


# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی سێیەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبدالعزیز

چاپی دووە

بەرگی سێیەم

ناوەندی رۆشنبیر

ئەم جزمە پێك هاتووە لە بەشێك لە سورەتی(المائدة) کە لە ئایەتی(٨٢) وە دەست پێ ئەکات تا دوایی سورەتەکە، وە بەشێك لە سورەتی(الأنعام) لە سەرەتاوە تا ئەگاتە ئایەتی(١١٠).

باسی بەشی دووەم دوا ئەخەین بۆ سەرەتای سورەتی(الأنعام)، کە لە دواییدا هەموو سورەتەکە ئەخەینە پێش چاو، لێرەدا هەر لە بەشی یەکەم ئەدوێین لەم جزمی(٧) وە.

لەسەرەتای ئەم سورەتەوە گوتمان: ئەم قورئانە هات بۆ ئەمەی ئوممەتێك فەراهەم بێنێ، دەوڵەت و میریی یەك دروست بکات، گەل و کۆمەڵێك دابڕێژێ، چەند دەروون و ژیریی یەك پەروەردە بکات و پێیان بگەیەنێت، پەیوەستی ئەو گەل و کۆمەڵە تازە بکاتەوە لەناو خۆیاندا، هۆی پەیوەندی دەوڵەتەکەی بە دەوڵەتەکانی ترەوە دیاریی بکات، پەیوەندی ئوممەتەکەی بە ئوممەتەکانی ترەوە روون بکاتەوە، ئینجا ئەوانە هەموو کۆ بکاتەوە و شەتەکیان بدات بە تەنیا سەرچاوەو تەنیا دەسەلاتێکەوە، کە ئایینی راستەقینەی خوایە، موسڵمانانی راستەقینەش هەر بەو جۆرە ئایینیان ناسیوەو وەرگرتووە. جا لەبەر ئەوە ئەم چوار سورەتە درێژە کە هاتن بە دوای یەکدا چەند مەبەست و مەسەلەی جۆر بەجۆر و جیاوازیان تیا هەیە کە هەموو بەشدارن و هاوبەشن لەو مەبەست و ئامانجەدا کە قورئان هات بۆ پێك هێنانی و بە هەموو ئەوانە ئەو مەبەستە پێکدێت، هەروەها دەستمان ئەکەوێ دارشتنی بۆچوونی بیرو باوەڕ و روون کردنەوە و پاك و خاوێن کردنی لە هەموو شتێکی پڕو پووچی بت پەرستی و لادان و گۆڕاندنی(أهل کتاب) نامەداران، لەپاڵ ئەوەدا گەل و کۆمەڵی موسڵمان تێ ئەگەیەنێ کە خۆی چییە و کارو پیشەی چییە و بۆچی هاتووە، ئەو رێگەی ئەیداتە بەر چۆنە، دەست نیشانی بۆ ئەکات بۆ ئەو درك و داڵ و کۆسپ و گرێ و هەڵخلیسکانەی کە لەو رێگەدا هەیە، بێگومان ئەم قورئانە تەمێ دادەرو رێ نیشاندەری ئەم ئوممەتەیە، کەواتە پێویستە لەسەر ئەم ئوممەتە کە هەموو کارو کردەوەو هەڵوێستی بە پێی دەست نیشانی ئەم قورئانە بێت، جا لێرەدا لە پاش ئەوەی ئەندازێ بە درێژیی باسی جوولەکە و گاوری کرد، ئەوا باسی هەڵوێستی جوولەکە وبت پەرست و گاوریش ئەکات تا بە پێی ئەوەو لەبەر رووناکی ئەوەدا موسڵمانان بجولێنەوە،

لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ

---

**ئەفەرموێ: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ سوێند بەخوا دەستت ئەکەوێ بە تین ترینی هەموو ئادەمی، واتە بێ ئایین و بێ بڕوایان لەبارەی خەشم و دوژمنایەتی یەوە دەربارەی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و موسڵمانن ﴿ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ﴾ جوولەکەیەو ئەوانەی کە هاوبەشیان بڕیار داوە بۆ خوا. پێش خستنی جوولەکە وا نیشان ئەدات کە ئەوان لە بت پەرستەکان بە تین ترن لە قین و خەشم و دوژمنایەتیدا. ئەگەر ئاوڕێك بدەینەوە بەلای مێژوودا لە کاتی هاتنی ئیسلامەوە تا ئێستا، دڵنیا ئەبین و هیچ گومانمان نابێ لەوەدا کە دوژمنایەتی و قینی ئەوان سەخت تر و قوڵ تر و درێژ ترە.**

**جوولەکە بەرەنگاری ئیسلام وەستا بە دوژمنایەتی، هەر لە یەکەم جاری بەرپا بوونی دەوڵەتی ئیسلامدا، هەر لە یەکەم رۆژەوە کە بوو بە ئوممەت، قورئان چەند هەواڵیدا و دەست نیشانی کرد بە دوژمنایەتی و پیلانی ئەوان کە ئیتر بەسەو هیچی تری ناوێ، کەواتە هەرچی ئەڵێین و ئەیخەینە بەرچاو بۆ ئاشکرا کردن و روون کردنەوەی ئەو هەواڵ و دەست نیشانانەیە. شتێکی ئاشکرایە کە جوولەکە بە درێژیی ژیانی بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیان خوا دووچاری کردون بە چەندەها سزاو ئازارو کوشتن و بڕین و دەربەدەری و بێزراو و قیزەون بوون بەلای گەل و میللەتەکانی جیهانەوە، بەڵام کە ئیسلام هات، بەدڵ و سنگێکی فراوانەوە چوو بە دەمیانەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی ژیان بە خۆشی و ئاشتی لەگەڵ بەستن سەراسەر ئەو پەیمانە خێرو خۆشی تیا بوو بۆیان، بەڵام بە پێی سروشتی ناپاکی خۆیان ناپاکی یان کرد و بە دەست درێژیی و پاشگەز بوونەوە لە پەیمانەکەیان، بێجگە لەوەی کە لەناو خۆیاندا ئەیان کرد بۆ زیان گەیاندن و پیلان گێڕێ، هەڵئەسان بە هاندانی هەموو بت پەرستەکانی نیوەدورگە، هەموو تیرو تایفەکانیان کۆکردەوە بە دژی ئیسلام و موسڵمانان، ئینجا کاتێ کە ئیسلام زاڵ بوو جوولەکە نەوەستا و لە بارێکی ترەوە دەستیکرد بە پیلان و خراپەکاری و هەڵبەستنی شتی پڕو پووچ بەناوی ئایینی خواو حەدیسەوە، هەموو ئەو درۆو دەلەسە پڕو پووچانەیان خستە ناو گەلی موسڵمان، ئەوانیش بە دڵێکی پاکەوە وەریان گرتن و نووسینیانەوە، بەهۆی ئەوەوە تێکەڵی کتێبە ئیسلامییەکان بوون و بڵاو بوونەوە لە**

جیهاندا بە تایبەتی کتێبەکانی تەفسیر، ئەگەر قورئان نەبوایە کە خوا پاراستی و بە جۆرێکی کردووە دەست نادا بۆ گۆڕین و دەستکاری، سەر تێك ئەچوو لەم ئوممەتە و گومڕا ئەبوون، خوا پاداشتی زانایان بداتەوە کە ئەو درۆو دەلەسە و شتە پڕوپووچانەشیان دیاریی کرد و کتێبی تایبەتی یان بۆ دانان و دیاریی یان کردن، یەکەم بەهۆی قورئان و دووەم بەو کردەوەی پیرۆزەی ئەوان ئایینەکەمان بە پاك و خاوێنی و پارێزراوی مایەوە، ئەو جوولەکانە بەوانەوە نەوەستاون و ناوەستن لە پیلان گێڕی و ئاژاوە نانەوە لەناو موسڵماناندا، هاندانی دوژمنان لێیان لە هەموو لایەکەوە، بە رادەیەك هەر دوژمنایەتی و ئاژاوەو بەربەرەکانیێ یەك کە هەیە لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ لای جوولەکەو بە پیلانی ئەوان روو ئەکاتە ئیسلام و موسڵمانان، هەر جوولەکە بوون بەهۆی هەڵنان و بەکارهێنانی سەلیبی و بت پەرستەکان لە ئیسلام و موسڵمانان و جەنگ کردن لەگەڵیاندا، لەناو وڵاتی ئیسلامدا ئەو هەموو بەکریێ گیراوانەیان بۆ پەروەردە کردن، بە پیلانی ئەوان بوون بە کار بەدەست، بەریان دانە ئیسلام و موسڵمانان، ئەوەی دوژمنی ئیسلام پێی خۆش بیێ ئەو بەکریێ گیراوی بەناو موسڵمانانە بەجێیان هێنا زۆر بە زیادەوە، لەهەر لایەکەوە هەر بزووتنەوەیەکی ئیسلامی سەر هەڵدا بەجاریێ پەلاماری ئەدەن بۆ کپ کردنەوەی، ئەو کەسەی کە نەزان و نەفامی هەڵنا و پڕوپاگەندە و دەلەسەی بڵاو کردەوە لە چەرخی خەلیفەی سیێ یەمدا تا لە ئەنجامدا ئەو تاوانە گەورە کرا و ئەو خەلیفە پاکە شەهید کراو دەرگای تاریکی و ئاژاوە و جەنگ کرایەوە لەناو موسڵماناندا ئەو کەسە جوولەکە بوو، ئەو کەسەی کە دووبەرەکی و ئاژاوە و رەگەزایەتی و نەتەوایەتی هەڵگیرساند لە دەوڵەتی خەلافەتی تورکیادا تا سەری لەوەوە دەرچوو خەلافەتی ئیسلامی لابدات، جاڕی نەهێشتنی دراو ئینجا بەند بە بەندی ئیسلام سڕایەوە لە تورکیادا. ئەو کەسەی کە ئەوەی کرد جوولەکە بوو. ئینجا بە دوای ئەوەدا بڕیاریان داوە کە لە هەر لایەك بزووتنەوەی ئیسلامی و بیرو باوەڕی گەڕانەوەی حوکمی ئیسلام و خەلافەتی ئیسلامی سەر هەڵدا ئەبیێ پەلاماری بدریێ و هەموو جۆرە جەنگێکی لەگەڵ بکریێ. ئەو کەسەی کە ماددیێتی و بیێ بڕوایی پەرە پێدا، دەوڵەتی بەناوەوە دروستکرد جوولەکە بوو. ئەو کەسەی کە پەرەیدا بە ئارەزووی بەرەڵایی و تێکەڵی و داوای ژیانی ئاژەڵی کرد جوولەکە بوو، ئەوەی بوو بەهۆی بڵاو بوونەوەی زۆربەی بیرو باوەڕە بیرو باوەڕە ناڕەواکان کە دژی مرۆڤایەتین هەر جوولەکە بوو. ئەوەی بوو بەهۆی بڵاو بوونەوەی زۆربەی بیرو باوەڕە ناڕەواکان کە دژی مرۆڤایەتین هەر جوولەکە بوو. بەڵیێ

بەڕاستی ئەو جەنگ و ئاژاوەی کە جوولەکە بەرپای کرد و فەراهەمی هێنا بەدژی ئیسلام، ماوەی درێژترو پان و قوڵ تر بوو لەوەی کە بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرەکان هەڵیان گراند، هەرچەند زۆر بەتین بێت – لە کۆن و لە تازەدا – جەنگ لەگەڵ بت پەرستەکانی عەرەبدا درێژەی نەکێشا زیاتر لە(٢٠) ساڵ، هەروەها لەگەڵ مەجوس و فارسدا لە چەرخی یەکەم و کۆندا، لەم چەرخی تازەدا هەرچەند زۆر بەتین تر و درێژترە، بەلاّم هێشتا ناگاتە سەختی و بەتینی جەنگی سەهیۆنی جیهانی کە مارکسیێتی تەنها پەل و لقێکی یەتی. بە کورتی هیچ جەنگێکی تر لە جیهاندا نەبووە دەربارەی ئیسلام بە وێنەی جەنگی جوولەکە مەگەر جەنگی سەلیبی کە لە بەشی دووەمی ئایەتەکەوە ئەندازەیە لێی ئەدوێین، کەواتە بە چاکی بۆمان روون ئەبێتەوە کە پێش خستنی جوولەکە لە ئایەتەکەدا زۆر راست و بەجێیە. جوولەکە بەو جۆرە رق و کینە و حەسادەت ئەکوڵێ لە دڵیاندا، دەربارەی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام و شوێن کەوتووەکانی، لەبەر ئەوە خوا پێغەمبەرو بڕواردارانی ئاگادار کرد بەو سروشتە پیسەی جوولەکە، هیچ هێزێك زاڵ نەبووە بەسەر ئەو سروشتە بەدەدا بێجگە لە هێزی ئیسلام و موسڵمانان لە رۆژێکدا کە موسڵمانان بە رێك و راستی موسڵمان بوون، هیچ هێزێکیش جیهان رزگار ناکات لەو سروشتە بەدو یاخی یە، بێجگە لە ئیسلام کە موسڵمانان بە راستی بگەڕێنەوە بۆلای، ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَىٰ﴾ دەستت ئەکەوێ نزیك ترینی هەموو بێ ئایین و بێ بڕواکان لە بارەی نەرمی و خۆش ویستنەوە دەربارەی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ئەوانەن کە گوتیان بەڕاستی ئێمە کۆمەك و یارمەتی دەرانین بۆ ئایینی خوا، ئایا ئەم سێ تاقمە لەو ئایەتەدا، بەشێوەی گشتی مەبەستن؟ لە هەموو چەرخێکدا بەو جۆرەن کە لەو کاتەدا بوون؟ یان تایبەتەو، لە کات و چەرخی تایبەتدا بەو جۆرەن؟ بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە ئەم سێ تاقمە لە چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) و لە ماوەی ژیاندا بەو جۆرە بوون کە قورئان باسی کردن، ئەوە بوو جوولەکەو بت پەرستەکان ئەو هەموو دوژمنایەتی و کردارە بەد و بۆگەنەیان کرد، بەلاّم نەسرانی یەکان بە پێچەوانەی ئەوان بوون، ئەوەبوو بەو جۆرە شیرینە هاتن بەدەم موسڵمانە کۆچ کەرەکانەوە و لەپاشان موسڵمانیش بوون

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا﴾ ئەو خۆشەویستی و نزیکی یەکەیان بەهۆی ئەوەیە کە لەناویاندا هەیە چەند زانا و چەن عابیدێکی گۆشەنشین ﴿وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ بەهۆی ئەوەیە کە خۆیان بە زل دانانێن لە ئاستی حەق و راستی یەك کە بۆیان دەرکەوت یان لوت بەرز نین لە ئاستی مەردووم، زانین و بە دوای زانین دا گەڕان و ئەو خۆ بە زل نەزانی یە هۆیەکی ئاشکران بۆ دڵ نەرمی و دۆستایەتی و بێ کینەیی و نەبوونی حەسادەت، وەکو نەسرانی یەکانی نەجران بەدەم هەندێ بەربەرەکانی یان کرد و لە پاشان چوونەوەو بێ دەنگ بوون، کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نارد بۆ هەموو پادشاکانی ولاَتان و بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون – هرقل و مقوقس – بە شیرینی وەلاَمیان دایەوە، تەنانەت ئەگەر گەلەکەی – هرقل – رێیان بدایە موسڵمان ئەبوو، بەلاَم لە پاش چەرخ و ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) مێژووی جوولەکە بە تایبەتی و لە پاش ئەوان بت پەرست، مێژووی ئەو دووانە شایەتە لەسەر ئەوە کە هەر بەردەوام بوون لەسەر ئەو حاڵ و بارەی کە ئایەتەکە بۆی باس کردین، جا بە پێی ئەو مێژووە بەدەیان، بە گوێرەی ئایەتەکە کە بە شێوەی گشتی بۆ هەموو کات مەبەست بن، وەك: زۆربەی زانایانیش ئەفەرمون. یان دوژمنایەتی جوولەکە و موشریك بووە و هەروایش ئەبن، خۆشەویستی و نەرمی نەسرانی لە کاتی پێغەمبەردا بووە، مێژووی بەدی نەسرانی یەکان لەپاشدا شایەت و بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەوان بە شێوەی تایبەتی مەبەست بن، ئەو بارو حاڵەیان بووە هەر لە کاتی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و سەرەتای ئیسلامدا، وەك(ئیبن و عەباس و ئیبن و جوبەیر و عطا و سدی) یش ئەفەرمون، کە مەبەست بەمانە لە ئایەتەکەدا(نجاشی) و هاوەڵەکانی یەتی، لە(مجاهد) ەوە ئەگێڕنەوە مەبەست ئەو نەسرانی یانەن کە لە خزمەتی – جعفری کوڕی ئەبی تالیب – دا هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوانیش(٨٠) کەس بوون(٧٢) یان(حبشی) و(٨) یان شامی بوون. بێجگە لەو مێژووە بەدەیان ئەم دوو ئایەتی داهاتووە بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوە کە مەبەست بەمانە تاقمێکی تایبەتییە لەوانەی کە خۆیان بە شوێن کەوتووی حەزرەتی عیسا ئەزانی، چونکە ئاشکرایە ئەم دوو ئایەتە دەست نادەن بۆ ئەوەی حاڵ و باری هەموو نەسرانی یەکان وا بووبێت،

وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ کاتێ ئەبیستن و گوێیان ئەبێ لەو قورئانەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای پێغەمبەرو فروستادەکەی(ﷺ) ﴿تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ ئەبینی چاوەکانیان پڕ ئەبێ لە فرمێسك هەتا فرمێسکیان لێ هەڵئەقوڵێ و هۆنە ئەکاتە خوارەوە، لەبەر ئەو حەق و راستی یەی کە ناسیویانە و بۆیان دەرکەوتووە لەو قورئانەی کە بیستیان حاڵ و باریان بەو جۆرەیە لە دەروونیاندا، گفت و گۆو وتەشیان ئەمەیە: ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا﴾ ئەڵێن: ئەی پەروەردگار، ئەوا بڕوامان هێنا بەوەی کە هێنرایە خوارەوە و بەو کەسەی کە هێنرایە خوار بۆ سەری ﴿فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ کەواتە بمان نووسە لەگەڵ ئەوانەی کە شایەتن لە رۆژی دواییدا. واتە: بمانخەرە ریزی ئوممەتەکەی محمد(ﷺ) کە لە رۆژی دواییدا ئەبێ بە شایەت لەسەر ئوممەتەکانی تر، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت کراوە – خوا لێیان رازی بێت – یان بمان نووسەو بمانخەرە ریزی ئەوانەی کە شایەتی ئەدەن لەسەر راستی ئایینی ئیسلام، ئەو شایەتی یە ئەدەن بە زمان و بە کردەوە بۆ چەسپاندن و بەدی هێنانی لە ژیانی مەردومدا، بێزاری دەرئەبڕن لە خۆیان لەمەی هیچ شتێك رێیان لێبگرێ لەو بڕواهێنانە، لەمەی ئەو حەقە ببیستن و بڕوا نەهێنن، لەمەی ئومێد و هیوایان نەبێ کە خوا بەهۆی ئەو بڕوا هێنانەوە وەریان ئەگرێ، بەرزیان ئەکاتەوە بۆ رادەو پلەی پیاو چاکانی خوا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَكَذَّبُوا﴾ ئایا چ شتێك بووە و هەیە بۆ ئێمە؟ چ رێگرێك هەیە لە ئێمە کە بڕوا نەهێنین بە**

خوا بە تاك و تەنيايى؟! بڕوا بەوەى كە ھاتووە بۆمان لەسەر زمانى ئەو فروستادەيە؟ لە كاتێكدا ئەوەى ھاتووە بۆمان ھەق و راستە؟ واتە ھیچ شتێك نەبووە و نییە و ھیچ بەرگرى كەرێك نییە لە بڕوا ھێنانمان ﴿وَنَطۡمَعُ أَن يُدۡخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ لە كاتێكدا كە ئومێدمان ھەیە بەھۆى ئەو بڕوا ھێنانەمان پەروەردگارمان بمانخاتە ریزى پیاو چاكان و وەرمان بگرێت لەگەڵ ئەوان، یان ئومێدمان ھەیە كە پەروەردگارمان بمانخاتە بەھەشت لەگەڵ چاكەكاندا، واتە: ئوممەتى ئەم فروستادەیە، ﴿فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ﴾ ئینجا بێگومان خوا پاداشتیان ئەداتەوە بەھۆى ئەوەى كە گوتیان و لە دڵێكى پاك و بڕوادارانەوە ھەڵقولاَ، پاداشتیان ئەداتەوە بە بەھەشتانێك كە روبارەكان دێن و دەچن لە ژێریاندا، ﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ كە ئەچنە ئەو بەھەشتانە و ئەمێننەوە تیایاندا بە ھەمیشەیى و بێ دوایى ھاتن و بڕانەوە، خواى پەروەردگارى میھرەبان زانى كە ئەوانە راست ئەكەن و دڵ و زمانیان یەكە، زانى كە بە راستى ھاتوونەتە ئەم ئایینە تازە و ھاتوونەتە ریزى بەندە چاكەكانى، ئومێد و چاوەڕوانى ئەكەن كە خوا وەریان بگرێ و بیانخاتە ریزى ئەوان، لەبەر ئەوە ئەو پاداشتە گەورەى بۆ بڕیاردان و كردى بە بەشیان ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئەوەیە پاداشتى ئەوانە كە چاك و چاكەكارن، یان مەبەست ئەوەیە كە ئەوەیە پاداشتى ھەموو چاكان و چاكەكەران بە شێوەى گشتى، كە ئەمانە لێرەدا یەكەم و سەردەستەن، لەسەر ھەر بار ئەم سیفەتە بەرزترینى پلەى بڕواو موسڵمانێتى یە ئەوا خوا شایەتى ئەدا كە ئەوانە خاوەنى ئەم سیفەتەن، كەواتە دەركەوت كە ئەمانە تاقم و دەستەیەكى تایبەتین و خاوەنى سیفەت و نیشانەى دیارین وەكو لەم سێ ئایەتەدا باس كران بەڕوونى، كەواتە با ھیچ ھەڵە نەكات و وابزانێ كە ھەموو نەسرانى یەكان مەبەستەو ئەم ھەڵوێستە چاكە دابنێ بۆ ھەموو نەسرانى و گاورەكان تا بەھۆى ئەوەوە ھەڵوێستێكى ناڕەوا پەیدا ببێ بۆ موسڵمانان بەرامبەر ھەموویان، ئەوە ببێ بەھۆى دۆستایەتى و خۆشەویستى ئەمان و جوێ كردنەوەیان لە دوژمنەكانى ترمان.

بەڵگەیەکی تری ئاشکرا لەسەر ئەوەی کە مەبەست لێرەدا دەستەو تاقمێکی تایبەتی یە نەك هەموو نەسرانییەکان ئەمەیە کە: بەرامبەر ئەوان و ئەو موژدەی کە دان بەوان ئەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە تاك و تەنیایی ئێمە و ئایەتەکانی ئێمە – واتە قورئان – بە درۆ دائەنێن و بڕوایان بەڕاستی نییە، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرێکی زۆر سەخت و بەتینن، نیشتەجێ ئەبن تێیدا و لێی جوێ نابنەوە، گوتمان: ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە، چونکە ئەم فەرمودەیە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو نەسرانی یانەی کە بڕوایان بە تاك و تەنیایی خوا نییە و بڕوایان بەو قورئانە نییە کە هاتووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانە بەشدار نین لە هیچ کام لەو سیفەت و نیشانانەی کە باس کران بۆ ئەوانەی کە ئەم چوار ئایەتە پێشووە هاتە خوارەوە دەربارەیان، بە کورتی بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ کە مەبەست هەموو نەسرانی یەکان بێت لەبەر ئەم چەند هۆیە:

١- لەبەر ئەوەی ناگونجێ لەگەڵ ئەو سیفەت و نیشانە و بەڵگەیانەی کە گوتمان لە تەفسیری ئەم چوار ئایەتەی پێشەوە.

٢- لەبەر ئەو چەند ریوایەتەی کە – قورتویی و بەیهەقی و قەتادە – هێناویانە لە تەفسیرەکانیاندا، هەموو ئەو ریوایەتانە دژی ئەوەن کە گشتی مەبەست بێت و تایبەتی یان ئەکەن.

٣- لەبەر ئەو هەموو ئایەتانەی کە هاتوون لەم سورەتە و چەند سورەتێکی تردا لەبارەی هەڵوێستی بەدی نامەدارەکان چ جوولەکە و چ گاور دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان.

٤- لەبەر مێژووی بەدی خۆیان کە پڕە لە دوژمنایەتی و دەست درێژیی و کوشتن و بڕین و قەلاچۆ کردنی موسڵمانەکان لەهەر لایە و لە هەر شوێنێ کە دەستی دابێ بۆ ئەو نەسرانییانە هەر لە رووداوی – یەرموك – ەوە تا – ئەندەلوس – و جەنگی درێژی سەلیبی و هەڵمەتەکانیان بۆ سەر وڵاتەکانی ئیسلام، یەکەم جار ئەفەریقا و لە پاشان لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا، ئینجا دەست تێکەڵ کردنیان لەگەڵ سەهیۆنی یەتی

جیهانی تا دواترین شێوەی ئیسلامیان نەهێشت بە رووخاندنی خەلافەتی عوسمانی و پشت گیرییان بۆ بت پەرستەکان لە هیند و لە هەموو لایەکی تر بە دژی ئیسلام و موسڵمانان. ئینجا لەپاش ئەو هەموو تاوان و کردەوە بەدانە هەمیشە وان لە کەمینا بۆ هەر بزووتنەوەیەکی ئیسلامی کە لەهەر لایەك سەر هەڵدا، دەست بەجێ بە هەموو جۆر لە هەموو لایەکەوە پەلاماری ئەدەن و هەموو بەکرێ گیراوەکانی خۆیان لە وڵاتدا ئەخەنە کار بۆ لەناو بردن و نەهێشتنی ئەو موسڵمانانە و کپ کردنەوەی ئەو بزووتنەوانە... دوبارە ئەڵێمەوە: کەواتە: با هیچ موسڵمانێ نەخەڵەتێ و هەموو دوژمنەکانی خۆی و ئیسلامەکەی بناسێ... ئەم سورەتە دەستی پێکرد بە چەند ئایەتێك لەبارەی حەلاڵ و حەرام و عیبادەت و پارێزگاری ئەو شتانەی کە خوا کردوونی بە نیشانەی خواپەرستی، هەندێ لەو حەلاڵانە: خواردنی خۆراکی ئەهلی کیتاب و مارەکردنی ئافرەتیان بوو، ئینجا هاتە سەر باسی ئەو نامەدارانە بە درێژیی وەك تێپەڕی کرد، ئینجا لەپاش ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە یەکەمجارەوە دەستی پێکرد، هەندێکی تر لەوە ئەهێنێت و فەرمانی پێئەدات، ئینجا بە دوای ئەوەدا باسی نامەدارەکان ئەهێنێتەوەو لێکۆڵینەوەو دەمە قاڵێ یەکی تریان لەگەڵ ئەکات، کەواتە هەموو ئایەتەکانی ئەم سورەتە بە دەوری ئەو دوو مەبەستەدا ئەخولێتەوە، هەموویان بوون، بە راقە و درێژە دان بۆ سەرەتای یەکەم ئایەتێ کە فەرموی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾ وەك لە سەرەتای سورەتەکەیشەوە دەست نیشانمان بۆ کرد، ئینجا هەموو ئەوانەش ئەگەڕێنەوە بۆ یەك مەبەست، مەسەلەکە شەریعەت و دانانی یاسا و بەرنامەی ژیان تایبەتە بە خواوە و هەر مافی ئەوە، واتە:ئەبێ تەنها خوا شت حەرام یان حەلاڵ بکات، تەنها خوا شت قەدەغە یان رەوا بدات، تەنها خوا جڵەوگیریی و فەرمان بکات و دەرکا، هەر کەسێك لاف ئەو مافە لێبدات بۆ هەرکەسێك لە راستیدا – بەدەم بیڵێ یان نەیڵێ – لاف مافی خوایەتی لێئەدا بۆ ئەو کەسەو دەست درێژیی ئەکات بۆ سەر مافی خوا و خوایەتی خوا، هەرکەسێك هەر سەرچاوەیەك رەوا بدا بێجگە لە شەریعەتی خوا بۆ حەلاڵ و حەرام و قەدەغە و رەوا دان، ئەو کەسە لائەدات و پشت

ئەکاتە ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) بەوەیش لە بڕوا هێنان دەرئەچێ و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنێ.

لێرەوە تا ئایەتی(١٠٨) کراوە بەناو و سیفەتی بڕوا هێنانەکەیانەوە کە ئەوەش زۆر بە کارو سەرنج راکێشە بۆ گوێ رایەڵی کردن و فەرمانبەریی، هەرکام لەوانە بیر خستنەوە و دڵ بەستنەوەی تیایە بە بڕواکەی کە پێویستە پارێزگاری کردنی و دوورکەوتنەوە لە سەرپێچی و ملەجەڕە و هەر شتێ کە دژو پێچەوانەی بڕواکەیانە. لە یەکەم بانگ کردندا جڵەوگیریی یان ئەکات لەوەی کە قەدەغە بکەن لەسەر خۆیان ئەو شتە پاك و خاوێنانەی کە خوا حەڵاڵی کردوون بۆیان، بێجگە لەوەی کە هەموو ئایەتەکانی هەموو سورەتەکان پەیوەست و جۆشن پێکەوە و هەرکام لەو ئایەتانە وەك بەش و ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشی مەردوم و بە هەموویانەوە لەشی تێرو تەواوە، هەروەها بە هەموو ئایەتەکانی هەر سورەتێك سورەتەکە تەواو ئەبێ و ئەبێ بە سورەتێکی سەربەستی جیاواز، بێجگە لەو پەیوەندی و پەیوەستی و خۆش بوونە هەر ئایەتێك پەیوەندی و پەیوەستی تایبەتی هەیە بە ئایەتی پێش و پاشی یەوە هێندێ لەو پەیوەندی و پەیوەستی یانە روون و ئاشکران و هێندێکیان دوورن و بە بیر کردنەوە دەرئەکەون، بۆ نموونە ئەم دوو ئایەتی بەشی یەکەمە پەیوەستی یەکی دووری هەیە بە مەبەستی سەرەکی ئایەتەکانی پێشی یەوە کە هاتن دەربارەی ئەو نەسرانی یانەی کە لێرەدا وەسف و سەنای کردن بەوەی کە نزیکترن لە خۆش ویستنی بڕوادارانەوە، هۆکەشی ئەوەبوو کە زانا و عابیدی خەڵوەت نشینیان تیایە کە وازیان لە ژیان و خۆشی جیهان هێناوەو هەر خەریکی خواپەرستین، کەواتە لەوەوە گومان ئەبرێ کە رەهبانێتی و خەڵوەت نشینی شتێکی چاکە و پێویستە موسڵمانانیش هەوڵی بۆ بدەن، لەگەڵ ئەوەدا ئەو رەهبانێتی یە شتێکی کاتی بووە لەو شەریعەتەدا و مەسیحییەکانیش خۆیان پێویستیان کرد لەسەر خۆیان نەك ئەوە خوا پێویستی کردبێ، لەم شەریعەتەدا ئەوە هەڵگیراوە لە بارەیەوە ئەم بڕیارە دەرچوو: ﴿لا رهبانية الإسلام﴾ رەهبانی یەتی نییە لەم شەریعەتی ئیسلامەدا، جا بەم دوو ئایەتە ئەو گومانە نامێنێ،

**ئـەوەتا ئەفـەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئـەی كەسـانێ كـە بڕواتان هێناوە قەدەغە مەكەن لە خۆتان ئەو شتە پاك و خۆشانەی كە خوا حەلاڵی كردوون بۆتـان. لـەبارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئايەتـە و ئايـەتی دوای ئـەم، چەند ریوايـەتێك هـاتووە، هێنـدێكيان درێـژەو لـە مەبەسـتدا ریوايەتـە كورتـەكان ئەگێڕتـەوە، لەبـەر ئـەوە هـەر كورتەكە باس ئەكەين كە(ئيبن و جەرير) هێناويەتی كە پێغەمبـەر(ﷺ) ڕۆژێك دائەنيشێ و ئامۆژگـاری ئـەكات لـەو ڕۆژەدا هـەر ئـەيان ترسـێنێ و بـەس، لـە پاشـدا چەند كەسـێك لـە هاوەڵـەكانی ئەفـەرمون: ئەگـەر كارێـك نەكـەين، كردەوەيـەك دانـەهێنين بـۆ خۆمـان، ناهـەقی ئەكەين و تيا ئەچين، نەسرانی يەكان شتيان لەسەر خۆيان قەدەغە كرد. كەواتـە با ئێمـەيش قەدەغـەی بكـەين ئينجا هێنـدێكيان قەدەغـەيان كـرد خـواردنی گۆشـت و شـتی قەڵـەو چـەور، هێندێكيان پێويستيان كرد كە هەميشە لە ڕۆژدا بە ڕۆژوو بن و قەدەغـەيان كـرد خـواردن لـە ڕۆژدا، هێندێكيان ژنی قەدەغە كرد لە خۆی. ئەو هەواڵـە گەيشت بە پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەويش فەرموی: چييە هێندێ كەس ژن و خۆراك و خەو لەسەر خۆی قەدەغە دەكات؟! بزانن كە من ئەخەوم و ناخەوم بە ڕۆژوو ئەبم و بە ڕۆژوويش نابم هێندێ جار، ژنيش ئـەهێنم و هەركـەس لە ڕەوشتی من لا بدا لە من نييە، ئينجا ئەم ئايەتە هاتە خوارەوە، لە سـەحيحی – بوخـاری و موسـليم و ئـەبو داود – يـشدا حـەديس هەيـە بـە وێنـەی ئـەم ریوايـەتی(ئيبن و جـەرير) ە، هەرچەند شتێكی ئاشكرايە كە رای زانايان لەسەر ئەوەيە كە هۆی هاتنە خوارەوە، ئايەتەكان تايبەتی ناكەن و هەركام گشتی بێت لەسەر گشتێتی خۆی ئەمێنێتـەوە، هەميشە ئايەتـەكان بـە پێـی گشتی دەق و وتەيەكـەيان ئـەگيرێن، مەگـەر بەڵگـەيـەكی بـەهێز ببێ لەسـەر تايبـەتی كردنـی، هەرچـەند كارەكە بـەو جۆرەيـە بـەلام زانينـی هـۆی هاتنـە خـوارەوە باشتر مەبەسـتی ئايەتەكە روون ئەكاتەوە، جا لەبەر ئەوە چاك وايە هـەر ریوايـەتێكی سـەحيح و بـەهێز دەسـت كـەوت باس بكرێ و بـە پێـی ئـەوەو لەبـەر ڕوونـاكی ئـەودا تەفسيری ئايەتەكە بكرێتـەوە، لـە هـەمان كاتـدا گشتێتی دەقەكە بهێڵرێتـەوە، هـەر بـارێكی تـريش كـە دەقەكە دەستبدات بۆی**

فەرامۆش نەکرێت، کەواتە ئەڵێین: بە پێی ئەو ریوایەتانە بەو جۆرە تەفسیرمان کردووە، بێجگە لەوە چەند بارێکی تریش هەڵئەگرێ:

١- ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردووە ئێوە بە حەرامی دامەنێن و بڕواتان وانەبێ کە حەرامە بە وێنەی بت پەرستەکان کە هێندێ لە حوشترەکانیان حەرام ئەکرد و باوەڕیان بە حەرامی یەکەیان بوو، بە بێ ئەوەی ئەو حەرام کردنە لەلای خواوە هاتبێ.

٢- ئەوەی کە حەڵاڵی کردووە ناوی نەبەن بە حەرام و پێیان مەڵێن حەرام.

٣- ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردووە بە فتوای ناهەق حەرامی مەکەن، وەك زاناکانی ئیسرائیلی شتی وایان ئەکرد.

٤- ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردووە ئێوە قەدەغەی مەکەن بە سوێند و نەزر کردن وەك باوە شتی وا ئەکرێ.

٥- ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردووە ئێوە حەرامی مەکەن بەهۆی تێکەڵ کردنی بە شتی حەرامەوە. بەجۆرێ جوێ نەکرێتەوە لە یەکتر، ئەو کاتە هەموو حەرام ئەبێ، ئەم ئایەتە بۆ هەرکام لەم جۆرانە هەڵئەگرێ وەك ئەگونجێ بە شێوەی گشتیش بگیرێ، بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار ئەم هەموو جۆرانە ناڕاست و ناڕێکن، پێویستە موسڵمان دوور کەوێتەوە لێیان بە تایبەتی یەکەم کە لە گوناهە زۆر گەورەکانە و مەردوم لە بڕواو ئیسلام دەرئەچی پێی، چونکە حەرام و حەڵاڵ کردن هەر فەرمانی خوایە و تایبەتی یە بە خواوە.

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ﴾ تێمەپەڕن و دەست درێژیی مەکەن. ئەم فەرمودەیە سێ بار هەڵئەگرێ:

یەکەم: جڵەوگیریی پێشووەو بەهێزی ئەکات بەمەی ناوی ئەبات بە دەست درێژیی.

دووەم: مەبەست جڵەوگیریی یە لە زیادە رەوی کردن لەو شتە حەڵاڵانە، واتە: وەك ئەو شتانەی حەڵاڵ کردووە لە سنووری پێویستدا بوەستن و زیادە رەوی مەکەن پێیان.

سێ یەم: زیادە رەوی مەکەن لەو حەڵاڵانە و تێپەڕ مەکەن بۆ حەرام و قەدەغەکانی خوا.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿٨٨﴾

---

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ **چونكە خوا تێپەڕ كەران و دەست درێژیی كەرانی خۆش ناوێ، واتە: خەشمی هەیە لێیان، لەوانەی سنووری شەرع ئەشكێنن، ئینجا فەرمان ئەدا بە خواردن و بەكارهێنانی ئەو شتانەی كە حەلاڵی كردوون، ئەفەرموێ: ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ﴾ بخۆن و بخۆنەوە لەوەی كە خوا پێیداون و كردوویە بە رۆزیتان كە حەلاڵ و پاك و خۆش و ئارەزوو كراوە، یان شتی حەلاڵ و پاك و خۆش بخۆن لەوەی كە خوا پێیداون و كردوویەتی بە رۆزیتان ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ﴾ خۆتان بپارێزن و بترسن لەو خوایە كە ئێوە بڕوادارن پێی. بترسن و خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی، لەوەی كە لە خۆتانەوە شت حەرام و حەلاڵ بكەن و لەوەی لە سنووری شەرع تێپەڕ بكەن، بێگومان بڕوا بە خوا داخوازە بۆ ئەو ترس و خۆپارێزی یە، ئەم ئایەتە بەڵگەیەكی ئاشكرایە لەسەر ئەوەی كە خواردنی ئەو شتانەی كە خۆش و بەلەزەتن دژی لە خوا ترسان و خۆپارێزی - تەقوا - نی یە، وەك چەند حەدیسی سەحیح و رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵگەیەكی روون ئاشكران لەسەر ئەوە، بەڵێ، پێویستە ئیسراف و زیادە رەوی نەكرێ لە خواردن و خواردنەوە و هەموو شتێك دا، هەر هەواڵ و حەدیسێ كە هاتووەو ئەو دژایەتی یە بگەیەنێ، لە رووی راستی دا پشتیان پێ نابەسترێ، چونكە لاواز و بێ بنچ و بنەوان و سەرچاوەن لای زانایانی حەدیس، تەنانەت هێندێ لەو هەواڵ و حەدیسانە كە لە(أحیاء) دا هاتوون لەو باسەدا كە ناوی بردووە بە(كتاب كسر الشهوتين)(حافظی عێراقی) بە لاوازیان دەرئەكات و ئەفەرموێ: سەرچاوەو بنەوانێكی دەست نەكەوتوە بۆ هیچ كامیان. كەواتە با هەر پەیڕەوی پێغەمبەری ئازیز بكەین(ﷺ) كە رەوشتی ئەو لە هەموو كتێبە باوەڕ پێكراوەكان دا بڵاو بووەتەوەو ناسراوە، رەوشتی پیرۆزی ئەو لەبارەی خواردنەوە بەم جۆرە بوو كە خواردنی بە گرنگ نەگرتووە و گوێی نەبووە لێی، خۆشترین خواردەمەنی وەك گۆشتی برژاو و خورما و رۆن و كەشكەك و حەڵوا، هێندێ جار نانی جۆو خوێی خواردووە یان زەیت، هێندێ جار بە برسێتی ماوەتەوە كە هیچی دەست نەكەوتبێ، بەڵێ خۆی پاراستووە لە تێپەڕ كردن لە ئەندازەی پێویست و دوور بووە لە زیادە رەوی، كەواتە با هەر پەیڕەوی ئەو بكرێ، هەركەس ئەیەوێ ئارەزووی خۆی**

رام بكات و زاڵ ببێ بەسەریدا ئەوا شەریعەتی ئیسلام رۆژووی داناوە با رۆژوو بەكار بێنێ بۆ ئەوە، ئەوەی كە هێندێ لە پیاوچاكان كردوویانە لەبارەی خۆگرتنەوە و دوور كەوتنەوە لە هێندێ خۆراك ئەوە شتێكی شەخسی خۆی بووەو بەناوی ئیسلامەوە نەیكردووە و پێویست نی یە هیچ كەسێكی تر پەیڕەوی یان بكات و چاویان لێ بكات، بەڵكو پێویستە لەسەرهەمووان تەنها رێگە و رێبازی پێغەمبەر(ﷺ) بدەنە بەر و لانەدەن لێی.

شتێكی ئاشكرایە كە ئیسلام ئایینی ژیانە لە هەردوو جیهان نەك ئایینی كەنار گیری و دوور كەوتنەوە لەو هەموو نازو نیعمەتەی كە خوا دروستی كردووە بۆ بەندەكانی خۆی. بۆ بەڵگە تەنیا ئەم دوو ئایەتە بەسە كە ئێستا لەگەڵیان دا ئەژین، بێجگە لە چەند ئایەتی تری وێنەیان و بێجگە لە چەند حەدیس، لەناو حەدیسەكاندا، تەنیا ئەم حەدیسە بەسە كە بە چەند ریوایەتێك هاتووە یەكێ لەو ریوایەتانە ئەمەیە كە ئەفەرموێ: خوا منی رەوانە نەكردووە بە رەهبانی یەتەوە، ئەفەرموێ: رەهبانی یەتی ئوممەتی من بریتی یە لە تێكۆشان لە رێی خوادا.

حەز ئەكەم لەم بارەیەوە فەرمودەی یەكێ لە زاناو هەڵكەوتووەكانی ئوممەتیش بێنم كە لە زۆر تەفسیرەكاندا هەیە: ریوایەت كراوە كە - حسنی بصری - خەریكی خواردنێك ئەبێ كە پێی ئەوترێ(فالوذج) كە دروست ئەكرێ لە هەنگوین و مەغزی گەنم و رۆنی مانگا، لەو كاتەدا - فەرقەدی سەنجی - دێت بۆلای ئەمیش پێی ئەفەرموێ: ئەی فەرقەد چی ئەڵێی لەمەدا؟ ئەویش ئەڵێ من نایخۆم و پێم خۆش نییە خواردنی. ئینجا حسن خوا لێی رازی بێت روو ئەكاتە غەیری ئەو و بە سەرسوڕمانەوە ئەفەرموێ: ئایا موسڵمان لەكەو رەخنەی ئەگرێ لەمە؟ واتە نەخێر!! ئینجا دێتە سەر باسی سوێند خواردن و ئەو سوێندانەی كە پێویستیان نی یە بە كەفارەت و ئەوەی پێویستی هەیە، وا دەرئەكەوێ هاتنی بەدوای ئەو دوو ئایەتی پێشوودا لەم بارەیەوە بێ كە(ئیبن و عەباس) - خوا لێیان رازی بێت - ئەفەرموێ: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو ئایەتە ئەمە بوو كە چەند كەسێك خواردنی خۆش و پۆشاكی چاك و ژنیان لەسەر خۆیان حەرام كرد و سوێندیان لەسەر ئەوە خوارد، ئینجا كە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە ئەو چەند كەسە عەرزی پێغەمبەریان كرد(ﷺ) ئایا چی بكەین بە سوێندەكانمان؟ ئینجا ئەم ئایەتانە هاتە خوارەوە چارەسەری دانا بۆ ئەو سوێندانە و وێنەیان كە پێویستیان هەیە بە چارەسەر، لە یەكەم جارەوە باسی ئەو سوێندانە ئەكات كە دانامەزرێن و چارەسەریان ناوێ،

لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ

---

**ئەفـــەرموێ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ خـــوا لێتـــان نـــاگرێ و ناتـــانگرێ لـــە سوێندەکانتاندا بە سوێندێ کە نیازی دڵی لەگەڵدا نەبێ و زمان هەڵکەوێ وەك باوە مەردوم ئەڵێن: ئەرێ واللە، نەواللە، بەم جۆرەیش تەفسیر کراوەتەوە لە حەدیسدا، لەبەر ئەوە ئەمەم هەڵبژارد، بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە لە ئایەتی سورەتی(البقرة) دا باسمان کرد بە درێژیی بە پێی رازی زانایان، کەواتە لێرەدا پێویست نییە بە دووبارە کردنەوە با سەرنجی ئەوێ بدرێ، ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ﴾ بەڵام لێتان ئەگرێ و ئەتانگرێ بە دابەستن و بەهێزکردنی سوێندەکانتان بە قەست و نیازی تەواو، واتە: ئەو سوێندانەتان کە هەر بە دەمتان دا دێت و قەست و نیازیان لەگەڵ دا نییە دانامەزرێن و خوا لێتان ناگرێ، ئەگەر بە پێچەوانەیان رەفتار بکەن، بەڵام ئەو سوێندانەتان کە لە نیازی دڵەوە دێت دائەمەزرێ و ئەگەر بیانشکێنن خوا ئەتانگرێ و ئەیکات بە گوناە بەسەرتانەوە[1]، کەفارەتتان لەسەرپێویست ئەکات بەو جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَكَفَّارَتُهُ﴾ کەفارەت و هۆی سرینەوەی شکاندنی ئەو سوێندانە ﴿إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ﴾ خۆراك دانی دە هەژارە، ﴿مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ لە میانەی خۆراکێ کە دەرخواردی منداڵ و خێزانی خۆتانی ئەدەن. ئیتر میانە لە ئەندازەدا، بەم رەنگە نە زۆر و بە لێشاو، نە کەم و کورِ. یان میانە لە جۆرو نرخ دا، بەم رەنگە نە زۆر چاك و گران و نە زۆر خراپ و کەم نرخ، بەڵکو ناوەراست وەك بە درێژیی و بە روونی باس کراوە لە کتێبەکانی زاناکانی ئیسلامدا. لەسەر هەموو مەزهەبە باوەڕ پێ کراوەکان، بە پێی هەموو راو بریارە جیاوازەکانیان. هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست(أوسط) باشترینە، بەم جۆرە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێیان رازی بێت –**

---

[1] واتە کاتێ سوێندەکان بشکێنن و کەفارەتیان نەدەن.

ریوایەت کراوە ﴿أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ﴾ یا پۆشاکی دە هەژار، ئینجا ئایا پۆشاکەش ئەبێ لە میانە بێت، یان لە هەر جۆر بێ و پێی بگوترێ پۆشاك، ئایا یەك پۆشاك بەس بێ، یان دوو پێویستە بۆ پیاوو ئافرەت، یان هەر بۆ ئافرەت دوو پێویستە؟ ئایا ئەو پۆشاکە ئەبێ بە گوێرەی باو لەش دابگرێت یان هەر عەورەت بەسە؟ رای زانایان لەمانەدا جیاوازە و دووبەرەکین. کەواتە با سەرنجی کتێبەکانیان بدرێ و هەرکەس بە هەرکام پێی خۆشە رەفتار بکات، ﴿أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ یا ئازاد کردنی بەندەیەك چ نێرو چ مێ، ئەمیش بەو جۆرو شێوەی کە زانایان فەرمویانە لە کتێبەکانیاندا. بێگومان سوێند خۆر هەرکام لەم سیانەی هەڵبژاردبێ لە کاتی خۆیدا کە بەندە بووە، هەرکام لە دووانە پێشووەکە هەڵبژێرێ ئێستا کە بەندە نەماوە و بەندە دەست ناکەوێ، هەرکام لەمانە بەس بووەو بەسە بۆ ئەو کەفارەتە، هەرچەند جیاواز بن لە قورسی و سووکی و هەرزانی و گرانیدا، دیارە هەرکام قورس و گرانتر بێت چاکترە، ئەم سیانە بەو جۆرەیە، بەڵام بۆ ئەم چوارەمەی کە دێت ئەبێ بەرێز بێ و تا هەرکام لەو سیانە دەست کەوێ ئەم نابێ بە کەفارەت وەك دەقی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ﴾ ئینجا هەرکەس دەستی نەکەوت هیچ کام لەم سیانە، کەفارەتی رۆژووی سێ رۆژە، ئەو دەست نەکەوتنە بۆ سێ یەمەکە بەمە ئەبێ کە بەندە نەبێ و دەسەڵاتی نەبێ بە سەر کرینیدا، یان هەر دەست نەکەوێ وەك ئێستا کە بەندە نی یە و بەندە نەماوە، بۆ یەکەم و دووەم بەمە ئەبێ کە زیاد لە خۆراکی شەو و رۆژێکی خۆی و هەرکەس کە لەسەریەتی زیاد لەوە ئەوەندەی نەبێ کە بیکات بە خۆراکیان پۆشاکی دە هەژار وەك(ئەبو حەنیفە) ئەگێرێتەوە لە(مالیك و شافیعی و ئەحمەد) ەوە، بەلای حەنەفی یەوە هەرکەس ئەوەندە ماڵی نەبێ کە بگاتە حەدی زەکات رۆژووی لەسەرە، بێجگە لەمانە چەند رایەکی تریش هەیە پێویست نییە بە هێنانیان، هەروەها ئایا ئەگەر رۆژووی لەسەر بێ ئەبێ هەر سێ رۆژەکە بەسەر یەکەوە بێت، یان دروستە بە جیا جیایش؟ بەلای(شافیعی) یەوە جیا جیایش بێ دروستە، بەلای زۆربەوە ئەبێ بەسەر یەکەوە بن، ﴿ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ﴾ ئەوەی کە باس کرا کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێ کە سوێندتان خوارد و سوێندەکەتان شکا،

﴿وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ﴾ پارێزگاری سوێندەکانتان بکەن، بەم رەنگە دەم بەرەڵا نەکەن و سوێندی زۆر بخۆن یان پارێزگارییان بکەن لە کەوتن مەگەر لەبەر هۆیەکی شەرعی وەك لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە: هەرکەسێك سوێند بخوات لەسەر شتێ، ئینجا بزانێ کە پێچەوانەی ئەوە چاکترە، با ئەوە بکات و کەفارەتی سوێندەکەی بدات. کەواتە ئەگەر سوێند خۆر لەسەر شتێ کە پێچەوانەی دروست نەبوو، وەك سوێند خواردن لەسەر نەکردنی واجبێك یان کردنی حەرامێك ئەوە پێویستەو فەرزە شکاندنی و کەفارەت دانی، بەڵێ باشتر ئەوەیە بە بێ هۆیەکی شەرعی سوێند هەر نەخورێ بەڕاستی چ جای بە درۆ. وەك ئاماژەمان بۆ کرد لە تەفسیری ئایەتەکەدا، ئینجا سوێند لە ئیسلامدا ئەمەیە کە هەر بە خوا و بەناو و سیفەتێ لە سیفەتەکانی خوا بخورێ کە قورئانیش ئەگرێتەوە، ئیتر بێجگە لەوە هیچ سوێندێکی تر راست نییە و شەرعی نییە و دانامەزرێ و بە شکان و نەشکاندنی هیچ کەفارەتێکی نییە، با سوێند پێ خوراوەکە ماڵی خوا یان مەلائیکە بێیان با گەورەترین دروست کراوەکانی خوا بێت وەك پێغەمبەر(ﷺ). ئینجا ئایا سوێند بە غەیری خواو ناو سیفەتەکانی دروستە یان حەرامە؟ ئەوە شتێکە بە درێژیی باس کراوە لەلایەن زانایانەوە، کورتە و پاڵفتەکەی ئەمەیە:

١- هەر سوێندێ نیازی رێز پێدان و بە گەورەترینی سوێند پێ خوراوەکەی لێ بکرێ بە وێنەی رێز پێدان و بە گەورە گرتنی خوا و ناو و سیفەتەکانی، یان نزیك خستنەوە لەو رێز و بە گەورە گرتنە، ئەوە کوفرە و هاوبەش دانانە بۆ خوا، ئەمە مەبەستە بەو حەدیسانە کە هاتوون لە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکان دا: ﴿من حلف بغير الله فقد كفر أو فقد أشرك﴾ هەرکەسێك سوێند بخوا بە غەیری خوا ئەو کەسە بێ بڕوا بووە یان هاوبەشی بۆ خوا داناوە.

٢- هەر سوێندێك لەو سوێندانە کە سوێند پێ خوراوەکەی ئەو رێز و بە گەورە گرتنەی پێ نەدرێ، بەڵام نیازی سوێندی راستەقینەی لێ بکرێ. بەم رەنگە سوێند لەسەر خوراوەکەی پێ بگرێتە گەردن و بە پێویستی بزانێ پارێزگاری و نەشکانی و بترسی لە شکانی، هەر سوێندێکیش بەم جۆرەی لێبێ، بێگومان حەرامە و بە هیچ رەنگ دروست نی یە، چونکە شەرع ئەو گرتنە گەردن و پێویستی پارێزگاری و مەترسی لە شکان وشکاندنی تایبەتی کردووەبەسوێندێکەوە کە بە خوا و ناو و سیفەتی خوا بێ.

ئەم جۆرە سوێندە زۆر رووی داوە لە ناو مەردومانداا، وەك باوە سوێند ئەخورێ بە گیان و سەری پیاو چاکان، سوێند خۆر بە راستی نیازی سوێندی راستەقینەی لێ ئەکات و زۆر مەترسی ئەکات لە شکان یان شکاندنی، بەڵکو چەند جار رووی داوە بە درۆوە سوێند خوراوە بە خوا بەڵام کابرای سوێند خۆر نەیتوانیوە بە درۆوە سوێند بخوا بەسەری پیاو چاکەکە! ئەگێڕنەوە کابرایەك گومانی دزی لێ ئەکرێ و ئەبرێتە خزمەت کاك احمدی شێخ – خوا پلەی بەرز بکاتەوە –، لە پاشان کابرای دز سوێند ئەخوا بە خوا و بە قورئان نەیدزیوە، لە پاشان کابرای ماڵ دزراو ئەڵێ بە دزەکە: بڵێ: بەسەری کاك ئەحمەد نەم دزیوە. کابرای دز ئەڵێ: کە بە لاتەوە گەورەتر و بەڕێز ترە لە خوا، هەزار بار رەحمەتی خوا لەو شێخە خواناسە بێ، با هەموو موسڵمانێ ئاوا لە خواترس و تێگەیشتوو بێت، با هەموو پیاوێکی گەورە وەك کاکە ئەحمەدی شێخ بکات، نەك هەمیشە بە پێش چاویەوە سوێند ئەخورێ بەسەری و بە گیانی و ئەویش ئەگەر لە دڵەوە زۆر پێخۆشحاڵ نییە و کەشخە ناکات بەو سوێندە بۆ هیچ دەنگ ناکات و بێزاری دەرنابڕێ؟!

٣– هیچ کام لەو دووبارە مەبەست نەبێ، بەڵام باوە لە کاتی قسەو گفت و گۆدا ئەو سوێندە رواڵەتیانە ئەخورێن بۆ بەهێز کردن و دڵنیا کردن لەسەر قسەکە. ئەم جۆرە حەرام نی یە، بەڵکو ئەم جۆرە دوو بەشە:

یەکەم: سوێند پێ خوراوەکە رێزدارو گەورە بێ و شێوە و بۆنی ئەو رێز و گەورەیی یەی لێوەرگیرێ، ئەمە هەرچەند حەرام نی یە، بەڵام باش نی یە و بێزراوە و کەراهەتی هەیە، چونکە بۆن و هەناسەی سوێندی حەرامی لێدێ.

دووەم: ئەوەی کە ناوبراوە رێز دارو گەورە نەبێ، وەك باوە دوو کەسی هاوڕێ لە کاتی قسە کردندا ئەڵێن بە یەکتر: بەسەری تۆ و بە گیانی تۆ، ئەم بەشەیان حەڵاڵە و هیچی تێدا نییە، ئەوەی کە لە حەدیسدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی دەربارەی کابرای عەرەبی لادێی(أفلح و أبيه إن صدق) رزگار ئەبێ بە گیانی باوکی ئەگەر راست بکات ئەو فەرمودەیە بڕاوە بەسەر ئەم بەشی دووەمەدا، وەك ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: ئەمە وەڵامێکی رێك و پێکە نەك ئەوەی کە گوتراوە ئەو فەرمودەیە سڕاوەتەوە، یان گوتراوە ئەوە تایبەتی بووە بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) و بۆ هیچ کەسێکی تر نییە چاو لەو بکات و وتەی وا بڵێ!! هەرچەند باس و مەسەلەیەکی تر هەیە کە لەم شوێنەدا گوتراوە و زانینیان بەکەڵکە،

كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ

---

**بەڵام لەبەر ئەوەی لە کتێبەکانی فیقهدا گوتراون و لەبەر ئەوەی باسەکەی ئێرە درێژە نەکێشێ ئەگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە کە کۆتایی هێنا بەم فەرمودەیە: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ مانەندی ئەو باسە نایابە و بەو جۆرە ڕێك و پێکە خوا بە ڕوونی باسی ئەکات بۆتان ئایەتەکانی خۆی، یان هەرچۆنێ باسی سوێند و کەفارەتی سوێندەکانی بۆ کردن هەروەها بە ڕوونی باسی هەموو شتەکانی ترتان بۆ ئەکات کە پێویست بێت، بۆ ئەوەی سوپاسی ئەو فێر کردنەی بکەن، یان سوپاسی چاکەکانی بکەن کە پێویستە سوپاس کردنیان.**

**لەپاش ئەوەی فەرمانیدا بە خواردنی ئەو شتانەی کە پاك و حەڵاڵن و ئارەق و قومار و وێنەیان لە چەرخی نەفامیدا بە پاك و خاوێن و حەڵاڵ دائەنران، بێگومان حەڵاڵ ئەوەیە کە خوا حەڵاڵی کردبێ، حەرام ئەوەیە کە خوا حەرامی کردبێ، بەو باو و بڕیاری مەردوم هیچ حەرامێ حەڵاڵ نابێ وەك هیچ حەڵاڵێکیش حەرام نابێ، ئینجا ئەوا ئەوانەی حەرام کرد و هیچ ڕێگەیەکی نەهێشتەوە بۆ حەڵاڵ کردنیان و فەرموی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ﴾ ئارەق و قومار ﴿وَٱلْأَنصَابُ﴾ ئەو بەردانەی کە کراون بە بت، پەرستن و سەربڕینی چوار پێ و ماڵاتیان لادا ئەکرێ بە قوربانی ﴿وَٱلْأَزْلَٰمُ﴾ ئەو پیاڵانە یان ئەو پارچە دارانەی کە وەك تیری بچووك وان و بەکار ئەهێنرێن بۆ دیاریی کردنی بەش و چارەنووس، هەروەها هەندێ جار لە قوماردا وەك لە سەرەتای سورەتەکەوە باس کرا ﴿رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ ئەوانە هەر پیس و قیزەونێکن کە لە کردەوەی شەیتانن، واتە: بە هاندان و ڕازاندنەوەی ئەو ئەکرێن و ئەو شیرینیان ئەکات لەبەرچاودا ﴿فَٱجْتَنِبُوهُ﴾ کەواتە کەنارگیر بن و دوور کەونەوە لەو پیس و قیزەونە، یان لەوەی کە باس کرا ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو بە ئومێد و چاوەڕوانی ئەوە بکەن بە ئامانج و ڕزگار بن لەو هەموو زیان و خراپە کە لەوانەدا هەن، زیان**

و خراپەی هەردوو جیهان. ئینجا باسی بەش و مەبەستی شەیتان ئەکات لە ئارەق و قوماردا و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ شەیتان هەر ئەوەی ئەوێ کە دوژمنایەتی و کینەبەری بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە و بەرگریتان بکات لە یادو باسی خوا و لە نوێژ. نوێژی جوێ کردەوە و بە تایبەتی باسی کرد هەرچەند بەشێکە لە یاد و باسی خوا لەبەر زیادە گەورەیی و گرنگی یەکە تایبەتی یە بە نوێژەوە. تا ئەو رادەیە ناوبراوە بە کۆڵەکە و پایەی ئایین و کراوە بە گەورەترین نیشانە و دروشمی بڕوا، شەیتان ئەیەوێ ئەو دوو زیانە گەورەیە بگەیەنێ بە مەردوم و بەد بەختیان بکات لە هەردوو جیهاندا، ژیانی دنیایان تاڵ بکات بە دوژمنایەتی و کینەبەری و ژیانی کۆمەڵایەتی یان تێك بدات، دڵیان بپچڕێ لە باس و یادی خوا، کە ئەو پچڕانە کان و کانگای هەموو شەڕو سزایەکە لە هەردوو جیهان دا. ئینجا بەهۆی ئەمەی کە ئارەق و قومارو هۆو مایەی ئەو دوو زیانە گەورەیەن بەلامەوە شتێکی ئاشکرایە و هیچ لێکۆڵینەوە و بەڵگە هێنانەوەی ناوێ – ئەو هەموو شەڕو لێدان و زامدار کردن و کوشتنەی کە بە درێژایی مێژوو بەرپا بوون لەو دوو شتە پیسەوە نایەنە ژمارە – شتێکی ئاشکرایشە کە مەست و سەرخۆش بە هیچ رەنگ هۆش و خەیاڵی نییە بەلای خوا و یادی خوا و نوێژەوە، قومار کەریش بە جۆرێ هەست و هۆش و خەیاڵ و دڵی ئەبەسترێ بەو قومارەوە هۆشی بەلای خۆیشی یەوە نامێنێ چ جای یاد و باسی خواو نوێژ کردن، ئەگەر بیر بکەوێتەوە، یان بیر بخرێتەوە و دەست هەڵگرێ لە قومارەکەی و نوێژ بکات نوێژەکەی لاواز و بێ گیانە و هیچ سوودێکی لێ نابینێ بێجگە لەوەیش ئەوا خوا هەواڵی پێداین کە شەیتان نیازو مەبەستی ئەوەیە، کەواتە عارە بۆ ئێمە لە گوێی بکەین.

لە ئایەتی سورتی(البقرة) دا ئەندازەیە بە درێژیی باسی ئەم دوو شتە پیسەم کرد لەگەڵ چەند شتێکی تر کە پەیوەندی یان هەیە بەم دووانەوە، هەرچەند گرنگیش بن و زانینی ئەوانە پێویست بێت، دووبارە کردنەوەی ئەو شتانە لێرەدا پێویست نییە، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای ئەوێ بکات. لە ئایەتی پێشوودا لەگەڵ ئارەق و قوماردا باسی ئەو دوو شتەکەی تری کرد ﴿وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ﴾کە راڤە و تەفسیرمان کردن، هەر چواری جووت کردن لەمەدا کە شتێکی قیزەون و پیسێکن لە کردەوەی شەیتان لەو ئایەتەدا ئەو چوارەی پێکەو باس کرد بەلام لەم ئایەتەدا هەر باسی زیانی ئارەق و قوماری کرد، بێدەنگ بوو لەو دووانەکە، زانایان ئەفەرمون: هۆی ئەوە ئەمەیە کە ئەم دوو ئایەتە هاتوون هەر بۆ قەدەغە کردن و بێزراندنی

ئارەق و قومار، باسی ئەو دووانە لەگەڵیاندا بۆ ناشیرین کردن و زیادە بێزراندنیانە بەمەی کە ئارەق و قومار کراون بە هاوسەری ئەو دووانە و جووت کراون لەگەڵیان کە ئەو دووانە دوو جۆرن لە بت پەرستی و نیشانەی بێبڕوایین، کەواتە باسی ئەو دووانە ئەبێ بە هۆی دڵنیا کردن لەسەر حەرامی و قەدەغە کردنیان، بەڵگەش لەسەر ئەوە دوو شتە:

١- باسی حەرامی ئەم دووانە لە سەرەتای سورەتەکەوە تێپەڕی کرد بە دەقی ئایەتی سێ یەم کە ئەوەندە روون و ئاشکرایە رێی هیچ قسەو باسێکی تیا نەهێشتووەتەوە، بەڵام باسی حەرامی ئارەق و قومار بەم جۆرەی ئێرە تێپەڕی نەکردووە، کەواتە پێویست نەما باسی حەرام کردنی ئەم دووانە، بەڵام پێویستی هەیە بە باسی قەدەغە کردنی ئارەق و قومار بەم جۆرەی کە لەم ئایەتەدا هات.

٢- ئەم دوو ئایەتە ڕوویان کراوەتە بڕواداران و بانگ لەوان کراوە، بێگومان ئەم دووانەش لەگەڵ بڕوادا کۆنابنەوە و بە هیچ کلۆجێك ناگونجێن پێکەوە، کەواتە لەم دوو ئایەتەدا مەبەستی سەرەکی هەر قەدەغە کردنی ئارەق و قومارە، نەك ئەو دووانەکەش، لەبەر ئەوە هەر باسی زیانی ئارەق و قومار لێرەدا پێویستە، ئەم دوو شتە پیسە تایبەتی نین بەو جۆرو شێوە تایبەتی یەی کە لەسەریبوون و بەکار هێنراون لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتەدا، بەڵکو گشتین و بۆ هەموو جۆرو شێوەکانی پاش ئەو چەرخ و کاتە تا ئێستا و لە داهاتوویشدا ئیتر بە هەر جۆرێك پێك بهێنرێن و بە هەر ناوێك ناو ببرێن، چونکە ئاشکرایە کە مەبەست بە ناوبراوەکە قەدەغە کراوە نەك ناوەکە، ئەم دوو شتە پیسە بووبوون بە باو و دەقیان پێوە گیرا بوو تا ئەو رادەی هەست و دڵی مەردومانیان داگیر کردبوو، باس هەر باسی ئەم دووانە بوو لەناو کۆڕ و کۆمەڵدا، بە شانازی یەوە پێش بڕکێ ئەکرا تیایاندا، لەبەر ئەوە خوای میهرەبان بەرە بەرە لەبەرچاوی خستن، یەکسەر و لە ڕێوە بە ئاشکرا و بە روونی جاڕی ئەوەی نەدا، بەڵکو وەك لە ئایەتی(البقرة) دا ئاماژەمان بۆ کرد حەرامی ئارەق بە چوار قۆناغ و قومار بە دوو قۆناغ روون کرایەوە بۆ هەمووان، ئەم ئایەتی ئێرە دواترین قۆناغەکەیان بوو کە بەم جۆرانەی خوارەوە حەرامی یەکەیان روون کرایەوە و دڵنیایی لەسەر کرا:

أ- ناوی بردن بە(رجس) کە ئەوپەڕی پیسی و ناشیرینی ئەگەیەنێ، تا ئەو رادە ئەو وتەیە بەکار هێنراوە بۆ بت و بتی پێ ناشیرین و بێزراو کراوە.

ب- وتەی(انما) هاتووە لە ئایەتەکاندا و کورت هەڵهێنراون، واتە ئارەق و قومار هەر ئەو پیس و قیزەونەن، کەواتە بە هیچ جۆر خێرو چاکەیەکیان تیا نییە کە رەوایان بدات.

ت- جووت و هاوسەری کردن لەگەڵ(انصاب و ازلام) کە دوو جۆرن لە بت پەرستی و لە کردەوەی بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرانن، وەك لە بارێکی تریشەوە پەیوەستی یەکی بەتین بووە لە نێوان ئەو چوارەدا لەو کات و چەرخەدا، بەم رەنگە کۆڕو کۆمەڵیان ئەگرت و قوماریان ئەکردو ئارەقیان ئەخواردەوە و گۆشتی ئەو حوشترو ماڵاتەیان لەگەڵ ئەخوارد کە سەر ئەبڕران بەسەر ئەو بەردانەدا کە ئامادە کرابوون بۆ شێوەیەك لە شێوەکانی بت پەرستی، بەکارهێنانی(ازلام) یش قوماریان ئەکرد لە بەشە گۆشتەکەیاندا، رەنگە ئەو پەیوەستی یەش هۆیەك بێت بۆ هاوسەر کردنی ئارەق و قومار لەگەڵ ئەو دووانەدا لە ئایەتەکەدا.

پ- گێڕانی ئەو دووانە بە کردەوەی شەیتان، ئاشکرایشە کردەوەی شەیتان هۆی خەشم و ناڕەزایی خوای میهرەبانە.

ج- بە وتەی(فاجتنبوه) فەرمانیدا کە بریتی نی یە تەنها لە واز هێنان، بەڵکو واز هێنانە لەگەڵ دوور کەوتنەوە، ئەو وتەیە لە قورئاندا بەکار هێنراوە بۆ گوناهو تاوانی زۆر گەورەو شتی زۆر خراپ، وەك هاوبەش دانان بۆ خوا و بت پەرستی و شایەتی ناهەقی و گوناهە گەورەکانی تر.

ح- دوور کەوتنەوەی ئەو دووانەی گێڕاوە بەهۆی رزگار و چاوەڕوانی گەیشتن بە ئامانج، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردنی ئەو دووانە مایەی زیان و بێ بەشی یە لە هەردوو جیهان.

خ- بەکارهێنانی ئەو دووانەی گێڕاوە بەهۆی دوژمنایەتی و کینەبەری کە ئەو دوو شتە مایەی بەد بەختی و بێ بەشی یە لە خۆشی ژیانی ئەم جیهانە لە پێش بەدبەختی ئەو جیهان.

د- گێڕاونی بە بەرگری کەر لە یادو باسی خوا و نوێژ کردن کە ئاشکرایە بەش براویی هەرەگەورەهەرلەوەوە پەیدا ئەبێ کە مەردوم بێبەش بێت لە یادی خواو لە نوێژ کردن.

﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ۝٩١ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ۝٩٢﴾

**ژ- ئەمەی لە كۆتایی ئایەتەكەدا ئەفەرموێ: ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ كە مەبەست فەرمان دانە بە كۆتایی هێنان لەو دوو شتە پیسە، واتە دەی كۆتایی بێنن، بەڵام لە دیمەن و شێوەی پرسیاردا هێنای كە بەهێز ترە لەوەی كە بە شێوەی فەرمان بهاتایە، چونكە ئەم دیمەن و شێوە قورئانی یە هەڕەشە ئەگەیەنێ، وا نیشان ئەدات كە هیچ بڕو بیانوویەك نەماوەتەوە بۆ كۆتایی نەهێنان، واتە وەك فەرمووبێتی: ئەوا خوێنرایەوە بەسەرتاندا ئەو شتانەی كە بەرگری كەرن بۆتان و هۆی كۆتایی هێنانتانە، دەی ئایا ماوتانە و لەگەڵ ئەوانەدا كۆتایی ئەهێنن؟ یان هەر لەسەر باری خراپی خۆتان ئەمێننەوە و وەك جڵەوگیریی نەكرابن؟**

**ر- لەپاش ئەوە دووبارە فەرمان ئەداتەوە بە كۆتایی هێنان و خۆپاراستن لە نافەرمانی بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ﴾ فەرمانبەر و گوێ رایەڵی خوابن و فەرمانبەر و گوێ رایەڵی نێرراو فروستادەكەی بن، وریا بن و خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی، بێگومان ئەم سێ فەرمانە ئەگەر ببەسترێن بەوانەی كە لە ئایەتی پێشوودا جڵەوگیریی یان لێكرا و تایبەتی بكرێن بەوانەوە ئەوا دیارە دووبارە كردنەوەی فەرمان دانە بە كۆتایی هێنان، ئەگەر نەبەسترێن و تایبەتی نەكرێن ئەوا هەر ئەوان ئەگرنەوە و ئەوان لێرەدا یەكەم و سەر دەستەن.**

**ز- هەم هەڕەشە سەختە ئاراستە ئەكات ﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە روو وەرگێڕن و فەرمانبەریی ناكەن ئەوا بزانن ئەوەی كە لەسەر فروستادەكەی ئێمە بێ هەر راگەیاندنێكی روون و ئاشكرایە، یا بزانن كە هەر**

راگەیاندنێکی روون لەسەر فروستادەکەی ئێمەیە، بێگومان ئەویش هەڵساوە بەوەی کە لەسـەریەتی بـە بـێ کـەم و کـوڕیی، کەواتـە هـیچ بـڕو بیانووییـەك نەماوەتـەوە بـە دەستتانەوە، ئێوە شایستەی سزادان و خەشمی خوا ئەبن و خۆتان زیانبار ئەبن، بەم هەڕەشە سامناکە باسەکەی دوایی پێ هێنا و دڵنیایی بەهێزی کرد لەسەر حەرامی و قەدەغەیی ئەو دوو شتە پیسە.

هیچ فەرمانێکی تر لە قورئاندا بێجگە لە فەرماندان بە بڕوا هێنان و بڕوا، هیچ جڵەو گیریی یەکی تر لە قورئان دا بێجگە لە جڵەوگیریی لە هاوبەش رەوا دان و بت پەرستی، هیچ فەرمان و جڵەوگیریی یەکی تر نەهاتووە لە قورئاندا، بێجگە لەو دووانە کە بە توندی گیرابێ و دڵنیایی لەسەر کرابێ بە وێنەی جڵەوگیریی لەم دوو شتە پیسە، فەرماندان بە کۆتایی هێنان لێیان، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە مەردوم زۆر بە توندی سەریان تێکردبوون، هەردووەکەیان زاڵ و بەهێزن لە دەرووندا و زیانێکی زۆر و فراوانیشیان هەیە، بە تایبەتی سەرخۆشی کە دژی ئەو وریایی و بێداریی یە هەمیشەیی یەیە کە ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان، چونکە موسڵمان ئەرکی گەورەی لەسەر شانە نابێ بە فیڕۆ کاتی خۆی زایە بکات، زیانی دەروونی و ژیریی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری وەك لە تەفسیری ئایەتی(البقرة) دا ئاماژەمان بۆ کردن، کەواتە پێویستی بوو کە ئاوا بە گرنگ بگیرێن و دڵنیایی بکرێ لەسەر حەرامی یان، تا بە باشی و بە بێ سەر لێکردنەوە کۆتایی یان لێ بهێنرێ، فعلا لەم دواترین قۆناغەدا بە تەواوی وازی لێ هێنرا بە جۆرێ کە مێژووی جیهان سەرسامە تێیدا، ئەوەبوو کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە ساڵی سێ یەمدا لە پاش رووداوی(احد)، جاڕ درا بەمەی کە ئەوا ئارەق حەرام کرا، بە جاڕێ هەموو گوێ رایەڵی یان کرد بە بێ گیرو گرفت، ئەوەی پیاڵە ئارەقی بە دەستەوە بوو فڕێیدا دەست بەجێ، هەرکەس پەلاماریدا هەر کوپە ئارەقێك لەماڵیدا بوو فڕێی دایە کۆڵان و شکاندی، هینی وابوو قومە

ئارەق لە دەمیدا بوو دەست بەجێ تفی یەوە و نەیهێشت بچێتە خوارەوە، کار وای لێهات وەك ئارەق و سەرخۆشی هەر نەبووبێت!! ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە بڕوای راستەقینە لە دڵەکاندا دامەزراو و جێگیر بوو، گرێ کوێرەی هەرە گەورە کرایەوە، گرێی بێ بڕوایی بەهۆی ئەوەوە گرێکانی تریش کرانەوە، لەپاش دامەزراندن و جێگیر بوونی ئەو بڕوا راستەقینە لە دڵ و دەروونـدا، ئیتر بڕواداران بە تەواوی لـە نـەفامێتی هاتنـە دەرەوە و خۆیـان دارنـی لـە هەرچی نیشانە و دروشمی نەفامی بوو، بۆ هەر کاروبارێ ئەوەندەی پێویست کە فەرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) ببیسترایە، ئیتر لەپاش بیستن بە بێ دوا و بەر و سەر لێ کردنەوە بە هەموو سۆز و پەرۆشەوە گوێ رایەڵی ئەکرا، بە بێ ئەو بڕوایە چارەسەری هیچ دەردێك بە تـەواوی ناکرێـت، هـیچ خراپەیـەك لـە ریـشە ناهێنرێـت، زۆر و یاسـا هـەر بـە رواڵـەت و لـە ئاشکرادا کار ئەکەن و دەسـەڵاتیان هەیە، هیچیان پـێ ناکرێ لـە دەروون و پـەناو نهێنیـدا، چەند ساڵ و زەمانە هێندێ لە دەوڵەتەکان بیریان کردووەتەوە و ئەیانەوێ گەل رزگار بکـەن لـە دەسـتی ئـارەق و سەرخۆشـی، بە نووسین و روون کردنـەوەی زیانـەکانی تـێ ئەکۆشـین و بەڵام لەبەر ئەوە چارەسەرە راستەقینەکەی ئیسلامیان نەبوو هیچیان پـێ نەکرا و هـەوڵ و تێکۆشـانەکەیان بەرهـەم و سـوودێکی ئـەوتۆی نـەبوو، کـاتێ ئـەم ئایەتانـە هاتنـە خـوارەوە دەربارەی ئارەق و قومار و لەناو کۆمەڵی موسڵمانان دا قسەو پرسیارێك کەوتە ناو لەلایان دوو دەستەوە:

١- دەستەی پاکان و لەخواترسان، کە خەم و پەژارە دڵی داگیر کردن بۆ ئەوانەی کە مردن و کاتی خۆی ئارەقیان خواردووەتەوەو قوماریان کردووە و پارەکەیان خواردووە، یان بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە لە(احد) دا شەهید کران و لەناو سکیاندا ئارەق بووە، واتە پێش حەرام کردنی.

لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ

---

٢- **دەستەی ناپاك كە ئەیانویست بە فاك و فیك و ئەو جۆر قسانە دڵی موسڵمانان بێ ئارام بكەن كە گوایە ئەوانەی كە مردوون ئەبێ چییان بەسەر بێت كە ئەو شتە پیسەیان خواردووە كە لە كردەوەی شەیتانە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە كە پاكانی دڵ ئارام كرد و ناپاكانیشی دەم كوت كرد و فەرموی:** ﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾ **نەبووە و نییە لەسەر ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە و كردەوەی چاكەكانیان كردووە لە مردووان و زیندوان و ئەوانەی ئامادە بوون و ئەوانەی ئامادە نەبوون، لەسەر هیچ كام لەونە نەبووە و نی یە هیچ ئەرەج و گوناهێك لەوەی كە خواردبێتیان و چەشتبێتیان لە ئارەق و پارەی قومار لە پێش حەرام كردنیانەوە، هەروەها هەر شتێكی تریش كە حەرام نەبووبێ و لەپاشدا حەرامی نەكرابێ** ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ **كاتێ كە خۆیان پاراستبێ لەو چەرخەدا لەوەی كە حەرام بووە لەسەریان، بڕوایان هێنابێ بەوەی كە خوا ناردبێتی، كردەوە چاكەكانیان كردبێ كە دانراون بۆیان** ﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ﴾ **ئینجا لەپاش ئەوە خۆیان پاراستبێ لەوەی كە حەرام كرابێ لە پاش دا و لە پاش راگەیاندنی** ﴿وَّءَامَنُواْ﴾ **بڕوایشیان هێنابێ بەوەی كە هاتبێ لەلایەن خواوە دەربارەی ئەوەو هەرچی لەوەو بەر** ﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ﴾ **ئینجا پاش ئەوە بەردەوام بووبن لەسەر خۆپارێزی یان پلەیەكی تر بەرز بووبنەوە لە خۆپارێزیدا، بەم رەنگە خۆیان پاراستبێ لە شتێكیش كە دوو دڵ بووبن لە حەلاڵیدا** ﴿وَّأَحْسَنُواْۗ﴾ **چاكەكانیشیان بە چاكی كردبێ، بەم رەنگە بە تێرو تەواوی بەجێیان هێنابێ بە بێ كەم و كوڕی، یان بە جۆرێ هەڵسابن پێی، وەك لە حوزوری خوادا بن و بەچاو خوا ببینن** ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ **خوا ئەو چاكە كارانەی خۆش ئەوێ.**

زانایانی تەفسیر چەند رایەکی تریشیان هەیە لەبارەی سێ بارە کردنەوەی وتەی ﴿اتَّقَوا﴾ و دووبارە کردنەوەی ﴿آمَنُوا﴾ و تەفسیرو راڤەیان، لەم کاتەدا ئەم رایەم هەڵبژارد کە کردم بە تەفسیرەکە ئەندازەیە بەهێزە لە دڵمدا، هەرکەس مەیلی هەیە با تەماشای راکانی تریش بکات، هەرکامی تری زیاتر بەدڵ بوو با هەڵیبژێرێ، ئینجا ماوەتەوە گرێیەك کە بە تەواوی لێی دواون و لە چەند رێگەیەکەوە هەوڵیان داوە بۆ کردنەوەی، بەلامەوە وا چاکە دەست نیشان بکەم بۆ ئەویش کە ئەمەیە: بە رواڵەت نەبوونی ئەرەج و گوناهەکەی بەستووە بەو مەرجانەوە، کەواتە بە بێ ئەو مەرجانە ئەبێ ئەرەج و گوناە ببێ بۆ بڕوادار و بێبڕوا لەسەر هەر خواردن و خواردنەوە و بەکار هێنانی ئەوانە پێش حەرامکردنیان و راگەیاندنی حەرامکردنەکەیان بە بێ هیچ مەرج و شەرتێك ئەمە گرێیەکە بوو.

بۆ کردنەوەکەی شتێك ئەڵێین لەو شتانەی کە گوتراون، زانینی راستەقینەش هەر لای خوایە: مەبەست بە هێنانی ئەو سیفەتە شیرینانە وەسف و سەنای ئەوانەیە کە ئەم ئایەتەیان تیا هاتە خوارەوە و دەرخستنی بارو حاڵەتی بەرزیان تا هیچ گومانی خراپیان پێ نەبرێ، واتە ئەوانە هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە لە خواردن و بەکارهێنانی ئەو شتانە، لە پێش حەرام کردنیاندا، ئەوانە سیفەت و نیشانەیان بەو جۆرە بووە، کەواتە رادەو پلەیان لای خوا بەرزە، چ جای ئەوە بە چاك دانەنرێن، ئینجا ئەڕوات لەسەر باسی حەرام و حەلاڵ و هێندێکی تر لەو دوو جۆرە باس ئەکات، لە یەکەمجارەوە ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، ﴿لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ﴾ سوێند بەخوا، خوا تاقیتان ئەکاتەوە بە هێندێك نێچیری بەڕی(وشکانی) ئیتر گۆشت خوراو بێ یان نا، یا تاقیتان ئەکاتەوە بە شتێك کە ئەو نێچیرانەیە ﴿تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ﴾ کە دەستتان و رمەکانتان پێیان ئەگەن، دەستتان بەچکە بچووکەکان و رمەکانتان بە گەورەکانیان، وەك لە(ئیبن و عەباس و مجاهد) ەوە ریوایەت کراوە، واتە رەفتارتان لەگەڵ ئەکات بە وێنەی کەسێك کە بیەوێ تاقیتان بکاتەوە،ئەیەوێ ئەوەی کەئەیزانێ ئێوە بە کردەوە بەدی بێنن و دەرکەوێ بۆ مەردوم ئەوەش

لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟
ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ

**﴿لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾ تا خوا بزانیٚ و بناسیٚ ئەو کەسەی کە لە خوا ئەترسیٚ، لە شویٚنیٚکدا کە پەنهانی یە و کەس بە دیاریەوە نییە، یان بزانیٚ و بناسیٚ کەسیٚك کە لە خوا ئەترسیٚ لە کاتیٚکدا کە لە پەنهانیدایە و خوا نایبینیٚ، بیٚگومان خوا هەموو شتی هەر زانیوە بە بیٚ سەرەتا بۆ زانینەکەی لە پیٚش پەیدا بوونی شتەکە وەك پاش پەیدا بوونی، کەواتە ئەم وتەیەش وەك وتەی تاقی کردنەوەکە ئەبیٚ لابدریٚ لە رووکەش و روالّەتەکەی، هەروەها هەموو وتەکانی ویٚنەیان کە لە قورئان و حەدیسدا زۆر هاتوون و بەکار هیٚنراون، جا لەبەر ئەوە زانایان سیٚ واتا و مەبەستیان بۆ باس کردوون، بە هەرکام ریٚکەو ئەگونجیٚ بەکار هیٚنانی بۆ خوا:**

**١- وەك لە وتەی پیٚشوودا گوتمان: بۆ ئەوەی کردەوە و رەفتارتان لەگەلّ بکات بە ویٚنەی کەسیٚك کە بیەویٚ بزانیٚ.**

**٢- تا دەرکەویٚ و ئاشکرا ببیٚ و جویٚ ببیٚتەوە بۆ مەردوم ئەوەی کە خوا ئەیزانیٚت.**

**٣- تا ئەوەی کە خوا زانیویەتی لە پیٚش بەدی هاتنیدا دووبارە بیزانیٚ پاش بەدی هاتنی و بە بەدی هاتوویی، کە ئەجرو پاداشت و تۆلّە بە پیٚی ئەم زانینەیە و شویٚنی ئەم ئەکەویٚ، واتە ئەوەی کە خوا زانیویەتی تا بەدی نەیەت و لە بەندە روو نەدات خوا پاداشت و تۆلّە ناسیٚنیٚ لە بەندەکەی.**

**ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە سالّی(حودەیبی یەدا) کە پیٚغەمبەر(ﷺ) بە هەزارو چوار سەد کەسیٚکەوە چوون بۆ مەککە بە نیازی عومرەو ئیحرامیان بەست بەو نیازەوە، لە پاشان ئەوە بوو قورەیش ریٚی گرت لیٚیان تا کارەکە بەو پەیمان و سولّحە بەناوبانگە دوایی هات، جا لەو ماوەدا کە لە ئیحرام بوون حەیوانی کیٚوی و پەلەوەرو بە زۆری و بە بیٚ تەقیٚ و تریٚز هاتنە ناویان بە جۆریٚ بە ئاسانی ئەیانتوانی بیانگرن بەدەست و بە رمەکانیان، بەلاّم لەبەر خوا خۆیان گرت لەو هەموو گۆشتە خۆشە، خوای گەورە بەوە تاقی کردنەوە وەك لە کاتی خۆیدا ئیسرائیلی یەکانی تاقی کردنەوە بە جلّەوگیریی یان لە راوە ماسی، وەك لەمەو پاش بە یارمەتی خوا باسی ئەکەین لە ئایەتی(١٦٣) ی سورەتی(الأعراف) دا، بەلاّم ئەوانە لەو تاقی کردنەوەدا دەرنەچوون، وەك ئەم ئوممەتە دەرچوون لەم تاقی کردنەوە گرنگەدا،**

هەروەها لە چەند تاقی کردنەوەی تریشدا ئەوان دەرنەچوون و ئەمان بە ڕێکی دەرچوون، بەهۆی ئەوەوە ئەو سەرکردایەتی و جێنشینییەی لەوان سەندەوە و بەخشی بەم ئوممەتە، بەجۆرێ بە دەسەلاَت و بەهێزی کردن و ولاَتی بۆ تەخت کردن کە بۆ هیچ ئوممەتێکی تر نەکراوە لە جیهاندا، خوای پەروەردگار هەواڵی ئەو تاقی کردنەوەی پێدان و ئینجا ئەم هەڕەشە سەختەی ئاراستە کردن، ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئینجا هەرکەس دەست درێژیی بکات بە گرتنی هیچ نێچیرێك لە پاش ئەو باس و هەواڵ پێدانە، بۆ ئەو کەسە هەیە سزایەکی ئازار دەر هەر لە جیهاندا، بەم ڕەنگە بە ڕووتی دار و جەڵدە ئەدرێ لە پشت و لە سکی بە فراوانی، وەك(ئیبن و عەباس) فەرموویەتی – خوایان لێ ڕازی بێت – ڕای زۆربەی زانایانی تەفسیریشی لەسەرە، یان لە ڕۆژی دواییدا، وەك هێندێتر ئەفەرمون، یان لە هەردوو جیهاندا وەك(شیخ الإسلام) ئەفەرموێ، بەلاَم شتێکی ئاشکرایە سزای ڕۆژی دوایی بە تۆبە و گەڕانەوەی ڕاست لائەچێت، بەهەرحاڵ زۆر شایستەی ئەو سزایەن، چونکە لەپاش ئەو جڵەوگیریی و هەواڵ پێدان و هەڕەشەیە هەر دەست درێژیی یەك بکرێ بەڵگەیە لەسەر سەرکێشی و نەترسان و گوێ نەدان بە فەرمانی خوا، هەرکەس نەتوانێ جڵەوی خۆی بگرێتەوە لە شتی وا بێگومان بۆ شتی گەورەتر هەر ناتوانێ گوێ ڕایەڵی بکات، ئینجا بە ڕوونی و بە درێژیی باسی کەفارەتی نافەرمانی و پێچەوانە کردنی ئەو بڕوادارانە ئەکات، لە یەکەمجارەوە جڵەوگیریی و لە دواییدا هەڕەشە دووبارە ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی کەسانێ بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ نێچیری کێوی مەکوژن لە کاتێکدا کە ئێوە لە ئیحرامدا بن ئیتر با لە خاکی حەرەمدا نەبن، یان مەیکوژن کاتێ کە لە خاکی حەرەمدا بن، ئیتر با لە ئیحرامدا نەبن، کە هەرکام هەڵئەگرێ، هێندێ ئەفەرمون مەبەست بە ئایەتەکە هەر دووبارەکەیە و ئایەتەکە ئەیانگەیەنێ، بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار دووبەرەکي نییە لەمەدا کە هەرکەس لە ئیحرامدا بێت نابێ نێچیر بکوژێ لە هیچ شوێنێك، هەروەها هەرکەس لە خاکی حەرەمدا بێت دروست نی یە نێچیر بکوژێ با لە ئیحرامیشدا نەبێ.

ئەو دووبەرەکی یە لەمە دایە ئایا کام بار مەبەستە لە ئایەتەکە؟ ئینجا مەبەست بەم نێچیرە هەر گیانلەبەرێکی کێوییە کە گۆشتی بخورێ، ئەمە بەلای ئیمامی شافیعی یەوە، کەواتە بەلای ئەمەوە گیانلەبەری ماڵ و هەر کێوی یەکی گۆشت نەخوراو و بژاردنی نییە، بەلای حەنەفی یەوە بێجگە لە مارو دوو پشك و کۆلارە و قەلە بازەڵە و مشك و سەگی بگرو

گورگ ئیتر هەموو گیانلەبەرێکی تری کێوی بڕاردن و تۆڵەی هەیە، بێجگە لە پڵنگ و درندەکانی تریش بەلای ئیمامی مالیك و ئەحمەدەوە و چەند کەسانێکی تریش وەك لە کتێبی فیقهـ و تەفسیردا بە درێژیی باس کراوە لەگەڵ چەند رایەکی تریشدا، ئینجا ئەو نێچیرەی کە بکوژرێ لەلایەن هەر کەسێکەوە کە لە ئیحرامدا بێ وەك مردارەوە بوو وایە با بە سەر برینی شەرعیش بیکوژێ، بەلای(حەنەفی و ئەحمەدو مالیك ەوە بە(شافیعی یەوە) لە رای تازەیدا، لە رای کۆنیدا ئەگەر سەربڕاوی شەرعی بێت خواردنی دروستە بۆ ئەوانەی کە لە ئیحرامدا نین، ئینجا دووبەرەکی هەیە لەمەدا کە ئایا حەلاڵە بۆ کەسێ کە لە ئیحرامدا بێ گۆشتی نێچیرێکی گۆشت خوراو بخوا کە کەسێ گرتبێتی بۆ خۆی کە لە ئیحرامدا نەبێ، بەلای زۆربەی جەماوەرەوە دروستە لەبەر ئەو حەدیسە سەحیحەی کە هاتووە لە(بوخاری و موسلیم) و غەیری ئەواندا کە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکانی لە گۆشتی نێچیرێکی وایان خوارد لە ساڵی حودەیبی یە لە کاتی ئیحرامدا کە بەدیاریی بۆیان نارد، هێندێ بەلایانەوە دروست نییە لەبەر روواڵەتی ئایەتەکە. لەبەر حەدیسێك کە هاتووە لەوەدا، ﴿وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا﴾ ئەگەر هەرکەسێك لە ئێوە ئەو نێچیرە بکوژێ بەدەستی قەست ﴿فَجَزَآءٌ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ ئەو کەسە لەسەریەتی بڕاردنی ئەو نێچیرە بە بریتی یەك لە وشترو رەشە وڵاخ و مەڕو بن بە مانەند و وێنەی ئەو نێچیرەی کە کوشتویەتی، مانەندو وێنە لە دیمەن و قەبارەدا بەلای کۆمەڵ و جەماوەری زانایانەوە لە هاوەڵەکان و ئەوانەی پاشی ئەوان یان لەهەر سیفەتێکی تریشدا ئەگەر لە دیمەن و قەبارەدا وەك یەك نەبوون وەك(شافیعی) و کۆمەڵێك ئەفەرمون، ئەگەر وێنەی نەبوو بە نرخەکەی ئەبژێرێ و بەلای حەنەفی یەوە مەبەست بە وێنە هەر قیمەت و نرخەکەیەتی ﴿يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾ لەکاتێکدا کە دوو پیاوی عادل لە خۆتان ئەو بریتی یە دابنێن و بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی کە مانەند و وێنەی نێچیرە کوژراوەکەیە، بەم جۆرەی کە(ئیبن و جەریر) ئەفەرموێ و لە حەدیس و کردەوەی هاوەڵەکانەوە ئەیهێنێ، ئەگەر ئاسکێکی بچووکی لەناو بردبێ بڕیاری کارێیان بەرخێکی لەسەر بدەن کە وێنەی بەچکە ئاسکەکە بێت لە تەمەن و قەبارەدا، ئەگەر گەورەی لەناو بردبێ بڕیاری گەورەی لەسەر بدەن، ئەگەر کەرە کێوی یەکی لەناو بردبێ بڕیاری رەشە وڵاخێکی لەسەر بدەن ئیتر نێر بێت یان مێ، گەورە یان بچووك بە پێی کەرە کێوی یەکە، هەروەها وەك بە درێژیی لە کتێبی تەفسیرو فیقهدا باسی کراوە بە تایبەتی باش روون کراوەتەوە لە تەفسیری گەورەی ئیمامی رازی دا

لەگەڵ چەند باس و مەسەلەی تردا، هەروەها ئالوسی لە تەفسیرەکەیدا ئەو دوو پیاوە عادلە لە بڕیاری ئەو بڕیتی یە مانەندە بدەن،

هَدْيًا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ ۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ ۚ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾

---

**﴿هَدْيًا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ﴾ بە دیاری یەكی نێرراو كە بگاتە پەناو دەوروبەری ماڵی خوا واتە ئەو شوێنەی ئەو خێرو قوربانی یانەی تیا سەر ئەبڕێت و گۆشتەكانیان ئەدرێن و دابەش ئەكرێن بەسەر هەژارانی خاكی حەرەمدا، كەواتە ئەگەر بەو جۆرەی لێ نەكرێ بەرناكەوێ و ئەو كەفارە لە مل ناكەوێ، ئینجا با بزانرێ وەك لە سەرەتای سورەتەكەیشەوە گوترا كە(هدی) ناوە بۆ ئەو حوشترو رەشە ولاخ و مەڕ و بزنانەی كە ئەنێررێن بۆ ئەو شوێنە پیرۆزەو بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە، كەواتە ئەو وتەیە(هدیا) لەگەڵ رای زۆربەو جەماوەردا زۆر رێك و گونجاو ترە كە ئەفەرمون ئەو بریتی یە ئەبێ لەو گیانلەبەرو چوار پێیانە بن، ئەگەر مانەند و وێنەی دەست نەكەوت ئەو كاتە ئەبێ بە نرخ و قیمەتی نێچیرە كوژراوەكە.**

**ئایەتەكە باسی كەفارەت و بریتی كرد هەر بۆ كوشتنێ كە بەدەستی قەست بێت و بێ دەنگ بوو لە كوشتنێ كە بە هەڵە بێت، بەڵام هەڵەش هەر وەك دەستی قەست وایە لە كەفارەت بژاردنەكەدا، نەك لە گوناهبار بووندا بەلای زۆربەی زانایانی تەفسیر و فیقهەوە،(زەهەری) ئەفەرموێ: قورئان هات لەبارەی دەستی قەستەوە و سوننەتیش هات لەبارەی هەڵەوە و بڕیاری بریتی و بژاردنیدا بەهۆی ئەمیشەوە تۆڵە ئەو بریتی یە بوو كە باس كرا ﴿أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ﴾ یان كەفارەتێ كە بریتی یە لە خۆراكی چەند هەژارێ ﴿أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا﴾ یا هاوتای ئەو خۆراكە لەبارەی رۆژووەوە، واتە لەباتی خۆراكەكە رۆژوو بگرێت. هەركام لەم سیانە هەڵبژێررا چاكە و بەسە بەلای ئیمامی حەنەفی و مالیك و شافیعی یەوە، وەك شافیعی بە روونی ئەفەرموێ: ئەگەر نێچیری كوژراو كە مانەند و وێنەی هەبوو كابرا بە ئارەزووی خۆی هەركام لەو سیانە هەڵئەبژێرێ چاكە ئەگەر مەلی بوو مانەند و وێنەكە سەر ببڕێ و گۆشتەكەی دابەش بكات بەسەر هەژارانی حەرەمدا، ئەگەر مەیلی بوو وێنەكە بكات بە پارەو پارەكەش خۆراك بكڕێ و بیدا بەو هەژارانە، ئەگەر ویستی لە باتی**

خۆراکی ڕۆژێکی هەر هەژاریَ ڕۆژێك بە ڕۆژوو بێت، ئیتر ئەو خۆراکە – مودد – یَکە لای شافیعی و دوو – مودد – لای حەنەفی، ئەو کەسەی کە هەڵبژاردنی بە دەستە کابرای بکوژە بەلای زۆربەی جەماوەرەوە، بەلای هێندێکەوە بە دەست دوو پیاوە عادلەکەیە، بەلاَم بەلای(ئیمامی ئەحمەد و زوفەر) ەوە ئەو سێ شتە ئەبێ بە پێی ریزی ئایەتەکە بێت، هەروەها چەند رایتر هەیە لەم مەسەلەیەدا با سەرنجی کتێبەکانی فیقە بدرێت، ئینجا باسی هۆی دانان و پێویست کردنی بژاردن و کەفارەتەکە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ﴾ بۆ ئەمەی ئەو بکوژە بچەژێ سەرەنجامی قورس و بەرهەمی سەختی کارەکەی خۆی، واتە ئەو تاوانەی کە کردی بە رێز شکاندنی ئیحرامەکەی، یان رێز شکاندنی خاکی پاکی حەرەم ﴿عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾ خوا بورد لەوەی کە رابورد و تێپەڕی کرد، واتە پێش هاتنی ئەم ئایەتە هەر نێچیرێکتان کوشتبێ لە کاتی ئیحرامدا، هەرچەند کارێکی خراپ بووە و لە سەردەمی نەفامیشدا هەر نەئەکرا و ئەگەر بکرایە تۆڵەی ئەسەنرا، هەرچەند کارەکە وایە بەلاَم خوا بورد لەوانەی پێش هاتنی ئەم ئایەتی قەدەغە کردنە، ﴿وَمَنْ عَادَ﴾ هەرکەسێك بگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو کردەوەیە لەپاش ئەم قەدەغە کردنە ﴿فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ﴾ خوا تۆڵەی بەتینی لێ ئەسێنێ لە ڕۆژی دواییدا، ئینجا کەفارەتەکەشی هەر لەسەرە بەلای(عطا و ئیبراهیم و ئیبن و جوبەیر و حسن) و جەماوەرەوە، لە(ئیبن و عەباس و شورەیح) ەوە کە کەفارەتی لەسەر نی یە، بەڵکو خوا ئەو تۆڵە سەختەی لێ ئەسێنێ لە ڕۆژی دواییدا، یان هەرکەس بگەڕێتەوە بۆ کوشتنی لەپاش ئەوەی کەفارەتی بۆ جاری یەکەم ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، خاوەنی تۆڵەی بەتینە، کەواتە تۆڵەئەسێنێ لەوەی کە سەرکێشە لەسەر یاخی بوون و سەرکێشی یەکەی.

خوای میهرەبان کاتێ ئیحرام و ناوچەی حەرەمی گێڕاوە بە پەناگا بۆ ئەو گیانلەبەرانە، کە بەندەی تاوانبار گوێی نەدا و بە دەسەلاَت و هێزی خۆی پەرمویەوەو دەست درێژیی کردە سەر پەنا دراوی خوا، ئەو کەسە شایستەی ئەو هەڕەشەو تۆڵە بەتینەیە، نێچیری کێوی دوو شتی بەو جۆرەیە کە باس کرا،

بەڵام نێچیری ئاوی و دەریایی بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾ پێش ئەوەی تەفسیری بکەین چاك وایە دەست نیشان بکەین بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە کە زانایان رای جیاوازیان تیا هەیە:

١- ئایا ئەم ئایەتە ئاراستەی هەموو بڕواداران کراوە، یان مەبەست هەر ئەوانەیە کە لە ئیحرامدا بن وەك هێندێکی تر لەسەر ئەوەن؟

٢- ئایا مەبەست بەم حەڵاڵ کردنە لە ئایەتەکەدایە هەر بۆ خواردنە، یان گشتی یە لە خواردن و هەر سوود وەرگرتنێکی تر و کەفارەت و بژاردنی هەیە؟

٣- ئایا گیانلەبەری ئاوی ئەوەیە کە لە ئاودا بژی ئیتر با لە وشکانیشدا بژی، یان ئەوەیە کە هەر لە ئاودا بژی وەك کۆمەڵێ ئەفەرمون، کە یەکێکیان ئیمامی شافیعی یە؟

٤- ئایا مەبەست بە وتەی ﴿صَيْدُ﴾ دەست کەوتی گیانلەبەری ئاوی یە بە شێوەی گشتی، یان هەر ئەوەیە کە بە راو و کردەوە دەست کەوت ببێ و مەبەست بە وتەی ﴿وَطَعَامُهُۥ﴾ خواردنە و راناوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ وتەی ﴿صَيْدُ﴾ وەك هەندێ ئەفەرمون، یان مەبەست خوراوە و راناوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ وتەی ﴿ٱلْبَحْرِ﴾ وەك هەندێکی تر لەسەر ئەوەیە؟ یان مەبەست بە ﴿صَيْدُ﴾ گرتن و راو کردنە و راناوی ﴿وَطَعَامُهُۥ﴾ ئەگەڕێتەوە بۆ دەست کەوتی راوەکە، ئینجا بە پێی ئەو رایانە تەفسیری ئایەتەکە بکەین.

ئەوانەی کە لایان وایە ئایەتەکە ئاراستەی هەموو بڕواداران کراوە، گیانلەبەری ئاوی ئەبڕن بەسەر ئەوانەدا کە هەر لە ئاودا ئەژین و ئەفەرمون: مەبەست حەڵاڵ کردنی خواردنە و هەموو وەرگرتنێکی تریش بە بێ کەفارەت و بژاردن و مەبەست بە ﴿طعام﴾ خوراوەکەیە کە ئیمامی شافیعی یەکێکە لەم تاقمە، لەسەر رای ئەمانە تەفسیری ئەم ئایەتە بەم جۆرەیە: ئەی بڕواداران حەڵاڵ کراوە بۆتان خواردنی گۆشتی ئەو گیانلەبەرانەی کە هەر لە ئاودا ئەژین، ئێوە بە کردەوەو بە راو کردن ئەیانگرن، خواردنی ئەوانەش کە دەستکەوت ئەبێ بە بێ راو

و کردەوەی ئێوە، وەك ئەوانەی ئەمرن و ئاو ئەیانداتە لا، یان ئاو لێیان ئەنیشێتەوە و ئەکەونە وشکی و ئەمرن، لەسەر ئەم رایە ئەو گیانلەبەرانە ماسی بێت یان هەر گیانلەبەرێکی تر، لەسەر هەر شێوەو شکڵێ حەڵاڵن، بە مەرجێك لەئاودا نەبێت نەژی، یان ئەڵێن حەڵاڵ کراوە بۆتان ئەوەیە خواردنی گۆشتیان بە تەڕو تازەیی و خواردنیان بە کۆنی و خوێ کراوی و وشك کراوەیی. ئەوانەی کە لایان وایە ئەم ئایەتە ئاراستەی هەر ئەوانە کراوە کە لە ئیحرامدا بن، مەبەست لە حەڵاڵ کردنی کوشتن و گرتنیانە، ئیتر بۆ خواردن یان بۆ هەر مەبەستێکی تر، مەبەست بە ئاوی ئەوەیە کە لە ئاودا بژی و زاوزێ و نیشتەجێ بوونی لە ئاودا بێ، ئیتر لە وشکیشدا بژی یان نا، مەبەست بە ﴿طعام﴾ خواردنە، یان مەبەست بە ﴿صید﴾ راوکردنە و مەبەست بە ﴿طعام﴾ خواردنە، لەسەر ئەم رایە ئەڵێن: ئەی کەسانێ کە وان لە ئیحرامدا حەڵاڵ کراوە بۆتان دەستکەوت راو کردنی ئاویی بە بێ گوناهو بە بێ کەفارەتدان، حەڵاڵ کراوە بۆتان ئەوانەیان کە ئەخورێن، واتە حەڵاڵە بۆتان راو کردن و گرتنی هەموو گیانلەبەرە ئاویی یەکان، خواردنی ئەوانەیان کە گۆشتیان ئەخورێ، ئەو گۆشت خوراوانەش بەلای ئیمامی حەنەفی یەوە هەر بریتی یە لە ماسی، ئیتر بێجگە لە ماسی هیچ گیانلەبەرێکی تری ئاویی خواردنی حەڵاڵ نییە با ژیانیشی هەر لە ئاودا بێت، ئەو ماسی یەی کە حەڵاڵە ئەبێ لە خۆیەوە نەمردبێ بە بێ هۆیەکی ئاشکرا، بەلای ئیمامی ئەحمەدەوە هەموو ئاوی یەکان ئەخورێ بێجگە قوڕباق و تیمساح، بەلای ئیمامی مالیك و(ئیبن و ئەبی لەیلا) وە هەموو ئاوی یەکان ئەخورێن بە تێکڕایی، بەلای کۆمەڵێکی ترەوە هەر گیانلەبەرێکی ئاوی وێنەی لە وشکیدا نەخورێ وەك سەگ و بەرازی ئاوی، ئەویش ناخورێ و هەرچی وێنەی نەبێ یان وێنەکەی بخورێ ئەویش ئەخورێ، یان ئەڵێن ئەی ئەوانەی کە وان لە ئیحرامدا حەڵاڵ کراوە بۆتان راو کردن و خواردنی هەموو گیانلەبەرە ئاویی یەکان بە تێکڕایی، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی ئەو حەڵاڵ کردنە و ئەفەرموێ: ﴿ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ ﴾ لەبەر سوود پێگەیاندن و خۆشی پێدان بە ئێوەی نیشتەجێ و بەوانەی کە

سەفەرین و گەڕۆکن، ئەم رایانە کە هاتوون لەلایەن زانایانەوە باسمان کردن هەموو ئەگونجێن و دەست ئەدەن،

**﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًاۗ﴾ حەرام كراوە لەسەرتان نێچیری كێوی و وشكی تا لە ئیحرامدا بن، هەروەها تا لە خاكی پاكی حەرەمدا بن، واتە دروست نییە بۆ ئەو كەسەی كە لە ئیحرامدا بێت، یان لە خاكی حەرەمدا بێت گرتن و كوشتنی نێچیری كێوی و وشكی ئیتر چ گۆشت خوراو و چ گۆشت نەخوراو بێجگە لەو گیانلەبەرانەی كە لە پێشەوە باسمان كردن لە تەفسیری سەرەتای ئایەتی(٩٥) دا، ئینجا ئەگەر یەكێ لە ئیحرامدا نەبێ و لە خاكی حەرەمدا نەبێ و نێچیرێ بگرێ، ئایا دروستە دەرخواردی كەسێكی بدات كە لە ئیحرامدا بێت یان لە خاكی حەرەمدا بێ، وە دروستە بۆ ئەمیش ئەم گۆشتە بخوات؟ ئەوە مەسەلەیەكە دووبەرەكی زانایانی تێدا هەیە، كەواتە با سەرنجی كتێبەكانی ئەوان بدرێ هەركەس هەركامی بەدڵە بەو جۆرە بكات، لەپاش ئەو حەرام كردن و حەلاڵ كردنە، ئینجا هەستی لە خواترسی ئەبزوێنێ لە دەروونا و پرسیار و حیسابی رۆژی دوایی بیر ئەخاتەوە تا بەندەی خوا بە سۆزو پەرۆشەوە پێشوازی فەرمانەكانی بكات بە باشی گوێرایەڵ و مل كەچ بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لەو خوایەی كە هەر بۆلای ئەو كۆ ئەكرێنەوە لە رۆژی دواییدا، ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ هۆی ئەو قەدەغە و حەرامكردنانە و ئەفەرموێ: ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ﴾ كەعبە كە ماڵێكی پیرۆزی رێزدارە خوا گێڕای بە هۆی راگیر بوونی كارو بار و پێك هاتنی بەرژەوەندی و سوودی مەردومان لە جیهان و لە رۆژی دوایی یاندا لە سەردەمی نەفامی و پێش ئیسلام، لە چەرخی ئیسلام پاش هاتنی ئیسلام خوا گێڕای بە شوێنی كۆبوونەوە و كۆنگرەیەكی ساڵانەی گشتی جیهانی، كە مەردومان لە هەموو وڵات و ناوچەكانی جیهاندا بەشدار بن تیایاندا، كۆبوونەوە و كۆنگرەی یەككگرتن و یەكێتی و دۆستایەتی و ئاشنایی و كۆمەكی و دەستەبەرەیی، گێڕای بە بازاڕ و فرۆشگایەكی گشتی، گێڕای بە شوێنی خواپەرستی یەكی زۆر گەورە و گرنگ كە تاقانەیە و دیاری یە لەناو هەموو جۆرە عیبادەت و خواپەرستی یەكانی تردا، چونكە شوێنی حەج كردنەكە بە یەكجار خواپەرستی یەكی گیانی و لەشی و ماڵییە. پیت و سوود و قازانج و بەرهەمی ئەو ماڵە بەفەرە هەر زۆر زۆرە. وەك ئامارژەم كرد بۆ**

زۆریـان لـه سـورەتی(الحـج) دا کـه لـه پـێش ئـەم سـورەتەدا تەفـسیرم کـردووە، هـەروەها لـه سورەتی(البقرة) و(آل عمران) یشدا دەست نیشانم کردووە بۆ هێندێ لەوانە، لەبەر ئەوە بە پێویستم نـەزانی لێـرەدا درێـژە پێـدان لـەو بارەیـەوە، بـەس لێـرەدا دەسـت نیـشان ئەکـەم و سـەرنج رائەکێشم بۆ شتێکی زۆر گـرنگ کـە هـەموو جیهـان و جیهانیـان هەمیـشە پێویـستن پێی، بە تایبەتی جیهانیانی ئەمڕۆی پڕ لـە بێ ئارامی، جیهـانی یـانی دامـاوی سـەرگەردان بەهۆی ئاژاوە و دوژمنایەتی و کوشتن و بڕین و جەنگەوە، ئەو شتە زۆر گرنگەش ئەمەیە کە خوا ئـەو شوێنە پیرۆزەی گێڕاوە بـە ناوچـەی ئـارام و ئاشـتی تـا ئـەو رادەیـەی کـە هەرکـەس بگات بە بکوژی کوڕ و باوکی، نابێ بە هیچ رەنگ دەستی بۆ درێژ بکات، ئینجا ئەو ئارامی و ئاشتی یە نەك تەنها بۆ ئادەمی و مرۆڤ، بەڵکو گشتی یـە بـۆ پەلـەوەر و گیانلەبەرانی تـریش بێجگە لە هێندێ لە گیانلەبەران کە دژو دوژمنی هـەموو گیانلەبـەرێکن، بەڵکو گشتی یـە بـۆ دارو درەختەکانیش، ناوچەی ئاوا پڕ لە پیت و فەڕە و هەموو کەس پێویستی پێـی هەیـە تـا فێـری ئـارامی و ئاشـتی نانـەوە بـبن و نرخـی ئـارامی و ئاشـتی و ئاشـتی نانـەوە بـزانن و بحەوێنەوە پێی و رزگار ببن لە بێ ئارامی و داچڵەکان و بیم و تـرس. پێغەمبـەری ئـازیز(ﷺ) وێنەی ئەو ناوچە پیرۆزەی بڕیـار دا لـە شـارە بەفەڕەکـەی خۆیـدا، وەك لـە چـەند حەدیـسێکدا هـاتووە، یـەکێ لەوانـە حەدیـسێکە کـە ئیمـامی عـەلی ئەفـەرموێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرموی: مەدینـە حەرامـە، لـە(عیرەوە تـا فـور) واتـە رێـزدارە و قەدەغەیـە دەسـت درێـژیی تیایانـدا بـە وێنەی مەککە، خوای گەورە هەرچۆن ئەو ماڵە بەفەڕەی گێڕا بـە ناوچـەی ئـارامی و ئاشـتی و بـێ بـاکی، گێـڕای بـە بەربەسـت و بەرهەڵـست، هـەروەها بەرهەڵـست و بەربەسـتی دانـا لـە کاتیشدا، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ﴾ مـانگی بەڕێزیـشی گێڕاوە بـەهۆی راگیر بـوون و پێك هاتنی سوود و بەرژەوەندی مـەردومان، واتـە ئـەو چـوار مانگـە:(ذی القعدة، ذی الحجة، محرم، رجب)، ئەوەتا جەنگ و کوشتاری تیا قەدەغە کراوە تەنانەت لـە سـەردەمی نەفامیـشدا لەو چوار مانگەدا وازیان ئەهێنا لە جەنگ و کوشتار و تاڵان و داگیر کـردن، لـەو ماوەیـەدا بـە بێ باك و بیم و بە ئارامەوە ئەگەڕان بە ناوچەکانیاندا، مەترسـی یـان نەئـەکرد لـە بـاوك و کـوڕ کوژراوەکانیان کە دەست درێژیی بکەن بۆ بکوژەکانیان، کەواتە ئەوەش هەلێکی چاك بوو کـە خوا داینا بۆ ئارامی و حەوانەوەی مەردومان بۆ فێر بوون و رام بوون لەسەر ئارامی و ئاشتی و خۆگرتنەوە لە خراپەکاری،

وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾

---

**﴿وَٱلْهَدْىَ﴾ ئەو حوشتر و وڵاخ و ماڵاتانەی کە ئەیان ناردن بۆ مەککە تا لەوێ سەری ببڕن و گۆشتەکانیان بدرێ بە هەژار و بێ نەوایان، بەرەڵا ئەکران و هیچ کەس دەستی بۆ درێژ نەئەکردن، تەنانەت ئەگەر کەسێك لە برسا دەماری جومگەی بجوییایە دەستی نەئەبرد بۆ ئەوانە و نزیکیان نەئەکەوتەوە، وەك(قتادة) ئەفەرموێ، کەواتە لە لایەکەوە بەوە خواپەرستی ئەکرا، لە لایەکی ترەوە برسی پێ تێر ئەکرا، وەك لە هەمان کاتدا بەوە مەردوم فێر ئەکرا و رام ئەکرا لەسەر کۆتایی هێنان و دوورکەوتنەوە لە دەست درێژیی و خراپەکاری ﴿وَٱلْقَلَٰٓئِدَ﴾ ئەم وتەیە بە دوو جۆر تەفسیر کراوە:**

**١- ئەو حوشترانەی کە بە نیشانەیەکی تایبەتی دیاریی ئەکران و رەوانە ئەکران بۆ مەککە کە لەوێ سەربڕرێن بۆ هەژاران، لەسەر ئەم رایە جۆرێکە لە پێشووەکە کە باس کرا، جوێ کراوەتەوەو بە تایبەتی باس کراوە لەبەر بەنرخی و گرنگی ئەم جۆرەیان.**

**٢- ئەو شتانەی کە ئەکران بە نیشانە و ئەیانکردنە ملی خۆیان و حوشترەکانیان بەهۆی ئەوەوە هیچ کەس دەست درێژیی لێ نەئەکردن لە چون و گەڕانەوەیان لە حەج، وەك(قتادة) ئەفەرموێ: کەسێك بچوایە بۆ حەج ملەوەنێکی لە موو ئەکردە ملی بەهۆی ئەو نیشانەوە هیچ کەس دەست درێژیی بۆ نەئەکرد، کاتێ لە حەج ئەگەڕایەوە خۆی نیشانە دار ئەکرد بە شتێ لە دارو درەختی مەککە، بەهۆی ئەوەوە بە بێ باك ئەگەڕایەوە بۆ ناو ماڵ و مناڵی و هیچ کەس لافەی نەئەکرد، ئەفەرموێ: ئەوانە چەند بەربەست و بەرهەڵستێك بوون خوا هێشتبونی یەوە لەناو مەردومانداا لە سەردەم و چەرخی نەفامیدا، ئەوەیان لەناودا مابوویەوە بە کەلەپوور لە ئایینی حەزرەتی ئیسماعیلیەوە(علیه السلام)، ﴿ذَٰلِكَ﴾ خوا ئەوەی کرد و ئەو بەربەستانەی دانا ﴿لِتَعْلَمُوٓاْ**

﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە بزانن کە خوا ئەزانێ و ئاگایە بە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ خوا زاناو ئاگایە بە هەموو شتێ بە ئەوپەڕی زانین و ئاگاداری، واتە ئەو یاسا و بڕیارانە کە خوا داینان و هۆی راگیر بوونی کاروباری مەردومانە و مایەی پێك هێنانی بەرژەوەندی یانە نیشانە و بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر زانین و ئاگاداری خوا بە هەموو شتێ، چونکە بە بێ ئەو زانینە تێرو تەواوە هەرگیز ناگونجێ دانان و داهێنانی ئەو یاسا و بڕیارە وردو پڕ سوودانە کە سەراسەر دوورخەرەوەی زیانن لە بەندەکان، راکێشەرو بەدی هێنەری فەڕو سوودن بۆیان لە هەردوو جیهاندا، دەی بەهۆی ورد بوونەوە و بیر کردنەوەی ئێمەش لەو کردەوە و بڕیارە بەرز و گرنگانە ئێمە زانا و بڕوادار ئەبین بەو زانین و ئاگاداری یە فراوان و بێ سنوورەی خوای پەروەردگاری میهرەبان، ئینجا باسی حەرام و حەلاڵەکان دوایی ئەهێنێ بە ترساندنمان لە تۆڵە و سزای خوا لەگەڵ ئومێد و چاوەڕوانی لێ بوردن و میهرەبانی یەکەی ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بزانن کە خوا تۆڵەی زۆر بە تینە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ خوا لێ بوردەی میهرەبانە، کەواتە هەرکەس ژیر و دانا بێت خۆی ئەپارێزێ لە شکاندنی سنوورەکانی خوا، بەڵکو لە نزیك کەوتنەوەیان، بە سۆزو پەرۆشەوە ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو فەرمانبەریی خوا ئەکات، لەگەڵ ئەو ترساندن و ئومێد پێدانەدا دەست نیشانمان بۆ ئەکات بەوەی هیچ بڕو بیانوویەك نی یە بۆ بەندەی تاوانبار و خۆی دووچاری سەرەنجام و بەرهەمی کردەوەی خراپی خۆی ئەبێ و هیچ کردەوەیەکیش ناشاردرێتەوە، کەواتە با خۆمان بگرینەوە لە خراپە و بە هەموو هێز پەلاماری چاکە بدەین و ئەفەرموێ: ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ﴾ فروستادەکەی خوا هیچی لەسەر نییە بێجگە لە راگەیاندن ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ﴾ خوا ئەزانێ و ئاگایە بە هەرچی ئێوە دەری ئەخەن و هەرچی ئەیشارنەوە، ئینجا بە بۆنەی باسی حەرام و حەلاڵەوە دەست نیشان ئەکات بۆ ترازوویەك کە موسڵمان بیگرێ بەدەستەوە و هەموو نرخدار و بێ نرخێکی پێ دیاری بکات.

قُلْ لَا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠٠) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ (١٠١)

---

**﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بە هەرکام لە ئوممەتت بڵێ: ﴿لَا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ﴾ یەکسان نییە و وەك یەك نییە پیس و پاك ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ﴾ هەرچەند سەرت سوور بهێنێ و پێخۆشحاڵت بکات زۆری پیسەکە، چونکە سەرەنجام و پاشە رۆژی پیسەکە زۆر بەدو خراپە، بەرهەم و سەرەنجام و پاشەڕۆژی پاکەکە زۆر چاکە، کەواتە پیسەکە هەرچەند ماوەیەك زۆر و خۆش و ئارام دەر بێت، دوا رۆژەکەی کە بەدو تاڵە شیرینی و خۆشی یەکەی لەبیر ئەباتەوە، بەڵام پاکەکە هەرچەند کەم و کوڕی تیا بێت، بەرهەم و سەرەنجامە چاکەکەی هیچ نیشانە و دروشمێکی کەم و کوڕی یەکەی ناهێڵێ، کەواتە هەرکەس ژیرو تێگەیشتوو بێت هەرگیز بە زۆریی پیسەکە ناخەڵەتیّ و باوی نادا بەسەر پاکەکەدا، ئەم فەرمودەیە هەرچەند بە بۆنەی باسی حەرام و حەڵاڵەوە هاتبێ بەڵام سنووری فراوان ترە لەوە و هەموو پاك و پیسێکی گیانی و لەشی ئەگرێتەوە، هەموو پاك و پیس و چاك و خراپ ئەگرێتەوە، هەرچۆنێ حەڵاڵ و حەرام یەکەم و سەردەستەیە لەم شوێنەدا، ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ کەواتە بترسن و خۆتان بپارێزن لە خوا ئەی خاوەن ژیریی یە راستەقینەکان، خۆتان بپارێزن بە دوور کەوتنەوە لە هەموو پیس و خاوەن پیسی یەکان، بە وەرگرتن و هەوڵ دان بۆ هەموو پاکێتی و پاکەکان و هەرگیز هەڵنەخەڵەتێن بە زۆریی پیس و قەبارەو رووکەش و رواڵەتی خەڵەتێنەری، بەڵکو بگەن بە ئامانج و بە خێرو خۆشی هەردوو جیهان، ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە کۆمەڵی موسڵمانان بۆ تەمێ کردن و پەروەردە کردنیان، فێری شەرم و ئەدەبیان ئەکات لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەم رەنگە جۆرە پرسیارێکی لێ ئەکەن کە پێویست نەبێ کە لەوانەیە دەرکەوتنی شتێك بێت کە مایەی ریسوا بوون و بێ ئابروویی بێت، یان بەهۆی ئەو پرسیارەوە زیادە ئەرکێك پێویست بکرێت لەسەر پرسیار کەرو مەردومانی تر ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ پرسیار مەکەن لە چەند شتێك کە ئەگەر ئاشکرا بکرێن بۆتان**

و وەلاّم بدرێنەوە ناڕەحەتتان ئەکەن ﴿وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ﴾ ئەگەر پرسیار بکەن لێیان کاتێ کە قورئان ئەهێنرێتە خوارەوە، واتە لە کاتی بوونی پێغەمبەر لەناوتاندا ئاشکرا ئەکرێن بۆتان، واتە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەن ناڕەحەتیان ئەکەن، یان مەبەست بە ڕستەی پێشوو جڵەوگیریی یە لە پرسیار کردن لە هەر شتێك کە بە هیچ جۆر باسی نەهاتبێ نە لە قورئان و نە لە حەدیسدا، مەبەست بە ڕستەی دووەم پرسیار کردنە لە شتێك کە قورئان پێی هاتبێ، بەلاّم مەردوم وەریان نەگرتبێ و تێنەگەیشتبن بە جوانی، دیارە پێویستە پرسیار کردن لە شتێ وا تا وەرگیرێ و بزانرێ چۆن ڕەفتار بکرێ، کەواتە ڕستەی دووەم بۆ ئەوە هاتووە کە بەهۆی ڕستەی یەکەمەوە گومان نەبرێ کە هەموو پرسیارێك ناڕەوایە و نابێ بکرێ، ئینجا لەسەر ئەم بارە گرێیەك پەیدا ئەبێ، گرێیەکەش ئەمەیە: بە ڕواڵەت ڕاناوی ﴿عنها﴾ ئەگەڕێتەوە بۆ وتەی ﴿أشیاء﴾ کەواتە ئەبێ پرسیار لەو شتانە قەدەغە بێت بە پێی ڕستەی یەکەم و ڕەوا بێت بە پێی ڕستەی دووەم، دەی چۆن قەدەغەیش و ڕەوایش ئەبێ؟!

بۆ کردنەوەی ئەم گرێیە دوو شت وتراوە:

١- ڕاناوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ جۆری ئەو شتە قەدەغە کراوانە بۆ عەینی ئەوانەی کە لە ڕستەی یەکەمدا وتراون، واتە هەرچەند دوو شتی جیاوازن، بەلاّم یەك شتن لەم بارەیەوە کە هەرکام پرسیار لێکراون، جا بە پێی ئەو یەکێتی یە ڕاناوەکە گەڕاوەتەوە بۆ ئەو شتانەی کە باس کراون.

٢- کاتی قەدەغە و ڕەوادانەکە جیاوازە، واتە قەدەغەیە لە پێش هاتنی قورئان و باس کردنی قورئان بۆ ئەو شتانە و ڕەوایە لە پاش هاتنی قورئان و باس کردنی قورئان بۆیان. ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا﴾ خوا بورد لەو پرسیارانەی لەوەو پێش، چاوپۆشی کرد و لێی نەگرتن، واتە ئەو پرسیارانە هەرچۆنێ لەوانە بوون کە ناڕەحەتتان بکەن، هەروەها گوناهیش بوون، چونکە بێ شەرمی نیشان ئەدەن دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) و هۆی دڵگرانی ئەو بوون، هەرچەند پرسیارەکانتان بەو جۆرە بوون، بەلاّم خوا بورد لەوانەی پێشوو، کەواتە کۆتایی بێنن و مەگەڕێنەوە سەر وێنەی ئەو جۆرە کارانە، هۆی ئەو چاوپۆشی و لێ نەگرتنەش ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ﴾ خوا زۆر لێ بوردە و سڕەرەوە و داشاردەری گوناهو خراپەی بەندەکانی یەتی ﴿حَلِيمٌ﴾ زۆر لەسەرخۆ و پەلە نەکەرە لە تۆڵە سەندندا، ئینجا با چەند ریوایەتێك بهێنین کە هاتوون لە تەفسیری

ئایەتەکەدا تا بەهۆی ئەوانەوە تێ بگەین لە جۆری ئەو پرسیارانەی کە مەبەستن لە ئایەتەکەدا:

أ- حەدیسێك کە(ترمزي و دار القطني) ئەیهێنن لە ئیمامی علی یەوە - خوا لێی رازی بێت - کاتێك کە ئایەتی پێویست کردنی حەج هاتە خوارەوە مەردومان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لە هەموو ساڵێکدا پێویستە؟ ئەویش بێ دەنگ بوو، ئینجا دووبارەیان کردەوە، ئەویش فەرموی: نەخێر. ئەگەر بم وتایە بەڵێ پێویست ئەبوو، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە،(دار القطني) ئەم حەدیسە بە درێژتر ئەهێنێ لە(ئەبو عیاض) ەوە و ئەویش لە(ئەبو هورەیرە) ەوە و ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ).

ب- ئیمامی موسلیم حەدیسێ ئەهێنێ لە سەحیحەکەیدا لە(أنس) ەوە - خوای لێ رازی بێت - کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: سوێند بەخوا پرسیاری هەرچیم لێبکەن وەڵامتان ئەدەمەوە تا لەم شوێنەدا بم کە وەستاوم، ئینجا پیاوێك هەستا و وتی: ئایا شوێنی من کوێیە؟ ئەویش فەرموی: ئاگر، ئینجا عبدالله ی کوڕی حوذافە هەستا و وتی باوکی من کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرموی: باوکی تۆ حوذافەیە. ئینجا دایکی فەرموی ئایا نەترسای لەوەی دایکت کاری خراپی کردبێ، وەك ئافرەتەکانی سەردەمی نەفامی تا بەهۆی ئەوەوە دایکت بێ ئابڕوو بکەیت لەبەرچاوی مەردوم؟ ئەویش وتی سوێند بەخوا ئەگەر دای بنامایە بە هینی بەندەیەکی قولەڕەش خۆم بە هینی ئەو دائەنا. لە ریوایەتێکی تردا(ئیبن و جەریر) ئەیهێنێ لە(ئەبو هورەیرە) وە - خوا لێیان رازی بێت - جارێك پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەوە هات بە خەشمناکی یەوە، وا رووی داگیرسابوو هەتا دانیشت لەسەر دوانگە - مینبەر -، ئینجا پیاوێك هەستا و چوو بۆلای و وتی من لە کوێ ئەبم، ئەویش فەرموی: لە ئاگردا ئەبی، ئینجا یەکێکی تر وتی باوکی من کێیە؟ ئەویش فەرموی: باوکی تۆ حوذافەیە، ئینجا عمر هەستا و وتی بڕوامان هەیە و رازین کە خوا پەروەردگارمان بێت و ئیسلام ئایینمان بێت و محمد(ﷺ) پێغەمبەرمان بێت و قورئان پێشەوامان بێت، بەڕاستی ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا گەل و کۆمەڵێکین تازە لە نەفامی و بت پەرستی یەوە هاتووین، خوا باشتر ئەزانێ کە کێ باوکمانە، ئەفەرموێ: ئینجا خەشم و رقەکەی نیشتەوە و ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

ت- (مجاهد) لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی کەسانێ کە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی(بحيرة) و(سائبة) و(وصيلة) و(حام) ەوە، ساعیدی کوڕی حوبەیش لەسەر ئەمەیە و ئەفەرموێ: نابینی کە بە دوای دا ئەم ئایەتە هاتووە لە ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ﴾،هەروەها چەند ریوایەتێکی تریش هاتووە لە هەموو ئەو ریوایەتانەوە وەرئەگیرێ و دەرئەکەوێ شێوەو جۆری ئەو پرسیارانەی کە لەم ئایەتەدا جڵەوگیریی کراوە لێیان، بە کورتی هەموو پرسیارێکی بێجێ و بێ مەتڵەب ئەگرێتەوە، ئینجا وێنەیان بۆ ئەهێنێتەوە بۆ ئەو جۆرە پرسیارانە لەلایەن گەلە پێشووەکانەوە کە کاتی خۆی کردیان و سەری لە خراپی یەوە دەرچوو، ئەفەرموێ: ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ﴾ بێگومان ئەو جۆرە پرسیارانەیان کرد کۆمەڵ و تاقمانی تر پێش ئێوە ﴿ثُمَّ أَصْبَحُوا بِهَا كَافِرِينَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە گەڕان بە بێ بڕوا بەهۆی ئەو پرسیارانەوە.

چەند رایەك هەیە لەبارەی مەبەست بەو کۆمەڵ و تاقمەوە هێندێکیان باس ئەکەم کە بەهێزترن:

١- لە(ئیبن و عەباس) ەوە - خوا لێیان رازی بێت - ئەوانەن کە داوایان کرد لە حەزرەتی عیسا کە خوانیان بۆ بێتە خوارەوە لە ئاسمانەوە.

٢- بەلای هێندێکەوە گەلەکەی موسان(علیە السلام) کە داوایان کرد لێی کە خوایان نیشان بدات، یان رێکە رێك و گیر و گرفتیان لە سەربڕینی وڵاخەکەدا کرد تا خوا قورس و گرانی کرد لەسەریان.

٣- بەلای هێندێکی ترەوە گەلەکەی(صالح) ە(علیە السلام) کە داوای حوشترەکەیان لێکرد بە شێوەی موعجیزە مەبەستەکەیان بەدی هات و لەپاشان سەریان بڕی.

٤- بەلای(مقاتل) ەوە مەبەست هەر ئیسرائیلی یەکانە کە داوا و بڕو بیانووی زۆریان هەبوو لە پێغەمبەرەکانیان، ئینجا کاتێ بۆیان جێبەجێ ئەکرا بێ بڕوا ئەبوون پێیان و سەرکێشی یان ئەکرد.

چەند حەدیسێکی سەحیحیش ئەهێنن کە رێك و پێکن لەگەڵ باس و مەبەستی ئەم ئایەتە و ئایەتی پێشوودا:

أ- پێغەمبەر(ﷺ) جارێ فەرموی بە هاوەڵەکانی لێم گەڕێن و پرسیار مەکەن تا من لێتان گەڕێم، واتە هەرچیم پێ راگەیاندن بە بێ گیرو گرفت و لێکۆڵینەوە وەری گرن و گوێرایەڵی بکەن، چونکە ئوممەتەکانی پێش ئێوە لەناوچوون و تیا چوون هەر بە هۆی پرسیاری زۆر و دووبەرەکی و سەرپێچی یان لە فەرمانی پێغەمبەرەکانیان.

ب- جارێکی تر فەرموی: بێگومان خوا چەند شتێکی پێویست کردووە لەسەرتان و زایەیان مەکەن و بەجێیان بێنن، چەند سنوورێکی داناوەو دیاریی کردووە مەیان شکێنن و تێپەڕ مەکەن لێیان، چەند شتێکی قەدەغەو حەرامکردووە، کەواتە نەیان کەن و بێ دەنگ بووە لە چەند شتێك لەبەر میهرەبانی پێتان، نەك لەبیری چووبێ، کەواتە پرسیاریان لێمەکەن.

ت- فەرموی: تاوانبارترینی موسڵمانان کەسێکە کە پرسیار بکات لە شتێك کە حەرام نەبووبێ لەسەر موسڵمانان. ئینجا حەرام بکرێ لەسەریان بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە، لە پێشەوە گوتمان کە(مجاهد) لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت ئەکات، هەروەها(سەعیدی کوڕی جوبەیر) یش هەر هاتووە کە یەکێ لەو شتانەی کە پرسیاریان ئەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەم(بحيرة) و(سائبة) و(حام) و(وصيلة) یە بوو، جا ئەگەر ئەو ریوایەتە راست بێت، ئەوا پەیوەندی ئەم ئایەتەی کە دێت شتێکی ئاشکرایە و پەیوەندی تەواوی هەیە بە ئایەتی پێشەوە، ئەگەر راست نەبێت ئەوا هەر پەیوەستی بەهێزی هەیە لە دووبارەوە:

یەکەم: لە ئایەتی پێشوودا بەرگری کرد لە باس و پرسیارێکە بێ سوود و بێ هودەیە و داوا نەکراوە لە مەردومان لێکۆڵینەوە لێیان، ئینجا لەم ئایەتەدا جڵەوگیریی ئەکات لەوەی شتێ بگرنە گەردن و بڕیاری بدەن لەسەر خۆیان کە پێویست نەکراوە لەسەریان و داوای شتی وایان لێ نەکراوە.

دووەم: لە ئایەتی رابردوودا بە توندی جڵەوگیریی کرد لە حەرام کردنی ئەو شتانەی کە حەڵاڵن، ئینجا لەم ئایەتی داهاتووەدا بە تایبەتی ئەم چوار جۆرە حەڵاڵە ئەهێنێ کە لە سەردەمی نەفامیدا حەرامی یان ئەکردن لەسەر خۆیان، دەم کوتیان ئەکات و بە بێ بڕوا و درۆزن و نەفامیان دائەنێ،

مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾

**ئەفەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ﴾ چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی ئەم چوار شتەوە، یەكێ لەوانە ئەهێنین كە زۆربەی لەسەرە:**

**١- (بَحِيرَةٍ): ناوە بۆ حوشترێك كە(٥) سكی بكردایە و پێنجەم نێر بوایە، ئەو كاتە گوێچكەیان لەت ئەكرد و بەرەڵایان ئەكرد و قەدەغە بوو سواری پێ كردنی و لەسەر ئاو و لەوەڕ دەر نەئەكران بە ئارەزووی خۆیان، سەر نەئەبڕران و تووك و خوری یان لێنەئەكرایەوە، شیر و ماستەكەیان تایبەتی ئەكرا بۆ بتەكان و هیچ كەس نەی ئەخوارد و هیچ سوودێكیان لێ وەرنەئەگرت، دیارە بت هیچ ناخوات، كەواتە بۆ بتەوانەكان ئەبوون.**

**٢- (سَآئِبَةٍ): حوشترێك بوو كە خاوەنەكەی ئازادی ئەكردو قەدەغە بوو هیچ سوودێكی لێ وەرگیرێ وەك(بحیرة) ئەویش لەبەر ئەوە بوو دەسكی بكردایە و هەموویشی مێینە بووایە، یان ئەوە بوو خاوەنەكەی ناساغ بوایە یان بچوایە بۆ سەفەرێ ئەیگوت ئەگەر چاك ببمەوە یان لە سەفەرەكەم گەڕامەوە حوشترەكەم ئازادو سەربەست بێت، ئینجا لەپاش چاك بوونەوە یان گەڕانەوەی ئەو حوشترەی بەو جۆرە لێ ئەكرد.**

**٣- (وَصِيلَةٍ) حوشترێك بوو كە یەكەم و دووەم سكی مێینە بووایە، ئینجا سەریان ئەبڕی بۆ بتەكانیان یان بێچووە ماڵاتێكی نێر بوو كە دایكەكەی بە دووانە بزایە و ئەوی تریانی مێینە بووایە ئەو كاتە ئەو نێرەیان سەر نەئەبڕی بۆ بتەكانیان كە ئەگەر تەنیا بووایە سەریان ئەبڕی بە پێی باوی خۆیان كە مێینەی تەنیایان ئەهێشتەوە بۆ خۆیان و نێری تەنیایان ئەكرد بە قوربانی بتەكانیان و نێری دوانەیان ئەهێشتەوە.**

**٤- (حَامٍ): حوشترێكی نێربوو كە لە پشتی ئەو دە سك پەیدا ببوایە.**

ئەم چوار جۆرە چوار پێ یانە قەدەغە و حەرام ئەکردن بە نەفامی و بەدەم بڕ، ئیتر ئایا بە ناوی خواوە حەرامیان ئەکردن و ئەیانگوت خوا قەدەغەی کردوون، خوا فەرمانی پیا داوین بەوە وەك لە ئایەتی ترەوە وەرئەگیرێ ئەوەش بەو بۆنەوە کە لە نەوەی ئیبراهیمن و لە شەریعەتی ئیبراهیمەوە ئەو قەدەغە کردنە هاتبێ یان بەو ناوەوە نەبووبێ و هەر بڕیارێکە خۆیان لەلایەن خۆیانەوە دەری ئەکەن، بە هەرکام مەبەست بووبێ ئەوا خوا دەم کوتی کردن و بە درۆی خستنەوەو فەرموی خوا بڕیاری نەداوە و نەیگێڕاوە بە شتێکی شەرعی نە(بحیرة نە سائبة نە وصیلة نە حام) بێگومان هەرکەسیش بڕیارو باوەڕی دژی بڕیارو شەرعی خوا بێ، یان درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێ ئەو کەسە بێ بڕوایە و لە ئیسلام و ئایینی خوا دەرئەچێ، وەك لێرەشدا ئەم فەرمودەیە ئەیگەیەنێ و دەست نیشانی بۆ ئەکات. ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ﴾ بەلاّم ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە درۆ بەدەم خواوە هەڵئەبەستن ﴿وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ زۆربەیان ژیر نین و نازانن کە ئەوە دەست هەڵبەست و درۆیە و بەناوی خواوە ئیتر ئایا مەبەست بەم زۆربەیە ئەمانەی سەردەم و چەرخی پێغەمبەر بن(ﷺ)، مەبەست بە بێ بڕوا و دەست هەڵبەست کەران باوك و باپیر و پێشووەکان بێت، یان مەبەست بەوان سەرۆك و زاناکانی یەکەم جاریان بن کە لە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل لایانداو ئەو جۆرە شتە پڕو پووچەیان داهێنا بەناوی خواو بە دەم خواوە وەك(عەمری کوڕی عامری خوزاعی) یان(عەمری کوڕی لوحەی کوڕی قمعە) کە پێغەمبەر(٢) ئەفەرموێ بینیم ریخۆڵەی رائەکێشا لەناو ئاگردا، چونکە یەکەم کەس بوو کە ئەم لادانەی کرد، مەبەست بەمان ژێر دەستەو شوێن کەوتووەکانی ئەوان بن وەك(قتادة و شەعەبی) ئەفەرمون کە ئەو شوێن کەوتوانە ئەوانەی دوای سەردەم و چەرخی پێغەمبەریش ئەگرنەوە، بە هەرکام ئەگونجێ و ناڕێکی تێدا نییە، بێگومان ئەوانەی ئەم چەرخی دوایی یە لەسەر ئەو باوەڕو کردەوەی پێشووانە بوون،

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُوا۟ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ

**کەواتە ئەمەش هەر ڕێك و ڕاستە کە هەر دەربارەی ئەمان ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ کاتێ کە بگوترێ پێیان ﴿تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ وەرن بۆ لای ئەو قورئانەی کە خوا ناردی یە خوارەوە بۆلای ئەو نێرراوەی کە ئەم قورئانەی بۆ هات، وەرن بۆلای ئەم دوانە تا دەرکەوێ بۆتان هەموو حەلاڵ و حەرامێك و بڕوا هەر بەمان بێنن و هەر شوێنی ئەمان کەون، کاتێ کە ئەوەیان پێ بگوترێ و ئەو ڕێگە ڕاستەیان نیشان بدرێ ﴿قَالُوا۟﴾ ئەڵێن : ﴿حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ بەسمانە ئەوەی کە دەستمان کەوتووە و زانیومانە باوك و باپیرمانی لەسەر بووە، واتە لانادەین لەوەی ئەوانی لەسەر بووە و هەر ڕێو ڕێبازی ئەوان ئەدەینە بەر: ئەو سەر لێ شێواوانە شوێنی شتێ ئەکەون کە بەندە دایهێناوە بۆیان، شوێنی شتێ ناکەون کە پەروەردگاری بەندە بۆی داناون و ناچن بە دەم بانگەوازی ڕزگار بوون لە بەندەیی بەندە، ڕازین و باوی بەندەیی ئەدەن بەسەر بەندەیی خوادا، جا لەبەر ئەوە بۆ سەر سوڕهێنان و سەرزەنشت کردن ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەکات: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ ئایا ئەوەی باوك و باپیریان بەسیانە و هەر شوێنی ئەوە ئەکەون، با باوکو باپیریان هیچ شتێکیان نەزانی بێ و ڕێنموونی یان وەرنەگرتبێ و نەکەوتبنە سەر ڕێی ڕاست؟ واتە ئەبێ هەر پەیڕەوی زانا بکرێ کە لەسەر ڕێی ڕاستە نەك نەفام و نەزان کە گومڕا و سەرگەردانە، وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان بۆ کرد، مەبەست بەم فەرمودەیە سەرزەنشت و لەکەدار کردنی ئەو شوێن کەوتوانەیە، کەواتە ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ کە دروستە لادان لە شەرعی خوا و شوێن کەوتنی هەرکەسێکی تر کە زانا بێ بێجگە لەوەش نەزانین و نەفامی و لادان و ترازان لە ڕێی ڕاست و کەوتنە ناو چاڵی گومڕایی سیفەتێکی هەمیشەیی و دامەزراوە بۆ هەرکەسێك لابدا لە شەرع و بەرنامەی خوا و پەیڕەوی شەرعی خۆی بکات یان شەرعی هەر کەسێکی تر بێجگە لە شەرعەکەی خوا، ئیتر هەرچەند خۆی بە**

زاناو لێزان و کار دروست سەیر بکات و دابنێ و لاف هەر پلەو پایە و رادەیەك لێبدات بۆ خۆی یا بۆ ئەو کەسەی کە پەیڕەوی ئەکات! بەڵێ کاری ئەم ئادەمی یە بەم جۆرەیە: هەرکەسێك بە رێکی دامەزرێ لەسەر ئەو سروشتە پاکەی کە خوا بەخشی بەم ئادەمی یە، ئەو کەسە بە جوانی خوای خۆی ئەناسێ و تەنیا ئەو ئەکات بە پەرستراو و پەروەردگاری خۆی، بە سۆزو پەرۆشەوە دان ئەنێ بە بەندەیی خۆی بۆ تاکە خواکەی، هەر بۆ بەرنامە و شەرعەکەی ئەو مل کەچ ئەبێ، دژی هەر پەرستن و بەندەیی یەکیترە، کەواتە هەر لەو تاکە خوا شەریعەت و بەرنامە وەرئەگرێ، هەرکەسێك بترازێ لەو سروشتە پاکە بە سەرگەردانی و گومڕایی ئەسوڕێتەوە لە تاریکی نەفامیدا، رێزی ئادەمێتی خۆی لەبیر نامێنێ و بێبەش ئەبێ لە ئازادی و سەربەستی و ئەبێ بە بەندەی ئەڵقە لە گوێی دروست کراوێکی بێ دەسەڵاتی وەك خۆی یا پەست تر و بێ نرخ تر لە خۆی! نەفامی و نەزانی بریتی نییە لە چەرخ و ماوەیەکی دیاریی تایبەتی، بەڵکو هەر بریتی یە لە لادان لە بەرنامە و شەریعەتی خوا ئیتر لە هەر شوێن و وڵاتێ و لەناو هەر گەل و کۆمەڵ و چینێك!!

لەپاش ئەوەی باوو حاڵ و وتەی بێ بڕوایانی روون کردەوە، ئینجا لایەك ئەکاتەوە بۆلای بڕواداران و دڵنیا و دڵ ئارامیان ئەکات بەمەی کە بە وتارو کرداری بێ بڕوا و تاوانباران ئەمان زیانبار نابن بە مەرجێ هەڵسن بە ئەرك و پێویستی سەرشانی خۆیان، خۆیان جوێ بکەنەوە لەوان، لەناو خۆیان هەڵسن بە یەکێتی و دەستە بەرەیی و ئامۆژگاری و رێنموونی یەکتر، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ بنوسێن بە نەفسی خۆتانەوەو وازی لێمەهێنن و پارێزگاری بکەن لە خراپەکاری و گوناهو تاوان، واتە هەرکامتان هەمیشە خەریکی خۆتان بن بە چاك کردن و پاراستنی لە گوناهو بێ شەرعی، بە هەڵسان بە ئەرکی سەرشان و ئەوەی داوا کراوە لێی، یان هەمووتان ئەی گەل و کۆمەڵی بڕواداران هەمیشە خەریکی خۆتان بن و بنوسێن بە گەل و کۆمەڵی خۆتانەوە بە پارێزگاری یەکێتی و راستی و دەستە بەرەیی خۆتان و یارمەتی دانی یەکترو کۆمەکی کردن لەچاکەوخواپەرستیدا، بەبەهێزکردنی دۆستایەتی وخۆشەویستی ناوخۆتان و پچڕان و دوورکەوتنەوەیان لە هەر پەیوەندی و پەیوەستی یەکی ناشەرعی لەگەڵ بێگانەدا،

﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ واته بەو جۆرە بن و ئیتر باكتان نەبێ، چونكە ئەو كەسەی كە گومڕا بووە لای داوە لە ڕێی ڕاست زیانتان پێ ناگەیەنێ كە ئێوە ڕێنموونی وەرگرن و لەسەر ڕێی ڕاست بن، یان ئەگەر ئێوە بەو جۆرە خەریك بن بە خۆتانەوە ئەوەی كە گومڕایە زیانتان پێ ناگەیەنێ كاتێ كە ئێوە ڕێنموونی وەرگرن و لەسەر ڕێی ڕاست بن، وتەی ﴿یضركم﴾ هەڵئەگرێ(مرفوع) بێ هەڵیش ئەگرێ(مجزوم) بێ، وەك زانایان ئەفەرمون، جا لەسەر رای یەكەم ئەو ڕستەیە عیللەت و هۆیە، لەسەر دووەم وەڵامی شەرتە، لەبەر ئەوە بەو دوو جۆرە تەفسیرم كردووە، ئینجا بەڵێن و هەڕەشە ئاراستەی بڕواداران ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەتان ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجاهەواڵتان پێئەدا لەو ڕۆژی گەڕانەوەدا بە هەر كردەوەیەك كە كردووتانە لەم جیهانەدا، بە گوێرەی ئەو كردەوانە پاداشت و تۆڵە ئەبێ بەو جۆرو شێوەی كە خوا خۆی ئەزانێ.

چەند كەسێك لە كۆن و تازەوە كەوتونەتە هەڵەیەكی گەورە لەم ئایەتەدا، بەم ڕەنگە گومانیان وا بردووە كە ئەم ئایەتە وا ئەگەیەنێ فەرمان بە چاكە و جڵەوگیریی لە خراپە پێویست نییە و هەركەس خۆی چاك بكات ئیتر هیچی لەسەر نی یە، بەڵام هەر لە كۆن و یەكەمجارەوە جێنشینی یەكەم و یاری غار دەم كوتی ئەو كەسانەی كرد و گومانەكەیانی بە ناهەق و ناڕەوا دەركرد،(ئیبن و جەریر) لە(قەیسی كوڕی ئەبو حریمە) ئەگێڕێتەوە كە ئەفەرموێ: ئەبوبەكر- خوای لێ ڕازی بێت - چووە سەر مینبەرەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا لە پاش سوپاس و سەنای خوا فەرموی: ئەی خەڵكینە ئێوە ئایەتێك لە نامەی خوا ئەخوێننەوە و وای دائەنێن كە ئەو ئایەتە ڕوخسەتێكە بۆتان و ڕێتان ئەدا كە هەڵنەسن بە فەرمان دان بە چاكەو جڵەوگیریی لە خراپە ئەو ئایەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ سوێند بەخوا خوا لە نامەكەیدا ئایەتی لەمە بەتین تری نەناردووە سوێند بەخوا ئەبێ فەرمان بدەن بە چاكەو جڵەوگیریی بكەن لە خراپە یان خوا داگیرتان ئەكات بە تۆڵەیەك لەلایەن خۆیەوە. لە ڕیوایەتێكی تردا كە خاوەنەكانی(سنن) ئەیهێنن بەم جۆرەیە، فەرموی: ئەی مەردومەكان ئێوە ئەم ئایەتە ئەخوێننەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾... ئێوە لە غەیری جێگەی

خۆیدا دای ئەنێن، من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە کە ئەی فەرمو: بەڕاستی مەردومان کاتێ بێ شەرعی یان بینی و نەیان گۆڕی نزیکە خوا تۆڵەیەکیان بدات بەسەردا کە گشتی بێبۆیان، هەروەها بە چەند ریوایەتێکی تریش هاتووە،(عبدالله ی کوڕی مبارك) – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە بەهێزترین ئایەتە لە پێویست کردنی فەرمان بە چاکەو جڵەوگیریی لە خراپە، چونکە خوا فەرمان بە هەموو بڕواداران ئەدات کە پارێزگاری هەموو بڕواداران بکەن، واتە مەبەست بە ﴿ أَنفُسَكُمْ ﴾ هەموو بڕوادارانە کە هەموو وەك یەك لەش وان و پارێزگاری هەر یەکێکیان بۆ یەکێکی تر وەك پارێزگاری نەفسی پارێزەرەك وایە، ئەو پارێزگاری یەش بە ئامۆژگاری یەکتر ئەبێ و هاندانی یەکتر بۆ خێرو چاکە و جڵەوگیریی بێزراندنی یەکتر لە تاوان و خراپە.(حوذەیفەو سەعیدی کوڕی موسەیەب) و چەند کەسێکی تر تەفسیری ﴿ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ﴾ ئەکەنەوە بە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە، بێگومان ئەگەر ئەو رستەیە نەبڕین هەر بەسەر ئەوەدا – وەك ئەو کۆمەڵە بڕیویانە – شتێکی روون و ئاشکرایە کە فەرمان بە چاکەو جڵەوگیریی لە خراپە بەشێکە لەوەی کە ئەو رستەیە ئەیگەیەنێ، چونکە مەبەست بەو رستەیە دەست گرتنە بە ئیسلام و کەوتنە سەر رێگەی ئیسلام بە رێکی، ئەوەش بە بێ هەڵسان بەو فەرمانە بەدی نایەت، هەڵسان بەو فەرمانە بەشێکی گرنگ و گەورەیەتی، تا بەو جۆرە رێك و راست و دڵنیا کەرە یاری غار خوا لێی رازی بێت، بەرگری ئەو گومان و هەڵەی کرد یەکەم جار، ئینجا لەپاش ئەو زانایان بە دوای ئەوەدا هاتن و مەبەست و فەرمودەکەی ئەویان پتەوتر کرد و پەکی ئەو بێ هێزو لاوازانەیان خست کە ئەیانویست و ئەیانەوێ لە پەنای رواڵەتی ئەم ئایەتەدا خۆیان بشارنەوە و بە تەمبەڵی لێی راکشێن و بخەون تا خراپە و خراپەکەران زاڵ ببن و ئایینی ئیسلام نەهێڵن لە ولاتدا. ئێمە ئەمڕۆ زیاتر پێویستمان هەیە بە راست کردنەوەی ئەو هەڵە و گومانە ناڕەوا، چونکە هەڵسان بەو فەرمانە ئەمڕۆ ئەرکی گرانترە و پاڵدەری بەهێزی ئەوێ کە موسڵمانان راپەڕێنێ، بێجگە لەوەش ئەمڕۆ خراپە و خراپەکاران پەرەی سەندووە، پێویستی زیاتر هەیە بە تێکۆشان و بەرگری، بە راستی زۆر جێی سەرسوڕمانە کە چۆن لە موسڵمانەوە ئەو جۆرە گومان و هەڵەیە روو بدات، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە ئەم ئایینە گشتی و هەتا هەتایی یە تا ئەم جیهانە، داواکراوە لەم ئادەمی یە کە بێجگە لەم ئایینە شوێنی هیچ شتێکی تر

نەکەویّ و رازی نەبیّ بە هیچ یاسا و بەرنامە و رژێمێکی تر، داواکراوە لەم ئوممەتە کە پارێزگاری ئەم ئایینە بکەن و ببنە مامۆستای هەموو جیهانیان، بانگیان بکەن بۆ ژێر ئاڵای ئەم ئایینە، بۆ رزگار کردن و دەرهێنانی هەموو لە پەرستنی بەندە بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنیا، بۆ چەسپاندنی خوایەتی خوا لە وڵات و زەوی خوادا، بۆ گێڕانەوەی سەرکێشان و مل پێچی کەران لە ئایین و یاسای خوا و گێڕانەوەیان تەنها بۆلای خواو ئایین و شەریعەتی خوا، بۆ بەدی هێنان و راگیر کردنی شەریعەتی خوا لە ژیان و جیهاندا، شتێکی ئاشکرایە کە ئیسلام بەو جۆرەیە و داوای ئەمانە ئەکات کە ئاماژەمان بۆ کردن، دەی شتێکی ئاشکرایە کە ئەو داوا کراوە بە بیّ هەولّ و تێکۆشان و فیداکاری ناگونجیّ و دەست نادات و بەدی نایەت، هەولّ و تێکۆشان بە شێوەیەکی شیرین ئەگەر گومڕا و لادەرەکان هەر بە ئامۆژگاری و ریّ نیشاندان بگەڕێنەوە بۆ سەر رێگەکەی خوا، بەهێزو فیداکاری کاتیّ کە هێزێکی سەرکێش بە دژی هەڵسیّ و رێبگریّ لە ئایینی خوا و ببیّ بە بەربەست و کۆسپ لە رێی ئایین و شەریعەتی خوادا، ئەمەی کە گوتمان شتێکی زۆر روون و ئاشکرایە لە ئایینی ئیسلامدا، بە پێی قورئان و حەدیس و بڕیاری زانا و پێشەواکانی موسڵمانان، دەی ئایا چۆن ئەو هەڵە و گومانەی کە باس کرا رووی کردووەتە دڵی هێندیّ لە موسڵمانان و جێی بووەتەوە لەو دڵانەدا!! ئینجا دواترین بڕیار لەو بڕیارە شەرعی یانە کە لە سورەتەکەدایە ئەمێنیّ لە بارەی هێندیّ لە مامەڵە و بەسەرهاتی گەل و کۆمەڵی موسڵمان کە ئەوەش ئەمەیە هەرکام لە بڕواداران ئەگەر بە سەفەر چوو بە لایەکدا و ویستی وەسیەتێك بکات پێویستە لەسەر دوو شایەت بگرێت بەو جۆرو شێوەی کە لە ئایەتەکەدا بڕیار دراوە، لەبەر زیادە روون کردنەوە، لە پێشەوە هۆی هاتنە خوارەوەی باس ئەکەین، ئینجا بە کورتی مەبەستی ئایەتەکان باس ئەکەین و لەپاش ئەوە ئەچینە سەر تەفسیرەکەیان.

هۆی هاتنە خوارەوەیان ئەمەیە کە(بوخاری و دارالقطنی) ئەیهێنن لە(ئیبن و عەباس) ەوە -- خوا لێیان رازی بێت – کە ئەفەرمویّ: هاتنە خوارەوە بە بۆنەی(تەمیمی داری و عەدی کوڕی بەددا) وە کە هەردوو نەسرانی بوون و هاتوچۆی شامیان ئەکرد و ئەچوون بۆ مەککە و زۆر ئەمانەوە لەویّ. ئینجا لەپاش کۆچ کردن بۆ مەدینە شوێنی بازرگانی یەکەیان گواستەوە بۆ مەدینە، جاریّ لەویّ دەرچوون بۆ شام و گەنجیّ لە(بنی سهم) کەوتە تەکیان و

لە شوێنێکدا گەنجەکە مرد کە موسڵمانی تیا نەبوو، وەسیەتی کرد بۆیان کە ئەوماڵەی پێیەتی بیدەنەوە بە خاوەنەکەی، ئەوانیش دایاننەوە، جامێکی زیوی تیا بوو گلیان دایەوە و فرۆشتیان بۆ خۆیان، لەپاش سوێند دان و سوێند خواردنیان جامەکە لە مەککە دۆزرایەوە، ئەوانەی کە کڕیبوویان وتیان لە(تەمیم و عەدی) مان کڕیوە، ئینجا دوو کەس لە میرات بەرو خوێشی مردووە کە هاتن و سوێندیان خوارد کە ئەم جامە هینی فلآنە کە مردووە، شایەتی یەکەی ئێمە راست ترە لە شایەتی یەکەی ئەوان و ئێمە دەست درێژییمان نەکردووە، بە چەند ریوایەتێکی تریش هاتووە و هەموو یەك مەبەست ئەگەیەنن، ئەوەی ئەم ئایەتانە ئەیگەیەنن ئەمەیە: ئەو کەسەی کە هەست ئەکات بەوەی کە مردنی نزیکە، ئەیەوێ وەسیەت بکات بۆ کەس و کاری بە ماڵێ کە لە ژێر دەستیدایە، پێویستە ئەو کەسە دوو شایەتی عادلی موسڵمانان ئامادە بکات ئەگەر نیشتەجێ بوو، ئەو ماڵەیان پێبدا بۆ ئەوەی بیدەن بەو کەس و کارەی کە لەوێدا ئامادە نین و بەدیارەوە نین، ئەگەر ئەو وەسیەت کەرە لە سەفەردا بوو، موسڵمانی دەست نەئەکەوت بیکات بە شایەت و ماڵەکەی بداتە دەست، دروستە دوو شایەت بگرێ لە غەیرە موسڵمان، ئینجا ئەگەر موسڵمانان یان کەس و کاری مردووە کە بەد گومان بوون لەو دوو شایەتەدا سوێندیان بدەن بە شێوەیەکی سەخت، بەم رەنگە راگیریان بکەن لە پاش بەجێ هێنانی نوێژێ کە ئەیکەن، بە پێی عەقیدەو باوەڕی خۆیان بۆ ئەوەی سوێند بخۆن بەخوا کە سوێندەکەیان بە راستی یە و بە دوای بەرژەوەندی نە خۆیان نە هیچ کەسێکی تردا ناگەڕێن، هیچیان دانەشاردووە لەوەی دراوەتە دەستیان و کراون بە ئەمیندار بەسەرییەوە، ئەگەر ئاوا نەبن ئەوا تاوانبار و گوناهکارن، هەرکاتێ ئەم دوو شایەتە ئەوەیان کرد ئەوا بڕوایان پێ ئەکرێ و شایەتی یەکەیان ئەبیسترێ و وەرئەگیرێ، ئەگەر دوای ئەوە دەرکەوت کە ئەو دوو شایەتە درۆیان کردووەو گوناهکارن لە شایەتی دانەکەیان داو ناپاکن، ئەو کاتە دوو کەس و کاری مردووەکە کە شایستە تر بن راست ئەبنەوە سوێند ئەخۆن و شایەتی ئەدەن و سوێند ئەخۆن کە شایەتی یەکەی ئەمان راست ترە لە شایەتی دووانە پێشووەکە، بە شایەتی دان و سوێند خواردنی ئەم دوو شایەتە شایەتی دووانە پێشووەکە هەڵئەوەشێتەوە، شایەتی ئەم دووانە وەرئەگیرێ، ئینجا دێینە سەر تەفسیری ئایەتەکان،

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَـٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٍ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَـٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَـٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ١٠٦﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿شَهَـٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ﴾ شایەتی دانی ڕاست و ڕەوای نێوانتان ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ کاتێ کە مردن ئامادەی هەرکامتان بوو بەوەی کە نیشانەی نزیکی هاتنی دەرکەوت ﴿حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ﴾ لەکاتی وەسیەت کردنتان ﴿ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٍ مِّنكُمۡ﴾ بریتی یە لە شایەتی دانی دوو کەسی عادل لە خۆتان، واتە لە بڕواداران وەك زۆربە ئەفەرمون، یان لە تیرەو بەرەو خوێشی خۆتان، وەك هێندێك لەسەر ئەوەن، واتە هەرکام لە ئێوە نیشانەی مردنی دەرکەوت و ویستی وەسیەت بکات با دووکەس لە خۆتان بکات بە شایەت لەسەر وەسیەتەکەی، دیارە کە گیران بە شایەت ئەبێ ئەو شایەتی یە بدەن. ئەگەر ئەو وەسیەت کەرە نیشتەجێ بوو ئەبێ شایەتەکانی لە خۆیان بێت بەو جۆرەی کە گوتمان، ﴿أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾ یان دوو کەسی تر لە غەیری خۆتان، واتە غەیری بڕواداران یان غەیری خزم و خوێش، ئەوەش بە گوێرەی ئەو دوو ڕایەی کە باس کران، ﴿إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەگەر ئێوە بە سەفەر چوون بە وڵاتدا ﴿فَأَصَـٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ﴾ ئینجا بەسەرهاتی مردن دووچارتان بوو و یەخەی پێگرتن بە هاتنی نیشانەو پێشڕەوەکانی، ئینجا تێمان ئەگەیەنێ کە چۆن و لەسەر چ شێوەیەك ئەو شایەتی یە بدەن، ئەفەرموێ: ﴿تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ ڕاگیریان ئەکەن لە پاش نوێژ، واتە نوێژی عەسر وەك زۆربە ئەفەرمون، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) سوێندی(عەدی و تەمیمی) لەو کاتەدا دا، یان نوێژی عەسر، یان نیوەڕۆ وەك(حسن بەسری) ئەفەرموێ، چونکە حیجازی یەکان لەو کاتەدا دائەنیشتن لە دادگادا بۆ بڕینەوەی ئاژاوەو محکمە کردن، یان هەر نوێژێك وەك هێندێ ئەفەرمون، چونکە نوێژ جڵەوگیریی ئەکات لە خراپە و بێ شەرعی، کەواتە زیاتر خۆیان ئەپارێزن لە درۆ و ناهەقی کردن لە شایەتی دانەکەیاندا،(ئیبن و عەباس) – خوا لێ یان ڕازی**

بێت – ئەفەرموێ ئەگەر شایەتەکان موسڵمان نەبوون، مەبەست بەو نوێژە نوێژێکە کە لە ئایینی خۆیاندا هەیە، چونکە هەرکام لەوان رێزی نوێژی خۆیانیان بەلاوە هەیە، کەواتە ئەو نوێژە پاڵدەریان ئەبێ بۆ ئەوەی بە راستی و حەقیانەت بجولێنەوە، ئەو دوو شایەتە لەو کاتەدا راگیر ئەکرێن و داوای سوێندیان لێئەکرێ ﴿فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾ ئینجا ئەوانیش سوێند ئەخۆن بەخوا ﴿إِنِ ٱرْتَبْتُمْ﴾ واتە ئەو سوێند دان و سوێند خواردنەیان پێویستە، ئەگەر گومانتان بوو لە راستی و پاکی یاندا، ئەگەر بەد گومان نەبوون دەربارەیان ئەوا هیچ سوێند دان و سوێند خواردنیان ناوێ، واتە ئەبێ سوێند بخۆن لەسەر راستی و پاکی یان لەوەدا کە ئەیڵێن، ئەبێ لە سوێندەکەیشیاندا ئەم دوو شتە بڵێن:

١- ﴿لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا﴾ ناکڕین بەو سوێندە هیچ بریتی و پول و پارەیەك، واتە سوێندەکەمان ناگێڕین وەك شتومەکێ کە ئەدرێ لەبەر بریتی و دەست کەوێ کە سوودێکی جیهانی پێوەرگیرێ، بە درۆوە سوێند ناخۆین لەبەر ماڵ و دەست کەوتێك کە پێی وەرگرین، یان هەقێك کە بەوە ژێر پێی بکەین، بەڵکو هەرچی راستە ئەوە ئەڵێین، مەبەستمان پێك هێنانی بەرژەوەندی هیچ کەسێك نی یە ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾ ئیتر با شایەتی بۆ دراوەکە خزم و نزیك بێت لێمانەوە.

٢- ﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ﴾ ئێمە ئەو شایەتی یە ناشارینەوە کە خوا پێویستی کردوەو و فەرمانی داوە بە راگیر کردنی بە رێك و راستی، یان ئەو شایەتی یە کە بە سوێند دڵنیاییمان لەسەر کردووە ﴿إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْءَاثِمِينَ﴾ بێگومان ئەو کاتە لەوانە ئەبین کە گوناهبار و هەڵگری باری گوناهن، واتە ئەگەر ئێمە ئەو سوێندەمان بکڕین بە هەر شتێکی ئەم جیهانە، یان درۆ بکەین تیایدا لەبەر سوود و بەرژەوەندی خۆمان یان خزم و خوێشمان، یان شایەتی یەکە بە راستی نەدەین و هەمووی یان هێندێکی بشارینەوە، ئەچینە ریزی ئەوانەی کە هەڵگری باری گوناهن، ئەو دوو شایەتە بەو سوێند و شایەتیدانە ئیتر وازیان لێئەهێنرێ و رێی هیچ کردەوە و قسەو باسێك نامێنێ کە بەکار بهێنرێ لەگەڵیان بە مەرجێ هیچ شتێکیان لێوە دەرنەکەوێ کە بە پێچەوانەی سوێندو شایەتی دانەکەیان بێت.

بەڵام ئەگەر دژو پێچەوانە دەرکەوت ئەو کاتە سوێندو شایەتی یەکەیان هەڵئەوەشێتەوە و رەفتاریان پێ ناکرێ بەم جۆرە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسۡتَحَقَّآ إِثۡمٗا﴾ ئینجا ئەگەر زانراو ئاگاداری پەیدا کرا بەسەر ئەوەدا کە ئەو دوو شایەتە شایستەی گوناه بوون و گوناهبارن لەو سوێند و شایەتی یەی کە هەڵسان پێی بەم رەنگە دەرکەوت درۆو ناپاکی یان – وەك لە مەسەلەکەی عەدی و تەمیمدا، لەپاشدا جامەکە دەرکەوت لێیانەوەو دۆزرایەوە لای ئەو کەسەی کە پێیان فرۆشتبوو یان لەپاش موسڵمان بوونی تەمیم چووە ژێر و راستی گوت – ئەو کاتە دوو کەس نزیکتر بن لە مردووەکەوە لە شوێنی دوانە پێشووەکەدا دائەنیشن بەم رەنگە سوێند و شایەتی یەکە ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەمان و لەپاش سوێندو شایەتی یەکەیان بڕیار دەرئەچێ بە گوێرەی قسەی ئەمان وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا﴾ دوو کەسی تر دائەنیشن لە شوێنی دووانەکەی پێشوودا بۆ سوێند خواردن و شایەتیدان ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ﴾ واتە: لەو میرات بەرو کەلەپوورانەی کە دوو شایەتە پێشووەکە ستەم و دەست درێژیی یان کردنە سەر بە سوێندی درۆ و شایەتی ناهەق، کە ئەو دووانە شایستە تر بوون بۆ شایەتیدان بەهۆی ئەوەی کە مردووەکە کردبوونی بە وەصی و ئەمیندار، یان ئەوان شایستە تر بوون بۆ سوێند دان و سوێند خواردن، چونکە ئەو دووانە لە راستیدا ئەبن بە داوا لێکراو و دان نەنێر بە داوا کراوەکە، میرات بەرەکان ئەبن بە داواکەر، کەواتە ئەمان شایەتی یان لەسەرەو ئەوان سوێند، سوێندەکەی ئەوان ئەدرێت بەسەر ئەماندا، بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، کە مەبەست بە ﴿ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ﴾ دووکەس کە نزیک ترن لە مردووەکە، واتە دوو کەسی تر دائەنیشن لە شوێنی دوو شایەتە پێشووەکاندا، کە لەو کەلەپوور بەرانە بن کە لەناو ئەواندا دوو کەسی نزیک تریان شایستەن بەوەی تەرخان بکرێن بۆ شایەتیدان و بە درۆ خستنەوەی دوو شایەتە پێشووەکە، چونکە شارەزا ترو دڵسۆز تر و نزیکترن، بەم جۆرەیش هەر رێکە و مەبەستەکە ئەدات بە دەستەوە، وەك بە پێی هەموو جۆرە خوێندنەوەکانی تریش تەفسیر کراوەتەوەو مەبەستی رێك و راست ئەدەن، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبە گەورە بەناوبانگەکان بکات، لەسەر هەر بار ئەم دوو شایەتی دەرە شایەتی ئەدەن بە دژو پێچەوانەی دوو شایەتە پێشووەکە کە ستەم و دەست درێژیی یان کرد،

﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

---

**﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ﴾ ئینجا سوێند ئەخۆن بە خوا ﴿لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا﴾ کە بەڕاستی و بێگومان شایەتی یەکەی ئێمە هەق و راسترە لە شایەتی یەکەی ئەوان ﴿وَمَا اعْتَدَيْنَا﴾ ئێمە دەست درێژییمان نەکردووەتە سەر ئەوان بەوەی بە ناهەق تاوانبارمان کردبن، یان لە هەق و راستی تێپەڕمان نەکردووە لەو تاوانبار کردنی ئەوانەدا ﴿إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان ئەو کاتە ئێمە لە ستەم کاران ئەبین، ستەم کار لە خۆمان بەمەی خۆمان ئەخەینە بەر خەشم و تۆڵەی خوا، یان ستەمکار لەوانەی کە مردووەکەمان بە پاك و ئەمینداری داناون، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی ئەم یاسا و بڕیارانەی کە لەم دوو ئایەتەدا هاتن ئەفەرموێ:**

**﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا﴾ ئەوەی کە باس کرا لە داواکردنی سوێند لەو دووانەی کە وەسیەتیان لەلا کراوە، سوێند دانیان بەو توند تیژی یەو لەو کاتە گرنگەدا و بە پێش چاوی مەردومانەوە، ئینجا گێڕانەوەی سوێندو شایەتی دان بۆلای کەس و کاری مردووەکە ئەگەر زانرا دووانە ئەمیندارەکە ناپاکی و کاری خراپیان کردووە لە سوێندو شایەتی یەکەیاندا، ئەو بڕیارانە لەسەر ئەو بارو شێوەیە نزیکتر و شایستە ترە بەوەی کە شایەتەکان هەڵسن بە شایەتی یەکەیان لەسەر بارو رووە راستەکەی و بە بێ گۆڕین و لاری و ناپاکی بەکار هێنان لەبەر خواو لە ترسی سزای خوا ﴿أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ یان بترسن لەوەی کە لە پاش سوێندەکانی ئەمان چەند سوێندێك بگێڕرێتەوە بۆلای کەلەپوور بەران و ئەمان بە ناپاك و تاوانبار دەرکەن و ئابڕوویان بەرن لە بەرچاوی مەردوم، واتە ئەو جۆرو شێوەی کە دانراوە نزیك ترین هۆو رێگەیە بۆ ئەوەی سوێندو شایەتی یەکەیان بەڕاستی بدرێن لەبەر خوا یان لە ترسی ئابڕوو چوون، ئینجا کۆتاتی ئایەت و باسەکە ئەهێنێ بە بانگ کردنێکی گشتی بۆ ترسان و خۆپارێزی لە خوا و چاودێری و ئاگاداری و دەسەڵاتی خوا، بۆ گوێ رایەڵی فەرمانەکانی، چونکە خوا رێنموونی ئەو کەسانە ناکات کە لا ئەدەن لە رێی خوا بۆ هیچ خێرو چاکەیەك، ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن و بترسن لە خوا ﴿وَاسْمَعُوا﴾ ببیسن**

فەرمانەکانی خوا و تەمێ و ئامۆژگاری یەکانی بە بیستن و وەرگرتن و گوێرایەڵی ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ خوا ڕێنموونی گەل و کۆمەڵێك ناکات کە سەرپێچی بکەن و دەرچن لە سنووررو ڕێگەی خوا.

ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە – وەك لە پێشەوە باسکرا – دەربارەی(تەمیمی داری و عەددی) یەوەو بە گوێرەی دەقی ئەم ئایەتانە ڕەفتار لەگەڵ ئەو دووانەو کەس و کاری ئەو کەسەی کە ئەو دووانەی کرد بە ئەمیندار و ئەو وەسیەتەی لاکردن،(تەمیم) لەپاش ئەو ڕووداوە موسڵمان بوو، ئینجا لەپاش پێغەمبەریش ڕووداوێکی تری وا ڕوویداو هەر بە پێی دەقی ئەم ئایەتانە ڕەفتار کرا، وەك(ئیبن و جەریر) ریوایەتەکەی ئەهێنێ لە(شەعبی) یەوە کە ئەفەرموێ: پیاوێك لە موسڵمانان لە – دقوقا – دا ئەکەوێتە مردن و هیچ کەس لە موسڵمانانی دەست ناکەوێت کە بیکات بە شایەت لەسەر وەسیەت کردنەکەی، ئینجا دوو پیاو لە نامەداران ئەکات بە شایەت، ئەفەرموێ: ئەو دووانەش دێن بۆ کوفە بە کەلەپوور و وەسیەتەکەیەوە بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری – خوای لێ ڕازی بێت – کە لەوێ حاکم ئەبێت و ئەو هەواڵەی پێ ئەدەن ئینجا ئەبو موساش ئەفەرموێ: ئەمە کارێکە کە لە پاش ئەوەی چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی نەداوە، ئینجا بە پێی ئەم ئایەتە بڕیاری دەرکرد بە ئاگاداری موسڵمانان و بە بێ ئەوەی هیچ کەسێك سەری کردبێتەوە لەو کردەوەو بڕیاری ئەبو موسایە – خوای لێ ڕازی بێت – ئیبن و کەسیر ئەفەرموێ: ئیبن و عەباس – خوا لێیان ڕازی بێت – فەرموی: وەك ئێستا بە بەرچاومەوە بێت کە ئەو دوو گاورە هاتن بۆلای ئەبو موسا لە ماڵەکەی خۆیدا، ئینجا ئەویش ئەو نامەی کردەوە کە ئەوان هێنابوویان لەلایەن ئەو موسڵمانەی کە ئەوانی کردبوو بە ئەمیندار، ئینجا بێگومان ئەم سورەتە لە دوا دوایی هاتنە خوارەوەی قورئاندا هاتە خوارەوە ئەوە زانایان ئەفەرمون هیچ ئایەتێکی نەسڕاوەتەوە، کەواتە هیچ کەس هەقی نییە سەر بکاتەوە لەم ئایەتە و هەموو بڕیارەکانی، بەڵکو هەر ڕووداوێکی وا هاتە پێشەوە بە پێی دەقی ئایەتەکە کارەکە ببڕێتەوە، بەم ڕەنگە بڵێ چۆن بێبڕوا ئەکرێ بە شایەت لە کاروباری موسڵماناندا؟ یان چۆن شایەت سوێند ئەدرێ؟ یان داواکەر(مدعی) چۆن سوێند ئەدرێ؟ یان چۆن شایەتی میرات بەر وەرئەگیرێ؟ نابێ هیچ کام لەو پرسیارانە بکرێ، چونکە دەقی قورئان لەم ڕووداوەدا بەم جۆرە هاتووە و ڕەفتاریشی پێ کراوە، کەواتە هەر ڕووداوێکی وا هەرکات هات و لەهەر وڵاتێکدا ڕوویدا ئەم ئایەتانە ئەبن بە چارەسەر بە تایبەتی لەو کات و چەرخەدا لەناو ئەو گەل و کۆمەڵی ئەو چەرخەدا ڕەفتار

کردن بەم ئایەتانە تاقانە چارەسەر بووە، بێگومان ئەمڕۆ و لەناو گەلانی ئەمڕۆدا ئەتوانرێ بە چەند هۆیەکی تر و لە چەند رێگەیەکی ترەوە چارەسەر بکرێ بۆ وێنەی ئەم رووداو و مەسەلەیە، ئەگونجێ لە رێگەی تەلەفۆن و لاسلکی یەوە ئەو وەسیەتە بگەیەنرێ بە جێ و شوێنی خۆی هەر بە قسەو دەمی وەسیەت کەرەکە یان لە رێگەی تەسجیلی دەنگەوە یان لە رێگەی راگەیاندنی بە ئیسنگەر و تەلەفزیون یان لە رێگەی نووسین و مۆر کردن و دانانی مامەڵە لە بانکێکدا بە شێوەی رەسمی.. هتد. ئایا لە ئێستا لە داهاتووشدا لە هیچ شوێن و ناوچەیەك پێویست نەماوە بەو چارەسەرەی کە قورئان هێنای؟ بێگومان هیچ کەس ناتوانێ – ئەگەر رێزی خۆی بگرێ – قسەی وا ناڕاست بکات، بەڵکو هەموو ژیرێك ئەزانێ و ئەڵێ کە ئەم ئایەتانە لەکار نەکەوتوون و هەرگیز لەکاریش ناکەون، چونکە ئەم ئایین و شەریعەتە هاتووە بۆ هەموو ئادەمی لە هەموو ناوچەو چەرخەکانیدا، روون و ئاشکرایشە کە ئێستا گەل و کۆمەڵێکی ئێجگار زۆر ژیانێکی لادێی و کۆچەری و زۆر دوور لە شارستانێتی هەیە، کە هیچ کام لەو هۆ و رێگایانەی تیا دەست ناکەوێ و ناچارە بە گەڕانەوە و بەکارهێنانی ئەو چارەیە کە لەم ئایەتانەدا هات.

دووبارە ئەگەڕێمەوە بۆ سەر قسەکەی یەکەمجار و ئەڵێم ئەم بڕیار و چارەسەرەی ئەم ئایەتانە هێنایان تەنیا و تاقانە بووە بۆ ئەو گەل و کۆمەڵ و چەرخە و لە هەمان کاتدا بە شێوەیەك کە نەهاتووە کە کورت هەڵهێنرا بێ لەوەدا هەتا هەتایە، بە شێوەیەك نەهاتووە کە دژی هیچ چارەسەرێکی تر بێت لە داهاتوودا، بێجگە لەوەی کە گوتمان، ئێستا و لە داهاتووشدا لە هێندێ وڵات و کاتدا هەر ئەوە چارەسەرە، کەواتە هیچ کەس رێی هیچ قسەو وتەیەکی نییە کە لەبەر خۆیەوە بڵێ وەك وڕێنە بکات، ئینجا لە کۆتاییدا بە جوانی ئەزانم دەست نیشان کردن بۆ چەند شتێك کە لەم ئایەتانەوە وەرئەگیرێن:

١- هاندان لەسەروەسیەت کردن وسستی نەکردن تێیدابالەکاتی تەنگی وسەفەریشدابێت.
٢- شایەت گرتن لەسەر وەسیەت لەکاتی نیشتەجێیان لە سەفەردا بۆ ئەوەی پارێزگاری بکرێ و بەجێ بهێنرێ.
٣- تا بگونجێ شایەتەکان موسڵمان بن و عادل و جێگەی بڕوا بن.
٤- گێڕانی غەیری موسڵمانیش بە شایەتی وەسیەت دروستە لە کات و شوێنی خۆیدا.
٥- وتەی شایەتی بەکار ئەهێنرێ بۆ ئەوەی کە داواکەرو داوالێکراو ئەیلێن و هەردوو ئەگرێتەوە.

٦- هەڵبژاردنی هێندە کاتێك کار ئەکات لە دڵ و دەروونـدا بۆ شایەتی دان و سوێند خواردن و سوێند دان شتێکی شەرعی یە بۆ ئەوەی راست بوترێت و درۆ و ناپاکی بەکار نەهێنرێت، هەروەها هەڵبژاردنی هێندێ شوێنی پیرۆز و بەرێز وەك لە چەند حەدیسی سەحیحیشدا دەست نیشان کراوە بۆ ئەوە، جا لەبەر ئەم ئایەت و حەدیسانە کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە دروستە رەقی و توندو تیژیی بەکار هێنان لەگەڵ سوێند خۆردا.(ئیمامی شافیعی) ئەفەرموێ: ئەو رەقی و توندی و تیژیی یە بەکار ئەهێنرێ لە مەسەلەی خوێن و تەلاق و ئازاد کردنی بەندە و ماڵێك کە بگاتە دووسەد درهەم لە کات و شوێندا، بەم رەنگە لە مەککە دا ئەو سوێندانە ئەدرێن لە نێوان روکن و جێی وەستانی حەزرەتی ئیبراهیم دا، لە مەدینەدا لای مینبەر، لە قودس دا لای – صخرة – دا، لە شوێن و وڵاتەکانی تردا لای پیرۆزترین مزگەوت، هەروەها لە کاتیشدا لە رۆژی هەینی و پاش نوێژی عەسر ئەو سوێندانە ئەدرێن.

٧- توندو تیژی بەکار هێنان لە وتەی سوێند خواردنەکەدا بە جۆرێك کە سامناك بێت و بیترسێنێ لە درۆ کردن، وەك لە شێوەی ئایەتەکەوە دەرکەوت، بە تین ترین شێوە ئەوەیە کە لە ئایەتی(لعان) دا هاتووە، کە بە راستی دڵ ئەهێنێتە لەرزە.

٨- ئەو هەواڵ و شایەتی یانەی کە مەردومان ئەیگەیەنن و ئەیدەن هەق وایە وەرگیرێن و بە راست دابنرێن، وەك دەرکەوت لە ئایەتەکەوە کاتێ شایەتەکان سوێند ئەدرێن کە گومان ببێ لە قسەکەیاندا، دیارە بەهۆی شتێکەوە ئەو گومانە پەیدا ببێ.

٩- هەرکەس کرا بە ئەمیندار ئەبێ بە پاك دابنرێ تا دەرئەکەوێ و روون ئەبێتەوە کە ناپاکە، هەروەها بە بێ بەڵگەیەك هیچ کەس بە ناپاك سەیر نەکرێ.

١٠- کاتێ کاربەدەست یا داواکەر و داوا لێکراو گومان دار بوون لە راستی شایەتدا، رەوایە سوێند دانی شایەتەکە.

١١- راست و رەوایە کە موسڵمان نا موسڵمان بکات بە ئەمیندار بەسەر ماڵەوە.

١٢- هەرکەسێك کە کرا بە ئەمیندار دروست و رەوایە سوێند دانی، رەفتار کردن بە پێی سوێندەکەی.

١٣- هەرکەسێك بەهۆی سوێندی کەسێکی ترەوە ماف و ماڵێکی لە دەست دەرچێ و لە پاشدا دەرکەوێ کە ناهەقی لەگەڵ کراوە لەلایەن سوێند خۆرەکەوە، وەك داوا کەری

لێدیێ، دروستە گێڕانەوەی سوێند و سوێند دانی ئەو خاوەن ماف و ماڵە بە دژی سوێند خۆری یەکەمجار، ئەو کاتە بڕیاری ماف و ماڵەکەی بۆ ئەدرێ.

١٤- هەرکاتێ پێویستی هەبوو بە هەڵسانی هێندێ لە کەلەپوور بەران بە کارێك کە پەیوەستی ببێ بە کاری مردووەکەیانەوە ئەبێ ئەوەی کە هەڵئەسێ بەو کارە نزیك تر و شایستە ترینی کەلەپور بەرەکان بێت.

١٥- دروستە و وەرئەگیرێ لە هێندێ کاتدا شایەتیدانی ناموسڵمان لەسەر موسڵمان و رەفتارکردن بەو شایەتی یە.

ئەو هەموو حوکم و بڕیارانە وەرئەگیرێن لەو دوو ئایەتە کورتە، کەواتە با بە باشی بیریان لێبکرێتەوە، ئەندازەیە درێژەمدا بە تەفسیری ئەم دوو ئایەتە تا بە باشی تەفسیر و مەبەستەکانیان روون ببنەوە و وەرگیرێن، چونکە وەك زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: ئەم دوو ئایەتە زۆر رەق و گرانن، هیوادارم کە خوا رێی خستبم لە راستی و مەبەستم پێکابێ، داواکارم کە خوا تەفسیرەکەم سوود بەخش بکات. ئینجا لە دوا دوایی ئەم سورەتە گرنگ و بەفەڕەدا ئەوەی کە ماوە و پێویستە لەسەر عەقیدەو باوەڕی راست ئەهێنێ و سەرنجی بۆ رائەکێشێ، هێندێکی تر لەو لادان و لاڕێی و نالەباری یە راست ئەکاتەوە کە تێکەڵی باوەڕ و عەقیدەی رێك و راستی نەسرانی یەکان کرا، تا وەری گێڕا و دەری کرد لەوەی کە لە ئاسمانەوە هات، دەری کردو وەری گێڕا لەو تاکو تەنیایی یە بێگەردەی خوا کە حەزرەتی عیسا و هەموو پێغەمبەرەکان لە پێش ئەو هێنایان - سەلامی خوا لە هەمووان بێت - لەو سەرچاوە و بنەڕەتە پاك و بێگەردە دەری هێنا بۆ چەند جۆرو شێوەیەك لە بت پەرستی و هاوبەش دانان بۆ خوا کە هیچ پەیوەندی یەکی نییە بە ئایینی خواوە. جا لەبەر ئەوە ئەیەوێ بە روونی خوایەتی و بەندەیی باس بکات لەسەر ئەو بارو شێوە راستەقینەی کە ئیسلام هێنای، ئەو دوو شتە روون بکاتەوە لە ناوبەناوی چەشمەنداز و وێنەیەکی زۆر گەورەو سامناك، کە حەزرەتی عیسا تێیدا بە پێش چاوی هەموو فروستادە و نێرراوەکانی خوا و هەموو ئادەمی یەکانەوە جاڕی تاك و تەنیایی خوا ئەدات و ئەوپەڕی بێزاری دەرئەبڕێ لەوەی کە لە پاش خۆی، خۆی و دایکیان کرد بە هاوبەشی خواو لاف خوایەتی یان بۆ لێدان، بێزاری دەرئەبڕێ و ئەیانخاتەوە بە درۆوە لەناو ئەو گەورەترین کۆڕو کۆمەڵەدا، کە بیر لێکردنەوەیشی هەق وایە دڵ بکەوێتە تەپە تەپ و دەمارەکان بکەونە فڕە فڕ و لەرزە،

ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە ئەی پێغەمبەر کە خوا هەموو نێررا و فروستادەکان کۆ ئەکاتەوە ﴿فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡ﴾ ئینجا ئەفەرموێ پێیان: ئایا چ جۆرە وەڵامێك درانەوە لەلایەن ئەوانەی کە ئێوە رەوانەکران بۆلایان؟ واتە ئایا وەڵام دانەوەی وەرگرتن و بڕوا هێنان و گوێرایەڵی کاتێ کە ئێوە بانگتان ئەکردن بۆ لای خوا یان وەڵام دانەوەی بێ بڕوایی و سەرکێشی لە کاتێکدا ئێوە هەڵسان بە راگەیاندنی تەواو؟ بێگومان خوا لە هەموو کەس ئاگادار تر و زاناترە بە هەموو شت، کەواتە مەبەست لەم پرسیارە دەرکەوتنی جۆری وەڵامەکە نییە، وەك هەموو پرسیارەکانی تری خوا کە مەبەست هەواڵدان و ئاگادار کردنەوە نییە بەسەر پرسیار لێکراوەکەدا، بەڵکو هەر پرسیارێك کە لە لایەن خواوە ئاراستە بکرێ مەبەست شتێکی ترە، جا لێرەدا مەبەست سەرزەنشتی ئەوانەیە کە بڕوایان نەهێناوە و سەرکێشی یان کرد لێیان.

بەڕاستی کارەکە ئێجگار سەخت و سامناکە زۆر زۆر شایستەی بیر لێکردنەوەیە، با بیر بکرێتەوە لەو هەموو نێرراو فروستادانە کە لە جیهاندا هاتن یەك لە دوای یەك و تاك تاك، مەگەر بە دەگمەن، جیاواز بوون لە کات و چەرخدا، لە جێ و شوێن و وڵاتدا، لە تیرەو بەرەدا، لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازییەدا بە یەك بانگ بانگی گەل و ئوممەتەکانیان ئەکرد و بەو جۆرە هاتن و تێپەڕیان کرد هەتا گەیشتە دواترینی هەموان و جێگر و جێنشینی هەمووان کە رەوانە کرا بۆ سەر هەموو جیهانیان هەتا نەمانی جیهان، ئەو هەموو نێرراوانە بەو هەموو جیاوازی یەوە خوا کۆیان ئەکاتەوە لەبەر دادگای خۆیدا، بەو جۆرو شێوەیە کە هەق وایە کە هەر بە بیر لێکردنەوە دڵ بێتە لەرزە و هەموو دەمارەکان بکەونە فرە فڕ، ئەو فروستادانە هەرچەند پایە و پلە بەرز بن، هەرچەند زانا و باخەبەر بن لە ئوممەتەکانیان، بەڵام وان لە حوزوری خوادا، ئەو خوایەی کە ئەوان باشتر ئەیناسن و لە هەموو کەس زیاتر شەرم و سام و بیمی لێئەکەن، زانینەکەشیان سنووری هەیە و لە هێندێ بارو رووەوە و زانین و ئاگاداری یەکەیان هەر بە ئەندازەیە کە کە خوا پێی داون، کەواتە هەر زانینێکیان ببێ وەك هەر نەبێ وایە لەچاو زانینی خوادا لەبەر ئەوە،

قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ

---

**﴿قَالُواْ﴾ له وەڵامدا ئەڵێن: ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ﴾ هیچ جۆرە زانینێك نییە بۆ ئێمە بەوان بە وێنەی زانینی تۆ پێیان، کەواتە چۆن روویان بێ و زاتیان بێ بەم زانینە کەم و کورەوە وەڵامی کەسێك بدەنەوە کە زانینی راستەقینە هەر لای ئەوە، بەم جۆرە(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ رازی بێت – تەفسیری ئەم فەرمودەی کردووەتەوە، ئەم تەفسیرە باشتر ئەچێتە دڵەوە لە چەند تەفسیرێکی تر کە گوتراوە و لە کتێبەکاندا بڵاو بووەتەوە، چونکە ئەم تەفسیرە زۆر رێکە لەگەڵ ئەمەی کە بە دوایدا ئەیهێنن و ئەیکەن بە رابەر لەسەر ئەوەی کە لە وەڵامدا ئەیڵێن: ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ واتە هیچ زانینێك نییە بۆ ئێمەیە بە وێنەی زانینی تۆ، چونکە بێگومان تەنیا تۆ تێرو تەواوی لە زانینی هەموو نهێنی و نادیارەکاندا. ئینجا بە تایبەتی رووی فەرمودە ئەکاتە حەزرەتی عیسا و ئەو چاکە و بەهرە تایبەتی یانەی بیر ئەخاتەوە کە رشتی بەسەر خۆی و دایکیدا، ئەو موعجیزە گەورانەی ئەخاتەوە بەرچاو کە پێی بەخشی بۆ ئەوەی ئەو گەلە بڕوای پێ بێنن، کەچی هێندێ لەوان بە پیس ترین شێوە بڕوایان پێ نەهێنا و خۆی و دایکیان لەکەدار کرد بە پیس ترین لەکە، هێندێ تریان بە پێچەوانەی ئەو تاقمەکەی تر زۆر زیادە رەوی یان کرد لە خۆی و دایکی دا، تا ئەو رادەیە گێڕانیان بە خواو پەرستراوی خۆیان، بە هۆی ئەو موعجیزە گەورانەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە بێگومان خوا ئەفەرموێ: لەو رۆژەدا ئەی عیسای کوڕی مەریەم ﴿ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ﴾ باسی ئەو چاکە و بەهرەی منە بکە بەسەر خۆت و دایکتەوە ﴿إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ کاتێ کە بەهێزم کردی و یارمەتیم دای بە**

فریشتەی سروش کە ناوی(جوبرەئیل) ە ﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ﴾ لەکاتێکدا قسەت لەگەڵ مەردومدا بە تڵفی لە بێشکەدا یان لە کۆشی دایکتدا، وەك خوا ئەفەرموێ، قسەت کرد بەو جۆرەی کە لە سورەتی(مریم) دا باسەکەی دێت، کە ئەو قسە کردنەش پاکی و خاوێنی دایکی روون و ئاشکرا کرد، بە شێوەیەك کە هیچ جۆرە گومانێك نەما کە خوا عیسای پێ بەخشیوە بە بێ باوك وەك بە درێژیی باسەکەی تێپەڕی کرد لە سورەتی(آل عمران) دا ﴿وَكَهْلًا﴾ قسەت لەگەڵ کردن لە کاتی گەیشتنت بەهێزی لەش و ژیریی تەواو، واتە قسە کردنەکەت لەو دوو کاتەدا وەك یەك وابوون بە بێ جیاوازی کە ئەوەش بەهرەیەکی تایبەتی بوو بە حەزرەتی عیساوە(علیه السلام) بۆ هیچ کەسێکی تر نەبووە بەو شێوەیە یان لە کاتی گەورە بوون و رەوانە کردنت بە فروستادەیی کە فەرمان و ئایینی خوات پێ راگەیاندن و بانگت کردن بۆلای خوا کە دیارە ئەم قسە کردنەش چاکەو بەهرەیەکی زۆر گەورەیە و شایستەی باس و بیر لێکردنەوەیە ﴿وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ باسی چاکەی من بکە بەسەرتەوە کاتێ کە فێری خوێندنەوەی نوسراوم کردی یا فێری نووسینم کردی، فێری کار زانی و کاردروستیم کردی، بە جۆرێ توانیت کاروباری فرمانی خۆت ببەی بەڕێوە بە رێك و پێکی. ﴿وَٱلتَّوْرَىٰةَ﴾ فێری تەوراتم کردی کە لە پێش تۆوە هات بۆ ئیسرائیلی یەکان ﴿وَٱلْإِنجِيلَ﴾ فێری ئینجیلم کردی کە نامەی خۆمەو پێم بەخشیت ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِي﴾ باسی چاکەی من بکە بەسەرتەوە کاتێ کە گێرات لە قوڕ قەبارەیەك وەك شێوەو وێنەی پەلەوەر بە مەیل و فەرمانی من ﴿فَتَنفُخُ فِيهَا﴾ ئینجا فوت کرد بەو قەبارە کە لەسەر وێنەی پەلەوەر بوو ﴿فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِي﴾ ئیتر دەست بەجێگەڕا بە گیان لەبەرێکی فڕیدە بە ئیزن و خواهیش و بڕیاری من ﴿وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِي﴾ کوێری تەواو و کوێر کە بە کوێری لە دایك بوو بوو، و بەڵەکت چاك ئەکردەوە بە ئیزن و مەیلی من ﴿وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ باسی چاکەی من بکە بەسەرتەوە کاتێ کە مردووانت دەر ئەهێنا لە گۆڕەکان بە ئیزن و خواهیش و مەیلی من،

وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾

---

﴿وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ﴾ **باسی چاکەی من بکە بەسەرتەوە کاتێ کە بەرگری ئیسرائیلی یەکانم کرد – واتە جوولەکە – لە تۆ کە ویستیان لەناوت بەرن** ﴿إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ **کاتێ تۆ چویت بۆ لایان بەو موعجیزە و بەڵگە ئاشکرا و روونانەوە کە رابەر بوون لەسەر پێغەمبەری و فروستادەیی یەکەت** ﴿فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ **ئینجا ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا لەو ئیسرائیلی یانە گوتیان: ئەوەی کە هێناویەتی هیچ شتێك نییە بێجگە لە جادوویەکی روون و ئاشکرا** ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ﴾ **باسی چاکەی من بکە بەسەرتەوە کاتێ کە خستمە دڵی هاوەڵە تایبەتی یەکانت کە بە دڵ پاك بوون لەگەڵت، لە ئاشکرا و پەنهانیدا خۆشیان ئەویستی، خستمە دڵی ئەوانە** ﴿أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى﴾ **فەرمانم پێدان بەمەی بڕوا بێنن بە من و بە فروستادەکەم، واتە خۆت کە عیسای کوڕی مەریەمی، ئەوانیش** ﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ **گوتیان ئەوا بڕوامان هێنا لەسەر ئەو بارو شێوەی کە خوا ئەیەوێ** ﴿وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ﴾ **تۆ شایەتی بدە بەمەی کە بەڕاستی ئێمە پاك و راستین لە بڕوا هێنانەکەمان دا، یان بە راستی گوێڕایەڵ و مل کەچین بۆ هەر فەرمانێکی خوا.**

**ئەوانە بوون ئەو چاکەو بەهرە گەورە و گرنگانەی کە خوا رشتی بەسەر حەزرەتی عیسادا(علیه السلام) تا ببن بە شایەت و بەڵگەی روون بۆی، کەچی کۆمەڵێکی زۆر لە شوێن کەوتووەکانی زیادە رەوی یان کرد و بەهۆی ئەوەوە لە رێگە راستەکەی عیسا ترازان و ئەو ئایینە پاکەی کە ئەو هێنای بۆیان گۆڕییان بە بت پەرستی و پڕیان کرد لە شتی پڕو پووچ، ئینجا ئەوەتا خوا هەواڵمان پێئەدات کە لە رۆژی دواییدا بە پێش چاوی کۆمەڵی هەرە بەرزو**

هەموو ئادەمی یەوە کە هێندێ لەوان ئەو گەل و کۆمەڵە زیادە ڕەوی کەرەیە، لەو ڕۆژەدا خوا ئەو چاکە و بەهرەیانە ئەداتەوە لە ڕووی حەزرەتی عیسا تا ئەو تاقمە خۆیان ئەوە ببیستن و ببینن، بۆ ئەوەی زیاتر بێ ئابڕوو و ڕیسوا بکرێن و سزای دەروونیشیان زیاتر ببێ، ئینجا بە جوانی ئەزانم دەست نیشان کردن بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە کە پەیوەندییان هەیە بەم سێ ئایەتانەی کە تێپەڕیان کرد:

١- هەرکام لەو چاکە و بەهرەیانەی بە جیاواز و سەربەخۆ نیشاندا بەمەی وتەی(إِذْ أَيَّدتُّكَ) ی لە پێشی یەوە هێنا، بێجگە لە چاك کردنەوەی کوێرو بەڵەك، هۆی ئەوەش زانایان ئەفەرمون ئەمەیە: هەرکام لەوانە زۆر گرنگ ترن و زۆرتر سەرسوڕ ئەمێنێ لێیان و هیچیان بە تێکۆشان و کردەوەی بەندە بەدی نایەت و دەست کەوت نابێ، بۆ وێنە فێر کردن و خوێندنەوە و نووسین بە بێ فێرکەر و مامۆستا بە بێ تێکۆشان و کردەوەی بەندە هەرگیز ناگونجێ، هەروەها بۆ وێنە بەرگری کردنی جوولەکە بەو جۆرەی کە وێنەو شێوەی عیسا بکشێنرێ بەسەر یەکێ لەوان و ئەم بەرز بکرێتەوە بۆ ئاسمان بە هیچ جۆر لە دەسەلاتی هیچ کەسدا نی یە بێجگە لە خوا، ئەم دوانەیان کە لە پێش ڕوونکردنەوەدا لەوانە بوون جێی لێکۆڵینەوە و قسە و باس بن ئەم دووانەم بۆ وێنە هێنا، چونکە ئەوانی تریان هەموو کەس ئەزانێ کە هەر لە ژێر دەسەلاتی خوادان و خەریك بوون و هەوڵی بەندە هیچ کار ناکات لێیان. بەلام چاك کردنەوەی کوێر و بەڵەك لەوانەن بە تیمار و پزیشکی چارەسەر بکرێن.

٢- وتەی(بِإِذْنِي) چوار جار فەرمو دەربارەی ئەو کردەوانەی کە لەسەر دەستی حەزرەتی عیسادا فەراهەم هاتن و لەوانەن کە بە کردەوەی ئەو دابنرێن، تا بزانرێ ئەوانە لە ڕاستیدا کردەوەی خوان و لەسەر دەستی عیسادا دەری خستن، کەواتە ئەو چوار جار گوتنە زیادە سەرزەنشت و دەم کوت کردنیان تیایە بۆ ئەوانەی کە زیادە ڕەوی یان کرد

لە حەزرەتی عیسادا و لە رادەو پلەی خۆی بەرزیان کردەوە، هەرچۆنیٚ باسی ئەم چاکەو بەهرە گەورانە لەو رۆژەدا زیادە ریسوا کردن و شەرمەزار کردن و سزای بەتینی دەروونی یان تیایە بۆ جوولەکە ناپاکەکان کە ئەو هەڵوێستە پیس و بۆگەنەیان بوو دەربارەی حەزرەتی عیسا و دایکی – سەلامی خوا لە هەردوو بێت –.

٣- ئەو کردەوانەی کە لەو رۆژەدا باسیان ئەکات بۆ حەزرەتی عیسا هەموو ئەوانە کردەوەی رابوردون، لەبەر ئەوە بەو جۆرە تەفسیرم کردن، بەڵام بە وتەی حازرو ئامادە نیشانیان ئەدات و ئەیانگەیەنیٚ، ئەوەتا ئەفەرمویٚ: ﴿تکلم، تخلق،... هتد) ئەوەش لەبەرئەوەیەکەوێنەوشێوەی نایاب ودڵرفێنی ئەوکردەوانەئامادەبکات وبیانخاتە بەرچاو وسەرنجیان بۆراکێشیٚ کەئەوەش بەپێی یاساوباوی رەوانبێژی شتێکی گرنگە.

٤- بێگومان یەکەم چاکە کە بریتی بوو لە قسە کردن بە تلفی و لە بێشکەدا هەرچۆنیٚ چاکەو بەهرەیە بۆ حەزرەتی عیسا، هەروەها ئاشکرایە کە چاکە و بەهرەیە بۆ دایکیشی، چونکە گەورەترین بەڵگە بوو لەسەر پاکی و بیٚ لەکەیی ئەو، جا ئەگەر مەبەست بەشدار کردنی حەزرەتی مەریەم بیٚ هەر لەو یەکەم چاکەدا، ئەوا هیچ جێی لێکۆڵینەوە و قسە و باس نییە، ئەگەر مەبەست بەشدار کردنی بیٚ لە هەموو چاکەکانی تریش دا ئەوا ئەڵێین: ئەو چاکانەی کە لەگەڵ حەزرەتی عیسادا کران لە راستیدا چاکەیشە لەگەڵ دایکیدا و دایکی بە چاکەی خۆی دائەنیٚ و پێی شادومان ئەبیٚ هەروەك بە تایبەتی لەگەڵ خۆی کرابیٚ. ئینجا بە بۆنەی ئەو چاکەو بەهرەیانە کە کران لەگەڵ حەزرەتی عیسا و دایکیدا – سەلامی خوایان لێبیٚ – بەو بۆنەیەوە باسی چاکەو بەهرەیەکی زۆر گەورە ئەکات کە خوا بەخشی بە حەزرەتی عیسا بە پێش چاوی خۆی و حەواریەکانەوە،

**ئەفەرمویٚ: ﴿إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە حەواری یەکان گوتیان بە عیسا(علیە السلام) ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ لەسەر ئەم خوێندنەوەیە مەبەستەکە رێك و روونە: واتە ئەی عیسای فروستادەی خوا ئایا تۆ ئەتوانی داوا بکەیت لە پەروەردگارت... بەڵام لەسەر خوێندنەوەی یەکەم کە بەناوبانگە رواڵەتەکەی ناگونجیٚ لەگەڵ بڕواو بڕوادارانـدا، چونکە هەر بڕوادارێك ئەبیٚ بە بێگومان بڕوای هەبیٚ کە خوا توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەر شتێك دا کە خوا خۆی مەیلی بکات، جا لەبەر ئەوە لە رووکەشەکەی لادراوە بۆ مەبەستێك کە بگونجیٚ لەگەڵ بڕوای ئەو بڕوادارانەدا لەبەر ئەوە ئەم چەند بارەی بۆ باس کراوە:**

**أ- مەبەست پرسیار نییە لە توانین، بەڵکو پرسیارەکردن و بەجیٚ هێنان، واتە ئایا پەروەردگارت ئەوەمان بۆ ئەکات؟ کەواتە گومانیان نەبوو لە توانیندا بەڵکو گومانیان لە کردن و بەدی هێنانەکەدا بووە، زۆرجار ئەو مەبەستە نیاز ئەکریٚ لەو وتەیە.**

**ب- مەبەست پرسیارە لە توانین بە پێی داخوازی حیکمەت و کاردروستی، واتە ئایا حیکمەت و کاردروستی خوا رێی ئەوە ئەدات کە خوا شتی وامان بۆ بکات، ئەو کارە دژو پێچەوانەی کاردروستی خوا نییە؟ بێگومان هەر کارو کردەوەیەك بەو جۆرە بێت هەرگیزناگونجیٚ پێی وهەرگیز خوا مەیلی شتی وا ناکات و توانینی رووی تیٚ ناکات.**

**ت- ئەوانە گومانیان نەبووە لە توانینی خوادا، بڕوایان بووە کە خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەر کارو کردەوەیەکدا کە مەیلی بکات، بەڵام مەبەستیان دڵنیا بوون و ئارامی دڵ بووە بە تەواوی، وەك داواو پرسیارەکەی حەزرەتی ئیبراهیم کە لەبەر ئەوە بوو. خاوەنی(کشاف) لەسەر ئەوەیە کە ئەو وتەیە هەر بە پێی رووکەش و رواڵەتەکەی مەبەستە، واتە ئایا پەروەردگارت ئەتوانیٚ ئەوە بکات؟ چونکە ئەو لای وایە کە ئەو پرسیار کەرانە بڕوادار نەبوون لەبەر ئەوە دوو دڵ بوون لە توانینی خواو دەسەڵاتی بەسەر ئەوەدا، چەند شتێکی ئەکات بە بەڵگە لەسەر بیٚ بڕوایی یەکەیان، بەڵام بەڕاستی بەڵگە لەسەر بوونی بڕوایان بەهێز ترە، بە پێویستم نەزانی هێنانی بەڵگەکانی ئەو و بەڵگەکانی دژی راکەی ئەو، چونکە مەبەستێکی سەرەکی نەبەستراوە بە مەسەلەی بڕوا بوون و بیٚ بڕوایی یانەوە،**

أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾

---

**کەواتە پێویست نەبوو ئەو زیادە درێژە پێدانە و لەسەر هەر بار داواکەیان ئەمە بوو ﴿أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ﴾ کە خوا بینێرێتە خوارەوە بەسەرماندا خوانێك لە ئاسمانەوە، وەڵام و بەرپەرچی حەزرەتی عیسایش بەم جۆرە بوو کە خوا ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ عیسا گوتی پێیان لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەم جۆرە پەڵپ و داوایانە ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن بە راستی و بڕوای تێرو تەواوتان هەیە، یان لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی تا خوا میهرەبانیتان لەگەڵ بکات و ئەو لە خوا ترسی یە ببێ بەهۆی گەیشتنتان بە مەبەست و داوا کراوەکەتان، بە هەر بار ئەوان داواکەیان دووبارە کردەوە و هۆ و پاڵدەریان بۆ ئەو داوایە دەرخست بەم رەنگە ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان ﴿نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا﴾ ئەمانەوێ لەو خوانە بخۆین ﴿وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ دڵەکانمان ئارام بگرن بەوە و بە بینینی ئەو شتە کەس نەدیوە ﴿وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا﴾ بزانین کە تۆ راستت لەگەڵ کردین لەوەی پێت راگەیاندین، واتە هەرچەند ئێمە بڕوای رێك و راستمان هەیە، بەڵام ئەمانەوێ بڕواکەمان بەهێز تر ببێ و هیچ جۆرە خەتەرەیەکمان نەمێنێ، چونکە زانینێ کە لەچاو پێکەوتنەوە بێت جیاوازە و بەهێز ترە لە زانینێك کە بە ژیریی پەیدا ببێت ﴿وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ ئەمانەوێ ببین بە شایەت لەسەر بۆ ئەوانەی کە بە دیارەوە نین تا ئەوانەی کە ئامادەیی یان تیایە بۆ بڕوا هێنان بڕوا بهێنن ئەوانەش کە بڕوادارن بڕواکەیان بەهێزتر بێت، لە پاش داواکردنەکەیان وەك حەزرەتی عیسا پێی فەرمون: ئێوە چەند موعجیزەی گەورەتان بینی، کەواتە لە خوا بترسن و ئەم جۆرە پەڵپ و بیانوانە مەگرن، ئینجا ئەوانیش وەڵامیان دایەوە بەوەی کە داواکەمان بۆ ئەوە نییە کە بێبڕوا بین و مەبەستمان پەڵپ و بیانوو گرتن بێ، بەڵکو**

مەبەستمان چوار شتە وەك باس كرا، ئەو مەبەستانە هەرچەند گرنگن، بەڵام ئەوە نیشان ئەدەن كە رادەو پلەیان زۆر جیاواز بووە لەگەڵ رادەو پلەی هاوەڵەكانی پێغەمبەرمان(ﷺ) كە ئەمان بە هیچ رەنگ هیچ جۆرە پەڵپ و بیانوویەكیان نەبووە، سەریان نەكردووەتەوە لە هیچ كارێك كە خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریاندابێ، هێندێ جار پرسیاری لێكردوون كە زۆر ئاشكرا بووە لێیان لەگەڵ ئەوەدا زاتیان نەبووە وەڵام بدەنەوە تا خۆی باسی فەرمووە بۆیان.

ئینجا كە حەزرەتی عیسا(علیه السلام) زانی نیازەكەیان باشە و مەبەستیان تاقی كردنەوەو تەنگەتاو كردن نییە، ئەم نزایەی كرد كە ئەفەرموێ ﴿قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ عیسای كوڕی مەریەم گوتی: ﴿اللَّهُمَّ رَبَّنَا﴾ ئەی خوایە ئەی پەروەردگارمان ﴿أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾ بنێرە خوارەوە و ببارێت بەسەرماندا لە ئاسمانەوە خوانێك كە خۆراكی بەسەرەوە بێت ﴿تَكُونُ لَنَا عِيدًا﴾ ببێ بە جەژن و شادی بۆ ئێمە، وەك ئەگێڕنەوە كە لە رۆژی یەك شەممەدا هاتە خوارەوە كە ئەو رۆژە كراوە بە جەژن لای مەسیحی یەكان، ئینجا فەرموی: ﴿لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا﴾ واتە ببێ بە جەژن و شادی بۆ ئەوانەی ئێستامان و ئەوانەیداهاتوومان، یان ئەوانە كە لە كاتی ئەم نزادا هەن و بڕوادارن و ئەوانەی كە لە پاش هاتنی خوانەكە بڕوا ئەهێنن. ﴿وَآيَةً مِّنكَ﴾ ئەو خوانە ببێ بە موعجیزە و بەڵگەیەكی ئاشكرا كە دێت لەلایەن تۆوە لەسەر دەسەلاتی بێ سنووری تۆ و پێغەمبەرێتی من ﴿وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ رۆزی و بەشمان بدە لەو خۆراكەی كە لەسەر ئەو خوانەیە، یان خوان و خۆراكە كە یان بە شێوەی گشتی تر لەوان، خوایە تۆ باشترینی هەموو رۆزی دەرانی، چونكە خوا داهێنەرو بەخشندەیە بۆ هەرشتێ بەبێ بریتی و هیچ شتێ، لەم نزایەدا ئەو بەندە هەڵبژێرراوە شەرم و ئەدەبی تەواوی بەكار هێنا لەگەڵ خوای پەروەردگاری، ئەوە بوو لە یەكەم جارەوە بانگی لێكرد بەو دوو ناوە گەورە و پیرۆزە، ئینجا داواكەی كرد و ئەوەی كە داوایكرد بە رۆزی دانا كە خوا بە میهرەبانی خۆی ئەیداو دەری بڕی كە ئەم بەندەیە و ئەویش خوای پەروەردگاریەتی، خوای پەروەردگاری نزاكەی وەرگرت، بەڵام نەك هەروا بە خۆڕایی، بەڵكو ئەبێ هەڵسن بە سوپاسی و هەركەس هەڵنەسێ پێی دووچاری سەخت ترین سزاو تۆڵە ئەبێ،

قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ

**وەكو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱللَّهُ﴾ خوا فەرمووی: ﴿إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡ﴾ بەڕاستی من ئەو خوانە ئەهێنمە خوارەوەو ئەیبارێنم بەسەرتاندا ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ﴾ ئینجا هەرکەس بێبڕوا و ناسوپاس بێ لەپاش هێنانە خوارەوەی ئەو خوان و سوفرەیە لە کاتێکدا کە لە ئێوە بێ، واتە هەرکەس لە ئێوە لە پاش ئەوە بێبڕوا ببێ و لە ئایینەکەی پاشگەز ببێتەوە ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بێگومان من سزای ئەدەم بە سزایەك کە سزای هیچ کەس لە جیهانی یانی پێنادەم، وا دەرئەکەوێ مەبەست جیهانی یانی ئەو چەرخ و سەردەمەیە، ئەگەر مەبەست سزای ڕۆژی دوایی بێ، لەبەر رووکەش و ڕواڵەتی(وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ) لە ڕۆژی دواییدا بەرپا ئەبێ دەستەو بەرە تایبەتی یەکانی فیرعەون بخەنە بەتین ترین سزا یان مەبەست جۆرێکە لە سزا کە تایبەتی یە بەوانەوە ئیتر با بەتین تر نەبێ، ئەگەر مەبەست سزای ئەم جیهانە بێ، ئەو کاتە ئەگونجێ کە مەبەست هەموو جیهانییان بێ بێجگە لە ئیسرائیلی، چونکە سزایان بریتی یە لە سڕینەوەی ئادەمێتییان و گێڕانیان بە مەیموون و بەراز کە ئەو سزایە هەر بۆ ئیسرائیلی یەکان بووە، ئینجا زۆربەو جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەو خوانە هاتە خوارەوە و بەڵگەی بەهێزیش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە خوا فەرمووی: ﴿إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡ﴾ هەواڵ و بەڵێنی خوا ئەبێ ڕاست بێت و بەدی بێت،(حسن و مجاهد) لەسەر ئەوەن کە نەهاتووەتە خوارەوە، چونکە کاتێ ئەوانە ئەو هەڕەشە سەختەیان بیست ترسان و گوتیان نامانەوێ و پێویستمان پێی نییە، بەهۆی ئەوەوە نەهاتە خوارەوە، ئەم دووانە دوو بەڵگە ئەهێننەوە لەسەر ڕاکەیان، بەڵام بەرپەرچ دراونەتەوە، پشت هەر بە رای زۆربە و جەماوەر ئەبەسترێ و بە لامەوە پێویست نەبوو زیاد لەمە درێژە دان بەم مەسەلەیە، چونکە لە کتێبە گەورەکانی تەفسیردا باسەکە کراوە، هەروەها درێژەمنەدا بەو هەموو ریوایەت و قسە و باسە کە هاتوون لە بارەی چۆنی یەتی و دیاریی کردنی هاتنە خوارەوەی ئەو خوانە و ئەو خۆراکانەی کە بەسەریەوە بوون، چونکە زانینی ئەو جۆرە شتانە هیچ نرخ و زیادە گرنگی یە نادەن بە باس و مەسەلەکە، ئەگەر پێویست بوایە قورئان**

باسی ئەفەرمو، بێجگە لەوەیش ئەوەندە پڕوپووچی ئیسرائیلیات زۆرە و بڵاو بوونەتەوە، مەردوم دڵنیا نییە بە هیچ کام لەو ریوایەتانە، کەواتە چاك وایە زیاد لەوە نەڵێین کە قورئانەکە فەرمویەتی لەپاش ئەو بەڵێن و هەڕەشەیە ئیتر بیٚ دەنگ ئەبێ و ئەندازەیەکی تر ئەڕوا لەسەر مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتی یەکە، مەسەلەی خوایەتی تاك و تەنیایی خوا کە جاڕی پێئەدا لەسەر زمانی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) کە گەلەکەی لە پاش خۆی سەریان لیٚ تێکچوو لاڤ خوایەتی یان لێدا بۆ خۆی و دایکی. ئەو مەسەلەیە جاڕی پێئەدا لەو رۆژی کۆکردنەوە گشتی یەدا بە پێش چاوی هەمووانەوە لە شێوە پرسیارێکدا کە ئاراستەی حەزرەتی عیسا ئەکریٚ بۆ سەرزەنشت و بیٚ ئابڕوو کردن و بە درۆ خستنەوەی ئەو لاف لێدەرانە کە ئەو گەورەترین گوناهەیان کرد لە جیهاندا، ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە خوا ئەفەرمویٚ ئەی عیسای کوڕی مەریەم ﴿ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ﴾ ئایا تۆ گوتت بە مەردومان: کە من و دایکم دابنێن و بمانگێڕن بە دوو خواو پەرستراوی تر بە بیٚ خوایە کە ناوی(الله) یە و بێجگە لەو؟ واتە ئایا بە قسەی تۆ و لەسەر فەرمانی تۆ ئەو تاوانە زۆر گەورەیان کرد و تۆ و دایکتیان گێڕا بە هاوبەشی من، یان هەر لە خۆیانەوە لایاندا و ئەو ڕێگە چەوتەیاندایە بەر؟ بێگومان خوا لە هەموو کەس باشتر ئەزانیٚ کە عیسا ئەوەی نەگوتووە، بەڵکو هەر ڕێگەی خواپەرستی نیشان داون، ئەوان خۆیان تاوانبارن، کەواتە لە راستیدا ئەم پرسیارە و داوای وەڵام روو ئەکەنە ئەو گومڕایانە، نەك عیسا(علیه السلام)، بەڵام ئاراستە کردنی پرسیارەکە و داواکردنی وەڵامەکەی لە عیسا و شێوەی وەڵام دانەوەکەی عیسا ئێجگار کارو کردەوەکەی ئەوانە سەخت و سامناکتر ئەکات لەو رۆژەدا کە زمان و پێنووسی ئێمە کۆڵ و کولە لە دەرخستنی رادەی سەخت و سامناکی ئەو رۆژەدا، شتێکی ئاشکرایە کە هەر کەسێکی ئاسایش کە سەری لیٚ نەشێویٚ و خۆی بناسیٚ هەرگیز لە رووی نایە و زاتی نییە لاڤ خوایەتی لێبدا بۆ خۆی، چ جای کەسێکی وەك حەزرەتی عیسا کە یەکێکە لە پێغەمبەرە زۆر گەورەکانی خوا، ئەو هەموو چاکەو بەهرە و موعجیزە گەورانەی پێبەخشی هەر لە تلفی یەوەو پێش پێغەمبەرێتی و پاش پێغەمبەرێتی، کەواتە ئەبیٚ حاڵ و باری ئەو هەڵبژێرراوی خوا چۆن بیٚ کاتیٚ ئەو پرسیارە سامناکەی ئاراستە بکریٚ و داوای وەڵامی لێبکریٚ،

قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥۚ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾

---

**جا لەبەر ئەوە بە هەموو بیم و ترس و لەرزێکەوە لە یەکەم جاری وەڵامدا ﴿قَالَ﴾ئەڵێ ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ پاکی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە لەوەی کە هیچ وێنە و هاوبەشێك ببێ بۆ تۆ، یا لەوەی کە من شتی وا بڵێم دەربارەی تۆ یان شتی وا بگوترێ دەربارەت، لە پێشەوە ئەوە ئەڵێ ئینجا چەسپانی ئەکات بە پاك کردنەوەی خۆی و دوور بوونی لە قسەی وا ناڕاست و ناهەق، ئەفەرموێ: ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ﴾ نابێ و ناگونجێ بۆ من شتێ بڵێم کە بە هیچ ڕەنگ هەق نەبێ بۆ من، واتە ئەو وتەو قسە زۆر ناهەقە کە پرسیاری لێکراوەیە، ئینجا خوا ئەکات بە شایەت لەسەر پاکی یەکەی و دووری لەو قسە ناهەقە، ئەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ﴾ ئەگەر من ئەو قسە ناهەقەم کردبێ، ئەوا خوایە تۆ ئەزانیت و زانیوتە، چونکە: ﴿تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي﴾ ئەوەی لای من هەیە تۆ ئەیزانی، یان ئەوەی کە شاراوەیە و لە دڵمدایە تۆ ئەیزانی چ جای ئەوەی کە دەرم بڕیبێ و گوتبێتم، ئینجا کەم و کوڕی خۆی دەرئەبڕێ بەرامبەر بە خوا، ئەوەش نیشانەی بەندەیە، هێندێ لە سیفەت و نیشانەی خوا باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَۚ﴾ من نازانم و بێ ئاگام لەوەی کە لای تۆیە و تۆ ئەیزانی و کەس ئاشنا ناکەی پێی. ئینجا ئەوەی هەردوو ڕستەکە ئەیگەیەنێ ڕوونی ئەکاتەوە بەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ واتە بەڕاستی تەنها تۆ خاوەنی زانینی تەواو و ڕاستەقینەی بە هەموو نهێنی و غەیبەکان کە هێندێ لەو نهێنی و غەیبانە ئەوەیە کە لای عیسایە و دەری نابڕێ و ئەوەیە کە خوا ئەیزانێ و کەسی پێ ئاشنا ناکات. وتەی(نفس) بۆ چەند واتا و مەبەستێك بەکار ئەهێنرێ کە بۆ خوایش ئەبێ و شایانە، بەکار ئەهێنرێ بۆ**

تەنیا مەبەستێك كە شایانی خوا نییە ئەوەش كە لە زمانی كوردیدا بریتیە لە دەروون، جا ئەگەر لە رستەی یەكەمدا بەو جۆرە مەبەست بوو ئەبێ بڵێین: بەكار هێنانی بۆ خوا لە رستەی دووەمدا لە رێگەیەكەوە هاتووە كە لە رەوان بێژییدا پێی ئەگوترێ: ﴿مشاكلة﴾ واتە هاو وێنەیی و هاوبەشی دوو شت لە دیمەن و روالەتی تەنهادا، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴾ تۆڵە و سەرەنجامی خراپە خراپەیەكە بە وێنەی خراپەكە. لە پاش پێشكەش كردنی ئەو سوپاس سەنا گرنگە ئینجا ئەوێرێ و زاتی هەیە باسی ئەوە بكات كە رایگەیاندووە و وتویەتی بە گەلەكەی، ئەوەی كە نەی گوتووە دووری بخاتەوە لەخۆی، ئەفەرموێ: ﴿ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ ﴾ من هیچم نەگوتووە بەوانە بێجگە لەوەی كە تۆ فەرمانت پێداوم بە گوتن و راگەیاندنی ئەوەش كورتەكەی ئەمەیە: ﴿أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ ﴾ كە بپەرستن و گوێرایەڵی خوا بن كە ناوی ﴿الله﴾ یە كە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، واتە ئەوەی كە گوتوومە و رام گەیاندووە هەر بەندەیی خۆم و ئەوانە بۆ خواو پەرستنمانە بۆی. ئینجا خۆی بێ ئاگا و بێ بەش ئەكات لە هەر خراپە و تاوانێك كە لە پاش دەرچوونی خۆی ئەوان كردبێتیان، ئەفەرموێ: ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ ﴾ من بەسەریانەوە چاودێرو ئاگادار بووم تا لەناویاندا بووم و بە پێی فەرمانی رێنموونیم كردوون. ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ ﴾ ئینجا كاتێ كە تۆ منت وەرگرت و بەرزت كردمەوە بۆ ئاسمان هەر تۆ چاودێر و ئاگادار بوویت بە خۆیان و بە بەسەرهاتیان، واتە تا من لەناویان دا بووم بەسەریانەوە بووم ئەمزانی چی یان ئەكرد و چییان ئەگوت و من بانگم ئەكردن و رێنموونیم ئەكردن بۆ ئەوەی كە هەق و راستە و جڵەوگیرییم ئەكردن لە ناهەق و خراپە، بەڵام كە من لەناویاندا نەمام ئیتر نازانم و بێ ئاگام لە كردەوەو بەسەرهاتیان، تۆ خۆت ئەزانی چییان كرد و چییان گوت، خۆت ئەزانی كێ شیاوی یارمەتی بووەو كێ شایستەی لوتف و یارمەتی نەبووە، ﴿وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ تۆ ئاگادار و شایەتی بەسەر هەموو شتێكەوە، هەموو كاروباریان بە دەست تۆیە و هەرچۆنیان لەگەڵ بكەیت خۆت باش ئەزانی و هیچ كەس رێگەی هیچ قسە و باس و رەخنەیەكی نییە،

إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ

---

**﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ﴾ ئەگەر سزایان بدەیت لەسەر لادان و هەڵگەڕانەوەیان لە ئایینەکەیان، ئەوا داد بەکار ئەهێنی و مافی خۆتە و هیچ رەخنەیەك نییە ﴿فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَ﴾ چونکە ئەوانە بەندەی خۆتن و ئەیان ناسی و ئەزانی شایستەی ئەوەن ﴿وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ ئەگەر لێشیان خۆش ئەبی و تاوانەکانیان ئەسڕیتەوە، ئەوە لەبەر بیٚ دەسەڵاتی و دەستە پاچەیی نییە و لێبوردنەکەت بیٚ هودەو لە خۆڕایی نییە ﴿فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ چونکە تۆ زاڵ و بە دەسەڵاتی کاردروستی لێزانی بەسەر هەموو شتێك و لە هەموو کارو کردەوەکانتدا، بە چەند جۆرێکی تریش ئەم دوو رستەیە تەفسیر کراوەتەوەو لەم کاتەدا دڵم بەمە ئارامتر بوو کە نووسیم و بڕوام بەهێزتر بوو پێی، لەبارەی بەکارهێنانی وتەی ﴿تَوَفَّيۡتَنِي﴾ کە رووکەش و رواڵەتەکەی بۆ مراندن بەکار ئەهێنریٚ، واتە کاتیٚ کە منت مراند، لەگەڵ ئەمەدا کۆمەڵ و جەماوەری موسڵمانان لەسەر ئەوەن کە حەزرەتی عیسا(علیه السلام) نەمردووە و لە ئاسماندایە بە زیندوویی و لە پاشان دێتە خوار و لەم زەوییەدا مردن رووی تێئەکات وەك هەموو مرۆڤ و ئادەمی یەکانی تر، پشتیوانی کۆمەڵ و جەماوەریش حەدیسێکی سەحیحە کە بە چەند ریوایەتێك هاتووە، کەواتە پێویستە موسڵمانان بڕوایان پێی ببیٚ لەم بارەیەوە لە تەفسیری ئایەتی(آل عمران) دا کە خوا فەرموی بە حەزرەتی عیسا ﴿يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ﴾ بە پێی فەرمودەی زانایانی ئیسلام چەند راو تەفسیرێکم هێنا کە هیچ گریٚ و دژایەتی نەهێڵن لە دەروونندا، بە پێویستم نەزانی دووبارە کردنەوەی ئەو راو تەفسیرانە لێرەدا، لەبەر ئەوە بیٚ دەنگ بووم لەوانەو هەرکەس ئەیەویٚ با سەرنجی ئەوە بدا کە لە تەفسیری ئایەتی ناوبراودا نووسیومە، بەڵام لێرەدا شتێکی تر ئەڵێم کە لەویٚ نەگوتراوە و بە لایشمەوە بەهێزترە لە هەموو ئەوانەی ئەویٚ، ئەوەش ئەمەیە: کە مردن لە راستیدا بریتی یە لە نەمانی ئەم جۆرە ژیانی ئەم زەوییە و**

نەمانی پەیوەندی بەم ژیان و زەوییەوە، دەی شتێکی ئاشکرایە کە حەزرەتی عیسا(علیه السلام) کە بەرز بووەتەوە بۆ ئاسمان ئەو جۆرە مردنەی بۆ پەیدا بووەو ژیانێکی تری بۆ پەیدا بوو، ئیتر با رۆحە پیرۆزەکەی لە لەشە پاکەکەی جویێ نەبووبێتەوە، ئینجا کاتێ هاتەوە خوار بۆ سەر ئەم زەوی یە خوا وەك ئەوسای پێش بەرزبوونەوەکەی لێبکاتەوەو جۆری ژیانە ئاسمانی یەکەی لابات و بیگۆڕێ بە جۆرە ژیانەکەی کە لەم زەوییەدا بووی، کەواتە راستە بڵێین: مردووەو ناوی بەرین بە مردوو بەم رەنگە ئەم جۆرە ژیانەی کە لەم زەویەدا بوی نەما و زیندووشە بەم رەنگە رۆحەکەی جویێ نەبووەتەوە لە لەشە پیرۆزەکەی، ئێمە نابێ مردن و زیندوویی هەر ئەم بارەی بۆ دابنێین کە باو و ناسراوە لامان لەم زەوییەدا، بۆ وێنە هەموو بڕوادارێك ئەبێ بڕوای هەبێ کە شەهید لای خوا زیندوو بە دەقی قورئان و حەدیس دروست نییە ناویان بەرین بە مردوو لەگەڵ ئەمەدا مردوون بەم جۆرە مردنەی کە باو و ناسراوە لای ئێمەو لەناو ئێمەدا. بەلامەوە ئەمە رایەکی پەسەندە و هیچ گرێ یەکی تێدا نییە و هیچ جۆرە دژایەتی و ناڕێکی ناهێڵێ لەنێوان ئەو هەموو ریوایەتانە کە بە زیندووی دائەنێن و ناوی ئەبەنە رووکەش و رواڵەتی ئەم ئایەتی ئێرە و ئایەتی(آل عمران) کە بە مردووی نیشان ئەدەن و ناوی ئەبەن، لە پاش وەڵام دانەوەی حەزرەتی عیسا بەو جۆرو شێوە نایابە کە تێپەڕیکرد، ئینجا خوا هەواڵ و بڕیارێك ئاراستە ئەکات کە مزگێنی و دڵ ئارام کردنی تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە لەم جیهانەدا راستیان کرد و بەردەوام بوون لەسەر راستی یەکەی خۆیان تا لەم جیهانە دەرچوون، کە حەزرەتی عیسا یەکێکە لە سەر دەستەکانی ئەو راستانە، کەواتە بەم فەرمودە ئەو بیم و ترسە ئەهوەن ئەبێتەوە کە حەزرەتی عیسای داگیر کرد لەو رۆژە سەختەدا بەهۆی ئەو پرسیارە سامناکەی کە ئاراستەی ئەکرێ، ئەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ ﴾ بێگومان خوا ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡ﴾ ئەم رۆژی دوایی یە رۆژی سوود گەیاندنی راستی راستیانە پێیان، واتە ئەمە رۆژێکە کە ئەوانەی لە جیهاندا راستیان کرد و هەر بە راستی لە جیهان دەرچوون، ئەوانە بەهرەمەند ئەبن بە راست کردنەکەی جیهانیان و ئەگەن بە بەرو سەرەنجامی راستی یەکەیان،

لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌۢ ﴿١٢٠﴾

---

**وەك دەست نیشانمان بۆ ئەكات بەوە كە ئەفەرموێ:**

**١- ﴿لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بۆیان هەیە باخات و بەهەشتانێ كە رووبارەكان دێن و ئەچن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ لە كاتێكدا ئەو راستانە ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە هەمیشەیی و بە بێ بڕانەوە هەتا هەتایە.**

**٢- ﴿رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ خوا خۆشنوود و رازییە لێیان كە ئەوە لە هەموو شتێ گەورەترو بە نرخ ترە و هیچ چاكە و بەهرەیەكی تری پێناگات، ئەوانیش خۆشنوود و رازین لە خوای خۆیان، چونكە هیچ شتێكی تر نەماوەتەوە كە ئەوان بە تەمای بن و چاوەڕوانی بكەن، كەواتە ئەو خوا پێداوانە بەهرەمەند ئەبن بە خۆشی و خۆراكی لەش و بە خۆشی و خۆراكی گیان و رۆح كە ئیتر هیچ رادەو پلە و بەهرەیەكی تر نامێنێتەوە كە مەردوم پێی بگات لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ هەر ئەوەیە بەهرەمەند بوونی گەورەو گەیشتن بە ئامانجی گەورە، هێندێ ئەفەرمون، وتەی ﴿ذَٰلِكَ﴾ دەست نیشانە هەر بۆ خۆشنوودی و رەزامەندی خوا كە وەك لە حەدیسدا هاتووە ئەوە لە هەموو شت بەرزتر و گەورەترە بێجگە لەوەی كە قورئان ئەفەرموێ: ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾ كەمێك لە رەزامەندی خوا گەورەترە. بەڵام دەست نیشان بێ بۆ هەردوو بەهرەكە چاكترە، لەسەر هەربار بەهرەمەندی و گەیشتن بە ئامانجی گەورە بەوە ئەبێ كە دووچار بوونی سزا و ئازاریش نەبێ وەك(راغب) ئەفەرموێ، كەواتە ئەوانە یەكەم بەهرەمەندی یان ئەوەیە كە خوا لە ئاگر ئەیان پارێزێ، ئینجا دووەم بەهرەیان ئەوەیە ئەگەن بەو بەهرەیانەی كە لە ئایەتەكەدایە، داواكارین لە پەروەردگاری میهرەبان كە بەشدارمان بكات لەو بەهرەیانەدا - آمین -.**

**ئینجا لە كۆتایی باسەكە و سورەتەكەدا ئایەتێك ئەهێنێ كە زۆر رێك و پێكە لەگەڵ هەموو باس و مەبەستەكانی سورەتەكەدا، ئەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ﴾ هەر بۆ خوایە و تایبەتی یە بە خواوە پادشایەتی و خاوەنی ئاسمانەكان و زەوی و هەرشتێ كە**

لەناویان دایە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێكدا توانا و دەسەڵاتدارە، كەواتە خوایەتی و حاكمێتی و فەرمانڕەوایی تایبەتییە بەو خوایەی كە ناوی ﴿الله﴾ یە بە تاك و تەنیا و بێ وێنە و بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، هەموو ئاسمانەكان و زەوی و هەرچی لەناویان دایە هەموو دروست كراو و بەر حوكم و فەرمانبەر و مل كەچ و گوێ رایەڵە تەنها بۆ ئەو خوایە، كەواتە هەركەس ژیر و تێگەیشتوو بێ ناتوانێ شوێنی بێجگە لە ئاینی و شەریعەتی خوا بكەوێ و مل كەچی ناكات تەنها بۆ خوا نەبێت، خوا بە چاك و بێگەرد ئەگرێ لە هەر وێنە و هاوبەشێك، لاف خوایەتی لێ نادا بۆ هیچ كەسێكی تر، هیچ كەس ناكات بە هاوبەشی خوا نە لە زاتیدا و نە لە سیفاتیدا و نە لە كرداریدا و نە لە بەرنامە و بڕیاریدا.

ئینجا بە جوانی ئەزانم سەرنج راكێشم بۆ چەند یاسا و مەبەستێكی گرنگ كە ئەم سورەتە پیرۆزە ئاشنا و زانامان ئەكات پێ یان:

١- ئەم ئایینی ئیسلامە تێرو تەواوە و خوا گەیاندوویەتی بە پایان و هەڵبژارد بۆ هەمووان.

٢- ئەم ئایینە دامەزراوە لەسەر زانینی تەواو و بە بێ جۆرە گومان و دوودڵی یەك لە هەموو عەقیدە و بیرو بڕوادا و لەسەر رێ نیشاندان و رێنموونی لە خو و رەوشت و كردەوە بەرز و پیرۆزەكاندا.

٣- ئایینی خوا هەر یەك ئایینە بە بێ جیاوازی، هەر جیاوازی یەك هەبێ هەر لەو شەریعەت و بەرنامانەدا هەیە كە بە پێی كات و شوێن و بەرژەوەندی بەندەكان خوا ناردوونی.

٤- قورئان چاودێرە بەسەر هەموو نامەكانی خوادا و لەپاش هاتنی ئەم ئەبێ گەڕانەوەی هەموو نامەدارەكان و هەموو كەسانی تر هەر بۆ لای ئەم بێ، هەر ئەم ئەبێ تەرازوو بێ بۆ هەڵسەنگاندن و بەراورد كردنی هەموو راست و ناڕاست و هەق و ناهەقێك.

٥- پێغەمبەرێتی و فروستادەیی یەكەی پێغەمبەرمان(ﷺ) گشتی یە و بۆ هەموانە تا رۆژی دوایی، ئەم هەر راگەیاندنی لەسەرە و ئیتر هیچی بەدەست نییە.

٦- هێندێ لە موعجیزە و نیشانە و بەڵگەی پێغەمبەرێتی یەكەی ئەوەیە لەگەڵ نەخوێندەواری و دووری لە خوێندەوارانەوە زۆر شتی باس كرد بۆ نامەداران كە كاتی خۆی لە نامەكەیاندا هاتبوون، بەڵام لە پاشدا زایە بوو بوون و خۆیان لێی بێ ئاگا

بـوون یـان بـه دەسـتی قەسـت شـاردبوویانەوە، چـونکە نەئـەگونجان لەگـەڵ هـەوا و ئارەزووی خۆیاندا.

٧- پێغەمبـەرمان(ﷺ) وەك خـوا هـەواڵ و بـەڵێنی پێـدا، پاراسـتی لـەوەی کـەس بتـوانێ لەناوی بەرێیان بەرگری بکات لە راگەیاندنی پەیامەکەی.

٨- پێویستە لەسەر بڕواداران کە خۆیان چاك بکەن و رێنموونی خوا وەرگرن بە تەواوی و رێگە راستەکەی ئەو بدەنە بەر، هەرکات ئەمان بەو جۆرە بوون، ئیتر زیانبار نابن بە گومڕایی و بێ بڕوایی و خراپەکاری گومڕایان و بێ بڕوایان و خراپەکاران. زیانبار نابن نە لە جیهان و نە لە رۆژی دواییدا، بەڵام بە بێ هەڵسانیان بەوەی کە پێویست کراوە لەسەریان، ئەمان زیانبار ئەبن لە هەردوو جیهاندا.

٩- زۆر بە گرنگ گرتن و دڵنیایی کردن لەسەر پێویستی فەرمان بە چاکەو جڵەوگیریی لە خراپە.

١٠- بە درێژیی باسی حەرام و حەڵاڵ لە خۆراکدا.

١١- نەبوونی تەنگی و تەنگەتاو کردن لە ئیسلامدا.

١٢- قەدەغە کردنی زیادە رەوی و تونـد و تیـژیی لـە ئاییـندا، ئیتر با بەمـە بێ کـە مـەردوم خـۆی بێبـەش بکـات لـە بـەکارهێنانی شـتە پـاك و خاوێنـەکان کـە خـوا رەوای داون و حەڵاڵی کردوون.

١٣- قەدەغە کردنی ئارەق و قومار بە تەواوی بە جۆرێ کە هیچ جێگـەی گومـان و دوو دڵـی تیا نەما.

١٤- پێویست کردنی کۆمەکی بڕواداران لەسـەر خواپەرستی و چاکە و هـەر کارێکی سـوود بەخش کە بەرژەوەندی تیا بێت، قەدەغە کردنـی کۆمـەکی و یارمەتیـدان لەسـەر گونـاهو دوژمنایەتی و دەست درێژیی کردن.

١٥- گێڕانی مـاڵی خـوا بەهۆی راست بوونـەوە و راگیر بـوونی کاروبـاری ئـاییـنی و جیهـانی مەردومان، کە ئەگەر موسڵمانان بە پێی ئەم بەندە رەفتاریان بکردایە هیچ کـەم و کـوڕی یەك رووی تێنەئەکردن لە هەردوو جیهاندا.

١٦- قەدەغـە کردنـی دۆسـتایەتی و دەسـتە برایـی و خـۆش ویـستنی گـاور و جوولەکـە و گێڕانی ئەو دۆستی و خۆشەویستی یە بەهۆی چوونە ریزی ئەوان و ناپاکی یـان بـەو جۆرو شێوەی کە بە درێژیی باسمان کرد لە تەفسیری ئایەتەکاندا.

١٧- باس و بڕیاری ئەو شتانەی کە قەدەغەن لە کاتی ئیحرامدا.

١٨- تۆڵە و سزای خراپەکاران کە هەڵگەڕێنەوە لە کار بەدەستی شەرعی، هەروەها تۆڵە و سزای دز و جەردە.

١٩- حوکم و بڕیاری سوێند و کەفارەتی سوێند لەگەڵ باسی سوێندی ئەمیندار و شایەتدا.

٢٠- زۆر بە گرنگی فەرماندان بە وەسیەت کردن لەگەڵ باسی شایەت گرتن و شایەتیدان لەسەری، وەرگرتنی شایەتیدانی غەیرە موسڵمان لەسەر موسڵمان.

٢١- بە درێژیی لێکۆڵینەوە لەگەڵ جوولەکە و گاور بە شێوەی گشتی و بە تایبەتی، شیکردنەوەی زۆر لە بیرو باوەڕی ناڕاست و کردەوەی بەدیان.

٢٢- هەواڵدان بە پرسیار کردن لە پێغەمبەران لە ڕۆژی دواییدا دەربارەی وەڵام و هەڵوێستی گەل و ئوممەتەکانیان بە شێوەی گشتی و بە کورتی، بە تایبەتی و ئەندازەیە درێژە پێدان لەگەڵ حەزرەتی عیسادا(علیه السلام) سەبارەت بە گوناهە زۆر گەورە و ئەو درۆ زۆر زلەی کە ئوممەتەکەی کردیان لە پاش خۆی و لایاندا لە ئایینە پیرۆزەکەی، ئەو هەواڵەش بە جۆرێ ئەهێنێ دڵی ئاگادار و وریا ئەخاتە لەرزە، ئەمانە چەند شتێکی گرنگ بوون خرانە بەرچاو لەم سورەتە زۆر گرنگ و پیرۆزەدا،(ئیمامی ئەحمەد و نەسطئی و حاکم و بەیهەقی) ئەگێڕنەوە لە دایکی ئیمانداران(عائشة) وە – خوای لێ ڕازی بێت – کە فەرمویەتی ئەم سورەتە دواترین سورەتێکە کە هاتە خوارەوە، کەواتە هەر حەڵاڵێکتان دەست کەوت تێیدا بە حەڵاڵی بزانن و وەری گرن و هەر حەرامێکتان دەست کەوت تیای دا بە حەرامی بزانن و وەری گرن.

داواکارین لە خوای گەورە دڵمان دامەزرێنێ لەسەر حەڵاڵ کردنی هەموو حەڵاڵەکانی خوا و حەرام کردنی هەمووحەرامەکان ولەسەررێگە ڕاستەکە بمان ژیەنێ و بمانمرێنێ، یارمەتیمان بدات بۆ تەوو کردنی ئەم تەفسیرە و لێمان وەرگرێ و سوود بەخشی بکات – آمین –.

وصلی الله وسلم علی سیدنا محمد و علی كل عبد مصطفی.

١٤٠٧/٧/٨ – ١٩٨٧/٤/٥

## سورەتی(الأنعام)
## مەککەیی یە و(١٦٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

لە چەند ریوایەتێکدا هاتووە کە چەند ئایەتێکی ئەم سورەتە مەدینەیی یە، بەڵام لە چەند ریوایەتێکی تردا هاتووە لە(ئیبن و عەباس و ئەسمائی کچی یەزید و جابر و ئەنەس و ئیبن و مەسعود) ەوە – خوا لێیان رازی بێت – کە ئەم سورەتە هەمووی مەککەیی یە و بە یەکجاریش هاتووە، جا لەبەر بەهێزی ئەم ریوایەتانە باوەڕمان وایە کە مەککەیی یە، بێجگە لەوەش وەك لە تەفسیری سورەتی(البقرة) دا وتمان ناو بردنی سورەتەکان بە مەککەیی و مەدینەیی بە پێی سەرەتاکانیانە، هەر کام سەرەتاکەی مەککەیی بێت هەر بە مەککەیی ناو ئەبرێت با چەند ئایەتی مەدینەییشی تیا بێت، هەرکام سەرەتاکەی مەدینەیی بێت هەمووی بە مەدینەیی ناو ئەبرێت، هەرچەندە ئایەتی مەککەیشی تێدا بێت، دەی هیچ کەس نییە کە دووبەرەکی ببێ لە سەرەتاکەیدا، ئەو دووبەرەکییەی کە هەیانە لە چەند ئایەتێکی کەمدایە.

ئەم سورەتە لەو سورەتە مەککەیی یانەیە کە لە ماوەی سیازدە ساڵدا هاتە خوارەوە و بە دەوری یەك مەبەستی سەرەکیدا ئەخولانەوە وەك هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوا لەسەر ئەوە دامەزراون و راگیرن، ئەو مەبەستیش بریتی یە لە عەقیدە و بڕوا و پایەی بنەڕەتی و سەرەکی ئەو عەقیدەیەش ئەگرێتەوە بۆ بڕوا بە خوایەتی خوا و کاربەدەستی و حاکمێتی گشتی بۆ خوا بە تاك و تەنیایی و بە بێ هیچ هاوبەشی و وێنەیەك، ئەو کەسانەی کە بانگەوازەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەسێننەوە و ئەیانەوێ لەسەر بەرنامەکەی ئەو بانگی مەردومان بکەن بۆلای خوا، ئەبێ بە وردی بیر بکەنەوە لەمەی کە قورئان ئەو ماوە زۆرە خەریك بوو بەو عەقیدە و بڕواوە، هەر چەسپاندن و جێگیر کردنی ئەوەی کردبوو بە مەبەستی سەرەکی و لەوێوە دەستی کرد بەم ئایین و شەریعەتە گەورە و گشتی یە، کەچی بە گوێرەی زانین و تێگەیشتنی ئێمە زۆر رێگەیەکی سەخت و گران بوو، بەلامانەوە وایە چەند رێگەیەکی تر هەبوو کە سووك و ئاسان تر بوو لەسەر شانی پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا، بۆ وێنە ئەگەر بانگەوازەکەی بە ناوی بەرز کردنەوەی ئالای نەتەوایەتی عەرەبەوە بکردایە کە لەو کاتەدا گەلی عەرەب بەش خوراو و ماف داگیر کراو بوون، ئەگەر بەو ناوەوە بوایە زۆر بە ئاسانی عەرەبەکان نەکەوتنە شوێنی و فیداکاری باشیان ئەکرد بۆی و هەموو رازی ئەبوون

بە سەرکردایەتی ئەو، ئینجا پاش ئەوەی کە هەموو عەرەبەکانی بکردایە بە یەك بە سەرکردایەتی خۆی، زۆر ئاسان بوو کە خواپەرستی بچەسپێنێ لە ناویاندا و بیانکات بە بەندەی گوێڕایەڵی خوا، بەڵام خوا کە هەر خۆی زانای کاردروستە ئەم بارو ڕێگەیەی نیشان نەدا، بەڵکو هەر لە یەکەم جارەوە فەرمانی پێدا کە دەست پێ بکات بە بانگ کردنیان بۆ ئەوەی بڵێن(لا إله إلا الله) کە لە ڕاستیدا ئەو وتە پیرۆزە جاڕدانە بە شۆڕشێکی گەورە بەسەر هەموو بت و بیر و باوەڕو باو و ڕەوشتی لەوەوپێشی خۆیان و باوکو باپیریان کە بە درێژایی چەند چەرخ دامەزرا بوون لەسەری و دەقیان پێوە گرتبوو، ئەو وتەیە جاڕدان بوو بەوە، چونکە ئەوانە عەرەب بوون، چاك حاڵی ئەبوون لێی و تێ ئەگەیشتن لە واتا و مەبەستەکەی، ئەیانزانی کە ئەو وتەیە داوایان لێئەکات کە بە تەواوی واز بێنن لەو هەموو بارو باوی لەوەو پێشیان و هەمووی ژێر پێ بکەن و بیرو باوەڕێکی تازە وەرگرن لەلایەن خواوە و لەو تەنیا سەرچاوەیەوە، جا لەبەر ئەوە ئەو وتەیە ئەوەندە سەخت بوو لە دڵیاندا، ئەو هەموو ڕەقی و لاری و سەرکێشی یەیان بەکارهێنا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو هەموو سزاو ئازار و دەردی سەری یەیان بەکار هێنا لەگەڵ ئەو موسڵمانانەدا.

خوای پەروەردگار کە فەرمانیدا و پێغەمبەرەکەی خستە سەر ئەم ڕێگە زۆر سەختە و ویستی ئەم ڕێگە پڕ لە ئەرك و مەینەتە بداتە بەر، ئەو ڕێگەیەی نیشان نەدا کە باسمان کرد و زۆر بەلامانەوە سووك و ئاسان و بێ ئەرك بوو، خوای پەروەردگار کە بەم جۆرو شێوەیەی کرد نەیویستووە پێغەمبەر و یارەکانی بخاتە زەحمەت و مەینەتەوە، بەڵکو زانیویەتی کە هەر ئەو ڕێگە سەخت و پڕ لە مەینەتی یە ڕاست و بەکارە و ئەگات بە مەبەست، ڕێگە ئاسانەکەی ئێمە لارە و بێ کەڵکە و لائەدا لە مەبەست، چونکە مەبەست لە ناردنی ئایینی خوا ئەوەیە کە وڵات و دانیشتوانی وڵات کە موڵکی خوان ڕزگار بن لە هەموو جەورو ستەم و دەست درێژیی یەك، دیارە ئەوەش بەوە ئەبێ کە وڵات و دانیشتوان پاك و خاوێن و تایبەتی بکرێن بە خواوە، ئەوەش کاتێ ئەبێ کە هەر ئاڵای(لا إله الا الله) بەرز بکرێتەوە، هەرچی ئاڵا و پەرچەمێکی تر هەیە لا ببرێ و توڕ بدرێ و ژێر پێ بخرێ، هەرگیز بەوە نابێ کە پەرچەم و ئاڵایەکی بەد و ناڕەوا لا ببرێ و یەکێکی تری وێنەی بخرێتە جێی و بەرز بکرێتەوە، کەواتە ڕاست نەبوو پەرچەم و ئاڵای فارسی و حەبەشی و ڕۆمی لاببرێ و پەرچەم و ئاڵای عەرەبایەتی بەرز بکرێتەوە و بخرێتە شوێنی، چونکە ناهەق و ناڕاستە لە هەر شوێنێك ببێ و لەسەر هەر بار و وێنە و شێوەیەك ببێ، بێگومان هەموو ئادەمی دروست کراو

و بەندەی خوان، دروست کراو و بەندەی هیچ کەسێکی تر نین، دەی کاتێ ئەبن هەر بە بەندەی خوا کە هەر ئالاَ و پەرچەمی(لا إله إلا الله) بەرز بکرێتەوە بەسەریاندا،(لا إله إلا الله) لەسەر ئەو بار و شێوەیە کە عەرەبەکان تێی ئەگەیشتن و ئەیانزانی، کە ئەوەش ئەوەیە هیچ حاکمێتی و کاربەدەستی نییە بۆ هیچ کەسێك بێجگە لە خوا، هیچ یاسا و شەریعەتێك وەرناگیرێ لە خوا نەبێ، سوڵتە و دەسەلاَت هەر بۆ خوا هەیە، هەروەها بێجگە لەو رێگەی نەتەوایەتی یە، بە پێی زانینی ئێمە ئەگەر بانگ کردنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە ناوی کۆمەلاَیەتی و پێك هێنانی دادی کۆمەلاَیەتی بوایە، بە ئاسان تر کۆمەڵ و جەماوەر ئەکەوتنە شوێنی، چونکە لەو کاتەدا ماڵ و سامان زۆر بە لێشاو و فراوانی کۆبووبووەوە لای چەند کەسێکی کەم و ئیتر هەموو بەش بڕاو و بەش خوراو و برسی و ژێر دەستە بوون بۆ ئەو چەند کەسە کەمە، کەواتە ئەگەر بانگ و بانگەوازەکەی بەناوی رزگارکردنی چینی چەوساوە و داماوانەوە بوایە زۆر بە سۆز و پەرۆشەوە ئەوانە ئەکەوتنە شوێنی و بە ئاسانی مەبەستەکە پێك ئەهات، بەلاَم خوای زانای کار دروست فەرمانی نەدا و نەیخستە سەر ئەو رێگەیە، چونکە ئەیزانی ئەو رێگەیە چەوتە و رێبوارەکانی ناگەیەنێ بە ئامانج، چونکە دادی کۆمەلاَیەتی ئەبێ لە عەقیدە و بۆچوونێکی راستەوە هەڵقوڵێ بە گێڕانەوەی هەموو کارێ بۆلای خوا، ئەو کاتە هەرچی خوا بڕیاری بدات مەردوم بە سۆز و خۆشەویستی یەوە وەری ئەگرێ و بە ئارەزووی خۆی بەجێی ئەهێنێ، دڵ شادومان و خۆش نوودە بەو دابەش کردنی سامانەی کە خوا بڕیاری ئەدا، ئیتر چ دڵی وەرگر و چ دڵی وەرگیراو، کەواتە کارەکە زۆر بە ئاسانی ئەڕوا و بە بێ پێویست کردن بە زۆری چەك و قەمچی، بەبێ ئەوە هێندێ لە دڵەکان پڕ ببن لە چرووکی و چاوچنۆکی، هێندێکی تر پڕ ببن لە داخ و مەراق و حەسادەت، وەك ئەوانە پەیدا ئەبن و بەچاو ئەیانبینین لەناو ئەو گەل و کۆمەلاَنەدا کە(لا إله إلا الله) نەکراوە بە ئالاَیان.

ئەگەر بانگ و بانگەوازەکەی بە هەر ناوێکی تر و لە ژێر هەر ئالاَیەکی تردا بوایە کارەکەی نەئەڕۆیشت و نەئەگەیشت بە مەبەست و ئامانج، بەلاَم کاتێ بانگ و بانگەوازەکەی بەم رێگە زۆر سەختەدا برد و هەر ئالاَی(لا إله إلا الله) ی بەرز کردەوە، هەرچەند ئەرك و مەینەتی زۆر زۆر و سەخت بووە، کاتێ بەم رێگەدا هات گەیشت بە ئامانج و گەل و کۆمەلاَیەتی پێك هێنا کە دوژمنیش تیایدا سەرسام و سەرگەردانە، گەل و کۆمەڵێکی پێك هێنا کە لە هەموو جیهاندا وێنەی نەبینراوە و نەبیستراوە، هەرگیز نایشبینرێ و فەراهەم

نابێت، مەگەر تەنها ئەو ڕێبازەی یەکەم جارە بدرێتە بەر و پەیڕەوی ئەو یەکەم چینە بکرێ، بەڵێ کاتێ ئەو عەقیدەو بڕوایە دامەزراو جێگیر بوو لەپاش ئەو هەموو زەحمەت و تێکۆشانە کاتێك کە مەردوم پەروەردگاری خۆی ناسی و هەر ئەوی پەرست، کاتێك کە مەردوم ئازاد بوو لە زۆر و دەسەڵاتی بەندەکانی خوا بەسەر دڵ و دەروونیدا، لە زۆر و دەسەڵاتی ئارەزوواتی نەفس کاتێك کە ئەوە دامەزراو جێگیر بوو لە دڵەکاندا تەنها(لا إله إلا الله) خوا بەو دڵانە و بە خاوەنەکانیان فەراهەمی هێنا هەرشتێ کە دڵ داوای بکات و ئاواتی بۆ بخوازێ. زەوی و وڵات پاك بوویەوە لە ڕۆم و فارس نەك: بۆ ئەوەی عەرەب و عەرەبایەتی بێتە جێگەکەی، بەڵکو بۆ ئەوەی دەسەڵات و سەڵتەنەتی خوا جێگیر ببێ، گەل و کۆمەڵ پاك بوویەوە لە هەموو جەورو ستەمی کۆمەڵایەتی، دادو دادپەروەری خوا هاتە شوێنی و تەرازووە ڕاستەکەی خوا هاتە کایەوە، ئاڵای دادی کۆمەڵایەتی بەرز بوویەوە تەنها بەناوی خواوە، ناو نرا بە ئاڵای ئیسلام بە بێ ئەوەی هیچ ناو و نیازێکی تری لەگەڵ بێت، دەروون و ڕەوشت و کردەوە پاك بوونەوە، دڵ و گیان پاك و پاڵفتە بوونەوە بە بێ ئەوەی پێویست ببێ بە زۆری چەك و شیرو تیر، چونکە هەست کردن بە ئاگاداری و چاودێریی خوا بەسەر دڵ و دەروونەوە بەسەو مەردوم ئەگێڕێتەوە لەو خراپەکاری یانە و ئومێد و چاوەڕوانی و خۆش نوودی و ڕەزامەندی خواو شەرم لەخوا و ترسان لە تۆڵە و سزادانی خوا بە ئاسانی مەردوم ئەخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و پاڵدەر ئەبێ بۆ هەر کردەوەیەکی چاك و گەڕانەوە و خۆگرتنەوە لە هەر کردەوەیەکی خراپ. بە کورتی ئەوانە بەهۆی جێگیر بوونی(لا إله إلا الله) لە دڵیاندا لەسەر بارو شێوە ڕاستەقینەکەی، ئەوانە لە کردار و ڕەوشت و ژیانیاندا بەرز بوونەوە بۆ ئاسۆ و پۆپەی هەرە بەرز بە جۆرێ ئادەمێتی و مرۆڤایەتی پێی نەگەیشتووە و پێی ناگات، تەنها لەم ڕێگەیەوە نەبێ کە ئەم ئوممەتە پیایدا ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو پلە بەرزەی خۆی، ئەوانە ئەو ئاین و عەقیدە پاکە دامەزراو و جێگیر بوو لە دڵیاندا، بەڵێن و پەیمانیاندا بە تێکۆشان و فیداکاری لە ڕێی خوادا، لەسەر ئەوە بەڵێنی تەنیا شتێکیان پێدرا، بەڵێنی بەهەشت، ئەوانیش تەنها ئەو بەهەشتەیان گیڕا بە مەبەست و ئامانج و دەست مایە و تێشووی ئەو ڕێگە زۆر سەختەی کە بڕییان، تەنها بەو نیازەوە خۆیان گرت بەرامبەر ئەو هەموو سزا و ئازار و مەینەتی و دەردی سەری یەدا، بە ئومێد و چاوەڕوانی بەهەشت توانی یان بەردەوام بن لەسەر بانگ و بانگەوازەکەیان، بەرەنگاری نەفامێتی وەستان تا زاڵ بوون بەسەریدا، ئینجا کاتێ کە تاقی کرانەوە خۆیان گرت، کاتێ کە دڵیان هیچ مەبەستێکی تیا

ئەما بێجگە لە ڕەزامەندی خواو بەھەشت و چاوەڕوانی ھیچ ئەجرو پاداشتێکیان نەبوو لەم جیھان و زەوییەدا، تەنانەت نیازی سەرکەوتنی بانگەوازەکەیان لەسەر دەستی خۆیاندا، کاتێ دەروونیان پاك بوویەوە لە کەشخە و شانازی کردن بە تیرەو بەرە و نیشتمان و خاك و ھەرشتێکی تری ئەم جیھانە و زەوییە...

کاتێ کە خوا زانی ئەوانە بەو جۆرو شێوەیە پاك و خاوێن بوونەتەوە لەو ھەموو چڵك و چەپەڵییە، ئەوانەی گێڕا بە ئەمیندار بەسەر ئەم ئایین و شەریعەتە گەورە و جیھانی و ھەتا ھەتایی یەوە، ئەو گەورەترین سپاردەیەی دایە دەستیان، ئەوانیش بە ئەوپەڕی پاکی و راستی یەوە ئەو سپاردەیان گەیاندە جێ و شوێنی خۆی، بەو جۆرە کە خوا پێی خۆش بوو و داوای لێکردبوون، ھۆی ئەوەش ھەر ئەوە بوو کە بانگ و بانگەوازەکەیان دەستی پێکرد لە بڕواو عەقیدەوە، تەنھا ئالأی(لا إلـه إلا الله) بەرز کرایەوە بە بێ ھیچ ئالأیەکی ترو تێکەڵ کردنی بە ھیچ نیازو ئالأیەکی تر، بانگ و بانگەوازەکەیان ئەو ڕێگەیەیدایە بەر کە زۆر سەخت و سامناك بوو بە رواڵەت، لە رووی راستیدا سووك و ئاسان بوو، بێگومان ئەم بەرنامە پیرۆزە بۆ خوا نەئەبوو بە پاك و خاوێنی ئەگەر بانگ و بانگەوازەکە لە یەکەم ھەنگاوی یەوە بە ناوی نەتەوایەتی یەوە بوایە، یان کۆمەڵایەتی یاخود رەوشتیی یان ھەر شتێکی تر یان ھەر ئاڵا و نیشانە و دروشمێکی تری بەرز بکردایەتەوە بێجگە لە(لا إلـه إلا الله)، ئینجا با بێینە سەر ئایەتەکانی ئەم سورەتە پیرۆزە کە(ئیبن و مەردەویە) لە بارەیەوە حەدیسێ ئەھێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە – خوا لێی رازی بێت – کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: سورەتی(الأنعام) ھاتە خوارەوە کۆمەڵێك لە مەلائیکە کە ھاتبوون لەگەڵی لای رۆژئاوا و رۆژھەلأتیان پڕ کردبوو دەنگیان جریوە جریوی ئەکرد بە زیکر و تەسبیحات، زەوی کەوتە لەرزە پێیان، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەیفەرمو: سبحان الله العظیم، سبحان الله العظیم. سورەتەکە دەست پێئەکات بە بەرەنگاری و روو بەڕوو وەستانی بت پەرست و ھاوبەش ڕەوا دەران بۆ خوا لە کاتێکدا کە بەڵگە و نیشانەکانی تاك و تەنیایی خوا رووبەڕوویان وەستاون و چوار دەوریان گرتوون و خۆیان دەرئەخەن لێیان، بەڵگە و نیشانە بوونەوەری یەکان کە ھەن لە ناوچەکانی ئەم بوونەوەرەدا و ھەر لە خودی بێ بڕواکان خۆیشیاندا بەرەنگاری ئەو ھاوبەش رەوادەرانە ئەوەستن و دەستکاری دڵیان ئەکەن لە چەند بارێکەوەو خوایەتی خوایان بۆ روون ئەکەنەوە،

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ

---

**لـە يەكـەمجارەوە ئەفـەرموێ:** ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ هـەموو ستايش و ناوبردن بە چاكە و سوپاس بۆ خوايە كە ئاسمانـەكان و زەوى دروست كردووە بـەو هـەموو رێكـى و وردەكـارى يـە ﴿وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾ تـاريكى يـەكان و رووناكى داهێنا و دروستى كردن، ئيتر مەبەست تاريكى و رووناكى ئاشكرا و هەست پـێ كراو بێت، وەك تاريكى شەوان و رووناكى رۆژ، يان تاريك و رووناكى ژيريى، وەك: تاريكى بێ بڕوايى و رووناكى بڕوا، تاريكى نەزانى و نەفامى و رووناكى زانين و فاميدەيى، يان بە شێوەى گشتى مەبەست بن كە بێگومان ئەم شێوە گشتى يە لە دڵدا بەهێزترە، لەسەر هەر بار يەكەمى بە كۆ و دووەمى بە تاك فەرمو لێرە و لە هەموو شوێنەكانى تر لە قورئاندا، زانايان ئەفەرمون لەبەر ئەوەيە كە تاريكى يەكان زۆر ترو جياواز ترن، بە تايبەتى تاريك و رووناكى ژيريى، بۆ وێنە: تاريكى بێ بڕوايى ئەوەندە زۆرن نايەنە ژمارە بە ئاسانى، بەلاَم رووناكى بڕوا هەر يەكێكە، دەرگاى سورەتەكەى كردەوە بە سوپاس و ستايشى خوا لەسەر خوايەتى يەكەى كە دەرئەكەوێ بە روونى لەم دروست كردن و داهێنانەدا كە تايبەتين بە خواوەو ناگونجێن بۆ هيچ كەسێكى تر، دروست كردنى ئاسمانەكان و زەوى بەو هـەموو گەورەيى و نايابى و گرنگى يـەوە، ئينجا دروست كردنى تـاريكى يـەكان و رووناكى كـە دوو شـتى سەرسـوڕهێنەرن لـەم ئاسمـان و زەوى يـەدا، بێگومـان لـەم فەرمودەيـەدا وريـا كردنـەوە و دەستكارى يـەكى گـەورەيى تيايـە بـۆ دڵ و دەروون، هـيچ كـەس و هـيچ شـتێك نەپەرستێ بێجگە لەم خودا دروست كەرو داهێنەرە، كەواتە سەر سوڕ بمێنێ لە پەرستنى هيچ كەس و هيچ شتێكى تر، زۆر بە دوور سەرنج بدرێ و دابنرێ،

ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾

---

**وەك دەست نیشان ئەكات بۆ ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ واتە هەموو ستایش و سوپاسێ بۆ خوایە لەسەر ئەو چاكە و بەهرە گەورە و گرنگانەی دروست كرد و رشتی بەسەر هەمووانـدا، كەچی لەپاش ئـەوە ئەوانەی كە بڕوایـان نـەهێناوە بە پەروەردگاری خۆیان و هاوبەشی بۆ رەوا ئەدەن لا ئەدەن لە پەرستنی و یاخی ئەبن لێی یان ئەوانەی كە سپڵەن و دان نانێن بە چاكەو بەهرەكانی دا لائەدەن لە سوپاسی و یاخی ئەبن لێی، بە جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، ئەویش هەر گونجاو و رێكە واتە خوا ئەو هەموو دروست كراوە گەورەو گرنگانەی دروست كردو ئەو هەموو چاكەی رشت بەسەر هەمووانـدا، كەچی ئەوانەی كە بڕوایان نەهێناوە یان سپڵەن شتێ تر لەو دروست كراوانە یەكسان ئەكەن لەگەڵ پەروەردگاریاندا و ئەیكەن بە هاوتای ئەو لە پەرستن و چاو لەبەربووندا بۆی، لەسەر هەربار واتە كردەوەیەك زۆر دوور و ناڕاست و ناڕەوایە و ئەبوایە شتی وایان نەكردایە، ئەی هاوار بۆ دووری و نەگونجاویی ئەوەی كە ئەوانە ئەیكەن و هەڵئەسن پێی!! ئینجا دەست كاری یەكی تری دڵیان ئەكات بەمەی سەرنجیان رائەكێشێ بۆ پەیدا بوونی خۆیان و ژیانیان لـەم بوونـەوەرەدا، پەیـدا بـوون لـە قـوڕێكی تـاریكی زۆر دوور لـە ئـادەمێتی و ژیـان و بـارو شێوەی ئادەمی ئادەمێتی، پەیدا بوونی لـەوە و گۆڕان و گواستنەوەی لـەوەوە بۆ رووناكی گیان و ژیانی بەرز و شیرینی ئادەمی كە بەڕاستی و دروستی زۆر دوورن لە یەكترەوەو ئەگەر ئاوا روون و ئاشكرا نەبووایە، هیچ كەس بڕوای نەئەكرد كە ئەم ئادەمی یە بەرز و گرنگە لەو قۆناغە دوورەوە هاتووە، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ خوا كەسێكە كە ئێوەی دروست كرد لە قوڕ، دروست كردنی ئێمە لە قوڕ لەم بارەوەیە كە هـەموو ئادەمین و ئـادەمیش لـە قـوڕ دروست كـراوە، یـان لـەم بارەوەیـە كـە هـەركام لـە ئێمـە لـەو دڵۆپـە ئـاوە دروسـت كـراوە و**

ئاوەکەش لە خۆراك پەیدا بووە و خۆراکەکەش لە خاکی تێکەڵ بە ئاو پەیدا ئەبیٚ، کەواتە لەسەر هەر بار ئێمە لە خاك و قوڕ دروست کراوین ﴿ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا﴾ واتە لەپاش باسی دروست کردنتان لە قوڕ باسی ئەمە ئەکات کە خوا بۆ هەرکام لە ئێوە ماوەو کاتێکی بڕیار داوە و نووسیویەتی بۆ ژیان و مانەوەتان کە دوایی دێت بە مردنتان ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾ ماوە و کاتی ناوبراو و دیاریی کراو لای خوایە و هەر خۆی ئەزانیٚ و کەسی پیٚ ئاگادار نەکردووە کە دەست پیٚ ئەکات لە مردنی هەر کەسێکەوە تا کاتی زیندوو کردنەوەی لە ڕۆژی دواییدا، کەواتە بۆ هەرکام لە ئێمە دوو ئەجەل و ماوەمان هەیە وەك باسکرا، دووەمیان تەنها خوا زانایە پێی، بەڵام یەکەمیان خوا هەندیٚ کەسیشی پیٚ ئاگادار کردووە، وەك ئەو فریشتانەی کە خوا فەرمانیان پیا ئەدات بە گیان بەبەردا کردنی هەرکام لە ئێمە لە سکی دایکیدا و ئینجا نووسینی چوار شت: یەکیٚ لەوانە ماوەی ژیانی یەتی تا مردن، وەك لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە؛ هەروەها دروستە خوا لە چەند ڕێگایەکی ترەوە هێندیٚ لە بەندەکانی ئاگادار کردبیٚ و بیکات بەو یەکەمە، بەڵام دووەم وەك لە چەند شوێنێکدا هاتووە لە قورئاندا، هەروەها لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە کە ئەم دووەمە خوا کەسی پیٚ ئاگادار نەکردووەو ناشی کات، ئەم دوو ئەجەلە بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، وەك باس کراون لە زۆر لە کتێبەکانی تەفسیردا، بەڵام ئەمەی کە هەڵمان بژارد رای زۆربەی لەسەرە.

ئەم ئایەتە دەست ئەدات بۆ ئەمەی کە بەڵگە و نیشانەیەکی تر بێت وەك ئایەتی یەکەم لەسەر بوونی خواو خوایەتی و پەروەردگاریێتی و دەسەڵات و کاردروستی خوا کە بێگومان هەرکەس بێبەش نەبیٚ لە ژیریی و تێگەیشتن تۆزێك بیر بکاتەوە لەوە ئەبیٚ هەموو دڵ و دەروونی پڕ ببیٚ لە بڕوا بە پەروەردگارەکەی، چونکە بۆ بوونی ئەم مەردومە گرنگی هەر سیٚ تیرو بار هەیە کە بگوتریٚ:

١- خۆی خۆی دروست کردبێت.

٢- بە ڕێکەوت پەیدا بووبێت.

٣- كەسێکی زانای بە دەسەڵاتی کاردروست دروستی کردبێت.

دەی بێگومان تیرو باری یەکەم بە هیچ کلۆجێك هیچ کەس لە رووی نایە شتی وا بڵێ، تیرو باری دووەمیش هەموو کەسێکی ژیر تەریق ئەبێتەوەو شەرم ئەکات لە گوتنی، چونکە رێکەوت ناوی خۆی وا بە خۆیەوە و بێ رژێم و یاسایە، شتێکی ئاشکرایشە کە مەردوم هەموو گیان و بەش و پارچەیەکی پڕە لە یاسا و رژێم، کەواتە هەر تیرو باری سێ یەم مایەوە، ئەم ئایەتە هەرچۆنێ دەست ئەدات بۆ ئەوە، هەروەها دەست ئەدات بۆ ئەوەی بەڵگەو نیشانە بێ لەسەر راستی زیندوو بوونەوەو هاتنی رۆژی دوایی، بەم رەنگە: نەبوونی ئەم ئادەمی یە لە یەکەم جارەوە و فەراهەم هێنانی لەم خاکە و گێڕانی ئەم خاکە بەم مەردومە بەڵگەیەکی زۆر روونە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی لە یەکەم جارەوە خاك و قوڕی گێڕا بە ئادەم هەر ئەو کەسە لە پاش مراندن و گێڕانی بە خاك ئەیگێڕێتەوە بۆ مەردومەکەی جاران.

بەڕاستی هێنانی ئەم ئایەتە و گێڕانی بە بەڵگە لەسەر خوایەتی خوا یان لەسەر راستی زیندوو بوونەوە و هاتنی رۆژی دوایی، یان لەسەر هەردوو بەڵگەیەکی ئێجگار ئاشکراو بەهێزە و شایانی ئەوە نییە هیچ کەس گومانی ببێ تیادا، زۆر دوورە گومان و دوو دڵی لە خوایەتی خواو هاتنی رۆژی دواییدا لەگەڵ بوونی ئەم بەڵگە و نیشانە ئاشکرایانەدا، وەك خوایش ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ﴾ ئینجا ئێوە گومانتان هەیە، گومان یان دەمەقاڵێ و دان نەنان بە تاك و تەنیایی خوادا، یان گومان و دان نەنان و دەمە قاڵێ لە زیندوو بوونەوە، واتە ئەوەی کە ئێوە وان لەسەری زۆر دوورە لە سروشت و لە ژیریی یەوە و زۆر ناڕاست و بێ جێیە، نەئەبوو بەو جۆرە بوونایە و بەو جۆرە بن، ئینجا ئەوەی کە مەبەست بوو لەو دوو ئایەتەدا کە تێپەڕیان کرد کۆی ئەکاتەوە لەم ئایەتی سێ یەمەدا، خوایەتی خوا لە بوونەوەر و لە ژیانی ئادەمیدا بە روونی باس ئەکات،

**ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ۖ﴾ ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی و تاریکی یەکان و رووناکی دروست کردو ئێوەی لە قوڕ دروست کرد، هەر ئەوەیە بانگ لێکراو و پەرستراوی راستەقینە لە ئاسمانەکان و زەویدا، یان هەر ئەوەیە بانگ ئەکرێ و ناو ئەبرێ بە(الله) لە ئاسمانەکان و لە زەویدا، واتە هیچ هاوبەشێکی نییە لەو ناوەدا کە ئەوەش ناوە بۆ کەسێك کە خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرز و پیرۆزو شایستە و بەرێزە، پاك و خاوێنە لە هەر سیفەتێك کە ناشایستەیە و کەم و کوڕی و ناتەواوی ئەگەیەنێ ﴿يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ﴾ ئەزانێ و با خەبەرە بە نهێنی و ئاشکراتان لە وتارتان، یان لە وتار و لە کردار و لە هەرچی ﴿وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾ ئەزانێ و ئاگادارە بە هەر خێرو شەڕو چاکە و خراپەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە حیساب و پرسیار و پاداشت و تۆڵەتان بە پێی ئەوانە ئەبێ، نهێنی و ئاشکراکان لە رستەی پێشوودا هەرچەند گشتی بن بۆ ئەمەی لەم رستەدا فەرموی، بەلاَم بە تایبەتی باسی ئەمەی دووبارە کردەوە لەبەر دەرخستنی زیادە گرنگی ئەمان، چونکە پاداشت و تۆڵەیەکە کە مەردومان شایستەی ئەبن لەسەر کردەوەکانیان، لەسەر ئەم رایە پێشووە کە ئەم ناگرێتەوە و جیاوازن لە یەکتر، بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ و باشە.**

**لەم سێ ئایەتەدا رووی فەرمودەی کردە مەردومان و دروست کردن و راهێنان و ژیانی کرد بە بەڵگە بەم جۆر و شێوە سووك و روون و رەوانە کە سروشتیان دائەچڵەکێنێ و لە خەوی بێ ئاگایی خەبەریان ئەکاتەوەو هەرکەس رێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز لە رووی ئایەت دەمە دەمێ و دەمە قاڵێ بکات تیایدا، چونکە سروشت و ژیریی خۆی لێی ئەپەڕن و ئەچن بە گژ دەمی دا و بێ ئابرووی ئەکەن و پێی ئەڵێن: ئەی نەفام ئایا بوونی ئەم ئاسمان و زەوییە و بەڕێوە بردنی کاروباریان بەم رژێمە تێرو تەواوە بوونی گیان و ژیان بە تایبەتی گیان و ژیانی ئادەمی لە پۆپەی هەرە بەرزی خۆیدا، گەڕانی لەو هێڵ و رێگە تایبەتی یەی کە لەسەری هاتووە و دامەزراوە، ئایا ئەو هەموو شتە سەر سوڕهێنەرە راگیر ئەبێ و کاروباریان ئەڕوا بەڕێوە بە بێ خوایەکی تاك و تەنیای کارزان و کاردروست و بە دەسەلاَت؟ بەڕاستی مەسەلەکە ئەوەندە راست و روونە هەر خۆی لە خۆیەوە دڵ و دەروون و هەست و ژیریی**

جێگیر و دامەزراو ئەبێت، بێ بڕوا بە بوونی خوا زۆر بە دەگمەن دەست ئەکەوێت، ئەوانەی کە بە دەم لاف بێ بڕوایی لێئەدەن راست ناکەن لەگەڵ خۆیشیاندا، لە دڵەوە ئەزانن کە ئەبێ بەدی هێنەر و داهێنەرێك هەر ببێ، بەلاّم شەرم ئەکەن لەوەی بە رێك و راستی دانی پیا بنێن و خۆیان بخەنەوە بە درۆوە، هەموو بت پەرستەکان بە رێکیدان ئەنێن بە بوونی خوادا، هاوبەش رەوا دەرەکانی عەرەب کە ئەم سورتە و وێنەی بەرەنگاریان ئەوەستان، وەك قورئان لە چەند شوێنێکدا ئەفەرموێ، باوەڕیان وابوو کە خوا دروست کەرو رۆزی دەریانە، ئەو خاوەن و گیان پێدەر و مرێنەریانە، هەروەها چەند سیفەتێکی تریش، بەلاّم لەگەڵ ئەوەدا خوا و شەریعەتی خوایان نەئەگێڕا بە حاکم و کاربەدەستی خۆیان، یان لە هەموو کاروبارێکیاندا، هاوبەشیان بۆ رەوا ئەدا و ئەو بت و هاوبەشانەیان دەگێڕا بە حاکم و کاربەدەستی خۆیان لە پەرستن و هێندێ کاروباری ترياندا، بە هۆی ئەوەوە گەڕان بە بێ بڕوا و قورئان ئەو هەموو هێرش و هەڕەشانەی ئاراستە کردن، ئەوانە ئەوەندە نەفام بوون نەیان ئەزانی کە بڕوایان بەو خوای کە داهێنەری بوونەوەرو خۆیانە، تەگبیر کەرو بەڕێوەبەری ئەم بوونەوەرە و خۆیانە، نەیان ئەزانی کە ئەو بڕوایانە داخواز و پێویست کەرە لەسەریان کە ئەبێ هەر شوێنی بەرنامە و شەریعەتی ئەو خوا بکەون، وەك لە چەند شوێنێك لە قورئاندا دەست نیشانیان بۆ ئەکات و سەرنجیان رائەکێشێ بۆ ئەوە، یەکێ لەو شوێنانە ئەم سێ ئایەتە بوو لە سەرەتای ئەم سورەتەدا، ئەم رابەرو بەڵگەیانەی کە لەم سەرەتادا ئاماژەی بۆ کردن، هەرچۆنێ رابەر و بەڵگەی روون و بەهێزن لەسەر تاك و تەنیایی خوا باشتر رابەر و بەڵگەی روون و رەوان و بەهێزن لەسەر بوونی خوا و ئەو هەموو سیفەتانەی کە شایستە و پێویستن بۆ خوا و خوایەتی یەکەی، باشتر دەم کوت کەرو رێگرو پەك خەری ئەوانەن کە لاف بێ بڕوایی لێئەدەن لەم چەرخ و سەردەمی نەفامی تازەدا، خۆیان بێزراو و قیزەون و چەپەڵ ئەکەن لای هەموو ژیرێك بەمەی دەم بازی ئەکەن بە دەربڕینی بڕوا نەبوونیان بە بوونی خوا!!

بەڕاستی مەردووم کە بیر ئەکاتەوە وا گومان ئەبات کە ئەو لاف بێ بڕوایی یە هەر بە دەمی رووت ئەڵێن و لە دڵیانەوە نایەت و نەهاتووە، بەڵکو لە یەکەم جارەوە لە داخی کەنیسە و پیاوانی کەنیسە ئەو لاف و قسانە کران و دەرخران، مەبەست بەرگری کردن و بەرەنگار وەستانی ئەو هەموو ستەم و شتی پڕو پوچە بوو کە لە کەنیسەوە هات و پیاوانی کەنیسە

ئابرووی خۆیـان و كەنیسە و ئایینەكەیان پـێ بـرد، ئینجا جوولەكە ئەوەیان بە هەل زانی گەشەیان كرد بەو بێ بڕوایی یە لە ولآتاندا، بە هەموو فڕو فێڵ و پیلانێك پەرەیان پێ سەندو بلآوەیان پێكرد بۆ رووخاندن و لە ریشە هێنانی یاسا و بنەڕەتی ژیانی ئادەمی و پچڕینیان لە خواو عەقیدەو بڕوای پاك و خاوێن، تا بەهۆی ئەوەوە هەموو كەس – بێجگە لە خۆیـان – لەم جیهانەدا سەریان لێ بشێوێ و سەرگەردان بن، ئەو كاتە هەموو جیهانیـان بكەونە ژێر دەسەلآتی ئەمان و بەر حوكمیان بن – وەك بە تەمای ئەوەن و ئەیلێن لە(بروتوكولات حكماء صهیون) یدا هەیە و بڕوایان لەسەریەتی – هەرچەند پیلانەكەیان بەهێز بوو، كاری كرد لە زۆربەی ناوچەكانی جیهانـدا بە جۆرێك ماوەیەك هەورو تەم دوكەڵی رەش و تاریكی بێ بڕوایی و ماددێتی سەری جیهانی گرت و كردی بە شەوە زەنگ، بەلآم نەیان توانی سروشتی ئادەمی بگۆڕن و زاڵ بن بەسەر هەست و ژیریـدا، بەهۆی ئەوەوە فڕو فێڵ و پیلانەكەیان خاو بوویەوەو هەڵوەشایەوە، مەردوم بیری كردەوە و بێ بڕوایی فڕێدرا و بەرە بەرە ئەو هەورو دوكەڵە رەش و تاریكە كشایەوە بەلای سەروی جیهانـدا، تا رادەیەك وا ئومێد و چاوەڕوانی ئەكرێت كە پێش تەواو بوونی ئەم چەرخە و سەردەمە ئەو ماددێتی و بێ بڕوایی یە بە تەواوی توڕ بدرێ و بە قیزەون سەیر بكرێ و پیسی و چەپەڵی یەكەی ئاشكرا ببێ لە هەموو جیهانـدا، بەڵێ جوولەكە لەو بارەیەوە نەگەیشت بە ئامانج، بەلآم لە بارێكی ترەوە گەیشت، كە توانی ئایین بگێڕێ بە تەنیا هەست و هەڵسان بە نیشانە و دروشم و دوورخستنەوەی لە ژیان و رووداوەكانی ژیان، مەردومی هەڵخەڵەتان كە ئەگونجێ بڕوا بە خوا كۆ ببێتەوە لەگەڵ بڕوا بە بەرنامە و یاساكانی تر كە لە خواوە نەهاتبن و بەو یاسا و بەرنامانە كاروباری ژیان ببرێ بەڕێوە! ئەو جوولەكانە مەبەستیان هەر ئیسلام و دوور خستنەوەی شەریعەتی ئیسلامە، چونكە لە مێژووی خۆیاندا بۆیان دەركەوتووە كە تەنها ئەم ئایینە زاڵ ئەبێ بەسەریاندا كاتێ كە حوكمڕان بێت بەسەر ژیاندا، ئەوان زاڵ ئەبن بەسەر موسڵماناندا تا ئەمان حوكم نەكەن بە ئیسلام، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بە موسڵمان دابنێن!!

وا دەرئەكەوێ كە جوولەكە – سەهیونی – و گاورە سەلیبی یەكان نائومێد بوون لەوەی كە بڕوا و ئایین نەهێڵن لەم ولآت و ناوچە ئیسلامی یانەدا لە رێگای ماددێتی و بێ ئایینی یەوە، هەرچۆنێ نائومێد بوون كە ئەم ئیسلامە نەهێڵن و بیگۆڕن بە ئایینێكی تر لە رێگای

داگیر کەرو تەبشیرەوە... ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە سروشتی ئادەمی خۆی قێز ئەکاتەوە لە بێ بڕوایی و بێ ئایینی و شتی وا وەرناگیرێ و تورِی ئەدات، تەنانەت لەناو بت پەرستەکانیشدا – چ جای موسڵمانان –، ئایینەکانی تریش ناتوانن بچنە ناو هەر دڵێکەوە کە ئیسلامی ناسیبێ، یان بە کەلەپوور و شوێن کەوتنی باوك و باپیر بۆی بەجێ مابێ، جا لەبەر ئەوە ئەو جوولەکە و گاورانە لایاندا لە پیلانەکەی لەوەو بەریان کە لە ڕێگەی شیوعی یەت و تەبشیرەوە هەوڵ بدەن بۆ بەرگری ئیسلام، لایاندا بۆ چەند ڕێگایەکی تر بۆگەن تر و خەڵەتێنەر تر: ناچاربوون بەوەی لە ناوچەکانی ئیسلامدا چەند ڕژێمێکی ناڕاستی دەست کرد پێك بێنن بەناوی ئیسلامەوە و لە دیمەن و پۆشاکی ئیسلامدا کە بەدەم دان بنێ بە ئیسلامدا و دژی نەبێ بە تێکڕایی و بە شێوەی گشتی، ئینجا لە ژێر ئەو پەردەدا هەموو ئامانج و تەگبیرەکانی کۆنگرەکانی تەبشیر و پرۆتۆکۆلاتەکانی سەهیۆنی یەکان بەجێ بێنن کە خۆیان بۆیان بەجێ نەهات لەو ماوە دوورو درێژەدا ئەو ڕژێمە خەڵەتێنەرانە بە رواڵەت ئالأی ئیسلام بەرز ئەکەنەوە یان هیچ نەبێ وای دەرئەبڕن کە ڕێزیان هەیە بۆ ئایین لە کاتێکدا کە شەریعەتی خوایان دوور خستووەتەوە لە ژیان، ئەوەی ئەو حەرامی کردووە ئەمان حەڵاڵی ئەکەن، ئەوەی کە حەڵاڵی کردووە ئەمان حەرامی ئەکەن، بۆچوون و ڕەوشت و کرداری بڵاو ئەکەنەوە کە لەسەر ڕێبازو ڕەوڕەوەی ماددیێتی ئەڕوات و ڕەوشت و بۆچوونەکانی ئیسلام ئەڕوخێنن و لە ریشەیان ئەهێنن، ئەوەی کە کۆنگرەکانی تەبشیر و برۆتۆکۆلاتی سەهیونی بڕیاریان لەسەردا بە ڕێك و پێکی بەجێی ئەهێنن کە پیس تر و کوشندە تریان ئەوەبوو: ئافرەتەکان بە رووت و قوتی بێنە دەرەوە بە بێ باك و بێ شەرم بسوڕێنەوە بە کۆڵان و بازاڕ و دەشت و دەر و هەرشوێنێ کە ئارەزوو بکەن، بەناوی پێشکەوتن و شارستانی یەتەوە، بەناوی بەرژەوەندی و زۆر کردنی کار و بەرهەمەوە کارگەکان و فەرمانگەکان پڕ بکەن لە ئافرەت، دەستیان بکێشنەوە و دووریان بخەنەوە لە کارو پیشە گرنگ و پیرۆزو بە نرخەکانیان کە بریتی یە لە پێگەیاندن و پەروەردە کردنی ماڵ و خێزان، بە بێ ئەوە پێویستی و ناچاری یەك ببێ بۆ ئەوە، بەڵکو لە کاتێکدا کە ملیۆنەها پیاوانی دەست بەتاڵ بە بێ کارو ئیش کەوتووە و داماوە بۆ کار و ئیشێك کە خۆی پێ بژیەنێ، بە هەموو جۆر و شێوەیەك لە هەموو بار و ڕوویەکەوە هۆی بەرەڵایی و بێ

نامووسی و بەد خوویی و داوێن پیسی بڵاو ئەکەنەوە و پەرەی پێ ئەدەن، کە لە راستیدا مەبەست و ئامانجەکەش هەر ئەمەیە. بەم رژێمە خەڵەتێنەرانە هەڵسن بەو کار و کردەوە بۆگەن و ناپەسەندانە لە کاتێك دا لاف موسڵمانێتی لێئەدەن و خۆیان دائەنێن بە پارێزەر و بەرگری کەر لە ئیسلام! مەردومە داماوەکانی ئەم ناوچانە وا گومان ئەبەن کە لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵماناندا ئەژین!! ئایا ئەوە نی یە نوێژو رۆژوو فەرزەکان بەجێ ئەهێنن؟؟ ئەو وڵات و ناوچە ئیسلامی یانە بەو جۆرە دوور خرانەوە لە ئیسلام و دانیشتوان هەڵخەڵەتێنران و وا تێگەیەنران کە هەر موسڵمانن و لە ژێر سایە و ئاڵای ئیسلامدان، لە کاتێکدا هەموو ژیانیان دامەزراوە لەسەر بۆچوون و شەریعەت و یاسایەك کە دژو روخێنەری ئیسلامە، کەواتە ئاوات و ئامانجی سەلیبی و سەهیۆنی یەکان بەدی هات بە بێ ئەرك و زەحمەت، ئینجا بۆ ئەوەی هەڵخەڵەتاندنەکە بەتین تر بێت ئەو سەلیبی و سەهیۆنی یانە جار بەجار جەنگ و ئاژاوەیەك فەراهەم ئەهێنن و لە نێوان خۆیان و ئەم رژێمانەی کە دەستکردی خۆیانن و بە هەموو جۆر لە ژێرەوە یارمەتی دەرو کۆمەکیانن و ئەو جەنگ و دوژمنایەتی و ئاژاوەیانەی پێ دروست ئەکەن تا هەڵخەڵەتاندنەکە بەهێزتر بێ، بۆ ئەوەی بە کرێ گیراوەکان نەناسرێن و کار و کردەوە بەدەکانیان باشتر بڕوا لەناو گەل و کۆمەڵی بەناو موسڵماندا، ئەو خزمەتە گەورە گرنگەی کە پێی هەڵئەسن بۆ دوژمنانی ئیسلام و بەوانە نەئەکرا و ناشکرێ، ئەو خزمەتە زۆر گەورەو گرنگەی کە بریتی یە لە دوور خستنەوەی رۆڵەکانی ئیسلام لە ئیسلامەکەیان و پچڕین و دوور خستنەوەیان لە سەرچاوەی هێزو بەرزی یەکەیان کە بریتی یە لە ئیسلام و بیرو باوەڕەکەیان. ئینجا ئەگەر کەسانێ مابنەوە لە وڵاتەکانی ئیسلامدا کە هەڵنەخەڵەتابن بەو فڕو فێڵە شەیتانی یانە و بەباشی تێگەیشتبن لە ئیسلام و ئەو رژێمە بەدانە دانەنێن بە ئیسلام، بەرەڵایی و بێ نامووسی بە پێشکەوتن دانەنێن.. ئەگەر کەسانێ بە پاك و خاوێنی مابنەوە و داوای گەڕانەوە بکەن بۆ ئیسلامی راستەقینە و گەڕانەوە بۆلای قورئان و رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو لایەکەوە ئەوان گەمارۆ ئەدرێن و قسەی ناڕاست و ناڕەوا ئەخرێتە شوێنیان و مەردومان بەد گومان ئەکرێن دەرهەقیان و ناو ئەبرێن بە کۆنە پەرست و دواکەوتوو، شتێکی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر هەیە لەناو ئەو موسڵمانانەی کە ئەژین لە ژێر ئەو ئاڵا پڕو پووچانەدا، هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن بۆ لابردن و نەهێشتنی

هێندێ بێ شەرعی بچوك و ئیتر باسی گەورەترین گوناهەکە ناکەن کە بریتی یە لە حوکم کردن بە دژو پێچەوانەی کە خوا ناردییە خوارەوە، باسی ئەوە ناکەن کە حوکم و بڕیارو بەرنامەی تاغوت بەکار ئەهێنرێ لە ژیاندا، باسی ئەوە کە بیر و باوەڕی یان رۆژئاوا یان رۆژهەڵات کاربەدەستە کە ئەوە بناغە و بنەڕەتی هەموو دەردو بەڵایەکە، لەگەڵ بوونی ئەوەدا هیچ چاکە و چاك کردنێکی تر نرخ و کەڵکێکی ئەوتۆی نییە، لەگەڵ رازی بوون پێی بڕوا بە ئیسلام نامێنێ و خوا هیچ کردەوەیەکی چاکەی وەرناگرێ، بێ دەنگ بوون و بێزاری دەرنەبڕین لێی مایەی نەفرینی خوایە - خوا پەنامان بدات لێی - بێگومان سەهیۆنی و سەلیبی یەکان زۆر شادومان و دڵشادن بەم تەگبیر و پیلانە دوایی یە کە بەکاریان هێنا لە وڵات و ناوچەکانی ئیسلامدا لە پاش ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ هەوڵیاندا ناو و باسی ئیسلام نەهێڵن و بۆیان دەرکەوت کە نەکرا و نایش کرێ، زۆر دڵشاد و شادومانن بەوەی کە توانی یان ئەو رژێم و یاسا و بەرنامە بۆگەنانەیان چەسپاند لەناو موسڵماناندا، چونکە ئەزانن دوای ئەوە ئیسلام هەر ناوێکی رووتی ماوەتەوە، ناوی رووتیش جێگەی مەترسی نییە و زیانی نییە بۆ مەبەست و ئامانجە بۆگەنەکەی ئەوان. بەڵام بە یارمەتی خوای میهرەبان لەم تەگبیر و پیلانەشیاندا بە زوویی نائومێد و رەنجەڕۆ دەرئەچن، ئەوەتا لە هەموو لایەکەوە - تەنانەت لە ناوچەکانی ئەوانیشدا - دەنگ بەرز کراوەتەوە و داوای لابردن و نەهێشتنی ئەو رژێم و یاسا دەست کردانە ئەکرێ و گەڕانەوە بۆ ژێر ئاڵای قورئان و ئیسلام، تا بێت دەرئەکەوێ کە هۆی هەموو بەدبەختی و سەرشێوان و بێ ئارامی و ئاژاوە لە جیهاندا بوونی ئەو رژێمە بۆگەنەیە، تاقانە چارەسەرو رزگار کەر هەر ئیسلامە، سوپاس بۆ ئەو خوایە کە تا بێت تیشك و رووناکی ئایینە پیرۆزەکەی دەرئەخات بۆ بەندەکانی.

وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُواْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُواْ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾

بێگومان ئەم سێ ئایەتی رابوردووە بەڵگەو نیشانە و رابەری زۆر سووك و ئاسان و بەهێزی نیشانداین لەسەر بوونی خوایەتی بە دەسەڵاتی کارزانی کاردروست بە جۆرێکی وا کە بەر ئەبڕێتەوە و رێگە ناهێڵێتەوە – بۆ هەرکەس کە رێزی خۆی بەلاوە بێت – وەك ئەندازەیە روونمانکردەوە لەمەوپێش مەگەر کەسێك کە سەرکێشی و لارە جڵەوی بەکار بێنێ و بیەوێ هەر دەمبازی بکات، چاوی خۆی بنوقێنێ و روو وەرگێڕێ لەو هەموو رابەرو بەڵگە ئاشکرایانە وەك ئەوانەی کە ئەم ئایەتە ئاماژەیان بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُواْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ ئایەت بۆ ئەوانە هیچ رابەرو بەڵگەو ئایەتی لە رابەر و بەڵگە و ئایەتەکانی پەروەردگاریان مەگەر ئەوانە گوێ پێ نەدەر و روو وەرگێڕ بوون لێی و بە هەمیشەیی روو وەرگێڕن، واتە ئەوانە هەڵوێستیان هەر سەرکێشی و گوێ پێ نەدان و پشت تێکردنە، بەرامبەر هەر ئایەتێك کە هاتبێت و بۆیان دەرکەوتبێ، ئیتر مەبەست موعجیزە و رابەری ژیریی بێت، وەك هێندێ ئەفەرمون، یان مەبەست هەر ئایەتێك بێت لە ئایەتەکانی قورئان کە پەیتا پەیتا ئەهاتن و هەرکام لەوانە خۆیان بەڵگە و رابەرێکی ئاشکران لەسەر راستی ئەو ئایینە پیرۆزە کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێنان و دەست نیشانیش ئەکەن بۆ ئەو رابەرو بەڵگە ژیریی یانەی کە خوای پەروەردگار دای ناون لە دەروونی خۆیان و لەم بوونەوەرە گەورە و فراوانەی کە تیایدا ئەژین، لەسەر ئەم بارە کە رای زۆربەی لەسەرە، واتە هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان هاتبێتە خوارەوە و بێت بۆ سەریان – کە هێندێ لەو ئایەتانە ئەو سێ ئایەتە بوون کە تێپەڕیان کرد و ئەندازەیە تەفسیر و راڤە کران – هەر ئایەتێك لەو ئایەتانەیان بۆ بێت ئەوان رووی لێوەرئەگێڕن ﴿فَقَدْ كَذَّبُواْ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە بڕوایان نەهێنا بە هەق و بە راست – واتە قورئان یان ئایینی ئیسلام – و بە دووریان

دانا کاتێ بۆیان هات، واته هەر لەگەڵ هات بۆیان ئیتر به بێ بیر لێکردنەوه و تێ فکران بێ بڕوایی خۆیانیان دەربڕی و به درۆیان دانا که ئەوەش ئەوپەڕی سەرکێشی و نەفامی یه، ئەگەر مەبەست ئایەت و رابەره بوونەوەری یەکان بێت ئەوا ئەڵێین وەك خاوەنی(کشاف) ئەفەرموێ: ئەوانه که روو وەر ئەگێڕن لەو رابەرو بەڵگه بوونەوەری یانه با سەرت سوڕ نەمێنێ لێیان، چونکه ئەوان بڕوایان نەهێنا و روویان وەرگێڕا له شتی گەورەتر و ئاشکراتر که ئەو شته هەق و راستەیه بۆیان هات، ئیتر مەبەست قورئان یان ئایینی ئیسلام یان پێغەمبەر بێت، که هەرکام لەم سیانه له هەموو رابەرو بەڵگەیەکی تر ئاشکرا ترن، کەواته لەسەر هەر بار ئەوانه بەهێزترین هۆو پاڵدەریان هەیه بۆ بڕوا هێنان، هیچ بڕو بیانوویەکیان به دەستەوه نی یه، کەواته بڕوا نەهێنانەکەیان هەر به دەستی قەسته لەبەر لاری و سەرکێشی یانه، کاتێ ئەوانه بەو جۆره بن ئەبێ بترسێنرێن و هەڕەشەیان لێ بکرێ، چونکه ترساندن و هەڕەشه له هێندێ کات دا بەکار و جێ ئەگرێ لەبەر ئەوه ئەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنبَـٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ کەواته لەمەو پاش دێت بۆ ئەوانه هەواڵه گرنگەکانی ئەو شتەی که ئەوانه به هەمیشەیی لاقرتی پێ ئەکەن، واته هەواڵ و بەسەر هاته گرنگەکانی قورئانیان بۆ دەرئەکەوێ و ئەزانن که لاقرتی یان به چ شتێ کردووه، بۆیان دەرئەکەوێ که ئەم قورئانه سزای ئەم جیهان یان ئەو جیهان، یان هەردوو بۆ سەریان یان له کاتی سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئیسلام و بەرز بوونەوەی ئاڵا و وتەی ئیسلام، بەم جۆرو شێوه کورت و نادیاری یه ئەو هەڕەشەی ئاراسته کردن به بێ باسی جۆرو کاتیان تا هەموو کاتێ له چاوەڕوانی دا بن.

ئینجا لەم کاتی ترساندن و هەڕەشەدا سەرنجیان رائەکێشێ بۆ له ریشه هێنان و لەناوچوونی گەله بێ بڕواو لاقرتی کەرەکانی رابوردوو که هێندێ لەوانه ناسراو و بەناوبانگ بوون، نیشانه و دروشمی شوێن و جێگەکانیان هەر مابووەوه به چوار دەوریان دا و گەلێ جار گوزەریان ئەکرد به لایان دا له کاتی کاروانی هاوین و زستانیاندا،

أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ﴿٦﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا﴾ ئایا ئەوانە نەیان زانیوە ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ﴾ کە ئایا لە پێش ئەوانەوە چەند گەل و ئوممەتمان لەناو برد و نەمان هێشت، یان ئایا نەیان زانیوە کە ئێمە لە پێش ئەوانەوە گەل و ئوممەتی زۆرمان لەناو برد، واتە زۆر ﴿مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ دامانمەزراندبوون لە زەوی دا و جێ و شوێن و دەسەلاٌت و هۆی ژیان و سەرکەوتنمان پێ دابوون ﴿مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ﴾ بە دامەزراندن و دەسەلاٌتێ کە نەمان دابوو بە ئێوەو فەراهەممان نەهێنا بۆتان، ئەی ئەوانەی کە ئەم قورئانە هات بۆتان، واتە ئەوان دامەزراو ترو بە هێزتر بوون لە ئێوە لە ولاٌتی خۆیان دا، ئەوەی کە درا بوو بەوان زۆر و فراوانتر بوو لەوەی کە درا بە ئێوە ﴿وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا﴾ رشتمان و باراندمان بەسەریان دا بە زۆری و فراوانی و تێرو تەسەلی ﴿وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ﴾ جۆگەو رووبارەکانمان گێڕا بە جۆرێ کە ئەهاتن و ئەچوون بە ژێر جێ وشوێن و دارو درەخت و باخەکانیان دا، واتە بە خۆشی و کامەرانی ژیانیان ئەبردە سەر لەناو باخ و بێستان و کانیاو و ئاوی زۆر و رۆزی و میوەی فراوان دا، ئینجا ئەوانە چۆن بوون و چی یان کردو چی یان بەسەرهات؟ ئەوانە خۆیان لێ گۆڕا و یاخی بوون لەو پەروەردگارە بەخشندەیە، سەریان کردە تاوان و خراپەکاری، لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ ئینجا ئێمەیش لەناومان بردن بەهۆی تاوان و گوناهەکانیانەوە ﴿وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ دروستمان کردو دامان هێنا لە پاش ئەوان گەل و ئوممەتێکی تر، لە جێی ئەوان و لە باتی ئەوان کە ولاٌتە وێرانەکە ئاوەدان بکەنەوە! کەواتە ئەو بێ بڕوایانە زۆر سووك و ترۆ و بێنرخ بوون لای خواو لای بەندەیانی لای خوا و لای ولاٌتەکانی لای خوا، تێپەڕیان کرد بە ریسوایی و سزاو ئازارەوە و دووچاری دەردی نەبڕاوەی خۆیان بوون و ناو و باویشیان نەما مەگەر بە تف و نەفرین لێکردن، واتە هیچ**

کەس و هیچ گەل و کۆمەڵ و چینێ خۆی پێ ناگیرێ بەرامبەر قارو خەشمی خوا، هەرچەند لە جیهان دا بەرزو بەهێزبن، لەکاتی دیاریی کراودا ئەبێ لەناوچن!

بەڕاستی هەڕەشە و ترساندنێکی زۆر سەخت و سامناکە و هەق وایە هەموو کەس سام و بیمی لێ بنیشێ و تەمێ خوار ببێ، ئەمەی کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ کرد شتێکی راست و روون و ئاشکرایە لای هەموو ژیرو خاوەن فامێك، زۆر جار بەچاو ئەبینرێ کە خوا دەسەلأت و سامان و خۆشی ئەدا بە کەسێك یان بە چین و تاقمێك، کەچی لەباتی ئەوەی زۆر مل کەچ و چاو لەبەرێتی بۆ خوا و بە هەموو جۆر هەوڵ بدا بۆ رەزامەندی خوا، لەباتی ئەوە بە پێچەوانەوە هەموو هێزو دەسەلأت و سامانەکەی بەکار ئەهێنێ لە دەست درێژیی و تاوان و خراپەکاریدا، ئینجا دەستی قودرەت دێتە کار هەریەکە و هەر چینێ دووچاری سزایەکی سەخت ئەکات بەو جۆرو شێوەی کە خوا خۆی ئەزانێ. جاری وابووە بە سزایەك لەلای سەروویانەوە یان لەلای خوارو ژێریانەوە تا لەناوی ئەبردن و لە ریشەی ئەهێنان، وەك روویدا بۆ گەلەکەی(لوط) پێغەمبەر(ﷺ)، هێندێ بە سزای قات و قڕی و برسێتی، هێندێ جاری تر بە سەر لێ شێوان و تێك بەردانیان لە یەکتر و هەمیشە لە بیم و ترسدا ژیان بە بێ ئارامی و هەروەها...

ئەم ئایەتە و وێنەی کە لە قورئاندا زۆرە، باوێك لە باوەکانی خوامان نیشان ئەدات، و تێمان ئەگەیەنێ کە گوناهو تاوانەکان هۆی سزاو ئازارو لەناو چوونی خاوەنەکانیانن، خوا بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە گوناهباران و تاوانباران دووچار ئەکات و ئەبێ بزانین کە ئەوە باوێکی نەگۆڕاوە ئیتر زۆری پێ چووبێ و بچێ یان کەم، یان زۆر کەس بووە و هەیە کە بە چاوی خۆیان ئەوەیان نەدیبێ و نەی بینن لە ماوەی تەمەن و ژیانیاندا.

ئینجا هەمیتر لەسەریان ئەڕوا و سەرکێشی و نالەباری ئەو بێ بڕوایانە روونتر ئەکاتەوە، وێنەو نموونەیەکمان ئەخاتە بەرچاو کە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە لەگەڵ ئەوەدا ئەو نموونەیە تایبەتی نییە بەو یەکەم چینەی کە یەکەمجار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، بەڵکو لە هەموو چەرخ و چینێکدا هەر بووەو هەر هەیشە، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ﴾ ئەگەر بمان هێنایەتە خوارەوە بۆ سەرت نامەو نووسراوێك لە کاغەزێکدا ﴿ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾ ئینجا بەچاوی خۆیان ئەو نامەو نووسراوەیان بدیایە و بە دەستی خۆیان دەستیان

لێبدایە ﴿فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە و لە زانینی خوادا تێپەڕی کردووە بڕوا نەهێنانیان، ئەوانە ئەو کاتە ئەیانگوت: ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە هیچ نییە بێجگە لەوەی کە جادویەکی روون و ئاشکرایە، واتە بڕوا نەهێنان و روو وەرگێڕانیان لە ئایەتەکانی خوا، لەبەر ئەوە نییە کە بەڵگەی ئاشکرا نەبێ لەسەر راستی ئەو ئایەتانە، یان بەڵگە لەسەریان لاوازو بێ هێز بێت، یان بەڵگەی ئاشکرا نەبێ و تێی نەگەن، بەڵکو هۆی بڕوا نەهێنان و روو وەرگێڕانیان هەر عیناد و سەرکێشی یە و نایانەوێ دان بنێن بە هەق و راستیدا، ئەوەتا ئەگەر ئەم قورئانە بە سروش نەهاتایە کە هاتنەکەی بە بەر چاوەوە نییە، بەڵکو بەو شێوە بهاتایە کە باس کرا ئیتر ئەوە ئەوپەڕی رادەیە لە ئاشکرا کردندا، هەر هێشتا ئەوانە بڕوایان نەئەهێنا و ئەیان گوت: ئەمە جادووە و بێ بنچ و بنەوانە!!

بەڕاستی شێوە و وێنەیەکی ئێجگار ناشیرین و بێزراوە و هۆی هەڵگیرسانی داخ و رق و خەشمە دەربارەی ئەوانەی کە خاوەنی ئەو دڵە رەق و رەشە و ئەو مێشکە پووت و پووچەن، هاندەرە بۆ هێرش و پەلامار دان و داپڵۆسین، نەخشە کێشانی ئەو شێوە بەدو بێزراوەیان چەند مەبەستێکی گرنگ پێك ئەهێنێ:

١- ئەوانە ئاگایان لە خۆیان نییە و هەست ناکەن بەو سروشت و هەڵوێستە ناشیرین و بەدەی کە هەیانە، ئینجا بەم نەخشە و وێنەیە خۆیان ئەخرێتە بەرچاوی خۆیان و تەریق ئەکرێنەوە پێی بە وێنەی کەسێکە کە زۆر ناشیرین و بێزراو بێت و رووخساری بەدی خۆی نەدیتبێ، ئینجا یەکێك ئاوێنەیەکی ساف ببا لە بەردەمیدا داینێ تا خۆی ببینێ و شەرمەزار ببێ پێی.

٢- ئەو شێوە و نەخشەیە دڵ و دەروونی بڕواداران ئەبزوێنێ و دەمار و غیرەتیان گرژ ئەکات و ئەیانهێنێتە جۆش بەرامبەر ئەو بێ بڕوا و سەرکێشانە و سوور تر و دامەزراو تریان ئەکات لەسەر بڕواو ئایینە راستەکەیان.

٣- بڕواداران بێدار ئەکاتەوە بە ئارامی و پەلە نەکردنی خوا دەربارەی ئەو بێ بڕواو سەر کێشانە، کەواتە با ئەمانیش کۆڵ نەدەن و پەلە نەکەن و بوەستن بە بەرکاری خواوە و بێ ئارام نەبن.

هەموو ئەوانە چەكێكی بەكارن بۆ بڕواداران كە بە كاری بێنن لەو بەربەرەكانێی كە هەیانە لەگەڵ ئەو سەركێشانەی كە ئەیانەوێ بەرگری ئایین و قورئانەكەیان بكەن. ئینجا نموونەیەك باس ئەكات لە پەڵپی بێجێ و بڕو بیانووی نارەوای بت پەرستەكان، ئەفەرموێ:

﴿وَقَالُواْ﴾ ئەوانە گوتیان: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ﴾ با بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەر محمد فریشتەیەك كە هاوڕێی بوایە لە راگەیاندنی بانگ كردنەكەیدا، شایەتی بدایە لەسەر ئەوەی كە لەلایەن خواوە هاتووە، ئینجا بەرپەرچی پەڵپەكەیان ئەداتەوە بە جۆرێ كە دەری ئەخات كە ئەوانە نەزان و بێ ئاگان لە سروشتی فریشتە، بێ ئاگان لە باوی خوا لە ناردنی فریشتەدا، هەرچۆنێ دەست نیشانیان بۆ ئەكات كە خوا میهرەبانی بەكار ئەهێنێ لەمەی كە پەڵپ و بیانووەكەیان بەجێ ناهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ ٱلْأَمْرُ﴾ ئەگەر فریشتەمان بناردایەتە خوارەوە كار لە كارەگا ئەترازێنرا و بڕیارو كاری لەناو بردن و لە ریشە هێنانیان جێبەجێ ئەكرا، ئەوەش بە پێی باوی خوا لە گەلە پێشووەكاندا كە هەر كاتێ پەڵپی شتێكیان گرتبێ لە پێغەمبەرەكانیان و بەجێهێنرابێ و لە پاش ئەوە بڕوایان نەهێنابێ خوا لەناوی بردوون و لە رەگ و ریشەی هێناون لەسەر دەستی فریشتەدا، خوایش نایەوێ ئەم ئوممەتە ئەوەی بەسەر بێ، چونكە ئەمە دواترین ئوممەتە و خوا بڕیاری وایە كە بمێنێ تا رۆژی دوایی، ئینجا كاری سەخت تریان ئەمەیە كە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو ناردنە خوارەوە ئەوانە ماوەو مۆڵەت نادرێن و بەبێ دواكەوتن ئەو سزایە ئەدرێن كە ئەمرن و لەناو ئەچن پێی. ئەم رستەیە بەجۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام ئەوەمان هەڵبژارد كە گوتمان، چونكە بەهێزترو هەڵبژێرراوە بەلای زۆربەوە، رێك تریشە لەگەڵ ئایەتی سورەتی(الحجر) دا: ﴿مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذًا مُّنظَرِينَ﴾ ئێمە فریشتە نانێرینە خوارەوە مەگەر بە كارێكی راست و بەجێ كە بریتی یە لە گەیاندنی پەیام بۆ فروستادەكان، یان سزادانی ئەو گەلانەی كە سەركێشی بەكار بێنن پەڵپی بێجێ بگرن، ئەو كاتە ئەوانە مۆڵەت نادرێن، ئەو بێ بڕوایانە دوو پەڵپیان گرت:

١- ئەمەبوو كە لەمەو پێش باسمان كرد: با فریشتەی لەگەڵ بهاتایە و شایەتی بدایە لەسەر پێغەمبەرێتی یەكەی.

٢- ئەیان گوت پێغەمبەر ئەبێ فریشتە بێ، کەواتە ئێمە بڕوا ناهێنین بە محمد کە ئادەمی یەکە بە وێنەی خۆمان، جا لێرەدا هەڵئەگرێ لەم سورەتەدا مەبەست بەرپەرچ دانەوەی هەر پەڵپی یەکەم بێ، ئەو کاتە ئەڵێین: بە دوو جۆر بەرپەرچی دایەوە، یەکەم ئەوەبوو کە تێپەڕی کرد، دووەمیش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا﴾ ئەگەر ئەوەی کە داوای هاتنە خوارەوەیان کرد بۆ ئەوەی شایەت بێت، ئەگەر ئەوەمان بگێڕایە بە فریشتە ﴿لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا﴾ ئەبو بمان گێڕایە بە پیاوێك واتە بمانبردایەتە سەر شێوەی پیاوێك تا بتوانن ببینن، چونکە ئەوان توانای بینینی فریشتەیان نییە لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی، دیارە ئەو کاتە هیچ سوودێك نەئەبوو لە ناردنەکەیدا، چونکە ئەیان گوت ئێمە داوای فریشتەمان کردووە و ئەمەی کە هاتووە پیاوێکە وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾ ئەو کاتە ئەمان شێوان لەسەریان و ئەمان کرد بە گرێ ئەوەی کە خۆیان ئەیشێوێنن و ئەیکەن بە گرێ، واتە هەمان قسە و بەزمەکەی خۆیان ئەهاتەوە کایەوە، بەم ڕەنگە ئەیان گوت: ئێمە داوای فریشتەمان کردووە و ئەمە پیاوێکە، بە کورتی داوای هاتنی فریشتە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) پەڵپێکی ناڕاست و بێجێ بوو لەبەر دوو شت: یەکەم: ئەگەر بهاتایە ئەوانە تیا ئەچوون و خوایش نەیویستووە ئەوان تیا چن و لەناو ببرێن، دووەم: ئەگەر چاو لەوە بپۆشین و وا دابنێین کە تیا نەئەچوون، ناردنەکەی سوودی نەئەبوو و ئەوانی پێ دەم کوت نەئەکرا، چونکە ئەبوایە لە شێوەو وێنەی پیاوێکدا بهاتایە، ئەو کاتە دەم کوت نەئەکران و پەڵپەکەیان هەر ئەگرت.

ئەگەر ئەم فەرمودەیە بکەین بە بەرپەرچی دووەم بۆ داواو پەڵپی ناردنی فریشتە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا بەو شێوەی کە تێپەڕی کرد تەفسیری ئەکەینەوە، ئەگەر بیکەین بە بەرپەرچ دانەوەی ئەو پەڵپ و قسە بێجێ یە کە هەر لە کۆنەوە کراوە لەلایەن بێ بڕوایانەوە لە گەل و ئوممەتەکانی پێشوویش کە ئەیان گوت: پێغەمبەر نابێ لە ئادەمی بێت، بەڵکو

ئەبێ هەر لە فریشتە بێت، ئەگەر لەسەر ئەم بارە بڕۆین وەك هێندێ لە زانایانی لەسەرە، ئەو کاتە ئەڵێین: واتە ئەگەر پێغەمبەرمان بگێڕایە بە فریشتە و لە ئادەمی فروستادەمان نەناردایە، ئەبوو ئەو فریشتەیەمان لە شێوەی پیاوێکدا بناردایە تا مەردومان بتوانن ببینن و ئەوەی کە پێیان رائەگەیەنێ ببیسن و لێی وەرگرن، دەی ئەو کاتەش لایان وائەبوو کە ئادەمی یە، کەواتە کارەکەیان لێ ئەشێواو ئەکەوتنە ئەو گومان و گرێیە کە پەیدایان کردبوو بۆ خۆیان. بەڕاستی ئەم جۆر و باری دووەمە باشتر ئەچێتە دڵەوەو بەهێز ترە، هەرچەند جۆرو باری یەکەمیش هەر گونجا و رێکە. ئینجا لەسەر بار و جۆری یەکەم و دووەم چەند شتێکی گرنگ وەرئەگیرێ کە بە جوانی ئەزانم ئاماژە بۆکردنیان:

أ- دەرئەکەوێ کە ئەو بت پەرستانە بڕوایان بووە بە بوونی خوا و بڕو بیانوو و پەڵپێکیان نەبووە لەو بارەیەوە، بەڵکو داوای رابەرو بەڵگەیان کردووە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) رەوانە کراوی ئەوە، ئەم قورئانەش لەلایەن خواوە هاتووە و پەڵپی ئەوەیان گرتبوو کە با فریشتەیەکی لەگەڵ بێت و شایەت بێت لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی، بێجگە لەوە چەند پەڵپی تریان ئەگرت لەو بارەیەوە، وەك لە چەند شوێنێ لە قورئاندا باسی فەرموە، درێژ تریان ئەوەیە کە لە سورەتی(الأسراء) دا هاتووە لە ئایەتی(٨٩ – ٩٥)، بێگومان پەڵپ و بڕ و بیانووەکانیشیان دەربارەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەبەر لاری و سەرکێشی و نەفامی بووە و نەیان ویستوە دان بنێن بەو هەق و راستی یەی کە هات بۆیان، ئەگەر ئەوانە بە دوای بەڵگە و نیشانەدا بگەڕانایە، بەڵگە و نیشانەی زۆر بەهێز هەبوو، خو و رەوشتە پاك و خاوێنەکەی کە هەر لە منداڵی یەوە لەسەری هاتبوو، بەڵگەیەکی ئاشکرا بوو لەسەر راستی و پاکی یەکەی، ئەوانە پێش پێغەمبەرێتی یەکەی ناویان ئەبرد بە(الأمین)، لەبەر پاکی یەکەی شتی نەختینە و بە نرخیان لا دائەنا بە سپاردە تەنانەت لەو کاتانەیشدا کە ئەوپەڕی رادە دوژمن و دژی بوون تا ئەو رادەی بڕیاری تەواویاندا لەسەر لەناوبردنی، لەو کاتانەیشدا هەر ئەو سپاردانەی لابوو، ئەوەبوو لەو کاتەدا کە کۆچی کرد بۆ مەدینە ئیمامی عەلی بەجێ هێشت بۆ دانەوەی ئەو سپاردانە بۆ خاوەنەکانیان ! هەروەها

راستی و راست گۆیی یەکەی روون و ئاشکرا بوو بەلایانەوە، ئەوەبوو لە سەرەتای دەرخستنی پێغەمبەرێتی یەکەوە کۆی کردنەوە و پرسیاری لێکردن: ئەگەر هەر هەواڵێکیان پێبدا بڕوای پێئەکەن ؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ بڕوات پێئەکەین هەرگیز درۆمان لێنەدیوی، کەواتە ئەوانە بەدوای بەڵگەدا نەگەڕاون، بەڵکو مەبەستیان بەکار هێنانی سەرکێشی و لاری بووە، ئینجا لەپاش ئەوانە قورئانەکەی بەهێزترین و روونترین رابەرو بەڵگە بوو لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی لەچەند جار و روویەکەوە، بە باشی ئەیانزانی کە لە توانای ئادەمیدا نییە و بەرگری ناکرێ، لەبەر ئەوە دواترین بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە گوتیان سیحرو جادووە، ئایەتی پێشوو باش بۆمان روون ئەکاتەوە کە مەبەستیان بە دوا گەڕانی رابەرو بەڵگە نەبووە ﴿وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ﴾.

ب- لەو شتانەی کە وەرئەگیرێن لە پەڵت و بیانووەکانی ئەوان و بەرپەرچ دانەوەکانیان ئەمەیە: ئەو بێ بڕوایانە بڕوایان هەبوو بە بوونی فریشتە، بەڵام نەزان و بێ ئاگا بوون لە سروشت و چۆنی یەتیان، لە جۆری پەیوەندی یان بە خواو بەم جیهان و ئادەمی یەوە، وەك دەر ئەکەوێ لەو هەموو قسەو باسە پڕو پووچانەی کە قورئان لەلایەن ئەو بێ بڕوایانەوە ئەیان گێڕێتەوە و بەرپەرچیان ئەداتەوە و دەم کوتیان ئەکات لەسەریان، کەواتە دەرکەوت کە نەفامی تازە زۆر زۆر پەست تر و بێ ئاگا تر و دواکەوتوو ترن لە نەفامی کۆن، چونکە ئەمان بڕوایان نییە بە هەر شتێ کە هەستی پێنەکەن بە یەکێ لە هەستیارە ئاشکراکان کە ئەوە ئەوپەڕی رادە و پلەیە لە نەفامی و نەزانیدا، بەڵام نەفامی کۆن بڕوای بووە بە خوا و بە فریشتە و بە جین و گەلێ هێزی تریش، هەرچەند بڕواکەیان تێکەڵی پڕو پووچی زۆر کردووە. کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بە بانگ کردنی بێ بڕواکان بۆ بیر کردنەوە لە نەمان و لەناو بردنی گەل و کۆمەڵە پێشووەکانی وێنەی خۆیان کە - وەك ئەمان - لاقرتی یان کرد بە پێغەمبەرەکانیان، بانگیان ئەکات بۆ گەڕان بە وڵاتاندا و سەرنج دانی شوێنەواری ئەو وڵاتە وێران کراوانە،

وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾

---

**ئەفــەرموێ: ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ ســوێند بــەخوا گاڵتــە و لاقرتــی کــراوە بــە فروســتادان لــە پــێش تــۆ لەلایــەن گــەل و ئوممەتەکانیانــەوە، ﴿فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە دەوری ئەوانەیدا کە لاقرتی یـان کـرد بـەو پێغەمبەرانـە و هاتە سەریان تۆڵە و سزای ئەو شتە هەق و راستەی کە ئەوان لاقرتی یان پێ ئەکرد، یان هاتــە ســەریان و دەوری دان ئــەو ســزای کــە فروســتادەکان هەڕەشــەیان پــێ ئــەکرد لێیــان و ئەوانیش لاقرتی یان لێئەهات، لەسەر هەر بار ئەم فەرمودەیە دڵخۆشی دانەوە و دڵنەوایی تیایــە بــۆ پێغەمبــەرمان(ﷺ) لەســەر ئــەو هــەموو لاقرتــی و دەمبازییــەی کــە بــێ بڕواکــان ئاراستەیان ئەکرد، دڵ ئارام کردنی تیایە بە پاشەڕۆژی سەرکەوتنی هەق و هـەق ناسان، بە ســەرەنجام و دوا رۆژی بــەد بــەختی و لەناوچــوونی بــێ بــڕوا و لاقرتــی کــەران، واتــە بــا پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) غەمبار نەبێ، چونکە ئەو رووداو و بەسەرهاتە ناخۆشانە بە تـەنیا بۆ ئەم نەبووە، با شـادومان بێ بـەو باوی خوا کە تێپـەڕی کردووە لـە پێشووەکاندا، ئەوە لە بارێکــەوە، لــە بــارێکی تــرەوە ترســاندن و هەڕەشــەی تیایــە بــۆ ئــەو بــێ بڕوایانــە، ئینجــا ئەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێ بڕواو لاقرتی کەرانە بڕۆن بگـەڕێن بە زەوی و وڵاتان دا بە رۆیشتن و گەڕانێ کە بۆ بیر کردنەوەو تەمێ وەرگرتن بێ، بۆ ناسین و زانینی باو و رەوشتی خوا بێ کە تێپەڕی کرد لە گەل و ئوممەتـەکانی رابوردوودا، ئەو باوو رەوشــتەی کــە دەرئەکــەوێ لــەو نیشانە و دروشــم و شــوێنەوارانەی کــە بەچــاو ئــەیان بینن، بەناوبانگن و بە دەماو دەم باس ئەکرێن لەناو مەردومانـدا، نەك گـەڕان و رۆیشتنێ کە وەك جــاران هــەر بۆ بازرگــانی و رابــواردن بــێ، ﴿ثُمَّ ٱنظُرُوا۟﴾ ئینجـا لـەپاش ئـەوە سـەرنج بـدەن ﴿كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئایا چۆن بوو پاشەڕۆژی بێ بڕواکان؟ واتە ئایا چۆن بوو تۆڵە و سەرەنجامی بێ بڕوایی یەکەیان؟ چۆن سەرکێشی و بڕوا نەهێنانەکەیان بوو بەهۆی لەناو چوونیان لەسەر ئەو بارو شێوە سەخت و دڵ تەزێنە؟**

لەسەرەتای سورەتەکەدا باسی خوایەتی خواو تاك و تەنیایی خوای کرد و خستیە بەرچاو لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و داهێنانی تاریکی یەکان و رووناکی و دروست کردنی ئەم ئادەمی یە گرنگە لە قوڕ، تا بەندەکانی خوا هەڵسن بە داخوازی ئەو خوایەتی یە لە ژیانی خۆیاندا، بەمەی بە تەواوی مل کەچ و گوێ رایەڵ و فەرمانبەر بن تەنها بۆ ئەو خوایە، هیچ کەس و هیچ شتێ نەکەن بە هاوشان و هاوتای، بڕیاردانی حاکمێتی خوا لە هەموو کاروباری ژیاندا، هەرچۆنێ ئەو حاکمێتی یەی هەیە لە هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرەدا بە شێوەی گشتی، بەدوای ئەوەدا باسی بێ بڕوایی و روو وەرگێڕان و لاقرتی سەرکێش و بێ بڕواکانی هێنا، هەڕەشە و ترساندنێکی سەختی ئاراستە کردن، سەرنجی راکێشان بۆ بەسەرهات و پاشەڕۆژی رەش و تاریکی وێنە و هاوڕێکانیان لە گەل و ئوممەتەکانی رابوردوو.

لەپاش ئەوانە ئینجا جارێکی تر ئەوا باسی ئەو خوایەتی و تاك و تەنیایی خوا ئەکات و ئەیخاتەوە بەرچاو و دەری ئەخات لە خاوەنی ی و پادشایەتی خواو کاربەدەستی و کارکردنی خوا لە هەموو شتێکدا، تا بەهۆی ئەوەوە لە هەموو شتێکدا روو هەر بۆلای خوا بکات، هەر ئەو بە کاربەدەست و فەرماندار دابنێ، ئەفەرموێ: ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ئایا بۆ کێیە و هینی کێیە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە و کێ خاوەنی هەموویەتی؟ ئینجا فەرمان ئەدا کە خۆیشی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّهِۚ﴾ بڵێ بۆ خوایەو هەموو موڵکی خوایە، با خۆی وەڵامەکەی بداتەوە، چونکە ئەوانە – وەك بۆمان باس ئەکات – بە باشی دانیان بەوەدا ئەنا، بێجگە لەوە هەموو کەس ناچارە و ئەبێ هەر بەو جۆرە وەڵام بداتەوە، کەواتە مەبەست لەم پرسیارە وەڵام دانەوەی ئەوان نییە. بەڵکو مەبەست سەرزەنشت و دەم کوت کردنیانە کە چۆن لەگەڵ ئەوە هاوشان و هاوبەش بۆ خوا رەوا ئەدەن، چۆن حاکمێتی و کاربەدەستیی رەوا ئەدەن لەم موڵکی خوادا بۆ کەسێکی تر کە خۆشی وەك هەموو شتەکانی تر موڵکی خوایە؟! ئەوانە هەرچەند لەو بارەیەوە زۆر پەست و نەفام بوون، بەڵام زۆر بەرزتر و بەفام تر بوون لەم بێ بڕوایانەی کە لەم سەردەمی نەفامێتی تازەدا پەیدا بوون کە بە بێ هۆشی و نەزانی وەك وڕێنە بکەن بێ بڕوایی خۆیان دەرئەبڕن کە لە راستیدا هەرکەس بێبەش و بەش بڕاو نەبێ لەهەمووژیریی وتێگەیشتنێك تەریق ئەبێتەوەوشەرمەزارئەبێ لەوەی وتەی وابەدەمیدا بێت.

لەپاش ئەوەی باسی ئەوپەڕی توانا و دەسەڵاتی کرد بۆ زاتی پاکی خۆی، ئینجا باسی میهرەبانی و بەزەیی گشتی و فراوانی ئەکات، بەو جۆرە نەرم و ناسکە بانگی بەندەکانی ئەکات بۆ روو کردنیان زۆر بە سۆز و پەرۆشەوە بۆلای خۆی. ئەفەرموێ: ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ واتە بڵێ: خوا پێویستی کردووە لەسەر خۆی بەزەیی و میهرەبانی، پێویستی کردووە بە ویست و خواهیشی خۆی بە بێ هیچ داخواز و پاڵدەر و پێویست کەرێ، بێجگە لە ئیرادە و خواهیشە بەر مەرەخەسەکەی خۆی، بێجگە لە خوایەتی و پەروەردگاریە پاك و بێ لەکەکەی خۆی، هەر لەسەر ئەو بنەڕەتە هەموو کردەوەو بڕیارەکانی هاتوون و دامەزراون، هەر بەو پێ یە رەفتار ئەکات لەگەڵ بەندەکانی لە هەردوو جیهاندا، میهرەبانی یەکەی داخوازە بۆ تۆڵە سەندن لە دەست درێژیی کەران و جیاکردنەوەی چاکان و پاکان لە بەدان و ناپاکان، بە پێی ئەو میهرەبانی یە پەلە ناکات لە تۆڵە سەندن دا، تۆبە و گەڕانەوە وەرئەگرێ لە گوناهکار و تاوانبار، کەواتە خەشم و تۆڵە و سزای داخوازی زاتی پاکی میهرەبانی نییە، بەڵکو لەبەر بەدی و بەد کرداریی بەندەکانی یەتی کە بە مەیل و خواهیشی خۆیان ئامادە نین بۆ میهرەبانی یەکەی خوا و کردەوە بەدەکانیان ئەکەن بە پەردە لە بەینی خۆیان و تیشکی میهرەبانی یەکەی خوادا. پێویستە لەسەر بەندەکان دوو شت:

یەکەم: بڕیاردان و پێویست کردنی ئەو بەزەیی و میهرەبانی یە لەسەر خۆی کە داهێنەر و بەدیهێنەر و خاوەن پەروەردگارە و هیچ پێویستی بە هیچ نییە.

دووەم: هەواڵ دانی بەندەکانی بەوەی کە پێویستی کردووە لەسەر خۆی، بەڕاستی هەموو زمان و پێنووسیان کۆڵ و کولە لە دەربڕینی گەورەیی و گرنگی ئەو دوو بەهرە و بەخششە، ئایا ئەم بەندەیانە ئەبێ چی بن هەتا پەروەردگار بەو جۆرە بە گرنگ بیانگرێ، بیر کردنەوە لەوە لە بارێکەوە سەر سوڕ ئەهێنێ و مەردوم سەرسام ئەکات، لەبارێکی ترەوە خۆش و شادمانی و ئارامێك ئەدات بە دڵ و دەروون کە هەرگیز دەسەڵات نییە بەسەر روون کردنەوەو دەرخستنیدا بە وتن و بە باس کردن، بەڵکو مەگەر هەرکەس بە هەست و ویژدان تێ بگات و بچەژێ!

میهرەبانی خوا هەرچەندە گشتی یە بۆ هەموو شتێ، بەڵام لەم ئادەمی یەدا ئێجگار گەورەترو فراوانتر و گرنگ ترە و نایەتە ژمارە، بەڵام با هێندێکی تر لە بەرهەمەکانی باس بکەین تا هەر دڵی خەوتوو بێت ئاگادار بێتەوە. لە یەکەم جارەوە بوونی گیانە تایبەتی یەکەی کە جیاوازە لە بوون و گیانەکانی تر، ئینجا ژێر بار کردنی هەموو هێزو وزەکانی ئەم بوونەوەرە بۆی، فێرکردن و زانا کردنی بەو هەموو شتانە کە لەبەرەوە زۆرتر و فراوانتریش ئەبن، ئامادە کردنی و گێڕانی بە جێنشین لەم جیهان و زەویدا، ئینجا گێڕان و رەوانە کردنی فروستادە و پێغەمبەران هەر لە خۆیان تا بەهۆی ئەوەوە رێگە راستەکەی خوا بدەنە بەر و گومڕا و سەرگەردان نەبن، ئینجا کردنەوەی قاپی لە هەر تاوانبارێك کە بە ئارەزووی خۆی روو بکاتەوە خواو کۆتایی بێنێ لە سەرکێشی و گوناە، پاداشت دانەوە لەسەر چاکە لای خوارەکەی بە دە قات هەتا حەفتا و حەوت سەدو حەفتا هەزار و هەرچەندی تر کە خوا خۆی ئەزانێ، بەڵام لەسەر خراپە بە یەك قات و سەر بەسەر ئەگەر نەبووری: سڕینەوەی خراپە بەهۆی کردنی چاکەیەکەوە لە میهرەبانی یەکەی بەزیاد بێت، ئامادەکردن بۆ ئەم چەند بەهرە تایبەتی یانە بەسە بۆ بڕوادار کە هەمیشە چاو لەبەر ببێ و شەرم بیگرێ و لە رووی نەیەت کارو کردەوەی ناشایستە بکات، ئینجا بە وێنە با هێندێ لە فەرمودەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) بهێنین بۆروونکردنەوەی بەشێك لەوەی کەئایەتەکەدەست نیشانی بۆکرد:

١- (بوخاری و موسلیم) حەدیسێ ئەهێنن لە(ئەبو هورەیرە) ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: کاتێ خوا دروست کراوی دروست کرد پێویستی کردو نووسی لە نامەیەکدا کە لای خۆیەتی لەسەر عەرش، بەڕاستی میهرەبانیم پێش خەشم کەوتووە، لە ریوایەتێکی تردا لای(بوخاری) بەم جۆرەیە: میهرەبانیم زاڵە بەسەر خەشمدا. لەسەر هەردوو ریوایەت واتە میهرەبانیم زۆرتر و فراوانترە و شتی زۆرتر داگیر ئەکات و ئەیگرێتەوە.

٢- (بوخاری و موسلیم) هەر لە(ئەبو هورەیرە) وە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی رەحمەت و میهرەبانی کردووە بە سەد بەشەوە، نەوەد و نۆی لای خۆی راگیر کردووە و یەك بەشی ناردە خوارەوە بۆ سەر زەوی، ئینجا لەو تەنیا بەشە دروست کراوەکانی خوا بەزەیی و میهرەبانی بەکار ئەهێنن بۆ یەکتر، تەنانەت وڵاخ سمی بەرز ئەکاتەوە لە بێچووەکەی

لەکاتی شیر خواردندا لەبەر ئەوە لێی نەکەوێ و ئازاری بدات. بە دوو جۆری تریش ئەم حەدیسە ریوایەت کراوە کە هەموو یەك مەبەست نیشان ئەدەن.

بەڕاستی وێنە و چیرۆکەکە زۆر سەر سوڕهێنەرو گرنگە، چاك ئەو رەحمەت و میهرەبانییە بێ سنوورەی خوا نزیك ئەخاتەوە لە بۆچوون و تێگەیشتنی ئێمەوە کاتێ کە بیر بکەینەوە لە هەرچی گیانلەبەرانە کە هەیە نایەنە ژمارە بۆمان، هەرکام بەزەیی و میهرەبانی تیایە دەربارەی چەند گیانلەبەرانی تر، ئینجا ئەو هەموو بەزەیی و میهرەبانییە بەر و بەرهەمی ئەو تەنیا بەشەیە لەو سەد بەشەدا! خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لە میهرەبانی یە زۆر و فراوانەکەی – امین –، هەرچەند حەدیس زۆر هاتووە لەم بارەیەوە، بەڵام بەو دوو ریوایەتە کۆتاییم هێنا و بەلامەوە لێرەدا بەسە بۆ ئەو مەبەستەی کە هێنامن بۆی.

بەڕاستی هەست کردن بەو میهرەبانی خواو نەقش بەستنی لە دەروونـدا زۆر شتێکی گرنگ و پێویستە بۆ موسڵمان، بۆ ئەوەی ئارامی و ئاسایش دڵی داگیر بکات بەرامبەر هەموو رووداوو بەسەرهاتێکی سەخت و گران کە رووی تێبکات. کە زۆرجار ئەوانە ئەبن بەهۆی سەر لێ شێوان و گومڕایی، چونکە ئەزانێ ئەوانە هەمووی خێرو خۆشی تێدایە، ئەوانە نیشانەی خەشم و دوور خستنەوە نین لە میهرەبانی، چونکە بێگومان موسڵمان نائومێد نییە و چاوەڕوانی رەحم و بەزەیی خوا ئەکات، خوایش هەرگیز ئەو کەسانە دەرناکات، بەڵکو مەردوم خۆی خۆی دەرئەکات کاتێ کە بێ بڕوا بن و بەزەیی و میهرەبانی یەکەی نەوێ. ئەو ئارامی و بە تەما بوونی میهرەبانییە دڵ و دەروون پڕ ئەکات لە خۆگری و دامەزراوی، هەست کردن بەو میهرەبانی و بەزەیی شەرم و چاو لەبەری خوا فەراهەم ئەهێنێ بۆ موسڵمان کە لە رووی نایە گوناهو تاوان بکات بە پێش چاوی قودرەت و ئاگاداری خواوە، هەروەها هەست کردن بەو میهرەبانییە زۆر بەکارە لە راست کردنەوەی خو و رەوشتی بڕوادارردا، لە کاتێکدا کە بڕوادار ئەزانێ کە ئەبێ ئەم چاو لە خوا بکات و بە پێی تیشك و رووناکی سیفەت و رەوشتەکانی ئەو بجوڵێتەوە، ئەبینێ خۆی بەو هەموو کەم و کوڕی و گوناهەوە خوا میهرەبانی لەگەڵ ئەکات و چاکەی ئەڕێژێ بەسەردا، کەواتە ئەبێ لەوەوە فێری چاوپۆشی و بەزەیی و لێبوردن بێ، ئینجا یەك لە بەرهەم و داخوازی ئەو رەحم و میهرەبانییە هاتنی رۆژی دوایی و زیندوو کردنەوە و کۆکردنەوەی هەمووانە لەو رۆژەدا، وەك لێرەدا بەڵێن ئەدات و دڵنیایی ئەکات لەسەر هاتنی:

که ئەفەرموێ: ﴿لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ سوێند بەخوا کۆتان ئەکاتەوە لە رۆژی دواییدا و لە زەوی دەرتان ئەهێنێ بۆلای ئەو رۆژە ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ کە هیچ گومان و دوو دڵی نییە لەو رۆژەدا لە هاتنیدا، واتە شایستەی ئەوە نییە کە هیچ کەس گومانی ببێ لەوەدا، چونکە نەهاتنی دژو پێچەوانەی داد و لێزانی و کاردروستی خوایە، هەروەها نابێ ئەم ئادەمی یە گرنگە ژیانی ئەم جیهانە دواترین قۆناغ و بەرزترین پلەی بێ و بەو ماوە کەم و کورتە ئیتر دوایی بێ و نەمێنێ، کەواتە میهرەبانی خوا داخوازە بۆ هێنانی ئەو رۆژە تا ئەم ئادەمی یە گرنگە بیکات بە دواترین قۆناغ و بەرزترین پلەی بێ و بەو ماوە کەم و کورتە ئیتر دوایی بێ و نەمێنێ، کەواتە میهرەبانی خوا داخوازە بۆ هێنانی ئەو رۆژە تا ئەم ئادەمی یە گرنگە بیکات بە دواترین قۆناغ و بەرزترین پلەی ژیانی، با چاکان و پاکان بگەن بە ئەجرو پاداشتی خۆیان، ئەو هەموو کردەوە چاکانە بە بێ هودە و بێ سەرو شوێن نەڕۆن، وەك لەو رۆژەدا بەشێکی گەورە و گرنگ لەبەر و بەرهەمی میهرەبانی خوا دەرئەکەوێ، کە ئەوەش ئەمەیە ئەجرو پاداشتی چاکان ئەدرێتەوە لای خواروی بە دە قات و لای ژووروی خوا ئەزانێ، بەلام تاوانباران یان لێیان ئەبورێ یان تۆڵەیان سەربەسەرە لەگەڵ کردەوە خراپەکانیان، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست بەم بەڵێنە هەڕەشە کردنە لە بێ بڕواکان کە ورد نابنەوە و بیر ناکەنەوە، بەهۆی ئەوەوە بە نەفامی هاوبەش بۆ خوا رەوا ئەبینن. بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ وەك دەست ئەدات بۆ ئەوەی هەردوو بارەکە مەبەست بێت، چونکە لەو رۆژەدا وەك رەحمەت و میهرەبانی هەیە، هەروەها سزا و تۆڵەش هەیە بۆ ئەوانەی کە لەم جیهانەدا بە کردەوەی خراپ دەرگای رەحمەت و میهرەبانی لەسەر خۆیان دائەخەن، عەرەب لە سەردەمی نەفامی یاندا – پێش ئەوەی خوا منەت بنێ بەسەریاندا بەم ئایینە پیرۆزە و بەرزیان بکاتەوە بۆ رادەو پلەی بەرزی خۆیان – بڕوایان نەبووە بە رۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە، وەك ئەوانەی کە لەم نەفامی تازەدا دەژین، نەفامی ماددی ئەمڕۆ!!

جا لەبەر ئەوە لەم بەڵێنەدا ئەو هەموو دڵنیایی یەی لەسەر کرد و ئەو وتە بەهێزەی بەکار هێنا: ﴿لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾، لەو ڕۆژەیشدا زیانبار و ڕەنجەڕۆ ئەوانەن کە ئەمڕۆ بڕوایان نەبووە و نییە بەو ڕۆژە، ئەوانە هەر لەلایەکەوە زیانبار نابن، بەڵکو لە هەموو بارو لە هەموو لایەکەوە، تەنانەت خۆیشیان لە دەست دەرئەچێ، ئیتر چ جای هەرچیتر، وەك دەست نیشان ئەکات، کە ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی کە زیانباری خۆیان بوون و خۆیان لە دەست دەرچوو، بە زایە کردن و بەکار نەهێنانی ئەو سروشتە ڕێك و پێکە و ئەو ژیریی یەوە بوون بەم دروست کراوە تایبەتییە و جوێ بوونەتەوە لە گیانلەبەرانی تر، کەواتە لە ڕاستیدا خۆیان لە کیس چوو، ئەوانە بڕوا ناهێنن، چونکە کەرەسە و کۆئەندامی بڕوا هێنانەکەیان زایە و لەکاریان خست بەهۆی ئەوەوە بڕوا ناهێنن، کەواتە هۆی بڕوا نەهێنانەکەیان ئەو زایە کردن و لەکار خستنەیە لەگەڵ بوونی ئەو هەموو ڕابەرو بەڵگە و پاڵدەرەدا کە خوا بۆی فەراهەم هێناون، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە: ئەوانەی کە لە زانین و بڕیاری خوادا تێپەڕی کردووە زیانبار بوونیان، ئەوانە بڕوا ناهێنن، واتە هۆی بڕوا نەهێنانەکەیان ئەو زانین و قەزاو قەدەرەیە کە تێپەڕی کردووە، ئەو زانین و قەزاو قەدەرەش بە پێی کردەوەکەی ئەوان تێپەڕی کردووە، واتە خوا زانیویەتی کە ئەمانە بە خواهیشی خۆیان ئەو ڕێگەیە ئەدەنە بەر، بەم جۆرەش هەر باشە و ئەگونجێ، بەڵام تەفسیر و جۆری یەکەم بەهێز ترە و دڵ پێی بە ئارام ترە، لەسەر هەر جۆر و بار هەڵئەگرێ ئەو وتەیە بە هەمووی ببێ بە ڕستەیەکی تەواو – وەك بەو شێوەیە لە تەفسیرەکەدا هات –، هەڵئەگرێ ئەو وتەیە دوو ڕستە بن هەرکام سەربەخۆ بن، ئینجا لەسەر هەر بار هێنانی ئەو وتەیە بۆ ڕەخنە و نەنگ گرتنە لەو دەستە زیانبارە و ناشرین کردنی حاڵ و باریان، لەبەر ئەوە بە تایبەتی باسی کردن و جوێی کردنەوە لەناو کۆکراوەکانی ڕۆژی دواییدا. لە ئایەتی پێشوودا باسی خوایەتی و پادشایەتی و خاوەنی یەتی خوای کرد بۆ هەموو دروست کراوەکان لە جێ و شوێندا،

﴿وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٤﴾

**ئینجا باسیان ئەكات لەكات و زەماندا، تا بە روونی خوایەتی خوا دەرخات لە هەموو بار و روویەكەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ﴾ هەر بۆ خوایە و موڵك و دروست كراوی خوایە هەرچی هەیە و دامەزراوە و ئارامی گرتووە لە شەو و لە رۆژدا ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ هەر ئەو خوایە بیسەری زانایە بۆ هەموو شتێ و بە هەموو شتێ لەهەر جێگە و شوێنێ و لەهەر كاتێكدا، لە ئایەتی پێشوودا دەری خست كە بە دەسەڵات و توانین دەوری هەموو شتی داوە، بەم رستەیەش لەم ئایەتەدا روونی ئەكاتەوە كە بە بیستن و زانینیش دەوری داوە، جێگیر بوون و بڕوا بەو دەور دانە ئێجگار بە كەڵك و بە نرخە بۆ بڕواداران لەگەڵێ بار و رووەوە، بە تایبەتی بۆ فەراهەم هاتنی سام و بیم و شەرم لەخوای پەروەردگار، خوا بە میهرەبانی خۆی ئەو بڕواو هەستە لە دڵماندا دامەزراو و جێگیر بكات.**

**كاتێ كە دەركەوت كە تەنها خوا داهێنەرو خاوەنە بۆ هەموو شتێ، ئینجا كاتی ئەوە دێت كە زۆر بە توندی بێزاری دەربڕێت بۆ پشت بەستن بە غەیری خوا و بەندەیی و پەرستنی غەیری خواو دۆستایەتی و خۆش ویستن و رەوا دانی كار بەدەستی بۆ غەیری ئەو، ئەمانە دژو پێچەوانەی موسڵمانێتین، هاوبەش رەوادانە كە هەرگیز كۆنابێتەوە لەگەڵ ئیسلامدا، لەبەر ئەوە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) كە ئەو بێزاری دەربڕینە ئاراستەی بێ بڕواكان بكات، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ بە بێ بڕوا و هاوبەش رەوا دەرەكان ﴿أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا﴾ ئایا غەیری خواو بێجگە لە خوا دابنێم و وەری گرم بە خواو خاوەن و پەرستراو و یارمەتی دەر و فریاد رەس؟ واتە نەخێر شتی وا ناكەم و بێزاری دەرئەبڕم لە شتی وا، غەیری خوا شیاو و شایستەی ئەوە نییە، بەڵكو تەنیا شیاو و شایستە ئەوە ئەو خوایە كە ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ داهێنەرو دەرهێنەری ئاسمانەكان و زەوی یە لە نەبوون ﴿وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ﴾ لەكاتێكدا كە ئەو خوایە رۆزی و خۆراك ئەدات، ئەو رۆزی و خۆراك نادرێ، واتە ئەو پێویستی نییە بە هیچ كەس و بە هیچ شتێ، هەموو شتێ پێویستی بەو هەیە، كەواتە ئەبێ هەر ئەو خوا بێ و**

هەر ئەو پەرستراو بێ و هەر ئەو فریاد رەس بێ. بەڕاستی مەسەلەکە زۆر ئاسان و روونە و سروشت و ژیریی، بێجگە لەوە وەرناگرێ، چونکە ئەگەر داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی نەکرێ بەکار بە دەست و پەرستراو و پشت پێ بەستراو و فریاد رەس، ئیتر ئەبێ کێ بکرێ؟ ئەگەر رۆزی دەری هەمووان نەکرێ ئەبێ کێ بکرێ. ﴿قُلْ﴾ بلێ: ﴿إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ﴾ بەڕاستی من فەرمانم پێدراوە کە لەم ئوممەتەدا یەکەم کەس بم کە مل کەچ بۆ فەرمانی خوا و گوێرایەڵ و فەرمانبەرم ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ پێم گوتراوە کە لە هیچ شتێکدا لە هاوبەش رەوا دەران نەبی، واتە دانانی غەیری خوا بە کاربەدەست و پشت پێ بەستراو و فریاد رەس و گوێرایەڵی کراو دژی موسڵمانێتی و هاوبەش رەوا دانە بۆ خوا دەی منیش فەرمانم پێدراوە کە هەر مل کەچ و گوێرایەڵ بم بۆ خوا و هیچ جۆرە هاوبەشێك رەوا نەدەم بۆ خوا. بەڵێ مەسەلەکە زۆر ئاشکرا و دیاریی یە و دەست ناداست بۆ بەکارهێنانی نەرمی و فش و فۆڵی، یان ئەبێ مل کەچی و گوێرایەڵی و پەرستن و داوای کۆمەکی و فریاد رەسی هەر بۆ خوا بێ و هەر داوا لە خوا بکرێ و حاکمێتی لە هەموو کاروبارێکدا هەر بۆ خوا رەوا بدرێ بە بێ هاوبەشی کردنی هیچ کەس و هیچ شتێ، کە ئیسلامیش هەر ئەوەیە، یا ئەبێ بت پەرستی و هاوبەش دانان بێتە کایەوە ئیسلام و موسڵمانان نەمێنن لە ئارادا. بێگومان شتێکی ناسراو و بەناوبانگە کە بێ بڕوا و بت پەرستەکان داوایان ئەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەندازەیە بێتە خوارەوە و نەرمی بەکار بێنێ لەگەڵیان، بەم رەنگە هەر هیچ نەبێ واز بێنێ لە بتەکانیان و کۆتایی بێنێ لە باسی بێ نرخی و بێ کەڵکی و پڕو پووچی یان، وازیان لێبێنێ لەوەی کە هێندێ لە سیفەت و نیشانەی خوایەتی کە بڕیاریان ئەدات بۆ ئەو بتانە، یەکەم شت ئەو حەرام کردن و حەلاڵ کردنەی کە بە ناوی ئەو بتانەوە ئەیانکرد و رەفتاریان پێئەکرد وەك لەم سورەتەدا باسی دێت، بەرامبەر ئەو واز هێنان و بێ دەنگ بوونە بەڵێنی دوو شتیاندا:

یەکەم: وازهێنانی ئەوانیش لە دوژمنایەتی و دژایەتی و بەربەرەکانێ لەگەڵی.

دووەم: گێڕانی بە سەرۆکی خۆیان و بە سامانداز ترین و دەوڵەمەندترینیان، کام ئافرەتی ئەوێ لێی مارەکەن، ئینجا بەرامبەر ئەو هەوڵ و بەڵێنە گەورەی ئەوانە خوا فەرمانیدا کە بەو توندو تیژی و سەختی یە ئەو بێزاری و سەرزەنشتەیان ئاراستە بکات بەم ئایەتەی کە تێپەڕی کرد و تەفسیر کرایەوە،

قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ

---

**فەرمانی پێدرا کە بیم و ترس بخاتە دڵیانەوە وەك دەرئەکەوێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ پێیان بڵێ ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ بێگومان من ئەترسم لە سزای رۆژێکی گەورە ئەگەر سەرپێچی بکەم لە فەرمانی پەروەردگارم و پێچەوانە رەفتار بکەم. ﴿مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ﴾ هەرکەس لادرێ لەو سزایە، یان هەرکەس ئەو سزایە لێی لادرێ لەو رۆژەدا بێگومان خوا میهرەبانی پێ کردووە، واتە رەحم و میهرەبانی هەرە گەورە کە پێك دێ بە رزگاربوون لەوە و چوونی بۆ بەهەشت ﴿وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ﴾ هەر ئەو میهرەبانی و نیازی خەیر پێکردنەیشە گەیشتنی ئاشکرا بە ئامانج و ئاوات , ئەو کەسانەی کە پشت بە غەیری خوا ئەبەستن و ئەیکەن بە کار بەدەست و دۆست و خۆشەویست، یان لەبەر ئەوە بە هیوای خێرو سوود و دەستکەوتێکن لێی، یان بە ئومێدی ئەوەیە رزگاریان بکەن لە هەر ناخۆشی یەك، ئینجا ئەدا لەو هیوایە و ئومێدەیشیان بەمەی کە هەموو ئەوانە بە دەست خوایە و هیچ کەس لە راستیدا هیچ شتێکی بە دەست نییە، کەواتە هیچ هۆ و پاڵدەرێك نییە بۆ لادان لە خواو پشت بەستن بە غەیری خوا، وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ﴾ ئەگەر خوا دووچارت بکات بە زیانێك هیچ لادەر و بەرگری کەرێك نییە بۆ ئەو زیانە لێت، هیچ کەس ناتوانێ ئەو زیانە نەهێڵێ مەگەر خوا، ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ ئەگەر خێرو خۆشی یەکت پێ بگەیەنێ ئەوا خوا توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، واتە هیچ کەس ناتوانێ ئەو خێرو خۆشی یەت لێ بستێنێ و بیگێڕێتەوە لێت... ئەم فەرمودەیە ئەگەر ئاراستەی تەنیا پێغەمبەریش کرابێ مەبەست گشتی یە و تایبەتی نییە تەنها بەوەوە، ئەمەی کە ئەم ئایەتە ئەیگەیەنێ بە درێژ تر هاتووە لە حەدیسێکدا کە(ئیبن و عەباس) - خوا لێیان رازی بێت - ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەك(ترمزی) ریوایەتی ئەکات لێیەوە کە ئەفەرموێ: جارێك لە پاشکۆی پێغەمبەردا بووم(ﷺ) ئینجا فەرموی پێم: ئەی کوڕە گەنجەکە چەند وتەیەکت فێر ئەکەم و**

پێت ڕائەگەیەنم: فەرمانی خوا بپارێزە و گوێڕایەڵی بە، خوایش تۆ ئەپارێزیێ، فەرمانی خوا بپارێزە، تۆیش خوات دەست ئەکەوێ بەرامبەرت لە هەموو کاروبارێکتدا، ئەگەر داوات کرد داوا لە خوا بکە، ئەگەر یارمەتی و فریاد ڕەسی داوا ئەکەیت لە خوای بکە، بزانە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆبێتەوە لەسەر ئەوەی سوودت پێبگەیەنێ بە هەر شتێك، سوودت پێناگەیەنێ بە شتێك نەبێ کە خوا نووسیویەتی بۆت، ئەگەر هەموو کۆببنەوە لەسەر ئەوەی زیانت پێبگەیەنن بە هەر شتێك زیانت پێناگەیەنن بە شتێك نەبێ کە لەسەرتی نووسیوە، قەڵەمەکان هەڵگیراون و ڕووپەڕەکان وشك بوونەتەوە، واتە هەموو کارو بڕیارێك تێپەڕی کردووە لە زانین و بڕیاری خوادا.

بەم بۆنەیەوە بە جوانی ئەزانم بەشێ لە فەرمودەیەکی درێژی شێخی گەیلانی بێنم کە فەرمویەتی لە کتێبی(فتوح الغيب) دا – خوای لێ ڕازی بێت –: هەرکەس ئەیەوێ ساغ و سەلامەت بێ لە هەردوو جیهاندا، پێویستە لەسەری خۆگری و ڕەزامەندی لە هەموو بەسەرهاتەکانیدا، باس نەکردن و شکات نەکردن لای مەردومانی خوا، دانانی پێویست و مەبەستەکانی لەبەردەم بڕیاری پەروەردگاریدا، خۆبەستنەوە بە پەرستن و گوێڕایەڵی خواو پچڕان لە هەموو شتێ بۆلای خوا، چونکە بێبەش کردنەکەی خوا بەخشینە، تۆڵەی نیعمەت و چاکەیە، دەردو بەلاَکەی دەوا و دەرمانە، بەڵێنەکەی مسۆگەرو حازر و بزەو وتنی کردەوەیە، هەموو کردەوەکانی چاکەیە و جوانە و لێزانی و کاردروستی و بەرژەوەندییە، بەس زانینی ئەوانەی شاردووەتەوە لە بەندەکانی و هەر خۆی ئەیانزانێ، کەواتە بەندە ئەبێ هەر خەریکی بەندەیی خۆی بێ بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەریی و مل کەچ کردن لە قەزاو قەدەردا، ئەبێ خەریك نەبێ بە کاروباری خوایەتی یەوە، بێ دەنگ بێ لە بۆچی و لەبەرچی و چۆن و کەی، واتە هیچ پرسیارێك لە خوا نەکات لەکارو کردەوەکانیدا، وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿لا يسأل عما يَفعل﴾ پرسیار ناکرێ لەخوا لە هەر کردەوەیەك کە ئەیکات، بەڕاستی بە پێی ئەوەی ئەو خواناسە فەرمویەتی بەندەیی پێك نایەت و جۆر و بەشێك لە مل پێچی و سەرکێشی دێتە کایە. لەپاش ئەم تێهەڵکێشە با بێینەوە بۆ سایەی ئایەتەکان: ﴿ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ هەر ئەو خوایە و توانا و زاڵە و هیچ کەس ناتوانێ لێی یاخی ببێ، هەموو کەس و هەموو شتێ بەر حوکمیەتی و ئەو تەگبیری کار و باری ئەکات و بەرز و بڵندە بەسەر بەندەکانیدا و هەموو لە ژێر مەیل و دەسەلاَتی ئەودان،

وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾ قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّآ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾

---

﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ هەر ئەو لێزان و کاردروستە لە هەموو کارو کردەوەی خۆی و تەگبیری دروستکراو و بەندەکانیدا، زانایە بە هەموو شتێ لەسەر بارە راستەقینەکەی ﴿ٱلْخَبِيرُ﴾ با خەبەرە و ئاگادارە بە کردەوەکانیان و ئەوەی بەرژەوەندی تێدایە، کەواتە بێجگە لە خوا هیچ کەس ناگونجێ بۆ ئەوەی بکرێ بە پەرستراو و کار بەدەست و پشت پێبەستراو.

ئینجا کۆتایی باسەکە و ئەو وتارو فەرمانانە ئەهێنێ کە بە روونی ئیسلام و ئایینەکەی خوایان جوێ کردەوە بە پاك و خاوێنی لە رەوادانی هەر جۆرە هاوبەشێك، هاوبەش رەوا دەرانیان نائومێد کرد لەوەی هیچ جۆرە یەك کەوتن و بەشداری یەك بکرێن لەوەی کە ئەوان گێڕاویانە بە ئایین بۆ خۆیان، کۆتایی ئەو باس و وتارو فەرمانانە ئەهێنێ بە فەرماندان بە پێغەمبەر(ﷺ) کە خوا بگرێ بە شایەت و هەواڵیان بداتێ بە شایەتی دانی خوا لەسەر راستی ئەو ئایین و قورئانەی کە ئەم رای ئەگەیەنێ، و ناڕاستی و ناهەقی ئەوەی کە ئەوان وان لەسەری، شایەتی دانی پێغەمبەر خۆی لەسەر تاك و تەنیایی خواو بەری بوون و دووری خۆی لە رەوا دانی هەر شتێ کە ئەوان گێڕاویانە بە هاوبەش، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە ئایا هیچ شتێك گەورەترە لەبارەی شایەتی دانەوە؟ واتە ئایا شایەتیدانی کێ گەورەترو راست ترە لە شایەتیدانی هەر کەسێکی تر؟ ئینجا فەرمان ئەدات کە خۆیشی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، چونکە وەڵامەکە ئاشکرایە و هیچ کەس رێی نییە دەمە دەمێی تیا بکات. ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ: خوایە کە ناوی(الله) یە. واتە شایەتی ئەو لە هەموو شایەتی یەك گەورەتر و راست ترە، ئەو خوایە ﴿شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ﴾ شایەتە لە نێوان من و ئێوەدا یان بڵێ لە وەڵامدا خوا شایەتە لە نێوان من و ئێوەدا، واتە شایەتی ئەدا بۆ من کە پێغەمبەرم و لەسەر هەقم، و شایەتی ئەدا کە ئێوە لەسەر ناهەقن، شایەتییەکەی خوایش ئەمەیە کە لەم قورئانە وەرئەگیرێ کە موعجیزەی خوایە و هەموو کەس داماو و دەستە

پاچەیە لە ئاستی تا ڕۆژی دوایی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ﴾ ئەم قورئانە سروش کراوە بۆلام بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم ﴿وَمَنۢ بَلَغَ﴾ هەرکەسێکی تریش کە ئەم قورئانەی پێ گەیشتبێ یان پێی بگات بە جۆرێ تێی بگات و حاڵی ببێ لێی ئەو کەسە هیچ بڕو بیانووی نامێنێ ئەگەر بڕوا نەهێنێ و دڵ ئارام نەبێ بەم شایەتی خوا، ئەوا بەری هەڕەشەی خوا ئەکەوێ و نیشتەجێ ئەبێ لە ئاگری دۆزەخدا، بەڵام هەرکەس پێی نەگەیشتبێ و پێی نەگات و حاڵی نەبێ و وەرنەگێڕرابێ بە زمانێ کە تێ ی بگات ئەو کەسە بەری هەڕەشەی خوا ناکەوێ و سزا نادرێ، بەڵام موسڵمانان تاوانبار ئەبن لەسەر ئەو ڕانەگەیاندن و حاڵی نەکردنە.

لەپاش ئەوەی دەست نیشانی کرد بەوەی کە ئەو شایەتی خوا لەم قورئانەدایە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوەی کە خوا شایەتی لەسەر داوە لەم قورئانەدا، دەست نیشانی بۆ ئەکات بە شێوەی بەر لێ بڕینەوە لە بێ بڕواکان و بێزاری دەربڕین لە شایەتی دانەکەی ئەوان کە دژو پێچەوانەی شایەتی یەکەی خوایە، بەبێ پێچ و پەنا شایەتی یەکەی ئەوانە بە ناڕاست و ناهەق دەرئەکات و شایەتی یەکەی خۆی بە خوایەتی خواو تاك و تەنیایی یەکەی دەرئەبڕێ، خۆی بە تەواوی جیا ئەکاتەوە لەوان بە جۆرێ کە هەرگیز یەك کەوتن و یەك گرتنیان ناگونجێ، تا ئەوان کۆتایی نەهێنن لەو بارەی کە وان لەسەری ئەفەرموێ: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ﴾ ئایا بەڕاستی ئێوە شایەتی ئەدەن کە لەگەڵ خوای تاك و تەنیادا چەند پەرستراوێکی تر هەیە؟ ﴿قُل لَّآ أَشْهَدُ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ بڵێ: من شایەتی وا ناهەق و ناڕاست نادەم، ئینجا فەرمانی پێئەدات کە شایەتیبدا بە دژو پێچەوانەی شایەتییە ناهەقەکەی ئەوان، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ بڵێ هەر تەنیا یەك خوا هەیە ﴿وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ بەڕاستی من بەریم لەوەی کە ئێوە ئەیکەن بە هاوبەش، بەریم لە ڕەوا دانی هیچ هاوبەشێك بۆ خوای تاك و تەنیا، بەهیچ کلۆجێك ناگونجێ بوونی زیادلە یەك خوا.

پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانانی ئەمڕۆ بە گشتی، بە تایبەتی بانگ کەرانی مەردوم بۆ ئیسلام و تاکە ڕێگە ڕاستەکەی خوا، پێویستە لەسەریان زۆر بە وردی بیر بکەنەوە لەم جۆرە ئایەتانە و هەر ئەو هەڵوێستەیان بێ بەرامبەر نەفامی تازە کە کاتی خۆی پێغەمبەر(ﷺ) بووی بەرامبەر ئەو چەرخە، واتە پێویستە بە وتەی پیرۆزی ﴿لا إله إلا الله﴾

ەوە بوەستن و دەستی پێوە بگرن و پارێزگاری بکەن لەسەر ئەو بارو شێوە راستەقینەی کە یەکەم چینی ئەم ئوممەتە دەستی پێوە گرت و پارێزگاری کرد لەسەر ئەو بار و شێوە راستەقینەی کە(رەبیعی کوڕی عامر) روونی کردەوە بۆ(رۆستەم) سەرکردەی لەشکری فارس لەو رۆژەدا کاتێ پرسیاری لێکرد کە ئێوە چیتان ئەوێ و بۆچی هاتوون بە ولأتەکەماندا؟ ئەمیش لە وەلأمدا فەرموی: خوا ئێمەی ناردووە بۆ ئەوەی مەردوم دەرکەین لە پەرستنی مەردوم بۆ پەرستنی خوا بە تەنیا و دەری کەین لە تەنگی و کەم و کوڕی جیهان بۆ فراوانی ئەو جیهان و رۆژی دوایی و دەری کەین لە جەور و ستەمی ئایینە ناهەقەکان بۆ داد پەروەری ئیسلام. واتە هاتووین بۆ رزگار کردنی مەردوم لە هەر یاسا و رژێم و بەرنامەیەك کە مەردوم دای نابێ، گێڕانەوەی هەمووان بۆلای تەنها رێگە و بەرنامەی خوا، نەهێشتن و داڕنینی مافی حاکمێتی لە هەموو کەس و لە هەموو شتێ، گێڕانەوەی تەنها بۆلای خوا، کە واتا و مەبەستە راستەقینەکەی وتە پیرۆزەکەی ﴿لا إله إلا الله﴾ هەر ئەوەیە، جا پێویستە لەبەر رووناکی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە ئێستا لە سایەیدا ئەژین. موسڵمانانی ئەم چەرخە و لە داهاتویشدا بەو وتە پیرۆزە لەسەر ئەو بارە راستەقینەی کە(رەبیعی کوڕی عامر) روونی کردەوە بوەستێن بەرامبەر جیهان و جیهانیان و بە هیچ شتێك نەخەڵەتێن و بە موو لانەدەین لە ئایینە پاکەکەی ئیسلام. پێویستە لەسەر موسڵمانان کە بڕوای تێرو تەواویان هەبێ بەوەی کە یارمەتی نادرێن و زاڵ نابن و ئەو بەڵێنەی کە داوێتی بە موسڵمانان بەدی نایەت تا بە تەواوی خۆیان دانەڕنن و خۆیان بەری نەکەن لە نەفامێتی و هەر شتێ بێجگە لە ئیسلام.

ئەم قورئانە نەهاتووە بۆ کات و چەرخێکی تایبەتی، نەهاتووە بۆ چارەسەر و بەرەنگاری هەڵوێستێکی تایبەتی، بەڵکو ئەم قورئانە هاتووە بۆ هەموو کات و چەرخێك، چارەسەر و بەرنامەیەکە هاتووە بۆ ئەم ئوممەتە هەتا هەتایە، کەواتە پێویستە بڕواداران لە هەموو کات و چینێکدا بە پێی ئەم قورئانە رەفتار بکەن و لەبەر رووناکی و تیشکی ئەم قورئانە رێگەکەیان بگرنە بەر و بەرەنگاری هەموو گرێ و کۆسپێ بکەن، ئینجا پشت بەخوا ببەستن و ئومێدەوار بن کە هەرچۆنێ یەکەم چین زاڵ بوون بەسەر نەفامی کۆندا، هەروەها ئەمانیش زاڵ ئەبن بەسەر نەفامیدا لە هەموو کات و چەرخێکدا.

ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر هاوبەش ڕەوا دارەکان(مشرکین) کە بڕوایان نەبوو بەم قورئانە و بە پێغەمبەر و بە زیندوو بوونەوە، ئەگەڕێتەوە سەریان و بەرەنگاریان ئەوەستێ بە چارەنووس و دوا ڕۆژیان لە ڕۆژی دواییدا، چارەنووس و دوا ڕۆژی سەخت و بەدیان لەسەر بێ بڕوایی یەکەیان، وەك بۆمان ڕوون ئەکاتەوە لەم چەند ئایەتانەدا، لە یەکەمجارەوە بەرەنگاریان ئەوەستێ بەو قورئانەی کە ئەوان بڕوایان پێی نییە نامەدارەکان بە باشی ئەزانن نامەی خوایە و هاتووە بۆ سەر ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) کە ئەمان بە سیفەت و نیشانەکانیاندا ئەیناسن، هەرچۆنێ کوڕەکانی خۆیان ئەناسن بەو شێوەو نیشانانەی کە نووسراوە لایان، ئەوانە لەگەڵ ئەو ناسینەدا زۆربەیان کە بڕوا ناهێنن زیانباری خۆیانن و خۆیان لە دەستیان دەرچوو، بەوە نییە ئەمان کە زیانباری خۆیان بوون، وەك لە ئایەتی ڕابوردوی ئەم سورەتە دا باس کران، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانەی کە نامەمان پێ بەخشین، واتە زاناکان جوولەکەو گاور ﴿يَعْرِفُونَهُۥ﴾ ئەم قورئانە ئەناسن کە نامەی خوایە، یان محمد ئەناسن کە ڕەوانە کراوی خوایە ﴿كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ﴾ هەرچۆن کوڕەکانیان ئەناسن،(ئەبو حەمزە) و چەند کەسانێ ئەگێڕنەوە کە لە پاش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە(حەزرەتی عمر) – خوای لێ ڕازی بێت – پرسیاری کرد لە(عبدالله ی کوڕی سەلام) لەم ناسینەی کە خوا هەواڵی پێداوە؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرموی: پێغەمبەر ئەناسین بەو نیشانە و سیفەتانەی کە خوا باسی کردوون، هەرچۆنێ هەرکام لەم ئێمە کوڕەکەی خۆی ئەناسێ بەو نیشانە و دیمەن و شێوەی کە هەیەتی لەناو کوڕەکانی تردا. ئینجا ئەفەرموێ: سوێند بەو خوایەی کە کوڕی(سەلام) سوێندی پێ ئەخوا من محمد باشتر ئەناسم لە کوڕەکەی خۆم، چونکە من نازانم دایکی چی کردووە: واتە گومانم نییە کە محمد پێغەمبەری خوایە بەهۆی ئەو نیشانەی کە خوا باسی کردوون، بەڵام بەو جۆرە نازانم کە دایکی کوڕەکەم لە من هێناویەتی، ئینجا حەزرەتی(عومەر) یش فەرموی ڕاستەکەی خوا

تەوفیقت بدا. ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوانەی زیانباری خۆیان بوون و خۆیان لە دەست چوو لە نامەداران، یان لەوان لە هاوبەش ڕەوادەرانیش، ئەوانە بڕوا ناهێنن، لە ئایەتی(١٢) ی ئەم سورەتەدا بە درێژیی تەفسیری وێنەی ئەمەمان کرد با سەرنج بدرێ، ئەو هەواڵەی کە خوای پەروەردگار دای لەبارەی زانایانی یەکەم چینی نامەدارانەوە، وەنەبێ تایبەتی بێ بەو یەکەم چینەوە، بەڵکو لە هەموو چەرخ و چینێکدا زانایانیان بە باشی گەورەیی و ڕاستی و هێزی ئەم ئایینەیان بە لاوە زانراو و ناسراو بووە، لەبەر ئەوە زۆر بە وردی کۆڵیونەتەوە لەوەی چۆن بتوانن هێزی ئەم ئایینە خاو بکەنەوە لە دڵی بڕوادارانی، چۆن گومان و دوو دڵی بخەنە ناو دڵیان، چۆن بەرگری یان بکەن لە ناسین و ئاگادارییان لە ئایینەکەیان؟ چۆن پەکیان بخەن و بیان وەستێنن لەو بزووتنەوەو شۆڕشەی کە ئەبێ هەڵسن پێی بۆ نەهێشتنی نەفامی و ناهەقی و چەسپاندنی شەریعەت و ئایینی خوا لە زەویدا و دەرکردن و فڕاندنی ئەوانەی کە دژو دوژمنی ئایین و شەریعەتی خوان، دژی ئەوەن کە مل کەچی هەر بۆ خوا بێ، چۆن ئایینەکەی ئیسلام وەرگێڕن بۆ تەنها بزووتنەوەی زانین و ڕۆشنبیریی ساردو سڕ، بۆ چەند باس و لێکۆڵینەوەی وشك و بێ خێر؟ چۆن موسڵمانەکان ڕوو لە کارو فرمانی ڕاستەقینەی خۆیان لادەن و ئەو کارو فرمان و بۆچوونە لە شوێنیاندا بچەسپێنن، ئەو نامەدارانە بەو جۆرو شێوەیە زۆر بە وردی و بە قوڵی کۆڵینەوە لەم ئایینی ئیسلامە، بەڵام نەك لەبەر ئەوە کە بە دوای حەقیقەت و ڕاستیدا بگەڕێن، وەك هێندێ لە سادەو نەزانەکانی موسڵمانان بەو جۆرە لێیان حاڵی بوون، نەك لەبەر ئەوەی بیانەوێدان بنێن بە ڕاستیدا و دان بنێن بە ڕاستی و نرخی ئیسلامدا، وەك هێندێ لە هەڵخەڵەتێنراوەکان وا تێگەیشتوون و بۆچوونیان بەو جۆرەیە بەرامبەر هێندێ لەو نامەدارانە کاتێ ئەیان بینن لە چەند بارێکەوە دان بەو شتە ڕاستانەدا ئەنێن! نەخێر بێگومان ئەو جۆرە موسڵمانانە زۆر هەڵەن کاتێ بەو جۆرە حاڵی بووبن لەو دوژمنانە، بەڵکو بێگومان ئەو هەموو وردە کاری و لێکۆڵینەوەیان هەر لەبەر ئەوەیە تا بزانن لە چ بارو لایەکەوە بدەن لەم ئیسلامە و بەر گوێی بکەن و لەبیری موسڵمانانی بەرنەوە! ئەوانە لەبەر ئەو مەبەست و ئامانجە ئەوانە ئیسلام و

قورئان ئەناسن هەرچۆنێ کورەکانیان ئەناسن! کەواتە پێویستی سەر شانمانە کە باش ئەوە بزانین، هەرچۆنێ پێویستی سەرشانمانە کە بزانین ئێمە شایان و شایستەین بەوەی کە ئایینەکەمان باشتر لەوان بناسین تا ئەوان و هیچ کەسێکی تر نەتوانێ ئاوامان بەسەر بێنێ کە بەسەریان هێنایین، ئەو هەواڵەی کە ئەم ئایەتە دای لەو نامەدارانە لەم چەرخ و سەردەمەی دوایی یەدا روونتر و ئاشکرا ترە، ئەوەتا نووسەرانیان لەم ماوە دوایی یەدا بە تێکڕایی لە هەر هەفتەیەکدا کتێبێ دەرئەکەن بە زمانێ لە زمانەکانی بێگانە لەبارەی ئیسلامەوە، بە روونی دەری ئەبڕن کە نامەداران ئاشنا و شارەزان بە هەموو شتێکی ئیسلام، ئاگادارو شارەزان بە مێژووی ئیسلام و سەرچاوەکانی ئیسلام و هێزی ئیسلام، بە هۆ و ڕێگاکانی بەرگری ئیسلام، بە ڕێگای راگەیاندن و نیشاندانی بە شێوەیەکی ناڕاست و ناڕەوا! زۆربەی ئەو نووسەرانە نیازو نیەتی خۆیان دەرنابڕن، چونکە ئەزانن پەلاماردان و هێرشی ئاشکرا بۆ سەر ئەم ئایینە غیرەتی موسڵمانان ئەهێنێتە جۆش و ئەیانخاتە سەر ڕێگای هەوڵ و تێکۆشان بۆ بەرگری لە ئایینەکەیان و فیداکاری لە ڕێگایدا، جا لەبەر ئەوە زۆربەیان ڕێگایەکی بەدتر و بۆگەن تریان دایە بەر، ڕێگای فێڵ و تەڵەکە، کە لەو ڕێگایەوە بە ئاسانی موسڵمانەکان دامرکێنن و بیانخەوێنن و بێ ئاگایان بکەن و ئەو غیرەت و جۆشەیان خاو بکەنەوە و هەست نەکەن بەوەی کە دوژمن لە کەمیندایە بۆیان، ئەو کاتە بە ئاسانی لە رووی دۆستی یەوە لایان ئەدەن لە ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام! زۆر پێویستە موسڵمانان وریا و ئاگادار بن لەم فێڵ و پیلانە گرنگەی کە ئەو نامەدارانە پێی هەڵسان، لەم دوایی یەدا: دەستیان کرد بە وەسف و سەنای ئیسلام، ئینجا لە پەنای ئەوەدا ئەمەیان خستە مێشکی موسڵمانان کە پێویستە دەستکاری یەکی خۆیان و ئایینەکەیان بکەن تا بگونجێن لەگەڵ بارو شارستانێتی تازەدا، بگونجێن لەگەڵ بارو باوی گەل و کۆمەڵایەتی تازەدا کە لەسەر بنەرەتێکی زانین و زانیاریدا دامەزراوە و بە لێزانی بەراورد کردن پێك هاتووە، نابێ دژو پێچەوانەی ئەو کاروبارانە بوەستن، نە لە بارەی شێوەی حوکمڕانی یەوە، نە هەر بارێکی کە گەل و کۆمەڵ بڕیاریان لەسەر داوە!! کەواتە لە سەرەنجامدا بە ئاسانی موسڵمانەکان رازی

ئەبن بەوەی کە هەموو کاروباری ژیانیان بدەنە دەست بیرو رای گەل و کۆمەڵ و بە پێی داوا و داخوازی ئەوان رەفتار بکەن و ژیان بەسەر ببەن. ئەو دوژمنانە وا ئەبەنە مێشکی ئەو موسڵمانە سادانەوە کە ئەگەر موسڵمانان بەو جۆرە بکەن، ئەو کاتە دەرئەکەوێ گەورەیی ئایینەکەیان، ئەو کاتە دەرئەکەوێ ئایینێکی گشتی و هەتا هەتایی یە و بۆ هەموو کات و چین و چەرخێك دەست ئەدا. ئینجا بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە ئەگەر موسڵمانان رازی بن بەوەو بخەڵەتێن بەو فێڵ و تەڵەکەیە، ئەو کاتە ئیسلامەکەیان ئەڕوا و پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نامێنێ و بێبەش لە هەموو بەرو بەرهەمی ئیسلام و هێزی و دەسەڵاتەکەی، ئینجا ئەو نامەدارانە لە رێگەی دۆزینەوەی ئەو جۆرە فێڵ و پیلانەدا، بەهۆی ئەو تەگبیر و لێکۆڵینەوە شارەزا لە هەموو ناوچە و کون و قوشبنی ئیسلام، تێگەیشتن لە مەبەست و ئامانجەکانی ئیسلام، کەواتە بە باشی ئیسلامیان ناسی وەك کوڕەکانی خۆیان ئەناسن. بێگومان شتە نهێنی یەکانی قورئان رۆژ بە رۆژ دەرئەکەوێ بە تەڕو تازەیی، بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لەو سایە و پەنای قورئانەکەیدا ئەژین، لە کاتێکدا کە خەریکن بە تێکۆشان و بەربەرەکانێ لە پێناوی عەقیدە و بیروباوەڕەکەیاندا.

ئەو هاوبەش رەوا دەرانە لاف ئەوەیان لێئەدا کە لەسەر ئایینی ئیبراهیمن(علیە السلام) لاف ئەوەیان لێئەدا کە ئەو شتانەی حەرام و حەڵاڵی ئەکەن بە پێی فەرمانی خوایە، لەکاتێکدا کە هیچ بنج و بنەوانێك نییە بۆ لافەکانیان، وەك لەم ئوممەتەیشدا چەندەها بەناو موسڵمان هەیە کە لاف موسڵمانێتی لێئەدەن و کەچی درۆ ئەکەن بە دەم خواوە بەم رەنگە یاسا و بڕیارو بەرنامە دائەنێن بۆ خۆیان و بۆ مەردوم، بە ئایینی خوای نیشان ئەدەن و وای دائەنێن کە ئەوە شتێکی چاکە و خوا پێی رازییە، خراپتر لەوە ئەوانەن کە ئایینەکەی خۆیان ئەفرۆشن بەم رەنگە شایەتی ئەدەن بۆ ئەوانە و ئەوەی کە دایان هێناوە بە ئایینی خوای نیشان ئەدەن، هەروەها ئەو درۆو دەلەسە هەڵبەستانە چەند شێوە و جۆرێ تریشیان هەیە وەك رەوا دانی کوڕ و کچ بۆ خوا و هەر شتێکی تر کە ناگونجێ بۆ خوا و شایستەی زاتی پاکی ئەو نییە و لە نەفامی کۆندا رەوا ئەدرا و بڕیاری لەسەر ئەدرا.

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾

جا لێرەدا قورئان بەرامبەر هەموو ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ﴾ ئایا کێ ستەم کار ترە لەو کەسەی کە درۆی هەڵبەستبێ بەدەم خواوەو شتی درۆی رەوا دابێ بۆ خوا، یا بڕوای نەهێنابێ بە ئایەتەکانی خوا و بە درۆی دانابن، واتە ئایەتەکانی قورئان کە بەڵگەو نیشانە و رابەرێکی ئاشکران، یان رابەرو نیشانە و بەڵگە بوونەوەرییەکان، یان بە شێوەی گشتی بە هەرکام واتە هیچ کەس ستەمکار تر نییە لەو درۆ و هەڵبەست و بێ بڕوایە، بەڵکو هیچ کەسێکی تر یەکسانیش نییە لەگەڵی و پێی ناگات، وەك بە پێی باوی قسە ئەوەی لێ وەرئەگیرێ، ئەوانە ستەم ئەکەن لە هەق و راستی، ستەم ئەکەن لە خۆیان کە ئەیخەنە بەر خەشم و سزای خوا، ستەم ئەکەن لە مەردومان کە سەریان لێ تێك ئەدەن و ناهەقی وا بڵاو ئەکەنەوە لەناویاندا، ئەیانگێڕن بە بەندەی غەیری خوا، ژیانیان لێ تێك ئەدەن بەو بیرو باوەڕو یاسا و بەرنامە لار و چەوتانە کە ژیانیان پێ تاڵ ئەبێ، ئینجا بە شێوەی گشتی هەواڵێکی دڵنیا کەر ئەدات لە بارەی دوا رۆژی بەدو بەش بڕاوی ستەمکارانەوە: ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بەڕاستی ستەمکاران ناگەن بە ئامانج و رزگار نابن، واتە ستەمکاران بە شێوەی گشتی ئەوە بەشیانە، چ جای ئەوانەیان کە لەوپەڕی پلەدا بن، کەواتە هەر خۆشی و شادمانی یەك ببینرێ پێیانەوە بە رواڵەت نابێ بە هیچ شتێکی نرخ دار دابنرێ، چونکە ماوەکەی زۆر کورتە، نیازی خێریشی لێنەکراوە، بەڵکو ئەو جۆرە خۆشی یە رواڵەتی یانە بۆ ئەوەیە کە پێی ئەگوترێ:(استدراج) لە زمانی شەرعدا، واتە وەك چەشە وایە تا بەرە بەرە ئەکەونە ناو ئاگری دۆزەخ و بێبەش ئەبن لە میهرەبانی خوا، خوا ئەوانە ئەناسێ و ئەزانێ کە گەڕانەوەیان نابێ و بە مەیل و ئارەزووی خۆیان سوور ئەبن لەسەر ستەم و بێ بڕوایی یەکەیان بە بێ نیازی گەڕانەوەو کۆتایی هێنان، کەواتە خۆیان چۆن ئەبن خوا ئەوەیان لەسەر ئەنووسێ و بڕیاری ئەدا. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هێندێ لە بێبەشی و نەگەیشتنیان بە ئامانجەکەیان، بەمە هەڵوێستی رۆژی دوایی یان ئەخاتە بەرچاو،

﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾﴾

---

ئەفەرمویٚ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ باسی ئەو رۆژە بکە کە ئێمە هەموو کۆ ئەکەینەوە بە تێکڕایی و پێکەوە، واتە هەموو مردووەکان، یان مەبەست لێرەدا هەر بت پەرستەکانە لەگەڵ پەرستراوەکانیان ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟﴾ ئینجا ئەڵێین بەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا داوە پێیان ئەڵێین بۆ سەرزەنشت کردن و بێ ئابڕوو کردنیان ﴿أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ ئایا لە کوێن پەرستراو و هاوبەشەکانتان کە کردبوونتان بە هاوبەشی خوا و لاف هاوبەشیتان بۆ لێ ئەدان؟ بێگومان هاوبەش دانان و هاوبەش ڕەوا دەران چەند جۆر و شێوەیەکن، هەروەها بت و پەرستراوەکانیش چەند جۆر و بابەتێکن، هیچ کام لەمانە هەر ئەو جۆرو شێوە سادە نییە کە زۆربەی مەردوم دڵی بۆی ئەڕوا لەکاتی باس کردن و ناوبردنی هاوبەش و هاوبەش ڕەوادەران و بت پەرستراوان: کە بریتی یە لەوەی دەستە و تاقمێکدار و بەرد و ئەستێرە و ئاگر بپەرستن و کوڕنوشی بۆ بەرن، وەك زۆربە و جۆر و شێوەیە باو بووە لەسەردەم و چەرخی نەفامی ئەو حەلەی کە ئیسلام هات! هاوبەش ڕەوادەران و دانان بۆ خوا کورتەکەی بریتی یە لە دان نان و بڕوا کردن بە هەر شتێ کە تایبەتی یە بە خواوە، ئیتر ئەوە بریتی بێ لە بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردنی ڕووداوەکانی ئەم بوون و بوونەوەرە و کارکردن و واسیتەگەری تێیدا لەلایەن هەرکەس و هەرشتێکی ترەوە بێجگە لە خوای تاك و تەنیای پەروەردگار یان بریتی بێ لە کڕنوش بردن و پەرستن و پێشکەش کردنی بەندەیی بۆ غەیری خوا، یان بریتی بێ لە وەرگرتن و بڕوا کردن بە هەر یاسا و بەرنامە و ڕژێمێك لە غەیری خوا، هەموو ئەمانە چەند جۆر و شێوەیەکن لە هاوبەش ڕەوادان و بەوەی ناو ئەبا و هەموو جۆرەکانی نیشان ئەدا لە چەشمەندازەکانی ڕۆژی دواییدا، عەرەبەکان لە سەردەمی نەفامیدا ئەو هەموو جۆرانەیان بەکار ئەهێنا: بڕوایان وابوو کە هێندێ لە دروست کراوەکانی خوا هاوبەشی خوا ئەکەن لە فەراهەم هێنان و بەڕێوەبردنی ڕووداو و کاروبارەکاندا، ئیتر لە ڕێگەی داوا کردن و تکا کردنێك لە خوا کە پێویست پێکردنی هەرگیز گێڕانەوەو نەکردنی بێ. کە ئەم جۆرەیان دانرا بوو بۆ مەلائیکە یان لە ڕێگەی توانین و دەسەلات – بە سەربەخۆیی – بەسەر ئازاردان و سزا گەیاندن ئەمەشیان ڕەوا دابوو بۆ جنۆکە، ئیتر خۆیان

له خۆیانەوە هەڵسن بەوە یان بەهۆی جادووگەر و کاهینەکانەوە، یان لە هەردوو ڕێگاکەوە، ئەمەشیان دانابوو بۆ ڕۆح و گیانی باوك و باپیرەکانیان، بۆ هەرکام لەمانە بتێکیان دیاریی کردوو کە دەست نیشان بێت بۆی، بەو ڕۆح و گیانانە ئاوەدان بن و کاهینەکان ڕاو بڕیاریان لێوەرگرن، بەم ڕەنگە هەرچی یان ویست حەلاڵی بکەن و هەرچی یان ویست قەدەغەی بکەن لەسەریان و لە ڕاستیدا ئەوەی کە ئەکران بە پەرستراو و هاوبەش ئەو کاهینانە بوون.

ئەو بت پەرستانە بە دیمەن ئەو دارو بەردانەیان ئەپەرست و نەزرو قوربانی یان بۆ ئەکردن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کاهینانەیان ئەپەرست و نەزر و قوربانییان بۆ ئەوان ئەکرد، هەروەها جۆرێکی تریش باو بوو لەناو ئەو عەرەبانەدا، کە لە فارسەکانەوە وەریان گرتبوو، بەم ڕەنگە بڕوایان وابوو مانگ و خۆر و ئەستێرەکان هاوبەشی خوا ئەکەن لە بەڕێوەبردنی ڕووداو و کاروبارەکاندا، لەبەر ئەوە سوژدەیان بۆ ئەبردن، لەمەیشەوە وەرئەگیرێ پەیوەندی ئەڵقەی کە دێت لە داستانی حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام) بەم شوێنەو بە مەبەستی سورەتەکەوە. هەروەها ئەو عەرەبانە جۆری سێ یەمیشیان بەکار ئەهێنا لە هاوبەش ڕەوادان – بەمەی – لە ڕێگای کاهینەکان و سەرۆك هۆزو تیرەکانەوە، پەیڕەوی چەند شەریعەت و باویان ئەکرد کە خوا ڕەوای نەدابوو بۆیان، لاف ئەوەیان لێئەدا کە ئەوە شەریعەتی خوایە. جا لێرەدا ڕۆژی دوایی ئەخاتە بیرو ئەو بەرەنگاری و پرسیارەی ئەو ڕۆژە ئەخاتە بەرچاو کە ئاراستەی ئەوانە ئەکرێ کە لەم جیهانەدا هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا داوە هاوبەش لە هەر جۆر و بابەتێ، هاوبەش ڕەوا دەران لە هەر جۆرو تاقمێ. ئەفەرموێ: ﴿نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئەوانە کۆ ئەکەینەوە هەموو پێکەوە بە کۆمەڵی ی موسڵمانان و ناموسڵمان یان بت پەرست و بتەکان و پەرستراوەکان.

ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانە لەم جیهانەدا بە ئومێد و چاوەڕوان بوون کە بتەکانیان فریایان کەون و بەهرەمەند بن لێیانەوە، بێگومان هیچ دەست کەوتێکیان نابێ، بێجگە لە بەش بڕاوی و نائومێدی، جا سەر باقی ئەوە سیخی سارد ئەکرێ بە جگەریاندا، بە سەرزەنشت کردن و تەشەر لێدان بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ ئینجا ئەڵێین بەوانەی کە هاوبەشیان ڕەوا داوە بۆ خوا ﴿أَيْنَ شُرَكَاؤُكُمُ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ ئایا لە کوێن هاوبەش و پەرستراوەکانتان کە بە درۆوە بە هاوبەشتان دائەنان و لاف هاوبەشیتان بۆ لێئەدان؟ شێوەو دیمەنی پرسیارەکە وا ئەگەیەنێ کە ئەو بتانە لەو کاتەدا ئامادە نەبن، لەگەڵ پرسیار لێکراوەکاندا، سەرەتای ئایەتەکە و چەند ئایەتێ تریش وا نیشان ئەدەن کە ئامادە بن

لەگەڵیان، کەواتە ئەبێ بڵێین: ئەوانە لە یەکەم جارەوە هەموو پێکەوە ئەبن لە پاشان دوور ئەخرێنەوە لە یەکتر، ئەم پرسیارەیان لێئەکرێ لەو کاتی پچڕان و دوورخستنەوەدا. یان ئەڵێین: ئامادە بوونەکەیان لە بێ کەڵکی و بێ سوودی و بێ نرخیدا وەك ئامادە نەبوون وایە یان ئەڵێین: مەبەست ئەوەیە ئایا لە کوێیە سوود و نرخی هاوبەش و پەرستراوەکانتان؟ ئینجا ئایا ئەم پرسیارەیان ئاراستە ئەکرێ لەلایەن خواوە روو بە روو و یەکسەرە وەك ئەو پرسیارو وتەیانەی کە ئاراستەی شەیتانی کردن یان بەهۆی فریشتەوە ئاراستە یان ئەکرێ؟ هەرکام لەم دووبارە ئەگونجێ و کام باریان کاردروستی و حیکمەتی تەواوتر بێ بەو جۆرە ئەبێ و خوا ئەیکات. ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟﴾ وتەی(فتنة) لە بنەڕەتدا بریتی یە لە تواندنەوەو پاڵفتە کردن، ئینجا بەکار هێنراوە بۆ چەند مەبەستێ: سزاو ئازار. تاقی کردنەوە، بەڵاو موسیبەت، بێ بڕوایی، گوناە، گومڕایی، عوزرو بەهانە، وەڵام دانەوە بە درۆ، شادمانی و کەشخە کردن، ئینجا ئایا لێرەدا مەبەست کامیانە؟ بە هەموو جۆرەکان تەفسیر کراوەتەوە، تاقمێك لەسەر ئەون کە مەبەست پێی بێ بڕوای و هاوبەش دانانە بۆ خوا،(زجاج) ئەمەی پەسەند کردووە،(عطا) یش ئەمەی ریوایەت کردووە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت– واتە: سەرەنجامی ئەو بێ بڕوایی و هاوبەش رەوا دانەیان کە لە ماوەی ژیانیاندا سوور بوون لەسەری و کەشخە و شانازی یان پێوە ئەکرد، دوا رۆژو سەرەنجامی ئەوەیان هەر ئەوە ئەبێ کە بێگومان ئەڵێن: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ سوێند بەخوا ئێمە هاوبەش رەوا دەر نەبووین و هاوبەشمان رەوا نەداوە بۆ خوا، واتە کەشخە و شانازی یەکیان سەری لە بێزاری دەربڕین و دان پیا نەنانەوە دەرچووە، پاکانە کردن لەسەر ئەوەی کە هاوبەشیان رەوا نەداوە! لەسەر هەر بارو هەر جۆر ئایا چۆن ئەو سوێندە ئەخۆن؟ چۆن ئەتوانن ئەو درۆیە بکەن لەو رۆژەدا و لە حوزوری خوادا؟ چۆن ئەمە ئەگونجێ لەگەڵ ئایەتی سورەتی(النساء) دا کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ ئەوانە هیچ قسە و باسێك ناشارنەوە و راستی هەموو شتێك ئەڵێن لە خۆیان؟ زانایان لە کردەوەی ئەم گرێیە دا چەند شتێکیان فەرموە، پەسەند تریان ئەمەیە – زانینی تەواو هەر لای خوایە – کە سام و بیم و ترسی ئەو رۆژە سەرگەردان و بێ هۆشیان ئەکات تا لە تاودا ئەوە ئەڵێن لە یەکەمجارەوە، وا ئەزانن ئەوە سوودی هەیە بۆیان، لە پاشدا ناچار ئەبن و راستی ئەڵێن، کەواتە کاتێ ئەم دوو وتەیە جیاوازە و دژایەتی روو نادا لە نێوان ئەم دووانەدا.

﴿ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ۖ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ﴾

---

**ئینجا سەر سوڕ ئەهێنێ لە حاڵی بەدی ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ﴾ تەماشاکەو سەرنج بدە کە چۆن ئەوانە درۆ ئەکەن و درۆ ئەسەپێنن بەسەر خۆیاندا و چۆن ئەو درۆ زلە ئەکەن و ئەڵێن ئێمە هاوبەشمان بڕیار نەداوە بۆ خوا؟ ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾ چۆن ون ئەبێ لێیان ئەو بت و پەرستراوانەیان کە درۆ و دەست هەڵبەستیان ئەکرد بە پەرستنیان بە ئومێد و چاوەڕوانی تکاو یارمەتی دانیان؟! ئەم ئایەتە بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، ئەوانەیش ئەگونجێن، بەڵام ئەوەی کە گوتمان لە دڵدا بەهێز ترە، خوا خۆی باش ئەزانێ، ئینجا حاڵ و باری تاقمێك لەو بێ بڕوایانە ئەخاتە بەرچاو و نەخشەی ئەکێشێ، دوا ڕۆژو چارەنووسیشیان روون ئەکاتەوە بە جۆرو شێوەیەکی زۆر سامناك، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ۖ﴾ هێندێ لەوانە کەسێکە کە گوێ ئەگرێ لێت ئەی پێغەمبەر لەکاتی قورئان خوێندنتدا ﴿وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً﴾ لە کاتێکدا دامان ناوە بەسەر دڵەکانیانەوە چەند پەردەیەکی گرنگ ﴿أَن يَفْقَهُوهُ﴾ لەبەر ئەوەی تێنەگەن لەو قورئانەی کە ئەیخوێنێتەوە بەسەریاندا وەری نەگرن ﴿وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ﴾ کەڕی و گوێ گرانیمان خستووەتە ناو گوێچکەکانیانەوە تا بەرگری یان بکات لە وەرگرتنی بەو جۆرو شێوەی کە پێویستە و کەڵکی ببێ بۆیان.**

**لە زۆر شوێن لەم تەفسیرەدا باسمان کرد کە مەبەست بەم جۆرە فەرمودەیانە چیرۆکە، واتە ئەوانە وەك کەسانێکن کە بەو جۆرەیان لێکرابێ و بەرگری کرابن لە زانین و تێگەیشتن: یان مەبەست ئەوەیە کە لەڕووی راستیدا خوا پەردەو کەڕی یەکی مەعنەوی و نادیاری یان تیا فەراهەم ئەهێنێ، بە هەرحاڵ و لەسەر هەر بار خواهیش و مەیل و بڕیاری رابوردووە و تێپەڕی کردووە کە ئەوانە بە مەیل و خواهیش و هەڵبژاردنی خوا، بە بێ زۆر پێ هێنان و ناچار کردن، لەسەر ئەو بارو حاڵە ئەبن و دوور و دژی ئایینی خواو گوێڕایەڵی ئەبن بۆ فەرمانی خوا، کەواتە سوچ و خەتای خۆیانە و نەنگ و ڕەخنە هەر روو ئەکاتە خۆیان، هیچ بڕو بیانوویەکیان نییە بەدەستەوە.**

وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُۖ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾

---

﴿وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا﴾ ئەگەر هەموو بەڵگەو نیشانەیەکی روون ببینن لەسەر راستی تۆو ئایینەکەت بڕوای پێناهێنن و دانی پیا نانێن، لەبەر ئەوپەڕی عیناد و سەرکێشی یان ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ﴾ تا ئەو رادەیە کاتێ بێن بۆلات لەکاتێکدا کە دەمە دەمێ و بەربەرەکانێت لەگەڵ ئەکەن، ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانە کە بڕوایان نەهێناوەو بێ بڕوان ئەڵێن: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەم قورئانە هیچ نییە بێجگە لەوەی کە وتەو قسەی پڕوپووچی نوسراوی گەلە پێشووەکانە، درۆو دەلەسەی ئەوانەو بەجێماوە لە پاش ئەوان ﴿وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ ئەو بێ بڕوایانە جڵەوگیریی ئەکەن لەو قورئانە و بڕوا پێهێنان و شوێن کەوتنی، واتە هەر بەوە کۆتایی ناهێنن کە بڕوای پێناهێنن و بە دەلەسەو قسەی پڕو پووچی دائەنێن، بەڵکو جڵەوگیریی مەردومانیشی لێئەکەن ﴿وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ﴾ خۆیشیان دوور ئەخەنەوە لێی بۆ ئەوەی دەری بخەن کە بێزارن لێی، بۆ بەهێز کردنی جڵەوگیریی کردنەکەیان﴿وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانە بەو کردەوەیانە هەر خۆیان لەناو ئەبەن، بەمەی خۆیان ئەخەنە بەر سزای سەختی خوا کە دووچاری ئەبن لەسەر گومڕا بوونی خۆیان و گومڕا کردنی مەردومانیش، ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ لە کاتێکدا کە هەست ناکەن بەوە و نازانن کە زیان هەر بە خۆیان ئەگەیەنن نەك بەو قورئان و ئایینەی کە خوا ناردی بۆیان، حاڵ و باری بەدی ئەم جیهانەی خستە بەرچاو، ئینجا ئەوا حاڵ و بەسەرهاتی رۆژی دواییشیان ئەخاتە بەرچاو، حاڵ و بەسەرهاتی سامناك و داچڵەکێنەریان،

وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾

---

**ئەفـەرموێ: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ ئەگـەر ئـەبینی ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) – یـان ئـەی هەرکەسێك کە شیاو شایستەی بینینی – ئەگەر ئەبینی بەچاوی خۆت ئەو کاتەی کە ئەو بێ بڕواو گومڕایانە ڕاگیر ئەکرێن بە دیاری ئاگری دۆزەخەوە و جڵە ئەکرێن بەسەر لێواری یەوە بۆ ئەوەی بەرە بەرە و بە ریز و بە پێی شایستەی خۆیان بۆ پێشخستن و توڕ دان بۆ ناو دۆزەخ، یـان کـورت هەڵئـەهێنرێن بەسـەر ئاگردا و تێپـەڕ ناکـەن لێیـان ئەوەستێنرێن بەسـەر پردی(صراط) ەوە کە وا بەسەر دۆزەخەوە، یان پـاش تێخستن ئاگادار ئـەکرێن بەسـەر سزاو ئازاوە بێ وێنەکەی دۆزەخدا، لەسەر هەر بار ئەگەر ئەوانە ئـەبینی بەڕاستی شتێکی ئێجگار سەخت و سامناك ئەبینی کە مـەردوم نـاتوانێ ڕادەو پلـەی روون بکاتـەوە، شتێکی سەرسام کەر و ترسێنەر ئەبینی، ئـەبینی داخ و مـەراقی پەشیمانی داگیریـان ئـەکات، ﴿فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا﴾ ئەڵێن ئای کاشکێ و خۆزگە بگێڕراینایەتەوە بۆ جیهان و بێ بڕوایـی نەکـەین و بێ بڕوا نەبین بـە ئایەتـەکانی پـەروەردگارمان ﴿وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لـە بڕواداران ببین و ببین بـە بڕوادار، واتە ئاواتە خوازی ئەوە ئەبن کە بێنەوە ئـەم جیهانـەو ئەم جارە وەك جاری پێشوو نـەبن، بـەڵکو موسـڵمان و بـڕوادار بـن، بـەڵام تـازە هـیچ نـاکرێ و ئـاواتی وا بـەدی نایـەت. ئاواتەکـەیان وا نیشان ئـەدات کە چاك تێگەیشتوون لـە خراپـی بـێ بڕوایـی و سـەرەنجامی بەدی، لە چاکی بڕوا و پاشە ڕۆژی شیرینی، لەبـەر ئـەوە بـەڵێن و بڕیـاری بڕوا هێنـان ئـەدەن ئەگەر ئاواتەکەیان بەدی بێت، لە ڕووی ڕاستیشدا کارەکەیان بەو جۆرە نییە، جا لـەبەر ئـەوە ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ﴾ نەخێر ئاواتەکەیان لەبەر ئەوە نییە کە ئارەزوو مەیلی بڕوا هێنانیان هـەبێ و بیانـەوێ بـە ڕاسـتی بـچنە ڕیـزی بـڕواداران ﴿بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ﴾ بـەڵکو دەرکـەوتووە**

بۆیان ئەوەی کە لەوەو پێش ئەیانشاردەوە، ئەم دەرکەوتووە کە لەوەوبەر ئەیانشاردەوە بە چەند جۆر تەفسیر کراوەتەوە:

١- کردەوە ناشیرین و بەدەکانیان کە لە نامەکانیاندا نووسراونەتەوە و مایەی شەرمەزاری و سزایانە، ئەو کردەوانەی کە ئەندامەکانیان شایەتی یان لێئەدەن لەو رۆژە سامناکەدا.

٢- کوفرو بێ بڕوایی یەکانیان کە لە یەکەمجارەوە دانی پیا نانێن و ئەیانشارنەوە، تا لە پاشدا ناچار ئەبن و دانی پیا ئەنێن.

٣- زیندوو بوونەوە و حیساب و پرسیار و سزاو تۆڵەی ئەو رۆژەیە کە لە جیهاندا دایان ئەشاردن بەبڕوا پێنەهێنان.

٤- ئەو هەق و راستی یەی کە سەرۆکەکان یا زاناکان لە جیهاندا ئەیانزانی، بەڵام ئەیانشاردنەوە لە نەزان و ژێر دەستەکان، لەبەر پارێزگاری سەرۆکایەتی یەکەیان، یان هەر بە عینادو سەرکێشی ئینجا لە رۆژی دواییدا دەرئەکەوێ بۆ ژێر دەستە و نەزانەکان ئەوەی کە سەرۆك و زاناکان لێیان ئەشاردنەوە بە شێوەی گشتی بگیرێ بۆ هەر شتێ کە دەرخستنیان بە خراپ دانابێ لە جیهاندا هەموو ئەوانە لەو رۆژەدا ئاشکرا ئەبن. چەند جۆرێکی تریش گوتراوە، بەڵام بە پێویستم نەزانی باسیان بکەم، لەسەر هەر بار ئاوات و قسەکانیان لە راستی یەوە نییە و لە ناچارییە، ﴿وَلَوۡ رُدُّواْ﴾ ئەگەر ئەوانە بگێڕرێنەوە بۆ جیهان ﴿لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ﴾ بێگومان دووبارە ئەبنەوە بۆ ئەو بارەی کە جڵەوگیریی کران لێی لە پێشەوە، ئەگەڕێنەوە بۆ سەر بێ بڕوایی و کردەوە بەدەکانی ئەوسایان ﴿وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ بێگومان ئەوانە درۆزنن و درۆ ئەکەن لەوەی کە ئەیڵێن و دەری ئەبڕن، خوا بەندەو دروست کراوی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ سروشتیان چییە و چۆنە.

وَقَالُوٓاْ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَـٰذَا بِٱلْحَقِّ ۚ

---

**ئینجا حالْ و بارێكی تری ئەم جیهانەی بێ بڕواكان ئەخاتە بەرچاو لەگەڵ شێوەیەكی تر لە دوا ڕۆژو چارەنووسیان لە ڕۆژی دواییدا، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ﴾ بێ بڕواكان ئەڵێن: ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا﴾ هیچ ژیانێكی تر نییە و نابێ بێجگە لەم ژیانە نزیكەی ئێستامان و ژیانی ئەم جیهانەیان ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ بێگومان ئێمە نابین بە زیندوو كراوە و زیندو ناكرێینەوە لە پاش مردنمان لەم جیهانەدا. مەسەلەی زیندوو بوونەوە و حیساب و پرسیاری ڕۆژی دوایی یەكێكە لە بیرو باوەڕە سەرەكی و بنەڕەتی یەكان كە ئیسلام و هەموو ئایینەكانی خوا پێی هاتن، لەپاش بیرو باوەڕی تاك و تەنیایی خوا، بە جۆرو شێوەیەك كە ئەم ئایینە لە هەموو بارو روویەكی یەوە لەسەر ئەم دووبنەڕەتە دائەمەزرێ و ئەم دووانە بنەڕەتن بۆ هەموو بۆچون و كردەوەو رەوشت و رژێم و یاسایەكی. بێگومان ئەم ئایینە كە خوا گەیاندی بە پایان و چاكەو بەهرەی خۆی پێ تەواو كرد بەسەر بڕواداراندا، هەڵی بژارد بە ئایین بۆیان — وەك خوا خۆی فەرموی لەم قورئانە پیرۆزەدا — ئەم ئایینە بەرنامەی ژیانە، بەرنامەیەكی تێرو تەواوە و هەموو بەش و پارچە و ناوچەكانی رێك و پێكن لەگەڵ یەكتر و تەواو كەری یەكترن: هەمووی دامەزراوە لەسەر ئەو دوو بنەڕەتە: تاك و تەنیایی خواو ژیانی ڕۆژی دوایی.**

**ژیان بەلای ئیسلامەوە تەنها ئەم ماوە كورتە نییە كە ماوەی ژیانی كەسێك بێیان گەل و ئوممەتێك یان هەموو ئادەمی لەم جیهانەدا، ژیان بەلای ئیسلامەوە قوڵترو پان تر و درێژترە لەوەی كە نەزان دایئەنێ بە جۆرێ ئەم ماوە كورتەی ئەم جیهانە ئەگرێتەوە لەگەڵ ژیانی ڕۆژی دوایی كە دوایی نەهاتووەو نەبڕاوەیە، ئەم جیهان و وڵاتە ئەگرێتەوە لەگەڵ جیهان و وڵاتی ڕۆژی دوایی كە هەر خوا ئەزانێ رادەی گەورەیی و فراوانی یەكەی، ئەم عالەمە ئاشكرا ئەگرێتەوە كە دیاریی یە و هەستی پێئەكرێ لەگەڵ چەند عامەلێ تردا كە ئەزانێ چەندێتی و چۆنێتی یان، موسڵمانی قورئانی بۆچوون و تێگەیشتنی لە بوون بە شێوەی گشتی و لە بوونی ئادەمی بە تایبەتی جیاوازو فراوانە لەهەر بۆچوون و تێگەیشتنێ تر و زۆرتر بە پانتر و قوڵتر تام و بۆنی ژیان ئەچەژێ، بە پێی ئەو بۆچوون و تێگەیشتنەی كارو**

کردەوەو خەریك بوون و مەبەستی گەورەتر و گرنگ تر بە نرخ ترە لە هەر کەسێکی تر کە ئەم بۆچوون و تێگەیشتنەی نەبێ، ئەو کەسەی کە بەم جۆرو شێوە قورئانی یە بڕوای هەیە بە رۆژی دوایی و بە دادو دادپەروەریی رۆژی دوایی، بە گرنگی و گەورەیی دەست کەوت و پاداشتی ئەو رۆژە و سەخت و سامناکی سزاو تۆڵەی ئەو رۆژە، ئەو کەسە زۆر جیاوازە لە رەوشت و کارو کردەوەو مەبەست و خەریك بووندا.

ئەم جیهانە بە لای ئەم کەسەوە جێی کشتوکاڵە بۆ رۆژی دوایی، تەقەلا و تێکۆشانی بۆ چاك کردن و پاڵفتەکردنی ئەم جیهانەیە، بۆ بەربەست کردن و بەرگری کردنی شەڕو خراپەیە لەم جیهان و ژیانە، بۆ بەدی هێنانی رەزامەندی خواو چەسپاندنی فەرمان و بەرنامەی خوایە و بەرگری کردنی هەموو دەست درێژیی یە کە بۆ سەر بەرنامەی خوا، بۆ پێکهێنانی خێرو چاکەو داد بۆ هەموو کەسێك. کە ئەمانەیە توێشوو و پێ بژێوی رۆژی دوایی، ئەمانە کلیلی قاپی یەکانی بەهەشت کە ئەو تێکۆشەرانە قاپی یەکانی بەهەشتی پێ بکەنەوە و بگەن بەو دەست کەوتەی کە خوا بەڵێنی پێداوە بۆ تێکۆشەرانی رێگای خۆی، کەواتە ئەو موسڵمانە قورئانییە هەرگیز کەنار گیری ناکات و وازناهێنێ لە تێکۆشان و سەری خۆی کز ناکات، تا ستەم و شەڕ و خراپە جیهان داگیر بکات و داد و بەرنامەی خوا ژێر پێ بکرێ. موسڵمانی قورئانی بۆچوون و تێگەیشتنی بەو جۆرەیە، نەك بەم جۆرەی کە بۆ خۆی دانیشێ و کەنارگیریی بکات و هەقی بەسەر هیچ شتێکەوە نەبێ، تا ستەم و شەڕ و خراپە و ناهەقی و خراپەکاری و نەفامی و دواکەوتن جیهان داگیر بکات و ناهەق زاڵ ببێ و سەرکەوێ، ئەو کەسەی کە بۆچوون و تێگەیشتنی بەو جۆرو شێوە بێت، ئەو کەسە زۆر دوورە لە ئیسلام و بۆنی ئیسلامی نەکردووە و تامی ئیسلامی نەچەشتووە. موسڵمانی قورئانی خەریکی ئەم ژیانە ئەبێ، لە کاتێکدا هەست ئەکات کە گەورەترو بڵندترە لەم ژیانە، خۆشی و نازو نیعمەتی ئەم جیهانە بەکار ئەهێنێ یان گوێی لێ نابێ، لە کاتێکدا ئەزانێ کە ئەو نازو نیعمەتە حەڵاڵە بۆی لەم جیهانەدا، لە رۆژی دواییدا تایبەتی یە هەر بە موسڵمانەوە، هەوڵ و تێکۆشان ئەکات بۆ بەرز کردنەوەو گەشە پێ کردنی ژیان و بەکارهێنانی هێزو وزەکانی ئەم جیهانە، لە کاتێکدا ئەزانێ کە ئەوە پێویستی سەرشانی خۆی بەجێئەهێنێ سەبارەت بەو جێنشینی یەی کە خوا بۆی داناوە لەم جیهان و زەوی یەدا، بەرگری ستەم و ناهەقی و خراپە ئەکات و خۆی دووچاری هەموو سزاو ئازار ئەکات و فیداکاری ئەکات بە گیان و بە ماڵ لەو رێگایەدا لە کاتێك دا ئەزانێ بەوە توێشووی رۆژی

دوایی فەراهەم ئەهێنێ، چونکە لە ئایین و ئیسلامەکەیەوە حاڵی بووە کە ئەم جیهانە جێگای کشت و کاڵ و فەراهەم هێنانی توێشوو دەست کەوتی ڕۆژی دوایی یە، ئەزانێ ئەبێ هەر لەم جیهانەوە گوزەر بکات و بڕوا بۆ ئەو جیهان، ئەزانێ ئەم جیهانە کەم نرخەو نابێ پشتی پێ ببەسترێ و بەڵام چاکە و بەهرەی خوایە ئەبێ لێرەوە بڕوا بۆ ئەو جیهان و گەیشتن بە نازو نیعمەتە فراوان و نەبڕاوەکەی، جا لەبەر ئەوە ژیانی ئیسلامی نابێ و ناگونجێ بە بێ بڕوای بەهێزو دامەزراو بە ڕۆژی دوایی، جا بەهۆی ئەوەوە قورئان ئەو هەموو باس و دڵنیایی یە ئەکات لەسەر ڕۆژی دوایی و بڕوا کردن و دڵ بەستنەوە بەو ڕۆژەوە، عەرەب لە سەردەمی نەفامی یاندا پێش هاتنی ئیسلام – وەك هەموو گەلە نەفامەکانی تری پێش ئەوان – وەك هەموو تاقم و چین و گەلە نەفامەکانی پاش ئیسلام، لەمەو پێشەوە تا ئێستای چەرخ و سەردەمە نەفامەکانی ئێستا و داهاتوو – نەفامی کۆن و تازە – بەهۆی نەفامی یەکەیانەوە لەبارەی ژیانەوە بۆچوون و تێگەیشتنێکی تەنگ و تاریك و کەم و کورپیان هەبووەو هەیانە، بێبەشن لەو بۆچوون و تێگەیشتنە پان و پۆڕ و قوڵ و فراوانەی کە لە ئایینی خوادا هات و بڕواداران ئاشناو زانا بوون پێی، جا لەبەر ئەو نەفامی و نەزانییە هەموو ئەم بۆچوون و تێگەیشتنەیان بووە و هەیە کە ئەم ئایەتە باسی فەرمو: ﴿إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ﴾ وەك تەفسیرمان کرد، بێگومان ئەو بۆچوونە ناگونجێ لەگەڵ ئادەمێتیدا، ژیان لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا زۆر تاڵ و سەخت و تاریکە، جا لەبەر ئەوە قورئان مەسەلەی بڕوا بە ڕۆژی دوایی زۆر بە گرنگ گرت، بە چەند جۆر و شێوەیەك دای لەو بۆچوونە ناڕەوا و بە هەڵە دەری کرد و هەڕەشەی سەخت و سامناکی ئاراستەی ئەو کەسانە کرد کە خاوەنی ئەو بۆچوونە ناڕەوایەن، یەکێ لەو هەڕەشەیانە ئەمەیە کە لێرەدا باسی ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ ئەگەر ئەبینی ئەو کاتەی کە ئەوانە ڕاگیر ئەکرێن لە حوزوری پەروەردگاریاندا، واتە فریشتە ڕاگیریان ئەکات لەو شوێنەداکە حیساب و پرسیاریان لێئەکرێ، ڕاگیریان ئەکەن هەر بە دیاری فەرمانی پەروەردگارەوە ﴿قَالَ﴾ پەروەردگار ئەفەرموێ پێیان: ﴿أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۚ﴾ ئایا ئەمە هەق و ڕاست نەبوو، واتە ئەم زیندوو کردنەوەو حیساب و پرسیارە کە ئێوە لە جیهاندا بڕواتان پێی نەبوو بە ڕاستتان نەئەزانی، ئایا ئەمە ڕاست نەبوو؟

قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٣٠﴾ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ

---

﴿قَالُواْ﴾ ئەوانیش ئەڵێن: ﴿بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ﴾ بەڵێ هەق و ڕاست بوو سوێند بە پەروەردگارمان. بەڕاستی پرسیارەکە ئێجگار ئابڕوو بەرو سەرشۆڕی و شەرمەزاری ئەهێنێ بەسەریاندا! هیچ چارەش نییە و ئەبێ دان بنێن بەو شتە ڕاستەدا، بەڵام زۆر بەداخەوە کە تازە هیچ سوودێکیشی نییە، چونکە ژیانی ئەم جیهانە هەل و هەڵکەوتێك بوو، خوا پێیدان و هەواڵی ئەم بەسەرهات و ڕووداوانەشی پێدان، کەواتە هیچ بڕو بیانووو بەهانەیەك نەماو کاتی ئەوە هاتە پێشەوە کە هەواڵ و هەڕەشەکەی جیهان بەدی بێت، لەبەر ئەوە: ﴿قَالَ﴾ خوا پێیان ئەفەرموێ: ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ کەواتە بچەژن ئەو سزایەی کە هەواڵتان پێدراو هەڕەشەتان لێکرا پێی بچەژن ئەو سزایە بەهۆی ئەوەی کە بڕواتان نەهێنا لە جیهاندا و هەمیشەیی لەسەری بوون تا مردن. ئەی هاوار بۆ ئەو بەش بڕاوی و چارە ڕەشییە! ئای بۆ ئەو شەرمەزاری و نائومێدییە! ئای هاوار! خوا بە میهرەبانی خۆی دووچاری ئەوەمان نەکات – آمین –. لەپاش باسی ئەو سزاو شەقاوەتەی کە دووچاریان ئەبێ، ئینجا باسی زیانباری یان ئەکات لەبارەی ئەو خۆش بەختی و پاداشت و نازو ڕێزەیان کە لە دەستیان دەرچوو، لەو ڕۆژەدا بەخۆیان ئەزانن و داخ و خەفەتی بۆ ئەخۆن، بەوە زیاتر سەختی و سامناکی بڕیارەکە ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ﴾ بەڕاستی زیانیان کرد و زیانبار ئەبن ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا و زیندوو بوونەوەو حیساب و پرسیار و گەیشتن بە حوزوری خوایان بە درۆ دائەنا و ئەوەی کە خوا هەواڵ و بەڵێنی پێدابوو بە ناڕاستیان ئەزانی و لایان وابوو بەدی نایەن، بەردەوام بوون لەسەر ئەو بێ بڕوایی یە، ئەوانە زیانبار بوون لە جیهاندا بەوەی ژیانیان بردە سەر لەسەر ئەو ڕادەو پلە پەستە و بەو بۆچوونە ناڕەواو بەو نەفامی و تێنەگەیشتنەوە، زیانبار و خەسارەت مەند بوون لە ڕۆژی دواییدا بەو جۆرو شێوە سامناکەی کە باسی کرد و دەست نیشانی بۆ کرد، بێجگە لەوەیش سەریان لەمەوە دەرئەچێ کە ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ﴾ واتە بڕوایان نەهێنا هەتا کاتی

دیاریی کراویان بۆ دێت لەناکاو و بە کوت و پڕی، ئەو کاتەش بریتی یە لە کاتی مردن کە خۆی یان سەرەتاکەی لەناکاودا دێت و ئیتر ڕۆژی دوایی ئەو مردووە دەست پێ ئەکات هەتا هەتایە و بێ بڕانەوە، ئەوەی کە دووچاری ئەبن بەسەریان دێت شتێکی کوت و پڕی یەو ئەوانە چاوەڕوان نەبوون بۆی و هیچ حیسابێکیان بۆ نەکردبوو، وەك هێندێ بەم جۆرە تەفسیری ئەکەنەوە، یان وەك کۆمەڵ و جەماوەر ئەفەرمون: مەبەست بەو کاتە ڕۆژی دوایی یە کە هاتنەکەی لەناکاودایە و بە کت و پڕی و بەبێ چاوەڕوانی کردن بۆلای لەلایەن ئەو دواترین چین و تاقمەی کە لەو کاتەدا هەن و جیهانیان بەسەردا وێران ئەکرێ. وەك هاتنی زیندوو کردنەوەی هەموانیش شتێکی کت و پڕی یە و لە ناکاودایە، لەسەر هەر بار لەو کاتەدا ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنابێ لە جیهاندا، ﴿قَالُوا﴾ ئەڵێن: ﴿يَحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا﴾ ئای داخ و مەراق و پەشیمانی سەخت بۆ ئێمە لەسەر ئەوەی کە قوسورمان کرد لە ژیانی جیهانماندا و زایەمان کرد و لامان وابوو کە هەر ئەو ژیانە هەیە، ئەو ژیانەمان نەکرد بەهۆی ڕزگار بوون لە سزای ئەم ڕۆژە و گەیشتن بە خۆشی و نازو نیعمەتە نەبڕاوەکەی، ئەی ئاخ و مەراق وەرە داباریێ بەسەرماندا ئەم کاتە کاتی خۆتە و هەر مافی خۆتە کە بێیت و ئامادەی بی. سزای ئەوانە هەر ئەو داخ و مەراقە سەختە نییە لەسەر ئەو بەش بڕاوی یانە لەو نازو نیعمەتە نەبڕاوەیە، بەڵکو خراپتر ئەوەیە کە لە ژیاندا کارێکی وایان کرد کە سەری لە سزاو ئازاری سەخت و نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی یەوە دەرچوو، وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ﴾ لە کاتێکدا ئەوانە بارە قورس و گرانەکانی خۆیان هەڵئەگرن بەسەر پشتیانەوە، واتە گوناهو تاوانە گەورەکانیان کە مایەی سزاو ئازاری نەبڕاوەی دۆزەخی یانە، ئیتر ئایا مەبەست بەم بارو هەڵگرتنە وێنە و چیرۆك بێ، وەك زۆر لە زانایان ئەفەرمون، یان مەبەست بارو هەڵگرتنی ڕاستەقینە بێت وەك هەندێ لەسەر ئەوەن کە ئەو تاوان و خراپانە ئەکرێن بە لەش و قەبارەیەکی ڕەش و ناشیرین و بۆگەن و ئەبن بە بارێکی گران بەسەر پشتی خاوەنەکانیانەوە و ئەوانیش هەڵیان ئەگرن و ناڵە و نرکەیانە بە ژێریانەوە، هەروەها هەر شتێکیان دزی بێیان داگیر کردبێ، هەر ماڵ و زەکاتێکیان بەسەرەوە بووبێ و نەیان دابێ، ئەوانەش ئەهێنرێنەوە و ئەکرێن بە بار و ئەبێ هەڵیگرن، ڕابەرو بەڵگە لەسەر ئەم ڕایە چەند حەدیسێکە کە لە چەند ڕیوایەتدا هاتوون لەلایەن زانایانەوە، هەرکام لەم دوو ڕایە ڕێکە و ئەگونجێ، لەسەر هەر بار ئەم ئایەتە دیمەن و شێوەیەکی ناشیرین و سامناك ئەخاتە بەرچاو، دیمەن و شێوەی وڵاخ و چوار پێکە لە ژێر باری قورس و گراندا بن،

لە کاتێکدا کە حاڵ و باری وڵاخ و چوار پێیەکە چاکترە، چونکە ئەوان بارە قورسەکەیان لێئەخرێ و لائەبرێ و پشوو ئەدەن و ماندوویی یان نامێنێ، بەڵام ئەمان بارە گرانەکەیان هەر ئەمێنێ و هەر بەوەوە ئەچنە ناو دۆزەخ و ئەسوڕێنەوە تیایدا هەتا هەتایە!! پەنا ئەگرین بەخوا لەو بارو حاڵە بەدە، کەواتە چەند رێك و بەجێیە کە بە دوای ئەوەدا ئەفەرموێ: ﴿أَلَا سَآءَ مَا یَزِرُونَ﴾ بێدار ببنەوە ئای چەند بەدو خراپە ئەو بارە گرانەی کە ئەوانە هەڵی ئەگرن.

لەپاش ئەوەی ئەو شێوەی زیان و خەسارەتمەندی یەی خستە بەرچاو لەگەڵ ئەو سەرەنجام و دوا رۆژە بەدو سەختەی کە دووچاری ئەو کەسانە ئەبن کە هەر چاو ئەبڕنە ئەم ژیانی جیهانە و بڕوایان بە رۆژی دوایی نییە، لەپاش ئەوە ئینجا پایە و پلە و بارو نرخی راستەقینەی ئەو دوو ژیان و جیهانە روون ئەکاتەوە، بە تەرازووە راستەکەی خوا کێشانەیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱلۡحَیَوٰةُ ٱلدُّنۡیَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهۡوٌ﴾ ئەم ژیانە نزیکەو ژیانی ئەم جیهانە هیچ نییە بێجگە لە شتێ کە مەبەست و سەرەنجامێکی راست و رەوای نەبێ وەك ماقلەی منداڵان، بێجگە لە شتێ کە مەردوم خەریك ئەکات و لای ئەدا لە هەرشتێ کە گرنگە و مەبەستی راستەقینەیە بۆی، بێگومان ئەم ژیانی جیهانە سەرەتایە و ئەبێ بەهۆی گەیشتن بەنازو نیعمەت و هەموو ئاوات و ئامانجە بەرزەکانی رۆژی دوایی، کەواتە نابێ ئەم ئایەتە تەفسیر بکرێتەوە بە پێی رووکەش و رواڵەتەکەی، لەبەر ئەوە زانایان دووبەرەکین لە تەفسیرەکەیدا،(ئیبن و عەباس) – خوا لێیان رازی بێت – ئەفەرموێ: مەبەست ژیان بێ بڕوا و ناپاکانە کە بۆشە و سەری لە مەبەست و ئامانجێکی راست و رەواوە دەرناچێ و هەموو خۆشی و رابواردنێکی کەم و کورتە، هێندێ تر ئەفەرمون: مەبەست هەر خۆشی و کارو کردەوەیەکە کە تایبەتی بێ بەم جیهانەوە و هەر خۆشی و شادومانی یەکە لەم جیهانەدا دوایی دێت، دەی دیارە شتی وا وەگ گەمە و گاڵتەی منداڵان وایە لەمەدا کە ماوەکەی کورتە و سەری لە هیچەوە دەرئەچێ و مەبەست و ئامانجێکی بەنرخی لێیەیدا ئەبێ، بەڵکو هەرکەسێك کە ژیر بێ ئەبێ لە کاتی خۆشی و رابواردنەکەیشدا هەر غەمبار و دڵ رەنجاو بێ، چونکە ئەبێ بزانێ کە ئەو خۆشی یەی نامێنێ و لە دەستی دەرئەچێ. بەهەرحاڵ و لە راستیدا ژیانی ئەم جیهانە ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو جیهانی نەبڕاوەدا، وەك ماقلەی منداڵان و گەمە و گاڵتە وایە،

﴿وَلَلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ﴾ بێگومانماڵی ئەو دنیا و ڕۆژی دوایی چاکە و چاکترە بۆ ئەوانەی کە خۆیان ئەپارێزن لە تاوان و خراپە و لە خوا ئەترسن، چونکە خۆشی و شادی یەکانی پاك و خاوێنە لەهەر زیان و ناخۆشی یەك، نەبڕاوە و دوایی نەهاتوویشە!! کەواتە هەرکەس ژیرو تێگەیشتوو بێت هەر بە دوای ژیان و خۆشی ئەو جیهاندا ئەگەڕێ، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نین و ئەوە نازانن؟ واتە ژیر بن ئەوە بزانن تا بەهۆی ئەوەوە کۆتایی بێنن لەو بێ بڕوایی و سەرکێشی یەی کە وان لەسەری و بگەڕێنەوە بۆلای خوای پەروەردگارتان.

قورئان لێرەو لە چەند شوێنی تردا نرخی راست و ڕەوا دائەنێ بۆ ژیانی ئەم جیهان و ئەو جیهان، هەرکام لە سنوور و رادەو پلەی خۆیدا دائەنێ، بەلاَم نابێ هیچ کەس وابزانێ کە مەبەستی ئیسلام کەنارگیری یە لەم ژیانی جیهانە و واز هێنانە لێی، نەخێر بۆچوونی وا لە ئیسلامەوە نەهاتووەو هەرکەسێك لە موسڵمانان ئەوەی لێ بینرابێ یا بانگی مەردومی کردبێ بۆی بێگومان ئەوە هەڵەیەو لە ئیسلامەوە نەهاتووە، بەڵکو لە شەخسی خۆیەوە ئەو هەڵەیە هاتووە، ئیتر بە بۆچوونی تایبەتی خۆی یان بەهۆی هێندێ لە بۆچوونەکانی بێگانە کە پەیدا بوو لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵماناندا بەهۆی تێکەڵ بوونیان بەو بێگانانەوە وەك مەسیحی یەکان و فارس و ئیغریقی یەکان، ئەوەی کە لە ئیسلامەوە هاتووە ئەمەیە کە ئەم ئادەمییە جێنشینە لەم جیهانەدا، خاوەن و ئاغایە تیایدا، ئەم زەوییە و هەرچی تیایە بۆ ئەم دروست کراوە و نابێ ئەم ببێ بە بەندەی ئەڵقە لە گوێ بۆ ئەم ژیان و جیهانە. بەڵکو بە پێچەوانەوە ژیان و جیهان بکات بە ژێر دەست و بەندەی خۆی لەو سنوورەدا کە خوا ڕەوای داوە، بە جۆرێ بیکات بە توێشووی ڕۆژی دوایی و هۆی گەیشتن بە بەهرە و دەست کەوتە بێ وێنەکانی ڕۆژی دوایی.

قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ

**ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) بە دڵخۆشی دانەوەو دڵنەوایی کردن لەسەر ئەو هەموو لاری و نالەباری و بڕوا نەهێنانە کە ئاراستەی ئەکرا لەلایەن گەل و نەتەوەکەیەوە، سەرنجی رائەکێشێ بۆلای پێغەمبەرەکانی پێش خۆی کە وەك ئەم دووچار بوون بە دەست گەل و ئوممەتەکانیانەوە، خۆیان گرت بە ئارام بوون هەتا خوا زاڵی کردن، بە پێی باو و رەوشتە نەگۆڕاوەکەی خوا ئەفەرموێ: ﴿قَدْ نَعْلَمُ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەزانین ﴿إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ﴾ کار بەم جۆرەیە کە بێگومان تۆ غەمبار ئەکات ئەوەی کە ئەوان ئەیڵێن، ئیتر مەبەست ئەوە بێ کە دەربارەی قورئان ئەیانگوت: قسە و نووسراوی پڕوپووچی کۆنی گەلە پێشووەکانە یان مەبەست ئەوە بێ کە ئەیان گوت پێی درۆزنە یان کاهینە یان جادووبازە، یان مەبەست گشتی بێ لەو هەموو وتەو قسە ناهەق و ناڕاستانە کە وەك وڕێنە کەر ئەهات بە دەمیاندا و هەر جاری شتێکیان ئەگوت دەربارەی خۆی و قورئان و تەنیایی خواو زیندوو بوونەوە و حیساب و پرسیار، هەروەها ئەو وتەو قسانەی کە لەم سورەتەدا باس کران، واتە ئێمە ئەوە ئەزانین، بەڵام تۆ غەمبار مەبە و گوێت نەبێ لەوە ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ﴾ چونکە بێگومان ئەوانە تۆ بە درۆزن دانانێن ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ بەڵکو ئەو ستەمکارانە دان نانێن بە ئایەتەکانی خوادا و بە دەم بێ بڕوایی دەرئەبڕن لێیان هەرچەند لە دڵەوە وا ئەزانن کە راستن. ئەو ستەمکارانە هیچ گومانیان نەبوو لە راستی پێغەمبەر(ﷺ) چونکە هەرگیز هیچ درۆیەکیان لێنەدیبوو لە پێش پێغەمبەرێتیشدا چ جای پاش پێغەمبەرێتی، هەروەها ئەوانە لە دڵەوە هیچ گومانیان نەبوو لەوەدا کە پێغەمبەرەو ئەم قورئانە راستە و لەلایەن خواوە هاتووە و هیچ کەس ناتوانێ وێنەی بڵێ... بەڵام لەگەڵ ئەوەدا دانیان نەئەنا بەوەدا و نەیان ئەویست مل کەچ بکەن بۆ ئەو ئایینە و ئەوەی لە دڵیاندا بوو دەری بڕن، چونکە ئەیانزانی ئەو ئایینە دەستیان ئەبەستێ لەو ستەم و خۆ بە زل زانین و کەشخە و سەرۆکایەتی یە ناڕەوای کە بۆیان دامەزرابوو، مل هوڕی یان پێوە ئەکرد بەسەر**

مەردوماندا، داخ لە دڵ بوون و حەسادەتیان لێئەهات بەو بەشە گەورەی کە خوا دابوی بە پێغەمبەر(ﷺ) وەك لە چەند ریوایەتێکدا ئەوە هاتووە کە ئەو سەرۆکە مل هوڕانە لەناو خۆایندا بە باشی دانیان ناوە بەوەدا، وەك لە چەند شوێنێك لەم تەفسیرەدا هێندێ لەو ریوایەتانەمان هێنا، تەفسیری ئەم ئایەتە بەم جۆرەی کە کردمان رێك و پێکە بە پێی واتا و زمانی عەرەب و هیچ قۆرت و گرێیەکی تێدا نییە و هیچ دژایەتی یەك رووی تێناکات، بەم رەنگە کە گوتراوە، چۆن لەلایەکەوە پێغەمبەر(ﷺ) بە درۆزن دانانێن و لەلایەکی ترەوە بڕوایان نییە بە ئایەتەکانی خوا، ئەم گرێ و پرسیارە روو نادا، چونکە مەبەست لە ﴿يَجۡحَدُونَ﴾ ئەمەیە — وەك گوتمان — لە دڵەوە ئەزانن و بڕوایان هەیە بەڕاستی ئەو ئایەتانە، بەڵام بەدەم ناڵێن و دانی پیا نانێن، کەواتە پێویست ناکات بەو وەڵامانە و بەو پینە و پەڕۆی کە لە کتێبەکانی تەفسیردا باس کراون. لەپاش ئەوەی بەو جۆرە دڵنەوایی پێغەمبەری کرد(ﷺ) دەست نیشانی کرد بۆهۆی راستەقینەی هەڵوێستی ئەو بێ بڕوایانە بەرامبەر پێغەمبەر و بانگەوازەکەی و ئایەتەکانی خوا کە نیشانە و بەڵگەیەکی روونن لەسەر راستی خۆی و ئەو ئایینەی کە هێنای، لەپاش ئەوە ئینجا ئارام و هێزو خۆگری ئەدات بە دڵی بەفەڕی، بەوەی حاڵ و باری و بەسەرهات و دوا رۆژی پێغەمبەرانی رابوردووی ئەخاتە بیر و بەرچاوی، کە چۆن خۆگر بوون و لەسەر کارو کردەوەی خۆیان رۆیشتن هەتا خوا یارمەتیدان و سەری خستن، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ﴾ سوێند بەخوا بڕوا نەهێنراو بە درۆزن دانرا چەند فروستادەو رەوانە کراوێك پێش ﴿فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ﴾ ئینجا ئەوانیش ئارامیان گرت و خۆگر بوون لەسەر ئەو بڕوا پێنەهێنان و بە درۆزن دانانە ﴿وَأُوذُواْ﴾ ئازار دران لە چەند بارو روویەکەوە، خۆیان گرت و بە ئارام بوون ﴿حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَاۚ﴾ هەتا یارمەتیدان و کۆمەکی و سەرخستن و زاڵ کردنی ئێمەیان بۆ هات ﴿وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ﴾ هیچ جۆرە گۆڕەرو تێك دەرێك نییە بۆ وتەو وشەکانی خوا کە یەکێ لەوانە بەڵێنی سەرخستن و زاڵ کردنی پێغەمبەرەکان و لەشکرو سەربازەکانی خوایە بەسەر دوژمنەکانیدا، واتە هەرچۆنێ ئەو پێغەمبەرانەمان سەرخست و زاڵ کرد، هەروەها تۆیش سەرئەخەین و زاڵت ئەکەین، کەواتە دڵ ئارام و دڵنیا بە، ئینجا زیاتر مەبەستەکە روون و دامەزراو ئەکات و دڵنیایی لەسەر ئەکات،

﴿وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِى ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ﴾

---

ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان هاتووە بۆلات هێندیٚ هەواڵی ئەو فروستادە و ڕەوانە کراوانە، کە لەو هەواڵانەدا ئەو سەرخستن و زاڵ کردنە بە ڕوونی باس کراوە، یان بێگومان ئەوەی کە باس کرا لە بارەی بڕوا نەهێنان و ئازار دان و خۆگرتنی فروستادەکان و زاڵ بوونیان لە دوا ڕۆژدا، ئەوەی کە باس کرا بۆت هاتووە لە هەواڵی داستان و بەسەرهاتی ئەو فروستادانەدا کە لەمەوپێش گێڕامانەوە بۆت. بێگومان کۆمەڵی بانگ کەرانی ڕێگەی خوا هەر لە کۆنەوە و لە سەرەتای ئادەمێتی یەوە هاتووە، هەر ڕێگە و ڕێبازێکیان داوەتە بەر کە بۆیان دیاریی کرابوو لەو سنووورە دیاریی کراوە لایان نەدا، بە ڕێك و ڕاستی هەنگاوەکانیان ناوە، بە دامەزراوی و بە بیٚ لادان و دواوبەر، تاوان باران ڕێیان لێگرتوون، گومڕا کەران و گومڕایان بەرگری یان کردوون، ئەو بانگ کەرانە دووچاری هەموو جۆرە ئازارو ئەشکەنجە بوون لەو ڕێگەیەدا، بەڵام لە دوا ڕۆژدا سەرکەوتن و زاڵ بوون هەر بۆ ئایینی خواو بانگ کەرانی ئەو ڕێگە و ئایینە بووە، ئیتر زۆری پیٚ چووبیٚ یان کەم، وەك لە ئایەتە و لە چەند ئایەتێکی تردا خوای میهرەبان پێغەمبەرە ئازیزەکەی(ﷺ) دڵخۆش و دڵئارام ئەکات، بێگومان ئەم بەڵێن و فەرمودەیانە بۆ شوێن کەوتووەکانی پێغەمبەریشە لەپاش خۆی هەتا ڕۆژی دوایی. بەڵام بەدی هاتنی ئەو بەڵێنە ئەبیٚ لەکاتی تایبەتی دیاریی کراوی خۆیدا بیٚ کە خوا خۆی ئەزانیٚ، نە بەوە پێش ئەکەویٚ کە ئەو بانگ کەرانە ئەشکەنجەو ئازاریان سەخت و درێژە دار بێت، یان گومڕا و تاوان باران کەشخە بکەن و ئازار و تانە و تەشەر بدەن لە بڕوادارانی پاك و بیٚ تاوان، هەروەها ئەو بەڵێنی خوا پێش ناکەویٚ بەهۆی ئەوەی بانگ کەر زۆر زۆر سوور و بە سۆز بیٚ لەسەر ڕێنموونی بانگ کراوان، و دڵ شکستە و غەمبار بیٚ لەسەر گومڕایی و سەرکێشی یان، نەخێر هیچ شتیٚ لەوانە ئەو بەڵێنە پێش ناخات، چونکە خوا پەلە ناکات لەبەر پەلە نانەوەی هیچ پەلەکەرێك، هیچ شتێك وتەو

بڕیاری خوا ناگۆڕێ، چونکە هەرچی خوا بڕیاری لەسەر دابێ هەر ئەوە ڕاستەو بێجگە لەوە ناڕاست و بێ جێیە، بێگومان خوا پاك و بێگەردە لەوەی کە کاری ناڕاست و بێ جێبکات.
بێگومان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئێجگار بە سۆزو بە پەرۆش بوو لەسەر بڕوا هێنانی گەلەکەی، زۆر سوورو چاوەڕوان بوو بۆ ئەوەی هەر پەڵپ و بیانوویەك کە بیگرن بۆیان جێ بەجێ بکرێ، بەڵکو بڕو بیانوویان نەمێنێ و بڕوا بێنن، ئەو بێ بڕوایانە چەند پەڵپ و بیانوویەکیان ئەگرت و داوای چەند بەڵگەو موعجیزەیەکی زەمینی یان ئاسمانی یان ئەکرد، ئەو حەزو ئارەزوەیش شتێکی سروشتی یە و بەهێزە لە دڵ و دەروونداً، جا بۆ بەرگری و چارەسەر کردنی ئەوە ئەم فەرموده سەخت و سامناکەی ئاراستە کردو فەرموی: ﴿وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ﴾ ئەگەر قورس و سەخت و گرانە لەسەرت روو وەرگێڕانی ئەوانە و بڕوا نەهێنانیان بە تۆ و بەو قورئانە ﴿فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ﴾ جا ئەگەر ئەتوانی ﴿أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ داوای ڕێگە و کون و کەلەبەرێك بکەیت لە زەویدا تا بچیت بە ناخیدا، ﴿أَوْ سُلَّمًا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ یان پلەکانە و پەیژەیەك لە ئاسماندا تا بچیتە سەر رووی ئاسمانەکان ﴿فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بەڵگەو نیشانەیەکی روونیان بۆ بێنی لەوەی کە ئەوان داوای ئەکەن وەك هەڵقوڵاندنی کانی و چەشمەیەك لە زەویدا، یان بەرز بوونەوەت بۆ ئاسمان و هێنانی نامەیەك لە ئاسمانەوە کە خۆیان بیخوێننەوە، ئەگەر ئەتوانی شتێکی وا بکەیت دەی بیکە، واتە ناتوانی شتی وا بکەیت و ناتوانی ڕێگەی وا بدۆزیتە بەر، مەیل و خواهیشی خوایش داخوازی ئەوە نییە، چونکە خوا ئەزانێ بەجێهێنانی ئەوە نابێ بەهۆی بڕوا هێنانی ئەوانە و ئەوانە بڕوا ناهێنن، باوی خوایش لەسەر ئەوە هاتووە هەرکات بێ بڕوایان پەڵپی شتێکیان گرتبێ و لەپاشدا بڕوایان نەهێنابێ، خوا سزای ناردووەتە سەریان و لەناوی بردوون، خوایش مەیل و ئیرادەی لەسەر ئەوە هات کە ئەوانە لەناو نەبا، وەك لە چەند شوێنێکدا ئەم باسەمان کرد بە درێژتر، کەواتە نابێ ئەو دەسەڵاتە ببێ بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نابێ مەیل و خواهیشی خوا روو بکاتە بەدیهێنانی ئەو جۆرە پەڵپ و بیانووانە،

**ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر بڕوا نەهێنانیان ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾ ئەگەر بیویستایە ئەوانەی کۆ ئەکردەوە لەسەر ڕێنموونی و بڕواهێنان.. بەم ڕەنگە لە ڕێوە سروشتی لەسەر بڕواهێنان دائەمەزران بە وێنەی مەلائیکە، یان بەم ڕەنگە رووی دڵیانی ئەکردە بڕوا هێنان و گوێرایەڵی، یان بەم ڕەنگە موعجیزەیەکی بۆ دەرئەخستن کە ناچاری بکردنایە بۆ بڕوا دەربڕین و مل کەچی، یان بەهەر جۆرێکی تر کە خوا خۆی ئەزانێ و دەسەڵاتی هەیە بەسەریدا، بەڵام خوای کاردروست ئەم ئادەمی یەی بە جۆرێکی تایبەتی دروست کرد بۆ کارو کردەوەیەکی تایبەتی کە داخوازە بۆ ئەوەی کە دەست بدات بۆ ڕێنموونی و گومڕایی، بۆ چاکەو خراپە، بۆ کارو پیشەی جۆر بە جۆر کە بتوانن هەڵسن بە هەموو پێویستی و کاروباری ژیان و جێنشینی یە کە خوا بۆی بڕیار دا، جا لەبەر ئەوە کۆی نەکردنەوە لەسەر ڕێنموونی و بڕوا هێنان، بەم ڕەنگە وەك مەلائیکە، هەر بۆ ئەو بارە دەست بدەن، بەڵام فرمانی پیادان بە بڕوا و ڕێنموونی، مەیل و خواهیش و هێزی هەڵبژاردنی پێدان و لێیان گەڕا کە بارێك هەڵبژێرن تا لە دوا ڕۆژدا بگەن بە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی خۆیان، خوای کاردروست ویستی بەو جۆرە ئادەمی دروست بکات، کەواتە ئەوە بزانە ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ لەوانە مەبە کە نەزانن و لە ریزی ئەو نەزانانەدا مەبە کە بێ ئاگا و نەزانن بە باوی خواو بەو جۆرە شتە وردو نادیارانە، لەم فەرمودەدا دەرکەوت کە خەڵکی دووبەش و دوو جۆرن:**

**١- بەش و جۆرێك کە دەست ئەدات بۆ بڕوا هێنان و گوێرایەڵی کە خوا مەیلی ئەوەی لێکردووە، لەبەر ئەوەی کە زانیویەتی کە ئەوە هەڵئەبژێرێ.**

٢- بەش و جۆرێك كە دەست نادات بۆ ئەو بارە و بەڵكو دەست ئەدات بۆ پێچەوانەی ئەوەو خوا ئیرادەی ئەم بارەی كردووە بۆی، چونكە بە ئارەزووی خۆی ئەوە هەڵئەبژێری.

ئینجا ئەوا دەست نیشان ئەكات بۆ نیشانەی هەردوو بەشەكە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ﴾ ئایەت بەدەم بانگ كردنەكەی تۆ و ئامادە نی یە بۆ گوێرایەڵی بێجگە لەوەی كە ئەیبیستن، واتە ئەوانەی كە تۆ بانگیان ئەكەیت بۆ بڕوا هێنان دووبەشن، بەشێك كە ئەبیستن بە بیستنی تێگەیشتن و وەگرتن، بەشێك كە ئەو بیستنەیان نییە، هەر بەشی یەكەم بڕوا ئەهێنێ و گوێرایەڵی ئەكات، نەك بەشی دووەم كە ئەو بیستنەی نییە، بەڵكو تێگەیشتنی نییە یان هەیەتی و سەركێشی بەكار ئەهێنێ، ئەم دوو جۆرە وەك نەبیستە وان و هیچ چارەسەریان نییە و وەك مردوو وان، ﴿وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ﴾ مردووەكان خوا زیندوویان ئەكاتەوە، واتە ئەو بێ بڕوا دڵ مردووانە، یان مردووەكان بە شێوەی گشتی ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ ئینجا ئەگێڕرێنەوە بۆلای خوا بۆ ئەوەی بگەن بە تۆڵە و سزای خۆیان یان بگەن بەوەی كە شایستەن بۆی. ئینجا ئەگوێزرێنەوە بۆ باسی هێندێ لە موعجیزە كە ئەو بت پەرستانە داوایان ئەكردو پەلپ و بیانوویان پێئەگرت، ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ نەفامی ئەو داوا كەرانە و بێئاگایی یان لەو باو و رەوشتی خوا، هەروەها دەست نیشان ئەكات بۆ میهرەبانی خوا كە ئەو پەلپ و بیانووی ئەوانە بەجێناهێنێ، چونكە ئەزانێ كە ئەوانە بڕوا ناهێنن پاش بەجێهێنانی پەلپەكەشیان، دەی ئەو كاتە ئەبێ لە ریشەیان بێنێ و لەناویان بەرێت، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا﴾ ئەوانە گوتیان و ئەڵێن: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ كاشكێ و با بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) موعجیزەیەك لەلایەن پەروەردگاری یەوە، واتە موعجیزەو بەڵگەیەكی ئاشكرا لەوان كە ئەوان داوایان ئەكردو پەلپ و بیانوویان پێ ئەگرت، بە وێنەی ئەو موعجیزەو بەڵگەیانەی كە گەلە پێشووەكان داوایان ئەكرد لە پێغەمبەرەكانیان - سەلامی خویان لێبێت -،

﴿قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ﴾

---

**ئینجا بۆ دەم کوت کردنی ئەوانە ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُلۡ﴾ بڵێ پێیان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً﴾ بێگومان خوا توانایە بەسەر ئەوەدا کە بەڵگەو نیشانەو موعجیزەیەك بهێنێتە خوارەوە، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەو ئایەت و موعجیزانەیە کە ناچار کەرن بە وێنەی بەرز کردنەوەی ئەو شاخەی کە خوا بەرزی کردەوە بەسەر ئیسرائیلی یەکاندا تا بە ناچاری ملیان کەچ کرد بۆ وەرگرتنی تەورات و فەرمانبەری یان بۆی، بە هەر جۆر مەبەست بێ خوا خۆی باش ئەزانێ و هەرگیز کاری بێ جێناکات، ناردنی شتی وایش ناڕاست و بێ جێیە لەسەر هەرکام لەم دوو بارە، لەسەر باری یەکەم ناردنی نەئەبوو بەهۆی ڕێنموونی و باوەڕ هێنانیان و ئەبو بەهۆی لەناوچونیان و لە ریشە هاتنی ئەو گەل و ئوممەتە بە وێنەی ئەو ئوممەتانەی رابردوو، لەسەر باری دووەم مەسەلەی تەکلیف و تاقی کردنەوە بە هیچ دەرئەچوو، چونکە بناغە و بنەڕەتی تەکلیف و تاقی کردنەوە لەسەر توانین و دەسەڵات و هەڵبژاردنەکەی ئەمێنێ، کارەکە بەو جۆرەیە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام ئەوانە یا زۆربەی ئەوانە نازانن و بێ ئاگان لەوەی کە گوتمان، هەرکامیان بزانن سەرکێشی بەکار ئەهێنن و دان نانێن بەو شتە راستانەدا، ئینجا قورئان دەستکاری یەکی دڵ ئەکات و سەرنجی رائەکێشێ بۆلای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە لەسەر دەسەڵات و توانینی بێ سنووری خوا کە وان بە پێش چاوەوە و هۆیەکی بەهێزن بۆ بڕوا هێنان و ڕێنموونی بۆ هەر کەسێك کە بیر بکاتەوەو تێگەیشتوو بێت، ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ هیچ گەڕۆکێکی گیانلەبەر نییە لەزەویدا ﴿وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ﴾ هیچ پەڕەندەیەك نییە کە ئەفڕێ بە هەردوو باڵەکەی**

﴿إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ﴾ مەگەر ئەوانە چەند گەل و ئوممەتێكن وێنەی ئێوە، واتە هەرچی گیانلەبەر لەم جیهانەدایە بە هەموو جۆرەكانی یانەوە، هەر جۆرێ لەوانە گەل و تاقمێكی تایبەتی جیاوازن لە هەموو جۆرو تاقمەكانی تر لە دروشم و شێوەدا، لە سیفەت و كار و كردەوە و سروشت و رێگەی ژیان و هۆی ژیاندا، هەركام لەوانە تایبەتی و جیاوازن، بە وێنەی ئادەمی كە گیانلەبەرێكی تایبەتی جیاوازە، هەركام لەوانە بەوێنەی ئادەمی كاروبار و بەسەرهات و مردن و ژیانی زانراوە و دیاریی كراوە و چاودێریی و بەرژەوەندی كراوە، بە رژێمێكی تێرو تەواو و بە پێی باوێكی نەگۆڕاوە، هەموو ئەوانە هۆنراونەتەوە لە رەوشت و بڕیارو تەگبیرەكانی خوادا، وەك وەرئەگیرێ لەمەوە كە ئەفەرموێ: ﴿مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ﴾ قسورمان نەكردووە و وازمان نەهێناوە لە هیچ شتێ و فەرامۆشمان نەكردووە لە زانینی خۆماندا، كە هەموو شتی گرتووەتەوە و بێ سنوورو دوایی نەهاتووە، یان مەبەست بە ﴿ٱلۡكِتَٰبِ﴾ دروست كراوێكە لە دروست كراوەكانی خوا كە هەموو شتی تیا نووسراوە و لە زمانی شەرعدا ناوبراوە بە ﴿لوح المحفوظ﴾، بە هەرحاڵ و لەسەر هەر بار خوا وازی نەهێناوە لە هیچ شتێك بە بێ تەگبیری تێرو تەواو، زانینی خوا دەوری هەموو شتیداوە و هەموو شتی گرتووەتەوە ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ﴾ ئینجاهەموو ئەوانە كۆ ئەكرێنەوە لە رۆژی دواییدا بۆلای پەروەردگاریان، هەموو كۆو زیندوو ئەكرێنەوە بۆ لای پەروەردگار تا هەموو هەق و ناهەقێ دەركەوێ و هەموو تۆڵە و پاداشتێ بەدی بهێنرێ، تەنانەت وەك لە حەدیسدا هاتووە هەقی بزن و مەڕی كۆڵ بسەنرێ لە شاخدار.

ئەم ئایەتە كورتە دڵی بێدار و وریا ئەهێنێتە لەرزەو دای ئەچڵەكێنێ بەوەی سەرنجی رائەكێشێ بۆ ئاگاداری و چاودێری خوا بۆ هەموو شتێ، تەگبیری زۆر و فراوانی و دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێكدا، بەو هەموو رژێمە تێرو تەواوەی كە فەراهەمی هێناوە بۆ ژیان و پەیدا بوون و مانەوەی ئەو دروست كراوانە، ئینجا ئەو خاوەن دڵە بێدار و وریانە تێئەگەن و هەست ئەكەن بەو هەموو بەڵگەو نیشانە روون و ئاشكرایانە كە پەروەردگار دایناون و فەراهەمی هێناون لەم دروست كراوانەدا، تێ ئەگەن كە ئەم بەڵگە و نیشانە

روونانە هیچ کەمتر نین – ئەگەر گەورەتر نەبن – لەو بەڵگە و موعجیزانەی کە داوایان ئەکەن لە پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها وەك(ئیبن و جەریر) ئەفەرموێ: تەمێ و ئامۆژگاری و ترساندنێکی بەهێزی تیایە بەمەی کە ئەو پەروەردگار هەرچۆنێ دەسەڵاتی هەیە بەسەر داهێنانی ئەم دروست کراوانەدا، هەروەها دەسەڵاتدارە بەسەر دووبارە کردنەوەدا، هەرچۆنێ ئاگادارە و لەم جیهانەدا هیچ شتێکی لێ ون نابێ، هەروەها لە ڕۆژی دواییشدا ئاگادارە بەسەر هەموو کردەوەکانی ئەم جیهانەی بەندەکانی، کەواتە با هەموو کەس بترسێ و خۆی بپارێزێ لە هەر کردەوەیەك کە مایەی سزاو تۆڵەی ئەو ڕۆژە بێت – خوا پەنامان بدات لە داماوی ئەو ڕۆژە سەخت و سامناکە –. لەبارەی هۆی وێنەیەتی ئەو گیانلەبەرانە بۆ ئادەمی چەند شتێکی تریش گوتراوە بێجگە لەوەی کە گوتمان، بەڵام بەڕاستی ئەمەی کە گوتمان لە دڵدا بەهێزو دامەزراو ترە و بە بێ ئەرك و گیرو گرفت ئەچێتە دڵەوە، زانایانی تەفسیر فەرمویانە، وتەی(بجناحیە) بۆ گەیاندنی گشتی یەتی(طائر) ە بەم ڕەنگە مەبەست جنس و تیرەی فڕندەیە، یان بۆ گەیاندنی ئەوەیە کە مەبەست باڵندەی ڕاستەقینەیە، بەڵام دڵ بۆ ئەوە ئەڕوا کە ئەو وتەیە پێویستە تا فڕۆکە دەست کردەکانی ئەمڕۆ بەرنەکەون و بەو وتەیە، وتەی(طائر) ئەمانیش نەگرێتەوە، واتە ئەگەر وتەی(بجناحیە) نەبوایە وتەی(طائر) ئەمانیشی ئەگرتەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەمانە گیانلەبەر نین، کەواتە ئوممەت نین، بەڵام بەهۆی ئەم وتەیەوە ئەمانە بەرناکەون، چونکە ئەمانە بەهۆی بەنزین و سوتەمەنی یەوە ئەفڕن، نەك بەهۆی باڵیانەوە، کەواتە ئەگەر ئەم وتەیە نەبوایە گرێ و ئیشکال ڕووی ئەکردە ڕووکەش و ڕواڵەتی ئایەتەکە، ئەمە شتێك بوو چەند ساڵێکە لە دڵمدایە و لام وایە جوان و ڕێکە، ئینجا ئەو گەڕان و گەردشەی کە کردی بە دڵ و دەروون دوایی ئەهێنێ بە باسی ئەوەی کە ڕێنموونی و گومڕایی بە پێی خواهیش و باوی خوایە، بەڵگەو نیشانەی هەرکام لەم دووانە هەیە لە سروشتی خەڵکیدا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نییە بە نیشانە و بەڵگە ئاشکراکانی ئێمە و بە درۆیان دائەنێن ئیتر چ بەڵگەو نیشانە بوونەوەری یەکان کە بەچاو ئەبینرێن و هەموو دڵێکی بینا هەستیان پێئەکات، چ بەڵگەو نیشانە ئاشکراکانی ئەم قورئانە، ئەو بڕوا نەبوونەیان لەبەر ئەوەیە کە کەڕەسە و کۆئەندامی بڕواهێنانیان کارناکەن و پەکیان کەوتووە،

وەك ئەفەرموێ: ﴿صُمٌّ﴾ کەڕن و نابیستن بە بیستنی وەرگرتن و تێگەیشتن ﴿وَبُكۡمٌ﴾ لاڵن لە ئاستی هەق و ڕاستی و دانی پیا نانێن ﴿فِي ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ لە ناو تاریکی یەکاندان، تاریکی هاوبەش ڕەوادان و بت پەرستی، تاریکی شوێن کەوتنی کوێرانە، تاریکی نەفامی و خۆ بە زل زانین و تاریکی خودپەسەندی و ڕەگەزپەرستی و تاریکی نەخوێندەواریی و نەزانی، کەواتە ڕووناکی حەق و ڕێنموونی نابینن، بەهۆی ئەوەوە ناکەونە سەر ڕێی ڕاست ئەوانە هەرچەند بە دیمەن و ڕواڵەت بیناو گۆیا و بیسەرن، بەڵام بە خواهیش و مەیل و هەڵبژاردنی خۆیان ڕووناکەنە هەق و ڕاستی و لە ڕێی ڕاست لائەدەن، گوێ ناگرن بۆ بانگ و بانگەوازی بانگ کەران بۆ ڕێی خوا و بۆلای خوا، دان نانێن بەوەی کە ڕاستە و بەپێی باوی خوا هەموو کردەوەو ڕەوشتێ بەرهەم و سەرەنجامی خۆی هەیە و بەرەو ئەوە ئەڕوا، مەیل و بڕیارو خواهیشی خوایش بە پێ و گوێرەی ئەوە تێپەڕی کردووەو هاتووە، کەواتە بەندە نە بێچارەو ناچارکراوە، نە خود سەرو سەربەخۆی تەواویشە کە بتوانێ هەر بە مەیلی کردەوەکانی بەدی بێنێ، بەڵکو مەیل و خواهیشی خوایش ئیش کەرو کاربەدەستە وەك لە چەند ئایەتێکدا ئەوەمان بۆ باس ئەکات بە ڕوونی، یەکێ لەوانە ئەمەیە کە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ﴾ هەرکەس خوا مەیل بکات و بیەوێ گومڕای ئەکات ﴿وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ مەیلی هەرکەسیش بکات و بیەوێ ئەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەو ڕێگە ڕاستەی خۆی کە هەرکەسێکی پیا بڕوا هەرگیز ون نابێ، هەرکەسیش لێی لابدا گومڕا و سەرلێ شێواوە، کاربەدەست و بەدی هێنەر تەنها خوایە، لە هەمان کاتدا بەندە خاوەنی هەڵبژاردن و پەلاماردانەولەسەرئەوەوبەپێی ئەوە تۆڵە و پاداشت ڕووی تێئەکات.

ئینجا با هەندێ بوەستین و بیر بکەینەوە بۆ ئەوەی تەمێ و پەندێك وەرگرین لەم ئایەتانی ڕابردووە، پەندو تەمێ وەرگرین بۆ ئەوانەی کە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ ئەم ئایینە پیرۆزە لە هەموو چەرخ و چینێکدا، بێگومان ڕێگەی بانگ کردن بۆلای خوا زۆر سەخت و پڕ لە زەحمەتە، کۆسپ و گرێی زۆری تێدایە، ئەرك و گرێ و زەحمەتی ئەم ڕێگەیە دوو هۆی سەرەکی هەیە:

١- بڕوا نەهێنان و سەرکێشی و بەربەرەکانی و جەنگ و ئاژاوەی بانگ کراوەکان و وەستانیان لە ڕێگەکەدا بە هەر جۆر و شێوەیەك کە لە دەست بێت.

٢- زیادە حرص و سووری بانگ کەر و ئەو ئارەزووە بەتین و سروشتی یەیە کە دڵ و دەروون داگیر ئەکات و ئەو غەم و پەژارەی کە ڕووی تێئەکات بەهۆی بڕوا نەهێنان و سەرکێشی بانگ کراوەکانی یەوە.

ئەم پەندو تەمێیە کە لەم ئایەتانە وەرئەگیرێ چارەسەرە بۆ ئەو دوو شتە: کاتێ کە قورئان فەرموی: هەر سروشتێ زیندوو بیسەر بێت گوێرایەڵی ئەکات و دێت بەدەم بانگ کردنەکەوە، ئەوانەی کە هەر سەرپێچی ئەکەن و سەرکێشی بەکار ئەهێنن و دان نانێن بە هەق و ڕاستیدا، ئەوانە دڵ مردوون و لاڵ و کەڕن لەناو تاریکی یەکاندا ئەژین و ئەمێننەوە، دەی کاری ئەوانە تەنها بەدەست خوایە و نابێ هیچ کەس بە تەمای بڕواهێنانی ئەو جۆرە کەسانە بێت، بانگ کەرانی ڕێگەی خوا ئەبێ نائومێد بن لێی، ئەوە لە بارێکەوە، لە بارێکی ترەوە یارمەتی دان و سەرخستنی ئایینی خوا بێگومان بەدی دێت، بەڵام کات و شوێن و هۆی تایبەتی خۆی هەیە، بە پێی باوی خوا بەو جۆرە نەبێ بەدی نایەت، وەك هەموو کاروبارەکانی تر، کەواتە ئەبێ بانگ کەری ئەو ڕێگەیە چاوەڕوان بێت و بوەستێ بەدەم کاری خواوە، خوا پەلە ناکات لەبەر ئەوەی کە ئازار و سزاو بڕوانەهێنان دووچاری ئەو بەندە خواناسانە ئەبێ - تەنانەت با ئەو بەندەیەش پێغەمبەر بێت(ﷺ) - ئەو دواخستنی سەرکەوتن و یارمەتی دانە چەند شتی گرنگی تیا بەدی دێت و دەرئەکەوێ کە پێویستە بانگ کەرانی ڕێی خوا خاوەنی ئەو شتانە بن: مل کەچی و تەسلیم بوونیان بۆ فەرمان و بڕیاری خوا بە بێ پەلە کردن و پەلە نانەوە، خۆگری و ئارامیان لەسەر ناخۆشی و ئازار لە ڕێی خوادا، بڕوا دامەزراوی لەسەر دوا ڕۆژو پاشە ڕۆژ بە بێگومان و دوو دڵی، ئەمانە شتێکی پێویستن و لەو دواکەوتنەدا دەرئەکەون.

لەم پەندو تەمێ ی ئێرەوە دەرئەکەوێ - وەك لە چەند ئایەتێکی تریشدا بە ڕوونی وەرئەگیرێ - کە کارو پیشەی پێغەمبەر(ﷺ) لەم ئایینەدا، هەروەها هەموو بانگ کەرانی پاش ئەو لە هەموو کات و چەرخ و چینێکدا هەر ڕاگەیاندنە و ئارام و خۆگری یە لەسەر هەموو کۆسپ و گرێ و ناخۆشی یەکی ئەو ڕێگەیەی کە بۆی دیاریی کراوە، ئیتر ڕێنموونی و گومڕایی خەڵکی ئەوە لە سنووری توانا و کارو فرمانی ئەو بەدەرە و هەر بە دەست خوایە و بە پێی باوێکە کە خوا دایناوە و گۆڕانی بۆ نییە، مەیل و پێخۆش بوونی ئەو لە ڕێنموونی

بانگ کراواندا، غەم و پەژارە و تەنگەتاوی بەهۆی لاری و سەرکێشی دوژمناندا هیچ گۆڕانێك ناهێنێ بەسەر ئەو باو و بڕیارەی کە خوا داینـاوە، حیساب و پرسیاری هەر لەسەر فەرمانبەری و خۆگری و دامەزراوی یەتی لەسەر ئەو کارو فرمانەی کە پێی سپێرراوە، جا لەبەر ئەوە ئەو کەسانەی کە بانگ ئەکەن بۆلای ئەم ئایینە نابێ گوێ یان ببێ لە پەلپ و بیانووی بانگ کراوەکان، نابێ هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی ئەم ئایینە بڕازێننەوە بۆیان بە گوێرەی ئارەزوو و خواست و خواهیشی ئەوان، بۆ وێنە: زۆرکەس لە بانگ کەران ئەیانەوێ ئیسلام شیرین بکەن لەبەر چاوی خەڵکی بەمەی ناوی ئەبەن بە(ئیشتراکی یان دیموکراتی)، بێگومان ئەوە هەڵەیەو سەری لە خراپی یەوە دەرئەچێ، هەرچۆنێ ئیسلام خۆی نادات بۆ گۆڕان هەتا هەتایە، هەروەها نابێ ناوەکەشی بگۆڕرێ و ناوی تری لێبنرێ، ئیسلام هەر ئیسلامە و بەس، ئیشتراکی یەت و دیموکراتی یەت بیرو باوەڕو مەزهەبێکی زەمینی و لەم زەوی یەوە هەڵقوڵاون و نابێ بکرێن بە ناونیشان بۆ ئیسلام کە هەر لە ئاسمانەوە هاتووە و هینی خوایە و بەندە هیچ دەخلێکی نییە پێ یەوە.

ئینجا لەم چەند ئایەتانەی داهاتووەدا بەرەنگاری سروشتی بت پەرستەکان ئەوەستێ بە سزاو دەسەڵاتی خوا، بە سروشتی خۆیان لەکاتی دووچار بوونیان بە سزای خوا، کە لەو کاتەدا ئەگەڕێنەوە بۆ لای خواو هیچ پشت و پەناو هێزو پەرستراوێکیان بەلاوە نامێنێ. ئینجا پەلیان ئەگرێ و ئەیان وەستێنێ و چین و گەلە پێشووەکانیان ئەخاتە بەرچاو کە خوا لەناوی بردن و لە ریشەی هێنان کاتێ کە یاخی بوون لە پێغەمبەرەکانیان، چۆن تاقی کردنەوە بە خۆشی و بە ناخۆشی و هەل و هەڵکەوتی بۆ فەراهەم هێنان تا بڕوا بێنن و کەچی ئەو هەلانەیان لە دەست خۆیان دەرکرد، ئینجا بە پێی باوو رەوشتی خوا خەشم و سزای خوا داباری بەسەریاندا و لەناوی بردن، ئینجا لە دواییدا باسی کارو پیشەی پێغەمبەرانیان بۆ ئەکات کە مزگێنی و ترساندنە، ئیتر بێجگە لەوە هیچ شتێکی تریان بەدەست نییە بە ئیزن و مەیلی خوا نەبێ، ناتوانن لەلایەن خۆیانەوە هیچ موعجیزەیەك بێنن بۆ خەڵکی، ناتوانن هەر پەلپێکیان لێ بگیرێ بە جێی بێنن، ئەوان هەر راگەیاندن و موژدەو ترساندنیان لەسەرە، لە ئایەتەکانی رابوردوودا بەرهەم و نیشانەو تەگبیر و زانینی خوای خستە بەرچاویان، ئینجا لێرەدا دەسەڵات و سزای خوایان ئەخاتە بەرچاو کە لەکاتی هاتنیدا ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا و پەنا هەر بە ئەو ئەهێنن،

﴿قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێ بڕوایانە کە هاوبەش ڕەوا ئەدەن بۆ من ﴿أَرَءَيۡتَكُمۡ﴾ هەواڵم پێ بدەن، یان ئایا ئەزانن، یان ئەبینن چۆنە حاڵ و باری خۆتان لەگەڵ ئەو بتانەی کە ئەیان پەرستن ﴿إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ﴾ ئەگەر سزای خواتان بۆ بێ لەم جیهانەدا بە وێنەی هاتنی سزا بۆ گەلەکانی ڕابوردوو، ﴿أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ﴾ یان ڕۆژی دواییتان بۆ بێ ﴿أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ﴾ ئایا نزاو هاوار ئەکەنە غەیری خوا بۆ ڕزگار بوونتان ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن و ڕاست گۆن. واتە دەی هەواڵم بدەنێ ئایا هاوار و نزا ئەکەنە غەیری خوا؟ یان ئەگەر ڕاست ئەکەن لەوەی کە لاف ئەوە لێئەدەن کە ئەو بتانە دێن بە هاوارتانەوە و تکاتان بۆ ئەکەن. ئینجا خۆی وەڵامە ڕاست و ڕەوانەکە ئەداتەوە کە ڕێکە لەگەڵ ژیریی و سروشتدا، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ﴾ واتە نەخێر لەو کاتەدا نزاو هاوار ناکەنە غەیری خوا، بەڵکو هاوار و نزا هەر لە خوا ئەکەن، ﴿فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ﴾ ئینجا ئەویش لا ئەبا و ناهێڵێ ئەوەی کە نزای ئەکەنێ بۆ لابردنی، واتە ئەگەر ویستی و مەیلی بوو، چونکە لابردن و لانەبردنی هەر بەدەست ئەوە، نەك هیچ کەسێکی تر ﴿وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ﴾ واتە هەر هاوار بۆلای خوا ئەکەن و واز ئەهێنن لەوەی کە هاوبەشی پێ ئەکەن و ئەیکەن بە هاوبەشی خوا، یان ئەوانەتان لەبیر ئەچێ و لە سام و بیمدا هۆشتان نامێنێ بەلایانەوە. لەکاتی تەنگاوەو ناڕەحەتیدا مەردوم بە سروشت ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو هیچ کەس و هیچ شتێکی تری لە بیر نامێنێ، بڕوا بە خوای پەروەردگار شتێکی هەست پێکراوی دامەزراوە لە ناخی دڵ و دەرووندا، جا لەبەر ئەوە لەو کاتانەدا ئەو پەردە و چڵك و چەپەڵی یە نامێنێ، شتە ڕاست و ڕەوانەکە دێتە کایە و دەرئەکەوێ، لەبەر ئەوە بێ پەروا لەو کاتانەدا هاوار و نزای لێهەڵئەستێ و هەر هەست بە خوا ئەکات، بەڕاستی هەرکەس بێبەش نەبێ لە هەموو

فام و ژیریی و تێکەیشتنێك و وەك دارو بەرد نەبێ هەرگیز ئەوەی بەسەر نایەت و ناگاتە ئەو رادەیەی کە بڕوای نەبێ بە بوونی خواو هەرکەسێك بەدەم لاف بێ بڕوایی لێبدات هەر بەدەمی رووت ئەو قسەیە ئەکات، لە دەروونی خۆیدا ئەزانێ کە درۆ ئەکات لەو لانەدا، چونکە مەسەلەکە زۆر روون و رەوانە و بە سووك و ئاسان وەرئەگیرێ، ئەو کەسە با بیر بکاتەوە لە خۆی و لە بوونی خۆی، ئایا خۆی خۆی دروست کرد؟ ئایا بە رێکەوت پەیدا بوو؟ بەڕاستی هیچ کەس لە رووی نایەت هیچ کام لەو دوو تیرو بارە بڵێ، کەواتە ناچارە ئەبێ باری سێ یەم بڵێ کە ئەمەیە: یەکێکی دەسەڵاتداری زانای کاردروست دروستی کردووە.

ئەگەر سەرنجێکی مێژووی ئەوروپا بدرێ، دەرئەکەوێ کە ئەو شەپۆل و لافاوی بێ بڕوایی یە چۆن هات و هۆکەی چی بوو؟ شتێکی ئاشکرای بەناوبانگە کە ئایینی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) تێکدرا و پڕ کرا لە شتی پڕوپووچ کە دژی سروشت و ژیرین، لەبەر ئەوە ژیر و زانایان ناچاربوون کە بڕوایان نەبێ بەو شتە پڕو پووچانە و بە دژیان بدوێن، پیاوەکانی کەنیسەش، لەبەر پاراستنی زۆر و دەسەڵاتێ کە بەناوی ئایینەوە دەست کەوتیان بوو بوو فتوایان دەرکرد بە کوشتن و سوتاندنی ئەو ژیرو زانایانە، ئاژاوەو بەر بەرەکانێ لەناو گەل دا پەیدا بوو لە نێوان پیاوانی ئایینی و ئەو رۆشنبیرانەدا، لەپاش درێژە کێشانی ئەو جەنگ و ئاژاوە بەرە بەرە رۆشنبیران زۆریان سەندو شۆڕشیان کرد بەسەر کەنیسە خوازاندا، بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەو شتە پڕو پووچانە دووبارە نەبنەوە لەناو گەلدا جاڕی بێ بڕوایی و بێ ئایینییاندا، هەرچی نیشانەی ئایین بوو لەناویان بردن، ئەوە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە جوولەکە ئەوەی بە هەل زانی کەوتە ئەوپەڕی پڕوپاگەندە و پیلان بە دژی ئایین و بڵاو کردنەوەی بێ بڕوایی و بێ ئایینی، ئەوە لەبەر بەدی هێنانی ئاوات و ئامانجی بۆگەنی خۆیان لە دووبارەوە: یەکەم: نەهێشتنی کەنیسە و ئایینی مەسیحی کە لکێکی گەورە بوو لە دڵیاندا. دووەم: ئەیان ویست کە ئایین نەمێنێ و بەس هەر ئایینەکەی جوولەکە بمێنێ تا هەموو کەس ببێ بە کەری ژێر باری ئەوان وەك لە(تلمود) و(بروتۆکولات حکماء صهیون) دا بە روونی گوتراوە و بڕیاری لەسەر دراوە لەلایەنیانەوە!! بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو تێکۆشانەی جوولەکە بەکاریان هێنا، ئینجا بە تایبەتی شیوعی یەت لە جیهاندا - کە رێکخراوێکە لە

ڕێکخراوەکانی جوولەکە – لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەدا کە بەکارهێنرا بۆ بڵاو کردنەوەی بێ باوەڕی بەو هەموو تێکۆشانە کە کرا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، کەچی گەلی ڕووسییان بۆ نەگێڕرا بە بێباوەڕ، بەڵکو تا بێت باوەڕ بە خوا پەرە ئەسێنێت، کاربەدەستان داماون و نازانن چی بکەن و ناچار بوون کە خۆیان ڕێك بخەن لەگەڵ بڕواداراندا، جاڕی ئەوەیاندا کە ئەوان دژی ئایین نین و ڕێگە ناگرن لێیان! تەنها ئەو یەك کەوتنە هەڵگەڕانەوەیە لە شیوعییەت. جوولەکە ویستی بە کۆمەکی سەلیبی یەکان ئەو بێ بڕوایی یە بڵاو بکەنەوە لە وڵاتی ئیسلامدا بەهۆی(اتاتورك) ەوە، بەڵام لەو ڕێگەیشەوە باشتر نائومێد بوون، ئەوەتا لەم دوایی یەدا کاربەدەستەکانی تورکیا ناچاربوون بە گەڕانەوە بۆ ناو کۆڕو کۆمەڵی دەوڵەتە ئیسلامی یەکان و ناوی موسڵمانێتی بنێن لە خۆیان، مەبەست لەم قسەو باسە ئەوەیە کە باوەڕ بەخوا و بە ئایین شتێکی سروشتی چارنەکراوە، سروشت خوای خۆی ئەناسێ زۆر بەچاکی، بڕوای هەیە بە تاك و تەنیایی پەروەردگاری، ئینجا هەر فێڵ و تەڵەکەیەك بەکاربهێنرێ بۆ لادانی لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆی هیچ نرخێکی نییە و کارناکات، بە مەرجێ بێدار کردنەوە و بانگ کردنێك ببێ کە خەوتوو و بێ ئاگا داچڵەکێنێ.

ئینجا چەند نموونەیەك لە سزای خوا ئەخاتە بەرچاو و دەست نیشانیان بۆ ئەکات کە گەل پێشووەکانی پێ دووچار بووە بەهۆی لادانیان لە ڕێگەی خوا، لەپاش ئەوەی کە خوا هەل و فرسەتی بۆ هەڵخستن و هیچ بیانوویان نەما، چونکە تاقی کرانەوە بە سەختی و بە ناخۆشی، کەواتە پێویست بوو لەناو بردنیان و پاك کردنەوەی وڵات لێیان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبۡلِكَ﴾ سوێند بەخوا فروستادەمان ناردو ڕەوانەمان کرد بۆلای چەند گەل و ئوممەتێك لە پێش تۆوە ﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ﴾ واتە ئەو گەل و ئوممەتانە بڕوایان نەهێنا، ئینجا ئێمەیش تۆڵەمان لێ سەندن بە نەبوونی و هەژاری و قات و قڕی و ترس و ناڕەحەتی و نەخۆشی و کەم بەرووبوومی: واتە ئەو جۆرە شتانەماندا بەسەریاندا بۆ تەمێ و تاقی کردنەوە، بەڵکو سەری بەندەیی داخەن و بگەڕێنەوە بۆلامان و بڕوا بێنن و نزاو پاڕانەوە بکەن لێمان بۆ ڕزگارکردن و نەهێشتنی ئەوانەی کە دووچارمان کردن پێیان،

فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾

---

﴿فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ﴾ **ئینجا ئەوانەی سەری بەندەیی یان شۆڕ نەکرد لەو کاتەدا کە سزاو ناڕەحەتی ئێمەیان بۆ هات و دڵیان نەرم نەبوو** ﴿وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ **بەڵکو دڵیان ڕەق بوو، واتە لەسەر باری خۆیان مانەوە یان ڕەق تر بوو** ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ **ئەو گوناهو تاوانەی کە کردیان شەیتان جوان و ڕازاوەی کرد بۆیان و شیرینی کرد لەبەرچاویان بە فریو دان و هەڵخەڵەتاندن. ئەم تەفسیرە لەسەر ئەوەیە کە وتەی(لولا) بە مانا(ما) بێت و زۆربە لەسەر ئەوەن کە ئەو وتەیە بۆ سەرزەنشت و پەشیمان کردنەوە بێت لەسەر ئەم رایە ئەڵێن: دەی کاشکێ ئەوانە لەو کاتەدا پەشیمان بوونایەتەوەو بگەڕانایەتەوەو پاڕە و لاڵەیان بکردایە لای ئێمە بۆ لابردنی ئەو سزاو ناڕەحەتی یانە کەچی وایان نەکردو بەڵکو... هەر دڵێك کە سزاو ناڕەحەتی و تەنگەتاو کردن ئەی گێڕێتەوە بۆلای خوا، دڵێکی ڕەق و وشکە وەك بەرد، دڵێکی مردووە و هەست و هۆشی نامێنێ، کەواتە بێدار نابێتەوە بەو سزاو ناڕەحەتی یانە، بە پێچەوانە ئەو دڵانەی کە گیانیان تیایە و وشك نەبوونەتەوە. ئەو گەل و ئوممەتانەی کە خوا باسیان ئەکات وداستان و بەسەرهاتیان ئەگێڕێتەوە، لەپاش ئەوان وێنەیان لەم دواترین ئوممەتەدا. بەو سزاو ناڕەحەتی یانە تەمێ خوار نابن و ناگەڕێنەوە، ئینجا خوا مۆڵەتیان ئەدات و چاکە و نیعمەت ئەڕێژێ بەسەریاندا، تا لە ناکاوێکدا ئەدات لە دەماخیان و لە ڕیشەیان ئەهێنێ بە هەموو داخ و حەسرەتێکەوە وەکو ئەفەرموێ:** ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ **ئینجا کاتێ ئەو گەل و ئوممەتانە ڕوویان وەرگێڕا و تەمێ خوار نەبوون بەوانەی کە خوا دووچاری کردن و تەمێ کردن پێیان، یان کاتێ کە ئەوانە گوێڕایەڵ نەبوون و گوێیان نەدا بەوەی کە تەمێ و ئامۆژگاری کران پێی لەلایەن پێغەمبەرەکانیانەوە، کاتێ بەو جۆرە بوون** ﴿فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ﴾ **قاپی دەروازەکانی هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە، هەموو خێرو خۆشی و فەڕو بەرەکەت و نازو نیعمەت،**

واته بە زۆری و بە لێشاو لە هەموو بارێکەوە هۆی خۆشی و کامەرانیمان رشت بەسەریاندا ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ﴾ هەتا کاتێ کە کەیف خۆش و شادومان بوون بەوەی کە پێیان دراو بەخشرا، لەو کاتی خۆشییەدا ﴿أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةً﴾ لەناکاوێکدا بە کوت و پری تۆڵەمان لێ سەندن و گرتنمان و سزامان باراند بەسەریاندا، کە ئەوە لە هەموو شت ناخۆشترە، ﴿فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ﴾ ئینجا ئەوانە لە شوێنی خۆیاندا، یان لەو کاتەدا نائومێد و سەرگەردان بوون بە بێ چاوەڕوانی چارەسەر، هەموو لەناوبران و لە ریشە هێنران بەو هەموو داخ و مەراقەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کرد– واتە هاوبەشیان بۆ خوا رەوادا – دوا بڕاو کران و دواترین کەسیان لەناوبرا ﴿وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ هەموو سوپاس و سەناو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان، لەسەر ئەو چاکەو بەهرە گەورەیە کە کردی لەگەڵ بەندە و دروست کراوەکانی، بە پاك کردنەوەی زەوی و وڵات لەو ستەمکار و تاوانبارانە، بەڕاستی چاکە و بەهرەیەکی زۆر گەورەیە، پاك کردنەوەی وڵات لەو بێ بڕوایی یە کە لە هەموو شت پیس و چەپەڵ ترە، لەو هەموو کردار و رەفتارو وتارە ناپەسەندو بۆگەنانە کە تەنها ئەوانە مایەی پەستی و سەرگەردانی و سەر لێ شێوانە، هۆی بەدبەختی و سیاچارەیی یە لە هەردوو جیهاندا، لە لوتف و میهرەبانی خوا بەزیاد بێ.

خوای میهرەبان گەلی نوح و ساڵح و لوتی لەناوبرد و وڵاتی پاك و خاوێن کردەوە لێیان، هەروەها فیرعەون یەکانی و ئیغریقی یەکان و رۆمانی یەکان و ستەمکارەکانی تر، هەموو ئەوانەی لەناوبرد بە پێی باوی پڕ لە دادی خۆی کە لەم ئایەتانی ئێرەو لە چەند ئایەتێکی تر وەرئەگیرێ. هەرچەند لە پاش رەوانەکردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەو جۆرە سزاو لەناوبردن و لە ریشە هێنانە نەماو خوا هەڵیگرت، بەڵام لەچەند بارو روویەکی ترەوە خوا سزاو ئازار ئەدات و ئەیرژێنێ بەسەر ئەوانەی کە خوا قاپی خێرو بەرەکەتێکیان لێئەکاتەوەو کەچی لەباتی مل کەچی و سوپاس بۆ خوا یاخی و سەرکێش تر ئەبن و خراپەکاری بڵاو ئەکەنەوە و ئەبن بە سەرچاوە و کانگای هەموو تاوان و دەست درێژی یەك، ئازارو سزایان ئەدا بە سزای دەروونی و گیانی، بە بەدخویی و بێ ناموسی و بەد کرداریی، بە جەنگ و کوشتار و بێ ئارامی وەك بە چاو ئەیبینین و ئەیبیسین ئەمڕۆ لە هەموو ناوچەکانی جیهاندا ئەو هەموو نازو نیعمەت و خێرو بێری فراوان و ئەو هەموو هۆی ئارام و حەوانەوە کە ئەمڕۆ

هەیە سوودی لیٚ وەرناگیریٚ و ژیان بەو تەنگ و تاریکی یە بەسەر ئەبریٚ، خۆشی و ئارامی نەماوەو هەموو هۆی رووناکی لەبەر چاو رەش و تاریك بووە! هێشتا ئەوە لە کوێیەتی و تا بێت بەرەو رەش و تاریکی تر مەردوم ئەڕوات، بەس تەنها ئومێدێك هەیە لەم رۆژەدا ئەوەش ئەمەیە کە خەڵکی لە هەموو لایەکەوە خەریکە ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، تەنانەت لە ناوچە و وڵاتەکانی تردا، کە کان و جێگەی بیٚ بڕوایی بوون تەنها ئەو ئومێدە هەیە کە لە هەموو لایەکەوە دەنگ بەرز ئەکرێتەوە بە داوا کردنی ئیسلام و جیهاد و تێکۆشان لە ڕێی ئیسلامدا، کە بە پێی باوی خوا لەو کاتەدا خوا یارمەتی بەندەکانی ئەدات و بەتاڵ و ناهەقی ژێر ئەخات، داواکارین خوا قاپی میهرەبانی خۆی بکاتەوە لێمان.

لەم ئایەتانی رابردووەو چەند ئایەتێکی تری و وێنەی ئەم ئایەتانە دەرئەکەویٚ کە باوی خوا وا هاتووە کە بەخۆشی و ناخۆشی و سزاو ئازار و کامەرانی بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە، هەرکەس ژیرو زانا بێت بەو جۆرە بەسەرهاتانە تەمیٚ و پەند وەرئەگریٚ و ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو مل کەچی و گوێرایەڵی ئەبێت، هەرکەسیش نەفام و نەزان و عاقیبەت شەڕ بێت بەو بەسەرهاتانە خراپتر ئەبێت. بەم رەنگە ئازارو ناخۆشی بیٚ شەرم و بیٚ بڕوا تر ئەبیٚ و بە خۆشی و نازو نیعمەت یاخی و بەرەڵا تر ئەبیٚ، خۆشی و نازو نیعمەتەکە ئەبیٚ بە مایەی سزاو خەشمی خوا، لە زمانی شەرع دا پێی ئەوتریٚ(استدراج) وەك لە چەند ئایەتێکەوە وەرئەگیریٚ، دەقی ئەم حەدیسە ئەیگێڕێتەوە کە(ئیبن و جەریر و ئیبن و ئەبی حاتەم) ریوایەتی ئەکەن: ﴿إذا رأيت الله يعلي العبد من الدنيا على معاصيه ما يحب فإنما هو استدراج﴾ کاتێك بینیت خوا بەشی بەندەیەکی دا بە پێی ئارەزووی خۆی لە جیهاندا لەگەڵ ئەوەدا گوناهبار و تاوانکار بێت، ئەوە(استدراج) ە بۆ ئەو بەندەیە، واتە خوا نیازی خێری پێی نییە، بەڵکو نیازی شەڕی پیٚ هەیە، ئینجا خوا بت پەرستەکان ئەترسێنیٚ و ئەیان وەستێنیٚ بەرامبەر دەسەڵاتی خوا بەسەریاندا، دەستە پاچەیی و داماویی خۆیان و بیٚ نرخی بتەکانیان لەوەی بتوانن بێن بە هاواریانەوە، کەواتە با بیر بکەنەوە و بگەڕێنەوە بۆلای خواو تەنها خوا بپەرستن،

قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغۡتَةً أَوۡ جَهۡرَةً هَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۖ

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو هاوبەش ڕەوادەرانە ﴿أَرَءَيۡتُمۡ﴾ هەواڵم بدەنێ و پێم بڵێن ﴿إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ﴾ واتە ئەگەر خوا کەڕو کوێرتان بکات و هێزی بیستن و بینینەکانتان ببات و نەیان هێڵێ ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾ مۆرو پەردە بهێنێ بەسەر دڵەکانتاندا کە ئەو کاتە هەست و هۆش و ژیریتان نامێنێ، ئەگەر خوا بەو جۆرەتان بەسەر بێنێ پێمبڵێن: ﴿مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِۗ﴾ ئایا کێیە خوایەکی تر بێجگە لە خوا کە ئەوەی لابراوەو نەهێڵراوە بۆتان بهێنێتەوە؟ بێگومان هەر سروشتێ تێك نەچووبێ و هەر ژیریی یە لەکار نەکەوتبێ ئەزانێ کە ئەو شتانە خوا داویەتی و بەخشیونی بەم بەندەیانە، ئەزانێ کە ئەگەر خوا بیانباتەوە هیچ کەسێکی تر نییە کە بیانداتەوە بە تایبەتی ئەو بتە بێ نرخانە کە دارو بەردێك بوون کە ئەوانە ئەیان پەرستن، کەواتە زۆر جێگەی سەر سوڕمانە داوا و هاوارکردن لەو بتانە: هەروەها زۆر جێی سەرسوڕمانە کە ئەوانە چۆن ڕوو وەرئەگێڕن و لائەدەن لەو ڕێگە ڕاستەی کە ڕێنموونی ئەکرێن بۆی، وەك سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەوەو ئەفەرموێ: ﴿ٱنظُرۡ﴾ سەرنج بدە و تەماشا بکە ﴿كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ کە چۆن ئێمە ڕابەرو نیشانە و بەڵگە ڕوونەکان جۆر بە جۆر و چەند بارە ئەکەینەوە لەسەر چەند بارو شێوەیەکی جیاواز کە هەق وایە بەهۆی ئەوەوە ڕێی ڕاست بدەنە بەر و لاڕێ نەگرن ﴿ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ﴾ کەچی ئەوانە لائەدەن و پشتی تێ ئەکەن و ڕوو وەرئەگێڕن!**

**ئەو وتەی ﴿يَصۡدِفُونَ﴾ە زۆر کاریگەر بووە لە دەروونی ئەوانەدا کە شارەزا بوون لە زمانی عەرەبیدا، چونکە ئەو وتەیە لە بنەڕەت دا بریتی یە لە لادانی حوشترێکی کوێرو دەردەدار لە ڕێگە و لەبەر دەردەداری یەکەی ڕێگە نەداتە بەر، کەواتە بەوە لاقرتی پێ کردن و بێ نرخانە**

ئاراستە ئەکات. لەم ئایەتەدا وتەی(کم) نییە و لە ئایەتی پێشوو و داهاتوودا هەیە، زانایان چەند شتێکیان فەرمودە سەبارەت بەم لابردنی ئێرە بە جوانی ئەزانم باس کردنی:

١- ترساندنی ئێرە سووك ترە لە ترساندنی ئایەتی رابوردوو و داهاتوو.

٢- ترساندنی ئێرە بە سزایەکە، بە بوونی ئەو سزایە و لەگەڵ ئەو سزایەدا سزا دراوەکان لە رادەو پلەی ئادەمێتی دەرئەچن و بەشیاوی ئەوە نامێنن رووی قسەیان تێبکرێ، چونکە هەرکەس بینین و بیستن و ژیریی نەمێنێ هەرگیز رووی قسەی تێناکرێ و وەك دارو بەردی لێدێ، جا لەبەر دەست نیشان بەوە ئەو وتەیە لێرە نەهاتووە.

٣- بوونی ئەووتەیەلەپێش و پاشەوە بەسەو پێویست نامێنێ بەهێنانی لەم ناوەڕاستەدا.

ئینجا پێش ئەوەی هۆشێك بکەنەوە لەو ترس و بیمەی کە ئاراستەی کردن لەم ئایەتی رابوردووەدا، پێش هۆش کردنەوە و هەر بە دوای ئەوەدا ئەیان ترسێنێ بە سزایەکی تر کە هیچ دوور نییە دووچار بوونی، ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو هاوبەش رەوادەرانە: ﴿أَرَءَيْتَكُمْ﴾ هەواڵم بدەنێ و پێم بڵێن: ﴿إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً﴾ ئەگەر سزای خواتان بۆ بێت، واتە لە وێنەی ئەو سزایانە بێتە سەرتان لە ناکاو و کت و پڕی و لە کاتی بێئاگاییدا، یان بێت بە جۆرێ نیشانە و سەرەتای ئاشکرا بێت، ﴿هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئایا لەناو ئەبرێ بەو سزایە بێجگە لە گەل و کۆمەڵی ستەمکاران؟ واتە هەر ئێوە تیا ئەچن کە ستەمکارن و هاوبەش رەوا دەرو سەرکێشن، چونکە باوی خوا وا هاتووە لەو جۆرە سزایانەدا پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان رزگار بوون و هەر ئەو تاوانبارانە تیا چوون، وەك هێندێ لەوانە ناسراو و بەناوبانگ بوون لای ئەو یەکەم چینە کە ئەم قورئانەیان هاتە سەر، وەك گەلی نوح و هود و ساڵح و لوط. ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە باسی کارو پیشەی پێغەمبەران، کە گەل و ئوممەتەکانیان داوای موعجیزەو پەڵپی هێندێ شتیان لێئەگرتن، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ فروستادە و نێرراوەکانمان نەناردووە و نایان نێرین ﴿إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ مەگەر بە جۆرێ کە هەر موژدە دەرو ترسێنەر بن، واتە هەر موژدە دان و ترساندنەکەیان بە دەست بووە نەك بەدی هێنانی ئەوەی کە هەواڵیان پێئەدات،

فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ الْعَذَابُ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ الْغَيْبَ

---

**﴿فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئینجا هەرکەسێك بڕوای هێنا بێ بەوەی کە پێویستە بڕوا پێی، کردەوەی چاك بکات بەم ڕەنگە فەرمانی شەریعەتی خوا بێ، ئەو کەسانەی کە بەو جۆرە بن هیچ مەترسی یەکیان لەسەر نابێ لەو سزایەی کە پێغەمبەران ئوممەتەکانی خۆیانیان پێ ئەترساند، غەمبار نابن بەوەی ئەو مزگێنی یەی کە پێیان دراوە لە کیسیان بچێ و دەست کەوتیان نەبێ ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە ئایەتەکانی ئێمە کە فروستادە و نێرراوەکانمان پێ یان ڕاگەیاندن ﴿يَمَسُّهُمُ الْعَذَابُ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ ئەو سزایەی کە ترسێنراون پێی لێیان ئەکەوێ بەهۆی دەرچوونیان لە گوێڕایەڵی خوا بە هەمیشەیی و نەگەڕانەوەیان بۆلای خوا، واتە ئەو فروستادە و نێرراوانە هەر بۆ ئەو ڕاگەیاندنە هاتوون ئیتر لە بارەی بەدی هاتنی ئەو هەواڵانەی کە ڕایانگەیاندووە هیچیان بەدەست نەبووە، کەواتە هەر داواو پەلپێ کە ئەو بێ بڕوایانە گرتوویانە ناڕەوا و بێجێ بووە. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ ناڕاستی و پڕوپووچی هێندێ بۆچوونی نەفام و نەزانان لەو بارەیەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێ بڕواو هاوبەش ڕەوا دەرانە کە هەردەمە داوای شتی نەگونجاوت لێئەکەن، هەرجارەی پەڵپ و بیانووی شتێ ئەگرن لێت کە لە توانای تۆدا نییە، بڵێ پێیان: ﴿لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللَّهِ﴾ من ناڵێم پێتان لای منە خەزنە و خەزێنەکانی خواو ئەو شتانەی کە خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەریاندا و بڕیاری لەسەر داون، لاف ئەوە لێ نادەم کە خوا ئەوانەی خستبێتە ژێر دەستم و چی مەیل بکەم بتوانم بیکەم، ئەوانەم بەدەست نییە تا بتوانم ڕۆزی و سامانتان زۆر و فراوان بکەم و دەوڵەمەند و بێ پێویستتان بکەم، ﴿وَلَآ أَعْلَمُ الْغَيْبَ﴾ من غەیب و شتی نادیاری و نهێنی نازانم کە زانینی تایبەتی یە بە خواوەو ڕێی زانین و هۆی زانینی نەدراوە بە بەندەو بە دەست بەندە نییە، من لاف ئەو جۆرە شتانە نادەم تا ئێوە ئەو پەڵپەم لێبگرن، وەك ئەڵێن: کە ڕۆژی دوایی دێت و لە داهاتوودا چی ڕوو ئەدات و کەی سزای خوامان دێتە سەر،**

وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾

---

**﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ﴾ من ناڵێم پێتان كه من فریشتەم تا ئێوه ڕەخنەم لێبگرن به خواردن و گەڕان به بازاڕو ڕێگه و باندا، یان ڕەخنەم لێبگرن بەمەی كه مرۆڤ و ئادەمیم ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ﴾ من هەر شوێنی ئەوه ئەكەوم كه سروش كراوه بۆ لام و پەیڕەوی هیچ شتێك ناكەم بێجگه لەوه، من هیچ شتێك ناكەم لەبارەی فروستادەیی یەكەمەوه بێجگه لەوەی كه فەرمانم پێدراوه و پێم سپێرراوه.**

**پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بەو جۆرو شێوەیه فەرمانی پێدرا كه حاڵ و باری خۆی و فروستادەیی یەكەی دەربخات و بەو جۆره خۆی بناسێنێ كه بەندەو مرۆڤێكی ئاسایی یه و رووت لەو هەموو بۆچوونه ناڕەوا و ئەو هەموو شته پڕو پووچەی كه بڕیار درا بۆ فروستاده و پێغەمبەرەكان له سەردەم و چەرخه نەفامی یەكاندا، به تایبەتی چەرخ و سەردەمی نەفامی نامەدارەكان له پاش لادانیان له نامه ڕاستەكەی خوا، وەك به ڕوونی ئەو هەموو شته پڕو پووچانه باس كراون و هەن له كتێبه دەست هەڵبەستەكانیاندا. هێندێ لەو بۆچوونه ناڕاستانه كه له سەردەمه نەفامی یەكاندا پەیدا بوو ئەمه بوو كه فروستاده نابێ ئادەمی بێت، بەڵكو ئەبێ فریشته بێ، هێندێكی تر ئەمەبوو كه فروستاده ئەبێ زانا بێ بەسەر غەیب و نهێنی یەكاندا، ئەبێ توانا و دەسەڵاتدار بێ بەسەر هەر شتێ كه مەیلی ببێ و داوای لێبكرێ، جا ئەوا قورئان لێرەدا دەست نیشانی كرد بۆ ئەم بۆچوونه ناڕاسته و فەرمانیدا كه پێغەمبەر(ﷺ) ئەم بارو شێوه ڕاستەقینه ڕاگەیەنێ و ئاراستەی هەمووانی بكات، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ بڵێ پێیان: ﴿هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ﴾ ئایا یەكسانه و چوون یەكه كوێرو بینا؟ واته گومڕا و ڕێنموونی وەرگر، لادەر له ئایین و سروش كراوی خوا و شوێن كەوتوو و پەیڕەوی كەری ئایین و سروش كراوی خوا، ئەو كەسەی كه نەزانه و ئەم شته ڕاسته نازانێ و ئەو كەسەی كه زانایه و ئەم شته ڕاستانه ئەزانێ، لەسەر هەر بار نەخێر ئەو دوو تاقمه یەكسان نین و چوون یەك نین ﴿أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا نابیستن، كەواته بیر ناكەنەوه لەم شته ڕاسته؟ یان دەی ئایا ئەبیستن و ئینجا بیر ناكەنەوه. بێگومان – وەك ئەم ئایەته دەست**

نیشانی بۆ ئەکات و چەند ئایەتێکی تر – هەرکەس هەر ئایین و سروشتی خوا بە هەق و راست نەزانێ، ئەو کەسە نەزان و نەفام و گومڕایە، هەرکەس هەر شوێنی ئایین و بەرنامەی خوا نەکەوێ، ئەو کەسە لە رێی راست لای داوەو ترازاوە، لەو بارەکەیشەوە هەرکەس هەر ئایین و سروشتی خوا بە هەق و بە راست بزانێ ئەو کەسە فامدارو زانایە، هەرکەس هەر پەیڕەوی ئایین و بەرنامەی خوا بکات ئەو کەسە لەسەر رێی راستە ئەو شتە راستانەی کە گوتمان هەرچۆنێ قورئان پێمان رائەگەیەنێ، کەوا بڕوا هێنان بەخوا داخوازە هەرچۆنێ مەسەلەکە بەو جۆرەیە، هەروەها شتێکی ئاشکرایشە و بە ئەندازەیە بەراورد کردن دەرئەکەوێ بۆ هەر کەسێك کە ژیرو تێگەیشتوو بێت، کەواتە کارو پیشەی ژیریی ئەبێ هەر ئەوە بێ کە ئایین و سروشەکەی خوا وەرگرێ و تێی بگات و شوێنی کەوێ و بە پێی رێنموونی ئەو هەموو هەنگاوێ بنێ و هەرگیز بەسەر خۆ هەنگاو نەنێ، هەرکەس بڵێ: ژیریی و سروش هەر لە خواوە دێن، کەواتە هەر دوو لە یەك رادەو پلەدان، یان بڵێ ژیریی بەسە بۆ خەڵکی و بێ پێویستی ئەکات لە سروش و ئایین هەرکەس هەرکام لەم جۆرە قسانە بکات، ئەو کەسە پێچەوانەی ئایین و فەرمودەی خوا قسە ئەکات، هەرچۆنێ واقیع و ئەوەی کە هەیە ئەیخاتەوە بە درۆوە، چونکە ئەوەتا بەچاو ئەبینرێ کە هەر ژیانێ کە دامەزرا بێ لەسەر رژێمە دەست کردەکان و مەزهەبە زەمینی یەکان، هەرکام لەو ژیانانە تاڵ و سەخت و بەدەو خۆی بە خۆی دیارە و پێویست بە قسەو باس نییە و لێکۆڵینەوەی ناوێ. خوای پەروەردگار فەرمانیدا کە پێغەمبەر(ﷺ) ئایین و عەقیدەکەی راگەیەنێ بە تەنیا و بە رووتی لە هەرشتێ کە سەرنج راکێش و خەڵەتێنەر بێ بۆ مەردوم لەم جیهانەدا، واتە بە بێ ئەمەی بیرازێنێتەوە بە شت و مەك و دەست کەوتی ئەم جیهانە، هەرچەند راگەیاندن و بانگ کردنەکەی بۆ هەمووانە، بەڵام هەموو کەس بەهرەمەند نەبوو – نایش بێ – بەوەی کە بانگی کردن بۆی، بەڵکو هەر ئەوانە بەهرەمەند بوون و ئەبن کە دڵ مردوو نەبوون و چاوەڕوانی خێرو چاکەیان لێ ئەکرێ و شیاوی ئەو بەهرەیەن، کەواتە لە راستیدا بانگ کردن و راگەیاندنەکە هەر بۆ ئەوانەیە، جا لەبەر ئەوە لێرەو لە چەند شوێنێکی تردا فەرمان ئەدات بە راگەیاندن بە شێوەی تایبەتی هەر بەو بەهرەمەندانەوە، وای نیشان ئەدات کە راگەیاندن و بانگ کردنەکە تایبەتی یە هەر بەوانەوە، چونکە هەر ئەوانە سوود وەرئەگرن لەو ترساندنە و گوێی بۆ ئەگرن،

وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرۡ بِهِ﴾ بترسێنە بەوەی کە سروش کراوە بۆلات، بەو قورئانە ﴿ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ﴾ ئەوانەی کە ئەترسن لەوەی کە کۆ بکرێنەوە بۆلای پەروەردگاریان لە رۆژی دواییدا، لە کاتێکدا ﴿لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ﴾ کە نیە بۆ ئەوانە لە خوا بگەڕێتەوە و بێجگە لە خوا هیچ دۆست و یارمەتی دەرو هیچ تکا کەرێك، واتە مەترسی ئەکەن کە کۆ بکرێنەوە بۆلای پەروەردگاریان لە کاتێکدا یارمەتی دراو و تکا بۆ کراو نەبن، ئەوانە بترسێنە ﴿لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکو بترسن و خۆیان بپارێزن لە هەر شتێ کە هۆی خەشم و سزای خوا بێ، ﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ﴾ دەرنەکەیت و دوور نەخەیتەوە لە خۆت و لە کۆڕت ئەوانەی کە پەروەردگاری خۆیان ئەپەرستن لە بەیانی و لە ئێوارەدا ﴿يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوانە لە پەرستنەکەیاندا خوایان ئەوێ و نیازی زاتی پاکی خوا ئەکەن، ﴿مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ﴾ هیچ شتێ لە حیسابی ئەوان لەسەر تۆ نییە و هیچ شتێ لە حیسابی تۆ لەسەر ئەوان نییە، واتە کاری ئەوان لە تۆ داوا ناکرێ و کاری تۆیش لەوان داوا ناکرێ، حیسابی بڕواو کردەوە نهێنی یەکانی ئەوان عائیدی تۆ نییە، بەڵکو تۆ ئەبێ بە پێی دیمەن و شێوە ئاشکراکەی ئەوان رەفتار بکەیت کە بە دیمەن ئەوانە بڕوادار و کردەوە چاکن، هەروەها حیسابی هەژاری و بێ نەوایی ئەوان لای خوایە و دەخلی ئەوانی پێوە نییە، ئەو جۆرە شتانە پەیوەندی یان نییە بە مەسەلەی بڕواو رادەو پلەی بەرز بە لای خواوە، واتە هیچ کام لەوانە نییە ﴿فَتَطۡرُدَهُمۡ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە تۆ ئەوانە دەرکەیت، بنەڕەتی مەسەلەکە ئەمەیە تاقمێك لە گەورەکانی قورەیش کە موسڵمان نەئەبوون بیانوویان ئەمەبوو کە پێغەمبەر(ﷺ) لات و هەژارەکان ئەگرێتە خۆی، وەك بیلال و**

صهیب و عەممار و خەباب و ئەوانی تر. ئەوانە بۆنی چڵك و ئارەقیان لێدێ و رادەو پلەی کۆمەڵایەتی یان پەستە و شایان ئەوە نین کە ئەوان لەگەڵیان دانیشن و ببین بە هاو کۆڕ و کۆمەڵیان! لەبەر ئەوە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوانە دەرکات و دووریان بخاتەوە لە خۆی، ئینجا ئەویش ئەوەی بە گوێ نەکردن، ئینجا داوایان کرد کە کۆڕ و مەجلیسێکی تایبەتی یان بۆ دیاریی بکات کە ئەوانەی تیا نەبێ، بۆ ئەوەی جیاواز بن و پایە و پلەی بەرزیان هەر پارێزراو بێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە دڵی کە ئەوە بکات بەڵکو بەهۆی ئەوەوە و لەو رێگەیەوە موسڵمانیان بکات، ئینجا بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هات و بەرگری کرد لەوەی کە نیازی کرد، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەو کەسە سەرۆکانە تانەو تەشەریان داوە لەو موسڵمانانە بەوەی کە راست ناکەن لە بڕوا هێنانەکەیاندا، بەڵکو مەبەستیان لە بڕوا هێنانە ئەوەیە کە رۆزی و خۆراکیان دەست کەوێ لای پێغەمبەر(ﷺ). جا لەسەر هەر بار، ئەو دوو رستەیە بە تێهەڵکێش هات بۆ بەهێزکردنی بەرگری و جڵەوگیریی یەکە، بۆ ئەوەی نەك ئەوەی کە ئەو سەرۆکانە ئەیڵێن ببێ بەهۆی دەرکردن و دوور خستنەوەی ئەو موسڵمانە هەژارانە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ واتە ئەوانە دەرنەکەیت، تا بەهۆی ئەو دەرکردنە ببی بە یەکێ لە ستەمکاران و بچیتە ریزی ستەمکارانەوە. سوپاس بۆ خوا پێغەمبەری ئازیزی پاراست لەوەی کە کاری وا ناڕەوا بکات، بەهۆی ئەوەوە ئەو بێ نەواو باخەڵ خاڵی یە دڵ پڕ لە بڕوایانە مانەوە لە کۆڕ و مەجلیسی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانە کە لەبەرچاوی نەفام لاواز و بێ نرخ بوون، بەڵام دڵ پڕ لە هێزو نرخدار بوون لای خوا، ئەوانە مانەوە لەو رادەو پلە بەرزەی کە بڕواو راستی یەکەیان گەیاندبوونی پێی و شایانی ئەوەی کردبوون. ئینجا دیارە ئەو خۆ بەزل زان و لووت بەرزانەش ئەبێ هەر ئەو قسانە بکەن کە قورئان بۆمان باس ئەکات، ئەبێ بڵێین: ئایا چۆن خوا خێرو خۆشی ئەدا بەو لات و بێ نەوایانە؟ ئەڵێن: بێگومان ئەگەر ئەم ئایینە چاك بوایە خوا ئێمەی ئەخستە سەر، هەرگیز ناگونجێ خوا شتی چاك بدا بەو لات و لووتانە و ئێمە بێ بەش بکات لێی،

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾

وەك دەست نیشان ئەكات لێرەدا كە ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ هەر بەو جۆرە و مانەندی ئەو تاقی كردنەوە گەورە و نایابە هێندێ لە بەندەیان تاقی ئەكەینەوە بە هێندێ تریان، واتە ئەو سەرۆك و دەوڵەمەندانەمان تاقی كردەوە بەو هەژار و ژێر دەستەیانە، بەم رەنگە پێشمان خستن بەمەی چەسپانی یان كرد لە بڕوا هێناندا. ﴿لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ﴾ تا ئەو سەرۆكانە بڵێن: ئایا ئەوانە خوا منەتی ناوە بەسەریاندا لەناو ئێمەو لە نێوان ئێمەدا، ئاییینی باشی بۆ ئەوان هەڵبژاردووە لە كاتێكدا كە ئێمە سەرۆك و سەركەوتووین بەسەر ئەواندا؟ واتە نەخێر شتی وا نییەو ئەگەر ئەو ئایینە باش بوایە لەوەیشدا پێش ئەكەوتین لەوان. بە دوو جۆری تریش تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام ئەوەی كە هەڵمان بژارد بەهێزترو دامەزراو ترە لە دڵدا، لەسەر هەربارو هەرجۆر مەبەست بێت ئەوا خوا دەم كوتیان ئەكات و بەرپەرچیان ئەداتەوە بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ﴾ ئایا خوا زاناتر نییە لە هەموو كەس و ئەوپەڕی زانینی نییە بەو كەسانەی كە چاو لەبەر و سوپاس كەرانن بۆ خوای خۆیان؟ واتە خوا بەندەكانی خۆش باش ئەناسێ و ئەزانێ ئەو بێ نەواو هەژارانە چاكن و شایستەی ئەوەن كە بیانخەنە سەر ئەو ئایینە چاكە، سەرۆك و خۆ بە زل زانەكان بەهۆی خراپی خۆیان خوا ئەو چاكە گەورەی لەگەڵ نەكردن، لەم بەرپەرچ دانەوەدا چەند شتێك نیشان ئەدا:

١- رێنموونی و خستنە سەر رێگەی ئیسلام چاكە و پاداشتێكە خوا ئەیدا بە كەسانێ كە خوا خۆی ئەزانێ ئەوانە چاولەبەر و سوپاس كەر ئەبن بۆ ئەو بەهرەو چاكەیە.

٢- ئەو چاكە و بەهرەیە پەیوەندی نییە بە بوونی ئەو شتانەی كە رێزو نرخ دارن لەم جیهان وزەوییەدا، بەپێی ئەوانەنییە، بەڵكوبە پێی چاولەبەری و سوپاسی بەندەیە.

٣- رەخنە گرتن لە هەر كارو كردەوەی خوا لە نەفامی و نەزانی یەوە دێت و پەیدا ئەبێت، ئینجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر گەورەترە لە هەمووان فەرمانی پێئەدا كە ئەم لە یەكەم جارەوە سڵاو بكات لەوانەی كە پێش كەوتن و چەسپانی یان كرد بۆ ئیسلام، ئەوانەی كە ئەو سەرۆك و خۆ بە زل زانانە بەچاوی سووك سەرنجیان ئەدەن و لاقرتی یان پێ ئەكردن،

وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾

---

**مزگێنی یان پێبدات به بەزەیی و میهرەبانی خوا بۆیان ئەفەرموێ:** ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ **کاتێ کە دێن بۆلات ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە ئایەتەکانی ئێمە:** ﴿فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ﴾ **بڵێ پێیان سڵاوتان لەسەر بێ** ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ **پەروەردگارتان نووسیویەتی و بڕیاری داوە لەسەر خۆی بەزەیی و میهرەبانی خۆی دەربارەتان، بەم رەنگە** ﴿أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ﴾ **هەرکەسێك لە ئێوە هەر کردەوەیەکی خراپ بکات بە نەفامی، واتە هەرکەس خراپە بکات نەفامە و ژیر نییە، چونکە هەر بڕوادارێك هەر کردەوەیەکی بێ شەرعی بکات ئەبێ بزانێ کە ئەو کردەوە سەرەنجامی خراپە و سەری لە زیانەوە دەرئەچێ، دەی تا نەفام نەبێ هەرگیز شتی وا ناکات و خۆی ناخاتە ئەو مەترسییە، یان مەبەست بە(جهالة) نەزانی یە، واتە هەرکام لە ئێوە هەر خراپەیە بکات لەکاتێکدا کە ئەو خراپەکارە نەزانە، نەزانە بە ئەندازەو حەقیقەتی ئەو زیانەی کە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەکەیەتی، لەسەر هەر بار ئەوە نیشان ئەدات کە بڕوادار شایستە نییە بۆ کردنی هەر خراپەو بێ شەرعی یەك، لەگەڵ ئەوەدا ئەفەرموێ:** ﴿ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ **ئینجا گەڕابێتەوە بۆ لای خوا لەپاش کردەوە خراپەکەی** ﴿وَأَصْلَحَ﴾ **خراپەکەی چاك کردبێتەوە و بەسەری گرتبێتەوە، بەم رەنگە کردەوەیەکی کردبێ کە دژو پێچەوانەی خراپەکەی بێ، هەرکەس لە ئێوە بەو جۆرە بێ کە باس کرا** ﴿فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ **کاری ئەو کەسە ئەوەیە کە خوا لێبوردەی میهرەبانە پێی و ئەو خراپەیە ئەسڕێتەوە لێی، یان کارو بڕیاری خوا ئەوەیە کە لێبوردەی میهرەبانە بەو کەسەی کە باسکرا، لە لوتف و میهرەبانی یەکەی بە زیاد بێت، ئینجا با ئەندازەیەك بوەستین و بیر بکەینەوە لە گەورەیی و گرنگی ئەم قورئانە کە چ شۆڕشێکی سەرانسەری و گشتی کرد بە مەردوم، چۆن گواستی یەوە و دەری هێنا لەو هەموو چاڵی و پەستی یە و بەرزی کردەوە بۆ پۆپە و ئاسۆی هەرە بەرزی مرۆڤایەتی، ماف تەواوی**

مرۆڤایەتی دەرخست و دیاریی کرد و بڵاوی کردەوە و دای بە خەڵکی، ئەو ئاڵ و گۆڕە گەورە بێ وێنەی کرد و پێی هەڵسا بە بێ کوشتن و بڕین و چەوساندنەوە و سزادان و بەند کردن و برسی کردن و داچڵەکاندن!!

زۆر پێویستە بیر بکرێتەوە لەو هەموو باو و کردەوە نەفامی یانەی کە چەندەها ساڵ دەقی پێوە گیرابوو لەگەڵ ئەوەدا قورئان هات و گۆڕینی بە مرۆڤایەتی و پیاوەتی و کردار و رەوشتی پاك و شیرین و دادپەروەریی بە بێ ئەوەی هیچ کەس دووچار بکرێ بە هیچ کارێکی ناڕەوا و ناخۆش، بیرێك لەوە بکرێتەوە و ئینجا لایەك بکرێتەوە بەلای هەموو شۆڕش و گۆڕین و ئاڵ و گۆڕەکانی جیهاندا، کە خەڵکی تر پێی هەڵسان بە پێی ئەو هەموو رژێم و بەرنامەیان کە لەم زەوی و جیهانەدا بەرپا بوون و هەڵقوولان، لە پێناوی هەرکام لەو گۆڕین و شۆڕشانەدا هەموو تاوان و کارو کردەوەی ناپەسەند و ناهەق کراو ئەکرێ بە بێ ئەوەی چارەسەری گیرو گرفتەکانی جیهان و مەردومیش کرابێ و بکرێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆربەی گۆڕین و شۆڕشەکان لە ناهەقی و خراپی یەوە بۆ ناهەق تر و خراپتر!! با بە جوانی بیرێك بکرێتەوە لە بەرنامەکەی قورئان و بناسرێ و هەر ئەو بدرێتە بەر، بەڵکو جارێکی تریش مرۆڤ و مەردومان بەهرەمەند ببنەوە بە پیت و فەڕی بەرنامەکەی خوا، رزگار بن لە شەڕو خراپە و ناهەقی و تاوان و ستەمی هەرکام لە بەرنامەکانی تر، ئینجا پێویستە روون بوونەوە و ناسینی هەموو رژێم بەرنامەکانی تر تا خوا پارێزی بکرێ لێیان و هیچ کەس نەخەڵەتێ پێیان، لە هیچ بارێکەوە تێکەڵ نەکرێن لەگەڵ بەرنامەکەی خوادا، چونکە هەر پاکێك تێکەڵی پیس بکرێ بە پاکی نامێنێتەوە، تێکەڵ کردنی هەر بەرنامەیەکی تر و رازی بوون پێی هاوبەش رەوادانە بۆ خواو بێجگە لەوەیش روون بوونەوە و ناسینی بەرنامەکانی تر هۆی زیادە ناسینە بۆ بەرنامەکەی خوا، چونکە هەر شتێ ئەناسرێ بە ناسینی دژەکەی، واتە تا بێ بڕوایی و خراپەو تاوان باشتر بناسرێن بڕواو خێرو چاکە باشتر روون ئەبنەوە. کاتێ کە بیر بکرێتەوە لەمەی کە گوتمان باشتر دەرئەکەوێ مەبەست لەم فەرمودەی کە ئایەت و مەبەستەکانی پێ دوایی ئەهێنێ،

**﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە گرنگ و روون و رەوانە ئێمە هەمیشە ئایەتەکان باس ئەکەین بە روونی و بە درێژیی. لەبارەی سیفەت و نیشانەی چاکان و تاوانباران، چ ئەوانەی کە سوورن لەسەر تاوانەکەیان و گەڕانەوەیان نابێ، چ ئەوانەی کە ئەگەڕێنەوە ﴿وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ بۆ ئەوەی روون و ئاشکرا ببێ رێگەی تاوانبارەکان، ئەم ئایەتە بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، روون بوونەوەی رێگەی تاوانباران زۆر زۆر پێویستە بۆ بانگ کەرانی رێگەی هەق، بە تایبەتی رێگەی ئەو تاوانبارانەی کە بەناو موسڵمانن و لە نەوەی موسڵمانانن، لە خاك و وڵاتێکدا ئەژین کە کاتی خۆی وڵاتی ئیسلام بووەو ئایین و شەریعەتی خوا حاکم و کاربەدەست بووە تیایدا، بەڵام لەپاشدا ئەو وڵات و دانیشتوانە وازیان لە ئیسلام هێناوە، بەم رەنگە بە ئارامی و ئاشتی یەوە، بە بێ دەنگ دانیشتوان لە ژێر سایەی بەرنامەو یاسایەکی تردا کە لەلایەن خواوە نەهاتووە و بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ لەگەڵ یەکەم بەندی ئیسلامەکەیاندا کە بریتی یە لە(لا إله إلا الله) چونکە ئەم وتە پیرۆزە بریتی یە لەوەی کە بڕوای رێك و پێك ببێ بەمەی کە تەنها خوا بەدیهێنەرو کاربەدەستە لەم بوونەوەرەدا، تەنها خوا ئەبێ بپەرستین و عیبادەتی بۆ بکرێ و یاسا و بەرنامە و شەریعەت تەنها لە خوا وەرگیرێ و مل کەچی و گوێرایەڵی هەر بۆ فەرمان و بڕیاری ئەو، هەرکەس بەو جۆرە ئەو وتە پیرۆزە نەڵێ و وەری نەگرێ، ئەو کەسە شایەتومانی نەهێناوەو نەهاتووەتە ژێر ئاڵای ئیسلام، ئیتر هەرچەند خۆی بە موسڵمان دابنێ، هەرچەند بە رووکەش و رواڵەت بە موسڵمان ناو ببرێ و دابنرێ، جا ئەمڕۆ کۆسپی هەرە گەورە لە رێگەی بزووتنەوەی ئیسلامی لەو وڵاتانەی کە دانیشتووەکانی بەناو موسڵمانن وەك باسکران، کۆسپی هەرە گەورە ئەو بەناو موسڵمانانەن لە رێگەی بزووتنەوەی ئیسلامی یەکاندا، ئەوانە کون و کەلەبەرێکی زۆر چاکن بۆ دوژمنانی ئیسلام کە لە رێگەوە بێن بۆ بەرگری کردنی ئیسلام و ئاژاوە و دووبەرەکی نانەوەو پڕوپاگەندە بە دژی بانگ کەرانی ئیسلام بەمەی کە ئایینێکی تازەیان داهێناوەو موسڵمانان بە ناموسڵمان دائەنێن، چۆن ئەو هەموو نوێژکەرو رۆژووگرە**

به نا موسڵمان دەرئەکەن؟! کەواتە پێویستە لەسەر بانگ کەران کە لە پێش هەموو شتێکدا هەوڵ بدەن بۆ روون بوونەوەو جیاکردنەوەی رێگەی موسڵمانان لە رێگەی تاوانباران.

لە ئایەتەکانی رابوردوا فروستادەیی و فروستادە و کارو پیشە و نیشانەی فروستادەی باس کرد، لەپاش ئەوە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر باس و روون کردنەوەی خوایەتی کە وەك شتێکی روون و ئاشکرایە بەم بوون و بوونەوەرە و بە هەموو بەش و پارچەکانی یەوە شایەتە لەسەری، لێرە لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات لە چەند بارو روویەکەوە:

١- ئەو خوایەتی یە روون و ئاشکرا بوو لەدڵی پیرۆزی پێغەمبەردا(ﷺ) کە بە بیٚ هیچ جۆرە گومانێك و بە هەموو ئارامی دڵی خۆیەوە هەستی پێئەکرد لەبەر ئەوە هیچ گوێی نەبوو لە بڕوا نەهێنان و یاخی بوونی گەلە بیٚ بڕواکەی.

٢- لە پەلە نەکردنی خوا لەو بیٚ بڕوایانە و گوێ پیٚ نەدانی بەو بڕو بیانووەی کە ئەیان گرت و داوایان ئەکرد، لەگەڵ ئەوەدا خوا توانا و دەسەڵاتدار بوو بەسەر بڕینی هەموو بڕو بیانوویەکیاندا، ئەو کاتە ئەگەر بڕوایان نەهێنایە لەناوی ئەبردن بە پێی باوی خۆی کە تێپەری کرد لە گەل و ئوممەتە پێشووەکاندا، دەی ئەگەر خوا نەبوایە نە پێغەمبەرو هیچ کەسێکی تر بێجگە لە خوا خۆی پیٚ نەئەگیرا، کەواتە ئەو پەلە نەکردنە هەرچۆنیٚ میهرەبانی بووبەوانە،هەروەهانیشانەیەکی ئاشکرا بوو لەسەر خوایەتی خوا.

٣- ئەو خوایەتی یە نیشان ئەدا لە زانین و ئاگاداری خوا بە هەموو غەیب و نهێنی و شتە نادیاریی یانەدا کە هەر بۆ خوا دەست ئەدات و ئەگونجیٚ.

٤- دەری ئەخات و دەست نیشانی بۆ ئەکات لەو چاودێری و ئاگاداری یە هەمیشەیی یەی کە خوا هەیەتی بەسەر بەندەکانیدا و زاڵە بەسەر هەموو کاروبار و بەسەرهاتیان لە هەموو کاتێکدا.

٥- نیشانی ئەدات لە سروشتی بیٚ بڕواکاندا، کە شتێکی جێگیر و دامەزراوە بە جۆرێك لە کاتی هەموو تەنگانە و تەنگ و چەڵەمەیەکدا بیٚ پەروا هەر بۆلای خوا ئەگەڕێنەوە و نزاو لاڵە هەر لە ئەو ئەکەن.

قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهۡوَآءَكُمۡ قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلۡ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ مَا عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦٓۚ

---

ئینجا با بێینە سەر ئایەتەکان زیاتر مەسەلەکە روون بکەینەوە، لە یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێگومان من بەرگری کراوم و جڵەوگیریم لێکراوە لەمەی کە بیپەرستم یان نزاو هاوار بکەم لەوانەی کە ئێوە ئەیان پەرستن یان هاواریان لێئەکەن بێجگە لە خوا. ﴿قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهۡوَآءَكُمۡ﴾ بڵێ پێیان: من شوێنی ئارەزووەکانی ئێوە ناکەوم، واتە ئێوە کە ئەوانە ئەپەرستن لە نەزانینەوە نییە و شوێنی هەق و راست نەکەوتوون، بەڵکو شوێنی هەوا و ئارەزووی نەفس کەوتوون ﴿قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ بێگومان من گومڕا ئەبم و لە ڕێی راست لائەدەم و ون ئەبم ئەگەر شوێنی ئارەزووی نەفسی ئێوە بکەوم، من لە ریزی ئەو کەسانە نابم کە ڕێنموونی وەرگرن و لەسەر ڕێگەی راستن.

خوای پەروەردگار فەرمانیدا بە پێغەمبەرەکەی کە بەو جۆرە روو بە رووی ئەوان بوەستێ و بەم جۆرە جوێ ببێتەوە لێیان، وەك لە چەند شوێنێکی تردا ئەو فەرمانە هاتووە، چونکە بێ ئەوە ئیسلام و خواپەرستی نابێ و بەدی نایەت، هەرگیز دوو شتی دژو پێچەوانەی یەکتر کۆنابنەوە لە جێگا و شوێنێکدا، وتەی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ کە بۆ زانا و ژیر بەکار ئەهێنرێ ئەوە ئەگەیەنێ کە جڵەوگیریی یەکە تەنها لە پەرستنی دارو بەرد نییە، ئەگەر تەنها مەبەست دارو بەرد بوایە لە باتی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ﴿ما﴾ ی بەکار ئەهێنا، وەك لە هێندێ ئایەتدا بە وتەی ﴿ما﴾ هاتووە، کە لەو ئایەتانەدا مەبەست هەر دارو بەردە، یان بە شێوەی گشتی مەبەستە و بەڵام پەرستراوە ژیرەکان براوەتە ریزی دارو بەردەکان، کەواتە لێرەشدا هەر پەرستراوە ژیرەکانە وەك مەلائیکە و جنۆکە و ئادەمی، یان بە شێوەی گشتی مەبەستە و بەڵام باوی پەرستراوە ژیرەکان دراوە بەسەر ئەوانی تردا و وتەی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ بەکار هێنراوە بۆ هەردوو چینەکە، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار پەرستن تایبەتی یە تەنها بە خواوە، نابێ بە هیچ کلۆجێك هیچ جۆرە هاوبەشێك رەوا بدرێ بۆ خوا نە لە زاتی پاکیدا؛ نە لە هیچ سیفەتیدا، نە لە هیچ

کردەوەیدا، نە لە هیچ بڕیارو یاسا و بەرنامە و شەریعەتیدا، بە بڕیاردانی هەر جۆرە هاوبەشێك لەهەرکام لەوبار و ڕووانەوە کە باسکرا خواپەرستی نابێ و ناگونجێ، لە چەند شوێنێکدا بە ڕوونی ئەوەمان باس کردووە پێویستە بزانرێ کە هەرچۆنێ بە سوژدە بردنی بۆ هەرکەس و هەر شتێکی تر بێجگە لە خوا مەردوم لە ئیسلام دەرئەچێ و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنێ، هەروەها شوێن کەوتن و بڕوا بوون بە هەر یاسا و شەریعەتێکی تر بێجگە لەم شەریعەتی ئیسلامە مەردومی پێ ئەبێ بە هاوبەش ڕەوا دەر و لە ئیسلام دەرئەچێ، لەپاش ئەوە باسی ناڕاستی و ناڕەوایی ئەو بارەی کرد کە ئەو بێ بڕوایانەی لەسەرن، ئینجا فەرمان ئەدات کە ڕاست و ڕەوایی ئەو بارە ڕوون بکاتەوە کە پێغەمبەری لەسەرە(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ پێ یان: ﴿إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾ بەڕاستی من لەمەدا کە هێناومە و ڕایئەگەیەنم لەسەر ڕابەرو نیشانەیەکی ئاشکرا و گەورە و گرنگم کە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم هاتووە، واتە ئەو قورئان و سروشەی کە ئەوپەڕی ڕادە بڕوای تەواوی پێی هەیە بە بێ هیچ گومان و دوو دڵی و بە هەموو ئارامی یەکی دڵەوە، ئەو قورئان و سروشەیە شێوەی گشتی یان خوایەتی خوا بە تاك و تەنیا و بە بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار ئەوەی کە ئەو لەسەری بووە لە دەروون و ویژدانی خۆیدا هەستی پێ ئەکرد و ئەیزانی و ئەیناسی و ئەو هەست و بڕوا دەروونی یە بۆ پێغەمبەرەکانی تریش بووە وەك قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە لەزمانی نوح وئیبراهیم و سالح و کەسانی ترەوە، ﴿وَكَذَّبْتُم بِهِۦ﴾ ئێوە بڕواتان پێ نەهێنا و بەڕاستی نازانن، ئینجا ئەتانەوێ من واز بێنم لەوەی کە بەو جۆرە ئاشکرایە لام و شوێنی ئێوە بکەوم لە شتێك دا کە ئێوەی لەسەرن، بە بێ ئەوەی کە خۆتان دڵنیابن پێی، بەڵکو هەر بە کوێرانە وەرتان گرتووە لە باوك و باپیرتانەوە، ئەو نەفامانە بەم قورئانە گەورەیە کە موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکرایە وازیان نەهێنا و داوای موعجیزەیەکیان ئەکرد کە خۆیان پەلیان پێ ئەگرت بۆ بڕوا هێنانیان، هەروەها پەلەیان ئەنایەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) بە هاتنی ئەو سزایەی کە هەڕەشەی ئەکرد لێیان پێی، بێگومان ئەو جۆرە شتانە هەر بەدەست خوایە و هیچ دەخلێکی کەسێکی تریان تیا نییە، لەبەر ئەوە فەرمانی دا کە بفەرموێ پێیان ﴿مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ﴾ لای من نییە و بەدەست من نییە ئەوەی کە ئێوەپەلەی پێ ئەنێنەوە و داوای هاتنی پێ ئەکەن لە من

﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ حوكم و بڕیار له دواخستنی ئەوەی کە ئێوە پەلەتانە و پەلە ئەنێنەوە بۆی، یان حوکم و بڕیار لە هەموو کارو بارێك دا کە ئەم دوا خستنە هەموو شتە، حوکم و بڕیار هەر بۆ خوایە و تایبەتی یە بە خواوە و بە بێ دەخلی هیچ کەسێکی تر ﴿يَقُصُّ ٱلْحَقَّ﴾ هەواڵی هەق و ڕاست ئەدا و ئەیگێڕێتەوە لە هەموو شتێك دا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یان شوێنی ڕاستی ئەکەوێ، بەدوای هەق و ڕاستی دا ئەگەڕێ لە هەموو کاروبڕیارێك دا، کاردروستی بەکار ئەهێنێ تیایان دا ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ﴾ خوا باشترینی هەموو بڕیار دەرو جیاکەرەوەیانە، ئەو بڕیار دەرە لە نێوان بانگ بۆ هەق و ڕاستی و ئەوانەی کە بێ بڕوا و سەرکێشن بەو جۆرو شێوەیە خوا فەرمانی دا کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نیشان بدات بە بێ دەسەڵات یان بەوەی کە هیچ دەخلێکی نییە لەبارەی هیچ قەزاو قەدەرێکی خوادا، خۆی نیشان بدات بە بەندە و مرۆڤێك کە سروشی بۆ کراوە کە فەرمانی خوا ڕاگەیەنێ و خەڵکی بترسێنێ، نەك بۆ ئەوەی خاوەنی قەزاو قەدەر بێت. ئینجا فەرمان ئەدات کە سەرنجیان ڕاکێشێ بۆ بەڵگەیەکی ئاشکرا لەسەر ئەوەی کە ئەو شتانەی ئەوان داوای ئەکەن و پەلەی پێ ئەنێنەوە لەلایەن خواوەیە و بەدەست خوایە، چونکە ئەگەر ئەو جۆرە شتانە بەدەست ئەم بوایە هیچ خۆی پێ نەئەگیرا و ئەو پەڵپ و بیانووەی ئەوانی ئەبڕی و داواکەی جێبەجێ ئەکردن، بەڵام چونکە کارەکە هەر بەدەست خوایە، ئەویش پەلە ناکات، ئەوەی ئەوان داوای ئەکەن بەجێی ناهێنێ، چونکە ئەگەر بەجێی بێنێ ئەبێ ئەمان لەناو بەرێ و لە ڕیشەیان بێنێ، ئەوەش بە پێی باوی خوا کە تێپەڕی کردووە لە گەلە پێشووەکان دا، کە هەرکام ئەگەر پەڵپ و بیانوویەکیان گرتبێ لە پێغەمبەرەکانیان و خوایش جێبەجێی کردبێ ئینجا لەپاش ئەوە ئەگەر بڕوایان نەهێنابێ خوا لەناوی بردوون، خوا خۆی ئەزانێ کە ئەمانە پاش بڕینی پەڵپەکەیان بڕوا ناهێنن، کەواتە ئەبێ لە ڕیشەیان بێنێ، خوایش نایەوێ ئەوەیان بەسەر بێنێ، بەڵکو ئەیەوێ ئەم ئوممەتە هەر بەردەوام بێ هەتا ڕۆژی دوایی، کەواتە نابێ پەڵپ و بیانووەکەیان بەجێ بێنێ،

قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿قُل﴾ **ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە:** ﴿لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ﴾ **ئەگەر لای من بوایە و بەدەست من بوایە ئەوەی کە ئێوە داوای ئەکەن و پەلەی پێ ئەنێنەوە، ئەگەر ئەوە بە دەست من بوایە خۆم پێ نەئەگیرا بە پێی سروشتی ئادەمی و ئەوەی بەدی ئەهێنا ئەو کاتە** ﴿لَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ **کاری نێوان من و ئێوە کۆتایی پێ ئەهێنرا، بەم رەنگە ئێوە لەناو ئەبران، چونکە بڕواتان نەئەهێنا** ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ **خوا زاناترە و ئەوپەڕی زانینی هەیە بە ستەم کاران و ئەزانێ کە بەو جۆرەن، کەواتە مۆڵەت دان و پەلە نەکردنەکەی لە زانینەوەیە و کاردروستی و بەرژەوەندی تیایە، ئەم تەفسیرە رێکە لەگەڵ چەند ئایەتێکی تردا یەکێ لەو ئایەتانە ئایەتی(٥٩) لە سورەتی(الأسراء):** ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾ **هیچ شتێك بەرگری ئێمەی نەکردووە لە ناردن و بەجێ هێنانی ئەو موعجیزانەی کە پەلپ ئەگرن بە هاتنی مەگەر ئەوەی کە لە ئوممەتە پێشووەکان بڕوایان پێ نەهێنان، واتە لەپاش بڕینی پەلپ و داواکەیان هەر بڕوایان نەهێنا و ئێمەش لەناومان بردن، کەواتە ئەگەر ئەم پەلپ و داوای ئەمانەیش ببڕین هەر بڕوا ناهێنن، ئەو کاتە بە پێی باوی خۆمان ئەبێ لەناویان بەرین، ئێمەیش بڕیارمان داوە کە ئەم ئوممەتە بەردەوام بێت، ئەم تەفسیرەی کە تێپەڕی کرد هەرچەند زۆر رێکە لەگەڵ تەفسیری ئەم ئایەتی سورەتی(الأسراء) دا بەڵام بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، یەکێ لەوانە ئەمەیە: بڵێ ئەگەر ئەوەی کە ئێوە پەلەی پێ ئەنێنەوە بە دەست من بوایە من خۆمم پێ نەئەگیرا و ئەو کاتە کاری نێوان من و ئێوە دوایی پێ ئەهێنرا، بەم رەنگە بەو سزایە ئێوەم لەناو ئەبرد، خوا زاناترە بە ستەمکاران و ئەزانێ کە چاك ئەوەیە ئەو سزایە بەدەست من نەبێ و ئێوە مۆڵەت بدرێن تا بە باشی شایستەی سزا بن، کەواتە مۆڵەتدانەکەی خوا لە زانین و کاردروستی یەوە هاتووە، لەگەڵ ئەوەدا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێك دا و پەلە ناکات لەوەی بەدی بێنێ ئەوەی کەئەوانەپەلپی لێ ئەگرن، ئینجالەکاتی خۆیدا سزایان ئەداودوچاری دەردی خۆیان ئەکات.**

﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩﴾

**ئینجا به بۆنەی زانین و ئاگاداری خوا بە ستەم کاران و تۆڵە و کاتی هاتنی سزایان، لەبەر ئەوەی باشتر خوایەتی خۆی بناسێنێ بە بەندەکانی باسی زانینی خواو ئاگاداری خوا ئەهێنێتە پێشەوە، زانین و ئاگاداری یەکەی بە هەموو شتە نهێنی یەکان و بە هەموو شتێ کە لەم بوونەوەرەدایە، ئەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ﴾ هەر لای خوایە کلیلەکان و هۆی زانینی ئەو شتانەی کە نادیاری و ناسراون و لە خەزنەی زانینی خوادان، یان هەر لای خوایە کان و خەزنەکانی غەیب و نادیاریی یەکان، هەر جۆر مەبەست بێت ئەوانە ﴿لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ﴾ نایانزانێ مەگەر خوا و هەر خوا ئەیانزانێ، بێگومان هێندێ لە غەیب و نهێنی یەکان کەسانی تریش ئەیانزانن وەك ئەو شتانەی کە بە ژیریی ئەزانرێ یان لە دڵ و دەروون دان و بە ویژدان هەستیان پێ ئەکرێ، کەواتە مەبەست بەم غەیب و نهێنی یانە لێرەدا ئەو جۆرانەن کە هەستیان پێ ناکرێ و بە ویژدان و ژیریی نازانرێن و هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیش نی یە لەسەریان، کە بێگومان ئەو جۆرو بەشانە تایبەتین بە خواوە، وەك بە درێژیی باسمان کرد لە چەند شوێنێك دا لەم تەفسیرەدا یان مەبەست ئەوەیە زانینی هەموو غەیب و نهێنی یەکان و هۆی زانینی یان هەر لای خوایە و تایبەتی یە بە خواوە، وەك دیمەن و رواڵەتی ئایەتەکە ئەوە ئەگەیەنێ کە هەموو کلیل و کانی غەیب و هەموو نهێنی یەکان هەر لای خوایە و هەموو ئەوانە هەر خوا ئەیانزانێ و هیچ کەسێکی تر نییە کە هەموویان بزانێ لەسەر هەر بار هیچ قۆرت و گرێ یەك نی یە و فەرمودەکە راست و رێکە، ﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ﴾ ئەزانێ و ئاگایە بە هەموو شتێ و هەرچی وا لە وشکی و تەڕی و دەریادا، یان هەرچی وا لە چۆڵ و بیابان و هەرچی وا لە ئاوەدانی و شارو دێ یەکان دا، ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا﴾ هیچ گەڵایەك ناکەوێ و لە درەختەکەی نابێتەوە مەگەر خوا ئەیزانێ و ئاگایە پێی، کەواتە هەرچۆنێ ئاگایە بە خودی هەموو شتەکان، هەروەها زانا و ئاگایە بە بەسەرهاتیشیان ﴿وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ﴾ هیچ دانەوێڵەیەك نییە لەناو سك و شارەوەکانی زەوی دایە ﴿وَلَا رَطۡبٖ وَلَا**

يَابِسٍ﴾ هيچ تەڕو وشكێك نییە ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ مەگەر هەموو ئەوانە وان لە زانینی خوادا، یان لە(لوح المحفوظ) دا واتە ئەو دروست كراوەی كە هەموو شت و رووداو و بەسەرهاتێكی تێدا نووسراوە، وەك لە چەند ریوایەتێك دا هاتووە، ئەمەی كە لەم ئایەتە كورتەدا فەرمووی، شێوەو وێنەی زانینە بێ سنوورەكەی خوایە كە هەموو شتێك ئەگرێتەوە و هیچ شتێكی لێدەرناچێ و لێ ون نابێ لە هیچ كات و لە هیچ شوێنێك دا، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان دا، نە دەریا و نە لە وشكانی دا، نە لەناو سكی زەوی نە لە چینەكانی هەوادا، نە زیندوو نە مردوو، نە تەڕ و نە وشك... بەڵام ئەمە لە كوێ كە ئێمە بە باوی خۆمان ئەیڵێین، ئەمە لە كوێ و ئەم تەعبیرە نایابە سەر سوڕهێنەرە لە كوێ؟

ئەم ئایەتە كورتە دڵ و دەروون و خەیاڵ رائەكێشێ و گەردشی پێ ئەكات بە ئاسمانەكان و بە زەوی دا، بە هەموو شتێكی دیاریی و ناسراو و نادیاریی و نەناسراودا و بیری لێ ئەكاتەوە لەو هەمووە لە رابوردوو ئێستا و داهاتوودا، ئینجا كاتێ كە بیر ئەكاتەوە و ئەزانێ ئەوانە هەموو و هەمیشە بە بێدواو بەر زانراو و ناسراوە لای پەروەردگار، زانینی خوا دەوری داون لە بچوكترین و نادیاری ترینەوە تا گەورەترو ئاشكرا ترەوە كاتێ كە بیر ئەكاتەوە لەو زانین و ئاگاداری و دەسەڵاتەوە سەرگەردان ئەبێ و خەریكە هۆش و گۆشی بڕواو بیر و ژیریی لەكار بكەوێ!! پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری زانا و تواناو بێ وێنە، بێگومان دابەش كردنی زانراو و ناسراو و گێڕانی بە دوو بەش نادیاریی و ئاشكرا،(غەیب و شەهادەت) بۆ ئێمەیە و بە لای ئێمەوە ئەو دوو بەشە هەیە، نەك بەلای خواوە، چونكە هەموو شت بە بێ جیاوازی ئامادە و ئاشكرایە لای خواو لە زانینی خوادا، ئەمە شتێكە پێویستە لەسەر هەموو كەسێك كە بڕوای پێی هەبێ بە بێ دوو دڵی، ئینجا لەبەر ئەوەی وتەی(غیب) — لە پاش پەیدا بوونی بیرو باوەڕی ماددێتی — زۆر جاران لائەدرێ لە مەبەست و واتا راستەقینەكەی خۆی بەم رەنگە بەكار ئەهێنرێ بۆ شتی پڕو پووچ بەرامبەر بە زانین و زانیاریی، قورئانیش ئەوەتا دای ئەنێ بە شتێكی راست، ئەفەرموێ: كان و كلیلەكان و هۆی زانینی هەر لای خوایە، ئەو زانینەی كە دراوە بە ئادەمی بەشێكی كەمە، ئەو بەشە كەمەیش كە پێی دراوە بە پێی پێویست و توانینی یەتی، بێجگە لەو ئەندازە زانینەی كە خوا پێی داوە، هیچ زانینێكی تری لا نییە، هەر شتێكی تری لا بێ هەر گومانە، هەروەها قورئان پێمان

ئەفەرموێ: کە خوا ئەم بوونەوەرەی دروست کرد، چەند باو و رەوشتێکی بڕیار داوە بۆ ئەم بوونەوەرە کە ناگۆڕرێن، رێنموونی ئادەمی کردووە کە بگەڕێ بە دوای ئەو رەوشتانەدا و هێندێکیان بناسێ و پەییان پێببا و هاوکاری یان لەگەڵ بکات بە پێی پێویست و لە سنووری توانین دا، بەڵێنی پێ داوە کە هێندێ لەو باو و رەوشتەی بۆ دەرئەخات کە خوا دایناوە لە لەشی خۆیان و لە ناوچە سنوری یەکانی ئەم بوونەوەرەدا، تا بۆیان دەرکەوێ و بە بێگومان و دوو دڵی بزانن و بڕوا بێنن کە ئەوەی بۆیان هاتووە لەلایەن خواوە راست و رەوانە... بە بێ ئەوەی دەرکەوتنی ئەوانە و دەست کەوتنیان ناڕێکی و دژایەتی ببێ لەگەڵ بوونی ئەو نهێنی و شتە غەیبی یانەی کە نەزانراو و نەناسراون بۆ ئادەمی، لەگەڵ بێ سنووری و بەر بەرەڵایی خواهیش و مەیلی خوا لە پەیدا بوون و هێنانە کایەی هەر شتێ... لە بیرو باوەڕ و بۆچوونی موسڵمان دا ئەوەی کە گوترا رێك و پێك و راست و گونجاون بە بێ گیرو گرفت، بە جوانی ئەزانم، بەڵکو پێویستە کە لەم بارەیەوە هەندێ بدوێم و لێکۆڵینەوە بکەم، بێگومان خوا لە زۆر شوێن دا باوەڕ بە غەیبی کردووە بە سیفەت و نیشانەی بڕواداران، یەکێ لەو شوێنانە سەرەتای سورەتی(البقرة) یە کە ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾، یەکەم غەیب بریتی یە لە خوا کە بەرهەمی کردەوەکەی دیارەو نە خۆی و نە چۆنی یەتی کردەوەکانی دیارەو کەس پەییان پێنابات، یەکێتر لەو غەیبانە رۆژی دوایی یە کە خۆی و هەموو رووداوەکانی هێشتا بەدی نەهاتوون و غەیبین لە ئێمەو پێویستە بڕوامان پێی هەبێ، چونکە خوا هەواڵی پێداوین هەروەها مەلائیکە و جنۆکە و شەیتان و چەند شتی تر، وەك بڕیارو قەزاو قەدەرەکانی خوا هەتا بەدی نەیەن ئێمە هیچی لێنازانین، بە بێ بڕوا کردن بەو قەزا و قەدەرانە ئیمان بە خواو بە ئایین بەدی نایەت، ئینجا بێجگە لەوانە لە هەموو لایەکەوە غەیب چواردەوری ئێمەی گرتووە... غەیبی رابوردوو و ئێستا و داهاتوو، غەیب لەبارەی خۆمانەوە، غەیبی ئەو بوونەوەرە گەورەیە کە تێیدا ئەژین لە پەیدا بوونی و لە سروشتی و لە بزووتنەوەی.

ئەم مرۆڤە ئەگەڕێ و مەلەوانی ئەکات لەناو دەریای بێپەیی نەزانی و بێ ئاگایی دا، تەنانەت نەزان و بێ ئاگایە لە هەموو کاتێك دا لەو شتانەی کە هەیە لە زاتی خۆی دا چ جای ئەو هەموو رووداوو شتانەی کە هەیە لە زاتی بوونەوەردا، هەرکات و ساتێك بگیرێ بە

دەستەوە بێ ئاگایە لەوانە، چ جای لەپاش ئەو کات و ساتە و لە داهاتوودا. بۆخۆی و بۆ ئەو بوونەوەرەی کە بە دەوریایەتی: بۆ هەموو ئەتۆم و هەموو کارەبایەك لە هەر ئۆتۆمێ، بۆ هەموو سێلێ و هەموو بەش و پارچەیەك لە هەر ئۆتۆمێ! ئاشکرایە کە بەو جۆرە نەزانراوو و نەناسراو غەیب هەیە، ژیریی کە ئەو تۆزە تروسکایی و رووناکی یە کەم و کورەیە و لە دورەوە هێندێ شت ئەبینێ و رەچاوی ئەکات و رێی لێی ئەکەوێ بە یارمەتی و کۆمەکی خواو رێنموونی خوا... بەڵام چاولەبەریی خوا نییە و سوپاسی ناکات، بەڵکو لەم چەرخ و سەردەمە دوایی یەدا کەشخە و شانازی ئەکات و لە خۆی گۆڕاوە بەهۆی ئەو زانین و ناسینە کەمەی کە خوا پێی داو هێندێ لەو شتە نهێنی یانەی بۆ دەرخست کەشخە ئەکات و وا گومان ئەبات کە ئەم مرۆڤە بە خۆی راگیر و وەستاوەو پێویستی بە خوا نییە! بڕوای هێنا بەو تۆزە تروسکە زانینە و گێڕای بە خوای خۆی و بە کەشخەوە بێبڕوایی دەرئەبڕێ بە غەیب و هەموو شتە نادیارەکان، بڕوا بە غەیب بە کۆنەپەرستی و پڕوو پووچ دائەنێ، بەڵام وەنەبێ هەموو کەس بەو جۆرە سەری لێتێك چووبێ، بەڵکو زۆر لە زانایان هاتنە کایەوەو ئەو بێ هۆش و ماددی یانەیان بە درۆ خستەوە و بە رێك و پێکی بڕوای خۆیان دەربڕی بە غەیب، تێگەیشتن و دانیان نا بەوەدا کە ئادەمی بەشێکی کەم لە زانینی پێدراوە و هێشتا لە قاپی دایە و نەهاتووەتە ناو کۆشکی بێ سنوور و بێپەیی زانین، ئینجا با هەندێ لە وتەی ئەم کۆمەڵە زانایانە بهێنین، بەڵام نەك بۆ ئەوەی بڕوای خۆمان بەهێز بکەین بە وتەو قسەی ئەوانە و وتەی ئەوان بکەین بە شایەت بەسەر راستی قسەو فەرمودەی خوا، نەخێر، نەخێر، خوا نەخواستە ئێمەی بڕوادار بەو جۆرە نین، بەڵکو ئەو وتەو قسانە ئەهێنین بۆ دەم کوت کردن و ئابڕوو بردنی ئەو ماددی یە نەفامانە کە لە خۆیانەوە وەك نەخۆشی گرانەتا دار لەبەر خۆیانەوە وڕێنە ئەکەن و ئاگایان لە دەمی خۆیان نی یە:

(ماری ستانلی کونجدن) زانای تەبیعی و فەیلەسوفی بەناوبانگ لەبارەی ئەو شتانەی کە زانین پێی گەیشتووە تا ئێستا ئەڵێ: زانین و بۆچوونەکانی ئادەمی شتێکن قەتعی نین و هەموو دەست ئەدەن بۆ هەڵە، بەرهەم و سەرەنجامەکان دەست ئەدەن بۆ بژارەو دەست تێخستن و گۆڕان، چونکە ئادەمی خۆی سنوور دارە و زانین و هۆی زانینەکانی دیاریی و سنوور دارن کەواتە ئەبێ دەست بدەن بۆ هەڵە و گۆڕان، بێجگە لەوەش ئادەمی هۆو

زانینـەکانی تـاقی کردنـەوەو بـەراورد کردنـە، دەی بـەراوردیش شـتێکی قـەتعی نـادا بـە دەستەوە، بە شێوەی گشتی و لە هەموو کاتێك دا، کەواتە هەر تەنها ئەبێ لە ڕێی ڕێنموونی و نیشاندانی خواوە ئەو زانین و ناسینە ڕاست و بێگومانەوە بزانرێن و بناسرێن، بێجگە لەوانە هەرچی بۆ ئادەمی پەیدا ببێ هەر گومانە و ناگاتە زانین، زیاد لەوە غەیب لە هەموو لایەکەوە دەوری ئادەمی داوەو نایەتە ژمارە، ئەم بوونەوەرە پڕە لەم شتە غەیبی یانە، ئەوەتا هەتا ئێستا ئەکۆڵێنەوە و چەند بۆچوون و چەند بەدەم بڕ قسە ئەکرێ لەبارەی سەرچاوەو پەیدا بوون و سروشتی بزووتنەوەی، لەبارەی کات و زەمان و شوێن و مەکان و پەیوەندی یان پێکەوەو پەیوەندی ئەوەی کە پەیدا ئەبێ لە بوونەوەردا پێیانەوە گیان و ڕۆح و سەرچاوەکەی پەیدا بوونی ئەو شتانەی کە کار ئەکەن پێی و هۆی فەراهەم هاتنی و پەیوەستی بەم بۆنەوە.

ئادەمی چی یە؟ ئایا چی جوێی ئەکاتەوە لە کەرەسەو ماددەکانی تر؟ ئایا چی جوێی کردەوە کە زیندەوەرەکانی تر؟ ئایا چۆن هات بۆ ئەم زەوی یە؟ ئەو ژیریی یە چییە کە پێی جوێ بووەتەوە و کار و کردەوەی پێ ئەکات؟ ئایا لەپاش مردن چی بەسەر دێت و دوا ڕۆژی چییە؟ بەڵکو ئایا لە چی پەیدا ئەبێ و ئەگەڕێ لەناو لەشی ئەم ئادەمی یەدا؟ چۆن پەیدا ئەبێ و ئەگەڕێ؟

ئەمانـەی کـە گـوتران و چـەند شـتێ تـر هـەموو مەیـدانن بـۆ غـەیب و زانـینی ئـادەمی سەرگەردانە تیایان دا، ئەمانەی کە باس کران لە غەیبە نزیکەکانن، ئیتر با بوەستێ غەیبە دوورەکان وەك مەلائیکە و جین و شەیتان و ئەو شتانەی تر کە دروست کراوێکن هەر خوا ئەیانزانێ و ئەیانناسێ، وەك مردن و ڕۆژی دوایی و حیساب و تۆڵە و پاداشت و شتەکانی تر، ئەو غەیبە نزیکانە بەسن و زانین لە ئاستی یان بە مل کەچی یەوە ئەوەستێ و هیچی پێ ناکرێ، ڕێگەی هیچ گومان و قسە و باسێك نییە تیایان دا، مەگەر کەسێك بیەوێ لە خۆیەوە دەمبازی بکات و لەبەر خۆیەوە وەك نەخۆشێکی تادار وڕێنە بکات، وێنەو نموونەی زۆر هەیە هەر لەسەر زمانی زاناکان کە باسی بکەین و بیهێنینەوە بۆ دەم کوت کردنی ماددی و نەفام و بێهۆشەکان بەلاّم بۆ ئەوەی زیاتر باسەکە درێژە پێنەدەین کۆتاییم هێنا، هەرکەس ئەیەوێ با سەرنجی هەندێ لە نامەو نووسراوەکان بدات، وەك نامەی(الله یتجلی فی عصر

العلم) و نامەی(الإنسان ذلك المجهول). ئینجا پێویستە بدوێین لەبارەی سروشتی غەیبەوە لەبیرو باوەڕی ئیسلام و بۆچوونی ئیسلامدا، بێگومان کە قورئان سەرچاوەی سەرەکی و بنەڕەتییە بۆ عەقیدەو بیرو باوەڕی ئیسلام و بۆچوون و تێگەیشتنی ئیسلامی، بە روونی ئەفەرموێ: دوو جیهان جیهانی غەیب و جیهانی ئاشکرا، کەواتە نە هەموو شتێك غەیبە لای ئادەمی و نە هەموو شتێك ئاشکرایە، بێگومان چەند باو و یاسایەك هەیە بۆ ئەم بوونەوەرە کە ئادەمی ئەتوانێ ئەندازەی پێویستی لێ بناسێ بۆ هەڵسانی بە جێنشینی یەکەی لەم زەوییەدا، خوا دەسەڵات دارو توانای کردووە بەسەر ناسینی ئەو ئەندازەیە لەو یاسا و باوانەی ئەم بوونەوەرە، بەکارهێنان و ژێر بار کردنی هێزو وزەکانی ئەم بوونەوەرە تا بتوانێ ئەم زەوییە ئاوەدان بکاتەوە و هەڵسێ بە کارو فرمانی جێنشینی یەکەی تیایدا، گەشە پێدان و سوود وەرگرتن لە خۆراك و رۆزی و هێزو وزەکانی زەوی، ئینجا لەگەڵ ئەو هەموو باو و یاسا دامەزراوانەدا، ئیرادەو خواهیشی خوا بەر بەرەلاّ و زاڵە، هیچ کام لەوانە رێی لێناگرێ و بەرهەڵستی ناوەستێ، قەزاو قەدەری خوایش لە مەیدانی دایە و ئەو هەموو شتێك جێبەجێ ئەکات و زاڵە بەسەر ئەو هەموو یاسا و باوانەدا، ئەو قەزا و قەدەرەش شتێکی غەیبە و هیچ کەس ئاگای لێ نییە بە زانینێکی تەواو، ئەوپەڕی ئەوەیە کە گومانی بۆ ببرێ، ئەوەش شتێکە کە زانین و زانیاری ئادەمی دانی پیا ئەنێ بە بێ سەرپێچی، بە ملیۆنەها کارو کردەوە پێك دێت لە گیان و لەشی ئادەمیدا هەمیشە و هەموویشی غەیبە بە لایەوەو هیچ ئاگای لێ نییە، ئیتر با بوەستێ کارو کردەوەو رووداوەکانی ئەم بوونەوەرە.

غەیب چوار دەوری ئادەمی داوە لە رابردوو و ئێستاو داهاتوویدا وەك چوار دەوری هەموو ئەم بوونەوەرە پان و پۆڕەی داوە، ئەم ئادەمی یە دێت بۆ ئەم جیهانە و لێی دەرئەچێ بە بێ ئەوەی هیچ دەسەڵات و زانینێکی ببێ نە لە هاتن و نە لە دەرچوونیدا، هەروەها هەموو زیندوو و زیندەوەرێکی تریش، بە هەندێ بیر کردنەوە لەم باس و لێکۆڵینەوەی کە تێپەڕی کرد دەرکەوت بە روونی کە بڕوا بوون بە غەیب نیشانەی ژیریی و زانینە، بڕوا نەبوون پێی نیشانە و بەڵگەیەکی روونە لەسەر نەفامی و نەزانی و تێنەگەیشتن وەك دەرکەوت کە ئیسلام باوەڕی هەیە بەو غەیبەی کە تەنها خوا ئەزانێ و ئاگایە بە کلیل و خەزنە و کانەکانی، لە هەمان کاتدا باوەڕی هەیە بە باو و یاساکانی ئەم بوونەوەرە کە هەرگیز ناگۆڕێن و

دامەزراون، ئادەمی دەست بۆ زانین و ناسینی هێندێ لەوانە و بەکارهێنانیان لە ژیانی ئەم جیهان و زەوییە دایە، کەواتە موسڵمان باوەڕی هەیە کە ئادەمی بە پێی پێویست دەست ئەدات بۆ زانین و زانیاری یەکی سنووورداری خۆی وەك باوەڕیشی هەیە بەو غەیبەی کە تایبەتییە بە خواوەو هیچ کەسێکی تر ئاگادار نییە پێی مەگەر کەسانێك کە خوا ویستبێتی ئاگاداریان بکات بەسەریدا و بە پێی ویست و خواهیشی خوا، کەواتە یەکێ لە هۆی جیابوونەوەی ئادەمی لەو گیانلەبەرو ویست و خواهیشی خوا، کەواتە یەکێ لە هۆی جیابوونەوەی ئادەمی لەو گیانلەبەرو زیندەوەرانەی تر بڕوا کردنە بە غەیب، کە ئەو گیانلەبەرانەی تر بێبەشن لێی و هەر بڕوایان بە شتێ هەیە و هەر شتێ ئەناسن کە هەستی پێئەکرێ و لە سنووری هەستیارەکاندایە، ئەوانەی کە ماددی و بێ بڕوان هەرچۆنێ بەو جۆرە دەم ئەکوتن سەبارەت بە غەیب و بڕوا بە غەیب بە شتێکی ناڕەوا سەیر ئەکەن و بە دژی زانینی دائەنێن، ئەوانە هەروەها وتەیەکی تریش دێت بە دەمیاندا کە پێی ئەڵێن:(الحتمية التأريخية) واتە بڕیاردان لەسەر شت بەدەم بڕ و هەواڵ پێدانی بە شێوەیەکی قەتعی. ئەوەی کە مارکس گوتی بڕیاری لەسەردا کە شیوعییەت لە ئینگلتەرەدا بەرپا ئەبێ لەبەر ئەوەی زۆر پێشکەوتوو بوو لەو کاتەدا، کەچی لەو شوێنانەدا بەرپا بوو کە دوا کەوتوو ترین بوو وەك روسیا و چین و شوێنە دواکەوتووەکانی تری ئەو چەرخە، هەرگیز لە شوێنە پێشکەوتووەکاندا بەرپا نەبوو، هەروەها وەك ئەوەی کە لینین لە پێشەوە و لە پاشان ستالین بڕیاریان لەسەر دا کە بێگومان جەنگ بەرپا ئەبێت لە نێوان سەرمایەدارەکان و شیوعییەکانی جیهاندا، لە کاتێکدا لە پاش ئەوان(خرۆشۆف) هاتە کایەو جاڕی ئاشتیدا و بانگی ئەکرد بۆ ژیان لە نێوان هەمووواندا بە ئارام و ئاشتی! هەروەها گەلێ شتی تر کە بەدەم بڕ گوترا و بڕیاری لەسەر درا و بە درۆ دەرچوون، لە دوا رۆژو سەرەنجامدا چاك وایە درێژە نەدەین بەم باسە، چونکە شیاوی ئەوە نییە لێکۆڵینەوەی تیا بکرێ.

وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ

---

لەپاش ئەوەی بەو جۆرو شێوە نایاب و کەس نەدیوە باسی زانین و ئاگاداری یە گشتی یەکەی خوای کرد لەپاش ئەوە ئینجا باسی هێندیٚ لە زانراوەکان ئەکات لە نەفسی ئادەمیدا، هەروەها بەرهەمێك لە بەرهەمەکانی دەسەلاٌت و چاودێری و(رقابة) هەمیشەیی یەکەی ئەفەرمویٚ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ﴾ هەر خوایە ئەو کەسەی کە ئێوە ئەخەوێنیٚ لە شەودا ﴿وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ﴾ ئەزانیٚ و ئاگایە بە هەر کارو کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن لە رۆژدا، بێگومان هەر خوا ئەمان خەوێنیٚ لە رۆژیشدا و ئاگاداریشە بە هەموو کردەوەکانمان لە شەودا، بەلاٌم لەبەر ئەوەی زۆرتر خەون لە شەودایە و شەو کاتی راستەقینەی خەوتنە، هەروەها زۆتر رۆژ کاتی راستەقینەی کارو کردەوەیە، لەبەر ئەوە بە تایبەتی باسی خەوتنی شەو و کردەوەی رۆژی کرد. ﴿ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ﴾ ئینجا لە خەو بێدارتان ئەکاتەوە لە رۆژدا ﴿لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗى﴾ بۆ ئەوەی تەواو بکریٚ و بەجیٚ بهێنریٚ ئەجەل و ماوەیەکی ناوبراوی دیاری کراو بۆ هەرکەسێك لەم جیهانەدا ﴿ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ﴾ ئینجا هەر بۆلای خوایە گەرانەوەتان کاتیٚ کە مردن، ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ ئینجا پاش ئەوە هەواڵتان پێئەدات بە هەر کردەوەیەك کە لە جیهاندا کردووتانە و پرسیارو حیساب و تۆڵە و پاداشتتان بە پێی دادو کاردروستی خوا ئەبێت.

بەراستی زۆر پێویستە بیر کردنەوە لەم ئایەتە: لە یەکەم جارەوە لاوازی ئادەمی ئەخاتە پێش چاو کە چۆن هیچی خۆی بەدەستی خۆی نییە، ئەوەتا وەك مردووی لێئەکات، فام و هۆش و هەستی لیٚ ئەسێنیٚ بە وێنەی مردوو و پێی ئەداتەوە بە بیٚ ئەوەی هیچ دەسەلاٌتێکی ببیٚ نە لە لێسەندنەوەو نە لە پێدانەوەکەیدا، بەڵکو هەردووبارەکەی بەدەست

خوایه، ئینجا سەرنجی رائەکێشێ بۆ ئەوەی کە خوا ئاگادار و زانایە بە هەموو کردەوەو ئارام و بزووتنەوەی چاك و خراپ، کەواتە هەمیشە وا لە ژێر رەقابە و چاودێریی خوادا، ئینجا تێی ئەگەیەنێ کە ماوەو ئەجەلێکی دیاریی کراوی هەیە و بە هیچ کلۆجێك دواو بەر و راکردنی نییە لێی، ئەبێ بگەڕێتەوە بۆلای چاودێر و موراقیبەکەی، ئینجا دەفتەر و نامەی کردەوەکانی ئەخرێتە روو بە ئەوپەڕی دادو دادپەروەریی، دەست نیشان ئەکات بۆ راستی و گونجاوی زیندوو بوونەوە بەمەی ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر زیندوو کردنەوە لە مردنی خەو، دەسەڵاتی هەیە بەسەر زیندوو کردنەوە لە مراندنی راستەقینەدا، لەم ئایەتە کورتەدا ئەو هەموو شتە گرنگە نیشان ئەدات کە بە راستی لە دەست قورئان دێت ئەو جۆرە شتانە، هەرکام لەم جۆرە ئایەتانە بە تەنیا موعجیزەو بەڵگەیەکی روونە لەسەر راستی و گەورەیی ئەم قورئانە و بەسە بۆ هەرکەسێك کە چاوی دڵی بینا بێ!!

ئینجا دەست کارییەکی تری دڵ ئەکات بەمەی سەرنجی رائەکێشێ بۆلای ئەو هێزو دەسەڵاتە بێ سنوورەی خوا کە زاڵە بەسەر بەندەکانیدا لە هەموو بارو روویەکەوە، بۆلای ئەو چاودێریی و ئاگاداری یە هەمیشەیی یەی کە هەیەتی بەسەریانەوە، بۆلای ئەو قەزاو قەدەرەی کە هەیە و بە هیچ کلۆجێك دواو بەر ناکات، بۆلای ئەو چارەنووس و دوا رۆژەی کە لادان و خۆ پەنادان و راکردن نییە لێی، بۆلای ئەو پرسیار و حیسابەی ئەو جیهان کە مۆڵەت نادا، ئەوانە لەو غەیبانەن کە دەوری ئادەمی داوە، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ هەر ئەوە زاڵ و دەسەڵات دارە بەسەر بەندەکانیدا هەموو بەندەکانی وان لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا، هەموو بێ دەسەڵات و لاوازن لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا. ئەمان هەموو مل کەچن ﴿وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً﴾ رەوانە ئەکاتە سەرتان چەند مەلائیکە و فریشتەیەك کە چاودێر و پارێزەرن و نووسەری کردەوەکانتانن بە بێ ئەوەی ئاگامان ببێ لێیان، کەواتە لە هیچ کات و لە هیچ شوێنێکدا ئێمە تەنیا نین بەڕاستی ئەم هەستە بەسە بۆ ئەوەی ئێمە بێدار ببینەوە و فریای خۆمان بکەوین، ئەو پارێزەرانە خەریکن بە کارو فرمانی خۆیانەوە، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ هەتا کاتێ کە مردن دێت بۆ هەرکامێکتان، واتە کاتی مردنی دێتە پێشەوە لەوێدا

## ﴿تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا﴾

﴿تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا﴾ رەوانــە کراوەکانمــان گیــانی ئەکێــشیٚ، واتــە کۆمــەك و فــەرمان بــەرو بەردەستەکانی فریشتەی گیان کێش کە بەناوبانگە بە(عەزرائیل).(ئیبن جەریرو ئەبو الشیخ) ئەگێڕنەوە لە(رەبیعی کوڕی ئەنەس) ەوە کە پرسیار کرا لە(ئەنەس) لە بارەی گیان کێشانەوە کـە ئایـا فریـشتەی مـردن بـە تـەنیا گیـان ئەکێـشیٚ؟ ئـەویش لـە وەلاٌمـدا فـەرموی: ئـەو کـار بەدەستە و کۆمەك و بەردەستانی هەیە، ئەم ئایەتانـەی خوێنـدەوەو فەرموی ئەوانە هەن و بـەلاٌم فریـشتەی بـەناوبانگ سـەرۆکە. لـە(ئیبراهیمـی نەخـەعی و موجاهیـد و قـەتادە) ەوە ئەگێڕنەوە کە ئەو کۆمەکانە گیانەکان ئەکێشن لە لەشەکان و ئینجا ئەیدەنە دەست سەرۆك. لە(عەلەبی) یەوە ئەگێڕنەوە کە سەرۆك گیانەکان ئەکێشیٚ و ئەیداتە دەست ئەوان، بەم رەنگە گیـانی بڕواداران ئەدا بە فریـشتەی رەحمـەت و گیـانی بیٚ بڕوایان ئەدا بە فریـشتەی سزا، ئەوانیش گیانەکان ئەبەن بۆ ئەو شـوێنەی کە خوا فـەرمانیان پێئـەدات، بەهـەرحالٌ و لەسـەر هەربار گیانەکان چەند جۆرو بەشێکن و مردنیش چەند جۆر و شێوەی هەیە، گیـان کێشانی چەند هەزارەها لە هەموو کاتێکدا و دانانی هەرکام و هەر جۆری لە شوێنی شیا و شایـستەدا کردەوەیەکی گەورەو فراوانە، ئەبیٚ چەند فروستادەیەك هەلٌسن پێی. لە هێنـدیٚ ئایەتـدا خـوا ئەکات بە گیان کێش ئەوەش یان لەبەر ئەوە کە خوا فەرمانـدار و کاربەدەسـتە بۆ هـەموو یـان لەبەر ئەوەیە کە لە راستیدا هـەموو شتیٚ خـوا ئـەیکات و خـوا بەدیهێنـەر و فەراهـەم هێنـەری هەموو شتێکە، ئەو فروستادەو نێرراوانە هەلٌئەسن بە فەرمانی خۆیان،

وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ

---

**﴿وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ﴾ لەكاتێکدا کە ئەوان هیچ سستی و کەم و کوڕی و دوا و بەر بەکار ناهێنن و چۆنیان پێ سپێرراوە هەر بەو جۆرە ئەکەن، کەواتە هەموو کەسێك هەناسەکانی ژمێرراو و دیاریی کراوە، ماوەی ژیانی خۆی هەیە بە بێ دواو بەر، ئەمیش هیچ ئاگای لەو شتە غەیبانە نییە، بەڕاستی ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە بەسە بۆ ئەوەی کە مەردوم بکەوێتە دڵە لەرزە و چاوەڕوانی ئەجەلی خۆی. هەموو کەسێك بەو جۆرە ماوەی ژیانی ئەبڕێ و گیانی ئەکێشرێ لە کاتی دیارییکراوی خۆیدا. ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئینجا لەپاش زیندوو کردنەوە ئەگێڕرێنەوە بۆ حوکم و بڕیاری خواو بۆلای شوێنی حیساب و بۆلای دادگای خوا ﴿مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ﴾ کە ئەو خوایە خاوەن و کاربەدەستی راستەقینە و پەرستراوو هاوار لێکراوی راستەقینەی خۆیانە لە هەموو بار و روویەکەوە، ئەگێڕێنرێتەوە بۆلای ئەو خاوەنەیان کە لە یەکەم جارەوە دایهێنان و دروستی کردن، گیانی کردن بەبەردا و ژیاندنی لە جیهاندا تا ماوەیەکی دیاریی کراوی خۆیان لە ژێر ئاگاداری و چاودێریی خۆی دا، ئینجا کاتێ کە ویستی گێڕاندنی یەوە بۆ ئەوەی حوکم و بڕیاری خۆی بەدی بێنێ تێیاندا، ﴿أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ﴾ بێدار بنەوە کە حوکم و بڕیار هەر بۆ ئەوە لەو رۆژەدا، واتە لەو رۆژەدا هیچ کەسێکی تر هیچ شتێکی بە دەست نییە بە رووکەش و رواڵەتیش، نەك وەك لەم جیهانەدا کە بە رواڵەت کەسی تریش هێندێ شتی بەدەستە، ﴿وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ﴾ خوا چەسپانتری هەموو ژمێرەر و حیساب کەرانە، بەم رەنگە لە کاتێکی زۆر کەم و کورتدا موحاسەبەی هەمووان ئەکات – وەك لە حەدیسدا هاتووە – چونکە هیچ شتێك خوا خەریك ناکات لە شتێکی تر، کەواتە حیسابی هیچ کەس دواناکەوێ لە حیسابی هیچ کەسێکی تر، هیچ کەسێك مۆڵەت نادرێ نە لە حیساب و نە لە تۆڵە و سزادان و پاداشت دانەوەدا.(ئیمامی عەلی) – خوای لێ رازی بێت – وێنەو نموونەیەکی شیرین ئەهێنێتەوە بۆ تێگەیشتن لەم مەسەلەیە، ئەفەرموێ: خوا رۆزی هەمووان ئەدات بە یەکجار و لە یەك کاتدا بە بێ ئەوەی رۆزی دانی هیچ کەس خوا خەریك**

بكات لە رۆژی دانی هیچ گیانلەبەرێكی تریان بێ بەهۆی دواكەوتنی!! تێگەیشتن و بۆچوونی موسڵمان بەم جۆرە لەم كار و مەسەلەیەدا بەسە بۆ ئەوەی هیچ جۆرە گومان و دوو دڵی یەك ببێ لەمەدا كە تەنها خوا حاكم و بڕیار دەرە لە هەموو كاروباری بەندەكانیدا لەم زەوی و جیهانەدا. بێگومان حیساب و بڕیارو تۆڵە و پاداشت لە رۆژی دواییدا لەسەر كردەوەی مەردومە لەم جیهانەدا، پرسیارو موحاسەبەیان بە پێی ئەو شەریعەتەیە كە خوا ناردی هەر شەریعەتی خوا ترازووە بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو شتێ، كەواتە یەكەم شتێ كە لەو رۆژەدا پرسیارو موحاسەبەی لەسەربكرێ ئەوشەریعەتانەیەكەخواناردنی بۆبەندەكانی و راگەیەنرا پێیان.

ئینجا بێ بڕواكان حەواڵەی سروشتی خۆیان ئەكاتەوە، ئەو سروشتەیان كە خوای خۆیان ئەناسن و لەكاتی تەنگاوەدا بێ پەروا پەنای پێ ئەبەن و هاواری لێئەكەن، كەچی لەكاتی خۆشی و ئارامدا ئەوەیان لەبیر ئەچێ و یاخی ئەبن، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان ﴿مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ ئایا كێ ئێوە رزگار ئەكات لە تاریكی یەكانی دەریاو وشكانی، واتە لە راو و داوو بەسەرهاتە سەخت و سامناكەكان كە هەست و هۆش ناهێڵن و ژیریی سەرگەردان ئەكەن وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت كراوە، یان مەبەست تاریكی یە ئاشكراكانە وەك تاریكی شەو و هەور و باو تەم و دەریا و هەر تاریكی یەكی تر، ئایا كێ رزگارتان ئەكات لەو تاریكی یانە ﴿تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ لەكاتێكدا كە ئێوە ئەپاڕێنەوە لە خواو هاوار و نزای لێئەكەن بە ئاشكراو نهێنی، ئینجا پەیمان ئەدەن و ئەڵێن: ﴿لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر رزگارمان بكات لەمە، واتە ئەم تاریكی یانە كە تێی كەوتوین بەسەرمان هات ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ بێگومان لە سوپاس كەرانی خوا ئەبین و دامەزراو و هەمیشەیی ئەبین لەسەر سوپاس و گوێرایەڵی بۆ خوا لەسەر ئەم چاكەیە، یان لەسەر هەموو چاكەكانی كە ئەم رزگار كردنە یەكێكە لێیان. ئەم حاڵ و بارە شتێكی ئاشكرایە و چەند جار بینراوە.

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿قُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان ﴿ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ﴾ خوا ئێوە رزگار ئەكات لەوانە و لە هەموو نارەحەتی و غەم و پەژارەیەكی سەخت كە دڵداگیر ئەكات، واتە تەنها خوا ئەوە ئەكات و بێجگە لەو كەس نایەت بەو هاوارەتانەوە و كەس ناتوانێ بێجگە لە خوا كە هەڵسێ بەو فریاد رەسی یە.

ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّۚ

---

لەپاش ئەوەی فەرمانیدا کە باری راست و رەوا نیشان بدات، ئینجا هەڵوێستی بەد و خراپیان ئەدا بەناوچاویاندا کە بە راستی مایەی سەرسوڕمانە، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ﴾ ئینجا ئێوە هاوبەش رەوا ئەدەن و دای ئەنێن بۆ خوا و واتە کار و هەڵوێستەکەتان بەدەو دوورە لە ژیریی یەوە، چونکە ئەبوایە سوپاسی گوێرایەڵیتان بکردایە بەرامبەر ئەو چاکە و میهرەبانی خوا، کەچی لەباتی ئەوەدا هاوبەش دائەنێن بۆی.

ئینجا لێرەدا بەرەنگاریان ئەوەستێ و ئەیانترسێنێ بە سزایەك کە لەوانەیە دووچاری بین لە پاش ئەو رزگار کردنە کە دەرچوون و رزگار بوونیان نەبێ لێی. ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ پێیان بڵێ: ﴿هُوَ ٱلۡقَادِرُ﴾ هەر ئەو خوایە توانا و بەدەسەڵاتە ﴿عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا﴾ بەسەر ئەوەی رەوانە بکاتە سەرتان سزایەك ﴿مِّن فَوۡقِكُمۡ﴾ لەلای سەروتانەوە ﴿أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ﴾ یان لەلای خوارو ژێر پێتانەوە ﴿أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا﴾ واتە یا سەرتان لێئەشێوێنێ و سەرتان لێ تێك ئەدا ئەتان دات بە گژ یەکتردا و جەنگ و ئاژاوە ئەخاتە ناوتان بەمەی ئەتان کات بە چەند تاقم و کۆمەڵێك کە جیاواز و دووبەرەکی بن و دوژمن و ناکۆك بن لە نێوان یەکتردا و هەر کۆمەڵێك دوای شتێك بکەون، یان مەبەست ئەوەیە تێکتان بەر ئەداتە یەکتر و تێکەڵ و پێکەڵتان ئەکات ﴿وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ﴾ ئەچەژێ بە هێندێکتان سزاو ئازارو ناخۆشی هێندێکی ترتان، کە ئەو سەر لێ تێکدان و دووبەرەکی و جەنگ و ئاژاوە ناخۆشترین بەسەرهاتە. ئەو سزایەی کە قورئان هەڕەشەی پێکرد تەفسیر کراوەتەوە بە چەند شتێك هینی لای سەروو بە پیا هەڵشاخانی مەلائیکە لەلای سەرەوە، بە بەردە باران و بای سەمت و تەرزە و باران کە ئەمانە روویان داوە لە گەل و ئوممەتە پێشووەکاندا، هی لای خواروو بە بومەلەرزە و رۆچوونە خوارەوە بە ناخی زەویدا و خنکان و نوقوم بوون لە دەریا و ئاودا کە ئەمانەش هەر روویان داوە لە پێش ئەم ئوممەتەدا، بەڵام تایبەتی نەکرێن هەر بەوانەی لەمەو پێشەوە، بەڵکو گشتی بکرێن لەوان و لەم هەمووی تریش کە لەم دوایی یەدا پەیدا بوون وەك بۆمبا و غازی

کیمیاوی و ساروخ و ئەڵغام و غەواسەی ناو دەریاکان و هەر شتێکی تریش وێنەی ئەمانە کە لە داهاتوودا پەیدا ببێ، ئەبێ ئەمانەش هەر مەبەست بن، چونکە خوای نێرەری ئەم قورئانە زاناو ئاگایە بە هەموو غەیب و نادیارییەکان، لە حەدیسدا هاتووە فەرمودەیەك کە دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە،(ئیمامی ئەحمەد و ترمزی) ئەگێڕنەوە لە(سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصە) وە کە ئەفەرموێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە کە خەریکین پێیەوە: لە وەڵام دا فەرموی: ئاگاداربن ئەمەی کە لەم ئایەتەدایە لەمە و پاش بەدی دێت و هێشتا نەهاتووە. ئینجا جۆری سێ یەم شێوەیەکە لە سزای دوور و درێژ کە خەڵکی بەدەستی خۆیان و بە مەیلی خۆیان فەراهەمیان هێناوەو فەراهەمی ئەهێنن، چونکە خوا بەرنامەو ڕێگەیەکی راست و رەوا و گونجاوی پێداون کە ئەبوایە هیچ کەس لێی لانەدایە، کەچی بەداخەوە لەو ڕێگە و بەرنامە پاك و راستە لائەدەن و هەرکەس شوێنی کەسێ یان شتێ ئەکەوێ بە پێی جیاوازی مەردومان لە تێگەیشتن و بۆچوون و ئارەزوودا، ئینجا هەرکەس و هەر کۆمەڵێك بەرگری ئەکات لە هەڵبژێرراوی خۆی بە هۆی ئەوەوە دووبەرەکی و دوژمنایەتی و جەنگ و بێ ئارامی پەیدا ئەبێت لە نێوانیاندا.

خوای پەروەردگار بەچەند جۆر و شێوەیەك فەرمودەکانی و بەڵگە و نیشانەکان نیشان ئەدات و ئاراستەی بەندەکانی ئەکات تا بە باشی تێبگەن و وەریان گرن و بەهۆی ئەوەوە بگەڕێنەوە لە گومرایی و ڕێ راستەکەی خوا بدەنە بەر، وەك ئەفەرموێ: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ سەرنج بدە کە چۆن ئێمە وتەو ئایەتەکان وەرئەگێڕین لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر لە بەر روون کردنەوەی مەبەست و نزیك خستنەوەی لە زانین و تێگەیشتنەوە ﴿لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە تێبگەن و وەریان گرن و بگەڕێنەوە و کۆتایی بێنن لەوەی کە وان لەسەری. لە پاش ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە ئاشکرایانە لەسەر راستی ئەم قورئان و ئایینە، لە پاش ئەو هەڕەشە سامناکانەی کە کردی لە بێ بڕواکان، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ﴾ گەل و نەتەوەکەت بڕوایان نەهێنا بەو قورئانە و بە درۆیان دانا ﴿وَهُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ لەکاتێکدا کە هەر ئەو راست و هەقە، کەواتە ئەبێ گوێ نەدەین بە بڕوا نەهێنانی ئەوانە و بەڵکو دڵنیایی و دڵئارامی هەر بەم قورئانە هەق ببێ،

قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾

**ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) بەم شێوەیە: ﴿قُلْ﴾ پێیان بڵێ: ﴿لَسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾ من پارێزەر و زاڵ نیم بەسەرتانەوە کە بە زۆر بڕواتان پێ بێنم، کارو باری ئێوەم پێ نەسپێرراوە، بەڵکو من هەر راگەیاندنم لەسەرە، ﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ﴾ بۆ هەموو هەواڵێك کاتێك هەیە بۆ رووداو و پەیدا بوون و بەدی هاتنی، کاتی دیاریی کراو کە خوا خۆی ئەیزانێ، ئیتر با لە جیهاندا یا لە رۆژی دواییدا یان لە هەردووکیاندا، ﴿وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ بێگومان لەمەوپاش ئەزانن راستی ئەم هەواڵەی کە قورئان دای، واتە راوەستن چاوتان بە خۆتان ئەکەوێ، بە کورتی ئەم هەڕەشەیەی ئاراستە کرد کە بە راستی زۆر سامناك و دڵ بێ ئارام کەرە بۆ هەرکەسێك کە فامیدە و دڵ بێدار بێت. هەرکەسێك کە لەسەر هەق و راستی بێ و دڵ ئارام بێ پێی و دڵ قایم و دڵ ئارام بێ بە نەمان و لەناوچوونی ناهەق، بەوەی لە کاتی دیاریی کراودا دەستی قودرەت ئەبێ بدا لە ناهەق و بەتاڵ، هەرکەسێك بەو جۆرە بێ دڵئارام و بێ باك ئەبێ و گوێی لە هیچ کۆسپ و گرێیەك نابێ و هەمیشە لەسەر رێ و رێبازەکەی خۆی دامەزراو ئەبێ و هەر رێگە راستەکەی خۆی ئەداتە بەر، جا چەندە پێویستە بۆ ئەوانەی بانگ ئەکەن بۆ رێگەی خوا کە بەو جۆرە بن لە بەرامبەر لاری و بڕوا نەهێنانی بانگ کراواندا، بەرامبەر هەر سزا و ئازارێك کە دووچار بین لێیانەوە، بەرامبەر هەر ئێش و ئازار و ماندوویی و دەردی سەریەك کە دێتە رێیان، ئای چەندە پێویستی یان هەیە بەم دڵئارامی یەی کە قورئان دای ئەڕێژێ لەدڵ و دەروونا.**

**لەپاش ئەو راگەیاندن و هەڕەشەیە، ئینجا فەرمانیدا کە ئیتر لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەدا دانەنیشن – تەنانەت بۆ ئامۆژگاری و راگەیاندنیش – کاتێ کە بینی ئەوانە دەست ئەکەن بە دەمبازی و بێ شەرمی دەبارەی قورئان و ئایینی خوا هەتا کۆتایی ئەهێنن لەوە و دەست ئەکەن بە قسەو باسێکی تر، چونکە دانیشتن لەگەڵیان لەو کاتەدا بێزاری نیشان نادات لە**

قسەو دەمبازی یە بەدەی ئەوان، یان کەم غیرەتی ئەگەیەنیٚ و دەربەست نەبوون و گویٚ نەدان بە ئایینەکەی خوا، کە پێویستە لەسەر موسڵمان غیرەتی بۆ ئایینەکەی بەهێز تر بێت تا هەر شتێکی تر، ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ کاتیٚ ئەوانەت بینی کە دەست ئەکەن بە قسەی بەدو ناشایستە و دەمبازی لە ئایەتەکانی ئێمەدا — واتە قورئان — وەك ئەوە باوی قورەیش بوو کە لە کۆڕەکانیاندا ئەیانکرد، ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ ئەو کاتە روو وەرگێڕە لەوانە و پشتیان تێبکە و هەستە لایان ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ﴾ هەتا دەست پێئەکەن و ئەدوێن لە قسە و باسێکی تر غەیری ئەوەی کە ئەیان کرد و ئەیان گوت دەربارەی قورئان ﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ئەگەر شەیتان لەبیری بردیتەوە، بەم رەنگە دڵتی خەریك کرد بە شتێکی ترەوە هەتا ئەو فەرمانەت لە بیر نەما و بەهۆی ئەوە دانیشتی لەگەڵیان لە یەکەم جارەوە درێژەتدا بە دانیشتنەکەت لە پاش دەست پێکردنی ئەوان بەو قسە بەدانە، ئەگەر ئەو لەبیر بردنەوەت بوو ﴿فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئیتر لەپاش بیرکەوتنەوە دامەنیشە لەگەڵ ئەو ستەم کارانە و هەستە لایان. ئەم فەرمان و جڵەوگیریی یە لە رێوە بۆ پێغەمبەرە(ﷺ) ئەگونجیٚ لە پاش ئەو فەرمان بووبیٚ بۆ موسڵمانانیش، ئەم فەرمانە لە مەککەدا هات، کاتیٚ کە کارو کردەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە سنووری بانگ کردن و راگەیاندن تێپەڕی نەکردبوو، فەرمان نەهاتبوو بە جەنگ کردن، لەبەر هەر هۆیەك کە خوا ویستی لەو ماوەیەدا، بەهۆی ئەوەوە فەرمان هات کە دانەنیشیٚ لەناو کۆڕ و کۆمەڵی ئەو بیٚ بڕوایانەدا کاتیٚ کە بینی ئەوانە دەم درێژیی ئەکەن بەرامبەر بە ئایین و قورئانەکەی خوا. ئەگەر لە بیری نەبوو لەو کاتانەدا لەناویاندا بوو، بە گورجی هەڵسیٚ و بەجێیان بێڵیٚ کە هاتە بیری فەرمان و جڵەوگیریی یەکەی خوا، هەروەها موسڵمانانیش وەك لە هێندیٚ ریوایەتدا هاتووە، لە پێشەوە فەرمان بەو جۆرە بوو، بەڵام لە پاش ئەوەی لە مەدینەدا دەوڵەت پێك هات فەرمان هات بە جەنگ و بەرگری هەتا کەس نەتوانیٚ سەرکێشی بکات و یاخی ببیٚ. ئینجا هەرچۆنیٚ بڕیاری جیابوونەوەو موقاتەعەیدا لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو بیٚ بڕوایانەدا لە کاتی دەم درێژیی کردنیاندا، هەروەها ئەو بڕیارە ئەدا لە نێوان بڕواداران و ئەواندا و دەست نیشان ئەکات بۆ جیاوازی دوا رۆژ و چارەنووسی هەردوو تاقمەکە،

وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا

**ئەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ﴾ ئەوانەی کە لە خوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لە کارو کردەوەی ئەو بێ بڕوایانە کە دەم درێژیی ئەکەن لە ئایەتەکانی خوادا، ئەو خۆ پارێزەرانە هیچ شتێك لە حیساب و پرسیار و تاوانی ئەو بێ بڕوا دەم درێژیی کەرانەیان لەسەر نییە و پرسیاری کردەوەکانی ئەوانیان لێناکرێ و تاوانەکانی ئەوان روویان تێناکات ﴿وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ﴾ بەڵام لەسەریانە ئامۆژگاری و جڵەوگیریی یان لەو کردەوە بەدانە بە پێی توانا، لەسەریانە ئەو ئامۆژگاری و جڵەوگیریی یە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بە ئومێدی ئەوە و بەڵکو ئەو بێ بڕوایانە لە خوا بترسن و خۆیان بپارێزن لەو تاوان و کردەوە بەدانە کە کردیان.**

**ئەم ئایەتە بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە گوتمان لە دڵدا جێگیر و دامەزراوە و رێکە لەگەڵ ئەوەی کە لە(ئیبن و عەباس) ەوە هاتووە کە ئەفەرموێ: کاتێ کە موسڵمانان جڵەوگیریی کران لە دانیشتن و کۆڕ گرتن لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەدا گوتیان: ئەگەر ئێمە پێویست بێت هەستان لە کۆڕ و کۆمەڵی ئەوانە لە کاتی دەم درێژیی کردنیاندا ئەبێ نەتوانین بچینەماڵی خواو تەواف نەکەین، چونکە ئەوانە هەمیشە خەریکن بەو تاوان و دەم درێژیی کردنەوە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، هەروەها ئەم تەفسیرە رێك و پێك و گونجاوە لەگەڵ ئایەتی(١٤٠) ی سورەتی(النساء) دا، لەوێ تەفسیرمان کردووەتەوە با سەرنج بدرێ، ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر ئەو دوور کەوتنەوەو دوورە پەرێزی و هاوڕێتی نەکردنە، ئەفەرموێ: ﴿وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا﴾ ئەی پێغەمبەر، هەروەها هەموو بڕوادارێك لە پاش ئەو، واز بێنە و روو وەرگێڕە لەوانەی کە ئایینەکەیان، واتە ئەو ئایینەی کە بۆیان هاتووە لەلایەن خواوە و داوایان لێکراوە هەڵسان پێی و راگیر کردنی، ئەو ئایینە راستەیان وەرگرتووە و گێڕاویانە بە شتێکی بێ نرخ و بێ سوود و بێ هودە و بە گاڵتە و رابواردن بە شتێکی خەریك کەر لە شتی گرنگ و مەبەست. واتە لاقرتی ئەکەن پێی و بە شتێکی بێ نرخی سەیر ئەکەن،**

وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾

﴿وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ژیانی جیهان هەڵیخەڵەتاندوون، بەم ڕەنگە باوی ئەدەن بەسەر ژیانی نەبڕاوەی ئەو جیهاندا، یان هەر ئەم ژیانەیان بەوە ڕاستە و بڕوا ناکەن بەو ژیان، واز بێنە لەوانە تێکەڵییان مەکە و گوێیان پێ مەدە ﴿وَذَكِّرْ بِهِۦٓ﴾ پەندو ئامۆژگاری بکە بە قورئان ﴿أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ﴾ لەبەر ئەوەی بەند نەکرێ و نەگیرێ و نەبەسترێتەوە هیچ کەس و هیچ نەفسێك بە کردەوەیەك کە کردوویەتی، واتە ئامۆژگاری بکە بە قورئان و بترسێنە ئەو بێ بڕوایانە تا بگەڕێنەوە لە کردەوە بەدەکانیان تا لە ڕۆژی دواییدا بەند نەکرێن لە ئاگردا لە باتی ئەو کردەوە بەدانەی کە کردوویانە لە جیهاندا، کە ئەو کەسانە و ئەو نەفسانە ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ نییە بۆیان لەلایەن غەیری خواوە هیچ دۆست و کاربەدەستێك و هیچ خزمێك کە کۆمەك و یارمەتی دەریان بێ، نییە بۆیان هیچ تکاکەرێك کە تکایان بۆ بکات ﴿وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ﴾ ئەگەر هەموو فیدا و بریتی یەك بدا لێیان وەرناگیرێ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئەوانەی کە ئایینەکەی خوایان گێڕا بە شتێکی بێ نرخ و بێ سوود و بێ هودەو ژیانی جیهان هەڵیخەڵەتاندن ﴿ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ کەسانێکن کە بەند ئەکرێن بەهۆی کردەوەیەك کە کردوویانە، ئینجا بەسەرهات و دوا ڕۆژی ئەوانە باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ﴾ بۆ ئەوانە هەیە هەر خوراوەیەك لە ئاوی زۆر گەرم و بە کوڵ، واتە ئەوەی کە بە ئاگری دۆزەخ هاتبێتە کوڵ، بۆیان هەیە هەر سزایەکی زۆر ئازار دەر بەهۆی ئەوەی بڕوایان نەهێنا لە جیهاندا و بەردەوام بوون لەسەری، خوا پەنامان بدات – آمین –. لەم ئایەتەوە چەند شتێك وەرئەگیرێ:

١- پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها هەموو موسڵمانێك فەرمانی پێدرا كە واز بێنێ لە هاوڕێتی و هاونشینی ئەوانەی كە ئایینەكەی خوا بە سووك و بە بێ نرخ سەیر ئەكەن، ئیتر ئەوەش بەدەم و بە وتن بێ یان بە كردەوە، كەواتە ئەو كەسانەی كە ئایینی ئیسلام ناگێڕن بە بناغە و بنەڕەتی ژیانیان لە هەموو بارو رووبەكەوە، ئەوانە رێزیان نییە بۆ ئایینەكەیان، بە سووك و بێ نرخی دائەنێن و لاقرتی پێ ئەكەن، كەواتە بەری هەڕەشە و بڕیارە سەخت و سامناكەكەی ئەكەون، وەك ئەو كەسانەی كە باسی غەیب ئەكەن بە لاقرتی یەوە و باوەڕ كەرانی غەیب بە گێل و نەفام دائەنێن، یان باسی زەكات ئەكەن و بەشتێكی بێ نرخی دائەنێن لە ژیاندا، یان باسی شەرم و رەوشتی پاك و داوێن پاكی ئەكەن بەوەی كە باو و رەوشتی كۆمەڵی كشت و كاڵ كەرانە، یان باوی سەردەمی دەرەبەگی یە، یان هینی بورجەوازیەكانە كە شتێكی دامەزراو نین، یان هەر شتێكی تر كە لە ئیسلامدا شتێكی گرنگ و پیرۆزن، بە كورتی ئەوانەی كە هەر شەریعەتی خوا نەكەن بە حەكەم و حاكم لە ژیاندا، لایان وابێ كە مەردوم خۆی رێی هەیە و سەربەستە بۆ دانانی رژێم و بەرنامەی ژیان، هەموو ئەوانە بەری بڕیارو هەڕەشەی ئەم ئایەتە ئەكەون ئایینی خۆیان گێڕاوە بە شتێكی بێ نرخ و بێ سوود، موسڵمانان ئەبێ بپچڕێن لێیان و تێكەڵییان نەكەن مەگەر بۆ ئامۆژگاری و تەمێ كردن.

٢- پێویستە لەسەر موسڵمانان هەڵسن بە تەمێ و ئامۆژگاری ئەوانە و ترساندنیان لە بەند كردنیان بەهۆی كردەوەكانیانەوە.

٣- ئەم ئایەتە وا نیشان ئەدات كە ئیسلام ئایینی هەمووە، چ ئەوانەی كە بڕوایان پێهێناوەو چ ئەوانەی كە بڕوایان پێی نەبێ.

٤- سنووری هاونشینی و تێكەڵی لەكاتی دەم بازی و بەد گۆیی ئەو بێ بڕوایانە هەر ئەوەیەكەئامۆژگاری وتەمێ بكرێن و بترسێنرێن، ئیتر بێجگە لەوە نابێ و دروست نییە، هەروەها تێكەڵی هەر گوناهكار و تاوانبارێكی تریش لەكاتی گوناهو تاوانەكەدا.

﴿قُلۡ أَنَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِي ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ حَيۡرَانَ لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَاۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۖ وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُۚ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ

**ئینجا فەرمان ئەدات کە پێغەمبەر(ﷺ) شێوە پرسیارێك ئاراستە بکات بۆ بێزاری دەربڕین زۆر بە توندی لە هاوار و نزا کردن و پەرستنی غەیری خوا. ئیتر ئەو بێزاری دەربڕینە بۆ دەم کوت کردن و بەرپەرچ دانەوەی بت پەرستەکان بێت کە داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە هاوبەشی یان بکات لە پەرستنی بتەکانیاندا تا ئەوانیش هاوبەشی ئەم بکەن لە پەرستنی خوادا، یان مەبەست هەر بێزاری دەربڕین بێ لەو بارو حاڵەی کە ئەو بت پەرستانەی لەسەرە کە واز دێنن لە پەرستنی خوا شتێکی تر کە بێ دەسەڵاتە و هیچ سوود و زیانێکی بەدەست نییە و مەبەست جاڕدان و دەربڕینی پچڕان و دوور کەوتنەوە و دوورە پەرێزی بێت لەو بێ بڕوایانە و ئەو بیرو باوەڕو کارە بەدەی ئەوان کە هەموو ژیریی یەکی ساغ دژیەتی و لەسەر هەر بار مەبەستەکە هەر یەکە، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: واتە فەرمانەکە زۆر گرنگە و فەرمانی خوایە و تۆ ڕاگەیەنەری، بڵێ: ﴿أَنَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا﴾ ئایا ئێمە تێپەڕ بکەین لە پەرستنی خوایە کە هەموو شتی بە دەستەو ئەو خوایە نەپەرستین و هاواری لێنەکەین و هەر شتێکی تر بپەرستین کە هیچ سوودێکمان پێ ناگەیەنێ لە پەرستنەکەیدا، هیچ زیانێکمان پێناگەیەنێ لە نە پەرستنەکەیدا، ﴿وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا﴾ پاشەڵپاش و بەدوادا وەرگەڕێینەوە ﴿بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾ لەپاش ئەوەی خوا ڕێنموونی کردین و خستینیە سەر ڕێگەی خۆی و ڕزگاری کردین لە گومڕایی؟ واتە ئایا لەپاش پێشکەوتن و بەرز بوونەوە تازە ئێمە بەرەو دواوە بۆ پەستی هەڵگەڕێینەوە بە قسەی گومڕا و**

سەر تێك دەر؟ ﴿كَٱلَّذِى ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ بە وێنەی کەسێك دێو و درنجان رای کێشن و بیبەن بۆ چۆڵ و بیابان لە زەوی دا ﴿حَيۡرَانَ﴾ بە سەرگەردانی و لادان لە ڕێگەی ڕاست و نەزانێ چی بکات و بۆ کوێ بڕوا ﴿لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٌ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى﴾ لە کاتێکدا کە چەند هاوڕێ و دۆستێکی ببێ کە بانگی لێبکەن و ڕێنموونی بکەن بۆ ڕێی ڕاست و پێی بڵێن ﴿ٱئۡتِنَا﴾ وەرە بۆلای ئێمەو ئەویش لەو نێوانەدا یەخسیر و داماوەو نازانێ بۆ کوێ بڕواو بە گوێی کێ بکات و بۆلای کام بڕوا. بەو سزا دەروونییە ئەژی کە هەمیشە دڵی بێ ئارام و دانەمەزراوە، ئینجا لەم کاتەدا بار و ڕێگەی دامەزراو و ڕاست نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ بڵێ: ﴿إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰ﴾ بەڕاستی هەر ڕێنموونی خوا کە ئایینی ئیسلامە ڕێنموونی یە و بێجگە لەو گومڕایی و لادانە لە ڕێگەی ڕاست، ئەم مرۆڤ و ئادەمی یە بە سەرگەردانی ئەخولێتەوە لە چۆڵ و بیاباندا هەرکاتێ وازبێنێ لەو ڕێنموونییە، یان لادا و بترازێ لە هەر شتێکی و بیگۆڕێ بە شتێکی تر، لا بداو بیگۆڕێ دووچار ئەبێ بە پێی لادان و گۆڕاندنەکەی، بێگومان ئەم ئادەمی یە لەلایەن خواوە دەسەڵاتدار کراوە بەسەر ناسینی هێندێ لە هێزو وزە و شتە نهێنی یەکانی ئەم بوونەوەرە، بۆ ئەوەی سوودیان پێ وەرگرێ لە کاروباری جێنیشینی یەکەی لە زەویدا، لە بەرز کردنەوەو گەشە پێدانی ژیان لەم جیهان و زەوییەدا. بەڵام دەسەڵاتدار نەکراوە بەسەر ناسینی زانینی زۆر لەو غەیب و نهێنی یانەی کە دەوری داون لە هەموو لایەکەوە، کە یەکێ لەوانە ژیریی و گیانەکەیەتی، بەڵکو غەیب و نهێنی یەکانی کارو پیشەکانی لەشی و ئەو هەموو هۆیانە کە ئەو کارو کردەوانەیان پێئەکات، بەم جۆرو شێوە ڕێك و پێکەی کە هەیەتی بەم ڕژێمە تێرو تەواوە. جا لەبەر ئەوە ئەم ئادەمی یە هەمیشە پێویستە بە ڕێنموونی خوا، هەرکاتێ بە پێی ئەو ڕێنموونی یە نەجولایەوە و گومڕا ئەبێ و لائەدا لە ڕێگەی ڕاست و سەرگەردان ئەبێ و دووچاری ستەم و بەد بەختی ئەبێ، ئەو دووچار بوونە شتێکی مسۆگەر و حەتمی یە لە مێژووی ئادەمیدا لە هەر کاتێکدا لای دابێ و لابدا لە ڕێنموونی خوا، ئەمەی شتێکی مسۆگەر و حەتمی یە نەك

هێندێ شتی تر که نەفامان لاف حەتمی یەتیان بۆ لێدان و لە پاشان بە هەڵە و بە درۆ دەرچوون، وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان بۆ کردن بەڵام ئەو دووچار بوون و گومڕایی و بەد بەختی یەی کە پەیدا بووە و پەیدا ئەبێ لەلادان لە بەرنامەی خوا شتێکی ئاشکرایە و بە چاو ئەبینرێ، جا لەبەر ئەوە ئەوا ئایەتەکە فەرمان ئەدا بۆ مل کەچی و لانەدانە، ئەفەرموێ: ﴿وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ فەرمانمان پێدراوە بەمەی کە مل کەچ و گوێرایەڵ بین بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیان، ئەم وتە پیرۆزە ئەوە نیشان ئەدات کە ئەم بوون و بوونەوەرە بە هەموو بەش و پارچەکانی یەوە بە دیاریی و نهێنی یەکانی یەوە مل کەچ و ژێر بارە و گوێرایەڵە بۆ خواهیش و مەیل و دەسەڵاتی خواو ناتوانن یاخی بن و سەرپێچی بکەن، ئەم ئادەمی یە کە بەشێکی زۆر گرنگە لەم بوونەوەرەدا بێگومان مل کەچ و ژێر بارە پەیدا بوون و پێك هاتنی لەش و گیان و بە هەموو هێزو وزەکانی یەوە ناتوانن یاخی بن و بە موو لابدات لەوەی بۆی دانراوە و دیاریی کراوە و هیچ دەسەڵاتی خۆی تیادا نییە، کەواتە ئەبێ مل کەچ و گوێرایەڵ بێ لەبارەی کارو کردەوەکانیشی یەوە کە مەیل و دەسەڵاتی وای تیادا هەیە، جا ئەگەر لەم باریشەوە گوێرایەڵ و مل کەچ و فەرمان بەر بێ ئەوا هەموو کار و باری ڕێك و پێك ئەبێ لە هەردوو جیهاندا.

لەپاش جاڕدانی مل کەچی بۆ پەروەردگار، ئینجا نۆبەی فەرماندانە بە نیشانەی ئەو مل کەچییە بە لەش و بە دەروون، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُۚ﴾ فەرمانمان پێ دراوە بەمەی کە بە ڕێك و ڕاستی نوێژ بەجێ بێنن و خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی و بترسن لەو پەروەردگارە. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی گوێرایەڵی و فەرمان بەری ئەو فەرمانە، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ ئەو پەروەردگارە کەسێکە کە هەر بۆلای ئەو ئێوە کۆ ئەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ﴾ هەر ئەو پەروەردگارە کەسێکە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد و لە نەبوون بەدیهێنا،

وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٧٣﴾ ۞وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً

---

﴿وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ﴾ لە كاتێکدا کە ئەفەرموێ بە هەر شتێك ببە ئەویش دەست بەجێ ئەبێ ﴿قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ﴾ هەر فەرمان و وتەی ئەو راست و هەقە، بەدیهێنان و دروست کردنی بۆ هەر شتێ پێویستی نییە بە کەرەسە و بە ماوەو نەبەستراوە بە هیچ شتێکەوە، بەڵکو بە تەنیا ویستن و بڕیاری بە بێ دواکەوتن ئەو شتە لە نەبوون پەیدا ئەبێ، بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوە، ﴿وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ﴾ هەر بۆ ئەوە موڵك و خاوەنی یەتی لە رۆژێکدا کە فوو ئەکرێ بە سووردا، واتە لەم جیهانەدا بە رواڵەت و رووکەش موڵك و خاوەنێتی بۆ بەندەیانی خوا هەیە بە پێی باو و شەریعەتی خۆی، بەڵام لە رۆژیدوایی و زیندوو کردنەوەدا موڵك و خاوەنی یەتی تەنها بۆ خوایە و ئەم موڵك و خاوەنێتی یە رواڵەتی یەش لەو رۆژەدا نامێنێ بۆ هیچ کەسێکی تر بێجگە لە خوا – لەو رۆژەدا دەرئەکەوێ بۆ هەموو کەس تەنانەت بێ بڕوا و یاخییەکانیش – کە تەنها خوا خاوەنی هەموو شتێکە و دەسەڵات و ئیرادە هەر بۆ ئەوە، ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ﴾ زانا و ئاگایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك ﴿وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ هەرئەوەلێزان و کاردروست لە هەموو کارو کردەوەکانیدا، ئاگا و با خەبەرو بە هەموو شتێ، چ ئاشکرا و چ نهێنی.

ئینجا بە جۆرو شێوەیەکی تر بیرو باوەڕی راست و تەنیایی خوا نیشان ئەدات، نیشانی ئەدات لە شێوەو داستان و سەرگوزەشتەی هێندێ لە فروستادە و پێغەمبەرەکاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم گوتی بە باوکی کە ئازەرە، ﴿أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً﴾ ئایا تۆ چەند بتێك ئەگیرێ بە پەرستراوانی خۆت؟ واتە شتی وا مەکەو کۆتایی بێنە لەو کردەوە ناڕاستە،

﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ بەڕاستی من تۆ و گەلەکەت ئەبینم لە گومڕایی یەکی روون و ئاشکرادا ئایا چ گومڕایی یەك لەوە زیاترە کە ئەم ئادەمی یە گرنگ و نایابە بچیٚ بەدەستی خۆی دارو بەرد یان هەر شتێکی تر دیاریی بکات و بیپەرستیٚ و بیکات بە خوای خۆی؟! بەڕاستی ئەوپەڕی نەفامی و پەستی یە و دژی ژیریی و سروشتە لەبەر ئەوە سروشت هاتە جواب لەسەر زمانی ئیبراهیم کە لەناو ئەو ماڵ و خێزان و گەلە نەفامەدا بوو کە لەوەو بەر دەقیان گرتبوو بەو بیرو باوەڕە ناڕاست و پەستەوە، هێشتا ئەو ئیبراهیمە بە تەواوی رێك و پێکی خوای خۆی نەدۆزی بووەوە، بەڵام سروشتە پاکەکەی هەر لە یەکەم جارەوە دژو بێزار بوو لەوەی ئەو بتانە بپەرستریٚ کە باوك و گەلەکەی ئەیانپەرستن، ئەو گەلی ئیبراهیمە لە کەلدانی یەکان بوون لە عێراقدا کە ئەو بتانەیان ئەپەرست، هەرچۆنیٚ مانگ و رۆژ و ئەستێرەیان ئەپەرست، چونکە ئەوەی کە بپەرستریٚ و لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا پەنای پیٚ ببریٚ ئەبیٚ کەسێك بیٚ کە توانا و دەسەڵاتدار بیٚ و خاوەنی ئەم بوونەوەرە بیٚ، دەی چۆن ئەو دارو بەردو شتانە بپەرستریٚ یان بکرێن بە واسیتە لە نێوان خواو بەندەکانیدا؟ لەبەر ئەوە خۆی پیٚ نەگیرا و بەو جۆرە بێزاری دەربڕی و هێرشی کردە سەر باوکی و گەلەکەی، چونکە عەقیدەو بیروباوەڕ گەورەترە لە هەموو شتێکی تر، بەرزو گەورەترە لە هەر پەیوەندی و پەیوەستی یەکی تر، ئەبیٚ لە پێناویدا دەست هەڵگیریٚ لەهەر شتێکی تر، کەواتە نابیٚ ئەو بێزاری دەربڕین و هێرشە لە باوکی نابیٚ بە لەکەو رەخنە بەسەر ئیبراهیمەوە. هیچ پێویست نییە بەوەی کە ئازەر دانریٚ بە مامی ئیبراهیم کە ئەوەش لادانە لە دەق و روکەشی قورئان کە لە چەند شوێن و ئایەتێکدا بە باوکی داناوەو ناوی بردووە.

ئەو ئیبراهیمە(علیه السلام) بەهۆی سروشتی پاك و خاوێنی شیاو و شایستەی ئەوە بوو کە خوا چاوی دڵی بکاتەوە و بەڵگە و نیشانە گرنگەکانی ئەم بوونەوەرەی نیشان بدات و بیان ناسێنیٚ پێی، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بەو جۆرو شێوەیە، بەو ویستە پاکەی بۆ هەق و راستی و بەو بێزاری و نەویستنەی بۆ بەتاڵ و ناهەقی بەو چەشن و شێوەیە ئێمە نیشانی ئیبراهیممان داو پێمان ناساندن پەروەردەو ئاگادارێتی و دەسەڵات و خاوەنێتی تێرو تەواوی خوا بۆ ئاسمانەکان و زەوی و ئاشنامان کرد بە حەقیقەتی ئەم بوونەوەرە و بەڵگە و نیشانە روونەکانی، تا ئەوە بکات بە بەڵگە و نیشانەیەکی ئاشکرا بۆ دەم کوت کردنی بت پەرستە گومڕاکان،

وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ

**﴿وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ﴾ بۆ ئەوەی لە دەروونی خۆیشیدا ببێ بە یەکێ لەوانە و بچێتە ریزی بڕواداره راستەقینەکان کە خاوەنی ئارامی دڵن بە بێ هیچ دوو دڵی و گومانێك لە بڕوا و زانینەکانیاندا، واتە بە سروشتی پاکی زانی کە ئەو دارو بەردو پەرستراوە پووچانە شتێکی بێ کەڵك و بێ نرخن، بێزاری دەربڕی لە پەرستنیان، ئینجا بەهۆی ئەو ئاشنا کردن و نیشان دانە پلەیەکی تر بەرز بوویەوە بۆ بڕوای راست و رەوا بە پەرستراوی راستەقینە، گەل و نەتەوەکەی ئیبراهیم کە لە کەلدانی یەکان بوون لە عێراقدا دارو بەرد و ئەستێرەو مانگ و رۆژیان ئەپەرست، ئیبراهیمیش بە سروشتی پاکی خۆی هەر لە یەکەم جارەوە زانی ئەو دارو بەردە بە هیچ رەنگ شیاوی ئەوە نین بپەرسترێن، شیاوی ئەوەش نین بکرێن بە واسیتە و هۆی گەیشتنی بە خوای راست و رەوا، لەبەر ئەوە بەو شێوە بێزاری دەربڕی لە پەرستنی ئەوانە و گەل و نەتەوەکەی بە گومڕا و سەر لێ شێواو دەرکرد، ئینجا هاتە سەر ئەستێرەو مانگ و رۆژەکەش و ئەوانیشی بە پووچ و بە بێ نرخ دەرکرد تا گەیشت بە خواو پەرستراوی راست و رەوای خۆی، وەك بۆمان دەرئەخات، کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ﴾ ئینجا کاتێ شەوی بەسەرهات و تاریکی دای بەسەریدا و بەرچاوی تاریك کرد ﴿رَءَا كَوۡكَبٗا﴾ ئەستێرەیەکی بینی، ئیتر ئەو ئەستێرەیە موشتەری بووبێ، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕنەوە، یان زوهرە بووبێت، وەك لە(قتادة) وە هاتووە، کە هەرکام لەو دوو ئەستێرەیە زۆر جوان و بە تیشك و بە شەوقن، بە تایبەتی ئەستێرەی موشتەری بتی هەرە گەورەی ئەستێرە پەرستان بووە لەناو گەلی یۆنان و رۆمی کۆندا کە گەل و نەتەوەکەی ئیبراهیم پێشەوا بوون لەو ئەستێرە پەرستی یەدا، ئینجا ئایا ئەوە یەکەم جاری بینینی بووبێ، وەك لە چەند**

ریوایەتێکی بێ هێزەوە دەرئەکەوێ کە شاراوەتەوە گوایە ئیبراهیم لە ترسی نەمروود دەری نەبینبێ، تا ئەو کاتە یان نەء! بەو جۆرە کە بەناوبانگە لەناو خەڵکیدا و ئەگێڕنەوە کە ئەو جۆرە قسە و باسانە لە دەلەسەی ئیسرائلیات دەچێت، ئەو بینینە بەو جۆرە بووبێ یان لەو جارەدا بە مەیلی خوا دابێتی لە دڵی و جوانی و شیرینی و بەرزی یەکەی دابێتی لە دڵی، لەسەر هەر بار با بزانین کە ئەو ئەستێرەی بینی چی گوت؟ ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ وتی ئەمە پەروەردگار و خاوەن و کاربەدەستی منە، بێگومان ئەو ئەستێرە بەرزو گەش و شیرینە زۆر جیاوازە لەو دارو بەردە بێ نرخ و پەستانە، کەواتە ئەگەر لابدرێ لە پەرستراوی راستەقینە ئەو ئەستێرەیە نزیك تر و شایستە ترە بۆ پەرستن تا ئەو دارو بەردە بێ نرخانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەمیش شیاوی پەرستن نییە و نیشانەی بێ نرخی و نەشیاوی تێدایە، ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَفَلَ﴾ ئینجا کاتێ کە ئەو ئەستێرەیە ئاوا بوو و لە پێش چاو نەما، ﴿قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾ ئیبراهیم فەرموی: من ون بوو و ئاوا بووەکانم خۆش ناوێ و نامەوێن، چونکە بەکار نایەن و چاودێریی و کار بەدەستی و بەڕێوەبەری یان پێ ناکرێ، کەواتە ئەو ئەستێرەیە بەکار نەهات و دەستی نەدا بۆ ئەوەی بپەرسترێ و پەرستراو ئەبێ شتێك بێت کە سروشت خۆشی بوێ و لێی ئاوا نەبێ. ﴿فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا﴾ ئینجا کاتێ کە مانگی بینی هەڵهات و سەری کێشا لە کەناری ئاسمانەوە و بە رووناکی یەکەی تاریکی یەکەی لەت کرد ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ وتی ئەمە پەروەردگار و کاربەدەستی منە، ئەم جیاوز بوو لە ئەستێرەکە، ئەم تاق و تەنیا دیار بوو بە ئاسمانەوە و رووناکی یەکەی پەخش بوو بووەوە و هەموو لایەکی داگیر کردبوو ﴿فَلَمَّا أَفَلَ﴾ ئینجا کاتێ ئەمیش ئاوا بوو و ون بوو لەبەرچاو ﴿قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي﴾ ئیبراهیم گوتی ئەگەر پەروەردگارم رێنموونیم نەکات بۆلای خۆی و خۆیم پێ نەناسێنێ ﴿لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ﴾ بێگومان لە گەل و کۆمەڵە گومڕاکان ئەبم و ئەچمە ریزی ئەوان، ﴿فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً﴾ ئینجا کاتێ کە خۆری بینی و سەری دەرهێنا لە کەناری ئاسمانەوەو ئەم گەورەترە لە پێش چاو و تیشك و رووناکی یەکەی بەهێز ترە و گەرمی بەتینی هەیە،

**﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿هَٰذَا رَبِّي﴾ ئەمە پەروەردگارمە ﴿هَٰذَآ أَكۡبَرُ﴾ ئەمە گەورەترە لەوان، کەواتە ئەم شیاو و شایستە ترە، بەلاّم ئەمیش وەك ئەوان ئاوا ئەبێت و ون ئەبێ. کەواتە ئەمیش هیچ، ئینجا لێرەدا هیچ نەمایەوە ئەمە نەبێ کە خوا و پەرستراوی راستەقینە ئەبێ کەسێك بێت جیاواز و وێنەی هیچ کەسێك نەبێت لەم بوونەوەرەدا، ئەبێت کەسێك بێت داهێنەر و پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە و هەرچی لەم بوونەوەرەدایە، ئینجا لەم کاتەدا ئەبێ ئیبراهیم بە بێ پێچ و پەنا جاڕ بدات و دەری ببڕێ کە ئەم دوورە و بێزارە لە هەرچی ئەو پەرستراوانە کە گەل و نەتەوەکەی کردوویانە بە هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَفَلَتۡ﴾ ئینجا کاتێ خۆر ئاوا بوو وەك ئەستێرەو مانگ، ﴿قَالَ﴾ ئیبراهیم فەرمووی: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەل و نەتەوەکەم ﴿إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ﴾ بەڕاستی من بەریم لە هەر شتێ کە ئێوە ئەیکەن بە هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار، من بەریم لە ڕەوادانی هیچ هاوبەشێك بۆ ئەو پەروەردگارە ﴿إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ بەڕاستی ئەوا من ڕووی خۆم وەرئەگێڕم بۆلای کەسێك کە لە نەبوون ئاسمانەکان و زەوی دروست کردن و دایهێنان، نیازی دڵی خۆم و پەرستنم ڕوو ئەکەمە ئەو کەسە، خۆم مل کەچ ئەکەم بۆی ﴿حَنِيفٗا﴾ لەکاتێکدا لا ئەدەم لە پەرستنی هەموو شتێك بێجگە لە دەمبازی و موجادەلەکەتان زۆر بێجێ و ناڕاستە، ئەو نەفامانە ئیبراهیمیان ئەترساند لە بتەکانیان کە دووچاری بکەن، ئەویش فەرمووی: ﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ﴾ من ناترسم لەوەی کە ئێوە هاوبەشی پێ ئەکەن و ئەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا، چونکە من بە باشی ئەزانم کە ئەم بتانە هیچ شتێکیان بەدەست نییە و هەموو شت هەر بە دەست خوایە، لە هیچ کاتێکدا من ناترسم لەوە ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۗ﴾ مەگەر کاتێ کە پەروەردگارم بیەوێ و مەیلی شتێ بکات کە دووچارم ببێ بەهۆی ئەو بتانەوە، ئەو کاتە ئەو شتە ئەبێ، بەلاّم ئەوەش هەر لەلایەن خواوەیە و بەدەست خوایە،**

وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ

---

**﴿وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ پەروەردگارم فراوانی هەیە بۆ هەموو شتێ لەبارەی زانینەوە و زانی خوا هەموو شتێ ئەگرێتەوە و دەوری هەموو شتیداوە، ئا بەو جۆرە ئیبراهیم پاراستن و سەرپەرشتی خۆی حەواڵەی مەیل و زانینی خوا کرد، زانی کە دووچاری هیچ شتێك نابێ مەگەر خوا ویستبێتی و زانیبێتی، ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا نایەتەوە بیرتان و هۆش ناکەنەوە کە کارەکە بەو جۆرەیە کە من پێتان ئەڵێم و پەند و ئامۆژگاریم کردن پێی؟ ئایا بیرتان ناکەوێتەوە کە ئەو بتانەی ئێوە هیچ دەسەلاتێکیان نییە بەسەر هیچ شتێکدا تا بتوانن زیان بە من بگەیەنن؟ لە پاش ئەوەی کە رایگەیاند نەترسانی خۆی لەو بتانە، بۆیان روون ئەکاتەوە کە ترسانی ئەم زۆر بێ جێیە، وەك نەترسانی ئەوان لە خواو رەوادانی هاوبەش بۆ لای زۆر ناڕەوا و بێ جێیە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ﴾ ئایا من چۆن ئەترسم لەو بتانەی کە ئێوە کردووتانە بە هاوبەش ﴿وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا﴾ لە کاتێك دا ئێوە ناترسن لەوەی کە ئێوە گێڕاوتانە بە هاوبەش بۆ خوا، شتێك کە خوا هیچ رابەرو بەڵگەیەکی لەسەر دانەناوە و هیچ رابەر و بەڵگەیەکی نەناردووەتە خوارەوە و سروشتی پێنەکردووە؟ واتە ئێوە ناترسن لە کاتێك دا کە کاری ئێوە جێ و هۆی مەترسییە، ئەی من چۆن بترسم کە کارەکەی من هیچ هۆی مەترسی تیا نییە؟ وەك دەست نیشان ئەکات ئەفەرموێ: ﴿فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ دەی ئایا کام لەو دوو دەستەیە شایستە ترە بۆ نەترسان و مەترسی نەکردن، واتە دەستەی خواپەرستان بە تاك و تەنیا یان دەستەی هاوبەش رەوا دەران ئەگەر ئێوە ئەزانن و خاوەنی زانینن، دەی هەواڵم بدەنێ، وەڵامی ئەو پرسیارە لێرەدایە کە ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە خوای تاك و تەنیا ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ﴾ لەکاتێکدا کە بڕواکەیان تێکەڵ نەکردبێ بە هیچ هاوبەش رەوا دانێك وەك بت پەرستەکان کە بڕوایان بە خوا هەیە و لە هەمان کاتدا بڕوایان بە بتەکانیش هەیە،**

أُولَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٨٣﴾

---

﴿أُولَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ﴾ ئەوانەی کە خاوەنی ئەو بڕوا پاکەن هەر بۆ ئەوانە هەیە نەترسان و مەترسی نەکردن ﴿وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ ئەوانە ڕێنموونی وەرگرن و ڕێی ڕاستیان داوەتەبەر ﴿وَتِلۡكَ﴾ ئەو وت و وێژو لێکۆڵینەوە و ڕابەرو بەڵگەی کە لەو ئایەتانەی ڕابردوو تێپەڕیان کرد ﴿حُجَّتُنَآ﴾ ڕابەرو بەڵگەی ئێمە بوون ﴿ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ کە بەخشیمان بە ئیبراهیم و ڕێنموونیمان کرد بۆی کە بیکات بە ڕابەر و بەڵگە ﴿عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ بەسەر گەل و نەتەوەکەیەوە و دەم کوتی ئەوانی پێ بکات، وەك کردنی ﴿نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُ﴾ بەرز ئەکەینەوە بە چەند ڕادە و پلەیەکی گەورە و گرنگ هەرکەسێك کە خۆمان بمانەوێ و مەیلمان ببێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ﴾ چونکە پەروەردگارت کار دروست و لێزانە لە هەر بەرز کردنەوە و نزم کردنەوە و هەموو کارو فرمانێکیدا ﴿ عَلِيمٞ ﴾ ئەوپەڕی ڕادە زانا و ئاگایە بە هەموو شتێك، بە حاڵ و بڕیاری هەر شتێك، ئەزانێ کێ بۆچی شیاو و شایستەیە.

ئینجا پێش ئەوەی دەست بکەین بە ئایەتەکانی داهاتوو بە جوانی ئەزانم هێندێ لە هەڵوێستی هاوەڵەکانی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) باس بکەم بەرامبەر ئەم قورئانە، بەهۆی ئەو هەڵوێستە ڕاست و پاکەوە ئەو ئوممەتە پێك هات کە هەموو ژیرێك تیایاندا سەرسامە.(ئیبن و جەریر) لە(عبدالله ی کوڕی ئیدریس) ەوە ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ﴾ دڵی هاوەڵەکانی داگرت و غەم و پەژارە گرتنی و گوتیان: ئایا کام لە ئێمە ستەمی لە خۆی نەکردووە؟ تا پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆشی دانەوەو ئارامیی خستە دڵیان، بەم ڕەنگە فەرموی: مەبەست بەو زوڵمە هاوبەش ڕەوا دانە بۆ خوا، وەك لوقمان وتی بە کوڕەکەی: ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾، هەروەها وێنەی ئەم ڕیوایەتە لە(زەیدی کوڕی صوحاف) ەوە کە پرسیاری کرد لە(سلمان) و ئەویش هەر بەو جۆرە تەفسیری کردەوەو(زەید) یش دڵی خۆش بوو و گوتی: بیستنی ئەمەم پێ خۆشتر بوو لەوەی

کە هەموو جیهان هینی من بێت. بەڵێ ئەم قورئانە بەو جۆرە و بەو توندی یە ئەبێ وەرگیرێ و سام و بیم و هەیبەتی ببێ لە دڵ و دەروونـدا، خـوا بـە میهرەبانی خـۆی ئەو هەست و هەڵوێستە بهێنێتەوە کایە بۆ ئێستا و داهاتووی ئەم ئوممەتە – آمین –.

ئینجا کۆمەڵ و لەشکری بڕوا ئەخاتە بەرچاو بە سەرکردایەتی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێبێت – لە(نوح) ەوە تا(ئیبراهیم) و تا دواترین و گەورەترینی هەموویان، هەژدە کەس لەوانە ناو ئەبات و دەست نیشان ئەکات بۆ چەندەهای تر لە باوك و باپیر و برایانیان، لەناو بە ناوی چەند کەسێکیان و بە دوایاندا چەند رستەیەك ئەهێنێ کە دەست نیشانن بە چاکیی و هەڵبـژاردەیی ئەوانـە، باسـی ئەوانـە و خـستنە پـێش چـاوی ئەو گەل و کۆمەڵـە سەرەتا و بنەڕەتە بۆ سێ بڕیار:

بڕیاری یەکەم: ئەوەیە کە سەرچاوەکانی رێنموونی بریتی یە لەوەی ئەو پێغەمبەرانە هێنایان کە ئەوەش بریتی یە لەوەی کە لەم قورئانەدا هاتووە، ئەم قورئانە کرا بە تاقانە سەرچاوە و هەرکەس لێی لابدا و تەنها رێی خواپەرستی نەداتە بەر هەموو کردەوەیەکی چاکی بێ سوود و بێ نرخە و بەبێ هودە ئەڕوا.

بڕیاری دووەم: ئەمەیە کە ئەو پێغەمبەرانە خوا نامە و حوکمڕانی و کاردروستی پێدان، ئەوانە هەواڵیان وەرگرت لە خوا، ئەوانە خوا ئایینی خۆی پێ سپاردن، کە رایگەیەنن بە بەندەکانی، جا ئەگەر بت پەرستەکانی عەرەب کە یەکەم چین بوون ئەم قورئانەیان پێ راگەیەنرا، ئەگەر ئەوانە بڕوا ناهێنن ئەوا خوا بێ پێویستە لەوان، ئەو پێغەمبەرانە و شوێن کەوتووەکانیان بەسن بۆ ئایینەکەی، کەواتە بڕوادار لە هەر شوێن و وڵاتی ببێ، تەنیا بێیان کۆمەڵی لەگەڵ بێ زۆر بەهێز و گەورەیە، چونکە گەلا و پەلێکە لەو درەختە بەرزو بڵند و بەفەڕە کە ریشەی کوتاوە لەناو سروشتی ئادەمی و مێژووی ئادەمیدا.

بڕیاری سێ یەم: ئەو پێغەمبەرانە کە سەر گەورەی کۆمەڵی خواناسانن هەر ئەوانەن کە خوا رێنموونی کردن لە یەکەمجارەوە، پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) و بڕواداران پێڕی هەر لەسەر ئەو رێنموونی یەی خوا ئەڕۆن و هەر پەیڕەوی ئەوە ئەکەن، پێغەمبەرمان(ﷺ) بانگی هەموو جیهانی یان هەر بۆ ئەوە ئەکات بە بێ ئەوەی داوای هیچ شتێك بکات لە هیچ کەس.

وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ

---

**ئینجا با بێینە سەر ئایەتەکان و بەو جۆرو شێوەیە تەفسیری بکەینەوە، ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ بەخشیمان بە ئیبراهیم کوڕێك کە ناوی ئیسحاقە و کوڕەزاکەی کە ناوی یەعقوبە و کوڕی ئیسحاقە ﴿كُلًّا هَدَيْنَا﴾ هەرکام لەو دووانە یان ئەو سیانەمان ڕێنموونی کرد و خستنمانە سەر ڕێ و ئایینی خۆمان و گێڕانمان بە پێغەمبەرو ﴿وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ﴾ لە پێش(ئیبراهیم) دا(نوح) مان ڕێنموونی کرد ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ﴾ لە رۆڵە و نەوەی(نوح) یان(ئیبراهیم) ڕێنموونیمان کرد و خستمانە سەر ڕێگەی خۆمان و گێڕامانن بە پێغەمبەر ﴿دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾، ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بەو چەشن و وێنەیە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە، واتە ئەمانەی کە باس کران. ﴿وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە لەو نەوەیانە ئەمانەشمان ڕێنموونی کرد، هەرکام لەمانە لە ساڵحانن، واتە ئەوانەی کە کارو کردەوەی شایستە ئەکەن و خۆیان ئەپارێزن لە کاری بێ جێی و ناشایستە، یان ئەوانەی کە خوا پەرستی ئەکەن و بە جۆرێ وەك بەچاو خوا ببینن.**

**﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا﴾ لەو نەوەیانە ئەمانەشمان ڕێنموونی کرد و خستمانانە سەر ڕێگەی خۆمان ﴿وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ هەرکام لەمانەمان باوداو رادەو پلەمان بەرز کردەوە بەسەر جیهانی یانی چەرخی خۆیاندا بە پێغەمبەرێتی، ﴿وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ﴾ باومان داوە و رادەمان بەرز کردووەتەوە هێندێ لە باوکەکانیان و نەوەکانیان و براکانیان، یان لە باوك و براکانیان زۆرمان ڕێنموونی کرد و خستنمانننە سەر ئایینی ڕاست.**

**﴿وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ﴾ ئەوانەمان باوداو هەڵمان بژاردن**

وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾

---

**﴿وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ رێنموونیمان کردن بۆ ڕێگەی ڕاست و خستنمانە سەری ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ﴾ ئەو ڕێنموونی یە بۆ ڕێی ڕاست و ئەو ئایینی ئەوانە ڕێنموونی تایبەتی خوایە، ﴿يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ ڕێنموونی پێ ئەکات لەناو بەندەکانیدا هەرکەسێك کە خوا مەیلی بکات، واتە بە لوتف و میهرەبانی خۆی ئەیبەخشێ بەوانەی کە خوا خۆی ئەیانناسێ و ئەزانێ ئامادەن بۆی ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانە کە باس کران و بەو جۆرە خوا بەهرەو میهرەبانی خۆی ڕشت بەسەریاندا، ئەوانە ئەگەر هاوبەشیان ڕەوا بدایە بۆ خوا بێگومان هەر کردەوەیەکی چاك کە لەوەو پێش کردبێتیان هەمووی زایە ئەبوو و بێ نرخ و بێ سوود و بێ پاداشت دەرئەچوو بەهۆی ئەو هاوبەش ڕەوادانە، کەواتە با یەکەم چین و تاقم کە ئەم قورئانەیان بیست تەمێ خوار بن و بترسن لە هاوبەش ڕەوادان و بت پەستی یەی کە وان لەسەری، چونکە لە جێ یە ئەو پێغەمبەرانە ئەوەیان بەسەر بێت ئەبێ ئەمان کە دوورن لە کردەوەی چاك چۆن بن و چی یان بەسەر بێت؟ ئینجا دیسان ئەیانترسێنێ و ئەم هەڕەشەشیان ئەدا بە گوێدا کە ئەفەرموێ: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەو پێغەمبەرانەی کە باس کران کەسانێکن ﴿ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ﴾ کە نامەو زانین و حوکمڕانی و پێغەمبەرێتیمان پێ بەخشین ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئەگەر ئەو بێ بڕوایانی مەککە باوەڕ نەهێنن بەو سێ شتە: یان بە ئایەتەکانی قورئان، یان بە پێغەمبەرێتی کە هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە، ئەگەر ئەوانە بڕوا نەهێنن ﴿فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ﴾ واتە ئەوا هیچ یەکێك ناکەوێ لەسەر ئەوان و هیچ زیانێك ڕوونادات، چونکە ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ چاودێریی و سەرپەرشتی و هەڵسان بە مافی ئەوەی کە باس کرا، ئامادەمان کردووە کۆمەڵ و دەستەیەکی بەڕێز کە بێ بڕوا نەبن و نەبوون پێی، ئیتر ئەوانە پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان بن، یان کۆچ کەران و یارمەتی دەرانی ئەم ئوممەتە بن، یان هەموو بڕواداران لە هەر چەرخ و کاتێکدا، یان هەر کەسانێ تر وەك بەمانە تەفسیر کراوەتەوە،**

أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾

**﴿أُولَٰٓئِكَ﴾ ئەو پێغەمبەرانە کە باس کران، ﴿ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ﴾ کەسانێکن کە خوا ڕێنموونی کردن و خستنی یە سەر ڕێی ڕاستی خۆی، ﴿فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ﴾ کەواتە ئەی پێغەمبەر پەیڕەوی ئەو ڕێگە و ڕێنموونی یە بکە کە خوا دای بەوان، ئەو ڕێگە و ڕەوشت و سیفەت و کردەوە پەسەندانە کە لەو پێغەمبەرانەدا بووە، ئەی پێغەمبەر تۆ بەدی یان بێنە لە خۆتدا بە سەربەخۆیی نەك بە لاسایی و شوێن کەوتن، ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بەم فەرمانە: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانەی کە یەکەمجار ڕەوانە کرای بۆ سەریان ﴿لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ﴾ من داوای هیچ کرێ و پوول و پارەیەك ناکەم لە ئێوە لەسەر ئەم قورئانە و ڕاگەیاندنی ئەم قورئانە، چ کەم و چ زۆر، کەواتە نیازو مەبەستەکە پاك و خاوێنە و هیچ کەس ڕێی نییە دوو دڵ و بەد گومان بێت، ڕاگەیاندنی ئەم وتەیە زۆر پەسەند و پیرۆزە لەبەر ئەوە پێغەمبەرەکانی تریش ڕایان گەیاندووە بە ئوممەتەکانیان، کەواتە با هەموو ئەوانە کە ئامۆژگاری ئەکەن و ئەیانەوێ ئایینی خوا بڵاو بکەنەوە، با ئەوانە لە ڕێی پێغەمبەران لانەدەن و داوای هیچ شتێ نەکەن لە هیچ کەسێك کە ئامۆژگاری ئەکەن و بانگیان ئەکەن بۆ ڕێگەی خوا، هەر لەبەر خوا بێ کارەکەیان نەك ئەوە بکەن بە هۆیەك لە هۆیەکانی ژیان و بەسەر ئەوەوە بلەوەڕێن، وەك لە زووەوە ئەوە بووە بە باو. بە تایبەتی بەناوی تەریقەتەوە کە لە ڕاستیدا ئەوە دوورە و دژی تەریقەتی ڕاستەقینەی خواناسانی ئەم ئوممەتەیە، وەرگرتنی شت بەناوی تەریقەتەوە زۆر جێگەی مەترسییە، چونکە ئەو مەردومانە کە شت ئەهێنن بە نیازێك ئەیهێنن کە لە توانا و دەسەڵاتی ئەو کەسەدا نییە کە شتەکەی بۆ ئەبەن، لە ڕادەو پلەیەکدا سەیری ئەکەن کە ئەو پیاوە زۆر نزم ترە لەو ڕادە و پلەیە، کەواتە بێگومان ئەو کاتە وەرگرتنی ئەوە حەرامە، ئینجا ئەگەر کەسێ کە شت ئەبات هەر نیازی ئەوە بێ کە بکرێ بە خێرو دەرخواردی هەژار و بێنەوایان بدرێ کە ماڵی تەکیە و خانەقا بێت، ئەو کاتە ئەبێ نە شێخ و نە کەسێکی تر داگیری نەکات و بە ماڵی خۆی سەیری نەکات، نابێ هیچ کەس هیچ زیادە تەسەڕوف و باشی و بۆشی یەکی بەسەرەوە نەکات، کوڕ و ماڵ و منداڵی**

شێخەکە جیا نەکرێتەوە لە کەسانی تر، دەی ئایا ئەوە لە کوێ ئەکرێ و بەو جۆرە رەفتار ئەکرێ؟ ئەم باسە زۆرتر هەڵئەگرێ، بەڵام با بەمە کۆتایی پێ بهێنین چاکە و بچینەوە سەر ئایەتەکان. ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەم قورئانە هەر ئامۆژگاری و رێ نیشاندانە بۆ هەموو جیهانی یان، نەك تەنها ئەوانەی کە یەکەمجار ئەم قورئانەیان پێ راگەیەنرا، نەك تەنها بۆ تیرەو بەرەو چینێ، بەڵکو بۆ هەموو تیرەو بەرە و چینەکانە تا رۆژی دوایی، بەڵێ بە راستی هەر رێگە نیشاندان و ئامۆژگاری یە بۆ هەردوو جیهان، بۆ هەموانیشە تا دنیا دنیایە و سروشتەکەی هەروا هاتووە و هەر بۆ ئەوە دەست ئەدات. ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتی(٨٥) کە باسی ئەو هەژدە پێغەمبەرانەی کرد – سەلامی خوایان لێبێت –، لەو ئایەتە و ئایەتی(٨٦ و ٨٧) باسی چواردەیانی کرد بە بێ تێبینی ریزیان بە پێی مێژوو و کات و چەرخیان، بەڵکو بە رواڵەت بە تێکەڵی و پێکەڵی و بە بێ رێز، لە بارەی هۆی ئەو تێبینی نەکردنە زۆربەی زانایانی تەفسیر بێ دەنگن و هیچ ناڵێن. بەڵام هێندێکیان دواون بە شێوەیەك دڵ پێی ئارامە.(خازن) ئەفەرموێ: خوای گەورە هەر تاقمێك لە پێغەمبەرانی جیا کردووەتەوە بە هێندێ بەهرە و هونەر، باسی ئەم پێغەمبەرانە لێرەدا بە پێی ئەوە هاتووە:(نوح و ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب) لە پێشەوە باس ئەکات، چونکە ئەمانە بناغە و بنەڕەتی پێغەمبەرانی پاش خۆیانن و نەژاد و نەسەبی هەمووان ئەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوانە، ئینجا لە جیهاندا پاش پێغەمبەرێتی تەماشای پادشایەتی و دەسەڵات و سامان ئەکرێ، کە لەو بارەیەوە(داودو سولەیمان) گەورەترین پلەیان بووە، ئینجا یەکێ لە سیفەت و بەهرە گەورەکان سەبرو خۆگری یە لە کاتی ناڕەحەتی و تەنگی و بەسەرهاتی خراپدا کە(ئەیوب) بەشی زۆر گەورەی بووە لەوەدا، ئینجا بەدوای ئەوەدا باسی کەسێك ئەکات کە بەشدار بووبێ لەو دوو بەهرەدا پادشایەتی و خۆگری کە(یوسف) سەردەستەیە لەوەدا، ئینجا هەندێ لە بەهرەی پێغەمبەران زۆری و بەهێزی موعجیزەیە کە موسا و هارون خاوەنی بەشی گەورەن لەو بارەیەوە، ئینجا هێندێ تر لە بەهرە بریتی یە لە پشت کردنە دنیا و خۆ خەریك نەکردن بە شتومەکی ئەم جیهانە دوا براوە کە(عیسا و زەکەریا و یەحیا و ئیلیاس) بەشی گەورەیان بووە لەوەدا، لەبەر ئەوە ناویان ئەبات بە سالح، ئینجا لەپاش ئەوانە باسی ئەو پێغەمبەرانە ئەکات کە شەریعەت و شوێن کەوتوویان نەماوەتەوە کە(ئیسماعیل و ئەلیەسەع

و یونس و لوط) بەشدارن لەوەدا. کاتێ بە وردی تێفکرێین لەوەی کە باسکرا دڵنیا و دڵئارام ئەبین کە شیرین ترین شت ئەمەیە کە قورئان هێناویەتی.

خاوەنی تەفسیری(المنار) هەر ئەم مەبەستەی نیشانداوە بەڵام بە جۆرو شێوەیەکی تر هێناویەتی، بە تێبینی ئەم دوو جۆرەو بە هەردووکیانەوە مەسەلەکە باشتر روون ئەبێتەوە، ئەم ئەفەرموێ: خوای گەورە لەم سێ ئایەتەدا باسی چواردە پێغەمبەری فەرموە.(باسی چوارەکەی تر ناکات: نوح و ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب)، چونکە ئەوان باس و ریزەکەیان بەجێیە و ماف خۆیانە و جێی قسە و باس نییە، بەڵکو ئەم چواردە قسە و لێکۆڵینەوەی ئەوێ، جا ئەفەرموێ: خوا باسی ئەم چواردەی فەرمو و کردنی بە سێ بەشەوە لە هەر بەشێکدا چەند پێغەمبەرێکی کۆ کردووەتەوە کە بەشدارن لە سیفەتێکی تایبەتیدا و ئەو سیفەتە جیای کردوونەتەوەو کردوونی بەو بەشە تایبەتی یەوە، هەرکام لەو سێ بەشەی لەوانیتر پچریوە بە وتەو رستەیەك ، وەك بە روونی باسی ئەکەین:

بەشی یەکەم: (داود و سولەیمان و ئەیوب و یوسف و موسا و هارون) کە ئەمانە لەگەڵ پێغەمبەرێتی یەکەیاندا خوا دەسەڵات و گەورەیی و حوکمرانی پێ بەخشین،(داود و سولەیمان) ی پێش خست کە دوو پادشای زۆر بە دەسەڵات و سامان بوون، لەم بارەیەوە پێشکەوتووتری هەمووان بوون، ئینجا(ئەیوب و یوسف) ی هێنا کە یەکەم فەرمانداریکی بە سامانی گەورە بوو، دووەم کە حاکمێکی کاربەدەستی فەرمانڕەوا بوو، هەرکام لەم دووانە دووچار بوون بە خۆشی و ناخۆشی و لە هەردوو تاقی کردنەوەکەدا بە چاکی دەرچوون و خۆگرو سوپاس گەر بوون، ئینجا(موسا و هارون) ی هێنا کە حاکم بوون بەڵام پادشا و ساماندار نەبوون وەك ئەوان، کەواتە ئەم دووانە هەرچەندە لە رادەو پلەی ئایینیدا گەورەتر بوون، بەڵام لە رادەو پلەی دنیاییدا نزم تر بوون، کەواتە خرانە دواوە، هەرکام لەم شەشە لە کاروباری خۆیاندا کردەو چاك کردار بوون، کەواتە زۆر شیرینە کە بەم رستەیە نیشانەداری کردن و جیای کردنەوە لە بەشەکانی تر: ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾.

بەشی دووەمی گێڕا بەم چوارە: (زەکەریا و یەحیا و عیسا و ئیلیاس)، کە ئەم چوارە جیاوازبوون لەناو پێغەمبەراندا بە پشت کردنە دنیا و روو وەرگێڕان لە خۆشی و باشی و بوشی دنیا و دوورکەوتنەوە لە دەسەڵات و سەڵتەنەتی دنیا، کەواتە سیفەتی ساڵحی لەماندا ئاشکرا تر بووەو زۆر رێکە کە ئەم رستەیەی هێنا بە دوایاندا: ﴿كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾.

بەشی سێ یەمی کرد بە:(ئیسماعیل و ئەلیەسەع و یونس و لوط) کە ئەمانە شتێکی تایبەتی یان نەبووە لەو تایبەتی یانەی کە هەبوون بۆ تاقمی یەکەم و دووەم، بەس پێغەمبەر و فروستادە بوون، وەك براکانی تریان، پێغەمبەرانیش خوا باوی داون بەسەر هەموو کەسانی چەرخی خۆیاندا، وەك بەدوای ئەواندا ئەم رستەیەی هێنا: ﴿وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾. بە راستی ئەوەی کە باس کرا زۆر بەلامەوە پەسەند و شیرین بوو لەبەر ئەوە بە جوانم زانی بیخەمە بەرچاو، زانینی تەواو و راستەقینە هەر لای خوایە، ئینجا ئەگەرێمەوە بۆ سەر تەفسیری ئایەتەکان: بێگومان ناردنی پێغەمبەران و نامە و شەریعەتی لە گەورەترین بەهرەو بەخششەکانی خوایە بەسەر بەندەکانی یەوە، لەگەڵ ئەوەدا زۆر لە بەندەکانی بەدو سپڵەن و دان نانێن بەو چاکە و بەهرەیەیدا، ئیتر لەبەر نەفامی و کەودەنییان یان لەبەر لاری و سەرکێشی یان و نەخۆش و حەسادەتیان بوو، ئەم جۆری دووەمە بە زۆری لەناو جوولەکەدا هەبوون، هەروەها لەناو بت پەرستەکانی قورەیش و عەرەبەکانی چەرخی پێغەمبەرمان(ﷺ)، جا ئەوا قورئان لە پاش باسی ئەو کۆمەڵە پێغەمبەرانە – سەلامی خوایان لێبێت – کە هێنانی ئەوانە لێرەدا نیشانە و سەرەتایە بۆ راستی و رەوایی پێغەمبەرێتی دواترو گەورەتری هەمووان – سەلامی خوا لە هەمووان بێت –، لە پاش باسی ئەوانە ئەوا دەمکوتی ئەو بێ بڕوایانە ئەکات و بەرپەرچیان ئەداتەوە و بەڵگە و رابەر ئەهێنێتەوە لەسەر راست و رەوایی ناردنی پێغەمبەرو نامەی خوا، لەسەر ناڕاستی و بەدیی بێ بڕوایی ئەو بێ بڕوایانە بەم ئایەتانەی خوارەوە، هەرچەند شێوەو رووکەشی ئایەتەکە گشتی یە و نەبەستراوە بە تاقمێکی تایبەتی یەوە، بەڵام زانایانی تەفسیر دووبەرەکین لەمەدا کە دەربارەی کام تاقم هاتبێتە خوارەوە: زۆربە لەسەر ئەوەن کە دەربارەی جوولەکە هاتوون، بەشێکیش لەسەر ئەوەن کە دەربارەی بت پەرستەکان هاتوون، هەردوولا چەند ریوایەتێك ئەکەن بە بەڵگە و چەند بەڵگەیەکی ژیریش ئەهێننەوە لەسەر رای خۆیان. هەرکام دەست ئەدات و ئەگونجێ، بەڵام بێگومان شێوەو رووکەشی ئەو خوێندنەوەی کە ئێستا باوە: ﴿تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾، ئەم خوێندنەوەیە رێك تر و گونجاو ترە لەگەڵ ئەو رایەی کە زۆربە لەسەریەتی، وەك بۆمان دەرئەکەوێ لەمەو پاش لەکاتی تەفسیری ئایەتەکەدا.

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ﴾

**لەسەر رای یەکەم هەرچەند جوولەکەکان خۆیان بە نامەدار دائەنا و بڕوایان هەبوو بە ئایین و بەرنامەی خوا، بەڵام کاتێ کە پێغەمبەرمان(ﷺ) رەوانە کرا بەم ئایین و قورئانە پیرۆزەوە حەسادەت گرتنی تا ئەم رادەیە لە خەشم و حەسادەتدا ئینکاری هەموو نامە و پێغەمبەرانیان کرد، لەبەر ئەوە ئەوا قورئان دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو وتە بەدەیان و بەرپەرچیان ئەداتەوەو دەم کوتیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ ئەوانە خوایان بە گەورە دانەناوە بە گەورە گرتنی راست و رەوای خۆی کە مافی خۆیەتی، خوایان نەناسیوە بە ناسینی راست و رەوای خۆی کە مافی خۆیەتی ﴿إِذۡ قَالُواْ﴾ لە کاتێکدا کە ئەیان گوت. یان لەبەر ئەوەی ئەیان گوت: ﴿مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖ﴾ خوا هیچ شتێکی نەهێناوەتە خوارەوە بۆ سەر هیچ ئادەمی یەك، ئەم وتەیە بەدە کە جوولەکە یان بت پەرستەکانی مەککە ئەیان گوت لەو چەرخی نەفامی یەدا، لە هەموو چەرخێکدا هەموو وێنەکانی ئەوان هەر گوتویانە و هەر ئەیڵێن، هێندێ لەوانە ئەمانەن کە ئێستا ئەڵێن: ئایینەکان دەستکردی ئادەمین، ئەم ئایینە گۆڕان و بەرز بوونەوە بە پێی گۆڕان و بەرز بوونەوەی ئادەمی، ئەم وتە بەدە بە تێکڕایی ئەڵێن بە بێ جیاکردنەوەی ئەو هەموو ئایینە پڕو پووچانەی کە لە راستیدا دەستکردی ئادەمین و لەبیرو بۆچوونی ئەوانەوە پەیدا بوون، وەك هەموو ئاینە بت پەرستەکانی کۆن و تازە، کە بەرزی و پەستی رووی تێ کردوون بە پێی بەرزی و پەستی ئادەمی، بەڵام هەر هەموو جۆرەکانی لە ئایینی خوا بەدەرن و دوورن لە ئایینی خوا، بە بێ جیا کردنەوەی ئەو ئایینە پڕو پووچانە و ئەم ئایین و شەریعەتانەی کە پێغەمبەران هێنایان لەلایەن خواوە، کە ئەمانە هەموویان لە ئەساسدا راستن و دامەزراون لەسەر بنەڕەت و بناغەی یەکەمجاریان، کە هەر پێغەمبەرێك هەر ئەوەی هێناوە، ئینجا هێندێ بڕوای پێ هێناوە و هێندێ بڕوای پێ نەهێناوە و یاخی بووە لێی، ئینجا دەست کاری کراوە و لێی لادراوە، بەهۆی ئەوەوە مەردومان گەڕاونەتەوە سەر نەفامی تا پێغەمبەرێکی تازە هاتووە بە هەمان ئایینی راست، کار بەو جۆرە بوو تا هاتنی ئەم قورئانە کە دەست نادا بۆ گۆڕاندن و دەستکاری، ئەو وتەیە بەدە کەسێك ئەیڵێ – لە کۆن و تازەوە – کە خوای نەناسیوە و خوای بە گەورە نەگرتووە بەو**

جۆروشێوەی کەراستەوماڤ خوایە، کەسێك ئەیڵێ کە بێ ئاگایە لە بەخشندەیی و میهرەبانی و دادو دادپەروەریی خوا، ئەم نەفام و نەزانانە نازانن کە ئەم ئادەمی یە گەورەتر و نایاب ژتری دروست کراوەکانی خوایە، هەرگیز ناگونجێ کە ئەو خوایە ئەم دروست کراوی خۆیە بەرەڵا بکات، بە بێ بەرنامە و شەریعەتێك کە دەستکردی خۆی بێت و بینێرێ بۆ ئەم دەستکرد و دروست کراوە نایابەی خۆی، هەرگیز نابێ بەرەڵایان ناکات و لێیان گەڕێ تا گومڕا بن، لە کاتێکدا خۆی دروستی کردوون و زانا و ئاگایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایان، بەهێزو وزەیان، بە کەم و کوڕی و لاوازییان، بە پێویستی یان بە ترازوویەکی راست و رێك کە بگەڕێنەوە بۆلای لە هەموو کاروبار و بیرو باوەڕ و بۆچوونێکیاندا، تا هەموو چاك و خراپ و راست و چەوتی یەکیان بۆ دەرکەوێ و دوورکەونەوەو بگەڕێنەوە لە هەڵە و لادان و ترازانیان، خوا خۆی زانی کە ئەو ژیریی یەی پێی بەخشیون بەس نییە و چارەسەریان ناکات، لەبەر ئەوە هەواڵەی ژیریی یەکەی نەکردن، بەڵکو هەواڵەی بەرنامەو پێغەمبەرەکانی کردن تا رێی راست بدەنە بەر و دوور بن لە هەر هەڵە و لارییەك، هەر ئەمە شایان و شیاوە لەگەڵ بەزەیی و میهرەبانی و دادی خوادا، کەواتە ناسینی خواو بە گەورە گرتنی ئەو خوایە داخوازە بۆ ئەوەی کە بڕوا ببێ بەوەی کە خوا فروستادەو پێغەمبەران رەوانە بکات، بۆ سەر بەندەکانی، بەرنامەی خۆی بنێرێ بۆیان، نامەیش بنێرێ بۆ هەندێکیان تا ئەو نامە بمێنێتەوە لەناو گەل و ئوممەتەکەیاندا لەپاش خۆیان تا ماوەیەك وەك نامەی موسا و عیسا و داود، یا بمێنێتەوە هەتا دنیا دنیایە وەك ئەم قورئانە، ئینجا لەسەر باری یەکەم بەرپەرچی دانەوەو دەم کوت کردنی بەو نامە و پێغەمبەرەی کە بڕوایان پێی بوو و ئەیان ناسین، لەسەر باری دووەمیش لەبەر ئەوەی فروستادەیی موسا بەناوبانگ بووە لەناو عەرەب و لە نیوە دورگەدا، نامەداران ناسراو بوون لەوێدا، خوا فەرمانیدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کەبەرەنگارو روو بەرووی ئەوبت پەرستانە بوەستێ بە موسا و نامەی موسا، فەرموی: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە ﴿مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ﴾ ئایا کێ ئەو نامەیەی هێنایە خوارەوە کە موسا هێنای ﴿نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ﴾ لە کاتێکدا کە ئەو نامەیە رووناکییە، واتە خۆی لە خۆی دا روون و ئاشکرایە و روون کەرەوەی شتی تریشە، لەکاتێکدا رێنموونییە بۆ مەردومان، واتە رێی خوایان نیشان ئەدات کە تەنها ئەوە رێی راستە و هۆی رزگارییە،

﴿تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ﴾ ئەیخەنە ناو چەند کاغەز و لیێ نووسراوێکەوە بە پارە پارە. ﴿تُبۡدُونَهَا وَتُخۡفُونَ كَثِيرٗاۖ﴾ کە دەری ئەخەن و زۆریشی لیێ ئەشارنەوە لە کاتێکدا کە بە پێویستی بزانن وەك ناونیشانی پێغەمبەر. زۆربە بەم جۆرەیان خوێندووەتەوە،(ئیبن و کەسیر و ئەبو عەمر) خوێندوویانەتەوە: ﴿یجعلونە﴾ بەهۆی ئەو دوو خوێندنەوەوە زانایانی تەفسیر جیاوازو دووبەرەکین لە تەفسیرەکەیدا، هەندێکیان بە یەکێك لە موشکلیەکانی قورئانیان داناوەو قسە و باسی زۆری تێدا کراوە، ئەوەی لە دڵمدا جێگیر بیێ ئەوەیە: ئەگەر ئەم ئایەتانە دەربارەی جوولەکە هاتبنە خوارەوە – وەك زۆربە لەسەر ئەوەن – ئەوا لە پێشەوە بەرپەرچیان ئەداتەوەو دەم کوتیان ئەکات، ئینجا بەم وتانەش سەرزەنشتیان ئەکات و پلاریان لێئەدات بەوەی کە ئەو نامەیە لەبەر دەستیاندایە و بە چاکی ئەیناسن و لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی بەسەردا ئەهێنن و دەست کاری ئەکەن، ئینجا لەسەر خوێندنەوەی زۆربە ﴿تجعلونە.. هتد﴾ روو بە روویان ئەوەستیێ و کارەکەی خۆیانی ئەداتەوە بە ناوچاویاندا، لەسەر خوێندنەوەی ﴿یجعلونە... هتد﴾ زیادە ریسوا کردنی تێدایە بەوەی رووی فەرمودەکەیان تێناکات و بە شیاوی ئەوەیان دانانیێ، چونکە ئەو کردەوە بەدەیان کردووە. ئەگەر سەرەتای ئایەتەکان دەربارەی بت پەرستەکان هاتبیێ ئەوا بەوە بەرپەرچیان ئەداتەوەو دەم کوتیان ئەکات بەو نامەیە کە بەناوبانگ بوو بەلایانەوە، ئینجا بەو بۆنەیەوە باسی جوولەکە ئەکات و ئەو پلارەیان لێئەدات بەو کردەوە بەدەیان، جا لەم کاتەدا خوێندنەوەی ﴿یجعلونە... هتد﴾ هیچ گریێ یەکی تێدا نییە، بەڵام بۆ خوێندنەوەی بە ﴿تجعلونە﴾ ئەبیێ بڵێین: رووی فەرمودەکەی وەرگێڕاوە لە بت پەرستەکانەوە بۆلای جوولەکەکان، کە ئەوە جۆرە گفتوگۆیەکە بەکار ئەهێنریێ، جۆرێکە لەوەی کە لە زمانی عیلمی بەلاغەدا دانراوە بە: ﴿التفات﴾. بە کورتی ئەگەر سەرەتای ئایەتەکان بۆ جوولەکەکان بێت خوێندنەوەی ﴿تجعلونە﴾ بیێ گرێیە و بۆ ﴿یجعلونە﴾ تەئویل ئەکەین بەو جۆرەی کە گوتمان، ئەگەر سەرەتا ئاراستەی بت پەرستەکان کرابیێ، خوێندنەوەی بە ﴿یجعلونە﴾ بیێ گرێیە و خوێندنەوەی ﴿تجعلونە﴾ ئەبیێ تەئویل بکریێ وەك گوتمان. لێرەدا خاوەنی تەفسیری(المنار) فەرمودەیەکی هەیە بە راستی باش

ئەچێتە دڵـەوە، ئەفـەرموێ: وا دەرئەکـەوێ لـە یەکـەم جـار لـە مەککـەدا خوێندنـەوە بـە ﴿یجعلونه﴾ بووبێ، هەروەها لە مەدینەش تا جوولەکە حوکم و بڕیاری رەجمیان شاردەوە، هەروەها موژدە دان بە هاتنی پێغەمبەرمان و سیفەت و نیشانەکانی لەناو کۆمەڵدا، گۆڕاندن و تەئویل کردنیان بۆ چەند مانا و مەبەستێکی تر لای ئەوانەی کە ئەیانزانی و ئاگادار بوون بە بوونی ئەو شتانە کە سەرۆکەکان ئەیان ویست بیان شارنەوە، هەروەها تا ئەو کاتەی جوولەکەکانیش وەك بت پەرستەکان، ئەو وتە بەدەیان گوت، ئەو کاتە هیچ دوور نییە کە خوا فەرمانی دابێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو رستەیانە ئاراستەی هەموویان بکات بەو جۆرو شـێوەی کـە ئێـستا بـاوە، ﴿ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ لەسـەر ئـەم بـارە هـەردوو خوێندنەوەکە هەر بن بە بێ سڕینەوەو بە بێ گیرو گرفت، ئەم بارە باشتر ئەچێتە دڵەوە، خوا خۆی باش ئەزانێ. بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار مەبەست بەم سێ راناوە جوولەکەیە بەلای هەمووانەوە، بەڵام دووبەرەکی هەیە لە راناوی ئەم رستەیەدا، ﴿ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ﴾ فێـر کـراون شـتێ کـە ئێـوە لەمەوبـەر نـەتان زانیـوە نـە خۆتـان و نـە بـاو باپیرتـان لـە پـێش خۆتانەوە، زۆربە لەسەر ئەوەن کە مەبەست جوولەکەیە و بەمە زیادە سەرزەنشتیان ئەکات، واتە ئەی نامە دارەکان ئێوە زیاد لەوەی کە لە ئایین و نامەکەتاندا زانا کراون، لەلایەن ئەم پێغەمبەرو قورئانیشەوە شتێ فێرکراون کە نە خۆتان و نە باوك و باپیرتان نەتان زانیوە کە ئەوان زاناتر بوون لە ئێوە، وەك ئەو شتانەی کە دووبەرەکی بوون تێیاندا و ئەم قورئانە روونی کردەوە و باسی کرد بۆتان، هەروەها وەك ئەو هەموو شتە زیادانەی کە لەم شەریعەتە تێـرو تـەواوە و هـەتا هـەتایی یـەدا هـات کـە هـەموو کاروبـاری جیهـان و ژیـانی لـێ وەرئەگیرێ.(مجاهد) لەسەر ئەوەیە کە مەبەست عەرەب و هەموو موسڵمانانە کە بێ ئاگا بوون لەو هەموو شتە گرنگانەی کە لەم قورئان و شەریعەتەدا هات، لەسەر ئەم رایە مەبەست بیر خستنەوەی ئەم ئوممەتەیە و سەرنج راکێشانیان بۆ ئەم ئایین و شەریعەتە گەورەیە، لەپاش ئەوەی سەرزەنشتی نامەدارەکانی کرد، بەڵام بەڕاستی رای یەکەم و زۆربە زۆر لە دڵدا جێگیر و بەهێزە، ئینجا خوای گەورە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە وەڵامێکی ئەو پرسیارە بداتەوە، کە هەر ئەوە وەڵامە و هەرکەس ژیر بێت و سەرکێشی بەکار نەهێنێ ئەبێ هەر ئەو وەڵامە بداتەوەو ماوەی ئەوانی نەدا دەمە دەمێی تیا بکەن،

قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا

**فەرمووی: ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەو کەسەی کە نامەی هێنایە خوارەوە بۆ سەر موسا خوایە کە ناوی(الله) یە. لە فەرماندانی بە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ وەڵامدانەوە چەند شتێك وەرئەگیرێ:**

**١- وەڵامی ئەوپرسیارە هەر ئەبێ ئەوە بێت و هیچ شتێکی تر دەست نادات بکرێ بەوەڵام.**

**٢- دەست نیشان بە یەك کەوتنی ئەوانە و دەستە پاچەیی یان لەوەی هیچ شتێك بڵێن.**

**٣- هەر ئینکاری و دەم بازی یەك بکەن لە رووی سەرکێشی و یاخی بوونەوەیە، نەك هیچ شتێکیان بە دەستەوە بێت.**

**ئینجا هەڕەشەیان لێئەکات و لە هەمان کاتدا بێ نرخیان نیشان ئەدات، ئەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ﴾ لە پاش ئەو روون کردنەوەی هەق و راستی و بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر نەهێشتنی هیچ برو بیانوویەکی ئەوانە، لە پاش ئەوە ﴿ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ﴾ لێ یان گەڕێ لەناو ناهەقی و بەتاڵی خۆیان دا وازیان لێ بێنە ﴿يَلْعَبُونَ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوانە گاڵتە و لاقرتی ئەکەن و کاری بێ نرخی و منداڵانە ئەکەن، تۆ زیانبار نابی و هیچ کارێکی ئەوان لەسەر تۆ نییە و روو ناکاتە تۆ. ئینجا ئەدوێ لەبارەی ئەم نامە تازەوە کە ئەوانە بڕوایان پێی نییە، کە سەرنج ئەدەین شتێکی بێ وێنەو نەوزهور نییە و بەڵکو لە پێش ئەمەوە نامەی تر هاتووە، ئەفەرمووێ: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ﴾ ئەم قورئانە نامەیەکە کە ئێمە هێنامانە خوارەوە، ﴿مُبَارَكٌ﴾ پیت و فەڕدار کراوە و سوود و قازانجی زۆر هەمیشەیی یە، لە هەموو بارەوە دامەزراو و ﴿مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بڕوادار بە راست گێڕی نامەیەکە لە پێش ئەمەوە هاتووە، واتە تەورات، یان هەموو نامەکانی ئاسمان کە دەستکاری نەکراوبن و لەسەر بار و شێوە راستەکەی خۆیان بن، چونکە هەموو نامەکانی خوا لەبارەی عەقیدە و بیرو باوەڕەوە یەك شتن و هیچ جیاوازی یان نییە، کورتە و پاڵفتەی هەموویان بانگ کردنە بۆ پەرستن و گوێڕایەڵی خواو**

دووركەوتنەوە لە هەر شتێكی ناڕاست و ناهەق و هەر بەرنامەیەك كە لەلایەن خواوە نەهاتبێ، بە كورتی هەموو نامەكانی خوا لە ئەسڵ و بنەڕەتدا یەكن و هیچ جیاوازی یەكیان نییە، جیاوازییان هەر لە فەرع و لق و پەل و پۆدا هەیە، كەواتە هێندێ لە نووسەران كە ئەیانەوێ و وەسف و سەنای ئیسلام بكەن بەمەی كە ئیسلام یەكەم ئایینە كە بیرو باوەڕی تەنیایی خوای هێنا بە تێرو تەواوی، یان بیرو باوەڕی ڕاست و ڕەوای هێنا لەبارەی فروستادەو فروستادەیی یەوە، یان لەبارەی ڕۆژی دوایی و حیساب و پرسیارو نزا و سزاو تۆڵە و پاداشت و دۆزەخ و بەهەشتەوە، ئەوانەی كە ئەو جۆرە قسانە ئەكەن هەڵەن و ترازاون لە ڕاستە شەقامەكەی قورئان، ئەو قسە و باسانەیان وەرگرتووە لە بۆچوون و بڕیاری ئەوروپایی یەكان كە ئەڵێن: بیرو باوەڕ و عەقیدە ئاسمانی یەكانیش گۆڕان و بەرز بوونەوە بە گوێرەی گۆڕان و بەرز بوونەوەی گەل و چینەكانی ئادەمی، ئەبێ نووسەران و خوێندەوارەكان خۆیان بپارێزن لەو جۆرە هەڵە و لادان و ترازانە كە ئەو ئەوروپایی یانە تێی كەوتوون، ئەم قورئانە بڕواداره بە نامەكانی تریش، چونكە ئەوەی ئەوان هێنایان ئەمیش هێنای وەك گوتمان، بەڕاست گێڕە و ڕاستی ئەوان دەرئەخات، چونكە ئەم موعجیزەیە، ئینجا هۆی ئەم ناردنە خوارەوەی ئەم قورئانەمان بۆ باس ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ واتە ئەم قورئانەمان ناردە خوارەوە لەبەر پیت و فەڕو بڕوا هێنان و بە ڕاست گێڕانی نامەی پێشی خۆی، لەبەر ئەوەی ئەی پێغەمبەر تۆ بترسێنی بەم قورئانە دانیشتوانی مەككە و دەوروبەرو چواردەوری. بێگومان پێغەمبەرمان(ﷺ) ڕەوانە كراوە بۆ سەر هەمووان و هەموو جیهانییان، لە پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ئەو جارەیدا لە چەند سورەت و ئایەتێكدا، وەك ئایەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ و ئایەتی(١٠٧) ی سورەتی(الأنبیاء) و ئایەتی(١٥٨) ی سورەتی(الأعراف): ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾ هەموو ئەو ئایەتانەی كە گشتێتی ئەم ئایین و پەیامە نیشان ئەدەن مەككەیین و كاتێ هاتوونەتە خوارەوە كە بانگ و بانگەوازەكەی پێغەمبەرمان(ﷺ) لە شیو و دۆڵەكانی مەككەدا چوار دەور درا بوو، بەڵكو هەندێكیان لە سەرەتای چەرخی مەككە و یەكەم جاری هاتنی ئەم ئایین و پەیامەدا هاتن وەك دواترین ئایەتی سورەتی(ن): ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ

﴿لِلْعَٰلَمِينَ﴾ کەواتە مەبەست لە: ﴿من حولها﴾ هەموو دانیشتوانی ئەم زەوی و جیهانەیە، وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ – خوایان لێ رازی بێت – و لە ئایەتی(١٩) ی ئەم سورەتەیش دا هەر ئەوە نیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾ ئەم قورئانە سروش و وەحی کراوە بۆلای من بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم و هەرکەس ئەم قورئانەی پێ گەشتبێ و پێی بگات، یان مەبەست هەر دەوروبەری مەککەیەیە، بەلاّم بە پێی سروشتی کارەکە هاتووە کە ئەبێ بەرە بەرە بێت و بەو جۆرە پەرە بستێنێ تا هەموو بگرێتەوە و بگات بە هەمووان، یان لێرەدا مەبەست ترساندنێکە کە لە چەرخی پێغەمبەردا و بە شەخسی پیرۆزی خۆی کرابێ، دەی ئەوەش هەر بۆ مەککە و شارو دێهاتەکانی دەوروبەر و ئەو ناوچەیە بووە، بۆ ولاّتەکانی تر و لە پاش خۆی بەهۆی یارەکانی ئەوەوە کراوە، بەهەرحالّ و بار رێی جوولەکە و شوێن کەوتووەکانی جوولەکە نییە کە ئەم ئایەتە بکەن بە بەلّگە لەسەر تایبەتی کردنی ئەم ئاین و پەیامە بە عەرەبەوە، دەم کوت ئەکرێن لەو قسە و باسە ناڕاست و ناپەسەندە کە دایان و ئەیدەن بە گوێچکەی نەفام و نەزاندا کە گوایە پێغەمبەرمان(ﷺ) هەر بۆ سەر عەرەب هاتووە، خۆیشی لە یەکەم جارەوە نەیویستووە تێپەڕ بکات لە مەککەو دەوروبەری، بەلاّم کاتێ کارەکەی سەرکەوت لەوێدا تەماع گرتی، تا نیو دورگەیشی داگرت، ئەو ئایەتانەی کە باسمان کردن دەم کوتی ئەو جوولەکە و شوێن کەوتووانە ئەکەن و قوڕ ئەدەن بە دەمیاندا، شاری مەککەی پیرۆز بە(أم القری)، دایکی شارەکان، واتە ئەسلّ و بناغە و بنەڕەتی شارەکان، چونکە رووگەی هەموو دانیشتوانی شارو ولاّتەکانە، یان لەبەر ئەوەیە کە یەکەم مالّی خوای تیایە کە دروستکرا بۆ ئادەمی کە جێگەی حەج و کۆبوونەوەیان بێت، یان لەبەر ئەوەیە کە لای خوا گەورەتر و بە نرخ تری هەموو شارو دێیەکە. یان لەبەر ئەوەیە کە مەردوم رێزی ئەگرن بە وێنەی دایکیان، یان لەبەر ئەوەیە بانگ کردنی گشتی دەرچوو بۆ هەموو دانیشتوانی زەوی، یان لەبەر ئەوەیە – وەك زانایانی تەفسیر – ی پێشوو فەرموویانە: زەوی لەوێوە دەست کرا بە راخستنی و ئامادەکردنی بۆ ژیان بەسەری یەوە،

وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَهُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٞ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثۡلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۗ

---

**﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەو كەسانەی كە بڕوایان هەیە و بڕوا ئەهێنن بە ماڵ و بە رۆژی دوایی و بەو ژیانەی كە لەو رۆژەدا ئەبێ ﴿يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ ئەوا بڕوایان هەیە و بڕوا ئەهێنن بەو نامە بەفەڕە، واتە ئەم قورئانە كاتێ پێ یان بگات و پێیان رابگەیەنرێ، چونكە لەم نامەدا دەستیان ئەكەوێ رێنموونی تەواو بۆ خۆش بەختی و كامەرانی هەرە گەورە لەو رۆژەدا، ئەو كەسەی بڕوای بەو رۆژە ببێ بێگومان ئەترسێ لە سزا و تۆڵەی ئەو رۆژە، ئارەزوو سۆزی ئەبێ بۆ پاداشت و نازو رێزەكەی، ئەوەیش پاڵی پێوە ئەنێ بۆ بیر كردنەوە لەم هەموو رابەر و بەڵگەیانە كە هۆی بڕوا هێنانن بەم قورئانە، ئەو كەسەی كە بڕوادار بێ بەو رۆژە، ئەبێ بڕوای بەوە ببێ كە خوا فروستادە ئەنێرێ بۆلای بەندەیانی و سروش ئەكات بۆلای، ئەو بڕوایە هیچ ئەرك و گرێیەكی تێدا نییە لە دەروونیدا، بەڵكو هان دەر و پاڵ پێوەنەری دەست ئەكەوێ بۆ ئەو بڕوایە، بۆ پەیوەندی یەكی بەهێز بەو خوایە و بەندەیی و گوێرایەڵی ئەو خوایە، لەبەر ئەوە ﴿وَهُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوانە پارێزەرن لەسەر نوێژەكانیان كە بەهێزترین هۆو پاڵ دەرە بۆ ئەو پەیوەندی و گوێرایەڵی یە، بە كورتی ئەو كەسەی كە بڕوای تەواوی ببێ بە رۆژی دوایی، بڕوا ئەهێنێ بەم نامە و بە نێرەری ئەم نامەیە، سوور ئەبێ پەیوەستی و پەیوەندی و گوێرایەڵی.**

**لەپاش ئەو گەردشانەی كە كردی بە دڵ و دەروون، ئینجا شێوەیەكی زۆر سەخت و سامناكی ئەو ستەمكارە بت پەرستانە ئەخاتە روو كە لەم جیهانەدا هەڵئەسان بە چەند تاوانی گەورە، وەك ئەوەی كە درۆیان هەڵئەبەست بەدەم خواوە، یان لاف ئەوەیان لێئەدا كە سروش و وەحی یان بۆ هاتووە، یان لاف ئەوەیان لێئەدا كە ئەتوانن وێنەی ئەم قورئانە بێنن،**

شێوەی ئەو ستەمکارانە کە هیچ ستەمێك ناگاتە ستەمی ئەوان، لە کاتێکدا کە ئەکەونە گیان کەنشت، مەلائیکە سزایان ئەدەن لەو کاتە سەختەدا، ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئایا کیٚ ستەمکارترە لەو کەسەی کە درۆ هەڵئەبەستیٚ بەدەم خواوە، وەك ئەوانەی کە بە درۆوە ئەیانگوت: خوا رەوانەی کردوین بە پێغەمبەریتی، یان شتی درۆو ناهەقیان رەوا ئەدا بۆ خوا وەك رەوادانی کوڕ و کچ و هاوبەش ﴿أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ﴾ یان گوتبێتی سروش کراوە بۆلام. ﴿وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ﴾ لە کاتێکدا هیچ شتێك سروش نەکرابیٚ بۆلای وەك ئەوانەی کە لاف پێغەمبەرێتی یان لێئەدا، یان گوتبێتی: ﴿وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ منیش ئەهێنم وێنەی ئەوەی خوا هێناویەتی یە خوارەوە، وەك ئەوانەی کە ئەیانگوت: ئەگەر بمانەویٚ بێگومان وێنەی ئەم قورئانە ئەڵێین، واتە هیچ کەس لەمانە ستەمکار تر نییە، لە(قتادة و ئیبن و عەباس) ەوە هاتووە – خوایان لیٚ رازی بێت – کە مەبەست بە یەکەم ئەوانەی کە لاف پێغەمبەرێتی یان لێئەدا، وەك(موسەیلەمە و سحاتی ژنی و ئەسوەدەی عەنسی)، مەبەست بە دووەم و سیٚ یەم(عەبدولاّی کوڕی ئەبو سەرحە) کە موسڵمان بوو و بوو بە نووسەری پێغەمبەر(ﷺ) کاتیٚ ئایەتی سورەتی(المؤمنون) هاتە خوارەوە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾، تا ئەگاتە: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾ لەوێدا زۆر سەری سوڕما لەوەی بە درێژیی باسی دروست کردنی ئینسانی کرد بەهۆی ئەوە گوتی: ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾، لەوێدا پێغەمبەریش فەرموی: بەو جۆرەی تۆ گوتت هاتووەتە خوارەوە بۆ سەرم، بەهۆی ئەوەوە ئەو(عبدالله) یە کەوتە گومان و گوتی: ئەگەر محمد راست ئەکات لەو قسەدا ئەوا منیش سروشتم بۆ هاتووە هەرچۆنیٚ بۆ ئەوە هاتووە، ئەگەر بە درۆ ئەڵیٚ ئەوا منیش گوتم بە وێنەی گوتنی ئەو، بەهۆی ئەوەوە پاشگەز بوویەوە لە ئیسلام و گەڕایەوە بۆ ناو بت پەرستەکان، گەڕایەوەبۆلای ئیسلام لەپێش فەتحی مەککە.ئەوەیەکەئەفەرمویٚ: ﴿وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾بەم جۆرە(کەلەبی)ئەگێرێتەوەلە(ئیبن و عەباس)ەوە–خوایان لیٚ رازی بێت–.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾

**بەهەرحاڵ ئەم ریوایەتانە سەحیح بن یان نەء، ئەم دوو ئایەتی داهاتوو هاتنە خوارەوە، ئەم هەڕەشە سەخت و سامناکەی ئاراستەی ئەوانە کرد کە ئەم وتە بەدەی گوتبێ یان بیڵێ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ﴾ ئەگەر ئەبینی ئەی پێغەمبەر، یان هەرکەسێك کە دەست بدات بۆ سەرنجدان، ئەگەر ئەبینی ﴿إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ﴾ ئەو کاتەی کە ئەو ستەمکارە بێ بڕوایانە وان لە ئێش و ئازارە زۆر سەختەکانی مردن و گیان کەنشتدا، ئێش و ئازاری لەشی و دەروونی کە داگیریان ئەکات و وەك شەپۆلی ئاو ئەدا بەسەریاندا ﴿وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ﴾ فریشتەکانی گیان کێشان دەستیان بۆ درێژ ئەکەن بە لێدان و سزادان و گیان کێشانیان زۆر بە توند و تیژیی و پێیان ئەڵێن: ﴿أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ﴾ گیانەکانتان دەربێنن و رزگاریان بکەن لەم تەنگی و ناڕەحەتی یەی کە وان تیایدا، واتە لاقرتی یان پێئەکەن و تەشەریان لێئەدەن، یان دەریان بێنن گیانەکانتان و دەری کەن لە لەشەکانتان و رزگار بوونتان نییە، واتە ئەگەر ئەوە ئەبینی و ئەو ستەمکارانە ئەبینی لەو حاڵ و کاتە سەختەدا بەڕاستی شتێکی زۆر سەخت و سەر سوڕهێنەر ئەبینی، بەڕاستی وێنەو شێوەیەکی زۆر سەخت و دڵ تەزێن و داچڵەکێنەرە، بە بیر لێکردنەوەیشی هەق وایە خەو و خواردن نەمێنێ و تیکە لە گەرودا بگیرێ، خوا پەنامان بدات بە میهرەبانی خۆی لە تۆڵە و سزادانی خۆی، پێیان ئەڵێن: ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ﴾ ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ ئەسێنرێ و دووچاری سزای بێ نرخ و زۆر ریسوا ئەکرێن ﴿بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾ بەهۆی ئەوەی شتی ناڕاست و ناهەقتان دەست هەڵبەست ئەکردوئەتان سەپاندبەسەرخوادا وەك ئەوانەی لە سەرەتای ئەم ئایەتەدا باسکرا، ﴿وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ خۆتان بەزل ئەزانی ورووتان وەرئەگێڕا لە ئایەتەکانی و بیرتان لێنەئەکردەوە و بڕواتان پێنەهێنا، ئینجا لە کۆتایی باسەکەدا ئەم تانەو تەشەرو سەختەیان ئاراستە ئەکرێ لەلایەن خواوە،**

وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٩٤﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ

---

﴿وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ﴾ **بێگومـان ئـەواهاتن بۆلامـان بـە تـاك وتەنیاویەكەیەكـە ورووت لەهەمووماڵ و ئەولادوهاوسەروكۆمەك وبت وهەرشتێ كە دڵتان بەسترا بوو پێیەوە،** ﴿كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ **هەرچۆن و مانەندی ئەوەی كە دروستمان كردن لە یەكەم جاردا بەو جۆر و شێوەیە،** ﴿وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ﴾ **بەجێتان هێشتن ئەوەی كە پێماندان و بەخشین لە ماڵ و سامان و هەر شتێ، هەموو ئەوانەتان بەجێ هێشت لەپاش خۆتان لە جیهاندا، هیچتان پێش نەخست بۆ خۆتان و لەگەڵ خۆتان نەتان هێنا، هیچ دەسەڵاتێكتان نییە بەسەر نە زۆر و نەكەم لەو شتانە** ﴿وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ﴾ **نابینین لەگەڵتان تكاكارەكانتان كە لاتان وا بوو و بە درۆوە لافتان لێئەدا كە ئەوانە هاوبەشی خوان لە نیوەدا، ئەتان كردن بە هاوبەش لە ژیان و سامان و داراییتاندا، ئەتان گوت ئەمانە ئەبن بە تكاكار بۆمان لای خوا** ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ﴾ **بێگومان پچڕا پەیوەستی و پەیوەندی نێوانتان، پچڕا هەرچی پەیوەندی و پەیوەستی یەك كە هەبوو لە نێوان ئێوە و ئەواندا،** ﴿وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ **ون بوو لێتان هەرچی كە لافتان لێئەدا، هەر درۆ و دەلەسەیەك كە لە جیهان دا كردتان، هەر تەماو ئومێدێك كە بووتان لەبارەی ئەو بت و پەرستراوە ناهەقانەوە هەموو زایە بوون و بە هیچ دەرچوون، بەڕاستی چەشمەنداز و وێنە و شێوەیەكی ئێجگار سەخت و سامناك و دڵ تەزێنە و دەروون ئەخاتە لەرزە... خوا پەنامان بدات...**

**لەپاش باس و روون كردنەوەی تەنیایی خوا و روون كردنەوەی پێغەمبەرێتی، ئینجا هەندێ لە كردەوە نایابەكانی خوا ئەخاتە بەرچاو كە زۆر سەرسوڕهێنەرن و بەڵگەو نیشانەیەكی زۆر روون و ئاشكران لەسەر زانین و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا، لەسەر لێزانی**

و کاردروستی خوا لەم بوونەوەرەدا، بەڵام بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە ئەو شتە ئاشکرایانە فەرامۆش ئەکرێن و لەبیر ئەچنەوە، لەو هەموو هەوڵ و تەقەلای قورئانەوە دەرئەکەوێ کە مەبەستی گرنگ و سەرەکی ناسینی خوایە، بەخۆی و هەموو سیفەت و کردەوەکانی یەوە، چونکە ئەو ناسینە کان و کانگای هەموو فەڕو پیتێکە لە هەردوو جیهاندا، وەك نەناسین و بێ ئاگایی لەوە مایە و کانگای هەموو نەگبەتی پاش بڕاوی و هەموو بەسەرهاتێکی بەدە لە هەردوو جیهاندا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾ بێگومان خوا لەتکەری دانەوێڵە و ناوکە تۆمەیە، لە دانەوێڵەیەکی وشك ئەو گیا و گەڵا و ساق و گوڵە دەرئەهێنێ، لەو ناوکە وشك و برینە ئەو درەختە گەورانە دەرئەهێنێ بە هەموو کەرەسە و ساق و پەل و گەڵا و بەرو میوەکانەوە، ﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ﴾ زیندوو دەرئەهێنێ لە مردوو، واتە ئەوەی کە خۆراك وەرئەگرێ و گەشە ئەکات کە ئەمە پەست ترین پلەی زیندووە بەلای عەرەبەوە، چەند پلە و رادەی تر هەیە لە ژوور ئەمەوە تا ئەگاتە زیندووی راستەقینە کە سەرچاوەی هەموو زیندووانە، دەرئەهێنێ لەوەی کە پێویستی نییە بە خۆراك و گەشە ناکات، ﴿وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ خوا دەرهێنەری مردووە لە زیندوو، هەر لە یەکەمجارەوە ئەم بوونەوەرە پەیدا بوو یان هیچ نەبێ ئەم زەوییە پەیدا بوو، لەو کاتەدا گیان نەبوو، ئینجا گیانلەبەر پەیدا بوو... خوا دەری هێنا لە بێ گیان، چۆن؟ ئێمە نازانین! لەو کاتەوە کە گیان پەیدا بوو زیندوو مردوو لە مردوو دەرئەچێ، بەم رەنگە ئەتۆم و وردیلکە مردووەکان لە هەموو کاتێکدا ئەگۆڕێن بە چەند کەرەسەیەکی زیندوو کە ئەبن بە ئەندام لە لەش و قەبارە زیندووەکاندا، ئەوانە کە لە بنەڕەتدا مردوون وەرئەگەڕێن بەچەند سێڵێکی زیندوو، هەروەها بە پێچەوانەوەش... بەم رەنگە لە هەموو کاتێکدا سێڵە زیندووەکانیش وەرئەگەڕێن بە ئەتۆم و وردیلکە مردووەکان تا ئەو قەبارە و لەشە هەموو لە رۆژێ لە رۆژاندا، ئەبێ بەو وردیلکە مردووانە!

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٩٧﴾

---

**بەڕاستی پەیدا بوونی گیان و بزووتنەوەی گیان شتێکی سەر سوڕهێنەرە و هیچ نازانێ چییە و چۆن پەیدا ئەبێت چ جای ئەوەی هیچ کەس بتوانێ خۆی بکات بە خاوەنی و هیچ لافێك لێبدات لەو بارەیەوە، هەمیشە دانەوێڵەیەکی بێ گیان لەت ئەبێ و گیان چەکەرەیەکی گەشە کەر و گیانداری لێدەرئەپەڕێ، ناوکەیەکی وشکی بێ گیان درەختێکی لێدەرئەچێت و بەرز ئەبێتەوە، ئەو گیانە شاراوە لەو دانەوێڵەیە و ناوکەیەدا کە گەشە ئەکات لە گیا و درەختەکەدا شتێکی نهێنی یە و بێجگە لە خوا هیچ کەس نازانێ چییە و سەرچاوەکەی لە کوێوە هاتووە، بێگومان هەر هەوڵ و تێکۆشانێك کە کرا لەلایەن مەردومانەوە بۆ زانین و ڕێبردن بە حەقیقەت و سەرچاوەی گیان، هەر هەموو ئەوانە بە هیچ دەرچوون، بێجگە لەوەی کە حەواڵەی خوا بکرێ و بە دروستکراوی خوا دابنرێ، هەرشتێکی تر کە گوتراوە و بگوترێ هەموو دەم بازی و وتەکاری یە و ئەگەڕێتەوە بۆ سەرکێشی و یاخی بوون لە ڕاستی و لە وتەو وتاری زۆر کە لە زانایانی تازەدا ئەوە دەرئەکەوێ بە روونی کە هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبی(الله یتجلی فی عصر العلم) بکات تا مەسەلەکەی بۆ دەرکەوێت، بێگومان هیچ کەس لە رووی ڕاستیدا هیچی بۆ نامێنێتەوە بێجگە لەوەی کە لێرەدا قورئان فەرمویەتی: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ﴾ ئەوەیە ئەوخوایەی کە ناوی(الله) یە و شایستەی پەرستن و گوێرایەڵی یە ﴿فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە چۆن لادراون لە پەرستنی ئەو خوایە ئەی بێ بڕواکان؟ واتە لادانتان لەو خوایە زۆر ناڕاست و ناهەق و جێی سەرسوڕمانە!**

**لەئایەتی پێشوودا هێندێ نیشانە و بەڵگەی زەمینی خستە بەرچاو، ئینجا هێندێ لە کردەوە نایابەکانی ئاسمانی ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ﴾ ئەو خوایە دروست کەری شەبەق و ڕووناکی و ڕۆژ بوونەوەیە وەك لە(ئیبن و عەباس و ضحاك و قتادة) وە ڕیوایەتکراوە، یان مەبەست ئەوەیە کە شەبەق و ڕووناکی یەکەی لەت ئەکات و بە تیشکی**

خۆر یان مەبەست ئەوەیە تاریکی شەبەقی یەکەم لەت ئەکات بە رووناکی شەبەقی دووەم وەك زانایانی تەفسیر بەم جۆرانەیان فەرمووە، بەهەرکام مەبەست بێت کارێکی زۆر نایاب و گرنگە و بەلاّم بەهۆی دەق پێوە گرتنەوە فەرامۆش ئەکریّ، ﴿وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنًا﴾ واتە شەوی گێڕاوە بە کات و هۆی ئارام گرتن و رەحەتی ماندوویی دەرچوون ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانًاۚ﴾ خۆرو مانگی گێڕاوە بە نیشانەی حیساب و دیاریی کردن و زانینی کات و رۆژو مانگ و وەرز و ساڵەکان، یان گەڕان و هەڵ هاتن و ئاوا بوونی ئەو دوانەی گێڕاوە لەسەر حیساب و ژمارەیەکی وردی نەگۆڕاو.

بەڕاستی مەسەلەی پەیدا بوون و هاتنی شەو و رۆژ و گۆڕانی چوار وەرز و گۆڕانی رووی مانگ بە پێی دووری و نزیکی لە خۆرەوە، ئەو وردەکاری یەی کە لەوانەدا کراوە بەو هەموو رێکی و نەگۆڕانە و لەسەر ئەو بارو یاسا دامەزراوە، هەرکەسێك چاوی دڵی کوێر نەبیّ و بێبەش نەبێت لە فام و ژیریی ئەبیّ هەر ئەمە بڵیّ: ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەو کارو کردەوە و گێڕاندنە بڕیارو رێکخستنی خوایە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا و لێزان و کاردروستە و هیچی لیّ ون نابیّ، هەرکەس ئەوە نەڵیّ ئەبیّ چی بڵیّ؟ ئایا ئەڵیّ: ئەو مانگ و خۆرو شتانە خۆیان بە خۆیان ئەو کارو بارە ئەکەن و ئەیبەن بەڕێوە؟ ئایا ئەڵیّ: بە رێکەوت و بە بیّ هیچ کەس ئەو کارو بارە ئەڕوا و فەراهەم دێت؟ بێگومان هەرکەس هەرکام لەم دووبارە بڵیّ بەدەم لە دەروونی خۆیدا ئەزانیّ کە هەرکام لەم دوو بارە شتێکی ناڕاست و ناڕەوایە و شایستەی ئەوەیە کە خەجاڵەت ببیّ و تەریق ببێتەوە لە گوتنی، کەواتە هەر ئەو بارە راستە ماوەتەوە کە قورئان فەرموی. هەروەها پێویستە هەر ئەو بارە بگیریّ بە دەستەوە لە کاروباری ئەم بوونەوەرو جیهانەدا، چونکە ئەوەندە بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرا هەیە و دەرکەوتووە وەك بە درێژیی خراونەتە بەرچاو لە پەڕاو و نامێلکەکاندا، ئەو هەموو بەڵگە و رابەرە روونانە هیچ ماوە ناهێڵنەوە و دەم کوتی ئەو کەسانە ئەکەن کە بیانەویّ هەرکام لەو دووبارە راستە بڵێن و ناچاری ئەکەن کە هەر بڵێن: ﴿ذلك تقدير العزيز العليم﴾ ئینجا جۆرێکی تر لە رابەرو بەڵگە ئاشکراکانی ئاسمانی ئەخاتە بەرچاو و ئەفەرمویّ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە دایهێناوەو گێڕاویەتی بۆ سوودی ئێوەو ئەستێرەکان، ئەو ئەستێرانە چەند سوود و نرخی ئاشکرایان هەیە وەك قورئان لە چەند

شوێندا دەست نیشانی بۆ ئەکات و ئەوەی لێرەدا باسی ئەفەرموێ ئەمەیە: ﴿لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ بۆ ئەوەی رێیان پێ دەرکەن لە تاریکی یەکانی بەرو دەریادا، چ تاریکی ئاشکرا وەك تاریکی شەو، یان تاریکی سەرگەردانی رێ هەڵەکردن لە چۆڵ و بیابانەکان و لەناو دەریا گەورەکاندا، رێ دەرکردن بەو ئەستێرانە لە دوو بارەوەیە: یەکەم: لە بارەی ناسینی کاتەکانی شەو و مانگ و ساڵەوە، دووەم: لە بارەی رێگەوبان و جێگەو شوێنێ کە مەبەستە و نیاز ئەکرێ، شتێکی ئاشکرایە کە ئەو ئەستێرانە لە کۆن و لە تازەوە لەمەوپێش و ئێستا و لە داهاتوودا هۆی ئەو رێ دەرکردنەن، سوود و نرخێکی گرنگ و گەورەیان هەیە بۆ ئێمە: ئینجا گەورەترین سوود و نرخ رێ پێدەرکردنیانە لە تاریکی بیرو بۆچووندا کە بێگومان بیر کردنەوە لەم ئەستێرانە و چۆنێتی و جیاوازی جێ و شوێن و شێوە و رەنگ و هەڵهاتن و ئاوا بوونیان و پەیوەندی و پەیوەستی یان پێکەوە لەسەر ئەو بار و رژێم و یاسا تێرو تەواوە، بە تایبەتی لەم چەرخی تازەدا کە ئەوەندە شتی گەورەو گرنگ دەرکەوتوون مەردوم سەرسام و شەیدا ئەکەن، بیرکردنەوە لێیان بەو جۆرە دڵ و دەروون پڕ ئەکات لە بڕوا بە پەروەردگاری زانای کاردروست، ئەو دەستە قودرەتە ئەخاتە بەرچاو کە ئەو کارە گرنگ و بەنرخەی کردووە، وەك سەرنج رائەکێشێ بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بە روونی چەند ئایەتمان باس کرد بۆ ئەوانەی کە ئەزانن و ئاگادارن و تێ ئەگەن لەو ئایەتانە و لە مەبەست پێ یان، ئیتر چ ئایەتەکانی قورئان کە رێنموونی ئەکەن بۆ هەق و راستی، چ رابەرو بەڵگەو نیشانە بوونەوەری یەکان کە ئایەتەکانی قورئان دەست نیشانی بۆ ئەکەن و ئاراستەی دڵ و دەروونیان ئەکەن و چاوی دڵ ئەکەنەوە بۆ بینینی ئەو رابەرو بەڵگەیانە، دەست نیشان ئەکەن بۆ ناوەراستی رێگەی راست، کەواتە بەو ئەستێرانە هەرچۆنێ رێ دەرئەکەوێ لە تاریکی یەکانی بەرو دەریادا، هەروەها رێیان پێ دەرئەکرێ لە تاریکی یەکانی ژیریی و دڵ و دەرووندا، خوای پەروەردگار ئەو ئایەتانەی باس کردووە بۆ هەمووان، چ زانا و چ نەزان، بەڵام تایبەتی کرد بە زانایانەوە، چونکە هەر ئەوان بەهرەمەند ئەبن پێیان. لەپاش ئەوەی رێنموونی کرد بەهەندێ لە ئایەت و رابەرە بوونەوەری یەکان لە زەوی و لە ئاسماندا،

وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾

وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ

---

**ئینجا ڕێنموونی ئەکات بە هەندێ لە ئایەت و رابەرەکان لە نەفس و دەروونی خۆماندا، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە ئێوەی دروست کردو داهێنا لە یەك کەس و لە یەك نەفس کە ئادەمی باوکی هەمووانە، بەڕاستی ئەمە لەلایەکەوە چاکە و بەهرەیەکی گەورەو گرنگە و هۆی یەکێتی و سۆز و بەزەیی یە لەناو رۆڵە و نەوەکاندا، لەلایەکی ترەوە ئەوپەڕی دەسەڵات و لێزانی و کاردروستی خوا نیشان ئەدات کە چۆن ئەو هەموو رۆڵە و نەوەی دروستکرد و ئەیکات لە تەنیا کەسێك، بەو هەموو جیاوازییە لە هەموو بارو روویەکەوە، تەنانەت لەناو براو خوشکی دایکی و باوکیدا، بەڵکو لەناو منداڵی دووانەدا، بەجۆرێ دەست نەکەوتووە و دەست ناکەوێ لە هەموو جیهاندا دووکەس وەك یەك بن تەنها لە رەنگ و وێنە و شێوەو رواڵەتیشدا، چ جای هەموو شتەکانی تر.**

**﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾[1] ئینجا بۆ ئێوە هەیە قەرارگا و شوێنی مانەوە، بۆتان هەیە شوێنی دانانتان بە شێوەی کاتی و بە سپاردە، ئینجا مەبەست بە یەکەم پشتی باوکە و دووەم سکی دایکە یان بە پێچەوانەوە، یان مەبەست بە یەکەم ئەم جیهانەیە و دووەم گۆڕە، یان مەبەست بە یەکەم پیاوەو دووەم ئافرەت، هەرکام هەڵئەگرێ، بەڵام تەفسیری یەکەم و دووەم بەهێز ترە بە لامەوە، چونکە مەبەستەکە باسی زۆربوونی ئەو تاقە کەسەیە و پەیدا بوونی ئەو هەموو رۆڵە و نەوەیە لەو تەنیا کەسە، بە هەردوو ریوایەت هاتووە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت –، ریوایەت بە تەفسیری دووەم بەناوبانگ ترە لەناو زانایانی تەفسیردا ئەگەرچی لە دڵدا یەکەم بەهێزترە و خوا خۆی باش ئەزانێ، لەسەر هەرکام لە یەکەم و دووەم دەست نیشانە و سەرنجی تێدایە بە دەسەڵات و لێزانی بێ سنووری خوا، بە ئەوپەڕی**

---

[1] وتەی یەکەم بە جۆرێکی تریش خوێنراوەتەوە:(فمستقرٌ). لەسەر ئەم بارە ئیسمی فاعیلە و دووەم ئیسمی مەفعولە، واتە هەندێکیان نیشتەجێ و ئارام گرە، هەندێ نیشتەجێ نی یە و مانەوەی کاتی یە و بە سپاردە دانراوە، لەسەر ئەوەی کە باوە هەڵئەگرێ هەردوو مەصدەر بن، یان ئیسمی مەکان، واتە بۆتان هەیە مانەوەو ئارام گرتن، بۆتان هەیە مانەوەی کاتی و وەك سپاردە یان شوێنی قەرارگاو مانەوە، شوێنی دانانی کاتی، ئینجا لەسەر هەر بار چەند رایەك هەیە لە تەفسیرەکەیان دا وەك لە کتێبەکان دا باس کراوە، لێرەیش دا دەست نیشانمان بۆ کرد.

کاردروستی خوا کە چۆن ئەو تاقە نەفسەی گێڕا بەو هەموو ئەندام و تیرەو بەرەی زۆر فراوان و جیاواز لە ڕەنگ و نیشانە و شێوەو شتەکانی تردا، وەك دەست نیشانمان بۆ کردن لە سەرەتای ئایەتەکەوە! بێگومان هەرکەس ورد و تێگەیشتوو بێت زۆر سەری سووڕ ئەمێنێ لەم کردەوەیە و تێئەگات کە ئەوە بەڵگە و رابەرێکی زۆر بەهێز و دڵنیا کەرە، وەك ئەفەرموێ: ﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴾ بەڕاستی و بە روونی باسی رابەر و ئایەتەکانی خۆمان کردووە کە بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر دەسەلات و خواهیش و زانین و کاردروستی و بەهرەو بەخشین و میهرەبانیمان، باسمان بۆ کەسانێ کە زانایەکی تێگەیشتوون و بە وردی بیر ئەکەنەوە و ئەکۆڵنەوە لە شت، کەواتە بە باشی سوود و بەرهەم وەرئەگرن لەم ئایەتانە، بەلاّم ئەوانەی کە ورد و تێگەیشتوو نین و چاو و دڵیان نابینایە، ئەوانە تێپەڕ ئەکن بەلای ئەو هەموو رابەرو بەڵگانەدا، بە بێ هۆش و وەك پەردەیەك هێنرا بێ بەسەر چاوی سەریشیاندا، کەواتە هەرچەند بە زانا و خوێندەوار سەیر بکرێن لە راستیدا کەودەن و نەزان و نەفامن، لەبەر ئەوە بەش براون لە پیت و فەڕو بەهرەی ئەو ئایەتانە، ئینجا دێتە سەر ئایەت و رابەرێکی تر کە ئاسمانی و زەمینی یە و لە راستیدا ئێجگار روون و ئاشکرا و بەهێزیشە،ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ ئەهێنێ و هێناویەتە خوارەوە لەلای ژوور و لە ئاسمانەوە ئاو، واتە باران ئەبارێنێ لە هەورەوە کە بەلای سەرەوە،﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ ﴾ ئینجا بەهۆی ئەو ئاوە دەرئەهێنن رووەکی هەموو شتێ، واتە هەموو جۆرێ لە جۆرە جیاوازەکانی ئەوەی کە ئەڕوێ لە زەویدا، ئەمەی کە ئاو هۆی رووان و سەوز بوونە شتێکی ئاشکرایە لای هەموو کەس چ زانا و چ نەزان، بەلاّم کاری ئاو لەوە گەورەتر و گرنگ ترە بە پێی بڕیارو بۆچوون و نەزرەی زانایانی تازە کە ئەڵێن: ئەم زەوی یە لە یەکەم جارەوە بڵێسەدار بووە وەك ئاگر، لە پاشان سارد بوویەوە، ئینجا بەڕێکی رەق و تەق بوو بۆ ئەوەی کە خۆڵی ببێ و دەست بدات بۆ کشتوکاڵ، لە پاشان بەهۆی ئاو و چەند شتێکی تر بەلای سەرویەوە، سەری زەوی گەڕا بە خۆڵێکی نەرم، ئینجا ئاو بەشداری کرد لەوەی کە هێزی رواندنی تیا پەیدا بوو، ئەوەش بەهۆی بزیسکە و چەخماخەی کارەبایی، کە ئەوەی پێ ی ئەگوترێ نایترۆجین پاڵفتەی ئەکرد و لەگەڵ باران ئەباری یە سەر رەزەی، کە ئەوەش کەرەسەیەکە بە بێ ئەوە خۆڵ هیچ شتێك ناڕوێنێ، ئەوەیە کە ئێستا پێی ئەگوترێ:(سماد) و بەکار ئەهێنرێ لە پێك هێنانی کشتوکاڵدا!

فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾

---

﴿فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا﴾ ئینجا دەرئەهێنین و دەرئەکەین لەو ڕووەك و چەکەرانە شتێك کە سەوزە، واتە ساق و پەل و پۆپەك کە لەو تۆمە و دانەوێڵە و ناوکانە دێنە دەرەوە کە ﴿نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا﴾ دەر ئەهێنن لەو شتە سەوزە دانەوێڵەیەك کە نیشتوونەتە مل یەك وەك ئەبینریٚ لە گوڵە گەنم و زەڕات و شتەکانی تردا، ﴿وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ﴾ هەیە بۆ دار خورما لە گۆپکە و گوڵ و خونچەکەی کە چەند هێشوویەك شۆڕ بوونەتەوە و نزیکن لەو کەسەی کە نیازیان ئەکات و ئەیەویٚ بیان چنیٚ، یان بەهۆی قورسی و زۆری دانەکانیانەوە شۆڕ ئەبنەوە بۆ سەر زەوی یان هێشووەکان لەبەر پڕی و زۆری یان نزیکن لە یەکترەوە، بەشێوەی تێهەڵکێش باسی خورمای فەرمووە لەبەر زیادە گرنگی خورما و زۆر بە کەڵکی لە هەموو بارێکەوە و شێوەکەشی زۆر سەرنج ڕاکێشە ﴿وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ﴾ دەرمان هێناوە لەو شتە سەوزە چەند باخ و بەهەشتانێك لە ترێی جۆر بەجۆر ﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ﴾ زەیتوون و هەنار دەرئەهێنین ﴿مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ﴾ ئەم دوو وتەیە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە:

١- هەر مەبەست هەنارەکە بێت، واتە لە کاتێکدا ئەو هەنارە شێوەی درەختەکەی وەك یەك لە ڕەگ و گەڵا و ساق و پەل و دڕك و دیمەنی بەرەکەیدا، چوون یەك نیە و جیاوازە لە تامی بەرەکەیدا، ئەوەتا شیرین و ترش و مێخۆشی هەیە.

٢- وەك دار زەیتون وایە لە دیمەن و جیاوازە و وێنەی ئەو نییە لەبەرو میوە و تامدا، بە کورتی وێنەی ئەوە لە گەڵادا، جیاوازە لە شتی تردا.

٣- هەر بگەڕێتەوە بۆ زەیتوونەکە، بەڵام وێنەی ئەو بڕیارە بدریٚ بۆ هەنارەکە، واتە هەناریشمان دەرهێنا بەو جۆرەی کە باس کرا بۆ زەیتوون.

٤- بگەڕێتەوە بۆ هەردوو واتە ئەوەی کە باسکرا یان هەرکام لەو دووانە ئەو دووبەشەی هەیە بە هەرکام لەو دوو جۆرە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر دەسەڵات و کاردروستی خوا.

خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا لە پاش باسی کشت و کاڵ و دانەوێڵە چوار جۆر لە دە شتی باسکرد، دانەوێڵە و کشتوکاڵی پێش خست، چونکە خۆراکی ژیانی تێدایە و بەهێزترە بۆ ژیان، ئینجا باسی دار خورمای هێنا کە بەرەکەی میوەیە و خۆراکی پێ بژیوە، چەند کەڵکی تری هەیە، ئینجا باسی باخی ترێی هێنا کە ترێ چاکترین میوەیە، ئینجا زەیتوونی هێنا کە شتێکی زۆر بەکارە لە گەلێ بارەوە، ئینجا باسی هەناری کرد کە ئەمیش زۆر بەکارو پەسەندە، ئەو شتە گرنگەی کە باسکرا خستی یە بەرچاو،

ئینجا سەرنج رائەکێشێ بۆ بیر کردنەوەو ورد بوونەوە تا بە بێ هۆش تێپەڕ نەکرێ وەك بێ هۆش و نەفامان ﴿انظُرُوا إِلَىٰ ثَمَرِهِ﴾ سەرنج بدەن و بە دڵ چاو هەڵخەن بۆلای بەرەکەی، بەری هەنار یان بەری هەرکام لە هەنارو زەیتوون یان بەری ئەوەی کە باسکرا لەو هەموو بەردارانە سەرنجێ بدەن ﴿إِذَا أَثْمَرَ﴾ کاتێك کە دەری ئەکات کە چۆن لەو دارە رەق و تەقە ئەو بەرە دێتە دەرەوە بەو جۆر و شێوەی یەکەمجارە کە پێنەگەیشتووە و بەکار نایەت ﴿وَيَنْعِهِ﴾ سەرنجی پێگەیشتنیشی بدەن کە چۆن لەو بارو حاڵی یەکەمجارەوە ئەگۆڕێ و ئەبێ بەو شتە خۆشە کە زۆر جیاوازە لە بارو حاڵی پێشووی، سەرنجی ئەو دوو بارو حاڵە بدەن تا دەرکەوێ بۆتان دەسەڵات و کاردروستی خوا، میهرەبانی و تاك و تەنیایی خوا، بەڕاستی هەرکام لەم شتانەی کە باسکران، هەروەها هەموو دەستکردەکانی تری خوا هەرکام لەمانە موعجیزەیەکی زۆر گەورەو سەر سوڕهێنەرە و خوایەتی خوا و تاك و تەنیایی خوا بە سوودو ئاسان نیشان ئەدا، هەرکام بەڵگە و رابەر و نیشانەیەکی زۆر ئاشکرا و روونن، بەڵام کەسانێ کە سوودی لێ وەرئەگرن کە بڕوادار بن، یان ئامادەیی یان ببێ بۆ بڕوا هێنان، لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكُمْ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بەڕاستی لەم شتە گرنگەی کە فەرمانتان پێدرا بە سەرنج دانی چەند بەڵگە و رابەری زۆر گەورە هەیە بۆ کەسانێ کە بڕوایان هەیە و بڕوا ئەهێنن، ئەوانەی کە بڕوادار نین و ئامادەیی یان تێدا نییە بۆ بڕوا هێنان نەفام و نەزانن و دڵیان کوێرونابینایە، هەرچەند بە ژیرو زانا دابنرێن، کەواتە ئەمانە سوود وەرناگرن، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات و بەهرەمەندمان بکات بە پیت و فەڕی رێنموونی قورئانەکەی.

وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ

لەپاش ئەوەی ئەو هەموو بەڵگە روون و ئاشکرایانەمان خستە بەرچاو کە بە راستی دڵ و دەروون پڕ ئەکەن لە بڕوا بە تاك و تەنیایی خواو دەسەڵات و کارسازی و کاردروستی خوا، لە پاش ئەوە ئینجا بێزاری دەربڕی یەوە لە بێ بڕوایی و خوانەناسی و هاوبەش رەوا دانی نەفامان ئەخاتە بەرچاو کە لە راستیدا زۆر جێگەی سەر سوڕمانە ئەم ئادەمی یە تا ئەو رادەیە پەست و نەفام ببێ و بیرو باوەڕی ئاوا پڕو پووچ بگرێتە گەردن!! ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ﴾ ئەوانە بڕیاریان داوە بۆ خوا چەند هاوبەشێك، ئیتر لە پەرستندا یان لە سەرپەرشتی و پەروەردگاریدا، ﴿ٱلْجِنَّ﴾ واتە ئەوەی کە گێڕاویانە و بە هاوبەشی خوای دائەنێن جنۆکەیە. واتە مەلائیکە وەك لە(قتادة و سدی) یەوە ریوایەتکراوە، کە ئەوانە مەلائیکەیان دائەنا بە کچی خوا و ئەیان پەرست، یان مەبەست بەم(جن) ە شەیاتینە کە گوێرایەڵیان بوون لە گوناهو هاوبەش رەوادانـدا وەك لە(حسن) ەوە ئەگێڕنەوە یان مەبەست(إبليس) ە کە چەند گەل و کۆمەڵێك ئەیان پەرست و ئەیپەرستن، ناویان ئەبردن بە(رب)، هەندێکیان ناویان ئەبرد بە خوای شەڕو تاریکی، خوایان ئەکرد بە خوای خێرو رووناکی،(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: ئەم ئایەتانە لەمانەدا هاتە خوارەوە کە پێیان ئەگوترێ(مجوس) و دوو خوا بڕیار ئەدەن،(یەزدان و ئەهریمەن)، ئینجا بێگومان ئەگەر مەبەست بە(جن) لێرەدا شەیاتین یان ئیبلیس بێت ئەوا شتێکی ئاشکرایە کە لە جینین، ئەگەر مەبەست بە مەلائیکە بێت، ئەوا ئەوانیش هەر پێیان ئەگوترێ، چونکە شاراوەن و نابینرێن،(جن) ئیتر بە شێوەی حەقیقەت یان مجاز بەهەر حاڵ و لەسەر هەر بار قورئان بەرەنگاری یان ئەوەستی و پڕو پووچی بیرو باوەڕەکەیان دەرئەخات بە یەك وتەو وشە ئەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَهُمْ﴾ واتە ئەوانە جینیان گێڕاوە بە هاوبەشی خوا لە کاتێکدا کە خوا ئەوانەی دروستکردووە، دەی ئەو دروست کراوانە چۆن ئەبن بە هاوبەش لە خوایەتیدا، یان لە پەروەردگاریدا؟! یان مەبەست ئەوەیە: ئەو بێ بڕوایانە هاوبەش دائەنێن بۆ خوا لە

کاتێکدا کە خوا ئەوانی دروست کردووە و ئەوانەی کە ئەیکەن بە هاوبەش هیچ دەخلێکیان نییە لە دروست کردنیاندا، کەواتە بڕیار دانەکەیان هەرچۆنێ نەفامییە، هەروەها سپڵەییشە. بێ بڕوایان هەر بەوەوە نەوەستان، بەڵکو شتی تری نەگونجاو و ناشایستەیان بۆ خوا ڕەوادا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بە درۆوە دەست هەڵبەستیان کرد بۆ خوا و ڕەوایاندا بۆ خوا چەند کوڕ و چەند کچ، بت پەرستەکان ئەیانگوت مەلائیکە کچی خوان، جوولەکە عوزەیریان ئەکرد بە کوڕی خوا، گاوڕ عیسایان ئەگێڕا بە کوڕی خوا، ئەوەشیان کرد بە نەزانی و نەفامی و بە بێ ئەوەی تێ بگەن لە هەڵە و لاری وتەکانیان، بەڵکو هەروا بە کۆ قسەیان توڕ ئەدا و خوایان پێ لەکەدار ئەکرد، ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاك و بێگەردی بۆ خواو خوا پاك و بێگەردەو بەرز و بڵند ترە لەوەی کە ئەو بێ بڕوایانە ئەیڵێن و ڕەوای ئەدەن بۆ خوا. ئینجا بەرەنگاری ئەم دەلەسەیەیان ئەکات و ئەکۆڵێتەوە لەگەڵیان بە جۆرێ پڕ و پووچی بیرو باوەڕەکەیان دەرئەخات، ئەفەرموێ: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ خوا داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە لە نەبوون، کەسێ کە بەو جۆرە بێ، بێ پێویستە بە هیچ کەس و بە هیچ شت، نەبوونی ڕووی تێناکات، کەواتە پێویستی نییە بە جێگیر و جێنشین و کۆمەك، ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ﴾ ئایا چۆن بۆ خوا ڕۆڵە و ئەولاد ئەبێ لە کاتێکدا ژن و هاوسەری نەبووە و ناگونجێ ببیبێ، واتە ئەوانە ئەزانن کە ڕۆڵە و ئەولاد بەوە ئەبێ کە نێرێك لە وێنەو تیرەی خۆی هاوڕێ و هاوسەری ببێ. دەی خوا نە وێنەی هەیە و نە هاوسەر کەواتە چۆن ئەولاد و ڕۆڵەی بۆ ڕەوا ئەدەن؟ ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ خوا هەموو شتی دروست کردووە، واتە ئەولاد ئەبێ وێنەو هاوتای باوکی بێ، وێنەو هاوتایش بۆ خوا نییە، چونکە هەموو شتێ خوا دروستی کردووە، دروست کراویش نابێ و ناگونجێ کە هاوتا و وێنەی داهێنەر و دروستکەری بێت، ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ خوابەهەمووشت زاناوئاگایە، کەواتەهەرئەو ئەبێ داهێنەرو دروستکەر بێت.

ئینجا هەرچۆنێ بەرەنگاری یان وەستا و بە درۆی خستنەوە لە بڕیاری هاوبەش و ئەولاددا، هەروەها بەرەنگاریان ئەوەستێ جارێکی تر هەر بەو داهێنەری و پەروەردگاری یەی خوا بۆ هەموو شتێ بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە و بیچەسپێنێ لە دڵدا کە هەر ئەبێ ئەو داهێنەر و پەرستراو بێت و هەر فەرمانبەریی و گوێڕایەڵی ئەو بکرێت بە تەنیا،

﴿١٠١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەو خوایەی کە ناوی(الله) یە، پاك و بێگەردە لەوەی کە بێ بڕواکان بۆی ڕەوا ئەدەن بە نەفامی، داهێنەرو بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوییە و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا و هەموو شتێ ئەو دروستی کردووە، ئەو زاتەیە خوا و پەروەردگاری ئێوە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ خواو پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە بێجگە لەو ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ دروستکەری هەموو شتێکە ﴿فَٱعْبُدُوهُ﴾ کەواتە ئەو بپەرستن ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ ئەو خوایە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە و هەموو کاروباری، هەموو شتێ حەواڵەی لای ئەوەو بە دەست ئەوە. بێگومان دروستکردن و داهێنەریی خوا بۆ هەموو شتێ داخوازە بۆ ئەوەی هەموو شتێ هینی ئەو بێ و موڵکی ئەو بێت، ئەوەیش داخوازە بۆ ئەوە کە هەر ئەو ڕۆزی دەر بێت، ئەو ڕۆزی بدات بە گیانلەبەران و بیان ژیەنێ لە موڵکی خۆیدا، دەی کەواتە ئەبێ هەر ئەو خوایە کار بە دەست و چاودێر و خاوەن پەروەردگار بێ، کەواتە ئەبێ هەر ئەو بپەرسترێ و گوێرایەڵی و مل کەچی بۆ بکرێ. گەلی عەرەب – لە سەردەمی نەفامیاندا – ئەیانزانی و بڕوایان هەبوو کە خوا دروستکەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە و داهێنەری ئەم ئادەمی یەیە، ڕۆزی دەری هەمووە، هەروەها هەموو گەلە نەفامەکانی تریش، مەگەر کەمێك لە ماددییە ئەغریقی یەکان، لەبەر ئەوە ئیسلام لە سەردەمی نەفامی عەرەبدا بەرەنگاری کەسانێ ئەوەستا کە هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا ئەدا، یاسا و شەریعەتیان لە خوا وەرنەگرت، نەك بەرەنگاری کەسانێ کە بڕوایان نەبێ بە بوونی خوا – وەك لەم دوایی یەدا لە چەند لایەکەوە چەند نەفامێکی وایش پەیدا بوو – پەرەی سەند تا زانیاری پێشکەوت، ئیتر بەرە بەرە ئەو بڕوا پووچە کشایەوە لە دەروونی مەردومدا، بە جۆرێ ئەو بێ بڕوایی یە خەریکە ببێ بە لەکەو نوختەیەکی ڕەش و چەپەڵ بە ناوچاوی هەرکەسێك کە ئەو باوەڕە پیسەی گرتبێتە گەردن، چاوەڕوانی ئەکرێ کە تا ماوەیەکی تر ئەم تەم و هەورە ڕەشە

نەمێنێ و بە تەواوی لاچێ بە ئاسمانی جیهانی یانەوە، بەڵێ بەناوی زانیاری یەوە چەند سەر لێشێواوێ خەریك بوون ئەو باوەڕە پووچە بچەسپێنن و پەرەی پێ بدەن، یەکێ لەوانە:(جولیان هاکسلی) کە لە کتێبی ناوبراوی بە(الإنسان یقوم وحده) و لە کتێبی(الإنسان فی العالم الحدیث) دا بە بێ شەرمانە و بێ پێچ و پەنا باسی نەبوونی خوا ئەکات و ئەڵێ: بڕوا بە خوا هیچ سوودێکی نییە و زانیاری دووری خستووەتەوە لە ژیریی ئێمە، یەکێکی تر لەوانە:(ول دیورانت) لە کتێبی(مناهج الفلسفة) دا وێنەی ئەمانە کە لە تاریکیدا پێیان هەڵکەوتووە و هەڵخلیسکاون ئێمە لە ڕێگای قورئان و ڕێنموونی قورئانەوە قسەیان لەگەڵ ناکەین، بەڵکو حەواڵەی وێنەی خۆیانیان ئەکەین لە زانایانی تازە، وەك(جون کلیفلاند کوزان) کە لە زانایانی کیمیا و بیرکاری یە و دکتۆرای زانکۆی کورنیلی هەیە و سەرۆکی بەشی زانیاری یە سروشتی یەکانە لە زانکۆی(دولت)، ئەم زانایە لە کتێبی(الله یتجلی فی عصر العلم) دا ئەڵێ: ئایا هیچ ژیرێك لای وایە و بیر ئەکاتەوە لەوە کە مادەی سادەی رووت لە ژیریی و زانین خۆی بە خۆی بەدی هێنابێ، بە ڕێکەوت و هەڵکەوت؟ یان ئەو ئەم ڕژێم و یاسایانەی داهێنابێ؟ ئینجا بڕیاری دابێ و پێویستی کردبێ لەسەر خۆی؟... بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە هەر ئەمەیە: نەخێر، نەخێر هەرگیز شتی وا ناگونجێ و نابێ، بەڵکو مادە کاتێ ئەبێ بە تاقە و تاقە ئەبێ بە مادە بێگومان ئەبێ بە پێی یاسایەکی دیاریی کراو بێ، کەواتە ئەبێ مادە بووبێ لە پێش بوونی و پەیدا بوونی خۆیدا، بێگومان هیچ کەس شتی وەها ڕەوا نادا و بە گونجاوی نازانێ. دووبارە ئەڵێ: کیمیا بۆمان دەرئەخات کە هەندێ لە کەرەسە و مادده بەرەو نەمانە و نامێنێ، هەندێ زۆر بە چەسپانی و هەندێ کەمتر، بەهەرحاڵ مادده شتێکی هەتا هەتایی نییە و نەمان رووی تێ ئەکات، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە سەرەتای هەیە و نەبوون رووی تێکردوە.. چەند بەڵگەیەکی کیمیاوی و زانیاری تر هەیە لەسەر ئەوە کە سەرەتای مادده بە هێواش و لەسەر خۆ پەیدا نەبووە، بەڵکو بە شێوەیەکی کت و پڕی پەیدا بووە، زانیاری ئەتوانێ کاتی پەیدا بوونی دیاریی بکات، بەهەرحاڵ ئەم جیهانی مادده ئەبێ دروستکراو بێت، لە کاتێکەوە دروستکراوە ژێر بارە بۆ

چەند یاسا و باو و ڕەوشتێکی دیارییکراو، بە هیچ کلۆجێك دەست نادات بۆ ئەوەی بە ڕێکەوت پەیدا بووبێ. ئەڵێ: کاتێ کە ئەم جیهانی مادده نەتوانێ و دەستە پاچە بێ لەوەی خۆی دروستکردبێ، یا یاسایەکی بۆ خۆی دانابێ، کەواتە ئەبێ فەراهەم هاتبێ بە دەسەڵاتی کەسێك لە ماددی تەبیعی و جیهانی مادده بەدەر بێ، هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرە شایەتە لەسەر ئەوەی کە ئەو دروستکەر و فەراهەم هێنەرەئەبێ زانا و لێزان و خاوەن مەیل و ئیرادە بێت، ئەبێ ئەو داهێنەرە هەمیشەیی بێت و نەبوون ڕووی تێنەکات، بە کورتی هیچ چارەیەك نییە و ئەبێ بڕوا بهێنرێ بە خوا.

زانای بایۆلۆجی(فرانك اللن) لەو تاریکیدا ئەڵێ: زۆر جاران ئەگوترێ ئەم بوونەوەرە پێویستی نییە بە داهێنەر و پەروەردگار، بەلاَم هەرکاتێ ئێمە بڕوامان بوو ئەم بوونەوەرە هەیە و خەیاڵات نییە، ئایا هۆی بوونەکەی چییە؟ بێگومان ئەبێ یەکێ لەم سێ بارە بڵێین: خۆی بە خۆی پەیدا بووە، بە بێ سەرەتا پەیدا بووە و هەر بووە، بە بێ داهێنەر و پەروەردگارێك پەیدا بووە.

ڕای یەکەم: کە بڵێ ئەم جیهان و بوونەوەرە بەو هەموو هێزو وزە و یاسا و ڕژێمە تێرو تەواوە هەروا لە خۆیەوە لە نەبوون پەیدا بوو، بەڕاستی ئەوپەڕی نەفامی یە، شایستەی ئەوە نییە بیرو لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێ. هیچ کەمتر نییە لە ڕای ئەوانەی کە شێت و وێڵ و سەرگەردانن و ئەڵێن ئەم جیهانە هەر نییە و خەیاڵی ڕووتە.

ڕای دووەم: کە ئەڵێ: ئەم بوونەوەرە هەر بووە بە بێ سەرەتا ئەم ڕایە هاوبەشە لەگەڵ ئەو ڕایەی کە ئەڵێ ئەم بوونەوەرە پەیدا بووە بە داهێنەر و خوایەك کە بە بێ سەرەتایەك هەر بووە، واتە ئەم دوو ڕایە هاوبەشن لەمەدا کە بوونێکی سەرەتا بڕیار ئەدەن بۆ شتێك، دەی ئایا ماددەیەکی سادەی بێ گیانی بێ خواهیشی بێ دەسەڵاتی مردوو بێ، یان خوایەکی زیندووی دانای زانای بە دەسەڵاتی کارساز بێ؟ بێگومان هیچ چار نییە بۆ کەسێك کە ڕێزی خۆی بەلاوە بێ هەر ئەم بار و حاڵی دوایی یە ئەڵێ. لە کۆتایی باس و وتارەکەیدا ئەڵێ: پێویستە بڵێین: ئەم بوونەوەرە لە دروستکراو و دەستکردی ئەو خوایەیە.

ئينجا ئەڕۆینەوە سەر ئایەتەكان و گوێ ئەگرین و بیر ئەكەینەوە لە هەندێ تری لەو سیفەتانەی كە قورئان پێمان ئەفەرموێ و خوامان پێ ئەناسێنێ، ئەفەرموێ: ﴿ لَا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ هێزی بینین و چاوەكان بڕی ئەو خوایە ناكەن و ناتوانن ببینن ﴿وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ﴾ ئەو خوایە بڕی هێزی بینین و چاوەكان ئەكات. ئەوانەی كە بە نەفامی داوا ئەكەن كە خوا ببینن بە چاوی سەر لەم جیهانەدا، وەك ئەوانەی كە بە نەفامی داوای بەڵگەیەكی ماددی هەست پێكراو ئەكەن لەسەر بوونی خوا، ئەم دوو تاقمە نازانن چی ئەڵێن و تێناگەن لە قسەی خۆیان و هەروا قسە تووڕ ئەدەن! هێزی بینینی ئەم ئادەمی یە و هەست و هەستیارەكانیان و زانینیان، هەموو ئەوانە دروستكراون بۆیان بۆ خەریك بوون و بەدیهێنانی كاری ئەم جیهان و بوونەوەرەیان، بۆ ئەوەی هەڵسن بە ئەركی جێنشینی یەكەیان لەم زەوییەدا، بۆ بینین و هەست كردنیان بەو هەموو شتە كە نیشانە و بەڵگەی ئاشكران لەسەر بوونی خوا و بەرهەم و دەستكردی دەستی قودرەتی ئەو خوان. بەڵام زاتی پاكی پەروەردگار، یەكەم: بەندەكان پێویستیان نییە بە بینینی لەم جیهان و زەوییەدا و هیچ كارو كردەوەیەكیان نەبەستراوە بەو بینینەوە. دووەم: چاوی ئەم جیهانە كە لە نەبوونەوە هاتووە، نەبوونیشی بەسەردا دێت و پاش ماوەیەك نامێنێ، ئەم چاوە توانای بینینی زاتێكی نییە كە سەرەتا نییە بۆ بوونی و هەرگیز نەبوونیش رووی تێناكات.

لە پێش گەیشتنی مەردوم بەم زانیاری یە تازەیە هەركەسێك بە نەفامی داوای بینینی خوای بكردایە، یا داوای بەڵگەیەكی تری ماددی ئاشكرای بكردایە لەسەر بوونی خوا، بە هەر حاڵ لەوانە بوو لە یەكەم جارەوە چاوپۆشی لێبكرایە و بگوترایە: فام و ژیریی ئەو بێ چارەیە هەر ئەوەندە بڕ ئەكات، بەڵام ئەوانەی كە ئێستا باسی ئەتۆم و كارەبا و پرۆتۆن و نیترۆن ئەكەن و بڕوایان هەیە بە بوونیان لەگەڵ ئەوەدا هیچ كام نە لە ئەتۆم و نە كارەبا و نە نیوترۆن و نە پرۆتۆنی نەدیوە و لاشی وایە دەست نادەن بۆ بینین، هێشتا كەرەسە و كۆئەندامێ پەیدا نەبووە كە ئەوەندە گەورە كەر بێت ئەو جۆرە شتانەی پێ ببینرێ. بەڵام بڕیاری بوونیان ئەدەن بەهۆی چەند شتێك كە بڕیار ئەدەن و وا دادەنێن نیشانە و بەڵگەن لەسەر بوونی ئەو نەبینراوانە، ئەو تاقی كردنەوە و بەراورد كردنەش جێگەی گومان و دوو دڵییە و دڵنیایی تێدا نییە، ئەوانە لەم بارەیەوە بەو جۆرەن، بەڵام لەبارەی بوونی خواوە دەم

ئەدەن بە یەکدا و دەم بازی ئەکەن بە نەزانی و نەفامی، داوای بەڵگە و نیشانەیەك ئەکەن کە بە چاو ببینرێ و داوای بینینی خوا ئەکەن بە چاوی خۆیان، کۆتایی ناهێنن بەم بوون و بوونەوەرە سەر سوڕهێنەرە کە دڵ و دەروون داگیر ئەکەن و هیچ ڕێگەیەك ناهێڵنەوە و ماوە نادەن بۆ ژیریی و ناچاری ئەکەن بە بڕوا هێنان بە پەروەردگاری جیهان، بە بێ دوو دڵی و گومان، مەسەلەی گونجانی بینینی خوا و ڕوودانی، نەگونجانی و ڕوونەدانی کە دووبەرەکی تیایە لەناو زانایانی ئیسلامدا، ئەهلی سوننەت زۆربە لەسەر رای یەکەمن، ئەو مەسەلەیە بە درێژیی لە عیلمی عەقائد و کەلامدا باس کراوە، لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی لێرەدا ئەو باسە بکەم هەرکەس ئەیەوێت با تەماشای ئەو کتێبانە بکات. رووکەش و رواڵەتی ئەم ئایەتە وا ئەگەیەنێ کە بینینی خوا نابێ و روو نادا نە لەم جیهان و نە لە ڕۆژی دواییدا، هەروەها چەند حەدیسێکیش هاتووە کە ئەکرێ بە بەڵگە لەسەر نەبینینی بە رووکە و بە رواڵەت، بەڵکو دەقی ئایەتی سورەتی(القیامة): ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾، چەند روویەك لە ڕۆژی دواییدا ئەدرەوشێتەوەو لە خۆشی و شادومانی دایە. سەرنج دەرو تەماشاکەری پەروەردگاریانن، هەروەها دەقی چەند حەدیسێك بە تایبەتی حەدیسی: ﴿انكم سترون ربكم كالقمر ليلة البدر﴾ کە بیست و یەك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ریوایەتیان کردووە لە پێغەمبەرەوە و لە کتێبەکاندا بڵاو بووەتەوە، ئەو حەدیسانە ئەوە ئەگەیەنن و بەڵگەن لەسەر بەدی هاتنی لە ڕۆژی دواییدا، بێگومان بەڵگە و رابەری رای یەکەم زۆرتر و بەهێزترە و بۆ یەك خستنی ئەم ئایەتی ئێرەو ئەو حەدیسانەی کە قۆڵگیری ئەم ئایەتەن، یەك خستنی ئەمانە و دەستە مل کردنیان لەگەڵ ئەو ئایەت و حەدیسانەی کە رابەرو بەڵگەن لەسەر بینینی خوا، بۆ ئەو مەبەستە چەند شتێك وتراوە زۆر بەهێزو بەجێن و ئەو مەبەستە بەجێ ئەهێنن، یەکێ لەوانە ئەمەیە کە مەبەست بەم ئایەتی ئێرە ئەمەیە: وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: هێزی بینین و چاوەکان بڕی خوا ناکەن بە جۆرێ دەوری خوا بدەن و حەقیقەتەکەی دەربخەن، خوا دەوری هەموو چاوەکان ئەدات، ئەیانبینێ بە جۆرێ حەقیقەتەکەی دەربخەن، پاڵفتەی وەڵام و یەکخستنی ئەمەیە: ئەوەی کە دووبەرەکی تێدا هەیە بینینی پەتییە: ئایەتەکە نەبوون و بەدی هاتنی بینینێکی تایبەتی ئەگەیەنێ کە بینینە بە شێوەی چوار دەور دان و حەقیقەت دەرخستنی ئەم باسە، بە یارمەتی خوا بە درێژتر و ڕوونتر لە سورەتی داهاتوودا(الأعراف) باس ئەکەین. کۆتایی ئایەتەکە ئەهێنێ بە دوو ناو لەناوە پیرۆزەکانی خوا،

**ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ سیفەتی یەکەم لە پێنج سورەتی تریشدا هاتووە: ﴿یوسف، الحج، الأحزاب، لقمان، شوری﴾، بە چەند جۆر تەفسیر کراوەتەوە، لە هەرکام لەو شوێنانەدا یەکێ لەو تەفسیرانە رێك و پێك ترە، یەکێ لەو تەفسیرانە ئەمەیە: خودا شاردەرێکە کە بینایی سەر و چاوی دڵ بڕی نەکەن و پێیدا نەگەن، بەرزو بڵندە لەوە، ئەو کاتە وەك رابەر وایە لەسەر رستەی یەکەم، هەرچۆنێ سیفەتی دووەم رابەرە لەسەر رستەی دووەم، واتە چاوەکان یان بینایی چاوەکان بڕی خوا ناکەن و پێیدا ناگەن، چونکە ئەو(لطیف) ە، خۆ داشاروەرێکە... هتد، ئەو هەموو چاوەکان یان بینایی یەکان ئەبینێ و دەوری هەموویان ئەدات , چونکە هەر ئەو زانا و ئاگایە بە هەموو شتێ.**

**ئینجا بە دوای ئەو هەموو ئایەتە گەورە و گرنگ و دڵڕفێن و نایابانەدا، ئایەتەکانی قورئان، یان ئایەتەکانی ئەم سورەتە بە تێکڕایی، یان بە تایبەتی ئەم کۆمەڵە ئایەتانەی دوایی یە کە دەستیان پێکرد لە ئایەتی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾ کە بە هەرکام لە راستیدا هۆی رووناکی و بینایی دڵن، مایەی رێنموونی و زانینن، بەدوای ئەمان ئەم ئاگادار کردن و بێدار کردنەوە دێنێ لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەفەرموێ: ﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾(بصائر) کۆیە و تاکەی(بصیرة) ە،(بصیرة) بریتی یە لە هۆی زانین و رێ بردنی دڵ بە شتێ کە راست و دروستە بە وێنەی(بصیر) کە بریتی یە لە هێزی بینینی چاو، واتە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە هات بۆتان چەند ئایەتێك کە رێنموونی و رابەرێکی ژیریین و هۆی زانین و رووناکی و بینایی دڵ و دەروونەوە ﴿فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ﴾ ئینجا هەرکەس بەوانە هەق ئەبینێ و ئەناسێ و بڕوا ئەهێنێ ئەوا بینینەکەی بۆ خۆیەتی و سوود بەخۆی ئەگەیەنێ، ﴿وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا﴾ هەرکەسیش کوێرە و هەق نابینێ ئەوا کوێری و هەق نەبینینەکەی دژی خۆیەتی و زیانەکەی لەسەر خۆیەتی،**

وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِيَقُولُواْ دَرَسۡتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٥﴾

---

﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ﴾ **بێگومان من چاودێر و پارێزەر نیم، واتە خوا رێنموونی کردوون و رێی راستی نیشان داون، ئینجا هەرکەس رێی راست ئەداتە بەر ئەوا خۆی قازانج ئەکات و بەهرەمەند ئەبێت، خوا پێویستی بە کردەوەی هیچ کەس نییە، هەرکەس رێی راست ناداتە بەر ئەوا خۆی زیان ئەکات و خوا دەربەستی هیچ کەس و هیچ شتێك نییە، منیش کە رەوانە کراوی خوام هەر رێ نیشان دەر و ترسێنەرم، چاودێر و پارێزەر نیم بەسەرتانەوە و هیچ کار و باری ئێوەم بەدەست نییە، بەڵکو بەدەست خوایە.**

**ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئایەتەکانی بۆ ئەکات کە چۆن مەبەستەکانیان ئاراستە ئەکات هەر جارەی بە جۆرو شێوەیەکی تایبەتی و گۆڕاندنی جۆرو شێوەکانیان بە جۆرێ ئەگەر لەلایەن خواوە نەهاتنایە، لە توانای ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەدا نەئەبوو، نە ئەگونجا هەڵسانی بە کاری ئاوا سەر سوڕهێنەر، کەواتە ئایەتەکان خۆیان شایەتن لەسەر سەرچاوەکەیان، بەڵام ئەو بێ بڕوایانە نەیان ویست دان بنێن بە هەق و راستیدا، لەسەر ئەوە ئەیان گوت: محمد ئەمانەی خوێندووە و لە خەڵکی وەرگرتووە و فێری بووە، لەبەر ئەوە تەمێی ئەکات و فەرمان ئەدات کە پەیڕەوی ئایەتەکان و ئەو قورئانە بکات کە سروشتی پێکراوە و گوێی نەبێ لەوانە و پشتیان تێبکات، ئەفەرموێ:** ﴿وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ **ئا بەو وێنە نایابە و بەو شێوە دڵگیرە ئێمە ئایەتەکان باس ئەکەین و جۆرو شێوەکانیان ئەگۆڕین** ﴿وَلِيَقُولُواْ دَرَسۡتَ﴾ **واتە بەو جۆرو شێوەمان کرد تا بڕوا سەرکێشەکان بڵێن: ئەی محمد ئەمەی کە ئەیخوێنیتەوە بەسەرماندا تۆ خوێندووتە و لە مەردومەوە فێر بوویت،** ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ **بۆ ئەوەی بە روونی باسی ئەم قورئانە بکەین بۆ دەستە و کۆمەڵێك کە ئەزانن و ئامادەن بۆ زانین، واتە خوای پەروەردگار ئایەتەکانی خۆی ناردو بار و جۆر و شێوەکەی گۆڕین لەسەر رادەو پلەیەکی نایاب و بەرز**

که عەرەب شتی وایان نەدیبوو، ناسراو نەبوو لایان، لەو باس و گۆڕاندنە نایابە دوو شت و دووبەرهەم سەرەنجام بەدی هات، بەم جۆرەی کە باسیان ئەکەین، مەردوم بوون بە دووبەش:

١- ئەوانەی کە سەرکێش و مل هوڕ بوون و ڕێنموونیان نەئەویست و بە دوای زانین و ڕاستیدا نەئەگەڕان، ئەمانە ئەیانویست شتێ دەست هەڵبەست بکەن و بیکەن بەهۆی دەسەلآت و توانینی پێغەمبەر(ﷺ) لە هێنانی ئەم قورئانەدا کە خۆیان دەستە پاچەن و ناتوانن لە ئاستی، ئەوەش ئەمە بوو ئەیان گوت: خوێندووتە و مەردوم فێری کردوویت، ئیتر مەبەستیان بەو فێر کەرە ئەو بەندە ڕۆمی یە بێت کە لە مەککەدا بوو و شمشێری دروست ئەکرد کە هەر عەرەبیش نەبوو، عەرەبی نەئەزانی، وەك قورئان دەم کوتی کردن بەم ئایەتی سورەتی(النحل) ە: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ﴾ بێگومان ئێمە ئەزانین کە ئەوانە ئەڵێن ئەم قورئانە هەر مەردوم فێری کردووە، واتە ئەو کابرا ڕۆمی یە کە لە چەند ریوایەتێکدا هاتووە، خوایش فەرموی: ﴿لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ زمانی ئەو کەسەی کە ئەوانە نیازی ئەکەن(اعجمی) یە و ئەم قورئانە عەرەبی یەکی روون و رەوانە، مەبەستیشیان بەو فێر کەرە ئەوە بووبێت، یان مەبەستیان نامەدارەکان بووبێت کە لەسەر ئەم بارەش هەر قسەکەیان زۆر پووچ و بێ جێیە، چونکە هەرکەس سەرنجی ئەو نامە دەستکاری کراوانە بدات کە لەو کاتەدا بە دەست نامەدارەکانەوە بوو، سەرنجێکی ئەم قورئانەیش بدات بۆی دەرئەکەوێ کە رادەو پلەی ئەو نامانە زۆر پەست ترە لە رادەو پلەی بەرز و بێ وێنەی قورئان، کەواتە بۆی دەرئەکەوێ کە قسەکەی ئەو بێ بڕوایانە زۆر بێ جێیە و لەوپەڕی نەفامی یەوە هاتووە.

٢- ئەوانەی کە زانا بوون و بە دوای هەق و ڕاستیدا ئەگەڕان و ئامادەیی یان تیا بوو بۆ وەرگرتنی ڕێنموونی، ئەوانە بەو باس و گۆڕاندنی ئایەتانە باشتر تێگەیشتن و بڕوایان بەهێزو دامەزراو تر بوو، وەك دەست نیشانی بۆ کرد کە فەرموی: ﴿لنبينه لقوم يعلمون﴾. ئینجا فەرمان لە بارەگای هەرە بەرزەوە دەرچوو بە جیا کردنەوەو جیاوازی خستنە نێوان ئەو دوو دەستە و کۆمەڵە، کۆمەڵی بینایی زانا، کۆمەڵ و دەستەی کوێری نەزان،

ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ۗ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ

---

**فەرموی: ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ شوێنی ئەم قورئان و ئایینە بکەوە کە سروش کراوە بۆلات لەلایەن پەروەردگارتەوە، واتە هەمیشەیی و بەردەوام بە لەسەر ئەوە، ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ خوایەك نییە و هیچ پەرستراوێکی راستەقینەی بێجگە لەو نییە ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ روو وەرگێڕە لە بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرەکان و پشتیان تێبکە و خۆتیان پێوە خەریك مەکە، گویٚ مەدە بە قسە ناڕەوا و ناهەقەکانیان کە یەکیٚ لەوانە ئەوەیە کە لەم ئایەتەدا دەست نیشانی بۆ کرد، بەم جۆرە و لەسەر ئەم بارە ئەم فەرمانە نەسڕراوەتەوە بە ئایەتی جیهاد و جەنگ کردن، لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت کراوە کە سڕراوەتەوە لەسەر ئەو ریوایەتە ئەبیٚ مەبەست بە وتەی(و أعرض) دەست بۆ نەبردن و جەنگ نەکردنیشە لەگەڵیان، ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئەوانە هاوبەشیان رەوا نەئەدا، ئەگەر خوا بیویستایە ناچاری ئەکردن بە بڕوا هێنان، ئەگەر خوا بیویستایە بە جۆرێکی دروست ئەکردن دەستیان نەدایە بۆ بیٚ بڕوایی وەك فریشتە، بەڵام خوا ئەم ئادەمی یەی دروستکرد بە جۆرێك کە دەست بدات و ئامادەیی ببێت بۆ بڕوا و بیٚ بڕوایی، لێیان گەڕا کە خۆیان بە مەیل و هەڵبژاردنی خۆیان رێگەی خۆیان بدەنە بەر لە سنووری مەیل و خواهیشە بیٚ سنوور و بەر بلاٚوەکەی خوادا کە لە بوونەوەردا هیچ شتێك نابیٚ و روو نادات بە مەیل و خواهیشی ئەو نەبێت، ﴿وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ لەلایەن خۆمانەوە ئەی پێغەمبەر تۆمان نەگێڕاوە بە چاودێر و پارێزەر بەسەریانەوە، کە لێپرسراو بیت لە کردەوەکانیان ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ تۆ زۆردار و دەسەلاٚتدار نیت بەسەریانەوە بەم رەنگە کاروباری ئەوانت پیٚ سپێردرابێت لەلایەن ئێمەوە، یان تۆ لەلایەن ئەوانەوە وەکیل نیت بەسەریانەوە، هەڵسی بە کاروباریان و تەگبیریان بکەیت و بەرژەوەندی یان بەدەست بێنی، ئەم فەرمان و پەندو ئامۆژگاری یە کارو کردەوەو شوێنی هەولٚ و تەقەلای پێغەمبەر(ﷺ) دیاریی ئەکات، هەروەها جێنشینەکانی لە**

پاش خۆی و هەرکەسێك لە هەر شوێن و کات و چەرخێك دا کە بانگی مەردومان ئەکات بۆلای خوا، نابێ دڵ و نائومێد و ئامانج و خەریك بوونی ببەستێ بەو سەرکێشانەی کە چاوی دڵیان نەکراوەتەوەو نابینان لە ئاستی رابەر و بەڵگە و هۆی بڕوا و رێنموونی، بەڵکو پێویستە نیازو مەبەست و خەریك بوونی روو بکاتە ئەوانەی کە چاوی دڵیان بینایە و گوێرایەڵن و ئامادەیی یان تیا بۆ بڕوا و گوێرایەڵی، چونکە ئەوانە پێویستی یان هەیە بە پەروەردە کردن و پێگەیاندن لەسەر بناغە و بنەڕەتی ئەو عەقیدە و ئایینەی کە هاتوون یان دێنە ژێر ئاڵاکەی، پێویستی یان هەیە بە پێك هێنانی بۆچوونێکی تێرو تەواو و بۆیان لەبارەی بوون و ژیان لەسەر ئەو بنەڕەتە پیرۆزە، پێویستن بە دروست کردنی کۆشکی خو و رەوشت بۆیان، ئەو مەبەستە گرنگانە پێویستی یان هەیە بە تێکۆشان و شایستەن بۆ خەریك بوون و تێکۆشان پێ یانەوە، بەڵام ئەوانەی کە یاخی و سەرکێش و بارێکی دژیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە، ئەوانە هەر شیاو و شایستەی ئەوەن لەپاش بانگ کردن و پێ راگەیاندن هەر گوێیان پێ نەدرێ و پشتیان تێ بکرێ، کاتێ کە هەق و راستی گەشەی کرد و زاڵ بوو خوا باو و رەوشتی ئەهێنێتە مەیدان، بەم رەنگە ئەو هەق و راستی یە ئەدات بە تەوقی سەری ناهەقی و بەتاڵدا، ئیتر ئەوەندە ئەزانێ لەناو ئەچێ و نامێنێ.

لەپاش ئەوەی فەرمانیدا بە پێغەمبەر(ﷺ) بە پشت تێ کردن و روو وەرگێڕان لەو سەرکێشانە، ئینجا تەمێ بڕواداران ئەکات کە ئەو روو وەرگێڕانە لە سنووری ئەدەب و ویقاردا بێت، تا ماوە نەبێ بۆ دەم درێژیی ئەو یاخی و سەرکێشانە ئەوەتا جڵەوگیریی بڕواداران ئەکات لەوەی جنێو و قسەی ناشیرین بڵێن بە بتەکانیان تا ئەوە نەبێ بەهۆی دەم درێژیی ئەوان دەربارەی خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ جنێو و قسەی بەد و ناشیرین مەڵێن بەو بت و پەرستراوانەی کە ئەوانە هاواریان لێئەکەن و ئەیان پەرستن، بێجگە لە خواو تێپەڕ ئەکەن لە ئەو، یان جنێو و قسەی ناشیرین مەڵێن بەو بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرانە، جنێو و قسەی بەدیان پێ مەڵێن لەبارەی بت و پەرستراوەکانیان و پەرستنیان بۆ ئەو بتانە،

فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ

**﴿فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە ئەوانیش جنێو و قسەی بەد بڵێن خوا بە ناهەقی و تاوان و ستەمکاری بە نادانی و نەزانی، ئەم ئادەمی یە سروشتی لەسەر ئەوەیە هەمیشە کارو کردەوەی خۆی بە باش سەیر ئەکات، رێگەو بەرنامەی خۆی بە راست ئەزانێ، ئیتر کردەوەو بەرنامەکەی چاك و راست بن یان خراپ و چەوت بن، سروشتی ئەم ئادەمی یە بەو جۆرەیە، جا بە پێی ئەوە ئەو بت پەرستانە هەرچەند ئەیانزانی و بڕوایان وا بوو کە خوا داهێنەر و رۆزی دەریانە، بەڵام ئەو بتانەیان ئەپەرست و بەرگری یان لێ ئەکردن بە جۆرێ کاتێ کە موسڵمانەکان قسە و جنێویان ئەدا بەو بتە بێ نرخانە دەست بەجێ ئەو نەفامانە رائەپەرین و دەم درێژیی یان ئەکرد دەربارەی خوای داهێنەرو رۆزی دەریان، بەوە بەرگری یان ئەکرد لەو بیر و باوەڕە پووچ و چەوتەی بە چاکیان سەیر ئەکرد و لە پێش چاویان جوان و شیرین کرابوو، وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو بارە سروشتی یە کە ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ﴾ ئا بەو جۆرە شیرینمان کردووە و رازاندوومانەتەوە بۆ هەموو گەل و ئوممەتێك کردەوەکەیان، ئیتر چاك بێت یان خراپ، ئەو رازاندنەوە و شیرین کردنە بە شێوەی ناچار کردن نییە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە خاوەن و بیرو باوەڕەکە بە دەسەڵات و مەیل و هەڵبژاردنی خۆی ئەو کردەوەو بیرو باوەڕەی بۆ خۆی دانا و هەڵبژاردووە، تا دەقی پێوە گرتووە، ئینجا لەو کاتەدا خوایش لەبەر چاوی شیرینی ئەکات، ئیتر چاك بێت یان خراپ، بە تایبەتی ئەگەر هەق و چاك و راست بێت باشتر شیرین و خۆشەویست ترە، هەرکەس لەسەر ئەوبار و حاڵی خۆیە ئەڕوا لە جیهاندا ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ﴾ ئینجا گەڕانەوەیان بۆلای خوای کاربەدەست و پەروەردگاریانە، ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئینجا بەدوای گەڕانەوەیان هەواڵیان پێئەدات بە هەر کردەوەیەك کە لە جیهاندا کردوویانە، بە پێی ئەو کردەوانە تۆڵە و پاداشتیان هەیە، کەواتە با موسڵمانەکان لێیان گەڕێن بۆ ئەو رۆژی خۆیانە، کاری بێ سوود**

و بێ هوده نەکەن و خۆیان خەریك نەکەن بەو جنێو و قسە بەدانەوە کە هیچ خێرو چاکەیان تێدا نییە، بەڵکو خراپەیان لێ ئەکەوێتەوە چ بۆ خۆیان و چ بۆ ئەوان، ئەبێتە هۆی دەم درێژیی ئەوان کە مایەی ئازاری ئەمانە، ئەوانیش بەوە سەرکێش تر ئەبن.

ئینجا کۆتایی بەو باسە دوورو درێژە ئەهێنێ کە رووپەڕەی بوون و بوونەوەری تیا خستە بەرچاو کە پڕ بوو لەو هەموو رابەر و بەڵگە روون و ئاشکرایانە، کە هەر دڵێ کوێر نەبێ پڕ ئەبێ لە بڕوای بەهێز پێیان، کۆتایی ئەو باسە ئەهێنێ بەوەی کە ئەو بێ بڕوایانە بەو هەموو رابەر و بەڵگە روونانە کۆتایی ناهێنن، داوای موعجیزەیەکی ماددی ئەکەن وەك ئەو موعجیزانەی کە دران بە فروستادەیەکی پێشوو، کە ئەوەش بوو بەهۆی ئەوە هەندێ لە موسڵمانان داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە داوای ئەو موعجیزەیە بکات کە ئەوانە داوای ئەکەن، ئینجا وەڵام و بەرپەرچی بەهێزی ئەو بڕوادارانە درایەوە بەوەی کە حەقیقەت و سروشتی بێ بڕوایی ئەوانەی روون کردەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾ ئەو بت پەرستە سەرکێشانە سوێندیان ئەخوارد بە خواو سوێند ئەخۆن بە بەتین ترین سوێندەکانیان، واتە سوێند ئەخۆن و تێ ئەکۆشن لە سوێندەکانیاندا، کە بە جۆرێك بڵێن ئەوپەڕی توانایان بێت ﴿لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا﴾ کە ئەگەر موعجیزەیەکیان بۆ بێت لەوانەی کە خۆیان داوای ئەکەن و پەڵپی پێ ئەگرن، بێگومان بڕوا ئەهێنن بەو موعجیزەیە و ئەزانن کە لەلایەن خواوە هاتووە، ئەو کاتە بڕوا ئەهێنن کە پێغەمبەر راستە و لەلایەن خواوە هاتووە ﴿قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ موعجیزەکان هەر لای خوایە و هەر بەدەستی ئەوە، واتە هیچ کەسێکی تر هیچ جۆرە دەسەڵات و تەگبیرێکی نی یە تیایاندا، هەر خوا خۆی ئەزانێ و بە مەیل و خواهیشی ئەوە بیدات بە هەرکەس ئەیدات و نەیدات نایدات، کەواتە هەق وایە لێی گەڕێن و بۆ خۆی و ئێمە هیچ نەڵێین، لە وەڵامەکەوە دەرکەوت کە ئەو داوایە جێ بەجێناکرێت، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆهۆی ئەوە بەمەی کە هاتنی ئەو داواکراوەهیچ سوودی نابێ وئەوانەبڕوا ناهێنن، خوایش کاری بێ سوود و بێ هودە ناکات،

وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ﴾ ئایا چی ئێوەی ئاگادار کرد و زانای کردن بە بڕوا هێنانی ئەوانەی ئەگەر ئەوداوای ئەوانە جێ بەجێبکرێ؟ واتە ئێوە ئەی بڕواداران کە ئاواتە خوازن بۆ هاتنی ئەو موعجیزەیە نازانن ﴿أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ کە ئەو ئایەتەکانی هات ئەوانە هەر بڕوا ناهێنن، ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ﴾ وەرئەگەڕێن و لائەدەین دڵەکانیان لە کاتی هاتنی ئەو موعجیزەیەدا لە ناسینی و ڕێ بردن بە هەق و ڕاستی، چاوەکانیان لائەدەین لە بینینی، کەواتە بڕوا ناهێنن ﴿كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەرچۆنێ بڕوایان نەهێنا بە هاتنی ئایەت یان بە قورئان لە یەکەمجارەوە لە کاتی هاتنی ئەم هەموو ئایەتانەی قورئانە کە هات بۆیان، پێش هاتنی ئەم موعجیزەی کە داوای ئەکەن و پەڵپی پێ ئەگرن، ﴿وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ لێیان ئەگەڕێین تا بمێننەوە لەسەر سەرکێشی و زیادە ڕەوی کردن لە ناهەقی و تاوانی خۆیاندا بە دوو دڵی و سەرگەردانی کە ئەو دوو دڵی و سەرگەردانی یە سزایەکی بەتینی دەروونییە و دوا ڕۆژیشی سزای دۆزەخە و بەش براوی یە لە هەموو خێرو خۆشی یەك، خوا پەنامان بدات بە میهرەبانی خۆی لەوانەی کە دوو دڵ و بێ ئارام و سەرگەردانن، کە ئایا ئەم قورئانە هەق و ڕاستە یان جادو و سیحرێکە کە مەردوم ئەخەڵەتێنێ، ئایا چاك ئەوەیە شوێن ئەو هەق و ئاشکرا بکەون یان سەرکێشی و لوت بەرزی بەکار بێنن و دەم بازی بکەن لەبەر خۆ بە زل زانی لەوەی کە مل کەچ بکەن بۆ ئەوانەی کە پەست و ژێر دەستەیان سەیر ئەکەن؟ ئایا بترسن لە هەڕەشەکانی قورئان و واز بێنن لە ڕێگە و ڕێبازی خۆیان و باوك و باپیریان، یان هەر لەسەر لاری و نالەباری خۆیان بڕۆن و ئیتر چی ئەبێ با ببێ؟ کەواتە ئەو کردەوە بە وتەی خۆیان هەر ئەوەیە کە خوا دڵ و چاویان لابدا و وەریان گێڕێ لە ڕێنموونی و ڕێی ڕاست دانە بەر، ئەو دڵەی کە بڕوا نەهێنێ بەو هەموو بەڵگە و نیشانە ئاشکرایانەی کە قورئان دەست نیشان و ڕێنموونی یان پێ ئەکات بەو شێوە بێ وێنەی کە هەر لە دەست قورئان دێت، ئەو دڵە دڵێکی داخراوی قفڵ دراوە، دڵێکی نابینای لە کار کەوتووە، لەبەر ئەوە بە هیچ ڕەنگ چارەسەر ناکرێ دەردی بێ دەرمانە، وەك لەم ئایەتەدا وا هاتووە و دەست نیشانی بۆ ئەکات، ئەم ئایەتە کە سەرەتایە و یەکەم ئایەتە لە ئایەتەکانی جزمی هەشتە کە

ئەفـەرموێ: ﴿﴾ ئەگـەر ئێمـە فریـشتەکانمان بهێنایەتـە خـوارەوە بـۆلای ئـەو بـێ بـڕوا و سەرکێشانە ﴿﴾ مردووەکـان قسە و گفت و گۆیـان لەگەڵ بکردنایـە ﴿﴾ کۆمـان بکردایەتـەوە بەسەریانەوە هەموو شتێك روو بە روو ﴿﴾ ئەوانە بڕوایان نەئەهێنا و ناهێنن ﴿﴾ مەگەر خوا بیەوێ و مەیل بکات ﴿﴾ بەلاَم زۆربەی ئەو سەرکێشانە نازانن کە کارەکە بەو جۆرەیـە، وەك باشتر روونی ئەکەینەوە لە کاتی تەفسیری ئەم ئایەتە لەسەرەتای جزمی هەشتەمەوە.

ئا بەم جۆرە لێ بووینەوە لە جزمی حەوتەم لە رۆژی ٢٨ ی مانگی مولود ١٤٠٩ هەر لەم رۆژەدا ئەوا دەست ئەکەین بە تەفسیری جزمی هەشت بە یارمەتی خوای میهرەبان، داواکارم لە خوا ئەم تەفسیرەم پێ تەواو بکات و لێم وەرگرێ و بیکات بە مایەی رێنموونی موسڵمانان و بەندەکانی خۆی.

**وصلى الله وسلم على حبيبه محمد و على اله و صحبه و كل تابع لهم بإحسان إلى يوم الدين**

ئەم جزمی هەشتەمە پێك هاتووە لە بەشێك لە سورەتی(الأنعام) لە ئایەتی(١١١) ەوە تا دوایی سورەتەکە، بەشی دووەمی دەست پێ ئەکات لە یەکەم سورەتی(الأعراف) ەوە تا ئایەتی(٨٧).

لە سەرەتای جزمی حەوتەمدا سورەتی(الأنعام) مان ناساند تا رادەیەك، ئەمانەویٚ ئەم بەشە لەم سورەتە کە بەشی یەکەمە لە جزمی هەشت بناسێنین لەسەر ئەو بارو شێوەی کە دەست نیشانمان بۆ کرد و بەشی یەکەممان پێ ناساند، لەبارەی بەشی دووەمی جزمەکەوە لە سەرەتای سورەتی داهاتوودا بە یارمەتی خوا ئەوەی پێویست بێ ئەیلێین. بۆ بیر خستنەوە و زیادە روون کردنەوە بە جوانی ئەزانم دەست نیشان بکەم بۆ چەند خاڵێك لەوەی کە لە سەرەتای جزمی حەوتەمەوە باسمان کرد. ئەو سورەتە کورتەکەی بریتی بوو لە نیشاندانی خوایەتی خوا لە چەند رێگایەکەوە: لە رێگای بوونەوەرەوە، لە رێگای دڵ و دەروونەوە، هەروەها لە رێگای نەمان و لەناوچوونی گەل و ئوممەتە رابوردووەکانەوە و هێنانیان بەدوای یەکدا چین لە دوای چین، لە رێگای نیشانە و دروشم و بەرهەمی دەسەڵاتی خوا لە ژیان ئەم ئادەمی یەدا، بارو حاڵی ئاشکرا و نهێنی یەکانی، لە کۆتاییدا نیشانی ئەدا لە چەشمەندازەکانی رۆژی دواییدا و هەڵوێستەکانی ئەو خەڵکە لە کاتێکدا کە کۆکراونەتەوە و راگیر کراون بە دیار فەرمان و بڕیاری پەروەردگاریانەوە. ئا بەو جۆرە دڵ و دەروون ئەگێڕێ و گەردشی پێئەکات بەناو ئەو هەموو شتە گرنگ و سەرسوڕهێنەرانەدا، لەسەر ئەو بار و شێوە قورئانی یە بێ وێنە و بە پێی ئەو بەرنامە تایبەتی یەی خۆی کە هەرگیز لاسایی ناکرێتەوە، خوا ئەناسێنێ بە بەندەکانی بە جۆرێ ئەیانگێڕێ بە بەندەی راستەقینەی خوا لە هەموو بار و روویەکیانەوە، گوێرایەڵ و مل کەچیان ئەکات، مل کەچ و گوێرایەڵی گیان و دەروونیان، تێکۆشان و کردەوەو بزووتنەوەیان، باو و عادەت و دروشمیان، مل کەچ و گوێرایەڵی کردنیان بۆ تاقانە دەسەڵاتەکەی خوا کە هیچ دەسەڵاتێکی تر نییە نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا، کەواتە هەر ئەو ئەبێت حاکم و کاربەدەست بێت لە ژیانی بەندەکانیدا، بۆ هیچ کەسێکی تر نابێ هیچ قەدەغە کردن و رەوادان، هیچ فەرمان و جڵەوگیریی، دانانی هیچ یاسا و بەرنامە، بە کورتی گرنگ تر و گەورەترین مەسەلە و مەبەستی ئەم سورەتە مەسەلە و مەبەستی خوایەتی و بەندەیەتی یە بەو جۆر و شێوە پان و فراوانەی کە دەست نیشانمان بۆ کردووە.

وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا

---

**جزمی حەوتەمی کۆتایی هێنا بە دوو ئایەت وایان نیشان ئەدات کە بێ بڕوایان بە توندی سوێند ئەخۆن لەسەر بڕوا هێنانیان ئەگەر بەڵگە و نیشانەیەکی ئاشکرای بوونەوەری یان بۆ بێت لەلایەن خواوە، بەهۆی ئەوەوە بڕواداران ئاواتە خواز بوون کە خوا ئەوەیان بۆ بکات، چونکە لایان وابوو کە بڕوا ئەهێنن، ئینجا خوای گەورە گومانەکەی بە هەڵە دەرکردن. ئینجا بەدوای ئەو دوو ئایەتەدا یەکەم ئایەتی جزمی هەشتەمی هێنا کە تەواوکارە بۆ مەبەستی پێشووی بە تەواوی سوێندو لاف و گەزافەکەی ئەوان بە درۆ ئەخاتەوە و نائومێدیی تەواو ئەدا بە بڕوا هێنان بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾ئەگەر ئێمە بمانهێنایەیە خوارەوە بۆلای ئەو بێ بڕوایانە فریشتەکان، وەك خۆیان بڕو بیانوویان بەوە گرتووە لە هێندێ کاتدا کە ئەیان گوت: ﴿ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ با فریشتەکانمان بۆ بێنی شایەتی بدەن لەسەر راستی تۆ ئەگەر لە راستگۆیانی، ئەگەر مردووەکان قسەیان لەگەڵ بکردنایە، بەم رەنگە زیندوومان بکردنایەتەوە و شایەتی یان بدایە لەسەر راستی تۆ و زیندوو بوونەوە، وەك پەڵپی ئەوەیان ئەگرت هێندێ جار، ئەیانگوت: ﴿ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ ﴾ دەی باوك و باپیرەکانمان بۆ بێنە، ئەگەر کۆمان بکردایەتەوەو کۆمەڵ و قەرەباڵغمان بکردایەتە سەریان هەموو شتێك بە روو بە روو بە پێش چاویانەوە هەتا شایەتی یان بدایە بۆت، ئەگەر ئەو هەموو موعجیزە و بەڵگە روون و بەهێزانەمان فەراهەم بهێنایە بۆیان نەئەبوون بە بڕوادار و بڕوایان نەئەهێنا مەگەر خوا بیەوێ و مەیل بکات، بەڵام زۆربەی ئەو بێ بڕوایانە نازانن کە کارەکە بەو جۆرەیە، بەڵکو وا ئەزانن شتەکە**

به دەست خۆیانه، لەبەر ئەوە سوێند ئەخۆن لەسەر بڕوا هێنان ئەگەر پەڵپ و بیانووەکەیان بەدی بێت، بێگومان ئەمە بەندەو بناغەیەکی راستە لە ئایینی پاکی ئیسلامدا، ئەبێ هەموو بڕوادارێك بڕوای هەبێ کە هەموو شتێ و هەموو رووداوێك بەدەست خوایە و بە مەیل و خواهیشی خوایە و بە قەزا و قەدەری خوایە، هەرکەس لانەدا لە راستە شەقامی ئایەت و حەدیس هەر ئەوە ئەڵێ و بڕوای بەو جۆرە ئەبێ، وەك دەرئەکەوێ لە قورئان و حەدیسەوە، کە ئەم ئادەمی یە تاقی کراوەتەوە بە ئەندازێك خود موختاری و سەربەستی لە هەڵبژاردنی هەر بارێ لە بیرو باوەڕ و کردەوەکانی، بە پێی ئەو هەڵبژاردن و تێکۆشانە خوا بەدی ئەهێنێ لە سنوور و چوار چێوەی مەیل و خواهیشەکەی خۆیدا، بە کورتی مەردوم لە هەر حاڵ و بارێکدا وا لە ناو قەبزەی قودرەتی خوادا، لە سنوور و چوار چێوەی دەسەلآت و خواهیشی خوا بە هیچ رەنگ لانادات و ناترازێ، ئینجا دوو ئایەت دێت، لە لایەکەوە تەواوکەری ئەو مانا و مەبەستانەن کە لە ئایەتە پێشووەکەوە وەرگیرا، لە بارێکی ترەوە پەیڕە و رێگە ئامادە کەرن بۆ چەند مەسەلەیەك کە بڕوایین و بەستراون بە شەریعەت و حاکمێتی خواوە، ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا﴾ هەر بەو چەشن و شێوە کە گێڕاومانە بۆ تۆ چەند دوژمنێك کە سەرکێشن و بڕوا ناهێنن با هەموو موعجیزەیەکیان بۆ بێنێ، خەریکن بە وتارو بە کردار رێت لێئەگرن و ئەیانەوێ بەربەستی ئایینەکەت بکەن، هەر بەو چەشنە گێڕاومانە بۆ هەموو پێغەمبەرێك لە پێش تۆ دوژمن، گێڕاومانە ﴿شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ﴾ چەند سەرکێشێکی رەق لە تیرەی جنۆکە و تیرەی ئادەمی ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ﴾ کە رائەگەیەنێ بە نهێنی هێندێکیان بە هێندێکی تریان قسە و وتەی رازاوەی رووکەش کە بە دیمەن و رواڵەت هەق و چاکە و لە راستیدا دیوی ناوەوە ناهەق و بەد و خراپە. واتە شەیتانەکانی(جن) رائەگەیەنن بە شەیتانەکانی ئادەمی، یان هێندێ لە هەرکام بۆ هێندێکی تریان، ئەوەش ﴿غُرُورًا﴾ لەبەر هەڵخەڵەتاندنیان و هاندانیان لەسەر سەرپێچی و دوژمنایەتی پێغەمبەرەکان و ئایینەکەی خوا. شەیتانەکانی(جن) کە هەمیشە خەریکن و هەوڵ ئەدەن بۆ هەڵخەڵەتاندن و لادانی ئادەمی لە رێگەی راست هەر لە یەکەم شەیتانەوە

دەستی پێکرد بۆ یەکەم کەس کە ئادەمی باوکی هەمووانە کە بەو جۆرو شێوەی کە قورئان و حەدیس بۆمان باس ئەکات هەوڵیدا تا ئەو زەڵلەی کرد بەخۆی و هاوسەری کە دایکی هەمووانە، لەپاش ئەوان هەروا هات و یەکەم شەیتان نەوەستا بە خۆی و رۆڵە و نەوەکانی یەوە هەمیشە هەر خەریك بوون و خەریکن بەو کارو پیشە بەدەی خۆیان دەربارەی هەموو رۆڵە و نەوەکانی ئادەم و حەوا، تا ئەو رادەی لەناو ئادەمیدا ئەو هەموو جێگر و نوێنەرەیان بۆ خۆیان فەراهەم هێنا کە هەمیشە خەریك بوون و خەریکن، لە شەیتانە ئەسڵی یەکان باشتر نەوەکانی ئادەم لائەدەن و ئەیانترازێنن لە رێگەی خوا بە دەم و بە کردەوەو بە هەر جۆر و شێوەیەك کە لە دەستیان بێت، شەیتانەکانی(جن) و ئادەمی کە ناوەستن لە هەڵخەڵەتاندن و گومڕا کردنی ئادەمی شتێکی ئاشکرایە بۆ هەموو ژیرێك، هەوڵ و تێکۆشانی شەیتانەکانی(جن) بۆ(جن) لە ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێیان رازی بێت – هاتووە و ریوایەت کراوە وەك لە تەفسیری(کەلبی) دا هاتووە کە شەیتانی گەورە لەشکر و سەربازەکانی کردووە بە دوو دەستە: دەستەیەکیان بۆ سەر ئادەمی و دەستەکەی تر بۆ سەر جن، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لیّ رازی بێت – کە(جن) لە تیرەی(جانە) و لە شەیاتین نین، شەیاتین لە نەوەی شەیتانن و نامرن تا کاتی مردنی خۆی و لەگەڵ ئەو ئەمرن،(جن) ئەمرن و بڕوادار و بێ بڕوایان هەیە، ئینجا هەڵئەگریّ(جن) کە ئادەمی ئەبینن بە کردەوە و وتاری شەیتانەکانی ئادەمی هەڵئەخەڵەتێن و گومڕا ئەبن، وەك ئادەمی پێیان گومڕا ئەبن. ئەم ئایەتە دڵخۆشی دانەوەو دڵنەوایی تێدایە بۆ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەروەها لە پاش ئەو بۆ بڕواداران، بەمەی غەمبار نەبن بەو کارو کردەوە بەدانە لەلایەن دوژمنانەوە، چونکە ئەمە هەروا هاتووە و هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لیّ بێت – لە پێش ئەمان دووچار بوون بە وێنەی ئەم سەرکێش و دوژمنانە و هەر ئەوانیش خۆیانگرت تا خوا ئەوانی لەناوبرد و ئەمانی زاڵ کرد بەسەر دوژمنانی ئایینی خوادا، هەروەها بەم تێهەڵکێشە ئارام ئەدا بە دڵ و دڵنەوایی ئەکات،

كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ﴾ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەو دوژمنە گومڕایانە ئەوەیان نەئەکرد کە باسکرا دەربارەی تۆو ئایینەکەت، واتە ئەگەر خوا بیویستایە بەرگری ئەوانەی ئەکرد لەو کردەوە بەدانەیان، بەڵام خوا بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە تا دەرکەوێ بۆ خەڵکی کام دامەزراو و گوێ رایەڵە و کام سەرکێش و گومڕایە، تا بە پێی ئەو کردەوەی خۆیانە ئەجرو پاداشتیان بداتەوە و تۆڵە و سزای ئەوانە بدات کە شایستەن. ئەو فەرمودەیە ئەو دڵنەوایی یەی تێدایە، لە هەمان کاتدا دەست نیشان ئەکات بەم یاسا گرنگە لە یاسا بڕوایی یەکانی ئیسلام کە زۆر پێویستە ناو بەناو ئاگادار کردنەوە پێی بۆ ئەوەی بەندە رووی دڵی هەر لای خوا بێت، پشت هەر بەو ببەستێ، ترس و چاوەڕوانی و ئومێدی هەر بۆلای ئەو بێ.

لەبارەی شەیتان و(جن) ەوە قسە و باسی زۆر و زەبەندە بڵاو بووەتەوە بە دەما و دەم و لە پەڕاو و کتێبەکانیشدا کە زۆر دوورن لە راستی یەوە، لەبەر ئەوە چاك وایە تەنها رای ئیسلام وەرگرین و هەر شتێکی تر ژێر پێ بخەین، چونکە بۆ ئەم شتە نهێنی و غەیبی یانە هیچ سەرچاوەیەکی ترمان نییە بێجگە لە ئیسلام، ئەگەر تەنها ئیسلام نەکەین بە سەرچاوە یان ئەبێ شوێنی شتی پڕو پووچ بکەوین، وەك ئەو هەموو درۆ و دەلەسە کە بەناوبانگە لەناو نەخوێندەوار و نەفام و نەزانەکاندا، یان ئەبێ سەرمان لێ بشێوێ، وەك ماددی یەکان هەرچی بە چاو نەبینرێ بڕوامان پێی نەبێ کە ئەوە ئەوپەڕی نەفامییە، ئەوە کە لە قورئان و حەدیسی سەحیحەوە وەرئەگیرێن سەبارەت بە(جن) و شەیاتین ئەوەیە: کە دروستکراوە لە ئاگر، توانای ژیانی هەیە لەسەر ئەم زەوییە و لە ناو زەوی و لەم زەوییەش بەدەر ئەتوانێ بزووتنەوە بکات لەم شوێنانەدا بە چەسپاتر و باشتر لە ئادەمی. بڕوادار و بێ بڕوایان هەیە، ئەوان ئادەمی ئەبینن و ئادەمی ئەوان نابینن لە شێوەکەی خۆیاندا، زۆر لە دروستکراوان هەن کە ئادەمی ئەبینن و ئادەمی ئەوان نابینێ! هێندێ لە شەیتانەکان زاڵن بەسەر ئادەمیدا بە هەڵخەڵەتاندن و گومڕا کردنیان، ئەتوانن شتی بەدو خراپ ببەنە دڵیانەوە بە جۆر و شێوەیەك کە ئێمە نایزانین، ئەو شەیتانانە دەسەڵاتیان نییە بەسەر بڕوادارنێکدا کە باس و

یادی خوا ئەکەن، هەر کاتێ بڕوادار یادو باسی خوا بکات ئەو رائەکات و خۆی ئەشارێتەوە، کاتێ بێ ئاگا بوو لەو یادو باسە ئەو دەرئەکەوێ و دەست ئەکات بە کاری بەدی خۆی دەربارەی ئەو ئادەمییە! بڕوادار بەهۆی یادی خواوە بەهێزترە لەوەی پیلان و فێڵی شەیتانی لاواز کاری لێبکات.(جن) وەك ئادەمی و لەگەڵ ئادەمی زیندوو ئەکرێنەوە و حیساب و پرسیاریان لێ ئەکرێ، وەك ئادەمی پاداشت و تۆڵەیان ئەبێ بە بەهەشت و دۆزەخ،(جن) بێ دەسەڵاتە بەسەر مەلائیکەدا! لەم ئایەتەوە چەند شتێکمان بۆ دەرئەکەوێ:

١- ئەوانەشەیتانن چ لەئادەمی و چ لە جن، هەرکام یەك کارو پیشەیان هەیە کە ئازاردان و دوژمنایەتی و سەرکێشی یە لە پێغەمبەران و خواناسان و سەرپێچی لە هەق و راستی.

٢- ئەو شەیتانە کە هەر کارو کردەوەیەکی بەد ئەکەن بە مەیل و خواهیشی خوایە و خۆیان لە خۆیاندا هیچ دەسەڵاتێکیان نییە، خوا دۆستانی خۆی تاقی ئەکاتەوە بەو شەیتانانە بۆ پاڵفتە کردنیان و پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروونیان و تاقی کردنەوەی ئارامی و خۆگرییان لەسەر ئەو ئایینە راستەی کە خوا کردوونی بە ئەمیندار بەسەری یەوە. ئینجا کاتێ ئەو دۆستانی خوا بە باشی دەرچوون لەو تاقی کردنەوەدا خوا ئەو دوژمنانەیان چارەسەر ئەکات و بەرگری یان ئەکات لێیان و پەکیان ئەخات لەوەی زیانیان پێ بگەیەنن، ئەو دوژمنانی خوایش ئەگەڕێنەوە بە ریسوایی و لاوازی و باری سەنگینی گوناهەوە.

٣- کاردروستی و لێزانی و ئاگاداری خوا بە هەموو شتێ داخوازە بۆ ئەوەی لەو شەیتانانە گەڕێ تا هەڵسن بەو کارو کردەوە بەدانەیان، خۆیان تاقی ئەکاتەوە بەو ئەندازە خواهیش و دەسەڵات و سەربەستی یەی کە پێی داون، دۆستەکانی تاقی ئەکاتەوە ئایا بە ئارام و خۆگر ئەبن؟ ئایا دامەزراو ئەبن لەسەر ئەو ئایینە راستەی کە پێیانە؟ لە کاتێك دا کە ناهەق خۆی گیڤ ئەکاتەوە و بە ئەوپەڕی کەشخە و خۆ بە زل زانی یەوە ئەخورێ و دەم درێژیی یان لێئەکات؟ ئایا خۆیان لەبەر خوا دائەڕنن و رووت ئەکەن لە هەموو خۆشی و ئارەزووەکانی نەفسیان و هەمووی ئەفرۆشن بە خوا؟

فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَلِيَرۡضَوۡهُ وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾

---

٤- دەرئەكەویٚ بیٚ نرخی شەیتانەكانی(جن) و ئادەمی، بیٚ نرخی پیلان و ئەو سزاو ئازارەی كە لە دەستیان دیٚت، چونكە ئەوانە لە خۆیاندا زۆر و دەسەلاٚتیٚكیان نییە، ناتوانن تیٚپەڕن و لابدەن لەوەی خوا بڕیاری داوە و ڕیٚگەی ئەوانەی داوە، دەی بڕوادار كە زانی كاروبارو دەسەلاٚت هەر بە دەست خوایە و لای خوایە و لە ڕاستیدا هیچ كەسیٚكی تر هیچ شتیٚكی بە دەست نییە، ئیتر ئەبیٚ هیچ نرخیٚك دانەنیٚ بۆ ئەو دوژمنانە، هەرچەند بە ڕواڵەت خاوەن هیٚزو دەسەلاٚت بن و لاف و گەزاف لیٚ بدەن، جا لەبەر ئەوە بەرامبەر ئەوانە فەرموی: ﴿فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ﴾ واتە ماتولٚ ئەگەر بیویستایە ئەوانە ئەو كارو كردەوە بەدەیان نەئەكرد، كەواتە ئەی پیٚغەمبەر لیٚیان گەڕیٚ لەگەڵ ئەو درۆ و دەلەسە و دەست هەڵبەستەی كە ئەیكەن، چونكە تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو لەسەر خوایە حیساب و پرسیاری ئەوانە، بیٚگومان دوا ڕۆژی بەدبەختی بۆ دوژمنانی خوایە و پاشەڕۆژی كامەرانی و سەركەوتن بۆ دۆستانی خوایە و باوی خوا هەر بەو جۆرە هاتووە.

ئەو شەیتانانە ئەو كارو كردەوە بەدانە ئەكەن، وەك فەرموی لەبەر هەڵخەڵەتاندن و هاندان لەسەر دوژمنایەتی و سەرپیٚچی لە ئایینەكانی خوا و پیٚغەمبەرەكانی، ﴿وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ بۆ ئەوەی مەیل و ئارەزووی ئەو وتە ڕووكەشانە بكات دڵی ئەو كەسانە كە بڕوایان نییە بە ڕۆژی دوایی ﴿وَلِيَرۡضَوۡهُ﴾ بۆ ئەوەی ڕازی و خۆشنوود بن بەو قسە ڕووكەشانە ﴿وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ﴾ بۆ ئەوەی گوناهو تاوانیٚ بكەن كە ئەوانە بكەرن بۆی و ئەیكەن بە قەست و نیازی خۆیان، واتە ئەوانەی كە بڕوایان نییە بە ڕۆژی دوایی هەموو نیازو مەبەستی خۆیان كورت هەڵئەهیٚنن بەم جیهانەوە، ئەبینن شەیتانەكان هەمیشە وان لە كەمین دا بۆ پیٚغەمبەرەكان و سزا و ئازاردانی شویٚن كەوتووەكانیان، وتارو كرداری بەد و ناپەسەند شیرین ئەكەن و ئەیڕازیٚننەوە بۆ ئەو بیٚ بڕوایانە، بەهۆی ئەوەوە ئەمانیش شویٚنی ئەو شەیتانانە ئەكەون و دەست ئەكەن بە گوناهو تاوان و خراپەكاری، ئەوەش كاریٚكە خوا ویستی و بڕیاریدا، لەبەر ئەوە تاقی كردنەوەو پاڵفتە كردنی لیٚ پەیدا ئەبیٚ،

ماوه دانه به هەموو کەس تا کردەوه بکات به ویست و خواهیشی خۆی، تا هەرکەس شایسته و شیاوی پاداشت و تۆڵەی خۆی ببێ به هۆی خۆگریی، تا شەیتانەکانیش مەنی خۆیان پڕ بکەن و باری گوناهی خۆیان هەڵگرن به تەواوی له ڕۆژی دواییدا، تا هەموو کارێك بەدی بێت و بڕوا به پێی ویست و خواهیشی خوا، کاری دۆستان و دوژمنان به تێکڕایی، بەو جۆره به ویست و خواهیشی خوا، خوا هەرچی بویَ ئەیکات.

ئەو شێوەو چەشمەندازەی که قورئان نەخشەی ئەکێشێ بۆ ئەو ئاژاوه و جەنگ و بەربەرەکانی یەی له نێوان شەیتانەکانی(جن) و ئادەمی، هەموو پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان، له ژێر چاودێریی ویست و خواهیشی خوادا، ئەو شێوەو چەشمەندازه شایستەیه بۆ ئەوەی بیرێك بکەینەوه و ئەندازێك بوەستین له بەردەمیدا، ئەمه ئاژاوەیەکه که هەموو هێزی شەڕ و خراپەی ئەم بوونەوەرەی تێدا کۆبووەتەوه بۆ بەجێ هێنانی یەك مەبەست که بریتییه له دوژمنایەتی هەق و جەنگ لەگەڵ هەق که نوێنەرەکەی پەیام و بەرنامەی پێغەمبەرانه – سەلامی خوایان لێ بێت – ئەو هەموو هێزه یارمەتی دەرو کۆمەکی یەکتر ئەکەن به هەر شتێ که له دەستیان بێت بۆ هەموو پیلان و تەڵەکه و هەڵخەڵەتاندنێك، له هەمان کاتدا لەناو خۆشیان دا هانی یەکتر ئەدەن و کۆمەکی ئەکەن لەسەر گومڕا کردنی یەکترا ئەمەش که گوتمان شتێکی ئاشکرایه له هەموو یەکگرتن و کۆبوونەوەکانی هێزی شەڕدا لەو جەنگانەی که ئەیکەن دەربارەی هەق و هەڵگرانی ئالاَق هەقدا، ئەوەتا هەموو کۆمەکی یەکتر ئەکەن لەسەر گومڕایی یەکتریش، له پێش چاوی یەکتر جەنگی هەق و دوژمنایەتی هەق و بەردەوامی لەسەر ئەوه شیرین ئەکەن و ئەیڕازێننەوه بۆ یەکترا هێزەکانی شەڕ هەمیشه ئەوه کارو پیشەیانه، بەڵام سەربەست و بەرەڵا نین لەو کاره بەدانەدا که ئەیکەن، بەڵکو له قەبزەی قودرەتی خوادان و چوار دەور دراون به ویست و خواهیش و دەسەڵاتی خوا، ئەو شەیتانانه دەسەڵاتیان هەر بەسەر ئەندازێکدا هەیه که خوا بیەوێ و بڕیاری دابێ، جا لەبەر ئەوه ئەو هێزانه هەرچەند به دیمەن و ڕواڵەت گەوره و بەهێزبن، بەستراوەو زنجیر کراون، ناتوانن زیان بگەیەنن به دۆستەکانی خوا مەگەر به شتێ و به ئەندازەیه که خوا ویستبێتی و بڕیاری دابێ، گەڕانەوەی هەموو کارێ هەر بۆلای خوایه، هەڵگرانی هەق و ئالاَی هەق زۆر پێویسته ئاگاداربن و هەرگیز ئەو یەکگرتن و کۆبوونەوەی هێزی شەڕه فەرامۆش نەکەن تا هەمیشه وریای خۆیان بن، له هەمان کاتدا ئەبێ بێ باك و دڵ بەهێز بن بەوەی که هەموو کارو بارێ بەدەست خوایه و ئەگەڕێتەوه بۆلای خوا، ئەبێ دڵ

و چاویان ببڕنه ئەو تاقانه دەسەلاتە و ئەو مەیل و خواهیشی خوا کە دەوری هەموو شتێکی داوەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا. ئینجا لێرەدا دێتە سەر باسی مەسەلەیەك کە لێرە بە دوای سورەتەکە خەریك ئەبێت پێیەوە، وەك لەمەو پێشی سورەتەکە بناغەو بنەڕەتی بۆ هەڵچنی، مەسەلەی حەرام و حەلاڵ لەو حەیوان و مالاتانەی کە سەر ئەبڕێن، ئەم مەسەلەش زۆر گرنگە لە بارەی روون کردنەوەی یەکەم بیرو باوەڕی ئیسلامەوە: کە بریتییە لە بڕوا بە حاکمێتی خوا لە هەموو شتێکدا کورت هەڵهێنانی ئەو مافە تەنها بۆ خوا، قەدەغە کردنی لە هەر کەسێکی تر لە هەر شێوەیەك لەشێوەکانی، لەو بارەیەوە شتی بچووك و گەورە یەکسانە.

واتە هەرچۆنێ پێویستە بڕواو بڕیاردانی حاکمێتی تەنها بۆ خوا لە شتی گەورەدا وەك کاروباری دەوڵەت یان دانانی یاسا و رژێم بۆ گەل و کۆمەڵ، بە بڕواو بڕیاردانی ئەو مافە بۆ غەیری خوا مەردوم لە ئیسلام دەرئەچێ، هەروەها پێویستە بڕواو بڕیار دانی ئەو مافە تەنها بۆ خوا، لە شتی بچوکیشدا وەك حەلاڵ کردن یان حەرام کردنی سەربڕینی مالات و حەیوان، بە بڕواو بڕیاردانی بۆ غەیری خوا مەردوم لە ئیسلام دەرئەچێ، جا لەبەر ئەوە لە یەکەم جارەوە ئایەتەکە باسی حاکمێتی خوا ئەکات لە هەموو کاروباری بەندەکانیدا، ئەوە ئەکات بە سەرەتا و بناغە بۆ حاکمێتی خوا لە حەرام کردن و حەلاڵ کردنی حەیوان و مالاتی سەربڕاو، کە ئەوەش شتێ بوو بت پەرستەکان لاف ئەو مافەیان لێئەدا بە ناهەق و ناڕەوا و دەست درێژیی یان تێدا ئەکرد بۆ سەر ئەو مافی خوا، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى حَكَمًا ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئایا من غەیری خوا نیازو داوا بکەم بە حەکەم، واتە قازی و داد بۆ لابراو و داد پەروەر لە نێوان من و ئێوەدا؟ واتە نەخێر شتی وا ناکەم، ئەوە شتێکی ناهەقە و بێزاری لێدەرئەبڕم، خوای گەورە فەرمانیدا کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم پرسیارە ئاراستەی بێ بڕوایان بکات بۆ بێزاری دەربڕین لەوەی نیازی غەیری خوا بکات، بێجگە لە خوا هیچ حەکەمێتی تر رەوا بدات بۆ خۆی لە هیچ کاروبارێکدا، بەوە روونی کردەوە و دیاریی کرد کە حاکمێتی هەر بۆ خوا ئەبێ و تایبەتی یە بە خواوە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی ئەو تایبەتی و تایبەتی کردنە بەمەی خوا هیچ پێویستی یەکی نەهێشتووەتەوە بۆ بەندەکانی بە هیچ بەرنامە و سەرچاوەیەکی تر،

﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا﴾ واتە من شتی وا بکەم لە کاتێکدا خوا کەسێکە کە ئەو نامەی ناردووەتە خوارەوە بۆ لاتان بە جۆرێ روون کراوەتەوەو باس کراوە لەو نامەیەدا هەر حوکم و بڕیارێك کە بەندەکانی پێویست بن پێی. بەڵێ ئەم نامەیە هات بۆ ئەوەی کە حوکم بکات بە داد لە نێوان ئادەمی دا لە هەر شتێکدا کە تیایدا دووبەرەکی بن، هات بۆ ئەوەی خوایەتی خوا و حاکمێتی خوای تیا دەرخرێ، ئەم نامەیە هات بە جۆرێ کە بە کورتی ئەو بیرو بڕوا بنەڕەتی یانەی تێدایە کە ڕژێم و ژیانیان لەسەر راگیرە، هەرچۆنێ بە درێژیی ئەو بڕیارانەشی تێدایە کە خوا ویستی دایانهێنێ و بیانچەسپێنێ لەناو کۆمەڵی ئادەمیدا هەرچەند جیاواز بێ رادەو پلەی ئابووری و زانین و هەر شتێکی تریان، بە هۆی ئەو دوو شتەوە ئەم نامەیە هیچ پێویستی یەکی نەهێشتووەتەوە بۆ ئەوەی غەیری خوا بکرێ بە حەکەم لە هیچ کاروبارێکی ژیاندا، ئەمە شتێکە خوا ئەیفەرموێ لە بارەی نامەکەی خۆیەوە، ئینجا هەرکەسێك ئەیەوێ بڵێ: ئەم نامەو شەریعەتە بەس نییە و هەموو پێویستی یەك چارەسەر ناکات یان بڵێ.... بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بڵێ کە موسڵمان نییە و – خوا پەنامان بدات – بڕوای بە فەرمودەی خوا نییە! ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ شتێکی تر کە هۆیەکی بەهێزە بۆ ئەوەی هەر ئەم نامەی خوا بکرێ بە حەکەم، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئەوانەی کە نامەمان پێ بەخشین، واتە زاناکانیان ئەزانن کە ئەم نامەی تۆ هێنراوەتە خوارەوە لەلایەن پەروەردگارتەوە بە هەق و راستی و هەق و راستی پێیە و هێناویەتی، ئەوانە لە دوو بارەوە ئەزانن: یەکەم: خۆیان زانان بە نامەی خوا و سروشی خوا، ئینجا کە سەرنج ئەدەن ئەزانن ئەم قورئانە هەر لەو سەرچاوەوە هاتووەو بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ هیچ کەسێکی تر شتی وا بێنێ بە تایبەت ئەم پێغەمبەرە کە نەخوێندەوارە و لە وڵاتی نەخوێندەوارانـدا پێگەیشتووە و هەرگیز ناتوانێ نامەیەکی وا بێنێ کە لە بەرزترین پلەی تەواوی دایە، دووەم: ئەزانن کە لە نامەکەی خۆیاندا موژدە هاتووە بە هاتنی ئەم نامەو پێغەمبەرە(ﷺ)، کەواتە گێڕانی غەیری ئەم قورئانە بە حەکەم ناڕاست و ناڕەوایە.**

ئەو نامەدارانە هەر زانیویانە و هەر ئەشزانن کە ئەم قورئانە نامەی خوایە، ئەزانن هێزی ئەم ئایینە لەو هەق و راستی یەوە هەڵئەقوڵێ کە پێیەتی و هێناویەتی، جا لەبەر ئەوە هەمیشە ناوەستن لە تێجەنگین لەگەڵ ئەم ئایین و قورئانە، بە بێ وازهێنان، بەدترین جەنگیان ئەمە بوو کە بە هەموو پیلانێك هەوڵیاندا تا لە حاکمی یەتییان خست و بەهۆی ئەوەوە زاڵ بوون بەسەر موسڵمانان و وڵات و خێرو بێری وڵاتەکەیاندا، بەربەستیان کردن لەوەی تێکۆشان و فیداکاری بکەن بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم نامەیە لە هەموو جیهاندا و گێڕانی بە حاکم و حەکەم لە ژیاندا، کەواتە تاقانە رێگەی موسڵمانان بۆ رزگار بوون و سەرکەوتنیان لە هەردوو جیهاندا گەڕانەوەیانە بۆلای ئەم قورئان و ئایینە و تێکۆشان و فیداکاری تا ئەم نامەیە بگێڕنەوە بە حاکم و حەکەم و بە ئیزنی خوا ئەوەش نزیکە و سەرەتا و دروشمی دەرکەوتووە، ئەوەتا لە هەموو لایەکەوە تەنانەت لە وڵاتە بێگانەکانیشدا، داوای گەڕانەوە ئەکرێ بۆلای ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام، ئینجا لێرەدا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ)، لە پاش ئەو هەموو برواداران، ئەو بڕوا نەهێنان و سەرکێشی و لاڕێ یەی کە بت پەرستەکان بەکاریان ئەهێنا، ئەو دان پیا نەنان و شاردنەوەی هەق و راستی یەی کە ئەو نامەدارانە پێی هەڵئەسان، ئەو دوو شتە قورسە کە دڵ و دەروون بێ ئارام ئەکەن، بە سووك و بە بێ نرخ ئەخاتە بەرچاو و ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ واتە ماتوڵ خوا ئەو نامەی هێناوەتە خوارەوە بە هەق و بەڕاستی، نامەدارەکانیش ئەوە ئەزانن، کەواتە با تۆ لەو کەسانە نەبی کە گوماندار و دوو دڵن تیایدا، با تۆ دوو دڵ و گوماندار نەبی لەوەدا، بێگومان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هیچ جۆرە گومان و دوو دڵی یەکی نەبووە لە راستی قورئان و ئایینەکەیدا، کەواتە ئەم تەشبیهو جڵەوگیریی یە بە پێی رووکەش و رواڵەتەکەی مەبەست نییە، بەڵکو مەبەست زیادە هاندانی پێغەمبەرە(ﷺ) و پێك هێنانی سۆز و پەرۆشی بەتینە لە دڵ و دەروونیدا دەربارەی ئایینەکەی، دەس نیشانیشی تێدایە بە قورسی و زۆر بەتینی ئەو پیلان و لاری و سەرکێشی یەی کە دووچاری خۆی و یارەکانی ئەبوو لەلایەن بێ بڕواکانەوە، هەروەها دەست نیشانی تێدایە بە بەزەیی و میهرەبانی خوا بە خۆی و یارەکانی، وێنەی ئەم فەرمودەیە لە چەند شوێنێکدا هاتووە لە قورئاندا و بە چەند جۆرێکی تریش وەلام دراونەتەوە، بەلام ئەمەی کە گوتمان لە دڵدا بەهێزترە و خوا خۆی باش ئەزانێ. لە ئایەتی پێشوودا وەسف و سەنای قورئانی کرد بەوەی لای خواوە هاتووەو نامەدارەکانیش ئەزانن کە لای خواوە هاتووە بە هەق و راستی و هەق و راستی هێناوە،

وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾

---

**لە پاش ئەوە ئینجا پلەیەکی تر لەسەری ئەڕوا بەوەی ئەو نامەیە خۆی لە خۆیدا تەواوەو گەیشتووە بە پایان و هیچ کەس ناتوانیٚ دەستکاری بکات و بیگۆڕیٚ بە هیچ باریٚکدا، ئەفەرمویٚ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ وتەی پەروەردگارت تەواو بوو و تەواوە ﴿صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ بەڕاستی و راست گۆیی، بە دادو دادپەروەریی، واتە لە کاتیٚکدا کە ئەو وتەیە راستە لە هەموو هەواڵ و بەڵیٚن و هەڕەشەکانیدا، بە داد و دادپەروەر لە هەموو فەرمان و جڵەوگیریی و بڕیارەکادا، ﴿لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ هیچ گۆڕەریٚك نییە بۆ وتەکانی لە هیچ بارو روویەکەوە، هیچ وتەیەکی بە ناهەق و ناڕەوا و ناڕیٚك دەرناکریٚ و هیچ هەواڵ و بەڵیٚن و هەڕەشەیەکی بە درۆ ناخریٚتەوە و هیچ بڕیارو فەرمانیٚکی بەرگری ناکریٚ و بە ناڕەوا دەرناکریٚ، هەموو فەرمان و بڕیارەکانی لە ناوەڕاست دایە و بە گۆڕانی بە هەر بارو لایەکدا بە لار و چەوت دەرئەچیٚ، ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ هەر خوا بیسەرە بۆ هەموو شتیٚ و بۆ هەر وتەیەك کە بەندەکانی ئەیلیٚن، هەر ئەو زاناو ئاگایە بە هەموو شتیٚ و بە هەر نیازو مەبەست و وتەیەکی بەندەکانی. هەر شتیٚ کە شیاوە بۆیان، هەر شتیٚ کە بەکارە بۆیان و چارەسەرە، کەواتە هیچ کەسیٚك ریٚگەی هیچ دەمبازی یەکی نییە لە هیچ کاروبار و بڕیاریٚکی خوادا، هیچ کەس ریٚگەی نییە دەم بکوتیٚ لە عەقیدە و بۆچوون و شەریعەتیٚ کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی، ئەبیٚ هەموو شتیٚ بە تەرازووی شەریعەتەکەی خوا بکیٚشریٚ و بە سەنگەکەی ئەو هەڵسەنگیٚنریٚ، هیٚندیٚ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون مەبەست بە(کلمة ربك) وتەو بڕیاری خوایە لە بەڵیٚن و بەسەرخستن و زاڵ کردنی پیٚغەمبەرو ئایینەکەی، لە هەڕەشە بە لەناوبردن و ریسوا کردنی دوژمنانیان، هەرچۆنیٚ تەفسیر کراوەتەوە بە ئایینی خوا بە رابەرو بەڵگەی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە، هەرکام لەمانەش هەر ئەگونجیٚ، بەڵام ئەوەی یەکەم کە کردمان بە تەفسیر لە دڵدا دامەزراو و جیٚگیر ترە، لەپاش ئەوەی روونی کردەوە کە هەق هەر ئەوەیە**

که ئەم قورئانە هێناویەتی، ئینجا بە روونی باسی ئەوە ئەکات کە راو بڕیاری مەردومان بەرامبەر بە قورئان گومڕایی یە و لە رووی زانینەوە نەهاتووە، مەردوم هەرگیز هەق ناڵێن و دەست نیشانی بۆ ناکەن، مەگەر کاتێ کە وەریان گرتبێ و وەری گرن لە تاقانە سەرچاوە راستەکە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەترسێنێ لەوەی گوێڕایەڵی خەڵکی بێت لە هەر شتێکدا کە دەست نیشانی بۆ بکەن لەلایەن خۆیانەوە، هەرچەند ئەو خەڵکە زۆر و فراوان بن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەو کەسانەیت کە وان لە زەویدا، تۆ گومڕا ئەکەن و لات ئەدەن لە ڕێگەی خوا ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾ ئەوانە لەبارەی عەقیدەو بیرو باوەڕ و بۆچوونەوە هەر شوێنی گومان کەوتوون و لە رووی زانینەوە نییە، لەو بارانەشەوە زانین نەبێ سوودی نییە ﴿وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ ئەوانە لەو رووەوە کە باس کرا هەمیشە هەر درۆ ئەکەن و گۆترەکاری ئەکەن، بێگومان زۆربەی ئادەمی لەو چەرخ و سەردەمەدا، وەك ئێستا لە نەفامیدا ژیاون، چونکە خوایان نەگێڕاوە بە حەکەم لە هەموو کاروبارێکیاندا، شەریعەتی خوایان نەگێڕاوە بە قانوون و یاسا بۆ خۆیان، بیروباوەڕ و بۆچوون و بەرنامەی ژیانیان بە پێی تەمێ و رێنموونی خوا نەبووە، ئەوانە هەر بەگومان و شوێن کەوتنی کوێرانە و گۆترەکاری ئەو بارو رێگەیان بۆ خۆیان داناوە، کەواتە شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی یان مایەی لادانە لە رێی راست و هۆی گومڕایی یە، ئینجا روونی ئەکاتەوە کە خوا خۆی بەندەکانی ئەناسێ، خۆی ئەزانێ رێنموونی و گومڕایی کامەیە، کەواتە هەر ئەو ئەزانێ کێ لەسەر رێی راستە و کێ گومڕایە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ بێگومان هەر پەروەردگارت زاناترە و ئەزانێ کێ ون بووە و لای داوە لە رێگەی خوا، هەر ئەو زاناترە بە رێنموونی وەرگرەکان و ئەوانەی لەسەر رێگەی راستی خوان، کەواتە پێویستە یاسایەك ببێ بۆ بڕیاردان بەسەر راستی و ناڕاستی و هەقی و ناهەقی بیرو باوەڕ و بۆچوونی خەڵکی و چاکی و خراپی کردەوەکانیان، پێویستە بوونی یاسایەك بۆ ناسین و جیا کردنەوەی هەق و ناهەق، ئینجا پێویستە بوونی کەسێك کە دانەر بێت بۆ ئەو یاسایانە و سەرچاوە بێت بۆ هەر بڕیارێك کە بدرێ بەسەر بەندەکانی خوادا.

خوای پەروەردگار ئەوا بڕیاریدا کە تەنها خۆی خاوەن مافە بۆ دانانی تەرازوویەك کە کێشانەی ئەو شتانەی پێ بکرێ، هەر ئەو خاوەن مافە لەو کێشانە و پێوانەدا، هەر بەو ئەناسرێ و جیا ئەکرێتەوە ئەوەی لەسەر رێگەی راستە و ئەوەی گومڕایە و ترازاوە، بێگومان نابێ گەل و سەرچاوە بێت، چونکە گەل دامەزراو نییە لەسەر یەك بار، بەڵکو بارو جۆر و شێوەی ئەگۆڕێ، هەر جۆرە گەلێك ئامانج و مەبەست و ئەخلاق و رەوشتێکی هەیە و هەرکام بە پێی ترازوو و سەنگ و مەنی خۆی کێشانە و پێوانە ئەکات، کەواتە حوکم و بڕیارێکی دامەزراوی نییە، ئیسلامیش شتی وای ناوێ و دژیەتی، ئیسلام چەند شتێکی نەگۆڕاوی داناوە بۆ گەل، ئیتر بارو شێوەی هەرچۆن ببێ، هەر گەلێك بە پێی ئەوە بوو کە ئیسلام دایناوە ئەو گەلە ئیسلامییە، هەرگەلێك بە پێی ئەوە نەبوو ئیسلامی نییە، کەواتە گەل دوو بەشە: ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی. لە پاش ئەو سەرەتا و بناغە هەڵچنینە، ئینجا مەسەلەیەك ئەهێنێ بە دوایدا کە لەو کاتەدا باو بووە لەناو بت پەرستەکان گۆشتی مردارەوە بوویان بە حەلاڵ دائەنا و سەربڕراو بە حەرام، ئەیانگوت: چۆن ئەوەی خۆمان بیکوژین حەلاڵە و ئەوەی خوا بیکوژێ حەرامە؟ ئینجا ئەمەی دانا بە دەست درێژیی کردن بۆ سەر حاکمێتی خوا، ئەوەی دانا بە دانانی شەرع و بڕیاری ئارەزووی نەفس و لادان لە شەرعی خوا، جا لەبەر ئەوە ئەم مەسەلەیەی هێنا و هەڵیساند لەسەر ئەو سەرەتایە کە باسکرا، فەرموی: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ واتە ماتوڵ کاری مەردوم بەو جۆرەیە کە باسکرا و حاکمێتی هەر بۆ خوایە، ماتوڵ شوێن کەوتن و گوێرایەڵی ئەوانەی کە باسکران بە هیچ کلۆجێك نابێ، یەکێ لە شوێن کەوتنیان گێڕانی حەلاڵە بە حەرام و حەرام بە حەلاڵ، کەواتە بخۆن لەو سەربڕاوەی کە ناو و باسی خوای لەسەر کرابێ ﴿إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن بە ئایەتەکانی خوا، ئینجا پرسیاریان لێ ئەکات بە شێوەی سەرزەنشت و بێزاری دەربڕین لەو کردەوەی کە خۆیان ئەیکەن،

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾ ئایا چی یە بۆ ئێوە کە ناخۆن لەوەی کە ناوی خوای لەسەر برابێ لەکاتی سەربڕینیدا، واتە هیچ بەرگری کەرێك نییە لە خواردنی و هیچ پاڵدەر و هۆیەك نییە بۆ نەخواردنی، ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ لەکاتێکدا بە روونی باسی کردووە بۆتان ئەوەی کە حەرامی کردووە لەسەرتان ﴿إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾ مەگەر ئەوەی کە ناچارکرابن بۆی و بە ناچاری بیخۆن، بەم رەنگە برسێتی زۆرتان بۆ بهێنێ و هیچ خۆراکی حەڵاڵتان دەست نەکەوێ، لەو کاتەدا لەبەر ئەو ناچاری یە ئەو حەرامی و قەدەغەی کە بووە خوا هەڵی ئەگرێ، بەڵام ئەوەی کە حەڵاڵە بۆ مەردوم هەر حەڵاڵە و حەرامی رووی تێناکات لەبەر خۆی، خولاسەی ئەم ئایەتە: ئەوەی کە حەرام کراوە لەسەرتان خوا بە روونی باسی کردووە، ئیتر بە ئایەتی(١٤٥) ی ئەم سورەتە کە دێت یان بە شێوەیەکی تر کە وەحی کرابێ، بێجگە لەوە حەڵاڵە، ئەوەی کە ناوی خوای لەسەر برابێ خوا حەڵاڵی کردووە، کەواتە چۆن سەرپێچی ئەکەن لە خواردنی؟ ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بە راستی زۆرکەس مەردوم گومڕا ئەکەن بە هەواو ئارەزووی خۆیان بە بێ هیچ جۆرە زانینێك کەلە خواوە وەرگیرابێ، یا بە بێ هیچ جۆرە زانینێك، بەڵکو بە هەواو ئارەزووی رووت و پەتی، ئەوانە خۆیان گومڕان و مەردومیش گومڕا ئەکەن بەوەی لەلایەن خۆیانەوە شەرع و بەرنامە دائەنێن و بڕیاری حەرام و حەڵاڵ ئەدەن، کە ئەوەش تایبەتی یە هەر بە خواوە، کەواتە دەست درێژیی ئەکەن بۆ سەر خوایەتی و حاکمێتی خوا ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ﴾ بێگومان هەر

پەروەردگارت زاناترە بە دەست درێژیی کەران کە ئەو گومڕا کەرانە لێرەدا یەکەم و سەردەستەن، کەواتە بە پێی کردەوەی بەدیان تۆڵەیان لێ ئەسێنێ کە گومڕا کردنی مەردوم و دانانی یاسا و شەرع بۆیان بە ناوی خواوە سەردەستەیە بۆ کردەوە بەدەکانیان. ئینجا هەڕەشە ئەکات و ئەیانترسێنێ لە سەرەنجامی ئەو گوناهەی کە ئەیکەن و ئەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓ﴾ واز بێنن لە گوناهی ئاشکراو و گوناهی نهێنی، یان واز بێنن لە گوناهێك کە زیان و بەدی و خراپی یەکەی ئاشکرا بێ بۆ گشتی، گوناهێك کە زیان و بەدی یەکەی ئاشکرا نەبێ، یان واز بێنن لە گوناهێك کە بە ئەندامە ئاشکراکان ئەکرێ و گوناهێك کە بە دڵ و دەروون ئەکرێ، کە سەردەستەی ئەو گوناهانە گومڕا کردنی خەڵکی یە و هاندانیانە بۆ شەریعەتی غەیری خوا و ناونانی بە شەریعەتی خوا بە درۆ و دەست هەڵبەست، واز لە گوناهەکان بهێنن، چونکە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ﴾ بەڕاستی کە گوناه ئەکەن بە دەستی ئەنقەست، ﴿سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ﴾ تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ و تۆڵە ئەدرێنەوە بە هۆی ئەندازەی ئەو کردەوە بەدەی کە بە هەمیشەیی و بە دەست قەست لە جیهاندا ئەیانکرد بە بێ پەشیمان بوونەوە، ئینجا جڵەوگیریی ئەکات لە خواردنی ئەوەی کە ناوی خوا نەبرابێ لەسەری کاتی سەربڕین و ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ ئەخۆن لەوەی کە ناوی خوا برابێ لەسەری ئەم ڕەنگە ناوی غەیری خوا برابێ لەکاتی سەربڕینیدا، وەك باو بووە لە ناو بت پەرستەکاندا کە ناوی لات و عوزا ئەبرا، هەروەها ناوی هەرکەسێك یا هەر شتێکی تریش، یان مردار بوویێتەوە ئیتر بە هەر جۆر لە جۆرەکانی مردار بوونەوە، ئەو مردارانەی کە بت پەرستەکان دەمبازی یان پێ ئەکردو ئەیانویست بە حەڵاڵی دەرکەن، بەمەی کوژراوی دەستی خوایە و ئیتر بۆ نەبێ سەربڕاوی دەستی خۆیان حەڵاڵ بێت و کوژراوی خوا حەرام بێت؟ ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞ﴾ بێگومان خواردن لەوە دەرچوونە لە گوێڕایەڵی خوا،یان دەرچوونەلەشتی حەڵاڵ بۆشتی حەرام،بەهەرحاڵ ئەوخواردنە حەرامە،

وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ﴿١٢١﴾

---

﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ﴾ **بێگومان شەیتانەکان، واتە شەیتانی گەورە و لەشکرەکەی شتی پڕوپووچ و ناهەق ئەبەنە دڵی دۆست و شوێن کەوتووەکانیان، واتە بت پەرستەکان، بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن، یان مەبەست بەو شەیتانانە مەجوسەکانە کە رایان ئەگەیاندە لای بت پەرستەکانی مەککە، لەسەر هەربار موجادەلە و دەمبازی یەکەیان ئەمە بوو، وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان بۆ کرد، کە چۆن ئەوەی خۆتان سەری ئەبڕن حەڵاڵە بۆتان و ئەیخۆن، ئەوەی کە خوا ئەیکوژێ، واتە مردارەکان، حەرامە بۆتان، وەك لە ریوایەتدا هاتووە، ئەو وتە بەدە خەریك بوو کار بکات لە دڵی هێندێ لە تازە موسڵمانەکاندا کە نەشارەزا بوون، ئینجا خوای پەروەردگار دەم کوتی ئەو شەیتانانەی کرد بەمەی کە ئەو وتەو خەتەرە لەلایەن شەیتانەکانەوە هاتووە و نابێ لە گوێیان بکەن** ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ئەگەر ئێوە ئەی بڕواداران گوێرایەڵیان بن و لە گوێیان بکەن بێگومان ئێوە بەو لە گوێ گرتنە هاوبەش رەوا دەر ئەبن بۆ خوا و لە ریزی بڕواداران دەرئەچن.**

**زۆر پێویستە بە باشی دڵ بدرێتە ئەم فەرمودەیە، ئەم دەقە قورئانییە کە بە روونی نیشانمان ئەدا کە ئەبێ حاکمێتی تەنها بۆ خوا بێت لە هەموو کاروبارێکدا، ئەبێ گوێرایەڵی و شوێن کەوتن و پەیڕەوی تەنها بۆ بەرنامە و شەریعەتی خوا بێت، گوێرایەڵی هەر موسڵمانێك بۆ هەر یاسا و بەرنامەیەك کە لە شەریعەت و بەرنامەی خوا وەرنەگیرابێ و لەسەر بنەڕەتی بڕوا بە حاکمێتی خوا نەبێ، ئەو شوێن کەوتن و گوێرایەڵی یە لە ئیسلام دەری ئەکات و ئەیگێڕێ بە بت پەرست و هاوبەش رەوا دەر،(ئیبن کەسیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێ:** ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ئەفەرموێ: چونکە لاتان داوە لە فەرمان و شەرعی خوا و پەیڕەوی فەرمان و قسەی غەیری خواتان کردووە، باوتان داوە و پێشتان خستووە لە فەرمان و بڕیاری خوا، ئەوەش هاوبەش رەوادانە بۆ خوا، وەك لەم ئایەتەشدا کە دەربارەی نامەداران ئەفەرموێ:** ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ **زاناکان**

و خواپەرستە کەنارگیرەکانیان گێڕاوە بە چەند خوایەك بۆ خۆیان. جا(ترمزی) لە(عودەی کوڕی حاتەم) ەوە ئەگێڕێتەوەکە ئەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە ناپەرستن؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ ئەیانپەرستن! چونکە ئەو زانا و عابیدانە حەرامیان بۆ حەڵاڵ ئەکەن و حەڵاڵیان لەسەر حەرام بکەن، ئەوانیش پەیڕەوییان ئەکەن، ئەوەش پەرستنیانە بۆیان، هەروەها(ئیبن و کەسیر) لە(سدی) یەوە ئەگێڕێتەوە لەم ئایەتەدا: ئەو نامەدارانە پەندو فەرمانیان داوا ئەکرد لەو زانا و عابیدانە و نامەی خوایان پشت گوێ ئەخست، ئەوەش پەرستنە لەبەر ئەوە قورئان بەرپەرچیان ئەداتەوە بەمە: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ﴾ فەرمان نەدراوە پێیان غەیری خوایەکی تاك و تەنیا بپەرستن، واتە ئەو خوایەی کە هەر ئەو شت حەڵاڵ یان حەرام ئەکات، حەرام هەر ئەوەیە کە ئەو حەرامی بکات، حەڵاڵ هەر ئەوەیە کە ئەو حەڵاڵی بکات، هەر شەرع و بەرنامەیەك کە ئەو دایبهێنێ ئەبێ پەیڕەوی بکرێ، بڕیاری هەر شتێکیدا ئەبێ بەجێ بهێنرێ، فەرمودەی ئەم دوو زانایە وەرگیرا و رێك و پێکە لەگەڵ دەقی ئەو ئایەت و حەدیسەی کە تێپەڕیان کرد، بە روونی ئەوە نیشان ئەدەن کە هەر موسڵمانێك پەیڕەوی هەر ئادەمی یەك بکات لە هەر یاسا و بەرنامەیەك کە خۆی دایناب‌ێ و لە خواوە نەهاتبێ ئەوە ئەو پەیڕەوی کەرە هاوبەش رەوادەرە بۆ خوا و موسڵمان نییە، ئەگەر لە پێشەوە موسڵمان بووبێ بەو پەیڕەوی کردنە لە ئیسلام دەرئەچێ و ئەبێ بە بت پەرست و هاوبەش رەوا دەر، ئیتر هەرچەند شایەتمان بێنێ بە زوبان و خۆی بە موسڵمان دابنێ! ئەم ئایەتی: ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ﴾ بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەمەی کە گوتمان جێگیر بوو لە دڵمدا و رای هێندێ لە زانای بەرزی لەسەرە لەبەر ئەوە هەڵم بژارد، ئینجا لەبارەی پێویستی ناوبردنی خوا لەکاتی سەربڕینی سەربڕاوان، پاڵفتەکەی ئەمەیە کە(ئیبن و کەسیر) لە تەفسیرەکەیدا فەرمویەتی. ئەفەرموێ: زانا و پێشەواکان – خوایان لێ رازی بێت – سێ تاقمن:

١– ئەگەر ناوی خوا نەبرا – ئیتر بە دەستی قەست یان لەبیرچوون – ئەو سەر براوە حەرامە خواردنی، ئەم رایە ریوایەتکراوە لە(ئیبن و عومەر و نافیع و عامر و شەعەبی و ئیبن و سیرین و ئیمامی مالیك لە ریوایەتێکدا)، هەروەها لە ریوایەتێکی ئیمامی

ئەحمەدیشدا، ئەم رایە هەڵبـژێرراوی(ئەبو سەور و داودی و زاهیری) یە،(ئەبولفتوحی شافیعی) ش ئەم رایەی پەسەند کردووە، بەڵگەیان ئەم ئایەتە و چەند حەدیسێکە.

٢- ناوبردنی خوا سوننەتە و مەرج نییە بۆ حەلاڵی، ئیمامی شافیعی و هەموو هاوەڵەکانی لەسەر ئەم رایەن، هەروەها(ئیمامی مالیك و ئەحمەد) لە ریوایەتێکیاندا، لە(ئیبن و عەبباس و ئەبو هورەیرە و عطا) یشەوە ئەگێرنەوە،(ئیمامی شافیعی) ئەم ئایەتە ئەبڕێ بەسەر ئەو سەربڕاوانەدا کە بە ناوی بت و بۆ بت سەر بڕابن، ئەم رایە بەهێزە،(ئیبن و عەباس) ئایەتەکە کە ئەبڕێ بەسەر مردارەوەبوودا، چەند حەدیسێك هاتووە کە بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر ئەم رایە.

٣- ئەگەر ناوبردنی خوا لەبیرچوو قەیناکا، ئەگەر بە دەست قەست ناو نەبرا ئەو حەلە حەرامە.(ئیمامی حەنەفی) و هاوەڵەکانی و(ئیسحاقی کوڕی راهوەی) لەسەر ئەم رایەن، لە مەزهەبی(ئیمامی مالیك و ئەحمەد) یشدا ئەم رایە بەناوبانگە، لە(ئیمامی عەلی و ئیبن و عەباس و سەعیدی کوڕی موسەیەب و عطا و تاوس و حەسەنی بەسری و ئەبو مالیك و ئیبن و ئەبو لەیلا و جعفر و رەبیعەوە گێڕراوەتەوە، ئینجا ئایا ئەم را جیاوازانە و ئەم دووبەرەکی یە لەوەدایە کە سەر بڕەکە موسڵمان بێ، یان گشتی یە بۆ نامەدارانیش؟ زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە گشتی یە، بەڵکو سەربڕاوی نامەدار بە بێ مەرج حەلاڵە وەك رووکەش و رواڵەتی ئایەتی(مائدە) دا نیشان ئەدا: ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ﴾ خۆراکی ئەوانەی نامەیان پێدراوە حەلاڵە بۆتان. لە پاش باسی حەلاڵی و حەرامی سەربڕاوان، ئینجا باسی سروشتی بڕوا و بێ بڕوایی ئەهێنێ کە بناغە و بنەڕەتی هەموو حەلاڵ و حەرامێکن. لە لایەکی ترەوە ئەم باسی بڕواو بێ بڕوایی یە بە شێوەی چیرۆکێك ئەیهێنێ کە شێوەی هاوبەش رەوا دەرەکان بێزراو و ناشیرین ئەکات، دڵ و دەروون دوور ئەخاتەوە لە گوێڕایەڵی یان، کەواتە هێنانی ئەم باسە زۆر بە جێیە و پەیوەستە لەگەڵ ئایەتی پێشیدا،

أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ

**ئەفەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ﴾ ئایا کەسێك کە مردوو بێت و ئینجا ئێمە زیندووی بکەینەوە ﴿وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ﴾ گێڕابێتمان بۆ ئەو کەسە رووناکی یەکی گرنگ و گەورە کە بە هۆی ئەوەوە بگەڕێ لەناو خەڵکیدا بە ئارامی و خۆشی، ئایا وێنەو شێوەی ئەو کەسە ﴿كَمَن﴾ وەك کەسێك وایە کە ﴿مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ سیفەت و وێنەی سەرسوڕهێنەر ئەمەبێ، ئەو کەسە لەناو چەند تاریکی یەکدا بێ، وەك کەسێك کە لە شەوی تاریکدا لە بێخ و بنی دەریایەکی رەش و تاریکدا بێ ﴿لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ﴾ لە کاتێکدا دەرنەچێ لەو تاریکی یانە و دەرچوونی نەبێ؟! ئایا ئەم دوو کەس چوون یەکن و وەك یەك وان؟ نەخێر ئەم دوانە زۆر جیاوازن، دەی بڕوادار و بێ بڕوا هەر بەم چەشنەن، بەڕاستی چیرۆکەکە زۆر راست و رێکە و هەر لە دەست قورئان دێت روونکردنەوەو نیشاندانی حەقیقەت و باری راستەقینەی هەر شتێ کە ویستبێتی باسی بکات و نیشانی بدات: بێگومان مەردوم بە بێ ئەم بڕوا و عەقیدە ئیسلامییە لە راستیدا مردووە، هەرچەند بە رواڵەت و دیمەن بە زیندوو دابنرێ و سەیر بکرێ، چونکە بێ بڕوایی پچڕانە لە زیندوویی راستەقینە کە سەرەتا و دواهاتن نییە بۆی، کەواتە راستە مردنە، دوورکەوتنەوە و پچڕانە لە هێزو توانای راستەقینە کە ئیش کەرە و کار ئەکات لە هەموو بوون و بوونەوەردا، کەواتە لە راستیدا مردنە، کوێری و نابینایی یە لەو کۆئەندامە سروشتییەی کە هۆی تێگەیشتن و وەرگرتن و گوێرایەڵی یە، کەواتە لە راستیدا بێ بڕوایی مردنە، بە پێچەوانەی ئەوەوە بڕواو عەقیدە پەیوەستییە بە زیندوویی راستەقینەوەو بەهێزو توانای راستەقینەوە، بینایی یە لە کۆئەندامە سروشتی یەکەی مەردومدا، کەواتە لە راستی دا زیندوو نییە.**

بێ بڕوایی پەردەیەکی ئەستووره بەسەر ڕۆح و گیانەوە بەرگری ئەکات لە هەست کردن و بەدی کردنی چەند شتی ڕاستەقینە، کەواتە تاریکی یە، قوفڵ و مۆرێکە بەسەر هەست و ئەندامەکانەوە، سەرگەردانی و گومڕایی یە، کەواتە لە ڕاستیدا تاریکی یە، بڕوا کرانەوە چاوکردنەوەو بینینە بۆ دڵ، پێگەیشتن و تێگەیشتنە، کەواتە نورو ڕووناکی یە، بێ بڕوای گرژ بوون و وشك و ڕەق بوونەوەیە، کەواتە تەنگی و تەنگەتاوی یە، لادان و ترازانە لە ڕێگای ئاسانی سروشتی، کەواتە سەختی و ناڕەحەتی یە، بێبەشی یە لە ئارامی و دڵنیایی، کەواتە دانەمەزراوی و بێ ئارامی یە، بڕوا سینگ و دڵ فراوانی یە ئاسایش و ئارام و فێنکی دڵ و سێبەر و سەهەندە، بێ بڕوا ڕوەکێکی ون و بێ سەرو شوێنە و ریشەی دانەکوتاوە و بنج بەست نەبووە لە زەوی و خاکی ئەم بوون و بوونەوەرەدا، هیچ نییە بێجگە لەوەی نەفەرێکی تاك و تەنیایە و پەیوەستی پچڕاوە بە پەروەردگار و داهێنەری ئەم بوون و بوونەوەرەوە، کەواتە لە ڕاستیدا پەیوەستی نی یە بەم بوون و بوونەوەرە، مەگەر پەیوەندی یەکی لەڕو لاواز و لە سنوورێکدا کە گیانلەبەرانی تری تێدا ئەژی، ژیانی لەم بوونەوەرەدا زۆر تەنگ و تەسکە و لە چوار چێوەی هەست و هەستیار دەرناچێ! بێگومان پەیوەستی بە خوا و پەیوەستی لە ڕێی خوادا بەندەی تاك و تەنیا کە ژیانێکی کورتی هەیە و ئیتر لەناو ناچێ، ئەو تەنیا کەسە ئەگەیەنێ بە خوای بێ وێنە کە سەرەتا نییە بۆ بوونی و دواهاتن و نەمان ڕووی تێناکات، ئینجا ئەیگەیەنێ و پەیوەستی ئەکات بەم بوونەوەرە و بەم ژیانە ئاشکرای کەهەیەوئەیناسین، ئینجائەیگەیەنێ وپەیوەستی ئەکات وتێکەڵی کۆمەڵی بڕواداری ئەکات کەریشەی داکوتاوەلەناوئەم بوون وبوونەوەرەدا.بەستراون پێکەوەبەدرێژایی چەرخ و ڕۆژگار.

مەردومی بڕواداری قورئانی ئەو ڕووناکی یەی دەست ئەکەوێ لە دڵ و دەروونی خۆیدا، بەهۆی ئەوەوە حەقیقەتی ئەم ئایینەی بۆ دەرئەکەوێ و تێ ئەگات لە بارە ڕاستەقینەکەی، تێ ئەگات لە بەرنامەی ئەم ئایینە لە کارو کردەوەو بزووتنەوەدا، ئەم ئایینە تەنها بریتی نییە لە کۆمەڵێك لە بیرو باوەڕ و عیبادەت و پەندو تەمێ و چەند شەریعەت و یاسایەك بە بێ

پەیوەستی و تێکەڵی و داڕشتن، نەخێر، بەڵکو دەرئەکەوێ بۆ بڕواداری قورئانی کە هەموو ئەم بوونەوەرە و هەرچی وا لەم بوونەوەرەدا، ئەم ئادەمی یە بە هەموو کارو کردەوەکانییەوە، هەموو ئەمانە یەك داڕشتنە و هەموو کەرەسە و بەش و پارچەکانی رێك و رێکخراوە و تەواوکەری یەکترن.

هەر بڕواداری قورئانی تێ ئەگات لە خۆی و لە ئادەمی و لەو بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژی و لە ژیان. بۆی دەرئەکەوێ کە هەرچی لەم بوونەوەرەدایە، هەرچی رووداو هەیە یاسا و رژێمێکی هەیە و بە پێی رەوشت و باوێکی زۆر وردە و هەموو سەرەتا و سەرەنجام و بەرهەمەکان دێن بە دوای یەکدا لەسەر یاسا و رژێمێکی تێرو تەواو، ئینجا مەیل و خواهیشی خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا و دەوری هەموویداوە و هەموو شت بەپێی ئەو مەیل و خواهیشەیە، بڕواداری قورئانی دڵی روناکە و لە هەموو شتێ تێ ئەگات و سەرناکاتەوە و سەری سوڕنامێنێ و دژایەتی پەیدا نابێ لەدڵیدا بەرامبەر ئەو هەموو شتە و ئەو هەموو رووداوە، ئا بەو جۆرو شێوەیە قورئان بە وتەو وتارە بێ وێنەکەی خۆی دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو شتە راست و دروستانە کە ئەفەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ﴾ موسڵمانەکان پێش ئەوەی بێنە ژێر ئاڵا و سایەی ئەم ئایینە دڵ مردوو و گیان تاریکن. بەم ئایینە دڵیان زیندوو بوو زیندوو ئەبێ، تاریکی نامێنێ لە گیان و هەست و دەروونیاندا، روناکی دێتە جێگەی، ئەو خاوەن بڕوایە ئەبێ بە کەسێکی ئازادی سەربەستی زانای تێگەیشتوو، رزگار ئەبێ لە بەندەیی هەرکەسێ و هەر شتێ بێجگە لە خوای پەروەردگاری تاك و تەنیا، دەی ئایا کەسێك کە بەختەوەر ببێ بە گیان و روناکی یەکی وا، وەك کەسێك وایە کە لە هەموو بارێکەوە لە تاریکیدا بژی و رزگار بوونی نەبێ؟ بێگومان ئەم دوو کەسە زۆر جیاوازن و دوورن لە یەکتر، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کابرای بێ بڕوا هەست بەوە ناکات و شادومان و خۆشنوودە بەو تاریکی و دڵ مردوویی یە و لە پێش چاوی شیرین کراون، هەرچۆنێ ئەو زیندوویی و روناکی یە شیرین کراوە بەلای بڕوادارانەوە،

كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا۟ فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾

---

**وەك ئەفـەرمویٚ: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ واتـە هەرچـۆنیٚ رازاوەتـەوە و شیرین کراوە بۆ بڕواداران بڕوا و کردەوە و چاکەکانیان، هەروەها شیرین کراوە بۆ بیٚ بڕواکان بیٚ بڕوایی و کردەوە بەدەکانیان کە هەمیشەیی و بەردەوام بوون لەسەریان، یان بەو چەشـن و تـەرزەی کـە شـەیتانەکانی(جـن) و ئـادەمی رایانگەیانـد و ئـەیانبردە دڵـی بـیٚ بڕواکانـەوە، هـەر بـەو جـۆرە و لەسـەر ئـەو بـارە شـیرین کـراوە بـۆ بـیٚ بڕواکـان کـردەوە بەدەکانیان، لەسەر هەر بار ئەو کەسەی کە ئەوە ئەڕازیٚنیٚتەوە و شیرینی ئەکات لە یەکەم جارەوە و پـیٚش هـەموو شـتیٚ خوایـە و مـەیل و خواهیـشی خوایـە کـە ئـەم ئـادەمی یـەی دروسـتکرد لەسـەر ئـەم سروشـتە تایبـەتی یـە، ئامـادەیی یـان تیایـە بـۆ خـۆش ویـستن و هەڵبژاردنی هەرکام لە بڕواو رووناکی و بیٚ بڕوایی و تاریکی، تاقی ئەکاتەوە بەو هەڵبژاردنە و هەرکامی هەڵبژارد بە مەیل و خواهیشی خۆی، خوا ئەوەی بۆ ئەکات و شیرینی ئەکات لە پیٚش چاوی، ئینجا شەیتانەکانی(جن) و ئادەمییش بیٚ بڕوایی و خراپەی لە پیٚش چاو شیرین ئەکەن، هەرچۆنیٚ مەلائیکە و پیاوچاکانیش بڕواو کردەوەی چاك و جوان شیرین ئەکەن بۆی، بەڵام هەموو کارەکان ئەگەڕیٚتەوە بۆلای خواو بیٚجگە لە خوا هیچ کەس و هیچ شتیٚ لە راستیدا هیچی پیٚناکریٚ و هیچی بە دەست نییە، بەڵکو بە فەرمانی خوا و بە ئیزنی خـوا ئـەبن بـەهۆی فەراهـەم هـاتنی ئـەو شـتەی کـە خـوا بیـەویٚ، ﴿جَعَلْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا﴾ واتـە هەرچـۆنیٚ گیٚڕاومانـە لـە مەککـەدا چـەند سـەرۆك و گەورەیـە، هـەروەها گیٚڕاومانە لە هەموو شاریٚکدا چەند سەرۆك و گەورەترین کەسانیٚ کە خراپەکارو تاوانبارانی ئەو شارانە بوون، یان هەرچۆنیٚ کردەوە بەدەکانی دانیشتوانی مەککەمان شیرینکرد بۆیان، هەروەها گیٚڕاومانە لە هەموو شاریٚکدا... هتد. ﴿لِيَمْكُرُوا۟ فِيهَا﴾ بۆ ئەوەی پیلان و فیٚڵ و**

دەلەسە بکەن لەو شارانەدا بۆ بەرگری چاکە و ئایینی خوا تا بەهۆی ئەوەو، خەڵك تاقی بکرێنەوەو دەرکەوێ کێ چاکە و کێ خراپە،(موجاهید) ئەفەرموێ: لەسەر هەموو رێگاکانی مەککەدا چوار کەسیان دانابوو، بۆ ئەوەی خەڵکی بەرگری بکەن لە بڕوا هێنان بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەیانگوت: ئەو پیاوە درۆزنە، جادوبازە، کاهینە، بڕوای پێ نەهێنن، ئەوە بوو پیلانەکەیان، بە هەر جۆر بووبێ ئەوا خوای میهرەبان بەڵێن ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) هەڕەشەش ئەکات لە پیلان کەران کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ﴾ فێڵ و پیلان ناکەن بە هیچ کەس بێجگە لە خۆیان، واتە زیان و سەرەنجام و بەرهەمی بەدی پیلان و خراپەکاری خۆیانە ئەبێ بەهۆی خەشم و قاری خوا لێیان، ئەبێ بە مایەی تیا چوونیان لە هەردوو جیهاندا ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە هەست ناکەن و ئاگایان لە خۆیان نییە، بەڵێ باوی خوا هەر وا بووە و هەر وا هاتووە کە لە هەموو پایتەخت و شارە گەورەکاندا کۆمەڵێك لە سەرۆك و گەورە پیاوان راست بوونەتەوە بۆ دوژمنایەتی و بەرگری ئایینی خوا، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئایینی خوا بۆ ئەوە هاتووە کە تەنها حاکمێتی خوا بچەسپێنێ و هەموو زۆردار و تاوانکارێ چەك بکات و ئەو زۆر و دەسەڵاتەیان نەهێڵێ کە بە ناهەق مەردومی پێ ژێر دەست ئەکەن و ماف داگیر ئەکەن، ئینجا ئەو زۆردار و تاوانبارانە دەست ئەکەن بە پیلان و خراپەکاری بە هەر جۆر لە دەستیان بێت بۆ پارێزگاری ئەو سەرۆکایەتی و دەست درێژیی و داگیر کردنەی خۆیان، کەواتە چار نییە ئەبێ ئەوە ببێ و ئەو پێغەمبەرو بڕوادارانە بکەونە ئەو ئاژاوە و بەربەرەکانی یە، بەڵام سەرەنجام و بەرهەمی کردەوە بەدەکانیان بە زیان و تیاچوونی خۆیان تەواو بووە، وەك باسکرا. ئینجا باسی ئەو خۆ بە زل زانییە ئەکات کە جێگیر و دامەزراوە لە دەروونی دوژمنانی پێغەمبەران و ئایینەکەیاندا، ئەو خۆ بە زل زانییەی کە بەرگری یان ئەکات لە بڕوا هێنان تا نەبن بە بەندەیەك وەك بەندەیانی تری خوا، واتە ئەبێ جیاوازیان ببێ و وەك ئەو خەڵکی ترە نەبن، لە کاتێکدا ئەوان لەسەر ئەمە رام بوون کە بە چاوی خوایی سەیر بکرێن و فەرماندار و فەرمان رەوا بن،

وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٤﴾ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٥﴾

---

**جا لەبەر ئەوە بڕو بیانووو پەڵپی بێ جێیان ئەگرت، وەك دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ﴾ كاتێ ئایەتێكیان بۆ بێت، ئیتر موعجیزە یان ئایەتی قورئان كە فەرمانیان پێبدات بە بڕوا هێنان ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن و ئەیانگوت: ﴿لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِ﴾ هەرگیز بڕوا ناهێنن هەتا پێمان نەدرێ وێنەی ئەوەی دراوە بە پێغەمبەران و فروستادەكانی خوا، واتە هەتا وەحی نەكرێ بۆلامان و جوبرەئیل نەیەت و هەواڵمان پێ نەدا كە محمد(ﷺ) راست ئەكات وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ و لە(حەسەنی بەسری) شەوە بەو جۆرە هاتووە، یان هەتا وەحیمان بۆ نەیەت و نەكرێین بە پێغەمبەر، وەك(مقاتل) و كۆمەڵێك ئەفەرمون. ئەم رایە رێكە لەگەڵ ئەوەی كە ئەگێڕنەوە كە(ئەبو جەهل) ئەیگوت: سوێند بەخوا رازی نابم پێی و هەرگیز شوێنی ناكەوم مەگەر وەحیمان بۆ بێت وەك بۆ ئەو دێت! هەروەها ئەم رایە رێك ترە لەگەڵ ئەم بەرپەرچ دانەوەی كە ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾ خوا زاناترە لە هەموو كەس و باشتر ئەزانێ پەیام و فروستادەی خۆی لە كوێ دائەنێ و كێ شیاو و شایستە ترە بۆ ئەو كارە و كێ دەست ئەدا بكرێ بە پێغەمبەرو فروستادە، واتە ئەو پەڵپ و بیانووی ئەوانە ناڕاست و ناڕەوایە و ئەوان شیاو و شایستەی ئەوە نین، بێگومان پێغەمبەرێتی كارێكی زۆر گەورەو گرنگە، یەكێكە لە كارە زۆر گرنگەكانی ئەم بوونەوەرە، هۆی پەیوەندی و پەیوەستی كۆمەڵی هەرە بەرزی بێ سنوورە بەم جیهانی سنووورداری كەم و كوڕی ئادەمی یەوە، هۆی پەیوەندی و پەیوەستی ئاسمانە بە زەوییەوە، جیهان بە رۆژی دوایی یەوە، خوا خۆی ئەزانێ كێ و كام لە بەندەكانی دەست ئەدات بۆ كاری وا، ئەوانەی**

**که به تەمای کاری ئاوان و خۆیان بە شیاوی ئەوە ئەزانن بەهۆی ماڵ و سامان و ئەو شتانەی تر کە لەم زەوییەدا بە گرنگ و نرخ دار سەیر ئەکرێن، ئەو کەسانە نەفامن و هەڵەن، نازانن کە ئەمان سروشتێکیان هەیە و پێغەمبەران - درودی خوایان لێ بێت - سروشتێکی تریان هەیە کە زۆر جیاوازن لە یەکتر، ئەمانە حەسادەت و خۆ بە زل زانی سەری لێ تێکداون و خۆیان لێکۆڕاوە لەبەر ئەوە بە تەمای شتێکن کە شیاوی نین، ئەمانە نەفامن نازانن پێغەمبەرێتی بەهرەو بەخششێکی خوایە بە هەوڵ و تێکۆشان دەستکەوت نابێ، ئەمانە شایستەی ئەم هەڕەشە سامناکەن کە لێرەدا فەرموی و کردی بە بەرپەرچی دووەم بۆ ئەو وتە بێ فەرەی ئەوان،** ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ﴾ **بێگومان دووچاری ئەوانە ئەبێ کە تاوانیانکرد، واتە ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا لە جیهاندا، خۆیان زلتر دائەنا لەوەی مل کەچ کەن و بڕوا بێنن بە پێغەمبەر(ﷺ)، بە تەمای بەرزی پێغەمبەرێتی بوون. لە باتی ئەو لووت بەرزی و خۆ بە زل زانی یە دووچاریان ئەبێ پەستی و زەبوونی و ریسوایی یەکی گەورە لای خوا لە ڕۆژی دواییدا، سزایەکی بەتین، بەهۆی ئەو پیلان و کردەوە بەدانەی کە کردیان و لە جیهاندا بەردەوام بوون لەسەری، ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە نەخشە کێشانی شێوەو وێنەی دڵەکان لە بارەی بڕوا هێنان و ڕێنموونی وەرگرتنەوە، ئەفەرموێ:** ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ﴾ **ئینجا هەرکەسێك کە خوا بیەوێ بیخاتە سەر ڕێی ڕاست و ڕێی ڕاستی پێ بناسێنێ، دڵی فراوان ئەکات بۆ ئیسلام و بڕوا هێنان بە جۆرێ کە سووك و ئاسان وەری گرێ، هیچ تەنگی و تاریکی یەکی تێدا نامێنێ، بەڵکو وەك لە حەدیسدا هاتووە نوورو ڕووناکی یەك ئەخاتە ئەو سنگ و دڵەو بەهۆی ئەوەوە ئەکرێتەوە و فراوان ئەبێ بۆی و بە ئاسانی جێگیر ئەبێ تیایدا،** ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ﴾ **هەرکەس خوا بیەوێ گومڕای بکات و نەیخاتە سەر ڕێی ڕاست** ﴿يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ **سنگی، واتە دڵی ئەگیرێ بە تەنگی یە کە تەنگی یەکی زۆر بەتین بێ وەك ئەو سینگ و دڵە بووبێ بە تەنگی بە جۆرێ:** ﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ **وەك ئەو کەسە بە زۆرە زمایی بەرز ببێتەوە بە ئاسماندا، واتە ئەوەندە دڵ تەنگ و بێزارە لە ئیسلام وەك داوای بەرز**

بوونەوەی بەرەو ئاسمانی لێکرا بێ کە بە هیچ رەنگ لە توانایدا نییە و ناڕەحەت و بێزارە لێی، بەرز بوونەوە بە لەش بۆ ئاسمان کراوە بە چیرۆك بۆ شتێ کە لە توانایدا نەبێ، ﴿كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بەو جۆرو شێوەو لەسەر ئەو تەرزە، واتە وەك گێڕانی سنگ و دڵ بە تەنگ بێزار لە ئیسلام، وەك ئەوە خوا سزا، یان شتی پیس و قیزەون یا پەستی و کەوتنە چاڵ ئەدا بەسەر ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن، واتە بەسەر ئەوانەی کە دڵ تەنگ و بێزارن، بەڵام بەم شێوەیە فەرموی تا لەکەداریان بکات بە بێ بڕوایی و دەست نیشان بکات بەهۆی ئەو دڵ تەنگی و بێزاری یە.

ئەم ئایەتە و وێنەکانی لە قورئاندا بوو بە جێگەو هۆی ئاژاوە و دووبەرەکی بەتین لەناو موسڵمانانداا، چەند مەزهەب و کۆمەڵی سەرەکی لێ فەراهەم هات:(قەدەری، جبری، معتزلة، ئەشعەری یە) بەڵام هەرکەس بە بێ لایەنگیریی ورد ببێتەوە لە ئایەتەکانی قورئان بە روونی بۆی دەرئەکەوێ کە قورئان پێمان رائەگەیەنێ ئەم چەند شتە: خوا داهێنەرو بەدیهێنەری هەموو شتێکە، خوا هەموو شتی دروستکردووە بە رژێم و بڕیارو قەزاو قەدەرێکی رابردوو، بە لێزانی و کاردروستی و باو و رەوشتێکی رێك و پێك، نەك بە گەزاف و لە خۆڕایی بێ هودەو بە بێ قەزاو قەدەرێکی رابردوو، کە بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی خۆی کاربکات و باوی هێندێ بدات بەسەر هێندێکی تردا، لەو رووەوە بە کارو کردەوەی ئەم دائەنرێ، بەندە ناچار و بێ دەسەڵات نییە، بەڵکو وا دروستکراوە کە بە خواهیش و مەیلی خۆی و بتوانێ بارێ هەڵبژێرێ بۆ خۆی و پەلامارو هەوڵی بۆ بدات، بەو ئەندازە مەیل و خواهیشە تاقی ئەکرێتەوەو فەرمانی خوا رووی تێ ئەکات، بە کورتی شتێکی ئاشکرایە کە خوا داهێنەرو بەدیهێنەری هەموو شت و هەموو کارو کردەوەو رووداوێکە، بەندە ناچار نییەوهێندێ لەکردەوەکانی بە مەیل و هەوڵ و خواهیشی خۆی فەراهەم دێت. دەی بەمە هیچ قۆرت و گرێیەك پەیدا نابێ وەك لە چەند شوێنی تریشدا بە درێژ تر ئەم باسەم کردووە،

وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗاۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ

---

﴿وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗاۗ﴾ ئەمەی کە قورئان هێنای – وەك لە ئیبن و مەسعودەوە ئەگێڕنەوە – یان ئەم ئیسلامە – وەك لە ئیبن و عەباسەوە هاتووە – ڕێگەی پەروەردگارتە، لە کاتێکدا کە ڕێكو ڕاستە و هیچ خواری و لاری تێدا نییە، ﴿قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ بێگومان بە ڕوونی ئایەتەکانمان باس کردووە، بەڵام هەر ئەوانە سوود وەرئەگرن کە خاوەن بیرن و بیر ئەکەنەوە، جا لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ﴾ بۆ گەل و کۆمەڵێك کە بیر ئەکەنەوە لەو ئایەتانەدا، ﴿لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ﴾ بۆ ئەوانە هەیە بەهەشت لای پەروەردگاریان و لە ژێر چاودێریی و میهرەبانی ئەودا، ﴿وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ خوا دۆست و خۆشەویست، یان کۆمەکی ئەوانە بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەی کە لە جیهاندا کردوویانە و هەمەیشەیی بوون لەسەری، یان خوا خاوەن و کار بەدەستی ئەوانە بە گەیاندنی ئەجرو پاداشتی ئەو کردەوانە بەوان. لەمەوپێش باسی ئەوانەی کرد کە خوا دڵی فراوان کردوون بۆ ئیسلام، ئەوانە بەرەو(دار السلام) ئەچن، ئەکەونە ژێر چاودێریی و میهرەبانی خوا، ئینجا بە پێی باوی خۆی بەرامبەر ئەوانە تاقم و دەستەیەکی تر ئەهێنێ بە پێچەوانەی ئەوان. باسی شەیتانەکانی(جن) و ئادەمی ئەکات کە لەمەوپێش دەست نیشانی کرد بە هێندێ لەکارو کردەوە بەدەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا﴾ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە خوا هەموو(جن) و ئادەمی کۆ ئەکاتەوە بە کۆمەڵی و پێکەوە، یان هەموو بێ بڕواکان کۆئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ﴾ ئەی دەستەو کۆمەڵی(جن) ﴿قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ﴾ بێگومان زۆرتان لە ئادەمی لاداو گومڕاتان کردن، وەك(ئیبن و عەباس و موجاهید و زەجاج) ئەفەرمون. یان خۆتان زۆرتان لێ وەرگرتن، مەبەست تاوانبار کردن و سەرزەنشتیانە و دیارە لەو ڕۆژە سەختەدا هەڕەشەیەکی زۆر سامناك ئەگەیەنێ، لەبەر ئەوە گوێیان ئەبەسترێ و هیچ قسە و بەهانەیەك ناهێننەوە، بەڵام هەڵخەڵەتاوەکانی ئادەمی کە کاتی خۆی چوون بە دەم ئەو شەیتانانەوە گوێڕایەڵی یان بوون، ئەوانە ئەیانەوێ عوزرو بیانوویەك بهێننەوە،

وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَاۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٢٩﴾

**وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ﴾ دۆستەكانیان لە ئادەمی كە شوێنیان كەوتن ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ﴾ ئەی پەروەردگارمان هێندێكمان سوود و خۆشی وەرگرت بە هێندێ ترمان، بەم رەنگە ئادەمی سوودو خۆشی وەرگرت لە(جن) ەوە بەمەی هانیاندان لەسەر خۆشی و رابواردن و بەجێهێنانی ئارەزووەكانی نەفس،(جن) یش سوودیان دەست كەوت لە ئادەمی یەوە بەمەی گێڕانیان بە سەرۆك و فەرمان رەوای خۆیان و بەوە شادومان و دڵخۆشیان كردن، یان وەك(حەسەن و جریج و زەجاج) و كەسانی تر ئەفەرمون، سوودو خۆشی ئادەمی ئەمە بوو كە كاتێ یەكێ بڕۆیشتایە بە سەفەرو شەو لە چۆڵیدا بمایەتەو بترسایە ئەیگوت: پەنا ئەگرم بە گەورەی ئەم شیوە، بەوە دڵ ئارام ئەبوو و بە خۆشی كاتی ئەگوزەراند، سوودو خۆشی(جن) یش ئەوەبوو كە ئەمانە هەڵخەڵەتان و گوێ رایەڵیان بوون، ﴿وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَاۚ﴾ گەیشتین بەو ئەجەل و ماوەی كە بۆت داناین و دیارییتكرد بۆمان، واتە رۆژی دوایی یان مردن، مەبەست لەو قسە و وتەیە دان نەنانە بە كردەوەی بەدی خۆیان و داخ و پەشیمانی دەربڕینە لێی، مل كەچی و سەرشۆڕیی دەرئەبڕن بۆ خوا، بەڵام تازە كاتی ئەوە نەماوە و هیچ عوزرو بەهانە و داخ و پەشیمانی و گەڕانەوەو نرخ و سوودی نابێ، بەڵكو كاتەكە كاتی بڕیار دەركردن و بەدی هێنانی ئەو هەڕەشانەیە كە لە جیهان دا خوا بەڵێنی پێدان، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ بێگومان خوا ئەفەرموێ: ﴿ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ﴾ ئاگر جێ و شوێنی نیشتەجێیانە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ بەجۆرێ ئەمێننەوە تیایدا بە بێ بڕانەوە بە هەمیشەیی ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ﴾ مەگەر ئەوەی كە خوا ویستبێتی، واتە ئەوانە هەمیشەیین و نیشتەجێن لە ئاگردا مەگەر كاتێ كە خوا ویستبێتی، رووكەش و رواڵەتی ئەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات**

که ئەوانەی لە هێندێ کات دا نامێننەوە لە دۆزەخدا، ئەوەش دژ و پێچەوانەی رووکەش و رواڵەتی هێندێ لە ئایەتەکانە وەك ئایەتی: ﴿وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ﴾ بێگومان ئەوانە دەرهێنراو نین لە ئاگردا، هەروەها دژ و پێچەوانەی زۆر حەدیسە، دژو پێچەوانەی رای زۆربە و جەماوەری زانایانە، جا لەبەر ئەوە زانایانی تەفسیر چەند تەئویل و پینە و پەڕۆیەکیان کردووە. هێندێ لە زانایانی بەرز لەسەر ئەوەن کە مەبەست لەم فەرمودەیە: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ و هەموو وێنەکانی، مەبەست گەیاندنی بەر بەرەلآیی و نەبەستراوەیی ویست و خواهیشی خوایە بە هیچ شتێکەوە، نەك مەبەست ئەوە بێ کە پاش چوونە دۆزەخ هێندێ جار مانەوە هەمیشەیی نابێ، ئەوەش کاتێکە کە خوا ویستبێتی نەبوونیان تیایدا، بۆ کردنەوەی ئەو گرێیە زانایان چەند شتی تریان فەرمووە، وام بە جوان زانی ئەو باسە لێرەدا نەکەم، بەڵکو دوای خەم بۆ سورەتی(هود) تا لەوێ بە درێژیی ئەوەی پێویستە بیڵێم، کەواتە با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە کە کۆتایی پێ هێنا بەم رستە پیرۆزە: ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت کاردروستە و هەموو کارو کردەوەیەکی دەست نادات بۆ گۆڕین و بژارە کردن و سەر لێکردنەوە، کە هێندێ لە کارەکانی سزادان و تۆڵە سەندن و ئەجرو پاداشت دانەوەیە، ئینجا پێش ئەوەی باس و وت و وێژەکە دوایی بێنێ بە تێهەڵکێش بەدوای بەشی یەکەمدا، ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ بە وێنەو مانەندی ئەو دۆستی و گوێرایەڵی ئادەمی بۆ(جن) و زاڵ کردنی(جن) بە سەریدا، بە وێنەو مەنەندی ئەو چارەنووس و دوا رۆژەی کە پەیدا بوو لەو دۆستایەتی و گوێرایەڵی یەدا، بەو وێنەو لەسەر ئەو بنەڕەت و یاسایە ئەگێڕین، هێندێ لە ستەم کاران بە دۆست و کاربەدەستی هێندێ تریان، یان ئەیان گێڕین بە هاوسەری یەکتر لە سزادا، هەرچۆنێ هاوسەر و بەشداری یەکتر بوون لە جیهاندا، لە کاتی خراپەکاری و کردەوە بەدەکانیاندا، واتە ئەوە ئەکەین بەهۆی ئەو تاوان و بێ بڕوایی و گوناهەی کە کردیان لە جیهاندا و هەمیشەیی بوون لەسەری، ئەمە یاسا و بڕیارێکی گشتی یە لە هەموو کات و چەرخێکدا هەروا هاتووەو هەروایە، ئەوەتا ئەبینین بێ بڕواو ستەم کارەکان هەرچۆن و جۆر و شێوەیان

جیاوازە، بەڵکو دژی یەکترین، هەموو ئەوانە یەك ئەگرن و ئەبن بە یەك کۆڕو کۆمەڵ کاتێ ئاژاوە و بەربەرەکانی رووبدا لەگەڵ ئایینی خواو دۆستەکانی خوادا، ئەبینین شەیتانەکانی ئادەمی چ سەلیبی و سەهیۆنی بن، چ بت پەرست و شیوعی بن، هەرچەند ئەوانە دژی یەکترن لە بارو روویەکەوە، بەرژەوەندی یان جیاوازە لە چەند بارێکەوە، بەڵام هەموو یەك ئەگرن و ئەبن بە یەك کۆڕ و کۆمەڵ لە دوژمنایەتی و دژایەتی ئیسلام و موسڵماناندا، بۆ وێنە هەموو گاپەرست و شیوعی یەکان بە رەزامەندی دەوڵەتی ئەمەریکا و ئەوروپا بوون بە یەك لە لێدانی پاکستان هەتا کردیان بە دوو بەش و بەنگلادیشیان لێ جوێ کردەوە، لە پاش ئەوە هەر خەریکن و واز ناهێنن هەمیشە پیلان و دووبەرەکی ئەخەنە ناو هەرکام لەو دوو پارچەیە و ئەیانەوێ ئەوانیش بکەن بە چەند پارچە و بەشێکی ترەوە، هەروەها بینیمان و ئەبینین کە چۆن رووسی بێ بڕواو هێندێ گاپەرست یەکیان ئەگرت بۆ لەناو بردنی گەلی موسڵمانی ئەفغانستان و هەموو چەکێکی تێدا بەکار هێنرا، روسیای بێ بڕوا کە لە کاتی خۆیدا خاکەکەی چوار سەد هەزار کیلۆمەتر بوو، بەڵام بەرە بەرە وڵاتانی داگیر کردو سیازدە جمهوریەتی هەر خاکی ئیسلامە، هێشتا بەوە کۆتایی نەهێنا، پەلاماری ئەفغانستانیشیدا، ئەوە دە ساڵە بە هەموو هێزی ئەدا لەو گەلە هەژارە، بەڵام(الله) بەرەکەتدا ئەو گەلە بێ دەسەڵاتە توانی بە ئیسلام و ئیمانەکەیەوە راوەستێ تا ناچار بووە بەوەی لەو وڵاتە هەژارە دەرچێ[٢]!!

ئەو یەککگرتن و کۆبوونەوەی کوفری جیهانییە لەسەر موسڵمانان بەهەموو هێزو دەسەڵات و جۆرە چەکێکەوە بەڕاستی شتێکی زۆر گەورەو سامناکە، یەککگرتن و کۆبوونەوەیەکە کە ئەم ئایەتی تێدا دەرئەکەوێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ هەرچۆنێ ئەو دڵنەوایی و ئارام دانەی تیا دەرئەکەوێ کە لە ئایەتی(١١٢) ی ئەم سورەتە خوای پەروەردگار ئاراستەی پێغەمبەری(ﷺ) کرد: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ بەڵام پێویستە کۆمەڵێکی موسڵمان هەبێ کە لەسەر رێبازە راست و پاکەکەی بڕواو لانەدا لە رەوشتە شیرینەکەی، ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر بەشی دووەم لە باس و وتو وێژەکە،

يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا ۚ قَالُوا۟ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ

**ئەفەرموێ: ﴿يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ ئەی دەستە و کۆمەڵی(جن) و ئادەمی ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى﴾ ئایا نەهاتووە بۆتان چەند نێرراو فروستادەیەك لە ئێوەو لە ناو کۆمەڵی ئێوەدا کە بخوێنێتەوە بەسەرتاندا و باس بکەن و راگەیەنن بۆتان ئایەتەکانی من ﴿وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا﴾ بتانترسێنن لە گەیشتن و دووچار بوونی ئەم رۆژەتان؟ ﴿قَالُوا۟﴾ ئەوانیش ئەڵێن: ﴿شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا﴾ شایەتی ئەدەین لەسەر خۆمان بەهاتنی ئەو فروستادانە و راگەیاندنیان پێمان. بێگومان خوا زاناو ئاگایە بە هەموو شتێکیان، کەواتە مەبەست لەم شێوە پرسیارە ئەمەیە کە خۆیان بە دەمی خۆیان دان بنێن بەو هاتن و راگەیاندنەدا تا ئەوەیان لەسەریان مۆر بکات، کەواتە خۆیان دان ئەنێن بەوەدا کە شایستەن بۆ ئەو تۆڵە و سزایە، ئەم فەرمودەو شێوە پرسیارە رووی کراوەتە هەردوو تیرەکە و ئاراستەی هەردوو کراوە، ئینجا ئایا وەك لە تیرەی ئادەمی پێغەمبەر نێردراو بووە، هەروەها لە تیرەی جنۆکەش رەوانە کراوە؟ ئەوە خوا خۆی ئەزانێ بە تەواوی، بێگومان پاش رەوانە کردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە و پێش رەوانە کردنی، هەرچەند هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەران هەر لە ئادەمی رەوانە کراون، بەڵام(ضحاك) و کەسانی تر ئەڵێن: لە پێش رەوانە کردنی ئەم پێغەمبەرە لە تیرەی(جن) رەوانەکراوە بۆ سەریان وەك رووکەش و رواڵەتی ئایەتەکەش ئەیگەیەنێ، بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار ئەتوانین وتەی(رسل) لێرەدا تایبەتی نەکەین بە رەوانە کراوی خواوە، بەڵکو بە گشتی بگێڕین لە فروستادەی خواو فروستادەی فروستادەکانی، ئەوانەی کە ئایینی خوایان پێ گەیشتبێ و ئینجا رایانگەیاندبێ بە خەڵکی وەك لە دوا دوایی سورەتی(الأحقاف) دا ئەفەرموێ: دەستەیەك لە(جن) گوێیان لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئینجا گەڕانەوە بۆلای گەلەکەیان و بوون بە ترسێنەریان و بانگیان کردن بۆ ئایینی ئیسلام، کەواتە ئەو پرسیارەی کە لێیان ئەکرێ لە رۆژی دواییدا لەسەر ئەم بارە بێ کە وتەی(رسل) بە گشتی مەبەست بێ، ئەم جۆرە باس و لێکۆڵینەوە لە راستیدا سوودێکی چەندانی نییە و پێویست نییە خۆ خەریك کردن پێ یانەوە، بەهەرحاڵ لەو رۆژەدا هەردوو تیرەکە ئەزانن ئەو پرسیارە بۆ سەرزەنشتە و لەکەدار کردنیان،**

وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾

---

بۆ ئەوەیە کە بە دەمی خۆیان دان بنێن بە شتەکەدا لەبەر ئەوە دان ئەنێن پێیدا و شایەتی ئەدەن لەسەر خۆیان و ئەڵێن: ﴿شهدنا على انفسنا﴾ ئینجا لێرەدا زۆر بەجێیە کە بە تێهەڵکێش بگوترێ: ﴿وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەم ژیانە نزیکە، واتە ژیانی ئەم جیهانە هەڵیخەڵەتاندن ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ﴾ بێگومان شایەتی ئەدەن لەسەر خۆیان لە رۆژی دواییدا کە ئەوان لەم جیهانەدا بێ بڕوا بوون بە ئایینی خوا و بە ئایەتەکانی خوا! واتە ئەوانە نەزان و نەفام بوون کە لەم جیهانەدا هەڵخەڵەتان بەم ژیانە بێ نرخە کە ماوەکەشی کەم و کورتە، دەستیان هەڵگرت لە ژیانی بێ وێنەی بەهەشت کە بڕانەوەیشی نابێ، خۆیان داما و سەرشۆڕ و ریسوای رۆژی دوایی کرد تا ئەو رادەی کە خۆیان شایەتی ئەدەن لەسەر بێ بڕوایی خۆیان و شایستەیی یان بۆ سزای نەبڕاوەی ئەو رۆژە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو دانان و شایەتی دانەش هیچ کەڵکی نابێ و سوودیان پێ ناگەیەنێ! ئەی چ داخێ لەوە سەخت ترە؟ ئای چ سەرشۆڕی یە لەوە سەر شۆڕیی ترە؟!! ئینجا لە پاش کۆتایی باسەکە رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش ئەو ئەیدا بە گوێی هەموو بڕواداران دا فەرمودەیەك کە دادو دادپەروەریی و بەزەیی و میهرەبانی خوا ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی کە باس کرا لە ناردنی پێغەمبەران و ترساندنی گەلەکانیان و راگەیاندنی ئایەتەکانی خوا پێیان ﴿أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ﴾ لەبەر ئەوەیە کە پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر سزا دەرو لەناوبەری وڵاتان و دانیشتوان نەبووە بەهۆی بێ بڕوایی یانەوە، لە کاتێکدا کە دانیشتوانی ئەو وڵات و شارانە بێ ئاگا بوو بن، کاروباری خوا بەو جۆرە نەبووەو نەهاتووە کە بە بێ ئاگادار کردن و ترساندن و سزا و تۆڵەی بەندەکانی بدا، واتە بەزەیی و میهرەبانی خوا داخوازی ئەوە بوو کە بەندەکانی نەگرێ لەسەر تاوان و بێ بڕوایی هەتا ترسێنەر و فروستادە نەنێرێ بۆ سەریان و ئاگادار نەکرێنەوە لە ئایین و فەرمانی خوا، ئینجا ئەوانیش بڕوایان نەهێنابێ و هەر سەرپێچی یان

کردبیّ، لەگەڵ ئەوەدا فام و ژیریی پێدابن و سروشتی بەرەو بڕوا و خواناسی داڕشتن، لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو بەڵگە و رابەرە روون و بەهێزانەی ئەم بوونەوەرەی بۆ دروست کردبن، لەگەڵ ئەو هەموو رێنموونی و یارمەتی دانەدا، سەرباقی ئەوە پێغەمبەران و ترسێنەرانی بۆ ناردن، چونکە فام و ژیریی زۆر جار هەڵە ئەکات لە ژێر زۆر و زەختی ئارەزووەکانی نەفسدا، زۆرجار کۆئەندام و جیهازی تێگەیشتن و رێنموونی پەکی ئەکەویّ و ئیش ناکات، خوای پەروەردگار بەو جۆرەی کرد لەگەڵ بەندەکانی تا هیچ کەس هیچ بڕو بیانووی بە دەستەوە نەمێنیّ، کەواتە ژیریی و سروشت هەرچەند بەهێزو پاك بن بە تەنیا پارێزەر نین لە هەڵە و گومڕایی، رێنموونی ناکەن بۆ شتیّ کە دڵنیایی و ئارامی تێدا بیّ، دامەزراو و خۆگر نین و بەرگەی هەموو زەخت و زۆریّ ناگرن، ماتووڵ عەقیدە و بڕوا پشتگیر نەبن و ئایین و بەرنامەی خوا یارمەتی دەر نەبیّ، ئینجا لە بارەی پاداشت و تۆڵەوە ئەمەمان بۆ باس ئەکات کە زۆر راست و رەوایە، ئەفەرمویّ: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾ بۆ هەرکام لە دەستەو کۆمەڵی(جن) و ئادەمی، واتە ئەوانەی کە بانگ و بانگەوازی فروستادەکانیان پیّ گەیشتبیّ، بۆهەرکام لەوانە هەیە چەند رادەو پلەیەك لە کردەوەکانیان ئیتر چاك یان خراپ، واتە بۆ بڕواداران چەند رادەو پلەی جیاواز هەیە یەك لەسەر یەك، بۆ شەیتانەکان و بیّ بڕواکانیش هەیە چەند رادەو پلەی جیاواز یەك لە ژێر یەك بە پیّ‌ی چاکی و خراپی کردەوەکان، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان پەروەردگارت بیّ ئاگا نییە لە هەر کردەوەیەك کە ئەوانە ئەیکەن، بەڵکو زانا و ئاگایە پێیان ژمارەی ئەکات بۆیان و لەسەریان، تۆڵە و سزای هەر کردەوەیەکی خراپ بە ئەندازە و مانەندی کردەوەکەیە، بەڵام ئەجرو پاداشتی چاکە بە چەند چەندانەیە لای خوارووی دە قاتە تا حەفتا و حەوت سەد و حەفتا هەزار و هەر چەندێکی تر کە پەروەردگار خۆی ئەزانیّ. بێگومان خوای گەورەو پەروەردگار هیچ جۆرە پێویستی یەکی نییە بە هیچ کەس و بە هیچ شتیّ، بیّ پێویستە بە بڕواو پەرستن و کردەوە چاکەکانی بەندەکانی، ئەگەر ئەوانە چاکە بکەن بۆ خۆیان ئەکەن و بەرهەمەکەی لە هەردوو جیهاندا بۆ خۆیانە، کەواتە میهرەبانی بەکار ئەهێنیّ لە ناردنی فروستادەو پێغەمبەرەکانیدا، هەروەها میهرەبانی بەکار ئەهێنیّ کە پەلە ناکات لە سزادان و تۆڵەی بیّ بڕوا و تاوانبار و ستەم کارەکان،

وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَءَاتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾

---

له كاتێكدا كه سزادان و لهناوبردنیان هیچی تێناچیٚ وهكو ئهفهرمویٚ: ﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ﴾ ههر پهروهردگاری تۆ بیٚ نیازه لهههموو شتیٚ، پێویستی به هیچ شتیٚ نییه، خاوهنی میهرهبانی یه ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئهگهر بیهویٚ و مهیلی ببیٚ ئێوه لهناو ئهبات و ناتانهێلیٚ و ئهتان مرێنیٚ ﴿وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ﴾ له پاش ئێوهو لهناو بردنی ئێوه ههرچی مهیلی ببیٚ ئهیهێنیٚ و ئهیكات به جێنشینی ئێوه، ﴿كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ﴾ ههرچۆنیٚ ئێوهی داهێنا و هێنانییه كایهوه له نهوهی گهل و كۆمهڵێكی تر كه جیاواز بوون له ئێوهو له سیفهت و كردهوهدا وهك ئهوانهی كه مانهوه له كهشتی یهكهی(نوح) دا، كهواته با لهبیر نهچیٚ كه ئهم خهڵكه به میهرهبانی خوا ماوهتهوه، مانهوهیان بهستراوه به مهیل و خواهیشی خواوه، ههر زۆر و دهسهڵاتێكیان ههیه خوا پێی داون و ئهوان دهسهڵاتداری راستهقینه نین، مانهوهیان به دهست خۆیان نییه، هیچ كهس بوون و پهیدا بوون و مانهوهی به دهست خۆی نییه، ئهمان و لهناوبردنی ئهمان و هێنانی تاقمێكی تر له جێی ئهمان سووك و ئاسانه و بۆ خوا هیچی تیٚ ناچیٚ، ههرچۆنیٚ چینی پێش ئهمانی لهناو بردو ئهمانی هێنایه جێیان، بهڕاستی ئهم فهرمودانه زۆر بههێزو بهكارن له دڵ و دهروونادا، كوتهك و پیلارێكی بهتین و قورسن بۆ دڵی شهیتانهكانی(جن) و ئادهمی كه پیلان ئهگێڕن و دهم درێژیی ئهكهن له ئایین و شهریعهتی خوادا، ههرچۆنیٚ مایهی ئارامی و دامهزراندنی دڵی بڕواداران و خواناسانن، لهپاش ئهوانه ئینجا ئهم ههڕهشهیه ئاراسته ئهكات، ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَءَاتٍ﴾ بهڕاستی ئهوهی كه بهڵێن و ههڕهشهتان لێكراوه، بێگومان دێت، دێت به

چەسپانی ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ﴾ بێگومان ئێوە نین بە یاخی و سەرکێش لە خوا و لە دەستی قودرەتی خوا دەرناچن و ئێوە دەستە پاچە کەر نین و لە دەسەلاتی ئێمە دەرناچن، ئینجا بەدوای ئەمانەدا هەڕەشەیەکی تر ئەهێنێ لە پەنای پەردەدا، کە زۆر کاریگەرە لە دەروونـدا، ئەفـەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) بڵـێ: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ﴾ ئـەی گـەل و نەتەوەکەم ئێوە کار و کردەوە بکەن بە ئەوپەڕی دەسەلات و بۆ گونجان و تواناتان، یان ئێوە لە شوێنی خۆتان و لە لایەن خۆتانەوە کارو کردەوەی خۆتان بکەن و چیتان لە دەست دێ بیکەن و لەسەر بارو حاڵەتی خۆتان بەردەوام بن، واتە منەتتان نەبێ، مەگۆڕێن لەو بارو حاڵەی کە وان لەسەری، ﴿إِنِّي عَامِلٞ﴾ بێگومان بە هەمیشەیی من کارو کردەوە ئەکەم لەسەر بارو حاڵی خۆم، واتە ئێوە دامەزراو بن لەسەر بێ بڕوایی و سەرکێشی و دوژمنایەتی، بێگومان منیش بەردەوام و دامەزراوم لەسەر ئایین و ئیسلامی خۆم، دیارە مەبەست فەرمان دان نییە بە بێ بڕوایی و کاری بەدی ئەوان، بەڵکو مەبەست لەم شێوە فەرمانە هەڕەشە کردنە لێیان، وەك بە جوانییش دەری ئەبڕێ، کە ئەفەرموێ: ﴿فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ﴾ بێگومان لەمەو پاش ئەزانن کێ پاشەڕۆژی خێرو خۆشی بۆ ئەبێ، ئەو پاشە ڕۆژەی کە بەهەشتە و خوا ئەم ماڵ و جیهانەی بۆ ئەو دروست کردووەو تا ئەم ماڵ و قۆناغە نەبڕێ ئەو دەست کەوت نابێ، واتە بێگومان ئەزانن کە ئەو پاشەڕۆژە بۆ کاممان ئەبێ، بەڵێ بێگومان ئەزانن کە ئەو پاشەڕۆژە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و شوێن کەوتووەکانی ئەبێ نەك بۆ ئەوان، ئەوان ناگەن بە ئامانج، چونکە ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بێگومان بێ بڕوایان و ستەمکاران ناگەن بە ئامانج و پاشەڕۆژی خێرو خۆشی یان بۆ نابێ، بەڵێ ئەمە یاسایەکی ڕاست و تەواوە کە گۆڕانی نابێ، بت پەرستان و هاوبەش ڕەوادەران نابێ بگەن بە ئامانج و پاشەڕۆژی چاك، چونکە ئەوان غەیری خوا ئەکەن بە یارمەتی دەرو کۆمەك، بێجگە لە خواش هیچ کەس و هیچ شتێ هیچی بەدەست نییە، ئەوانەی پەیڕەوی بەرنامە و ڕێنموونی خوا ناکەن پاشەڕۆژی خێرو خۆشی یان نابێ، چونکە بێجگە لە بەرنامە و ئایینی خوا گومڕایی و زیان ورەنجەڕۆیی یە، ئیترهەرچەند لە جیهاندا ماوەیەك خۆی بە دڵشاد و بەهرەمەند بزانێ.

له ئایه‌تی(١١٧) تا ئایه‌تی(١٢١) باسی حه‌رامی و حه‌ڵاڵی سه‌ربڕراوه‌كانی كرد، ئینجا به‌دوای ئه‌وه‌دا تا ئایه‌تی(١٣٦) چه‌ند یاسا و بیرو باوه‌ڕێكی سه‌ره‌كی و بنه‌ڕه‌تی ئه‌هێنێ له باره‌ی عه‌قیده‌ی رووت هه‌رچۆنێ چه‌ند چه‌شمه‌نداز و شێوه‌یه‌ك ئه‌هێنێ له‌باره‌ی بڕواو بێ بڕوایی و له‌باره‌ی جه‌نگ و ئاژاوه و به‌ربه‌ره‌كانێ له نێوان شه‌یتانه‌كانی(جن) و ئاده‌می له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ران و شوێن كه‌وتووه‌كانیان، هه‌روه‌ها چه‌ند شتێكی تر كه په‌یوه‌ندییان به عه‌قیده‌وه هه‌یه، ئینجا له ئایه‌تی(١٣٦) وه تا ئایه‌تی(١٥٤) باسی چه‌ند شتێك ئه‌كات كه به دیمه‌ن و رواڵه‌ت شتێكی ئه‌سڵی و سه‌ره‌كی نین، وه‌ك باسی حه‌رام كردن و حه‌ڵاڵ كردنی هێندێ شت، وه‌ك باسی ئه‌كه‌ین، جا لێره‌دا پێویسته ئه‌ندازێك بیر بكه‌ینه‌وه و ورد ببینه‌وه كه بۆچی قورئان ئه‌م جۆره شته بچووكانه به گه‌وره‌و گرنگ ئه‌گرێ و شان به شانی مه‌سه‌له سه‌ره‌كی یه‌كانی ئه‌كات، كاتێ كه ورد ئه‌بینه‌وه تێ ئه‌گه‌ین كه ئه‌وه زۆر جێی خۆیه‌تی، چونكه ئه‌م مه‌سه‌له بچووكانه له راستیدا ئه‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ خوایه‌تی خواو حاكمێتی خوا، چونكه ئه‌و حه‌رام كردن و حه‌ڵاڵ كردنه‌ی كه ئه‌و بێ بڕوایانه ئه‌یان كرد و بڕوایان پێی هه‌بوو له‌و شته بچووكانه‌دا، ئه‌و حه‌رام و حه‌ڵاڵ كردنه ده‌ست درێژیی یه بۆ سه‌ر حاكمێتی خواو ره‌وادانی حاكمێتی یه بۆ غه‌یری خوا، ئه‌وه‌ش دژی بڕوایه به خوایه‌تی خوا، كه‌واته له رێوه دژی وته‌ی(لا إله إلا الله) یه كه یه‌كه‌م به‌نده له هه‌موو ئایینه‌كانی خوادا، بناغه‌و بنه‌ڕه‌ته بۆ هه‌موو به‌نده‌كانی تری ئایینه‌كه‌ی خوا، له‌راستیدا بوونی ئه‌م ئایینه بریتی یه له بوونی حاكمێتی ته‌نها بۆ خوا، كاتێ كه حاكمێتی نه‌بوو بۆ خوا له هه‌موو شتێكدا ئایین نامێنێ و نابێ، گرێ و قۆرت و دژی ئایین له‌م چه‌رخه‌دا ئه‌مه‌یه كه له جیهاندا چه‌ند سته‌م كارو تاغوتێك هاتووه‌ته كایه‌و لاف ئه‌وه لێئه‌ده‌ن كه ماڤ دانانی یاسا و شه‌ریعه‌تیان هه‌یه، هه‌ر ئه‌م قۆرت و گرێ یه‌ش بوو له كایه‌دا له كاتی هاتنی ئه‌م ئایین و قورئانه‌دا، تا قورئان به‌و جۆره به گرنگ گرتی و چاره‌سه‌ری كرد، ئینجا با بێینه سه‌ر ئایه‌ته‌كان و به جوانی گوێ شل كه‌ین و دڵیان بۆ بكه‌ینه‌وه، ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا﴾ بێ بڕواكان و بت په‌رستان گێڕایان و بڕیاریاندا بۆ خوا له‌وه‌ی كه خوا دروستی كرد و دایهێنا له كشتوكاڵ و دانه‌وێڵه و به‌ر و میوه و حوشتر و مه‌ڕو ماڵات، له‌وه به‌شێكیان داناو بڕیاردا بۆ خواو به‌شێكیشیان بڕیاردا بۆ بته‌كانیان و هه‌ردوو به‌شه‌كه‌یان دیاریی كرد،

فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡۗ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿١٣٦﴾

---

**﴿فَقَالُواْ﴾ بەم رەنگە گوتیان: ﴿هَٰذَا لِلَّهِ﴾ ئەمە بۆ خوایە و هینی خوایە ﴿بِزَعۡمِهِمۡ﴾ واتە ئەو بڕیارانەش بنج و بنەوان و سەرچاوەیەکی راستی نەبوو، بەڵکو لە خۆیانەوە ئەو لافەیان لێ ئەدا ﴿وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا﴾ ئەوەش بۆ هاوبەشەکانمانە، واتە ئەو بتانەی کە کردومانن بە هاوبەشی خوا، یان هاوبەشی خۆمان لە ماڵ و سامانەکانماندا.**

**مەبەست لە بڕیاردان بۆ خوا ئەوەیە کە خواپەرستی پێبکەن و لە شتی گشتیدا سەرف بکرێ، وەك میوانداری و ڕێز گرتنی منداڵ و بەخێو کردنی هەژار و داماو، مەبەست لە بڕیاردان بۆ هاوبەشەکانیان بت پەرستی پێکردنە و بەکارهێنانی ئەو بەشەیە لە قوربانی بتەکان و خادیم و کلیلەوان و بەرژەوەندی بتەکان! خوای پەروەردگار لەم کاتەدا کە باسی باو و بۆچوونی ئەم نەفامانەی ئەو بت پەرستانە ئەکات سەرزەنشت و تەشەرێکی بەتینیان ئاراستە ئەکات بەوەی ئەفەرموێ: خوا ئەو شتانەی دروستکردووە، کەواتە ئەوپەڕی نەفامییە ئەوان خۆیان ئەکەن بە خاوەنی و دابەشی ئەکەن بەسەر خواو بتەکانیاندا، ئەوەش لە خۆیانەوە ئەیکەن بە بێ ئیزن و فەرمانی خاوەن و داهێنەرەکەی، ئینجا لەو دابەش کردنەشدا جەورو ستەم بەکار ئەهێنن لەوەی کە دایاننناوە بە بەشی خوا، وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئینجا ئەوەی کە بۆ هاوبەشەکانیانە ناگات بە خواو بۆ ئەو نابێ، بەم رەنگە ئەوەی دیاریی یان ئەکرد بۆ هاوبەشەکانیان سەرفیان نەئەکرد لە میوانداری ئەو شتانەی کە بەشەکەی خوایان تیا سەرف ئەکرد، بەڵکو هەر لە کاروباری بتەکاندا سەرفیان ئەکرد، بەڵام ئەو بەشەی کە دایان ئەنا بۆ خوا لێیان سەرف ئەکرد لە کارو کردەوەی بت پەرستیدا، یان بەم جۆرەی کە لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕنەوە کە کاتێ خۆراکیان کۆگا ئەکرد، بەشێکیان لێ دیاریی ئەکرد بۆ خواو بەشێ بۆ بتەکان، کاتێ با هەڵی کردایە و لە بەشەکەی خوای بهێنایە و تێکەڵی بەشی بتەکانی بکردایە لێی ئەگەڕان، هەروەها لە(مجاهد) ەوە وێنەی ئەوە هاتووە، لە(ئیبن و جەریر و سدی و قتادة) یشەوە هەروەها هاتووە و لە ریوایەتەکەی ئەودا ئەمەش هەیە: کاتێ قات و قڕی و گرانی رووی بدایە لە بەشەکەی خوایان بەکار ئەهێنا بۆ خۆیان،**

بەلاَم بەشی بتەکانیان ئەهێشتەوە و دەستیان بۆ نەئەبرد هەروەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ﴾ ئەوەی کە بۆ خوایە و بەشی خوایە ئەگات بە هاوبەشەکانیان، واتە بتەکانیان. لەسەر هەر بار ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ بەد بووەو بەدە بڕیارەکەیان و ئەوەی کە بڕیاری ئەدەن. بەڵێ بەڕاستی زۆر بەدە ئەو بڕیار و دابەش کردنە، چونکە یەکەم هەموو شتێ هینی خوایە و کەس خاوەنی راستەقینە نییە بۆ هیچ شتێ، دووەم: باوی ئەو بتە بێ نرخانەیاندا بەسەر خوادا کە ئەوەش ئەوپەڕی نەفامی و هەڵەیە، ئەو هەڵە و بۆچوون و کردەوە بەدانە لەلایەن شەیتانەکانی(جن) و ئادەمی یەوە بوو و هات و سەر تێکدان و گومڕا کردنی شوێن کەوتوو فەرمانبەرەکانیان، ئەوەش بەرژەوەندی ئەو شەیتانانەی تێدایە و لەبەر سوودی خۆیان ئەوەیان بەسەر دێنن، بەرژەوەندی و سوودی شەیتانەکانی ئادەمی ئەوەیە کە ئەو نەفامانە ژێر بارو ژێر دەستی خۆیان ئەکەن و ماڵ و سامانیشیان ئەخۆن، بەرژەوەندی و سوودی شەیتانەکانی(جن) یش ئەوەیە کە ئەمانە دووچاری بەد بەختی جیهان ئەکەن و ئاگری دۆزەخ لە رۆژی دواییدا، کە ئاوات و ئامانجی ئەوانیش ئەوەیە و هەمیشە بەدوای ئەو کار بەدەدا ئەگەڕێن، وێنەی ئەم شێوە نەفامییە کە لە سەردەمی نەفامی عەرەبەکاندا هەبوو، لە سەردەم و چەرخی نەفامی یەکانی تریشدا هەر بووەو هەیە، وەك ئیغریقی یەکان و فارس و رۆمەکان، هەروەها تا ئێستاش هەیە لە هیندو ئاسیا و ئەفەریقادا، خراپی و بەدی ئەو کردەوەی ئەوانە لەمەوە بوو، کە بە بێ فەرمان و ئیزنی خوا ئەو کردەوە و تەسەڕوفانەیان ئەکرد، دەی لەم نەفامی ئێستایشدا کردەوەو تەسەڕوفەکانیان دژو پێچەوانەی فەرمان و رەزامەندی خوایە، کەواتە نەفامی کۆن و تازە لەمەدا ئەگەن بە یەکتر و یەك ئەگرن، بێجگە لەوەش لە رووی راستیدا چەرخ و سەردەمی نەفامی شتێکی دیاریی و تایبەتی نییە، بەڵکو بریتییە لە لادان لە شەریعەتی خواو شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووی نەفس، ئیتر شێوەو وێنەکەی هەر جۆر ببێ. یەکێکی تر لە کردەوەی بەدی ئەو بت پەرستانە کردەوەیەك بوو کە هەرچۆنێ دژو پێچەوانەی فەرمانی خوا بوو، هەروەها هیچ ژیریی یەك وەری نەئەگرت، بە وێنەی ئەو دابەش کردنی ماڵەی کە لەم ئایەتی پێشووەدا باسکرا، ئەم کردەوەش کە بریتییە لە کوشتنی منداڵ و ئەولاد، ئیتر لەبەر مەترسی نەبوونی و بێ نەوایی، یان مەترسی لە دووچار بوونی عەیب و عار بەهۆی داوێن پیسی یەوە کە لەبەر ئەوە کچیان زیندە بەچاڵ ئەکرد،

وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ

یان ئەیان کردن بە قوربانی بۆ بتەکانیان وەك دەست نیشان ئەکات بۆ هەرکام لەو کوشتنە بەد و ناهەق کە ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ﴾ واتە هەرچۆنێ ئەو هاوبەشانە و ئەو شەیتانانە شیرینیان ئەکرد بۆ شوێن کەوتووەکانیان، ئەو دابەش کردنی ماڵ و سامانە، هەروەها مانەندی ئەوە شیرینی ئەکرد هاوبەشەکانی بت پەرستەکان بۆ زۆر لە هاوبەش رەوادەرەکان کوشتنی رۆڵە و ئەولادەکانیان! ئەو هاوبەشانە بریتی بوون لە شەیتانەکانی ئادەمی لە کاهینەکان و خادم و قاپی یەوانەکانی بتەکان و سەرۆکەکان، هەروەها شەیتانەکانی(جن) کە ئەو کارە بەدەیان بە خەتەرە و خەیاڵ ئەبردە دڵی ئەو بت پەرستە نەفامانەوە، ئەو کردەوە بەدەشیان لەبەر چاو شیرین ئەکردن لەبەر ئەمە بوو کە ئەفەرموێ:

١- ﴿لِيُرْدُوهُمْ﴾ بۆ ئەوەی لەناویان بەرن و بیانکوژن بە کوشتن و لەناوبردنی سروشت و ئادەمێتی یان و کوشتنی ئاشکرایش بە کەم کردنەوەی رۆڵە و بەرو نەوەیان.

٢- ﴿وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی تێکەڵ و پێکەڵ بکەن و بشێوێنن لەسەریان ئایینەکەیان، واتە ئایینی ئیبراهیم و ئیسماعیل کە لافیان لێ ئەدا پێی، یا ئەو ئایینە راستەی کە ئایینی خوایە و پێویستە ئەوان لەسەری بن و لێی لانەدەن.

ئەو جۆرە بۆچوونە ناڕاست و ناڕەوایانە، ئەو باو و عادەتە بەدانەی کە سەرچاوەکەیان ئەو جۆرە بۆچوونانەیە، کە کۆمەڵ و جەماوەر داگیر ئەکەن، تەنها ئەوەی نەفامی کۆن نییە، بەڵکو لە هەموو چەرخ و سەردەمە نەفامییەکاندا وێنەی ئەوانە و بەد تر لەوانە هەیە! بۆ وێنە لەم نەفامی تازەدا چەندەها بۆچوون و باو و عادەت پەیدا بوون و وڵاتیان داگیر کرد زۆر بەد ترو زیاندار تر، ئەو هەموو شتە بەدو خراپە کە بوون بە باو و لە هەموو بارێکەوە ئەرکێکی زۆر قورس و گرانیان هەیە و ماڵ و سامان بەرباد ئەکەن بە فیڕۆ و لە خۆڕایی، ژیان و خو و

رەوشت لە ریشە ئەهێنن، لەگەڵ ئەوەدا مەردوم مل کەچە بۆیان و ناتوانن خۆیان رزگار بکەن، گۆڕینی جل و بەرگ شەو و رۆژ سێ جار. جل و بەرگی کورت، جل و بەرگی تەنگ و تەسك، جلوبەرگێ کە مەردوم ئەهێنێتە پێکەنین! چەند شتی تر کە کراوە بەهۆی رازاندنەوە و جوانکردن بە پێی باوی ناشیرینی نەفامی تازە، ئەو هەموو بۆیە و داو و دەرمانە کە بەکار ئەهێنرێن و ماڵ و سامانێکی زۆریشیان ئەوێ، بێجگە لەوە ئەو جۆرە شتە بێ نرخانە خەریك کەرن لە کارو کردەوەی پیرۆز و بەنرخ! ئایا کێ ئەمانەی داهێنا و کردنی بە باو؟ کێ ئەبێ بە خاوەنی ئەو سامانە؟ بێگومان سەرمایەدارەکان و سوو خۆرەکان و خاوەن شەریکەکان کە بەو فێڵ و تەڵەکەیە کارێکی وایان کرد بوون بە خاوەنی هەموو بەرو بەرهەمی جیهان! لە راستیدا جوولەکە کارگێڕی هەموو ئەو شتانەیە و نیازو مەبەستی بۆگەنیان ئەوەیە پیاوەتی و ئادەمێتی نەهێڵن لە جیهان و وڵاتانی تر تا خۆیان سواری ملی هەمووان بن، ئەوەش بە پێی بیرو باوەڕ و بۆچوونی ناڕاستی خۆیان، کە ئەوان گەلی هەڵبژێرراوی خوان و پێویستە هەموو گەلانی تر بەندەی ئەڵقە لە گوێ و کەری ژێر باری ئەوان بن!! بەڵێ ئەوەیە کردەوەی شەیتانەکانی ئادەمی و(جن)، ئەوەیە جاهیلێتی و نەفامی کە شێوەو دیمەنەکەی جیاوازەو ریشە و کانەکەی هەر یەکە لە هەر چەرخێك و لە هەر وڵاتێکدا، بێگومان ئەگەر ئێمە نەفامی و سەردەمی نەفامی هەر ببڕین بەسەر ئەوەی کۆندا و لامان وابێ مەبەستی قورئان هەر ئەوەی کۆنە، ئەگەر ئێمە بەو جۆرە بین و بەو جۆرە بکەین مافی قورئانمان نەداوەو لە مەبەست و ئامانجەکەی نەگەیشتووین بە رێکی و بە تەواوی. هەرچەند فرو فێڵ و پیلانی نەفامان و دوژمنان زۆر بەهێز بن هەموو کاروباریان بە مەیل و خواهیشی خوایە،﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ﴾ئەگەر خوا بیویستایە ئەو بت پەرست و بێ بڕوایانە ئەوەیان نەئەکرد کە باسکرا، واتە ئەو رازاندنەوەی گوناهو کردەوە بەدانە، بەلام ویستی ئەوانەهەڵسن بەوکردەوەبەدەی کەکردیان لەبەرتاقی کردنەوەوتادەرکەوێ کێ بەندەی راستەقینەی خوایەو کێ یاخی وسەرکێشەوشوێنی شەیتانەکانی ئادەمی و(جن)ئەکەوێ،

فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾ وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ

---

**﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ واته کاتێ ئەوەی کە ئەوان ئەیکەن بە مەیل و خواهیشی خوایە، هەرچیش خوا بیەوێ و مەیلی بکات هەر ئەوە راست و بەجێیە و ئەوپەڕی کاردروستی تیایە، ماتووڵ کارەکە وایە، کەواتە لێیان گەڕێ لەگەڵ ئەو درۆ و دەلەسەی کە دەست هەڵبەستی ئەکەن بەدەم خواوە، گوێت نەبێ لێیان، ئەمە هەڕەشەیەکی سەختی لێ وەرئەگیرێ، وەك فەرمویێتی: راوەستە لێیان تا بزانی من چی یان لێ ئەکەم.**

**پێویستە بیرێك بکەینەوە کە ئەوانە زاتیان نەبووە ئەو بیرو بۆچوون و کردەوانە بە هینی خۆیان دابنێن، بەڵکو – بە زانین یان نەزانین – بە هینی خوایان دائەنان و بەناوی خواوە ئەیانگوت و ئەیانکرد، بەوەی بە ئایین و شەریعەتی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلیاندائەنا! زۆربەی شەیتانەکانی ئەمڕۆ لەم سەردەمی نەفامی تازەدا هەر بەو جۆرە ئەکەن، بەوە سادەو نەزان هەڵئەخەڵەتێنن، ئەوەتا ئەڵێن: ئێمە رێزی ئایین ئەگرین، ئەم یاسا و رژێمەی کە ئێمەی لەسەرین رێکە لەگەڵ ئاییندا و لە بنەڕەتەوە لەو وەرگیراوە، بەڕاستی ئەم کردەوە و ئوسلوبە پیس ترە لە ئوسلوبی شیوعی یەکان! چونکە ئەوان بێ پێچ و پەنا دان نانێن بە ئاییندا، کەواتە هەرکەسێك رێزو خۆشەویستی ئایینی لە دڵدا بێت بێزار ئەبێ لێیان، بەڵام بەمانی تر ئەخەڵەتێن. جا لەبەر ئەوە چەند ساڵێکە دەوڵەتە شیوعی یەکانیش ئەیانەوێ بەرە بەرە ناوی ئایین و رێز بۆ ئایین دەربڕن، تا بەوە سادە و نەفام هەڵخەڵەتێنن، ئەو سۆزو خۆشەویستی ئایینە کە لە وڵاتدا هەیە کپی بکەنەوە! ئینجا باسی سێ جۆری تر ئەکات لەو حوکم و بڕیارانەی کە ئەو بت پەرستانە دایان هێنا:**

١- هێندێ لە حوشتر و مەڕو ماڵات و خۆراکیان بڕ ئەدا و ئەیانگوت: ئەمانە قەدەغەن و هەرکەس ئێمە مەیلمان نەبێ نابێ لێیان بخوات.

٢- چەند حوشتر و ولاخێکیان دیاریی ئەکرد و قەدەغەیان ئەکرد سواری لێکردنیان.

٣- چەند حوشترو مەڕ و ماڵاتێك کە لە کاتی سەربڕینییاندا ناوی خوایان نەئەهێنا، بەڵکو هەر ناوی بتیان لێ ئەبرد.

ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ﴾ ئەیان گوت و ئەڵێن: ﴿هَٰذِهِۦٓ أَنۡعَٰمٞ وَحَرۡثٌ حِجۡرٞ﴾ ئەمانە چەند حوشترو ولاخ و مەڕ و ماڵات و کشتوکاڵێکن کە قەدەغە و بەرگری لێکراوێکن ﴿لَّا يَطۡعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ﴾ نایانخوات مەگەر کەسێك کە بمانەوێ و مەیلمان ببێ، واتە خوا یان بت پەرستەکان خۆیان، ئیتر ئەوە هەر پیاوان بێت نەك ئافرەتان وەك لە(ئیبن و زەید) ەوە ئەگێڕنەوە، یان ئەوانەشی کە خزمەتی بتەکانیان ئەکردن، ئینجا ئەوەشیان ئەگوت ﴿بِزَعۡمِهِمۡ﴾ بە قسەو لاف درۆی خۆیان، بە بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە ببێ، دیارە ئەوەش نەفامی یە و قسەیەکی وەرنەگیراوە ﴿وَأَنۡعَٰمٌ حُرِّمَتۡ ظُهُورُهَا﴾ ئەمەش چەند حوشترو ولاخ و مەڕ و ماڵاتێکن کە پشتیان قەدەغە کراوە و سواری یان پێ ناکرێ و باریان پێ نابرێ، ئیتر ئەم بەشە ئەوانە بن کە لە سورەتی(المائدة) دا ناوی بردن:(بحيرة، سائبة، وصيلة، حام) کە بەرپەرچی دانەوەو دەم کوتی کردن و بە درۆی خستنەوە، یان جۆرێکی تر بن. ﴿وَأَنۡعَٰمٞ لَّا يَذۡكُرُونَ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا﴾ ئەمانە چەند حوشترو ولاخ و مەڕ و ماڵاتێکن کە ناوی خوا نابرێ لەسەریان، نە لە کاتی سەربڕین و نە لە کاتی سوار پێکردن و نە لەکاتی دۆشینیان و نە لە هیچ کارو بارێکی تریان، بەڵکو ناوی بت ئەبرێ و یەکبار ئەکرێنەوە بۆ بتەکان، ئەم شتانەشیان بەناوی خواوە ئەکرد و بە قسە و بڕیاری خوایان ئەدایە قەڵەم ﴿ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِ﴾ بە دەست هەڵبەست و دەلەسە بە دەم خواوە و بە سەپاندنیان بەسەر خوادا،

سَيَجۡزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ

لەبەر ئەوە خوایش بە درۆی خستنەوە و ئەفەرموێ: ﴿سَيَجۡزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ بێگومان خوا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ بەهۆی ئەو درۆو دەست هەڵبەستەی کە ئەیان کرد بەدەم خواوە، ئەمەی کە لە سەردەمی نەفامی کۆندا کراوە، واتە درۆو دەست هەڵبەست بەناوی خواوەو بەدەم خواوە، لەم چەرخی نەفامی تازەدا دووبارە کرایەوە، بەڵام بە شێوەیەکی تر و لە پۆشاکێکی تردا، لەپاش ئەوەی کە بۆ سەهیۆنی یەت و سەلیبی یەتی جیهانی دەرکەوت ئەوەی کە ئەتاتورك پێی هەڵسا سەرناگرێ و ئەو جاڕی بێ ئایینی دەوڵەت و دژایەتی ئایینە بڕواداران بێدار ئەکاتەوە و سۆزو مەیلیان ناکوژێنێتەوە، بەڵکو لەوانەیە غیرەتی زۆر کەس بهێنێتە جۆش، لەبەر ئەوە رێگا و رەوشتەکەیان گۆڕی، وایان نیشاندا کە رێزیان هەیە بۆ ئایین و هەوڵیاندا پەردەیەکی ئایین بهێنن بەسەری یاسا و رژێمەکەیان دا، بەم رەنگە قورئان بانگ بە ئیزگە بلاو بکرێتەوە لە ولاتە بەناو موسڵمانەکاندا، هێندێ شتی جوزئی قەدەغە بکرێ، وەك بە ئاشکرا و لەناو کوڕ و کۆمەڵی گشتیدا ئارەق نەخورێ، هەروەها ئەو جۆرە شتانەی تر بۆ چاو بەست، بەڵام لە پەنای ئەوەوە هەموو ئاوات و ئامانجی تری سەلیبی و سەهیۆنی بەدی بهێنرێ! ئینجا هەروەها باسی جۆرێکی تر لە بڕیاری ناڕاست و ناڕەوای بت پەستەکان ئەکات، لە پاشان هەڕەشەیان ئاراستە ئەکات لەسەر ئەو بڕوا و بۆچوونەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ﴾ ئەوانە گوتیان ﴿مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ ئەوەی کەلەسکی ئەم حوشترو مەڕو مالاتانەدایە کە خۆیان قەدەغەکراون، واتە بێچووی (بحيرة و سائبة) کان وەك(مجاهد و سدی) ئەفەرمون. یان شیرەکانیان وەك(ئیبن و جەریر و ئیبن و لمونزیر) و کەسانی تر ئەگێڕنەوە لە(ئیبن و عەباس) ەوە - خوایان لێ رازی بێت - ﴿خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا﴾ حەلاڵە و تایبەتییە بە نێرینەکانمانەوە و مێینە بەشداری ناکەن ﴿وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ﴾ قەدەغە کراون لەسەر ژنەکانمان ئەگەر ئەو بێچووانە بە زیندوویی لەدایکیان ببن ﴿وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ﴾ ئەگەر بە مرداریی بوون ﴿فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ﴾ ئەوا هەموو تیایدا هاوبەش و بەشدارن، ئەو بڕیارانەیان ئەدا بە بێ هۆ و بە بێ بەڵگەیەك، بەس بەئارەزووی خۆیان ئەوحەلاڵ کردن وحەرام کردنەیان دائەهێنابەناوی خواوبەدەم خواوە،

لەبەر ئەوە خوا ئەفەرموێ: ﴿سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ﴾ بێگومان خوا تۆڵەی ئەو درۆ و دەلەسەیان لێ ئەسێنێ لەو حەرام و حەلاڵ کردنەی کە بەدەم خواوە کردیان چونکە ﴿إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا کاردروستی زانایە. کاردوستی و زانایی خوایش داخوازە بۆ ئەو تۆڵە سەندنە، بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنێ لەو هەموو شتە پڕوپووچ و لەو گومڕایی و لاری و نالەباری یەی کە ئەو نەفامانە دووچاریان بوون، لەو هەموو زیان و قۆرت و گرێ و ئەرکە گەورەی کە کەوتە سەرشانیان لە سەرەنجامی لادانیان لە ئایین و بەرنامەو شەریعەتی خواو لە رێگە راستەکەی خوا، بەڵێ بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنێ لەو عەقیدەو بیرو باوەڕو بۆچوونە کە ئەو هەموو قۆرت و گرێ و ئەرکە قورسەی ئەخستە سەرشانی ئەو گومڕایانە. لە کاتێکدا لەبەر دەستیاندا هەبوو ئەم عەقیدە رێك و روون و رەوانە کە دەروون بەرەڵا ئەکات لە شتی پڕو پووچ، ژیریی رزگار ئەکات لە شوێن کەوتنی کوێرانە، گەل و کۆمەڵ رزگار ئەکات لە نەفامی و بار و ئەرکی قورسی ئایینی و باوی نەفامی، ئادەمی رزگار ئەکات لە کۆیلەیی و بەندەیی بۆ بەندە، بەرزی ئەکاتەوە بۆ رادەو پلەی بەرزی بەندەیی بۆ پەروەردگاری تاك و تەنیای ئەم بوون و بوونەوەرە، ئەو رادەو پلە و پایە بەرزەی کە هەر پێغەمبەران گەیشتوونەتە پلەو پۆپەی هەرە بەرزی! بەڕاستی زیانباری یەکە یەکجار گەورەیە هەر لەم جیهانەدا پێش دووچاریی رۆژی دوایی کە هیچ زیان و دووچار بوونێك لەوە سەخت تر نییە! هەرکەسێك ژیر بێت و چاوێ بگێڕێ بەم جیهانی تازەدا بە باشی تێ ئەگات کە زیان و دووچار بوونی ئەم سەردەمی نەفامی تازەیە - نەفامی چەرخی بیستەم - زۆر سەخت ترو بەد ترە لە زیان و بەدیی چەرخی نەفامی کۆن، هەرکەس گومانی هەیە با تەماشای کتێبی:(جاهلية القرن العشرين) بکات، ئەو کاتە ئەو مەسەلە و باسەی بۆ روون و ئاشکرا ئەبێ و هیچ گومان نامێنێ، مەگەر ژیریی لەکار کەوتبێ و چاوی دڵی بە تەواوی کوێر بووبێ و سمەسای لێ بڕابێ! ئینجا کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بەم ئایەتە دڵ تەزێنە: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەڕاستی زیانبار و خەسارەتمەند بوون ئەوانەی کە رۆڵە و ئەولادی خۆیان کوشت، بە نەفامی و بە بێ زانین، واتە ئەوانە ئەوەندە نەفام و نەزان بوون ئەو تاوانە گەورەیان کردو ئەو زیانەیان بەسەر خۆیاندا هێنا،

وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ

---

﴿وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾ قەدەغە و حەرامیان کرد ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کرد و بە ڕۆزی پێی دان و ڕەوایدا ڕۆزی یان بێ، ئەوەشیان کە ئەکرد: ﴿ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ﴾ بە دەست هەڵبەست و درۆ بە دەم خواوە، بەڵێ ئەوانە زیانباری تەواو بوون، زیانباری هەردوو جیهان بوون، خۆیان لە دەست دەرچوو، ئەو ڕێزەی کە خوا پێی دابوون لە دەستیان چوو بەوەی بوون بە بەندەی یەکێکی وەك خۆیان، ڕازی بوون بە حاکمێتی غەیری خوا! لە پێش هەموو شتێکدا عەقیدە و ڕێنموونی و بیرو باوەڕی ڕاست و ڕەوایان لە دەست چوو کە مایەی هەموو بەدیی و بەدبەختی یە لە هەردوو جیهاندا ﴿قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانە ون بوون و گومڕا بوون و سەرگەردان و سەر لێ شێواو بوون، بێگومان ئەوانە نەبوون بە وەرگری ڕێنموونی بۆ ڕێی ڕاست، کەواتە با چاوەڕوانی خێرو چاکە و گەڕانەوەیان لێ نەکرێ.

لەپاش باسی ئەو هەموو بیرو باوەڕی لارو چەوت و بۆچوونی ناڕەواو کردەوە بەدەی کە دووچاری بوون لەسەرەنجامی لادانیان لە پەرستنی خواو گێڕانی تەنها خوا بە حاکم و تەنها شەریعەتی خوا بە بەرنامە، لەپاش ئەوە ئینجا ئەیانگێڕێتەوە بۆ سەر ئەو تاقە ڕێگە و بەرنامە ڕاستەی کە ونیان کرد، بۆلای ئەو کەسەی کە ڕۆزی و هەموو شتی ئەوانی بەدەستە، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ﴾ تەنها خوایە ئەو کەسەی کە دایهێنا و دروستیکرد باخات، تەنها خوا ئەو هەموو دارو درەختە تەڕ و ڕەنگاو ڕەنگەی دروستکرد لەو کەرەسە وشك و برینگ و بێ گیانانە، کە ئەو باخاتە دوو بەش و جۆرن ﴿مَّعْرُوشَٰتٍ﴾ کەپر و هەرزاڵ بۆ کراون و بەرز کراونەتەوە لە زەوی ﴿وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ﴾ کەپر و هەرزاڵ بۆ نەکراون و بەسەر زەویدا کشاون و بڵاو بوونەتەوە، کەواتە مەبەست هەر باخاتی ترێیە کە ئەم دوو جۆرەی وەك(ضحاك) ئەفەرموێ:(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەفەرموێ: مەبەست لە(معروشات) هەر درەختێکە کە لەسەر ساق نەوەستابێت، بەڵکو پەلی کوتابێ و بڵاو

بووبێتەوە بەسەر زەویدا وەك مێو و کولەکە و کاڵەك و شوتی و وێنەیان،(غیر مروشات) ئەو درەختانەیە کە لەسەر ساق و راوەستابن، هێندێك ئەفەرمون: یەکەم ئەوانەیە کە خەڵکی ناشتبنی و سەرپەرشتی کردبن و پەرژین و هەرزاڵی بۆ دروست کردبن، دووەم ئەو دارو درەختانەی کە خۆ سەوزن و هەر بە فەرمانی خوا سەوز بوون لە شاخ و چۆڵیدا ﴿وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ﴾ دارخورما و کشتوکاڵی داهێناوە و دروستیکردوون، واتە ئەو دانەوێڵانەی کە خۆراکن و زەخیرە ئەکرێن. بە پێی فەرمودەی(ئیبن و عەباس) – و خوا لێیان رازی بێت – ئەم دوانە بەری(غیر معروشات) ئەکەون، کەواتە دووبارە کردنەوەیان لەبەر زۆر گرنگی یانە، ئەم دوانەی دروست کردووە بە جۆرێ ﴿مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ﴾ جیاوازە بەر و سەمەری هەرکامیان لە رەنگ تام و بۆن و شێوەو چۆنێتیدا، هەروەها دووبارە کردنەوەی ئەم دووانەش کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ﴾ زەیتوون و هەناریشی داهێناوە و دروستی کردوون لە کاتێکدا کە هەنارەکە ﴿مُتَشَٰبِهًا﴾ وەك یەك وان و لە یەك ئەچن لە وێنەو دیمەندا ﴿وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍ﴾ لە یەك ناچن و چوون یەك نین لە تامدا، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست هەرکامە لە زەیتون و هەنار کە گەڵاکانیان لە یەك ئەچن، بەڵام بەرەکانیان جیاوازن، هەموو سوپاس و ستایشێ بۆ پەروەردگار، لە میهرەبانی یەکەی بەزیاد بێت کە ئەو هەموو نازو نیعمەتەی دروست کردووە بۆمان کە بەڵگە و رابەرێکی روون و بەهێزن لەسەر تاك و تەنیایی و دەسەڵات و زانین و کاردروستی خۆی، بیر لێ کردنەوەیان مایەی بڕوای بەهێزە بۆ هەرکەسێك کە ژیر بێت و چاوی دڵی بینا بێت، ئەمانەی دروستکرد بۆ ئێمەو ئینجا فەرموی: ﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ﴾ بخۆن لە بەرو میوە و بەرهەمی هەنار، هەروەها ئەوانی تریش، یان بخۆن لە بەرو میوەی ئەوانەی کە باسکرا لەم ئایەتەدا، بخۆن لێی کاتێ کە بەر دەرئەکات ئیتر با پێش نەگەیشتبن، واتە حەڵاڵە و رەوایە بۆتان خواردنی کە رەوادان و حەڵاڵ کردن و قەدەغە کردنی هەر بە دەست خوایە و هیچ کەسێکی تر بۆی نییە شت حەرام یان حەڵاڵ بکات، هەرکەس لاف ئەو مافە لێبدات لە راستی دا لاف خوایەتی لێئەدا، هەرکەس ئەو مافە رەوا بدات بۆ غەیری خوا ئەو کەسە هاوبەش رەوا ئەدا بۆ خوا.

وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿١٤٢﴾ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ نَبِّـُٔونِي بِعِلۡمٍ

---

**﴿ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ﴾ مافەکەی بدەن بە خاوەنەکانی، واتە ئەو بەش و مافەی کە خوا پێویستی کردووە لەسەرتان لەو شتانەدا کە باسکراون، بیدەن بەو کەسانە کە شایستە و موستەحەقن، رای زۆریە و بەهێز لەسەر ئەوەیە کە ئەم ئایەتە مەککەیی یە، کەواتە مەبەست لەم مافە ئەو زەکاتە نییە کە لە ساڵی دووەمی کۆچیدا پێویست کراو ئەندازەی دیارییکرا، بەڵکو مەبەست خێرو سەدەقەیەکە کە هەر پێویست بووە و ئەندازەی دیاریی نەکراوە، وەك لە چەند ریوایەتێکیشدا بەو جۆرە هاتووە، ئەو مافە بدەن ﴿ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ﴾ لە رۆژی دروێنە و برین و چنینیدا، واتە تەفرەی مەخەن لە کاتی دانەکەی، بەڵکو هەر لەگەڵ بەدەستەوە هات و گونجا بیدەن، یان مەبەست ئەوەیە کە پێویست کردنەکەی دەست پێ ئەکات لەو رۆژەدا نەك مەبەست ئەوەیە کە دانەکەی لەو رۆژەدا بێت ﴿ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ﴾ زیادە رەوی مەکەن و لە سنوورتێمەپەڕن بەلێشاودەستی تێ بخەن تابۆ خۆتان نەمێنێتەوە، وەك لە(ئیبن و جریج)ەوە ئەگێڕنەوە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە(سابتی کوڕی قەیس) دا – خوایان لێ رازی بێت – کە باخە خورماکەی بەخشی تا هیچ بۆ خۆی نەمایەوە، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە لە گوناهدا سەرف نەکەن، چەند رایەکی تریش هاتووە بەلاَم بەلامەوە بەهێز نین، لەبەر ئەوە باسم نەکردن، بەلامەوە هەر رای یەکەم چاك و بەهێزە، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ بێگومان خوا زیادە رەوی کەرانی خۆش ناوێ، بەڵکو لە بارەی زیادە رەوی کردنەکەیانەوە خەشمی هەیە لێیان، سزایان ئەدا لەسەری ئەگەر ویستی، ئینجا دێتە سەر باسی حوشتر و مەڕو ماڵات، ئەو حەرام و حەلاڵ کردنەکەی بێ بڕواکان دەمبازییان پێ ئەکرد بە ناهەق و ناڕاستی دەرئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ دروستی کردو دایهێنا لە حوشتر و وڵاخ و مەڕ و**

بزن ﴿حَمُولَةً﴾ بار کراو و هەڵگری بار و شتی قورس ﴿وَفَرْشًا﴾ ئەوەی کە پاڵ ئەخرێ و ڕائەخرێ بۆ سەر بڕین، بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراونەتەوە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ بخۆن لەوەی کە خوا کردوویە بە ڕۆزیتان و حەڵاڵی کردووە، ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون و ڕێبازەکانی مەدەنەبەر ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ چونکە بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆتان، واتە ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردووە بە حەڵاڵی بزانن و بیخۆن، چونکە حەڵاڵ و حەرام کردن بەدەست ئەوە، مەکەونە شوێن شەیتان کە هیچی بەدەست نییە و هیچی دروست نەکردووە، کەواتە چۆن شوێنی قسەی ئەو ئەکەون لەوەی کە خوا دروستی کردووە و کردوویە بە ڕۆزی ئێوە، چۆن ئێوە بە قسەی دوژمن ئەکەن و شوێنی ئەکەون، چۆن کوێرانە ئەکەونە شوێنی قسە و باسی باوك و باپیرانتان کە شەیتان هەڵیخەڵەتاندوون؟! ئینجا بەرەنگاری یان ئەوەستێ و بەریان لێ ئەبڕێتەوە سەبارەت بەو بیر و باوەڕە پڕو پووچەی کە بویان لەبارەی حەرام و حەڵاڵ کردنی ئەو حەیوانانەی کە خوا بۆی دروستکردن و حەڵاڵی کرد، کەچی ئەو نەفامانە لە خۆیانەوە هێندێکیان حەڵاڵ ئەکردو هێندێ حەرام، لەباتی ئەو دوو وتەیە:(حمولة و فرشا) ئەفەرموێ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ﴾ واتە دروستیکردووە و دایهێناوە هەشت جۆرو هاوسەر ﴿مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ﴾ لەوەی خوری هەیە و بە خوری لەشی داپۆشراوە دوان: نێرو مێ ﴿وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِۗ﴾ لەوەی مووی هەیە و بە مو لەشی داپۆشراوە دوان: نێرو مێ. ئەو جۆرە ماڵاتە ﴿قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ: ئایا خوا ئەو دوو نێرەی حەرام کردووە ﴿أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾ یا ئەو دوو مێیە، واتە نێر یان مێی ئەو ماڵاتە؟ ﴿أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾ واتە یا ئەو بێچوانەی کە لە سکی ئەو دوو جۆرە ماڵاتە مێینەدایە، واتە هیچ کام لە نێرو لە مێ و لەو بێچوانەی حەرام نەکردووە. ئەوانە خوا دروستیکردوون و حەڵاڵی کردوون بۆ ئێوە، حەرام و حەڵاڵ کردن تەنها بە دەست خوایە، ئیتر چۆن ئێوە لە خۆتانەوە هێندێکیان حەرام ئەکەن و بەدەم خواشەوە ئەوە ئەڵێن؟ ﴿نَبِّـُٔونِي بِعِلۡمٍ﴾ هەواڵم بدەنێ بە زانینەوە

إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً

---

﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە راست ئەکەن کە ئەڵێن: خوا ئەوەی حەرام کردووە، واتە هەواڵم پێبدەن بە شتێ کە گومانی تێدا نەبێ و زانراو بێ بە بەڵگە و نیشانەیەك کە لەلایەن خواوە هاتبێ، ئا بەو جۆرە دەم کوتی کردن و بەری لێ برینەوە، کەواتە با بیر بکەنەوەو ئەو بیرو باوەڕە پووچە لە دڵی خۆیان دەرکەن، ئینجا دێتە سەر باسی ئەو دوو جۆرەکەی تر لەو چوار پێی کە لە زمانی عەرەبدا ناو ئەبرێ بە:(نعم) ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ﴾ لە حوشتر دوان ﴿وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ﴾ لە رەشە ولاخ دوان ﴿قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ دیارە هیچ زانین و بەڵگە و نیشانەیەکیان بە دەستەوە نییە کە لەلایەن پێغەمبەرانەوە هاتبن، کەواتە ئەو قەدەغە کردنەیان لە کوێ هێنا ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا﴾ ئەی ئایا ئێوە حازر و ئامادە و بە دیارەوە بوون ئەو کاتە کە خوا فەرمانی پێداین بەم قەدەغە کردنە؟ واتە زانینی ئەو قەدەغەیە بۆ ئێوە یان ئەبێ لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بێت، یان ئەبێ خۆتان ئامادە بووبن و لە خواتان بیستبێ، دەی خۆتان بڕواتان بە پێغەمبەر(ﷺ) نییە، کەواتە هەر ئەم باری دووەمە ئەمێنێتەوە بۆ ئێوە، خۆ دیارە ئەمەش شتێکی نەگونجاوە بۆ ئێوەو خۆیشتان لاف ئەوە لێنادەن، کەواتە ئەبێ بڵێین کە درۆ و دەست هەڵبەست ئەکەن بە دەم خواوە، ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ دەی ئایا کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی کە درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێ و درۆ بسەپێنێ بەسەر خوادا ﴿لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکات و لایدا لە ڕێگەی خوا، ئەو دەست

هەڵبەستەشی کردبێ ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە زانینێکی ببێ بە هاتنی ئەو شتەی کە دەست هەڵبەستی ئەکات لەلایەن خواوە، کەواتە کردەوەکەشی بەدەو نیازەکەشی بەدە، کەوابوو هیچ کەس لەو کەسە ستەمکار تر نییە، ئەم وتەیە بە دوو جۆریَ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە گوتم بەهێزترە لای زۆربە، ئەم ئایەتە هەرچەند هاتبێتە خوارەوە دەربارەی کەسێك، یان کۆمەڵێك بە تایبەتی، بەڵام گشتی یە و تایبەتی ناکرێ، بەڵکو هەرکەسێك هەر شتێك دابهێنێ لە ئایینی خوادا، بەری فەرمانێ لە فەرمانەکانی خوا و پێغەبەر(ﷺ) نەکەوێ، ئەو کەسە بەری ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکەوێ کە لەم ئایەتەدایە، وەك دەست نیشانی ئەکات بەو گشتی یە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی خوا ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات، واتە ئەوانەی کە لە ئایەتەکەدا ناو و نیشانیان هەڵدرا، چونکە ئەوانە پەیوەندی خۆیان پچڕیوە بە هەر شتێ کە هۆی ڕێنموونییە، ئەوانە هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا داوە. لەپاش ئەوەی لە ئایەتەکانی رابردوودا روونی کردەوە کە هیچ کەس بۆی نییە هیچ شتێك قەدەغە بکات بێجگە لە خوا و هەرکەس ئەوە بکات درۆ بەدەم خواوە ئەکات، هەرکەس گوێرایەڵی بکات بۆ قەدەغە کردنی غەیری خوا، ئەو کەسە هاوبەش ڕەوا دەرە بۆ خوا، لە پاش ئەوە ئەوا باسی ئەوە ئەکات کە خوا قەدەغەی کردووە لەسەریان، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُل﴾ بڵێ بەوانەی کە بە درۆوە لە خۆیانەوە ئەو شتانە حەرام یان حەڵاڵ ئەکەن کە باس کران لە ئایەتەکانی رابردوودا ﴿لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ﴾ دەستم ناکەوێ لەوەی کە سروش کراوە بۆلام، دەستم ناکەوێ هیچ خۆراکێکی حەرام کراو لەسەر هەر بخۆرێ کە بیەوێ بیخوات ﴿إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً﴾ مەگەر ئەو شتە کە نیازی خواردنی ئەکرێ مردار بووبێتەوە، واتە بێجگە لە ماسی و کوللە کە بە حەدیس حەڵاڵ کراون بە مرداریش.

﴿أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا﴾ یا خوێنیٚ کە تەڕەو ئەڕژێنریٚ، نەك وشك و بەستوو بێت، وەك جگەر و سپڵ، ﴿أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ﴾ یان گۆشتی بەراز بیٚ ﴿فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ﴾ چونکە بێگومان بەراز یان گۆشتەکەی پیس و قیزەونە، دیارە لە جێیە گۆشت کە بە نرخ ترینە بۆ خواردن پیس بیٚ باشتر ئەبیٚ شتەکانی تر قیزەون بن ﴿أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ واتە یان سەر براوێك بیٚ کە ناوی غەیری خوا برابیٚ لێی لەکاتی سەربڕینیدا، وەك باو بووە لە سەردەمی نەفامیدا کە بەناوی بتەکانەوە سەریان ئەبڕی، هەروەها ناوی هەرکەس و هەرشتێکی تری لیٚ ببریٚ با ئەو کەسە پێغەمبەریش بێت(ﷺ). جا ئەو سەربڕاوانەی ناو بردووە بە گوناهو دەرچوون لە ئاینی و گوێرایەڵی خوا لەبەر زیادە ڕەوی کردن، واتە ئەو سەر بڕاوانە ئەوەندە خراپ و بەدن وەك نەفسی گوناهو دەرچوون لەگوێرایەڵی وان، واتە ئەوەی کە سروش کرابیٚ بۆلای من و خواردنی قەدەغە کرابیٚ هەر ئەم چوارەیە و من بێجگە لەم چوارەم دەست ناکەویٚ، حەرام و حەڵاڵیش هەر ئەوەیە کە لە من وەرگیرابیٚ و ئەوانەی کە باسکران و حەرام کراون لەلایەن بیٚ بڕواکانەوە هیچ کام نین لەم چوارەو لە من وەرنەگیراون، کەواتە نابیٚ ئەو حەرام کراوانەی ئەوان حەرام بن، ڕووکەش و ڕواڵەتی ئەم ئایەتە وا نیشان ئەدات کە حەرام هەر ئەم چوارەیە و ئیتر هەر خۆراك و حەیوانێکی تر حەرام نییە، لەبەر ئەوە هێندیٚ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە هەر ئەم چوارە حەرامە. لە(ئیبن و عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیر) یشەوە ریوایەت کراوە و ڕووکەشی مەزهەبی(ئیمامی مالیك) یش هەر لەسەر ئەوەیە، ئەم ئایەتە هەرچەند مەککەیی یە و لەوانەیە سڕینەوەو تایبەتی کردن رووی تێبکات، بەڵام ئایەتی سورەتی(البقرة) ش کە مەدینەیی یە ئەم ئایەتە بەهێز تر ئەکات و حەرامەکان کورت هەڵئەهێنیٚ هەر لەم چوارەدا: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ﴾

وەك بە درێـژیی تێپـەڕی کـرد لـەکاتی تەفسیرەکەیدا. بێجگـە لـەوە حەدیسی زۆر هـاتووە کـە ڕێکـە لەگـەڵ ئەمـەی کـە گـوترا، کەواتـە ئـەوەی کـە رووکەشـی ئایەتەکـە نیـشانی ئـەدا زۆر بەهێزە، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای تەفسیری رازی و منار و روح المعانی بکات تا بۆی دەرکەوێ هێزی ئەم رایە، لەگەڵ ئەوەدا کۆڕ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە حەرام هەر ئەم چوارە نییە، بەڵکو چەندەها گیانلەبەری تریش هەن کە حەرامن وەك ەب درێـژیی لـە کتێبی مەزهەبەکانی ئیسلامدا باس کراون و زانراون، بەهەرکام لەوانە کە بە حەرام دائەنرێن حەدیس هـاتووە، بۆ نەهێشتنی دژایەتی ئەو حەدیسانە لەگەڵ ئایەتەکانـدا، چەند شتێك گـوتراوە و چـەند وەلأمێك دراوەتـەوە کـە هـەموو هـەر جێگـەی قسە و بـاس و لێکۆڵینـەوەن، ئینجا پێویستە خوێندەوار و زانا رەگەزایەتی بۆ هیچ مەزهەبێك نەیانگرێ، سوور نەبنەوە و رەگ و دەماریـان راسـت نەبێتـەوە، بـەڵکو بـە ئـارام و ئاسـایش تێفکـرێن لـە هـەموو راو بەڵگەکان، هەرکام لە دڵ دا بەهێزتر بێ شوێنی کەون، بە تایبەتی ئەم جۆرە مەسەلانە کە پێیان ئەگوترێ: فـەرعی و ئیجتهادی مـافی ئەوەیان نییە ببن بـەهۆی ئاژاوە و دووبەرەکی. یەکێ لەهۆی گەورەیی ئەم شەریعەتە ئەوەیە کە ئاوا پان و قوڵ و فراوانە بۆ هـەموو کات و وڵات و چینێ لە چین و تاقمەکانی ئەم ئادەمییە، رێگەی تێڕوانین و ئیجتیهادی تیا دراوە بۆ ئەم جۆرە مەسەلانە تا ئەو رادەیە ئەگەر هەڵەش بکرێ هەر تاوان نییە بەڵکو ئەجرو پاداشت ئەدرێتەوە، بێگومان لە زۆر لە وڵاتاندا باوە خواردنی گەلێ لەم گیانلەبەرانە کە بەلای کۆڕ و جەماوەری مەزهەبەکانـەوە پیس و حـەرامن وەك مـارو کیسەڵ و قـرژانگ و قورباق، دەی کە ئیسلام گەیشتە ئەو وڵاتانـە ئایا لەبەرچی تـەنگیان لـێ هەڵکێشین و بـێ بەشیان بکـەین لـەو جۆرە خۆراکانە کە حەزی لێ ئەکەن و دەقیان پێوە گرتووە؟ ئایا بۆچی فتوایان بۆ دەرنەکرێ بـە پێـی راو بڕیـاری ئـەو هـەموو زانـا بەرزانـە کـە هـەر لـە کـۆن و سـەرەتای ئوممەتـەوە راو بڕیاریان لەسەر پاکی و حەڵاڵی ئەو گیان لەبەرانەیە هەر هیچ نەبێ با لـەو وڵاتانـەدا بە پێـی

رای ئیمامی مالیك ڕەفتار بكریٚ و نەكریٚ بە هەرا و بەزم، بەڵام بەداخەوە ئەگەر شتی وا بگوتریٚ لە هەموو لایەكەوە ئەكریٚ بە هەراو وا دائەنریٚ كە ئایینی ئیسلام بەوە ئەڕوخیٚ؟!!

لەناو ئەو قسە و وەڵامانەی كە گوتراون بۆ نەهێشتنی دژایەتی ئەو حەدیسانە كە هێندیٚ شتی تریان حەرام كردووە بێجگە و زیاد لەوەی كە لە ئایەتەكاندا هاتووە، لەگەڵ ئەم ئایەتە و ئایەتی سورەتی(البقرة) و(النحل) دا، لەناو ئەو قسە و وەڵامانەدا دوانیان ئەهێنم كە بەلامەوە بەهێزن:

١- ئەو كورت هەڵهێنان و حەسرەی كە لە ئایەتەكان وەرئەگیریٚ ئیزافییە و بە نەزەر ئەو حەرام كردن و حەلاڵ كردنەیە كە بت پەرستەكان بە ئارەزوكاری ئەیانكرد و بە درۆو دەست هەڵبەست بە ناوی خواوە ئەیانكرد، واتە لەناو حەرام كراوەكانی ئێوەدا هەر ئەمانە حەرامن، نەك مەبەست ئەوەیە كە حەرام كراو هەر ئەمانەن.

٢- ئەوەی كە لەو ئایەتانە وەرئەگیریٚ و پیٚی ئەگوتریٚ:(مفهوم) حەلاڵیتیٚ هەموو گیانلەبەرێكی ترە بە گشتیی، ئەو حەدیسانەی كە هاتوون لە حەرام كردنی زیاد لەوەی كە لەو ئایەتانەدا هاتوون، ئەو حەدیسانە ئەو گشتێتی یە ناهێڵن و تایبەتی ئەكەن. ئەو حەدیسانە هەرچەند قەتعی نین و پیٚ یان ئەگوتریٚ: خەبەری ئاحاد. هەرچەند بەو جۆرەن دەست نەدەن بۆ تایبەتی كردنی گشتێتی، بە تایبەتی گشتێتی یەك كە دەقی ئایەتەكە نەبیٚ، بەڵكو وەرگیریٚ لە خاریجی دەقەكەوە كە پیٚی ئەگوتریٚ:(مفهوم)، ئەمە سڕینەوەی ئایەت نییە تا بگوتریٚ چۆن ئایەت كە قەتعییە بە خەبەری ئاحاد سەڕڕێتەوە، ئەم دوو وەڵامەم بەلاوە بەهێزەو دژایەتی ناهێڵیٚ، بێگومان لە هەر شوێنێكدا دوو دەلیل و بەڵگە هەبوو تا بگونجیٚ ئەبیٚ یەك بخرێن و هیچ كام بەرەلا نەكریٚ.

فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖ

**ئینجا دێینه سەر ئایەتەکە، ئەو چوار شتەی حەرام کرد، بەڵام لە میهرەبانی خوا بە زیاد بێت کە لە کاتی تەنگیدا دەرو ئەکاتەوە لە بەندەکانی و تەنگەتاویان ناکات و باریان سووک ئەکات، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ﴾ ئینجا هەرکەسێك ناچار کراو برسێتی ناچاری کرد، لەکاتێکدا دەست درێژیی نەکاتە سەر ناچارێکی تری وێنەی خۆی وەك کۆمەڵی زانایانی تەفسیر ئەفەرمون، ئەگەر بەو جۆرەی کرد هەرچەند خواردنەکەی حەلاڵ بێت، بەڵام گوناهی ئەگات لە دەست درێژیی کردنەکەیدا، یان مەبەست ئەوەیە بە دوای خۆشی و لەزەتدا ئەگەڕێ، بەڵکو هەر لەبەر ناچاری بیخوات، وەك(حەسەن) ئەفەرموێ. یان مەبەست ئەوەیە ئەو بخۆرە ناچارە لە ئیمامی راستەقینەی ئیسلام هەڵنەگەڕابێتەوە وەك(مجاهد) ئەفەرموێ. لەسەر ئەم دوو بارە ئەو خۆراکە حەرامانە حەلاڵ ئەبن، ﴿وَلَا عَادٖ﴾ لە کاتێکدا لە خواردنەکەیدا تێپەڕ نەبێ لە ئەندازەی پێویستی ناچاری یەکە. ئەو کەسەی کە ئەوحەرامانەبخوات لە ناچاریدا و بەو دوو مەرجە خوا لێی ناگرێ، ﴿فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ چونکە بێگومان پەروەردگارت زۆر داپۆشەر و لێ بوردەی میهرەبانە، واتە ئەو گوناه ئەسڕێتەوە و نایهێڵێ، ئینجا ئایا ئەندازو سنووری ناچاری چییە، ئەو ئەندازە چەندە کە دروستە بخورێ؟ ئەوە زانایان چەند رای جیاوازیان هەیە با تەماشای کتێبەکان بکرێ. ئینجا باسی هێندێ شت ئەکات کە حەرامی کرد بە تایبەتی لەسەر ئیسرائیلی یەکان، واتە یەهود لەبەرسزادان وتۆڵەسەندن لێیان لەسەر تاوان و خراپەکاری یان، نەك بەمەی کە ئەو قەدەغە کردنەلەئەسڵ وبنەڕەتی ئەوشەریعەتەبێت،ئەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا﴾ حەراممان کردهەرلەسەرئەوانەی کەیەهودبوون بەتایبەتی نەك هیچ گەل وکۆمەڵێکی تر﴿كُلَّ ذِي ظُفُرٖ﴾ هەموو خاوەن ناخونێك، واتە یەك سم وەك حوشتر و ئوشتر مورغ و قاز و هەر گیانلەبەرێکی تر کە پێ و سمی دوولەت نەبێ وەك(مجاهد) ئەفەرموێ و لە(ئیبن و جورەیج) یشەوە هاتووە، یان مەبەست حوشترو ئوشتر مورغ و هەر چوار پێیەکی تری وێنەی ئەوان وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ. یان ئەمانە و هەموو پەلەوەرێکی خاوەن چناڵك کە راو بکات، وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. بێجگە لەمانە رای تریش هەیە و پێویست نییە بە باسکردن.**

وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمۡ ذُو رَحۡمَةٖ وَٰسِعَةٖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُهُۥ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ

---

**﴿وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ﴾ حەرامەانکرد لەسەریان هەر لە رەشە ولآخ و مەڕ و بزن و بەز و پیوەکانیان ﴿إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ﴾ مەگەر ئەوەی کە بە پشتیانەوە بێت و پشتیان هەڵی گرتبێ ﴿أَوِ ٱلۡحَوَايَآ﴾ یان پشقڵ دانەوە بێ ﴿أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ﴾ یا ئەو بەز و پیوەی کە تێکەڵ بێ لکابێ بە ئێسکەوە ئەم سێ جۆر بەز و پیوە حەرام نەکرا لەسەریان، بە کورتی حەرامکرا لەسەریان ئەوەی یەك سمە و وەك ناخوندار وایە بە هەموو شتێکی یەوە، هەر لە رەشە ولآخ و مەڕو بزنیش حەرامکرا هەر پیو و بەزێك کە تێکەڵی گۆشت و ئێسك نەبووبێ و جیاواز بێ بە رووتی و بە ئاسانی وەرئەگیرێ و لە شوێنەکەی ئەکرێتەوە وەك بەزی گورچیلە و ناو سك کە جوێ بن بە کلۆ، ئینجا هۆی حەرامکردنەوەکە و تایبەتێتی بەوانەوە روون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم﴾ ئەو حەرامکردنەمان کرد بە تۆڵەیان و بەوە سزاماندان ﴿بِبَغۡيِهِمۡ﴾ بەهۆی ستەمکاری و سەرکێشی یان، ئەوانە سوویان ئەخوارد، ماڵی مەردومیان بە ناهەق ئەخوارد، تاوانیان گەیشتە ئەو رادەیە کە چەند پێغەمبەریان شەهید کرد. هەرکاتێ تاوانێکیان ئەکرد خوا تۆڵەی لێ ئەسەندن و شتێکی حەلآڵی لەسەر حەرام دەکردن، ئینجا لەبەر ئەوەی ئەو هەوالآنەی کە قورئان ئەیدا جێگەی گومان بوو بۆ ئەو سەرکێشانە، ئەگەر بیشیان زانییایە راستن بەدەم دانیان پێدا نەئەنا و ئینکاریان ئەکرد لەبەر ئەوە دڵنیایی یەکی بەهێزی لەسەر کردو فەرموی ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ بەڕاستی و بێگومان ئێمە راست گۆین و راست ئەکەین لەم هەوالآنەدا ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە — واتە جوولەکە — وەك(مجاهد و سدی) و کەسانی تر ئەفەرمون و رووکەشی شوێنەکەش وا نیشان ئەدات لە پێش و پاشەوە، بڕوایان پێنەهێنای و تۆیان بە درۆزن دانا لە هەواڵدان بەو حەرام کردن وحەلآڵ کردنەی کەباسمان کرد﴿فَقُل رَّبُّكُمۡ ذُو رَحۡمَةٖ وَٰسِعَةٖ﴾پێیان بڵێ پەروەردگارتان خاوەنی میهرەبانی یەکی فراوانە، بەهۆی ئەوەوە پەلە ناکات و ناتانگرێ لەسەر هەر تاوان و**

خراپەکانتان، بەڵکو مۆڵەتتان ئەدات ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ بەرگری ناکریٚ سزاو تۆڵەی ئەو و کە هات ناگێڕدرێتەوە لەگەل و کۆمەڵە تاوانبارەکان. ئەم فەرمودەیە مەردوم ئەخاتە ئومێدو چاوەڕوانی بە ئەندازەی ئەوەی کە ئەیترسێنیٚ لە سزاو تۆڵە. ئەو خوایەی کە ئەم دلآنەی دروستکردووە بەم دوو جۆرو بارە لەگەڵیان ئەدویٚ، بەڵکو بکەونە سۆز و پەرۆش و گوێرایەڵ بن. لەپاش ئەوەی لە ئایەتەکانی رابوردوو بەرو دوای لیٚ بڕینەوە و بە تەواوی ناڕاستی و پڕوپووچی ئایین و بیرو باوەڕەکەیانی روون کردەوە، ئینجا دواترین بیانوویەك کە ئەیگرن بە دەستەوە ئەهێنیٚ و ئەوەیشیان بە ناهەق دەرئەکات و دەم کوتیان ئەکات لەسەری، ئەفەرمویٚ: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟﴾ ئەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا رەوا ئەداو لەمەو پاش ئەڵێن: ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ ئەگەر خوا بیویستایە نە ئێمە هاوبەشمان رەوا ئەدا و نە باوك و باپیرانمان ﴿وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ﴾ هیچ شتێکمان حەرام نەئەکرد، واتە بیرو باوەڕو کردەوە بەدەکانیان ئەبەستن بە خواست و خواهیشی خواوە و خۆیان بەبیٚ دەسەلآت وبەناچاردەرئەکەن وئەڵێن: ئەگەرخوا بیویستایەئێمەی بەرگری ئەکرد لەو شتە بەدانە. ئینجا با گویٚ شل کەین و بزانین خوا بە چ جۆریٚ بەرەنگاریان ئەوەستیٚ:

یەکەم: ئەیانترسێنیٚ بە جۆریٚ کە هۆش بکەنەوەو بێدار ببنەوە لەو بێهۆشی و بیٚ ئاگایی یە، سەرنجیان رائەکێشیٚ بۆ عیبرەت وەرگرتن لە تاقم و گەلە پێشووەکان. ئەفەرمویٚ: ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا﴾ واتە ئەمانە بڕوایان نەهێنا بە وێنەو مانەندی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا لە پێش ئەماندا هەتا سزا و تۆڵەی ئێمەیان چەشت، واتە با ئەمانیش راوەستن تا سزاو تۆڵەی ئێمە دێتە سەریان ئەو کاتە بڕوا ئەهێنن و وەك ئەوان هیچ سوودێکیش نابیٚ لە بڕوا هێنانەکەیاندا.

دووەم: باری راست و رەوا نیشان ئەدات، ئەوەش ئەمەیە کە شوێنی شتیٚ بکەون کە زانا و ئاگادان پێی نەك ئەوەی کە لە زانینیان بەدەرە و هەر لە خۆیانەوە بە گومان و گۆترەکاری دەمی بۆ ئەکوتن، بێگومان ئەزانن کە خوا فەرمانی چی پێداون و جڵەوگیریی لە چی کردووە، توانا و دەسەلآتیشیان هەیە بۆ گوێرایەڵی کەواتە رێگای گوێرایەڵی بدەنە بەر. ئاشکرایشە کە بیٚ ئاگان لە ئیرادە و خواهیشی خواو هیچ توانین و زانینیان نییە لەو بارەیە، کەواتە لەبەر چی واز ئەهێنن لەوەی کە زانین و توانین و دەسەلآتیان تێدا هەیە، پەلاماری شتیٚ ئەدەن کە لە توانا و زانین و دەسەلآتیاندا نییە؟

قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلۡ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشۡهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَاۖ فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشۡهَدۡ مَعَهُمۡۚ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا

---

**دەست نیشانمان بۆ ئەم بارو ڕێگەیە کە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ بەو بت پەرست و بێ بڕوایانە ﴿هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآ﴾ ئایا لەمەدا ئەیڵێن و لەم بیرو باوەڕەی کە وان لەسەری و بەدەم خواوە ئەیڵێن، ئایا لەمانەدا هیچ جۆرە زانینێکتان هەیە و هیچ بەڵگە و رابەرو نیشانەیەك هەیە بە دەستتانەوە تا دەری بخەن بۆمان و دەری بڕن؟ بێگومان هیچیان بە دەستەوە نییە و هیچ زانین و ئاگایەکیان نییە لەو بارەیەوە،کەواتە ئەبێ هەر ئەمەیان پێ بگوتری: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ﴾ ئێوە لەم بارەیەوە شوێنی هیچ شتێ ناکەون بێجگە لە گومان، ئێوە هەر درۆ ئەکەن بەدەم خواوە و بەدەم بڕ ئەم قسانە ئەکەن درۆ ئەکەن کە ئەڵێن: ئەم هاوبەش ڕەوادان و حەرام کردنەمان لەلایەن خواوە هاتووەو بە پێی فەرمان و ڕەزامەندی خوایە. خوای پەروەردگار ئەم هەواڵەیدا لەو بێ بڕوایانە کە لە داهاتوودا ئەم قسە ئەکەن، ئەو هەواڵە بەدیهات و ئەو بێ بڕوایانە ئەو قسە و لافەیان لێدا، وەك خوا بۆمان باس ئەفەرموێ لە ئایەتی(٣٥) ی سورەتی(النحل) دا: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ﴾ ئەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا دانا و گوتیان و ئەڵێن: ﴿لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ ئەگەر خوا بیویستایە نە ئێمە و نە باوك و باپیرانمان بێجگە لە خوا هیچ شتێکمان نەئەپەرست ﴿وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ﴾ هیچ شتێکمان حەرام نەئەکرد... هتد، کەواتە ئەم ئایەتی ئێرە یەکێ بوو لە هەواڵە غەیبییەکانی قورئان و موعجیزەیەکە لە موعجیزە جۆر بە جۆرەکانی قورئان کە پێویستە سوپاسی خوای لەسەر بکەین کە هەموو جارێ ڕاستی و پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆ ئاشکرا ئەکات لە بەزەیی و میهرەبانی یەکەی بەزیاد بێت، ﴿قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُ﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ پێیان لە کاتێکدا کە ئێوە هیچ**

بەڵگە و نیشانەیەکتان بەدەستەوە نییە لەسەر ئەو لاف و قسەی خۆتانە، دەی هەر بۆ خوا هەیە بەڵگەی روون و ئاشکرا کە گەیشتووەتە ئەوپەڕ لە هێزو دامەزراوی دا، ئەوەش بریتی یە لەم قورئانە و پێغەمبەر(ﷺ) و راگەیاندن بە روونی، تەفسیری بەم جۆرە بەناوبانگە لەناو زانایاندا، بە سێ جۆری تریش راڤە کراوەتەوە یەکێ لەو سیانە بەلامەوە بەهێزەو دڵم زۆر پێی بە ئارامە، تەنانەت لەمەش کە لە پێشەوە باسم کردو کردم بە تەفسیر، ئەو جۆرەش ئەمەیە: ئەوانە ئەڵێن: هاوبەش دانانیان بۆ خواو حەرام کردنی ئەو شتانەی کە حەرامیان کردووە، بە خواهیش و رەزامەندی خوایە و نابێ رەخنە و لۆمەیان لێ بگیرێ لەوەدا، بەڵگەو رابەریشیان ئەوەیە: ئەگەر خوا پێچەوانەی ئەوەی بویستایە کە ئێستا وان لەسەری بێگومان ئەمانی ناچار ئەکرد لەسەری، ئێستا کە ناچاری نەکردن ئەبێ رازی بێ بەمەی وان لەسەری، بەڵام ئەوەی کە ئەیکەن، کەواتە هەر بە قسە خۆیشیان خۆیان تاوانبار کرد، لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێیان بڵێ ﴿فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ﴾ واتە هەر بۆ خوایە بەڵگەی بەهێز بەسەر ئێوەدا ﴿فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ چونکە ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی ئەخستە سەر رێی راست و بە ناچاری بڕوای پێ ئەهێنان و ناچاری ئەکردن لەسەر وازهێنان لە هاوبەش رەوا دان و حەرام کردن بە ناهەقی، ئێستا کە وای نەکردووە بە مەیل و خواهیشی خۆتان ئەوە ئەکەن، کەواتە ئەبێ داواتان لێبکات بە بڕوا هێنان و کۆتایی هێنان لەوەی کە ئەیکەن، چونکە ئێوە خاوەن دەسەڵات و مەیل و خواهیش ناچار نین، هیچ بڕو بیانوویەکتان بەدەستەوە نییە، لەسەر هەر بار ئەم ئایەتە و وێنەکانی یاسا و بیرو باوەڕێکی گرنگ نیشان ئەدەن کە هاوەڵەکانی لەسەر بووە، لەپاش ئەوان کۆمەڵ و جەماوەری ئوممەت هەر ئەوەیان هەڵبژاردووە، هەر ئەوەش رێکە لەگەڵ ژیرییدا، ئەوەش ئەمەیە: بەندە دەسەڵات و مەیل و خواهیش و هەڵبژاردنی هەیە لەو کردەوانەدا کە داوای لێکراوە و جڵەوگیریی کراوە لێیان، بەجۆرێ هیچ بڕو بیانوویەکی نییە لە گوناهو سەرپێچی و سەرکێشیدا، چونکە ئاشکرایە کە ناچار نییە و ناچار نەکراوە لەلایەن خواوە، وەك سەرەتای هەموو ئەو ئایەتانە ئەیگەیەنن: ﴿لَوْ شَآءَ﴾ واتە خوا نەیویست، کەواتە ناچار نەکراوە و بە مەیل و خواهیشی خۆی ئەو

شتانه ئەکات، دوایی ئایەتەکانیش ئەوە ئەگەیەنن کە مەیل و خواهش و ئیرادەو دەسەلاتی خوا دەوری هەموو شتی داوە و لە هەموو شتێکدا کار ئەکات و هەموو شت و هەموو کردەوەکانی بەندە، چاك و خراپ بە پێویست و خواهیشی خوایە، بە کورتی ئێمە ئاگامان لە فەرمان و داواکراوەکانی خوا هەیە، ئاشکرایە کە ناچار کراو نین لەو کردەوانەدا، ئاگامان لە مەیل و خواهیشی خوا نییە، کەواتە هەر ئەبێ هەوڵی شتێ بدەین و خەریکی شتێ ببین کە ئەیزانین و دەسەلاتێکمان هەیە بەسەریدا، نەك خۆمان خەریك بکەین بە مەیل و خواهیشی خواوە کە بە هیچ رەنگ ئاگا و دەسەلاتمان رووی تێ ناکات، خوا بە میهرەبانی خۆی بمانخاتە سەر رێ راستەکەی خۆی و دامەزراومان بکات لەسەری – آمین –، ئینجا لە کۆتاییدا فەرمان ئەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) داوا بکات لەو بت پەرستانە و بەریان لێ ببڕێتەوە بە هێنانی ئەوانەی کە لەوانەن پشتیان پێ ببەستن، بەڵکو شایەتی یان بۆ بدەن لەسەر ئەو لاف و داوای کە هەیانە و ئەڵێن خوا ئەو شتانەی حەرامکردووە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا﴾ بێنن و ئامادە بکەن شایەتەکانتان کە شایەتی بدەن کە خوا ئەمەی حەرامکردووە کە باسکرا لە ئایەتەکانی رابردوودا،(مجاهد) ئەفەرموێ: مەبەست ئەو چوارەیە کە لە سورەتی(المائدة) دا باسکران:(بحيرة و سائبة و حام و وصيلة)، مەبەست لەم شایەتانە ئەوانەن کە پێشەوایانن و ئەمان دوایان کەوتوون، مەبەست لەم فەرمانانە دەرخستنی دەستە پاچەیی و پەك کەوتن و بێ ئابڕوویی یانە بەمەی کە هەرچۆنێ خۆیان نەزانن و بە گومان و گۆترەکاری قسە ئەکەن، هەروەها دەستە پاچەن لەوەی کە بە شایەتی شایەتان قسەکەیان ببەنە سەر. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ﴾ ئەگەر وا دابنێین کە دێن و شایەتی ئەدەن، ئەو کاتە تۆ بڕوایان پێ مەکەو شایەتی یەکەیان وەرمەگرە، چونکە درۆی رووتە، کەواتە بێ دەنگ مەبە لەسەر ئەو ناهەقی یە بەڵکو ناهەقی و ناڕەوایی یەکەی ئاشکرا بکە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ شوێنی ئارەزواتی ئەوانە مەکەوە کە بڕوایان نییە بە ئایەتەکانی ئێمە و بە درۆیان دائەنێن

وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ۞ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا

---

**﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ﴾ ئەوانـەی کـە بڕوایـان نییـە بـە ڕۆژی دوایـی ﴿وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ ئەوانەی کە هاوبەش و هاوتا بڕیار ئەدەن بۆ پەروەردگاریان، واتە شوێنی ئەوانە مەکەوە کەخاوەنی ئەوسیفەت وکردەوەبەدانەن، مەبەست ناشیرین کردن و بێزراندنیانە تا بە تەواوی دوورەپەرێزبێت لێیان وبەهیچ ڕەنگ پەك نەکەوێت لەگەڵیان ودڵت دانەنێیت بۆیان.**

**قورئان لێرەو لە چەند شوێنی تردا مەسەلەی حاکمێتی و دانانی یاسا و بەرنامەی زۆر بە گرنگ و گەورە نیشاندا، بەو هەموو توندو تیژیی یە لێی دوا، چونکە پەیوەندی بە خوایەتی خواوە هەیە و تایبەتییە بە خواوە و ڕەوا دانی بۆ هەر کەسێکی تر هاوبەش ڕەوادانە بۆ خوا، لەم قورئانە و لەم ئاییندەدا یەکسانە بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادانی ئاشکرا کە باو بووە بە ئاشکرا بت پەرستراوە و سوژدەی بۆ براوە، یەکسانە ئەوە لەگەڵ ڕەوادانی حاکمێتی بۆ غەیری خوا و ڕازی بوون بە هەر یاسا و شەرعێك کە لەلایەن خواوە نەهاتبێ و ئیزنی خوای لەسەر نەبێ، ئیتر بە ناوی خوایشەوە بێ هەر بت پەرستییە و هاوبەش ڕەوادانە بۆ خوا بە بێ جیاوازی لەگەڵ بت پەرستی یە ئاشکراکەدا، وەك ئەو حەرامکردن و حەڵاڵ کردنەی ئەو سەردەمە کە لەم ئایەتانی ڕابردوودا باسیکردن و بەناوی خوایشەوە ئەیانکرد، لەگەڵ ئەوەدا داینان بە بێ بڕوا بە ئایەتەکانی، بە بێ بڕوا بە ڕۆژی دوایی، بە هاوبەش ڕەوادەر بۆ خوا، ئینجا با ئەندازەیەك بیر بکەینەوە تا بۆمان دەرکەوێ کە بۆچی ئەو بڕیارانە ئەدرێ بەسەر ئەو کەسانەدا کە لەلایەن خۆیانەوە یاسا و بەرنامە دائەنێن بۆ خەڵکی، یان ڕازین و بڕوایان هەیە بە هەر یاسا و شەرع و بەرنامەیەك کە لەلایەن خواوە نەهاتبێ و ئیزنی خوای لەسەر نەبێ. ئەوانە لە ڕاستیدا بڕوایان نییە بە ئایەتەکانی خوا، چونکە ئەگەر مەبەست ئایەتە بوونەوەری یەکانە، هەموو ئایەتە بوونەوەری یەکان شایەتی ئەدەن کە تەنها خوا داهێنەر و ڕۆزی دەرە، هەر داهێنەر و ڕۆزی دەریش خاوەنی**

راستەقینەیە، کەواتە ئەبێ هەر ئەو خاوەنەش حاکم و کاربەدەست بێت، کەواتە هەرکەس حاکمێتی و کاربەدەستی هەر بۆ خوا دانەنێ ئەو کەسە بڕوای بەم ئایەتە بوونەوەری یانە نییە، ئەگەر مەبەست ئایەتەکانی قورئانە، ئەوا ئاشکرایە کە دەقی ئایەتەکانی قورئان بە روون و رەوانی بڕیاری حاکمێتی و کاربەدەستی لە ژیانی ئادەمییدا هەر بۆ خوا ئەدەن، هەر شەریعەتەکەی خوا دائەنێن بە یاسا و شەرع. هەروەها ئەوانە بێ بڕوان بە رۆژی دوایی، چونکە هەرکەسێك بڕوای هەبێ بەو رۆژە هەرگیز ناتوانێ دەست درێژیی بکات بۆ سەر خوایەتی خوا، لاف شتێ لێ بدات کە تایبەتی یە بە خواوە، ئەوەش ماف حاکمێتی بێ چەند و چوونە لە ژیانی بەندەکانی خوادا، ئیتر ئەو حاکمێتی یە لە بڕیارو قەزا و قەدەردا بێت، یان لە شەریعەت و یاسادا بێت، ئینجا شتێکی ئاشکرایە کە هەرکەسێك بەو جۆرە بێت کە باسکرا، بێگومان ئەو کەسە بت پەرستە و هاوبەش رەوا دەرە بۆ خوا، چونکە ئەگەر خوا پەرست بێت بە تاك و تەنیا ماف تایبەتی خوا رەوا نادا بۆ هیچ کەسێکی تر، لە پاش ئەوەی کە هەر حەلاڵ و حەرامکردنێك کە لەلایەن خواوە نەبێ، تاوان و ناهەقی دەرکرد، حەرام و حەلاڵ هەر ئەوەیە کە لە شەریعەتی خوادا هاتبێ، باسی حەرام و حەلاڵی خۆراکی بۆ کردین، لە پاش ئەوە ئەبێ بزانین حەرام و حەلاڵەکانی خوا کامانەن، جا ئەوا لەم ئایەتانی داهاتووەدا بنەڕەت و بناغەی حەرامەکانمان بۆ باس ئەکا لە کردار و لە وتاردا، لەگەڵ ئەوەی کە بنەڕەت و بناغەیە لە چاکەدا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ وەرن با بخوێنمەوە بەسەرتاندا ئەوەی کە پەروەردگارتان حەرامیکردووە لەسەرتان، وا ئەم ئایەتانەتان بەسەردا بخوێنم کە باسی ئەو حەرامانە ئەکات، ئەو حەرامانەی کە پەروەردگارتان حەرامی کردووە، کە هەر ئەوە ماف حەرام و حەلاڵ کردنی هەیە، ئەو حەرامانە باس ئەکات کە هێندێکیان بە وتەی جڵەوگیریی، هێندێکیان بە وتەی فەرماندان بە دژی ئەوەی کە حەرامە، بە پێی داخوازی رەوانبێژیی کە قورئان وا لە پۆپەی هەرە بەرزیدا، دەست پێ ئەکات لە تاوان و حەرامی هەرە گەورەوە کە هاوبەش دانانە بۆ پەروەردگار، ئەفەرموێ: ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾ واتە بخوێنم بەسەرتاندا بەم رەنگە ئەڵێم: هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی خوا، یان هیچ شتێك و هیچ جۆرە لە هاوبەش دانان نەکەن،

هاوبەش لە زاتی پاکیدا، هاوبەش لە سیفەت و نیشانەکانیدا، هاوبەش لە کردەوەکانیدا، هاوبەش لە یاسا و بەرنامەو شەریعەتیدا، هاوبەش لە پەرستن و گوێرایەڵی و فەرمانبەرییدا، هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی هەرچەند لە قەبارەدا گەورە بێ وەك مانگ و رۆژو ئەستێرەکان، یان گەورە بێ لە رێزو قەدردا وەك پێغەمبەران و پیاوچاکان، چونکە هەر شتێ هەر ئەندازەیە گەورە بێ دروستکراوی خوایە و ژێر باری دەسەڵات و ئیرادە و خواهیشی خوایە، گیانلەبەر هەرچەند ژیر و دانا و زانا بێ بەندەی خوایە، کەواتە نابێ لە سنووری بەندەیی دەرکرێ، هیچ جۆرە هاوبەش رەوادان نەکەن، نە هاوبەش رەوادانی گەورە، نە هاوبەش رەوادانی بچووك، بەڵکو پەروەردگار بە تاك و تەنیا دابنێن و وەری گرن لە هەموو بار و روویەکەوە، بێگومان هاوبەش رەوادان و دانان بە هەموو جۆر و شێوەکانی یەوە یەك حەرامە و بنەڕەت و سەرچاوەی هەموو حەرامێکە، یەکەم تاوان و گوناهێکە کە ئەبێ هەموو بێزاری و ئینکاری یەکی ئاراستە بکرێ، هەتا بە رێکی خەڵکی بڕوایان هەبێ و دان بنێن بەمەی هیچ خوایەك نییە بێجگە لەو خوایە کە ناوی(الله) یە، هیچ پەروەردگارێك نییە بێجگە لەو و هیچ حاکم و کاربەدەستێك نییە لە راستیدا بێجگە لەو، هیچ یاسا و شەرع دانەرێك نییە بێجگە لەو، هەرچۆنێ بێ سوژدە و عیبادەت ئەبێ هەر بۆ ئەو بکرێ. دانانی خوا بە تاك و تەنیا لە هەموو بارو روویەکەوە بنەڕەت و سەرچاوەی هەموو چاکە و پیت و فەڕێکە و هیچ عیبادەت و خو و رەوشت و کردەوەیەك جێگەی ناگرێتەوە، کەواتە هەر ئەوە بەجێیە کە هاوبەش رەوادان بۆ خوا بکرێ بە یەکەم حەرام و یەکەم دەست پێکراو لەم ئایەتە پیرۆزانەدا، بێگومان – وەك قورئان لە چەند شوێندا بۆمان باس ئەکات – ئەو یەکەم چینە بت پەرستە کە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا بڕوایان هەبوو بە بوونی خوا، بەوەی خوا داهێنەر و رۆزی دەریانە، خوا هیچ هاوبەشێکی نییە لە دروست کردنی ئەم ئاسمان و زەوی و بوونەوەرەدا، بێگومان ئەو باوەڕە بە تەنیا نرخی نییە و مەردومی پێ رزگار نابێ تا لەگەڵ ئەوەدا باوەڕی نەبێ بە حاکمێتی بێ چەند و چوونی خوا بە تاك و تەنیا، تا باوەڕی نەبێ بەوەی تەنها خوا پەروەردگارە و تەنها خوا کاربەدەست و فەرمان رەوایە، یاسا و بەرنامە و شەریعەت ئەبێ تەنها لە خواوە بێت و وەرگیرێ، ئەمە شتێکی زۆر روون و ئاشکرایە لە

ئیسلامدا لەگەڵ ئەوەدا بە داخەوە شەیتانەکانی(جن) و ئادەمی توانی یان زۆربە بترازێنن لەم ڕێگە ڕاستە، ئەم مەسەلەی پەروەردگارێتی و حاکمێتی خوا لە بیر بەرنەوە و لە هەست و دەروونـدا جیـای بکەنـەوە خواپەرسـتی کـورت هـەڵبهێنن تـەنها لـە نوێـژ و ڕۆژوو و عیبادەتەکانی تردا! جا لەبەر ئەوە ئەبینین تەنانەت ئەوانەی کە دڵسۆز و بە غیرەتن لەسەر ئیسلام، هەر باسی ڕێك و پێك کردنی ئەو عیبادەتانە ئەکەن، یان باسی خو و ڕەوشت ئەکەن، بێزاری دەرئەبڕن لە کردەوە بەدەکان و هێندێ شتی بچووك کە سەرەکی و بنەڕەتی نین، لە پێشەوە خەریکی بناغە و بنەڕەتەکە نابن، بێزاری دەرنابڕن لە بێ شەرعی هەرە گەورەو حەرامی هەرە گەورە کە بریتییە لە ڕەوادانی حاکمێتی بۆ غەیری خوا و ڕاگێر کردن و بەڕێوەبردنی ژیان لەسەر حاکمێتی غەیری خوا و دان نان و گوێرایەڵی بۆ بەرنامە و یاسای ئەم و ئەو و وازهێنان و بێدەنگ بوون لە یاسا و بەرنامەی خوای پەروەردگار! ئەمە دەردێکی یەکجار کاریگەر و کوشندەیە کە پێویستە لەسەر بڕواداران و موسڵمانانی ڕاستەقینە چارەسەری بکەن، لەسەر ئەو بارو شێوەیە کە ئایەتەکانی قورئان لە چەند شوێندا دەست نیشانی بۆ ئەکەن، لە یەکەم وەسیەتدا پەیوەندی و پەیوەستی بەندە دیاریی ئەکات بە پەروەردگاری یەوە، لەسەر ئەو بارو شێوەی کە باسمانکرد، بە بێ ئەوە بەندە ئازادی وەرناگرێ و هەر دەمە بەندەی ئەڵقە لە گوێیە بە شتێ و هەردەمە شوێنی هاوبەشێك ئەکەوێ. نازانێ ڕوو بە لای کوێوە بکات، بە بێ ئەو پەیوەندی یە پاك و خاوێنە دڵ و دەروون و ژیریی پاك نابێتەوە لە نەفامی و باو و عادەت و کردەوەی نەفامی و ژیانی ئازادی و سەربەستی نابێ و ناگونجێ. لە پاش ئەو یەکەم پەیوەندی و پەیوەستییە، ئینجا بە دوای ئەوەدا پەیوەندی و پەیوەستی بە باوك و دایکەوە ئەهێنێ و ئەیکات بە دووەم وەسیەت، وەك لە چەند شوێنێکی تردا هەر بەم جۆرە ئەکات، بەوە نیشانی ئەدات ئەوپەڕی گەورەیی و گرنگی مافی باوك و دایك، ئینجا بە شێوەو دەستەواژەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش و نایاب مەبەستەکە ئەگەیەنێ،

ئەفەرموێ: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ چاکە بکەن بە چاکە کردنێکی تێرو تەواو کە هیچ جۆرە خراپە و ناشایستەیی تیا نەبێت، بەم رەنگە وەك(ئیبن و عەباس) – خوایان لیٚ رازی بێت – ئەفەرموێ: چاکە و کردەوەی چاکیان لەگەڵ بکرێ بە سۆزو بەزەیی و نەرم و نیانی، کەواتە بە قسەی رەق و بیٚ تام وەلاٚم نەدرێنەوە، بە گرژی یەوە سەرنج نەدرێن، دەنگ بەرز نەکرێتەوە بەسەر دەنگیاندا، بەڵکو لەبەر دەمیاندا وەك بەندە لەگەڵ خاوەن و ئاغاکەیاندا بوەستن و خۆیان بە ژێر دەستە و فەرمانبەر نیشان بدەن، فەرمانیدا بە چاکە کردن تا بزانرێ کە تەنها خراپە نەکردن بەس نییە، بەڵکو ئەبیٚ لەگەڵ ئەوەدا چاکەش بکرێ! ئینجا بەدوای ئایەتەکاندا چەند فەرمودەی پێغەمبەریش(ﷺ) هات لەبارەی گەورەیی ماف باوك و دایکەوە، لەناو ئەوانەدا تەنیا حەدیسێك ئەهێنم کە بوخاری و موسلیم و ترمزی و نەسائی ئەیهێنن لە(ئیبن و مەسعود) ەوە کە ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کام کردەوە گەورەترە؟ ئەویش فەرموی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، ئینجا گوتم: ئینجا لە پاش ئەو؟ ئەویش فەرموی: چاکە لەگەڵ باوك و دایکدا، ئینجا گوتم لە پاش ئەو؟ ئەویش فەرموی: جیهاد لە رێگەی خوادا. چاکەی لەگەڵ باوك و دایك پێش خست لە جیهاد و جەنگ و تێکۆشان لە رێگەی خوادا کە گەورەترینی مافە گشتی یەکانە، کەواتە لەپاش ماف خوا ماف باوك و دایك لە هەموو مافێك گەورەترە، کەواتە هەر کەس ئەو مافە زیاە بکات هەموو مافێکی تر زایە ئەکات و چاوەڕوانی خێرو چاکەی لێناکرێ بۆ هیچ کەسێکی تر. ئینجا سیٚ یەم وەسیەت ئەکات بە جڵەوگیریی لە کردەوەیەکی زۆر بەدو خراپ لە کردەوە ناپەسەندەکانی سەردەمی نەفامی عەرەب، ئەوەش بریتییە لە کوشتنی ئەولاد لە ترسی بیٚ نەوایی و نەبوونی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ﴾ ئەولادەکانتان مەکوژن لەبەر بیٚ نەوایی و فەقیریی یە کە

هەتانە، یا لەبەر مەترسی لە فەقیری و نەبوونی یەك كە دووچارتان ببیٚ لەمەوپاش، هێندیٚ ئەفەرمون ئەم ئایەتی ئێرە دەربارەی ئەوانە هاتووە كە دووچاری فەقیری و بیٚ نەوایی بوو بوون و لەبەر ئەو نەبوونی یە ئەولادیان ئەكوشت، ئایەتی سورەتی(الإسراء) كە ئەفەرمویٚ: ﴿خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ﴾ دەربارەی ئەوانەیان هاتووە كە فەقیر و بیٚ نەوا نەبوون، بەلاٚم مەترسییان بووە كە لە داهاتوودا دووچار ببن. لەبەر ئەوەیشە لێرەدا رۆزی خۆیان پێش ئەخات لە رۆزی ئەولادەكان ئەفەرمویٚ: ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ واتە مەیان كوژن لەبەر فەقیری و بیٚ نەوایی یەك كە هەتانە، چونكە ئێمە رۆزی ئێوەو ئەوانیش ئەدەین، بەلاٚم لە ئایەتی سورەتی(الإسراء) دا رۆزی ئەوان پێش ئەخات، ئەفەرمویٚ: ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ واتە مەیانكوژن لەبەر مەترسی فەقیری و نەبوونی كە لە داهاتوودا دووچارتان ببیٚ، بەڕاستی فەرمودەیەكی زۆر جوان و وردە، لەسەر هەر بار لێرەیش و لەوێش ئەم دوو رستەیە سەربەخۆن و هۆی جلەوگیریی یەكەن، واتە كاری وا مەكەن، چونكە ئێمە رۆزی هەردووكتان ئەدەین، نەك ئێوە. كەواتە ئەوەی كە ئەیكەن بەهۆی ئەو كردەوە بەدە ناڕاست و بیٚ جێیە، بە هەرحالٚ و لەسەر هەربار مەبەست لە باسی ئەو هۆیە تەشەردانە و لەكەدار كردنیانە بەوەی كاری وا بەد ئەكەن لەبەر ئەو شتە ناڕاست و بیٚ جێیە، كەواتە ئەوە ناگەیەنیٚ كە ئەو كردەوە قەیناكات ئەگەر لەبەر ئەو هۆیە نەبیٚ، خوای پەروەردگار لە هەموو كەس میهرەبانترە، لەبەر ئەوە وەسیەت ئەكات بۆ ئەولادەكان بە پاراستنی ماف باوك و دایكەكان، وەسیەتیش ئەكات بۆ ئەوان كە پارێزگاری ئەولادەكانیان بكەن، وەسیەتەكەی پەیوەست ئەكات بە خوایەتی خواو پەرستنی خواوە، تا زۆر بە توندی گوێرایەلٚی فەرمانەكەی بكریٚ. لە پاش ئەوەی وەسیەتی كرد بە خانەوادە و خێزان، ئینجا وەسیەتیان بۆ ئەكات بە یاسا و رژێمیٚ كە لەسەری بن، رژێم و یاسای پاكی و خاوێنی و داوێن پاكی،

﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ﴾

**ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ﴾ نزیکی گوناهو کردەوە زۆر بەدەکان مەکەونەوە، واتە زینا و داوێن پیسی بە هەموو جۆرەکانی یەوە، وەك دەرئەکەوێ لەمەی کە بە دواییدا ئەمە ئەکات بە بریتی ﴿ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ ئەوەی کە دەرئەکەوێ و ئاشکرایە لەو گوناهانە و ئەوەی کە ئاشکرا نییە و نهێنی یە وەك باو بووە کە جێ و شوێنی تایبەتی بووەو ئالآی بۆ بەرز کراوەتەوە بۆ هەرکەس مەیلی کردبێ لەوانەی کە ماقوولْ نەبوون ئاسایی بوون، ئەوەی کە ماقولْ بووبێ بە دزی یەوە، دۆستی راگیر کردووە بۆ ئەو کارە بەدە، بە کۆ ئەفەرموێ لەبەر زیادە رەوی کردن لە بەدیی و خراپەکەی دا یان بە پێی ئەو کەسانەیە کە ئەو کارە بەدە ئەکەن، یان بە پێی جۆرەکانی یەتی، وەك ئاماژەمان بۆ کرد، لە(ئیبن و عەباس و ضحاك و سدی) شەوە بەو جۆرە ریوایەت کراوە، لەسەر هەر بار بێگومان نێربازیی لەو گوناهە زۆر بەدو ناشرینانەیە، ئینجا زۆر بەجێیە هێنانی ئەم گوناهە بە دوای گوناهی پێشوودا، چونکە لە راستیدا ئەم گوناهە هەرچۆنێ بێ تاوانێکی گەورەیە لە خۆیدا، هەروەها بەشێکە لە کوشتنی ئەولاد، چونکە ئەو کارە بەدە ئەگەر ئەولادی لێ پەیدا ببێ ئەوە لە سوکی و بێ نرخیدا وەك مردوو وان، ئەگەر لێشی پەیدا نەبێ ئەوا ئەو تۆمە پاکە ئەکوژێ و هەولْ نادا بەکاری بێنێ لە جێگەو شوێنی پاك و خاوێندا کە ئەگەر بەرهەمی لێ پەیدا بوو، بە نرخ و بەرێز سەیر بکرێ و دابنرێ، جڵەوگیریی کردن لە نزیك کەوتنەوەی ئەو گوناهە، یان لەبەر زیادە رەوی کردن و توند و تیژیی بەکار هێنانە لە جڵەوگیریی کردن لەو گوناهەدا، یان هەر مەبەست جڵەوگیریی یە لە نزیك کەوتنەوە بە بەکار هێنان و کردنی سەرەتای ئەو تاوانە، وەك تێکەڵی و سەرنج دان و ماچ و دەست لێ دان کە پاڵدەرن بۆی، هەروەها بەهێز تر ئەو رووتی و بەرەڵآیی و سینەمای بەدو بێ ناموسی و ئەو هەموو شتە جۆر بە جۆرانە کە لە**

سەردەمی نەفامی تازەدا داهات و بەکار ئەهێنرێن، بەهەرحاڵ زۆر پێویستە توندو تیژیی بەکار هێنان لەبارەی ئەو تاوانەوە، چونکە شتێکی روونە هەر گەل و کۆمەڵێك ئەو تاوانەی تێدا بلاو ببێتەوە بە تەواوی لەکار ئەکەوێ و کەڵکی هیچی نامێنێ. هەرکەس نەشارەزایە با بڕوا سەرێك بدا لەو ولاتانەی کە ئەو کارو کردەوە پیسانەی تیا باوە، یان تەماشای رۆژمانە و گۆڤارەکان بکات ئەو هەموو بەسەرهات و رووداوانە بزانێ کە بلاو ئەکرێنەوە، ئەو هەموو بێزاری یە دەرئەبڕن لە بلاو بوونەوەی ئەو گوناهو کارە بەدانە، ئینجا دێتە سەر پێنجەم وەسیەت ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ مەکوژن هەر نەفسێ و هەرکەسێك کە خوا کوشتنەکەی حەرام کردووە، مەگەر بە حەقیانەت و بەپێی فەرمانی خوا، واتە مەیکوژن لە هیچ حاڵێکدا، بە هیچ هۆیەك مەگەر لە حاڵێکدا و بە هۆیەك کە ئیسلام رەوای دابێ، بەم رەنگە جەنگ بکات لەگەڵ ئیسلامدا، یان کەسێکی کوشتبێ بەناهەق، یان لەئیسلام پاشگەزبووبێتەوە،یان لەدەوڵەتی راستەقینەی ئیسلام، یان زیناکەرێك بێ کەشایستەی بەردە باران بێ وەك دیارییکراوە لە کتێبی زاناکانی ئیسلامدا، لەقورئاندا زۆرجارجلەوگیریی ئەکات لەسێ گوناە بە دوای یەکدا: هاوبەش رەوادان بۆخوا، کوشتنی ناهەق، زینا، لە راستیدا ئەم سێ گوناهە کوشتنی تێدایە! یەکەم کوشتنی سروشتە، دووەم دیارە کوشتنی راستەقینەیە، سێ یەم کوشتنی گەل و کۆمەڵە. هەر سروشتێ لەسەر تاك وتەنیایی نەبێ ولەسەرئەوبارە نەژیی، ئەو سروشتە مردووە، هەر گەل و کۆمەڵێك کوشتنی تیا بلاو ببێتەوە بەرەو نەمان ئەڕوا، هەر گەل و کۆمەڵێك داوێن پیسی تیا بلاو ببێتەوە گەل و کۆمەڵێکی مردووە، ئەبێ داڕزێ و لەناو بچێ، شارستانێتی ئیغریقییەکان و رۆمانی یەکان و فارسەکان بەڵگەو شایەتێکی ئاشکران لەسەر ئەوە، سەرەتای رووخان و داڕزان لە شارستانێتی رۆژئاوایی یەکاندا بەدی ئەکرێ و نیشانەیە لەسەر ئەوە کە ئەمانیش ئەچن بەدوای ئەوانەی پێش خۆیاندا و هەر ئەو دوا رۆژو چارەنووسەیان ئەبێ، هەق وایە لەم رووداوە مێژوویی یانەوە هەموو گەل و کۆمەڵێك تەمێ خوار ببێ،

ئینجا لەبەر زۆر گرنگی ئەم پێنج فەرمان و وەسیەتە جوێی کردنەوە لە وەسیەتەکانی تری داهاتوو، بە تایبەتی دڵنیایی لەسەر کردن و فەرمان و وەسیەت و تەمێی ئاراستە کردین و فەرموی: ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ﴾ ئەم شتە گرنگەی کە باسکرا خوا داوای کرد لێتان بە توندی و وەسیەتی پێکرد بۆتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بەڵکو ژیر بن و بفامن و ژیریی خۆتان بەکار بێنن لە بەرگریی کردنی خۆتان لە کردنی ئەو تاوانە گەورانە، کە هەرکەس ژیر بێت ئەزانێ بەدی و خراپی ئەو شتە حەرامانە، ئەم وەسیەتانە دە شتن، بە سێ ئایەت باسی کردن، لەم ئایەتی پێشووەدا پێنجی کۆ کردەوە کە پەیوەندی و پەیوەستی یان پێکەوە بەهێزترە، وەك لەم دوو ئایەتی تردا ئەو پێنجەکەی تری کۆکردەوە کە ئەمانیش زیادە پەیوەستی یان پێکەوە هەیە، بێگومان هەتیو لاوازو بێ دەسەلاتە، لە سەردەمی نەفامی و لەناو ئەو گەلە نەفامانەی یەکەمدا هەتیو بەش خوراو و ستەم لێکراو بوو، وەك دەرئەکەوێ لە چەند ئایەتێکەوە، جا ئەوا خوای میهرەبان یەکێکی بە هەتیوی پەروەردە کرد، گێڕای بە گەورەترینی دروستکراوەکانی، کردی بە رابەرو فروستادە بۆ سەر هەمووان پەیام و ئایینێکی گشتی و هەتا هەتایی پیا نارد، بەندێ لەو پەیام و ئایینە بریتییە لە چاودێریی و سەرپەرشتی و پەروەردە کردنی هەتیو بەم جۆرو شێوەی کە لەم بەشەدا کردی بە یەکەم فەرمان و وەسیەت و فەرموی: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە بە هیچ رەنگ مەگەر بە شێوەو کردەوەیەك کە جوانتر و چاك ترە، وەك پاراستن و هێنانە بەرهەم و گەشە پێدانی هەتا ئەو هەتیوە گەورە ئەبێت و ئەگاتە هێزو توانای خۆی لە لەش و ژیرییدا، واتە بەو جۆرە پارێزگاری ئەو ماڵە بکەن و مەیخەنە ژێر دەستیان هەتا ئەو کاتە، ئەو کاتە کاتی باڵغ بوونە، یان گەیشتنە تەمەنی هەژدە ساڵ، یان بیست و پێنج، یان هەر چەند وەك لە کتێبی مەزهەبەکاندا باسکراوە. بەڵام لەسەر هەر بار بە مەرجێ ژیر و لێزان بێ و بتوانێ هەڵسێ بە کاروباری خۆی و ماڵەکەی، وەك لە سورەتی(النساء) دا بە درێژیی کرا،

وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾

**ئینجا حەوتەم وەسیەت کە دووەمە لەم بەشەدا ئەمەیە کە ئەفەرموێ:** ﴿وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ﴾ **لە کڕین و فرۆشتندا پێوانە و کێشانە بە تەواوی بەجێبێنن بە ڕێکی و بە دادو یەکسانی، بێگومان هەڵسان بەم فەرمانە بە ڕێك و ڕاستی زۆر زەحمەتە بەدی نایەت لە زۆربەی شتەکاندا بە بێ کەم و کوڕی لەبەر ئەوە جێی مەترسییە بۆ لە خوا ترسەکان، جا لەبەر ئەوە خوای میهرەبان بارو ئەرکی دڵ سووك ئەکات بەم ڕستەیە کە بە تێهەڵکێش ئەفەرموێ:** ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ **داوا لە هیچ کەسێك ناکەین و هیچ ئەرکێك ناخەینە سەرشانی مەگەر ئەوەی کە لە توانای دایە، واتە لێ ئەبورین و چاوپۆشی ئەکەین لە هەر کەم و کوڕی کێشانە و پێوانە کە بە دەستی ئەنقەست نەبێ و خۆپارێزیی لێی قورس و گرانە، لە میهرەبانی یەکەی بەزیاد بێ، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست لەم ڕستەیە هاندانە لەسەر ئەم فەرمانانە و دڵنەوایی کردنی بەندەکانە بەمەی ئەم داوا و فەرمانانە لە توانادایە و هیچ کەس دڵگران نەبێ لێیان، بەم ڕەنگەش هەر باشە و بەڵام یەکەم چاکترو بەهێزترە لە دڵدا، با بیر بکەینەوە لێرەدا کە چۆن مەسەلەی ئاڵ و گۆڕی بازرگانی و کێشانە و پێوانەی پەیوەست کردووە بە پەرستنی خواو عەقیدە و خوا وەسیەتی پێ ئەکات، وەك وەسیەت ئەکات بە پەرستنی خواو دوورکەوتنەوە لە هاوبەش ڕەوادان، بە پێچەوانەی بۆچوونی نەفام و نەزانەکانی کۆن و تازە کە عەقیدەو عیبادەت جوێ ئەکەنەوە لەو شتانەی کە پەیوەندی یان هەیە بە ژیانی ئەم جیهانەوە لە کاتێکدا لە ئایین و شەریعەتەکانیدا – بە تایبەتی ئەم دواترینەیان – هاتوون بۆ ئەوەی جڵەوی ژیان و جیهان بگرنە دەست و هەر ئەوان خاوەن و دانەری بەرنامە و یاسا بن لەم جیهانەدا، ئینجا دێتە سەر هەشتەم وەسیەت کە سێ یەمی ئەم بەشی دووەمەیە، ئەفەرموێ:** ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟﴾ **کاتێ وتەو قسەیەك ئەڵێن، ئیتر لە بڕیارو حوکمێکدا یا شایەتی یان هەرچی، ڕاست بکەن و داد و ڕاستی بەکار بێنن و هەق و ڕاست بڵێن** ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾ **ئیتر با ئەو قسە و بڕیار بۆ دراوەکە، یان بە دژو لەسەر**

دراوەکە خاوەن و خزمایەتی هەبێ پێتانەوە، بەو جۆرە شێوەیە ئیسلام ئەیەوێ دڵ و دەروون و ویژدان بەرز بکاتەوە، دەستی ئەگرێ لە هەر شوێنێکدا کە لەوانە بێ هەڵخلیسکێ و هەڵە بکات تیایدا، وەك ئەمە کە بەهۆی خزمایەتی یەوە دووچاری ناهەقی و هەڵە ببێ لە حوکم و بڕیار یان لە شایەتیدان، بۆ خزمەکەی یان بە دژی، کە بەڕاستی ئەو خزمایەتی یە هۆ و پاڵدەرێکی بەهێزە بۆ هەڵە و ناهەقی پێکردن، مەگەر بۆ کەسێك کە لە خواترس بێت و هەر چاو ببڕێتەوە رەزامەندی خواو ئیتر گوێی لە هیچی تر نەبێ، ئەو کاتە هەر بە پێی ئەم فەرمانی نۆیەم ئەجوڵێتەوە کە چوارەمە لەم بەشی دووەمەدا، هەموو وەسیەتەکانی تر ئەگرێتەوە، بەڵکو لە رووی راستیدا هەموو شەریعەتی خوا ئەگرێتەوە، کەئەفەرموێ: ﴿وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ﴾ بە عەهدو پەیمانی خوا هەڵسن و رەفتار بکەن بە جێی بێنن، واتە هەر شتێ کە خوا وەسیەتی پێکردبێ و فەرمانی پێ دابێ و رەزامەندی خوای لەسەر بێ، یان مەبەست ئەم وەسیەتانەیە کە لێرەدا هاتوون، یان هەر عەهدو پەیمانێ کە بەندە لەگەڵ خوادا بەڵێن و بڕیاری ئەدات و پێویستی ئەکات لەسەر خۆی و شەرعی بێت. هەرکام لەمانە رای هێندێ لە زانایانە و هەرکام هەڵئەگرێ و لەسەر رای یەکەم پێش خستنی وتەی عەهد لەبەر گەیاندنی کورت هەڵهێنانە، واتە هەر بە پەیمانی خوا هەڵسن و بەجێی بێنن، لەسەر ئەم دوو راکەی تر پێش خستنەکەی لەبەر گەیاندنی گرنگی و بە گرنگ گرتنە، وەك لە کتێبەکانی تەفسیردا باسکراوە. ئینجا بەدوای ئەم فەرمانانەدا ئەم فەرمودە گرنگە ئەهێنێ: ﴿ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ ئەم شتە گرنگەی کە باسکرا خوا داوایکرد لێتان و وەسیەتی پێکرد، بەڵکو بیر بکەنەوە تێفکرێن تێیدا و رەفتاری پێبکەن، پێنج وەسیەتەکەی پێشووی کۆتایی هێنا بە وتەی ﴿لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ چوارەکەی ئێرەی کۆتایی هێنا بە وتەی ﴿لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ لەبارەی هۆی ئەوە زانایان چەند شتێکیان فەرموە هەرکام لەوانە هەڵئەگرێ، لەناو ئەوانەدا فەرمودەی ئیمامی رازی بەلامەوە پەسەند ترە لەبەر ئەوە هەر باسی ئەو ئەکات: ئەو پێنجە یەکەم شتێکی روون و ئاشکران هەرکەس ژیر بێ سەرپێچی یان لێناکات، بەڵام ئەم چوارەی دوایی روون و ئاشکرا نین و پێویستی یان هەیە بە بیر لێ کردنەوە و تێفکرینێکی زۆر، ئینجا دێتە سەر وەسیەتی دووەم کە هەموو وەسیەتەکانی تری تیایە و ئەبێتە دووبارە کردنەوە بۆیان بە شێوەیەکی زۆر بەهێزو سەرنج راکێش،

وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً

---

**ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا﴾ خوێندنەوەی ئێستا بەسەرە باوەو پێنج لە حەوت خوێنەرانی قورئانی لەسەرە، دوانیان کە(حمزة و کیسايي) یە بە ژێرە خوێندوویانەتەوە، لەسەر ئەمەی کە ئێستا باوە لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێن: لەبەر ئەوەی ئەمە رێگەی منە لە کاتێکدا راستە و هیچ جۆر چەوتی تیا نییە، ﴿فَٱتَّبِعُوهُ﴾ پەیرەوی بکەن و بکەونە شوێنی و بیدەنە بەر، ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ شوێنی رێگەکانی تر مەکەون و مەیاندەنە بەر تا بەش بەشتان بکات بە وڵاتاندا لە رێگەکەی خوا کە راستە و تاقە رێگەیەکە، لەسەر خوێندنەوەی بە ژێرە فەرمودەیەکی سەربەخۆیە و هاتووە لەم دواترین وەسیەتەدا کە سەرچاوەی هەموو وەسیەتێکە چ ئەمانەی رابردوو، چ هەر وەسیەتێکی تریش، لەسەر هەر بار وتەی(هذا) دەست نیشانە بۆ قورئان یا شەرعەکەی پێغەمبەر(ﷺ) وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – ریوایەت کراوە، ئەمە بە رێگەی خوا دائەنرێ، چونکە دایهێناوە و ناردوویەتی، بە رێگەی پێغەمبەریش(ﷺ) دائەنرێ، چونکە لە یەکەمجارەوە بۆ سەر ئەو هاتووە و ئەو راگەیەنەریەتی، بە رێگەی بڕوادارانیش ناو ئەبرێ لەبەر ئەوەی بڕوایان پێی هەیە و پەیرەوی لێئەکەن،(مقاتل) ئەفەرموێ: دەست نیشانە بۆ ئەم نۆ وەسیەتەی کە تێپەڕیان کرد لەم دوو ئایەتی رابردووەدا، هێندێ ئەفەرمون: دەست نیشانە بۆ ئەوەی لەم سورەتەدا باس کراوە کە زۆربەی باسی تاك و تەنیایی خوایە و پێغەمبەرێتی و ئەم شەریعەتە، هەرچەند بەم دوو جۆرەیش هەر ئەگونجێ، بەڵام رای یەکەم بەهێز ترە، چونکە رای(ئیبن و عەباس) ە کە بەناوبانگە بە(ترجمان القرآن) بەشی دووەمی ئایەتەکە: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ﴾، زۆر رێك و پێك ترە لەگەڵ ئەم رایەدا، هەروەها حەدیسێ کە ئیمامی**

ئەحمەدو نەسائی و کۆمەڵێك ئەیهێنن لە(عبدالله ی کوڕی مەسعود) ەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) خەت وهێڵێکی راستی بەدەستی خۆی کێشاوئینجا فەرموی: ئەمە رێگەی خوایە کە راست و چەپی هێڵە راستەکەی کێشا، ئینجا فەرموی: ئەم رێگایانە هیچ کامیان نییە شەیتانێکی بەسەرەوە نەبێ کە بانگ ئەکات بۆلای. ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ﴾، ئەم حەدیسەش هەر ئەوە ئەگەیەنێ کە لە(ئیبن و عەباس)ەوە – خوایان لێ رازی بێت– هاتووە﴿ذَٰلِكُمْ﴾ ئەو شوێن کەوتن و پەیڕەوی رێگەی خواو واز هێنان لە رێگەکانی تر ﴿وَصَّاكُم بِهِ﴾ خوا فەرمانی پێدا و وەسیەتی ئێوەی پێکرد ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو خۆتان بپارێزن لە تۆڵە و ئاگری خوا بە شوێن کەوتنی تەنها رێگەی خوا و دوور کەوتنەوە لە هەر بەرنامە و رێگەیەکی تر، بەڵێ بەڕاستی وەسیەت لەمە بەنرخ تر و باشتر نابێ، خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتیمان بدات تا بەهرەمەندمان بکات بەم وەسیەتە پیرۆزە، ترمزی و ئیبن ولمونزیر و چەند کەسێکی تر لە(ئیبن و مەسعود) ەوە ئەگێڕنەوەکەفەرمویەتی: هەرکەسێك پێی خۆشە سەرنجی وەسیەتی محمد(ﷺ) بدا بە مۆرەکەیەوەبائەم ئایەتانە بخوێنێتەوە: ﴿قُلْ تَعَالَوْا .... لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾،(ئیبن و حەمید و ئەبو شێخ و حاکم) لە(عیبادەی کوڕی سامیت) ەوە ئەم حەدیسە ئەهێنن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: کام لەئێوەپەیمانم پێ ئەدالەسەرئەم سێ ئایەتە،ئینجاهەرکەس هەڵئەسێت پێیان ئەوەئەجرو پاداشتی لەسەر خوایە، هەرکەس کەم و کوڕی یان لێئەکات و شتێکیان لێ بەجێناهێنێ، ئینجا خوا لە جیهاندا دووچاری بکات، ئەوە ئەبێ بە تۆڵەی، هەرکەسێکدوا بخات و دووچاری نەکات، کاری ئەو کەسە ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، ئەگەر ویستی ئەیگرێ و تۆڵەی لێ ئەسێنێ،ئەگەرویستی لێی ئەبورێ، داوای میهرەبانی و لێبوردن ئەکەین لە خوا.

ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند شتێکی گرنگ و چەند مەسەلەیەك، بە چەند جۆر و شێوەیەك کە رێك و پێك و پەیوەستە لەگەڵ ئەو مەسەلە و جۆرو شێوەیانەی کە لە سورەتەکەدا هاتوون، وەك بە جوانی روون ئەبێتەوە لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا لە یەکەمجارەوە باسی نامەی موسا ئەکات کە رێگەی خوایە بە وێنەی

قورئان، تا بزانرێ ئەم ڕێگەی خوا کە لە ئایەتی ڕابردوودا باسکرا، درێژە دان بووە بەوەی کە لە نامە و پەیامەکانی لەمەو پێشدا هاتووە کە نزیك ترین پەیام و شەریعەت شەریعەتی موسایە کە لە تەوراتدا هاتووە، بێگومان ئینجیلیش وەك تەوراتە - کەواتە باسی تەورات وەك باسی ئینجیلیش بێ وایە، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ﴾ لەبارەی پەیوەستی ئەم وتە و تەفسیری ئەم ڕستەیە کە بە دوایدا دێت پێنج شەش بارو ڕا هەیە و گوتراوە، لەناو ئەوانەدا، دوانیان باس ئەکەم کە هەردووکیانم بەلاوە چاکە و چاکترە لەوانی تر کە باسم نەکردن، ڕاو باری یەکەم ئەمەیە کە وتەی ﴿قُلْ﴾ بڕیار ئەدرێ لە پاشی یەوە و پەیوەستە بە ﴿قُلْ﴾ لە ئایەتی ﴿قُلْ تَعَالَوْا﴾ دا، واتە ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ بەو خەڵکە وەرن با بخوێنم بەسەرتاندا ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە لەسەرتان و وەسیەتی پێکردووە بۆتان کە ئەوانە بوون باسکران، ئینجا لەپاش ئەوە پێیان بڵێ و هەواڵیان بدەرێ کە ئێمە بەخشیمان بە موسا نامەیەك کە تەوراتە و ئەویش وەك ئەم قورئانە شەریعەتێکی تێرو تەواو بووە بۆ چەرخی خۆی هەرچۆنێ ئەم قورئانە تەواو ترین شەریعەتە بۆ هەمووان هەتا هەتایە و ئەو وەسیەتانەی تیایە لە یەکەم جارەوە و لە پاشان بە درێژیی شتەکانی تر باسکراوە، بە وێنەی قورئان کە لەم سورەتە مەککەیی یەدا ئەم وەسیەتانە هاتن و لە پاشان لە سورەتە مەدینەیی یەکاندا شتەکانی تر هاتن، کەواتە وتەی ﴿ثُمَّ﴾ بۆ ئەوەیە کە ئەم ڕاگەیاندنە لەپاش ڕاگەیاندنی پێشووە، ڕای دووەم ئەمەیە کە پەیوەستە بە ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ﴾ واتە ئەوەی کە باسکرا خوا وەسیەتی پێکرد لەسەر زمانی هەموو فروستادەکان، ﴿ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئێمە بەخشیمان بە موسا ئەو نامە گرنگە ﴿تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ﴾ لەبەر تەواو کردنی چاکە و بەهرەمان بەسەر کەسێك کە بە چاکی هەڵسابێ بە مافی ئەو نامەیە لە ڕاگەیاندن و ڕێنموونی پێ وەرگرتنی و ڕەفتار پێ کردنی. واتە موسا یان هەرکەسێك ﴿وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾ لەبەر باس کردنی هەموو شتێك بە ڕوونی لەو شتانەی کە لە ئایینەکەدا پێویستن ﴿وَهُدًى﴾ لەبەر ڕێ نیشاندان و ڕێنموونی حەق و ڕاستی ﴿وَرَحْمَةً﴾ لەبەر میهرەبانی کردن بە مەردوم و بەوانەی کە ئەو نامەیان بۆ هات

لَعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيۡنِ مِن قَبۡلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوۡ تَقُولُواْ لَوۡ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡۚ

---

**﴿لَعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ﴾بەڵكو ئەوانە بڕوا بێنن بە گەیشتنیان بە حوزوری پەروەردگاریان وبەحیساب وپرسیاروتۆڵەو پاداشتیان لەڕۆژی دواییدا ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ﴾ ئەم قورئانە نامەیەکی گەورەیە ﴿أَنزَلۡنَٰهُ﴾ کە ئێمە هێنامانە خوارەوە ﴿مُبَارَكٞ﴾ پیت و فەڕ تێخراوە و زۆر پیرۆزە ﴿فَٱتَّبِعُوهُ﴾ کەواتەپەیڕەوی بکەن و شوێنی کەون ﴿وَٱتَّقُواْ﴾ خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی و ڕەفتارکردن بەپێچەوانەی ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾بەڵکومیهرەبانیتان پێ بکرێ، بە ئومێدو چاوەڕوان لەوپەیڕەوی وخۆپاراستنەدا،ئەونامەمان نارده خوارەوە بۆ سەرتان ﴿أَن تَقُولُوٓاْ﴾ لەبەر ئەوەی نەڵێن. یان لەبەربێزاری لەوەییان بەرگریتان لەوەی بڵێن لە ڕۆژی دواییدا ﴿إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيۡنِ مِن قَبۡلِنَا﴾ نامەهێنرایەخوارەوەهەربۆ سەر دوو کۆمەڵ لە پێش ئێمەدا ﴿وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە بێ ئاگابووین لە فێر کردن و خوێندنی ئەوان و نامەکەیان، چونکە زمانی ئەوانمان نە ئەزانی و تێی نەئەگەیشتین ﴿أَوۡ تَقُولُواْ﴾ یان بڵێین: ﴿لَوۡ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡۚ﴾ ئەگەر ئێمە نامەمان بۆ بهاتایە و بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەرمان بێگومان ئێمە ڕێنموونیمان وەرگرتووە ئەبووین و لەوان باشتر ڕێگەی خوامان ئەدایە بەر، خوای پەروەردگار ویستی فروستادەکانی ڕەوانە بکات بۆ سەر گەل و ئوممەتەکان بە زمانی خۆیان، هەتا کاتی ناردنی دواترین پەیام، لەوێدا دواترین فروستادەی نارد بۆ سەر هەمووان بەم قورئانەوە، دیارە ئەم فروستادە کە عەرەبە و لەناو عەرەبدا بووە ئەبێ نامەکەی بە زمانی عەرەبی بێت، ئینجا لە پاش وەرگرتن و تێگەیشتن و ڕەفتار پێکردنی ئەو یەکەم گەلە بە ئاسانی ئەم نامە عەرەبییە ڕاڤە کراو وەرگێڕدرا بە زمانەکانی تر، دیارە نەئەگونجا ئەو فروستادەیە کە هات بۆ سەر هەمووان نامەی بهێنایە بە زمانی هەمووان، کەواتە ئەبوو هەر بە زمانی عەرەبی بهاتایە، ئینجا بە ناردنی ئەم نامەیە بە عەرەبی ڕێگە نەما بۆ عەرەبەکان هیچ بڵێن و ڕێگەی ئەو بڕو بەهانانەیان لێ بەسترا کە قورئان دەست نیشانی بۆ کرد،**

فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿فَقَدْ جَآءَكُم﴾ واتە ئەو بەهانەیە نەهێننەوە، ئەگەر ئێوە راست ئەکەن لەو گەزافەی کە لێتان ئەدا ئەوا هات بۆتان ﴿بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بەڵگەو نیشانەیەکی روون لەلایەن پەروەردگارتانەوە کە ئەم قورئانەیە و بە زمانی خۆتان هات، موعجیزەیەکی ئاشکرایە، ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ رێنموونی و رێ نیشاندانێکی گرنگە و میهرەبانی یەکی گەورەیە لە هەردوو جیهاندا ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەواتە ئایا کێ ستەم کار ترە لەو کەسەی کە بڕوای نەهێنابێ بە ئایەتەکانی خواو بە درۆیان دابنێ، ﴿وَصَدَفَ عَنْهَا﴾ روو وەرگێڕێ لێیان و لاملیان بکات و بەرگری مەردومی لێبکات؟ واتە هیچ کەس لەو کەسە ستەم کار تر نییە، لەبەر ئەوە ئەم هەڕەشە سەخت و سامناکەیان ئاراستە ئەکات ﴿سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾ بێگومان تۆڵە ئەسێنین لەوانەی کە لا ئەدەن و بەرگری ئایەتەکانی ئێمە ئەکەن، تۆڵەیان لێئەسێنین بە سزای بەدو بەتین ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ﴾ بەهۆی ئەو لادان و رێگریی و بەرگرییەی کە کردیان و تاوانەکەیان. وشەی ﴿صدف﴾ لە زمانی عەرەبدا نەخۆشی یەکە کە دووچاری حوشتر دێت، بە جۆرێ رەوتی لێ تێك ئەدات و ناتوانێ بە رێك و راستی بڕوا، کەواتە لەم وتەیەدا دەست نیشان هەیە بە سووك و ریسوا کردنیان، وەك لە وشەی ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ﴾ لە سورەتی ﴿الأنبياء﴾ دا. کە دەست نیشانی تێدایە بە نەخۆشی یەك کە دووچاری حوشتر ئەبێ و ملی رەپ و رەق ئەکات و ناتوانێ بە ئاسانی لا بکاتەوە، هەروەها لە چەند شوێندا وتەی ﴿حبط﴾ بەکار ئەهێنێ بۆ کردەوەی بێ بڕواکان کە ئەمەش بریتییە لەوەی سکی مالاًت – بەهۆی گیای ژاریەوە – با بکات تا ئەتەقێ، بەو جۆرە دەستەواژەکانی قورئان کاریگەرە و سزای دەروونی تێدایە، وەك لە چەند جێگایەکی تردا بە**

پێچەوانەی ئەمانە ڕێز ئەگەیەنێ و خۆشی ئەدات بە دڵ و دەروون، ئینجا بەهۆی سەرکێشی ئەو بێ بڕوایانە و داواکردن و پەڵپ گرتنیان بە هێندێ موعجیزەو بیر نەکردنەوەیان لە قورئان کە گەورەترین موعجیزەیە، هەنگاوێکی تر ئەنێ لە ئاراستە کردنی هەڕەشەیەکی تری سامناك بۆ ترساندن و دەم کوت کردنیان، هەرچۆنێ لە سەرەتای سورەتەکەوە وێنەی ئەم هەڕەشەی ئێرەی ئاراستە کردن بەهۆی سەرکێشی و روو وەرگێڕانیان لە بڕوا هێنان.

ئەفەرموێ: ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئایا ئەو بێ بڕوایانە چاوەڕوانی هیچ شتێ ئەکەن و بە تەمای هیچ هەن بێجگە لەوەی کە فریشتە بێتە لایان بۆ گیان کێشانیان یەك بە یەك، یان فریشتەی سزادان و لە ریشە دەرهێنانیان، ئەوەش بە پێی باوی خوا لە گەلە پێشووەکاندا کە هەرکاتێ بێ بڕوایان پەڵپی موعجیزەیەکیان گرتبێ و پاش بەجێهێنانی بڕوایان نەهێنابێ، خوا لەناوی بردوون و لە ریشەی دەرهێناون. واتە ئەمانیش وەك پێشووەکان ئەبێ لەناوچن. ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ﴾ یان خوای تۆ بێت ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، واتە ئەو بەڵێنەی کە دای بە تۆ لە سەرخستن و زاڵ کردنی تۆ و ئایینەکەت و ژێر خستن و ریسوا کردن و لەناوبردنی دوژمنەکانتدا، یان فەرمان و بڕیاری خوای تۆ بێت بە سزادان و تۆڵە سەندن لێیان، یان مەبەست هاتنی خوایە بە بێ چەند و چوون و بێ وێنە بەڵکو بەو جۆرو شێوەی کە شایستەیە و خوا خۆی ئەزانێ کە ئەمە نزیکە لە مەزهەبی سەلەفەوە، یان هەر بە رێکی مەزهەبی سەلەف ئەگرین بەم رەنگە حەواڵەی خوای ئەکەین و رووکەشەکەی ناگرین، ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ﴾ یان هێندێ لە موعجیزە و نیشانە ئاشکراکانی پەروەردگارت بێت؟ ئایا مەبەست بەم هێندە ئەوانەیە کە خۆیان داوایان ئەکرد وەك لە سورەتی(الأسراء) دا ئەیگێڕێتەوە لێیان، هاتنی نامەیەك لە ئاسمانەوە کە خۆیان بیخوێننەوە، یان کانی و چەشمەیان بۆ هەڵقوڵێ... هتد؟ ئایا مەبەست ئەمە بێ وەك هێندێ ئەفەرمون. ئەو کاتە پرسیارەکە بۆ لاقرتی پێکردنیانە؟ یان مەبەست نیشانە گەورەکانە کە روو ئەدەن و نیشانەی نزیکی هاتنی رۆژی دوایین وەك لە چەند ریوایەتێکدا هاتوون، یەکێ لەوانە حەدیسی حوزەیفە یە کە ئەفەرموێ: جارێك پێغەمبەر(ﷺ) هات و ئێمە قسە و باسمان ئەکرد، ئەویش فەرموی: قسە و باس لە چی ئەکەن؟ ئێمەش گوتمان لە رۆژی دوایی، ئەویش فەرموی:

بێگومان ئەو ڕۆژە نایەت هەتا دە شت نەبینن لە پێشی یەوە: ئەو دوکەڵەی کە خەڵکی داگیر ئەکات، دەجال، عیسای کوڕی مەریەم، یأجوج و مأجوج، دابة الأرض، هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، سێ ڕۆچوونە خواری گەورە، یەکێ لە ڕۆژهەلآت و یەکێ لە ڕۆژئاوا، یەکێ لە جزیرەی عەرەب، دوای ئەوانە ئاگرێکە لە یەمەن خەڵکی ئەفرێنێ بۆ شوێنی کۆبوونەوەی بەناوبانگ، لەسەر ئەم بارە پرسیارەکە بۆ ئینکارە، واتە نەخێر ئەوانە چاوەڕوانی ناکەن بۆ یەکێ لەوانە نەبێ کە باسکران، یان بۆ تەفریوە، واتە بەڵێ چاوەڕوانی یەکێ لەوانە ئەکەن، بە هەرکام مەبەست چیرۆکە، واتە لەبەر ئەوەی لە ڕاستیدا لە پێش دەم ئەوانەدا یەکێ لەو سیانە هەیە کە باسکران، ئەوانە وەك چاوەڕوانییە لەو سێ شتە بن وان، ئینجا هێندێ لەو نیشانە ڕوونانە بە جۆرێکن مەردوم ناچار ئەکەن بە بڕوا هێنان و بە بێ هەوڵ و دەسەلآتی خۆیان لەو کاتەدا بڕوا ئەهێنن، هەرچەند ئەو بڕوایە وەرناگیرێ و هیچ سوودی نابێ، وەك ئاماژەی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ﴾ ڕۆژێ کە دێت هێندێ لە نیشانە و بەڵگە ڕوونەکانی پەروەردگارت کە بە ناچاری بڕوا ئەهێنن بە خەڵکی، ﴿لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا﴾ هیچ سوودێك ناگەیەنێ بە هیچ کەسێك بڕوا هێنانەکەی لەو کات و ڕۆژەدا ﴿لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ﴾ کە بڕوای نەهێنابێ لە پێش هاتنی ئەو بەڵگە و نیشانانەدا ﴿أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗا﴾ یان هیچ خێرو چاکەیەکی نەکردبێ لە بڕوا هێنانەکەی پێشوویدا – واتە لە پێش ئەو ڕۆژەدا بڕوای هێنابێ و بەلآم هیچ خێرو چاکەیەکی نەکردبێ لە ماوەی بڕوا پێشووەکەیدا، کەواتە بڕوا هێنانی ئەو ڕۆژە لە هیچ کەس وەرناگیرێ و هیچ سوودی نابێ لە دوو حاڵەتدا:

١- لە پێش ئەو ڕۆژەدا بڕوای نەهێنابێ.

٢- بڕوای هێنابێ بەلآم هیچ چاکەیەکی نەکردبێ لە بڕوا پێشووەکەیدا.

لە یەکەم حاڵەتدا سوودی نابێ و پێ ی ناگەڕێ بە بڕوادار، چونکە بڕواکەی بە مەیل و خواهیشی خۆی نییە و ناچارییە، بڕواش ئەبێ بە مەیل و خواهیش و ئیختیار بێت، کەواتە بڕواکەی لە ڕاستیدا بڕوا نییە و بە بڕوا دانانرێ. لە دووەمیشدا سوودی نابێ بۆی لە وەرگرتنی هەر چاکەیەك کەلە پاش بڕوا هێنانی ئەو ڕۆژە بیکات، واتە بڕوا هێنانی ئەو ڕۆژە ئەوەندە بێ کەڵك و بێ نرخە، هەرچۆنێ کەس پێی نابێ و ناگەڕێ بە بڕوادار، هەروەها نابێ

به بنەڕەت و هۆو مەرجی وەرگرتنی کردەوەی چاك كە بڕوا بنەڕەت و مەرجە بۆ وەرگرتنی.
بە كورتی بڕوای ئەو ڕۆژە نە كەسی پێ ئەگەڕێ بە بڕوادار، نە ئەبێ بە هۆو مەرجی وەرگرتنی هیچ كردەوەیەكی چاك كە لە پاش ئەو بڕوا هێنانە بكرێ، بەلاّم بڕوای لەوە و پێش كە بۆ بڕوای دوایی درێژە دانە بەو و سوودی پێ ئەگەیەنێ، هەروەها ئەبێ بە درێژەدان بۆ كردەوەی چاكی لەوەو پێش كە لە كاتی بڕواكەدا كرابێ، وەك ئەبێ بە مەرج و هۆی وەرگرتنی هەر كردەوەیەكی چاكی داهاتووی پاش رای دووەم. ئەم ئایەتە بوو بە جێگەی دەمەقالێ و بەربەرەكانێ و لێكۆڵینەوەیەكی دوورو درێژ لەلایەن موعتەزیلە و كۆمەڵ و جەماوەری زانایانی ئوممەتدا، كە ئایا بڕوا بە بێ كردەوە سوودی هەیە وەك جەماوەر ئەفەرمون، یان سوودی نییە و بە بێ كردەوە بە بڕوا دانانرێ وەك موعتەزیلە ئەڵێن. بەم جۆرەی كە تێپەڕی كرد لام وایە زۆر رێك و پێكە و رێگە ئەبەستێ لەو دەمەقالێ و بەربەرەكانێ یە، نابێ بە بەڵگە بۆ موعتەزیلە و هیچ پێویست نابێ بە بەرپەرچ دانەوەی ئەوان. هیوادارم بە وردی سەرنج بدرێ. ئینجا لەبارەی ئەم هێندە بەڵگەو نیشانەوە چەند رایەك هەیە لە راڤەو دیاریی كردنیان، ئەوەی كە بەهێز بێت و جێگەی رەخنە نەبێ ئەمەیە كە لەم حەدیسەدایە كە ئیمامی بوخاری و موسلیم ریوایەتی ئەكەن و دەقە لە مەسەلەكەدا: ﴿لا تقوم الساعة حتي تطلع الشمس من مغربها، فإذا طلعت و رآها الناس امنوا اجمعون، و ذلك حين لا ينفع نفسا إيمانها. ثم قرا هذه الأية﴾ ڕۆژی دوایی بەرپا نابێ هەتا خۆر هەڵنەیەت لە رۆژ ئاواكەی ئێستایەوە، ئینجا كاتێ هەڵهات و خەڵكی بینی یان هەموو بڕوا ئەهێنن، ئەوەش لەو كاتەدایە كە بڕوا هێنانی هیچ كەسێك سوودی پێناگەیەنێ، ئینجا لە پاش ئەو فەرمودەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ﴾ لە پاش ئەوەی ترساندنی بەو پاشە رۆژە سەختە،

قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾

**ئینجا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُلِ﴾ بلێ بەوانە بە شێوەی هەڕەشە ﴿ٱنتَظِرُوٓاْ﴾ چاوەڕوان بن بۆ هاتنە دی ئەوەی کە ترسێنران پێی ﴿إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ بێگومان ئێمەش چاوەڕوانین بۆ بەدی هاتنی بەڵێنی خوا بە ئێمەو هەڕەشەی لە ئێوە، لە پاش ئەوەی باسی بارو حاڵی بت پەرستەکانی کرد، ئینجا دێتە سەر باسی نامەدارەکان، واتە گاورو جوولەکە، دەست نیشان ئەکات بە هێندێ لە کردەوەی بەدی ئەوانیش، لەم باسەدا پێغەمبەر(ﷺ) جوێ ئەکاتەوە بە ئایین و شەریعەت و بەرنامەکەیەوە لە هەموو دەستە و تاقم کۆمەڵێکی تر، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ئایینەکەی خۆیان پارە پارە و بەش بەش کرد ﴿وَكَانُواْ شِيَعًا﴾ بوون بە چەند دەستە و تاقمێك و هەر دەستە و تاقمێك شوێنی پێشەوایەکی خۆی کەوت و دەستی گرت بە بەش و پارچەیەك لە ئاینەکەی خۆی ﴿لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ﴾ تۆ لە هیچ شتێکدا نیت لە بارەی ئەوانەوە، واتە پرسیاری کاروباری ئەوان لە تۆ ناکرێ و تۆ لێپرسراوی ئەوان نیت، یان مەبەست ئەوەیە تۆ دوور و بەریت لەوانە و هیچ پەیوەندیت پێیانەوە نییە و تێکەڵییان ناکەیت لە هیچ کاروبارێکیاندا، لەسەر تەفسیری یەکەم ئەم رستەیەی کە دێت بەدوای دا دەست نیشانە بۆ هۆی ئەو بڕیارە ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە تۆ لێپرسراوی ئەوان نیت، چونکە کاری ئەوانە هەر ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا و هەر بەدەست خوایە، ئەو تەگبیری هەموو شتیان ئەکات بە گوێرەی کاردروستی خۆی. لەسەر تەفسیری دووەم ئەم رستەیە سەربەخۆیە و هاتووە بۆ هەڕەشە لەوانە لەسەر کردەوە**

بەدەکانیان، واتە کاری ئەوانە هەر بۆلای خوایە و ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا لە رۆژی دواییدا ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ ئینجا خوا هەواڵیان پێ ئەدات لەو رۆژەدا بە هەر کردەوەیەك کە کردوویانە لە جیهاندا و بەردەوام بوون لەسەری بە بێ تۆبە و گەڕانەوە، واتە لەو رۆژەدا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ، ئینجا بەم بۆنەیەوە ئەو بڕیارە دەرئەکات کە پێویستی کردووە لەسەر زاتی پاکی خۆی لەسەر کردەوەکانیان، چ چاك و چ خراپ، ئەفەرموێ: ﴿مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ هەر کەسێك لە بڕواداران خێرو چاکە بەجێ بێنێ و بەو چاوە بێت لە رۆژی دواییدا، بۆ ئەو هەیە دە وێنەو دە قاتی چاکەکەی، واتە پاداشتی زۆری ئەدرێتەوە، یان مەبەست بە دە قات لای خوارووەتی و ئیتر لای ژووری ئەڕوا بۆ حەوت سەدو حەوت سەد هەزار و زیاتر وەك لە حەدیسدا هاتووە، ﴿وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ﴾ هەرکەسێك بە کردەوەی بەدو خراپەوە بێت ﴿فَلَا يُجْزَىٰ إِلَّا مِثْلَهَا﴾ ئەوە تۆڵەی لێ ناسێنرێ مەگەر یەك قات و وێنەی خۆی، یەك بە یەك و سەر بەسەر. ئەمەی کە هۆی بێ بڕوایی ساتێکەوە تۆڵەی هەتا هەتای لێ ئەسێنرێ لەبەر ئەویە ئەو بێ بڕوایە بڕیار و نیازی دڵی لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر هەتا هەتایە بمێنێ هەمیشەیی و بەردەوام ئەبێ لەسەر بێ بڕوایی یەکەی. کەواتە بە پێی نیازو بڕیارەکەی خۆی شایستەی تۆڵەی نەبڕاوەیە. خوا پەنامان بدات لە کەمترین سزای ئاگرەکەی، ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە ستەمیان لێناکرێ بە کەم و کوڕی لە پاشدا بە زیادە سزاو تۆڵە. یان مەبەست ئەوەیە لە چاکەدا کەمتر ناکرێن لە دەقات. لە خراپەیش دا لە سەر بەسەر و یەك قات، ئینجا لە کۆتایی سورەتەکەدا و لە کۆتایی ئەو باسە درێژەی کە تێپەڕی کرد لەبارەی یاسا و حاکمێتی یەوە، لە کۆتایی ئەوەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) بە جاڕدان و گوتنی چەند وتەیەك کە کۆکەرەوە و کورتەیەکە بۆ ئەوەی لەم سورتەدا هاتووە،

قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بڵێ بێگومان من خوا ڕێنموونی کردووم بۆ ڕێگەیەکی راست کە گەیەنەرە بە هەق و راست لە هەموو بارو روویەکەوە ﴿دِينًا قِيَمًا﴾ ڕێنموونی کردوم بۆ ئایینێکی زۆر راست کە بە هیچ ڕەنگ خواری و کەچی و لاری تێدا نییە، ﴿مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا﴾ مەبەستم لەو ئایین و بەرنامەی ئیبراهیمە لە کاتێکدا کە ئیبراهیم لایداوە لە هەموو ئایین و بەرنامە ناڕاست و ناڕەواکان. یان لە پەرستی خوادا راست و لێبڕاو بوە بۆ خوا ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بە هیچ ڕەنگ لە هاوبەش ڕەوا دەران نەبووە، لە ڕیزی ئەوان نەبووە لە کاروباری ئایینەکەیدا، کەواتە بت پەرست و جوولەکە و گاورەکان بێبەش و بەرین لە ئیبراهیم، هەرچەند لاف خۆشەویستی و شوێن کەوتنی ئەو لێ بدەن، ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي﴾ بڵێ بێگومان نوێژەکەم ئیتر فەرز یان سوننەت ﴿وَنُسُكِي﴾ عیبادەت و خواپەرستی یەکەم وەك(زەجاج و جەبائی) ئەفەرمون. یان سەر بڕینی ئەو ماڵات و حەیوانانەی کە لە حەج و عومرەدا ئەکرێن، وەك(سەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهید وسدی) ئەفەرمون، یان قوربانیم وەك(قتادة) ئەفەرموێ. یان حەجم وەك هێندێ تر ئەفەرمون. ﴿وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي﴾ ژیان و مردنم، یان ئەو بڕوا و چاکەم کە لەکاتی ژیان و مردنمدا هەیە و ئەیکەم یان لە پاش مردنم ئەمێنێتەوە ﴿لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بۆ خوایە کە پەروەردگاری هەموو جیهانییانە، واتە هەموو ئەوانەم هەر بۆ خوایە بە تاك و تەنیا و بە بێ شەریك و هاوبەش. ئەوەی لە دڵدا جێگیرە و دڵ بە چەسپانی بۆی بڕوا لەبارەی ژیان و مردنەوە ئەوەیە مەبەست بەخت کردنی گیان و ژیانە لە گوێرایەڵی و ڕەزامەندی خوادا تا لەسەر ئەوە بمرێ و وەك ژیاوە لەسەری ﴿لَا شَرِيكَ لَهُۥ﴾ هیچ جۆرە هاوبەشێك نییە بۆ خوا لەو پەروەردگاری یەی کە هەیەتی بۆ هەموو شت و**

هـەموو جیهانییـان ﴿وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ﴾ هـەر بـەو ئیخلاس و لـێ بڕانـە فـەرمانم پێـدراوە ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ من یەکەم و سەر دەستەی هەموو ئەوانەم کە گوێڕایەڵ و مل کەچن بۆ خوا و بۆ فـەرمانی خـوا، واتـە یەکـەمم لـەم ئوممـەت و شـەریعەتەدا وەك هـەموو پێغەمبـەران و فروستادەکان کە یەکەمن بۆ ئوممەتەکانیان. لە پاش باسی تاك و تەنیایی لەبارەی خوایەتی و پەرستنەوە، ئینجا باسـی تـاك و تـەنیایی خـوا ئـەکات لـەبارەی پـەروەردگارێتی یـەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ﴾ بڵـێ: ئایا بێجگە لە خوا من هیچ کەسێکی تر نیـاز بکـەم بە پـەروەردگار، لـە کاتێکدا کە ئەو پەروەردگاری هـەموو شتێکە. چ ئەوەی کە ئەپەرسترێ و چ ئەوەی کە ناپەرسترێ؟ واتە نەخێر من شتی وا ناکەم و سەر سووڕ ئەمێنێ لە کاری وا ناهەق و ناڕەوا، ئایا من بێجگە لە خوا هیچ کەسێکی تر و هیچ شتێکی تر بکەم بە حاکم و کار بەدەست و چاودێری خۆم لە کاتێکدا کە من بە پێی کردەوەو نیاز و نیەتی خۆم رەفتارم لەگەڵ ئەکرێ و پرسیارم لێ ئەکرێ لەسەر ئەوەی کە ئەیکەم لە چاکە و خراپە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾ هەرکەسێك هەر گوناهو خراپەیەك بکات هەر لەسەر خۆیەتی و ناکەوێتە سەر یەکێکی تر ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێ، بەڵکو هەرکەس بار و گوناهی خۆی وا بە کۆڵی خۆیەوە، وەك(ئیبن و عـەباس) ئەفـەرموێ لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا، ئەگێڕنـەوە کە بت پەرستەکان ئـەیانگوت بـە موسـڵمانەکان: ئێـوە شـوێنی ئێمـە بکـەون و ئێمـەش گوناهـەکانی ئێـوە هەڵـدەگرین. خـوایش بە درۆی خـستنەوە و بـەو جـۆرە بەرپەرچـیدانەوە، لەسـەر ئـەم بـارە مەبەست لەو دوو رستەیە هەریەکە و رستەی دووەم دووبارە کردنەوەیە بۆ یەکەم بۆ بـەهێز کردنی. هێندێ ئەفەرمون، ئەو وتەی ئەوانە دوو شت هەڵئـەگرێ، یەکەم: ئێوە شوێنی ئێمە بکـەون و هـەر گوناهـەکانتان لەسـەر ئێمـە بنووسـرێ، بـەو شـێوەیە رستەی یەکـەم بـوو بـە بەرپەرچ دانەوەی مەبەستی یەکەمە و رستەی دووەم بۆ بەرپەرچ دانەوەی مەبەستی دووەمە. بەم جۆرەش هەر چاکە و ئەگونجێ، ئەمـەی کە لـەم دوو رستـەدا هەیـە یاسایەکی گرنگە لە یاساکی ئیسلام و لە شەریعەتەکانی پێشوویشدا هاتووە وەك لە سورەتی(النجم) دا هـاتووە، یاسایەکی زۆر گرنگە و رووخێنەری بیرو باوەڕی بت پەرستییە، رێنموونی کەرە بۆ شتێ کە مایەی خۆش بەختییە لە هەردوو جیهانـدا، ئەوەش کە بریتییـە لـە کردەوەو پشت بەسـتنی هەرکەس بە کردەوەی چاکی خۆی، بەستنەوەی هەرکـەس بە کردەوەی خۆیـەوە کە ئـەوەش

شتێكی زۆر راست و ڕەوایە و پێی ئەگوترێ:(فردية التبعة) بەڵێ بەڕاستی ڕووخێنەری بت پەرستییە، چونكە بنەڕەتی بت پەرستی لەسەر ئەوەیە كە هێندێ لە دروستكراوەكانی خوا كە بەلای یەكێكەوە گەورەیە و تایبەتییە و جیاوازی یەكی هەیە بە خواوە، ئەو دروستكراوی خوا بكرێ بە واسیتە تا لە ڕێگای ئەو واسیتەوە دەستكەوتێك دەستكەوێ یان بارو زەحمەتێك بەرگری بكرێ، بە بێ ئەوەی كابرای واسیتە كەر هیچ هەوڵ و كردەوەیەكی ببێ لە مەیداندا ئیتر چ بۆ كاری ئەم جیهانەیان بۆ ئەو جیهان. دەی ئەم ئایەتە دژی ئەو بیرو باوەڕەیە و ناگونجێ لەگەڵی، بە كورتی هیچ كەس بارو گوناهی هیچ كەسێكی تر هەڵناگرێ، هەركەس بەستراوە بە كردەوەی خۆیەوە ئیتر چاك بێ یان خراپ، هەروەها هیچ كەس سوود وەرناگرێ بە كردەوەی هیچ كەسێكی تر بێجگە لەوەی كە لەو حەدیسە سەحیحەدا هاتووە: ﴿إذا مات ابن أدم انقطع عمله إلا من ثلاث﴾ كە ئادەمی مرد ئیتر ئەبرێتەوە مەگەر لە سێ بارەوە: ﴿صدقة جارية أو علم ينتقع به أو ولد صالح يدعو له﴾ سەدەقەی بەردەوام وەك خێرو وەقف و وەسیەت بە شتێ كە سوودی لێ وەرگیرابێ، یان عیلمێ كە بەجێی هێشتبێ، یان ئەولادێكی ساڵح كە نزای خێری بۆ بكات. ئەمەش هەر ئەگەڕێتەوە بۆ كردەوەی مردووەكە. هەروەها شتێكی تر كە لە حەدیسی سەحیح دا هاتبێ، یان بڕیاری هەموو زانایانی لەسەر بێ وەك نزا كردن یان خێرو سەدەقە كردن لەلایەن كەسێكەوە بۆ كەسێكی تری مردوو، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئایەتەكە. ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ﴾ ئینجا لەپاش ئەم جیهانە هەر بۆلای پەروەردگارە گەڕانەوەتان لە ڕۆژی دواییدا، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ لەدوای گەڕانەوەتان هەواڵتان پێئەدا بەوەی كە ئێوە لە جیهاندا دووبەرەكی بوون تیایدا، واتە بۆتان ڕوون ئەكاتەوە هەموو هەق و ناهەقێك، كەواتە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك كەڵكی نییە و هەر چاوەڕوانی و ئومێدێك بووبێ بێ جێیە و بێ سەر و شوێنە، ئینجا لە كۆتایی سورەتەكەدا ئایەتێك ئەهێنێ كە بە ڕاستی هاندەرە لەسەر ئەوەی كە هەر پشت بە خوا ببەسترێ و هەر ڕێگەی ئەو بدرێتە بەر، خۆبپارێزرێ لە هەموو شتی پڕو پووچ و بت پەرستی، دەست نیشان ئەكات بۆ هێندێ باو و ڕەوشتی كۆمەڵایەتی، مەردوم ئەترسێنێ لە نافەرمانی و سەركێشی، ئومێد و ئارامیش ئەخاتە بەرچاو كە ئەگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگار،

وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَـٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَـٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَـٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ﴾ ئەو پەروەردگارەی کە باسکرا کەسێکە کە ئێوەی گێڕاوە بە جێنشینان لە زەویدا، واتە گێڕاونی بە چەند چین و تاقمێك کە هەرچین و تاقمێك ڕۆیی یەکێ تر دێتە جێی و ئەبێ بە جێنشینی تا ڕۆژی دوایی بەو جۆرە ئەبن، وەك(حسن) ئەفەرموێ: یان گێڕاونی بە جێنشینەکانی خوا لەسەر زەویدا کارو کردەوەی تێدا ئەکەن و وەك هێندێ ئەفەرمون. بە پێی ئەم دوو رایە فەرمودەکە لەگەڵ هەموو ئادەمییە، هێندێ ئەفەرمون: ئەم فەرمودەیە ئاراستەی ئەم ئوممەتە کراوە، واتە خوا ئێوەی گێڕاوە بە جێنشینی گەل و ئوممەتەکانی رابردوو ﴿وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَـٰتٍ﴾ هێندێکتانی بەرز کردووەتەوە بەسەر هێندێکی ترتاندا بە چەند رادەو پلەیەك لە هەر بارو ڕوویەکەوە، دەوڵەمەندی و فەقیری، هێزو لاوازی، ئازایی و ترسنۆکی، زانین و نەزانی، ژیریی و گێلی، هەروەها ﴿لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ﴾ بۆ ئەوەی تاقیان بکاتەوە لەوەی کە پێی داون مەبەست لە تاقی کردنەوەی خوا ئەمەیە – وەك چەند جار گوتمان – ئەوەی کە خوا ئەیزانێ بەندە بە کردەوە بەدی بێنێ تا بۆ خەڵکی دەرکەوێ ئەگینا خوا هەموو شتی هەر زانیوە و هەر ئەزانێ بە بێ سەرەتا و دوایی هاتن بۆ زانینەکەی، ئینجا بۆ زیادە لوتف و میهرەبانی ڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنیا، دەست نیشان ئەکات و هەڕەشە و بەڵێن ئاراستە ئەکات بۆ هەرکەسێك کە شایستەی هەرکام بێ، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر ﴿سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ﴾ تۆڵەی چەسپانە و بە چەسپانی دێت دەربارەی هەرکەسێك کە سەرکێشی بکات و مافی خوا ژێر پێ بکات. ئیتر تۆڵەی ئەم جیهانیان هەردوو بە پێی لێزانی و داد و کاردروستی خوا. تۆڵەی چەسپانە، چونکە

بێگومان بەدی دێت و هەرچی بەدی بێت نزیك و چەسپانە، دوور و سست ئەوەیە کە بەدی نەیەت، چەسپانە بەلای خواوە، چونکە کات و چەرخ و زەمان لای ئێمە شتە و کار ئەکات. بەلای خواوە بیٚ نرخە و هیچ نییە و چاو نادات، چەسپانە کاتیٚ کە خوا مەیل بکات، چەسپانە کاتیٚ کە کاتی بەدی هاتنی هاتبێتە پێشەوە، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات لە تۆڵە و سزای خۆی – آمین –.

ئینجا بۆ بەڵێنەکەی رستەیەك ئەهێنیٚ کە بەزەیی و میهرەبانی لیٚ ئەباریٚ، ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی و بێگومان ئەو خوای پەروەردگارە زۆر داشاردەر و لیٚ بوردەیەکی میهرەبانە بە هەر کەسێك کە سپڵە نەبێت و رێزی چاکە و بەهرەی خوای بەلاوە بێت، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لە بەهرەو بەرهەمی ئەم دوو سیفەتە گەورەو گرنگەدا – آمین – ئای چەند شیرینە کە قاپی ئەم سورەتەی کردووە لە سوپاس و سەنای خوا، کۆتایی پێهێنا لە بێبوردن و میهرەبانی خوا!!

سوپاس بۆ پەروەردگار لیٚ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە لە ١٤ ی مانگی رەجەبی ساڵی ١٤٠٨ ی کۆچی. داواکارم لە قاپی خوای لێبوردەی میهرەبان کە لێم وەرگریٚ و یارمەتیم بدات بۆ تەواو کردنی ئەم تەفسیرە، سوود بەخشی بکات بە رۆڵەکانی ئەم ئوممەتی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ)

**وصلى الله و سلم على سيدنا محمد و على آله و صحبه أجمعين**

**هەر لەم رۆژەدا دەستم کرد بە تەفسیرەی سورەتی(الأعراف).**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓصٓ ۝١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ

## سورەتی(الأعراف)
## مەككەیی یەو(٢٠٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە وەك سورەتی پێشوو مەككەیی یەو بریتییە لە دووسەد و شەش ئایەت، مەبەستی سەرەكی و بنەڕەتی ئەمیش وەك سورەتی پێشووهەرعەقیدەیە، بەڵام زۆر جیاوازی ئەم هەیە لەگەڵ ئەو چارەسەر كردنی ئەو مەبەستە پیرۆزەدا! هەركام لە سورەتەكانی قورئان كەسایەتی یەكی تایبەتی خۆی هەیە جیاواز لە كەسایەتی سورەتەكانی تر، شێوەو نیشانە و بەرنامەیەكی تایبەتی جیاوازی هەیە، هەرچەند لەمەدا یەكن كە هەموو هەر فەرمودەی خوان و بە زمانی عەرەبی هاتوون، نابێ سەر سوڕ بمێنێ لەوە زۆربەی دەست كردەكانی خوا هەروان. بۆ وێنە ئەم ئادەمی یە لەسەر تا بە خوارێ دەست ناكەوێ هیچ كەسێك كەسایەتی یەكی تایبەتی خۆی نەبێ و جیاواز نەبێ لە هەموو كەسانی تر، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو هەر ئادەمین و یەك سروشتیان هەیە و لە یەك بنەڕەتەوە هاتوون! ئەم سورەتە یەكێكە لە حەوت سورەتە درێژەكانی قورئان، مەبەست و ئامانجەكانی سورەتە مەككەیی یەكانە، بەڵام بەجۆروشێوەی تایبەتی خۆی.لەیەكەم جارەولەپاش﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ دەست پێنەكات بەچوار پیت ﴿الٓمٓصٓ﴾ كە وەك وێنەكانیان لە سورەتەكانی تردا بە شێوەی پیت ئەنوسرێن، بەڵام بەناوی پیتەكانەوە ئەخوێنرێنەوە: ﴿الف، لام، میم، صاد﴾ەوە، لەبارەی ئەم پیتانەوە دواین لە چەند سورەتێكدا، بە تایبەتی لە سەرەتای سورەتی(یس) ئەندازەیە درێژەمان پێدا، كە یەكەم سورەت بوو دەستمان كرد بە تەفسیری، دەست نیشانمان كرد بۆ رای زانایانی ئیسلام لەبارەی ئەم پیتانەوە، كەواتە لێرەدا بە پێویستی نازانم دووبارەكردنەوە، لەپاش ئەو پیتانە، ئەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ واتە(الٓمٓصٓ) نامەیەكە كە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) یان بێدەنگ ئەبین لە(الٓمٓصٓ) و ئەڵێین: ئەمەی كەئەخوێنرێتەوەبەسەرتاندانامەیەكی گەورەوگرنگە كە هێنراوەتەخوارەوە بۆلای تۆ،

﴿فَلَا يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ﴾ واتـه مـاتولێ ئەمـە نامەیەکـە هێنراوەتـە خـوارەوە بۆلای تـۆ، کەواتە با لە دڵی تۆدا هیچ گومانێك نەبێ لە راستی ئەو نامەدا، وەك لە(ئیبن و عەباس) و کۆمەڵێکـەوە – خوایـان لـێ رازی بێـت – هـاتووە تەفسیری(حـرج) بـە گومـان ئەکەنـەوە و زۆربەش لەسەر ئەم رایە ئەڕۆن، یا با هیچ غەم و تەنگی یەك لە دڵتدا نەبێ لە راگەیاندنی و لە مەترسی کردن لەوەی بڕوات پێنەهێنن یان کەم و کوڕیت ببێ لە هەڵسان بە ماف ئەو نامەیە، ئەم تەفسیرە رای هێندێکە، بەڵام بەڕاستی زۆر بەهێزە و رێکە لەگەڵ چەند ئایەتێکی تردا، لە زمانی عەرەبیشدا هەر بەم جۆرەیە و بێ گیرو گرفتە، کەواتە هەقی وایە هەر بەو جۆرە تەفسیر بکرێتەوە، یان ماتولێ ئەو هەواڵەمان پێدایت، کەواتە با هیچ گومانێك لە دڵتدا نەبێت لەوەی کە نامەیەکە و هێنراوەتە خوارەوە لەلایەن خواوە بۆ لای ئەو، بەڵام کارەکە ئەوەندە گەورەو گرنگە ئەگەر یارمەتی و پیشتیوانی خوای لەگەڵ نەبوایە لەوانەبوو لەبەر زۆر ئەرك و قورسی و گرانی گومان و دوو دڵی رووبدات تێیدا، جا لەبەر ئەوە پێویستی هەیە و هاندان و خستنە پەرۆشە وەك زانایان فەرمویانە. پێویستیمان بەم تەئویل و پینەیە لەبەر شەرم کردنە لە(ئیبن و عەباس) – خوایـان لـێ رازی بێـت –(ترجمـان القـران) و ئەویش(حرج) ی بە گومان تەفسیر کردووە. ئەگینا لەسەر رای دووەم کە تەفسیری ئەکاتەوە بە غەم و پەژارە و دڵتەنگی، لەسەر ئەم رایە هیچی ناوێ و کارەکە ئەوەندە گەورە و گرانە پێویستی بەم ئارام دان و دڵ بەهێزکردنە هەیە، وەك لە چەندەها ئایەتی تردا هاتووە، غەم پەڕە و دڵتەنگی لەوەو مەترسی لەو ئەرکە کە هیچ ئەرکێکی تر لەوە گەورەترو گرانتر نییە، هیچ جێگەی رەخنە نییە ئەگەر خوا هێزو ئارامی نەدایە بە پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز نەیئەتوانی و توانای وەرگرتنی وەحی نەئەبوو، ئینجا توانای نەئەبوو کە روو بکاتە هەموو جیهان و جیهانییان و هەموو بە گومڕا و سەر لێ تێکچوو دابنێ، بچێ بە گژ ئەو هەموو کردار و رەفتارە باو و یاسا و رژێمەی کە لە جیهاندا بووەو هەیە و ئەبێ. بانگی هەمووان بکات تەنها بۆلای بەرنامەی خۆی و واز هێنان لە هەموو شت و لە هەر بەرنامەیەکی ترا! کێ

توانای کاری وای هەیە ئەگەر خوا یارمەتی دەرو ئارام دەر نەبیٚ؟! بێگومان هیچ کەس توانای نەبووە و نایبێ، هۆی هێنانە خوارەوەی ئەم نامەیە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾:

١- لەبەر ئەوەی بترسێنیٚ بەم نامەیە، واتە گەلەکەت و هەرکەس ئەم نامەیەی پیٚ بگات وەك لە سورەتی پێشوودا فەرموی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾ بۆ ئەوەی بترسێنم بەم قورئانە و هەرکەسێك ئەم نامەیەی پیٚ گەیشتبیٚ و پێی بگات.

٢- لەبەر بیر خستنەوەو ئامۆژگاری بۆ بڕواداران، واتە ئەوانەی کە خوا بڕوا هێنانی نووسیبیٚ بۆیان ئیتر لەو کاتەدا بڕوایان هێنا بێیان لە پاشدا تا رۆژی دوایی. بێگومان لە واقعی ژیاندا دەرئەکەویٚ ئەوانەی کە ئەترسێنرێن و ئەوانەی کە ئامۆژگاری ئەکرێن، کەواتە ئەم قورئانە هەتا هەتایە هەمیشە وا لە کارو کردەوەدا و هەمیشە تەڕو تازەیە تا دنیا دنیایە، هاتووە بۆ ئەوەی چاودێرو فریاد رەس بیٚ بۆ هەرکەس کە خۆی کوێر ناکات لە ئاستی، ئەم قورئانە هەمیشە خەڵکی ناچاریی هەیە پێی، چونکە ئەوەی کە بڕوای پێی نییە ئەبیٚ بترسێنریٚ، ئەوەی بڕوای هەیە ئەبیٚ پارێزگاری بکات لە هەڵە و ترازان لە ڕێگە راستەکەی، چونکە ئەم ئادەمی یە بە سروشت هەڵە بازە، ئەگەر وریایی نەکریٚ بەرە و نەفامی و کۆنەپەرستی ئەڕوا!! بەڵگەی ئاشکرا لەسەر ئەوە ئەمەیە کە ئەبینین رۆڵە و نەوەکانی موسڵمانان کە چەند پشتیان موسڵمان بوون، ئەمانە گەڕاونەتەوە بۆ پیسترین چەرخی نەفامی، خوا پاداشتی مامۆستای گەورە(محمد قطب) بداتەوە کە چەندە بە روونی و بە درێژیی نەفامێتی ئەم چەرخ و سەردەمەی دەرخستووە لە نامەی ناوبراوی دا بە(جاهلیة القرن العشرین)، ئەم ئیسلامە رووداوێکی مێژوویی نییە، کە جاریٚ رووبدات و بەدی بێت و ئینجا بڕواتە رووپەڕەی مێژوو، ئەم ئیسلامە روو بە ڕوو وەستان و بەرەنگاری کردنێکی هەمیشەیی یە بۆ ئەم جیهان و جیهانییانە تا رۆژی دوایی، بەرەنگاری ئەوەستیٚ ئێستا و لە داهاتوودا، هەرچۆنیٚ بەرەنگاری وەستا لە یەکەم جاردا. هەرجاریٚ لابدا و بگەڕێتەوە بۆ ئەو بارو حاڵەی کە لەسەری بوو یەکەمجار کە ئیسلام هات بۆ چارەسەرکردنی. ئەم ئیسلامە

هات بۆ ئەوەی رووی جیهان وەرگێڕێ، جیهانێکی تر بێنێته کایه، که تەنها خوا حاکم بێت تیایدا، حاکمێتی هیچ تاغوتێك نەهێڵێ. ئەم ئیسلامه هات بۆ ئەوەی که(لا إله إلا الله) بکات به بناغه و بنەڕەت، که هەموو پێغەمبەرەکان – سەلامی خوایان لێبێت – کردیان به بناغه و بنەڕەت به درێژایی مێژووی ئەم ئادەمی یه، مەبەست لەم وته پیرۆزەش بەی نایەت بەوه نەبێ که حاکمێتی له رژێمی هەموو بوونەوەردا، واته ئەبێ هەر تەنها خوا حاکم و کاربەدەست بێ له ژیانی ئادەمیدا به شەریعەت و بەرنامەکەی، هەرچۆنێ هەر خوا حاکم و کاربەدەسته له هەموو بوونەوەردا به بڕیارو قەزاو قەدەری، لەسەر ئەم بنەڕەت و یاسایه موسڵمان بڕوای نییه به هیچ هاوبەشێك له دروستکردنی ئەم بوونەوەره و بەڕێوەبردنی کاروباری، عیبادەت و پەرستنی هەر بۆ خوایه، شەریعەت و یاسا و بیرو باوەڕو بۆچوونەکانی هەر له خواوه وەرئەگرێ، حاکمێتی له هەموو ئەوانەدا هەر بۆ خوا رەوا ئەدات و بەس، ئەمەیه بیرو باوەڕ لەم ئایینەدا، دەی ئایا هەموو مەردومان ئەمڕۆ لەسەر ئەم باوەڕه پاکەن؟ نەخێر – بەداخەوه – ئادەمی ئەمڕۆ بوون به چەند بەشەوه، هەموو هەر له نەفامیدا ئەژییەن، بەشێك بێ بڕوایه و دان نانێ به بوونی خوادا به هیچ جۆر، کاری ئەمانه ئاشکرایه و پێویست به باسکرنی نییه! بەشێکی تری دان ئەنێ به بوونی خوا، بەڵام بت پەرسته و چەند هاوبەشێك رەوا ئەدەن بۆ خوا. وەك له هیند و ئەفەریقای ناوەڕاست و ناو بەناوی ئەفەریقا و چەند شوێنی تر له جیهاندا، بەشێك له نامەداران، واته یەهودی و نەسرانی، که ئەمانه له پێشەوه هاوبەشیان رەوا دا بۆ خوا بەمەی کوڕو ئەولادیان دەست هەڵبەست کرد بۆ خوا، له بارێکی تریشەوه زانا و عابیدەکانی خۆیانکرد به خواو پەرستراوی خۆیان، بەمەی شەریعەت و بەرنامەی ژیانیان لێ وەرگرتن و مافی حاکمێتی یان رەوادا بۆیان، هەرچەند عیبادەت و سوژدەیان بۆ نەئەبردن! ئینجا ئەمانه ئەمڕۆ هەر به تەواوی حاکمێتی خوایان نەهێشت له ژیانی خۆیاندا، چەند رژێم و یاسایەکیان دامەزراند بۆ خۆیان وەك سۆسیالیستی و سەرمایەداری و رژێمەکانی تر، چەند بارێکیان داهێنا بۆ حوکمڕانی وەك دیموکراتی و دیکتاتۆری، بەوه به تەواوی دەرچوون له ئایینی خوا و

خۆیان خستە ناو نەفامێتی ئیغریق و ڕۆمان و کەسانی تر، کە ڕژێمێ دروست ئەکەن بۆ خۆیان لەلایەن خۆیانەوە، دەستە و شتێکی تر هەن خۆیان بە موسڵمان ناو ئەبەن، بە ڕێکی شوێنی بەرنامەی نامەدارەکان ئەکەون! لە ئایینی خوا دەئەچن بۆ ئایینێ کە بەندە دایهێناوە، چونکە ئایینی خوا بەرنامە و شەرع و ڕژێمێکە خوا دایناوە بۆ ژیان و یاسای ژیان، کەواتە ئیسلام ئەمڕۆیش وەك یەکەم جاری هاتنی بەرەنگاری ئادەمی وەستاوە، مەبەستی ئەمڕۆی هەمان مەبەستە کە دەرهێنانی بەندەیە لە نەفامی و وەرگێڕانی بۆلای ئایینی خوا، لە پەرستنی دارو بەرد و بەندە بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنیا، بەڵێ بەڕاستی ئیسلام ڕووداوێکی مێژوویی نییە کە جارێ ڕووی دابێ و هەر لە مێژوودا مابێتەوە باس بکرێ، بەڵکو بێگومان ئێستا و لە داهاتوودا هەتا دنیا دنیایە، - وەك یەکەم جار - ئەبێ هەر ئیسلام چارەسەر و پەنا بێت و هەموو قۆرت و گرێی ژیان هەر بەم کراوەتەوەو ئەکرێتەوە، سەردەم و چەرخی نەفامی یەکان و ماوەیەکی دیاریی نییە، بەڵکو بۆ هەر کاتێك کە خواو حاکمێتی خوا لە کایەدا نەبێ و حاکمێتی بۆ هەر کەسێکی تر بێ بێجگە لە خوا، ئیتر لەسەر هەر بار و هەر شێوەیەك.

زانای بەرزی خواناس(بیضاوی) فەرمودەیەکی کورتی پڕ بە پڕی هەیە لەو بارەیەوە، کە ئەفەرموێ:(وهی ملة متابعة الهوی) جاهیلی یەت و نەفامی بریتییە لە ئایینی شوێن کەوتن و پەیڕەوی ئارەزووی نەفس. بە پێی ئەوە دەرئەکەوێ کە ئەمڕۆ نەفامی ڕووی زەوی داپۆشیوە، ئیسلام وەستاوەو لە کایەدا نییە! ئەوانەی کە بانگ ئەکەن بۆلای ئیسلام مەبەست و ئامانجیان هەر ئەو مەبەست و ئامانجەیە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەوڵی بۆ دا و پێکی هێنا، بانگ کەرانی ئەمڕۆ و داهاتوو بەرەنگاری شتێ ئەکەن و ئەوەستن کە کاتی خۆی پێغەمبەر(ﷺ) بەرەنگاری کردووە و وەستاوە، ئەمان پێویستە پەیڕەوی ئەو بکەن و شوێنی بکەون لەم ئایەتەدا کە خەریکین پێیەوە و ئەژین لە ژێر سایەیدا، لەپاش ئاراستە کردنی ئەم ئایەتە بۆ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی (ﷺ).

﴿اتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴿٤﴾ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٥﴾

---

ئینجا ڕووی فەرمودە ئەكاتە گەلەكەی كە یەكەمجار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچكەدا، هەروەها هەموو چین و دەستە و تاقمەكانی تر تا ڕۆژی دوایی و سەرجەم پێیان ئەفەرموێ: ﴿اتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ پەیڕەوی ئەوە بكەن، واتە ئەم قورئان و شەریعەتە، كە هێنراوەتە خوارەوە بۆلاتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە، ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ﴾ پەیڕەوی مەكەن و شوێنی و دۆستان و كاربەدەستانی تر مەكەون لەو پەرستراوانەی كە ڕەواتان داوە بۆ خۆتان، لە كاتێكدا كە تێپەڕ ئەكەن لە خوای پەروەردگارتان كە هەر ئەو دۆست و كاربەدەست و پەرستراوی ڕاست و ڕاستەقینەیە و هەموو كاروبارێكتان هەر بەدەست ئەوە ﴿قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ زۆر كەم ئێوە بیر ئەكەنەوەو تەمێ و ئامۆژگاری وەرئەگرن، واتە حاڵ و بارێكی بەدتان هەیە و تەمێ و ئامۆژگاری وەرناگرن تا بەهۆی ئەوەوە بگەڕێنەوە لەو بارو حاڵە بەدو پڕو پووچەی كە بە شوێن كەوتنی كوێرانە كەوتوونەتە سەری، كەواتە ئەم نامە پیرۆزە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی بڕوای پێبێنێ و مەردومی پێ بترسێنێ و ئامۆژگاری پێبكات. هاتووە بۆ مەردومانیش بۆ ئەوەی پەیڕەوی بكەن و پەیڕەوی فەرمانی هیچ كەسێكی تر نەكەن، كەواتە ئەم قورئانە هاتووە بۆ ئەوەی گۆڕانێكی سەرەكی و تێرو تەواو فەراهەم بێنێ لە هەموو بارو ڕوویەكەوە، بێگومان ئەوەش زۆر شتێكی گەورەو گرانە و پێویستی هەیە بە ترساندن و بێدار كردنەوەو داچڵەكاندن، لەبەر ئەوە ئەوا دەست نیشان ئەكات بۆ دوا ڕۆژ و بەسەرهاتی بەدو سامناكی گەلە ڕابردووەكان كە بەهۆی بڕوا نەهێنان و نافەرمانی یان دووچاری سزای سەختی خۆیان بوون، ئەفەرموێ:

﴿وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا﴾ شارو ولآتی زۆرمان وێران كرد و لەناو برد، واتە نیازی ئەوەمان كرد ﴿فَجَاءَهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا أَوْ هُمْ قَائِلُونَ﴾ ئینجا ئەو تەئویلە لەسەر ئەوەیە كە پیتی(ف) بۆ عەطف بێت، ئەگەر بۆ تەفسیری ئەو كاتە ئەو تەئویلەی ناوێ. واتە شارو دێیەكان بە دانیشتوانیانەوە، لە شەودا، یان لە كاتێكدا كە ئەو دانیشتوانە لە چێشتەنگاودا بوون، یان خەوتبوون لە چێشتەنگاودا، بە هەر بار كاتی هاتنی ئەو سزایانە دوو جۆر بوو، هەركام كاتی ئارامی و ئیسراحەتە، هاتنی سزا لەو كاتانەدا لەناكاو و كت و پڕی زۆر قورس و گرانترە و ئێش و ئازاری سەخت ترە، كەواتە باسەكەشیان ئەبێ زۆرتر هۆی تەمێ خواری بێ بۆ ئەوانەی پاش خۆیان، بێگومان هەرچەند دان نان بە گوناهو تاوان زۆر سەخت و گرانە لەسەر مەردوم، بەلآم ئەوانە لە كاتی هاتنی ئەو سزا سەختانەدا و دەركەوتنی نیشانەكانی هیچیان بۆ نامێنێتەوە بێجگە لەوەی بە سەرشۆڕی و دڵە لەرزەوە دان بنێن بە تاوانی خۆیاندا وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَمَا كَانَ دَعْوَاهُمْ إِذْ جَاءَهُم بَأْسُنَا إِلَّا أَن قَالُوا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ ئینجا نزا و هاواری ئەوانە یا داوا و لاف و ئیدعایان، یان وتە و قسەیان هیچ نەبوو كاتێ سزای ئێمەیان بۆ هات، بێجگە لەوەی كە گوتیان: بەڕاستی ئێمە ستەمكار بووین، واتە بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەر بووین، چونكە زۆرتر لە قورئاندا مەبەست لە ستەمكار و زاڵم هاوبەش ڕەوا دەرە، چونكە ستەمی هەرە گەورەیە، ئایا هیچ كەس ستەمكارترە لەو كەسەی كە هاوبەش ڕەوا بدات بۆ پەروەردگار و داهێنەری خۆی؟ ئای هاوار بۆ ئەو هەڵوێستە سامناكە كە ئەوپەڕی هەوڵ و تەقالا بۆ رزگار بوون لێی دان نان بێ بە گوناهو تاوان و هاوبەش ڕەوا دان بۆ خوا!! ئینجا لەم كاتەدا كە ئەو شێوە سەخت و سامناكە نیشان ئەدات، لەم كاتەدا كت و پڕو دەست بەجێ ئەگوێزرێتەوە بۆ مەیدانی دوایی و سزای ئەم جیهانە تێكەڵ و پێكەڵە پەیوەست ئەكات بە شێوەی سزای سەخت و سامناكی ڕۆژی دوایی یەوە،

فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦﴾ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ ۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴿٧﴾ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ ئینجا سوێند بە خوا پرسیار ئەکەین لەوانەی کە لە جیهاندا فروستادە و پێغەمبەران نێررا بوون بۆلایان، پرسیاریان لێ ئەکەین کە چۆن وەڵامتان دانەوە پێشوازیتان لێکردن؟ یان هەر جۆرە پرسیارێکی تر کە لە ئایەتەکاندا باس کراوەو پرسیاریش ئەکەین لە فروستادە و نێرراوەکان کە چۆن وەڵام درانەوەو پێشوازیتان لێکرا لەلایەن گەل و ئوممەتەکانیانەوە؟ یان ئایا راتان گەیاند ئەوەی رەوانە کران پێی، لێرەو لە چەند ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: پرسیار ئەکرێ، لە ئایەتی سورەتی(الرحمن) دا ئەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ﴾ نە جن و نە ئادەمی پرسیار ناکرێ لە گوناهی، بۆ یەکخستنی ئەم ئایەتانەو دەستە مل کردنیان چەند شتێك گوتراوە: مەبەست بە پرسیار کردن لەو ئایەتانەی کە پرسیار ئەگەیەنن، پرسیار کردنە بۆ تەشەر دان و بێ ئابروو کردن، مەبەست بە پرسیار نەکردن لەو ئایەتانەی کە پرسیار نەکردن ئەگەیەنن، پرسیارێکە کە بۆ هەواڵدان و ئاگادار کردن بێ، یان ئەڵێن: رۆژی دوایی دوورو درێژەو چەند کات و هەڵوێستی جیاوازی تێدایە، لە هێندێ کات و هەڵوێستدا پرسیار هەیە و لە هێندێ کات و هەڵوێستدا پرسیار نابێ. چەند وەڵامێکی تریش گوتراوەو بەلامەوە ئەم دوو وەڵامە بەسە و پێویست بە هیچی تر ناکات، ﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ﴾ ئینجا ئەخوێنینەوە بەسەریاندا و هەواڵیان پێ ئەدەین، هەواڵی هەموو بەسەرهات و ئەوەی رووی داوە لێیان، هەواڵیان پێ ئەدەین بە زانینی تێرو تەواو کە هەموو شتێکیان بگرێتەوە و هیچی ون نەبێ ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ﴾ ئێمە هیچ کاتێ غائب نەبووین لێیان، بەڵکو هەمیشە ئامادەو ئاگادار بووین پێیان و هەموو کارو کردەوەی ئەوانمان بیستووەو بینیوە، ئینجا ئایا ئەو هەواڵ**

پێدانە بەمە بێ کە نامەی کردەوەکانیان بێنێتە زمان و ئەو هەواڵانە بدات وەك(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: یان بە هەر جۆر و شێوەیەکی تر کە خوا ئەزانێ، ﴿وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ﴾ کێشانەی هەق و راست بۆ کردەوەکان لەو رۆژەدا ئەبێ، یان کێشانە لەو رۆژەدا هەر هەق و راستە، واتە کردەوەیەك کە ئەندازەو رادەی کردەوەی چاك و خراپی پێدەرکەوێ، ئیتر ئایا نامە و دەفتەرەکان بکێشرێن، یان کردەوەکان بکرێن بە جەستە و قەبارەی جوان و ناشیرین بە بەرچاوی هەموانەوە، وەك بە هەردوو بارەکە ریوایەت هاتووەو هەرکام کۆمەڵێ لە زانایانی لەسەرە، بەهەرکام ئەگونجێ و جێگەی سەر لێکردنەوە نییە، پێویست نییە و چاك نییە لادان لە رووکەش و رواڵەتی ئایەت و حەدیس بە بێ هۆو بەڵگەیەکی شەرعی، بە تایبەتی لەم چەرخ و سەردەمەدا لەسەر دەستی بەندەدا خوا چەند شتی داهێناوە کە لەوەو بەر هەرکەس بیگوتایە لەوانەبوو بە شێت و نەفام دەرکرایە، بۆ وێنە: ئەو شتانەی کە پلە و رادەی گەرما و سەرما و بەرزی و نزمی و دووری و نزیکی یان پێ دەرئەکەوێ. بە خەیاڵی کێدا ئەهات کە شتی ئاوا پەیدا ئەبێ، یان بە خەیاڵی کێدا ئەهات کە کردەوەو شێوەو چۆنێتی کردەوە و خاوەن کردەوە لە تەلەفزیۆن و ڤیدیۆدا نیشان ئەدرێ و لەو شریتانەدا ئەمێننەوە بۆ هەر کاتێ کە مەیل بوو نیشان بدرێن بە رێکی و روونی؟!! باشترین را ئەمەیە: ئەم شتە غەیبی یانە بڕوامان پێی هەیە و چۆنێتی یەکەی حەواڵەی خوا ئەکەین، وەك لە ئایەت و حەدیسە(متشابە) کاندا هەر ئەوە چاکە و زۆربە لەسەر ئەوەیە، ئینجا سەرەنجام و بەرهەمی کێشانەکە باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ ئینجا هەرکەس تای تەرازووەکانی یان کێشراوەکانی قورس بن بە هۆی بڕواو کردەوەی چاکەوە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ هەر ئەوانەن رزگارو گەیشتوون بە ئامانج، ئایا چ ئامانجێك بە نرخ تر و گەورەترە لە رزگار بوون لە ئاگرو شاد بوون بە نازو رێزی نەبڕاوەی بەهەشت؟! ﴿وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ هەرکەس کێشراوەکانی یان تای تەرازووەکانی سووك بن بەهۆی بێ بڕوایی و کردەوەی بەدەوە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم﴾ هەر ئەوانە کەسانێکن کە زیانباری خۆیان بوون و خۆیان لەدەست دەرچوو، بەهۆی زایە کردنی ئەو سروشتە ئیسلامی یەی کە هەموو

کەسێك لەسەر ئەوە لە دایك ئەبێ، زایە کردنەکەشی بەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَظْلِمُونَ ﴾ بەهۆی ئەوەی لە جیهاندا ستەمیان کرد لە ئایەتەکانی ئێمە بە بڕوا پێ نەهێنان و دان پیا نەنان و هاوبەش ڕەوادان بۆ ئێمە، هەمیشەیی بوون لەسەر ئەوە تا مردن، رووکەش و روالەتی ئەم ئایەتە و وێنەی لە سورەتەکانی تردا، وا نیشان ئەدەن کە ئەو کێشانە تایبەتی نییە بە موسڵمانانەوە، بەڵکو گشتی یە بۆ بێ بڕوایانیش، وەك کۆمەڵی زانایان لەسەر ئەوەن،(قرطبی) لای وایە کە کردەوەی چاکی بێ بڕوایان ئەبێتە هۆی سووك کردنی سزا وەك ریوایەتیش هاتووە لەو بارەیەوە دەربارەی(ئەبو تالیب)، زۆر لە زانایان لەسەر ئەوەن کە کێشانەی کردەوە تایبەتییە بە موسڵمانانەوە، بێ بڕوایان هەرچەند کردەوەی چاکیان کردبێ بە هیچ دەرئەچێ و ناکێشرێ و هیچ سزایەکی پێ سووك ناکرێ، ئەوەی کە لە حەدیسدا هاتووە لەبارەی سووك کردنی سزای(ئەبو تالیب) بەهۆی خزمەت کردن و بەرگری کردن لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە شتێکە تایبەتییە بەوەوە، لەسەر هەر بار ئایەتەکە باسی تاقمێك ناکات کە چاکە و خراپەیان یەکسانە کە ئەوانە بە ئەهلی ئەعراف دائەنرێن بەلای هێندێ لە زانایانەوە، بەڵام ئەم تاقمە لەبەر ئەوەی خوا لێیان ئەبوورێ هەر بەری دەستەی یەکەم ئەکەون، بێگومان کۆمەڵ و جەماوەری ئوممەت لەسەر ئەوەیە کە هەرکەس بڕوای رێك و دامەزراوی ببێ و لەسەر ئەو بڕوایە بمرێ ئەو کەسە بەهەشتی یە ئیتر هەرچەند کردەوەی خراپی کردبێ، وەك لە چەند حەدیسی سەحیحدا بە روونی هاتووە، یەکێ لەوانە حەدیسەکەی ئەبو زەڕ کە ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: ﴿من مات لا یشرك بالله شیئا دخل الجنة﴾ هەرکەس بمرێ کە هیچ شتێکی نەکردبێ بە هاوبەشی خوا ئەو کەسە ئەچێتە بەهەشت، ئەمیش(واتە ئەبو زەڕ) گوتی:(وإن زنی و إن سرق)؛ تا سێ جار ئەبو زەڕ ئەو پرسیارەی کردو ئەویش هەر بەو جۆرە وەڵامی دایەوەو لە جاری سێ یەم دا فەرموی: ﴿علی رغم انف ابو ذر﴾ واتە بەڵێ ئەو کەسە ئەچێتە بەهەشت، وەك بفەرموێت: بە کوێرایی چاوی ئەبو زەڕو لوت نزمی و سەرشۆڕیی ئەبو زەڕ، هەروەها لە چەند ئایەت و لە چەند حەدیسی ترەوە هەر ئەوە وەرئەگیرێ، هەروەها شتێکی ئاشکرایە لە

ئیسلامدا کە رادەو پلەی ئەجرو پاداشت و تۆڵە و سزا بە پێی رادە و پلەی چاکە و خراپەیە، کەواتە ئەبێ دەستەی یەکەم بڕین بەسەر ئەوانەدا کە بە بڕوای رێك و راستەوە مردبن ئیتر با کردەوەی بەدیشیان بووبێ، ئەوانە رزگار و گەیشتوو بە ئامانجن، هەرچەند هەر ماوەیەك سزایش بدرێن، چونکە پاشە رۆژیان هەر بەهەشتە بە بێ بڕانەوە، دەستەی دووەمیش بڕین لەسەر ئەو کەسانەدا کە بە بێ بڕوایی بمرن ئیتر هەرچەند کردەوەی چاکیشیان بووبێ، چونکە ئەوانە رزگار بوونیان نابێ لە سزای ئاگردا، ئیتر هەرچەند رادەی سزای جیاواز بێت، بە کورتی هەرکەس بڕوادار بێت لەو دەستەیە کە کێشراویانە قورسە، هەرکەس بێ بڕوا بێ لەوانەیە کە کێشراویان سووکە، دەستەیەك لە زانایان لەسەر ئەوەن کە بێ بڕوایان کردەوەیان ناکێشرێ و بەڵگەیان ئەوەی کە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا ﴾ هیچ کێشانەیەك بۆ ئەوانە دانانێین، بەڵام وتەی(وزن) کە بۆ دوو مەبەست بەکار ئەهێنرێ: کێشانە، نرخ و رێز. چاك وایە لەم ئایەتەدا مەبەستی دووەمی لێ بگیرێ، بەڵکو دڵ هەر بۆ ئەوە ئەڕوا، چوونکە رووی نەکراوەتە کردەوە، بەڵکو رووی کراوەتە نەفسی بێ بڕواکان: ﴿فلا نقيم لها وزنا﴾ هیچ وەزنێك دانانێین بۆ ئەوانە، واتە هیچ نرخ و رێزێك، ئیتر با کردەوەکانیان بکێشرێ، بەڵام لە ئایەتەکانی تردا رووی کراوەتە کردەوە: ﴿خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ واتە کردەوە کێشراوەکانی، بەم جۆرە ئەم ئایەتە رێك و گونجاوە لەگەڵ ئەو ئایەتانەی تر کە وا نیشان ئەدەن و وا ئەگەیەنن کێشانە هەیە بۆ کردەوەی بێ بڕواکانیش، هەروەها لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە هیچ سوود و بەرهەمێك دانانێن بۆ کردەوەی چاکی بێ بڕواکان، کورتەی باسەکە ئەمەیە: کێشانەی کردەوە گشتی یە بۆ بێ بڕوایش، بەڵام بێ بڕوا رزگار نابێ بە کردەوە چاکەکانی، هەرچەند ببن بەهۆی سووك کردنی سزای، ئەمەی کە گوتمان پوختە و پاکیزەی رای زانایانە کە لە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکاندا هەیە، خوا خۆی باش ئەزانێ.

وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾

**له پاش فەرماندان بە پەیڕەوی و شوێن کەوتنی ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) جڵەوگیریی لە پەیڕەوی کردنی هەر شت و هەرکەسێکی تر، ئینجا چەند جۆرێك لە چاکە و بەهرە گەورەکانی ئەخاتە بەرچاو تا بەندەکانی بیر بکەنەوە و چاولەبەری ئەو چاکە و بەهرەیانە ببن و بە سۆز و پەرۆشەوە گوێرایەڵی بکەن، لە یەکەم جارەوە باسی دامەزراندن و نیشتەجێ کردنی تیرەی ئادەمی ئەکات لەم زەوییەدا لەگەڵ فەراهەم هێنانی هۆی ژیان و گوزەرانی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ سوێند بەخوا ئێمە ئێوەمان دامەزراندووە و نیشتەجێمان کردن لە زەویدا، یان دەسەڵات دارو توانامان کرد و بەسەر کارو کردەوە کردن لە زەویدا کە خێرو بێری دەستگیر بکەن بۆ خۆتان.**

**ئەم ئادەمی یە لەم زەوییەدا ئەژی و ئەو هەموو بەرو بەرهەم و نازو نیعمەتەی بەکار ئەهێنێ لەگەڵ ئەوەدا زۆر بە بێ ئاگایی و بیر ناکاتەوە لە فەراهەم هێنانی ئەو هەموو شتە نایابە و ئەو هەموو کاروبارەی کە خوا دایهێناوە و کۆی کردوونەتەوە لە جیهان و بوونەوەردا، تا بە هۆی هەموو ئەوانەوە ژیان بەسەر بەرێ. خوای میهرەبان ئەم زەوییەی دروستکردووە لەسەر بارو رادەیەك و پێکی هێناوە لە چەند بەش و کەرەسەیەك ئەگەر هەموو جۆرە گۆڕانێکی تێدابکرێ ژیان ناگونجێ یان بەرێکی ناڕوا، قەبارەکەی رادەی دووری لە خۆرو مانگ، گەڕان و چەرخەی بە دەوری خۆی وخۆردا، رادە سستی وچەسپانی بزووتنەوەکەی... هتد، ئەو هەموو رێکخستن و گونجاندنەی کە زۆربەی دەرکەوتووە و بەرە بەرەش دەرئەکەون، ئەگەر هەرکام لەوانە نەبێ ژیان نابێ یان بە رێکی ناڕوا، خوا ئەو هەموو خۆراك و رۆزی یەی لەم زەوییەدا داناوە، ئەو هەموو هێزو وزەی تێدا فەراهەم هێناوەو بە بێ ئەوانە ژیان بەسەر نابرێ، خوا ئەم زەوی یەی ژێر بار کردووە و ئادەمی گێڕاوە بە ئاغا و کاربەدەستی کە بتوانێ ژێر باری بکات و بەکاری بێنێ لە داخوازو پێویستی خۆی دا، ئەگەر دامەزراندن و ژێر بار کردنی خوا نەبوایە ئەم ئادەمی یە لاوازە نەیئەتوانی زاڵ ببێ و ئەو هەموو شتە گەورەو گرنگانە ژێر بار و دەستکەوتی خۆی بکات، جا لەبەر ئەوە ئەوا قورئان ئادەمی بێدار ئەکاتەوە و دەست نیشانی بۆ کرد و بەو سوێند و دڵنیا کردنە سەرنجی**

راکێشا و فەرموی: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الْأَرْضِ﴾، فەرموی: ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ﴾ گێڕاومانە بۆ ئێوە لە زەویدا چەند شتێ کە هۆی گوزەران و ژیانتانە لەو هەموو خۆراك و خواردەمەنی یەی کە نۆشی ئەکەن و پێی ئەژین. دەست نیشان ئەکات بە سێ شت کە زۆر گرنگن:

١- بوونی ئەو شتانەی کە هۆی ژیان و گوزەرانن.

٢- بوونی ئەو شتانە لە وڵات و نیشتمانی خۆیاندا.

٣- ئەو شتانە هی خۆیانە و موڵکیانە.

کەواتە ئەبوایە ئەو خەڵکە زۆر چاو لەبەر و سوپاس گوزار بوایە، کەچی بە داخەوە بەم جۆرە بوون کە ئەیدا بە ناوچاوانیاندا، ئەفەرموێ: ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ زۆر کەم ئێوە سوپاس ئەکەن، سوپاس لە شەرعدا بریتییە لە بڕوا بەو خوایەی کە خاوەنی چاکە و بەهرەیە، دان نان پێی بە زمانی، بەکارهێنانی ئەو چاکە و بەهرەیە لە ڕەزامەندی خودا، جا لەمەوە بیر بکەینەوە ئایا کام لە ئێمە هەڵئەستێ بەو سوپاسە بە ڕێك و تەواوی؟ ئینجا باس و هەواڵی ئەم ئادەمی یە دەست پێ ئەکات بە چەند ڕووداوێ گرنگەکانی، لە یەکەمجارەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ﴾ وتەی(خلق) بۆ دوو مەبەست بەکار ئەهێنرێ، یەکەم بڕیاردانی هەر شتێ لە پێشەوە لەسەر بارو شێوەی تایبەتی خۆی، لە بنەڕەتدا لە زمانی عەرەبدا بەم جۆرە مەبەستە و بەکار ئەهێنرێ، ئینجا بەکار هێنراوە بۆ داهێنان و دروستکردنی ئەو شتە بڕیاردراوە، جا لێرەدا بە هەردووبار ئەگونجێ، ئینجا وتەی( ثم) لە بنەڕەتدا بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی جیاوازی و دوا و بەری دوو شت لە کات و زەماندا. هێندێ جار بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی دواو بەریی لە باسکردندا، واتە دوو شت کە کاتیان یەك بێ یا دواو بەریی لە باسکردندا یەکێکیان پێش بخرێ، ئیتر با ئەو پێشخراوە لە کاتدا لەدوا بێت، جا لێرەدا بە پێی هەر بارێ تەفسیری جیاوازە و چاك وایە ئەو تەفسیرانە باس بکەین:

لەسەر باری یەکەم: بێگومان ئێمە بڕیاری دروستکردنی ئێوەماندا لەسەر بارو شێوەی تایبەتی خۆتان، ئینجا لە پاش ئەوە شێوەو نەخشەمان کێشان بەو جۆرەی کە بڕیارمان دابوو،وێنەوشتەتایبەتی یەکانی خۆتانمان بەدی هێنا بۆتان، لەسەر ئەم بارە ئادەم و هەموو ئادەمی چون یەکن لەمەدا کە لە پێشەوە بڕیاری دروست کردنیان دراوە لەسەر بارو شێوەی تایبەتی خۆیان، ئینجا لەپاش ئەوە هەرکام بارو شێوەی خۆی بەدی هێنراوە.

لەسەر باری دووەم: بێگومان ئێمە ئێوەمان دروستکرد و داهێنا بە دروستکردنی ئەو مادده و کەرەسەی کە یەکەم کەس کە ئادەمە لێی دروستکرا، ئینجا لەپاش دروستکردنی

ئەوە شێوەو نەخشەمان کێشان، بەم رەنگە لەو مادده و کەرەسەیە ئەم شێوە و نەخشە تایبەتییەی ئێوەمان کێشا بەسەر یەکەم کەسدا لە یەکەمجارەوە و لە پاشان هەر بەو جۆرە ئەو شێوە تایبەتی یە هات بۆ نەوەکانی، یان ئێوەمان دروستکردو داهێنا بە دروستکردنی یەکەم کە ئادەمە، ئینجا لەپاش ئەوە ئێوەمان شێوەو نەخشە کێشا لە پشتی ئەودا، واتە مەبەست لە دروستکردنی باوکی هەمووانە کە دروستکردنی هەر تیرەیەك بە دروستکردنی یەکەم کەسیەتی، لە(ئیبن و عەباس و موجاهید و رەبیع و سدی و قتادة) - خوا لێیان رازی بێت - ئەم رایە ریوایەتکراوە، یان مەبەست ئەوەیە: ئادەمی دروستکرد لە پشتی باوکەکانتان و لە پاشان نەخشەمان کێشان لە منداڵدانی دایکەکانتاندا، وەك لە ریوایەتی(بوخاری و موسلیم) دا هاتووە، لەسەر هەر بار و رایەك لەمانەی کە تێپەڕیان کرد، وتەی(ثم) لەسەر مەبەست و واتای ئەسڵی خۆیەتی، واتە جیاوازی و دواو بەری کاتی دروستکردن و نەخشە کێشانەکە، رایەکی تر هەیە کە مەبەست دروستکردنە لەسەر ئەم بارو شێوەیە و بەم سورەت و وێنە تایبەتییەی کە هەیە، لەسەر ئەم رایە(ثم) بۆ گەیاندنی جیاوازی کات نییە، بەڵکو بۆ رێز پێدان و بە گرنگ گرتنی شێوەو نەخشە کێشانەکەیە، واتە دروستمان کردن بەم گیانلەبەرە تایبەتییە، گرنگ تر ئەوەیە ئەم شێوە و شکڵە جوانەتان پێدرا. بێجگە لەم تەفسیرانە چەند تەفسیرێکی تریش گوتراوە، بەڵام هەر ئەگەڕێنەوە بۆ ئەم تەفسیرانەی کە گوتران، لەبەر ئەوە پێویست نییە بە هێنانیان، لەسەر هەموو راو بارەکان ئەم دەقە قورئانی یانە و هەموو دەقەکانی تر لە بارەی پەیدا بوونی ئەم تیرە گیانلەبەرەوە وا ئەگەیەنن و نیشان ئەدەن کە هەر لە یەکەمجاری دروستکردنی یەوە هەر بەم جۆرە تایبەتییە هاتووە، نەك لە تیرەو جۆرێکی ترەوە هاتبێ و بەرە بەرە بەرز بووبێتەوە تا دواترین پلەی گەیشتبێتەوە ئەم بەرزترین پلەیە، وەك داریونی یەکان ئەڵێن. بەڵێ بەهەر جۆر پەیدا بووبێ لە بنەڕەتدا و هەر شتێکی تر بووبێ خوای پەروەردگار دروستکردووە و دایهێناوە و هیچ کەسێکی تر دەخلی نییە لە پەیدا بوون و گەیاندنی بەم رادەو پلەی ئێستای، قورئان چەند قۆناغێ دائەنێ بۆ ئەم ئادەمی یە کە لە پێشەوە لەسەریان بووەو لە هیچ کامیاندا لەسەر ئەم بارو شێوەی ئێستا نەبووە: خۆڵ، قوڕ، قوڕی ترشاو، قوڕی مچ، سواڵەت، دەی ئەگەر ئەو نەزەری یەش کە داریونی یەکان ئەڵێن راست بێ چی روو ئەدا، پاش ئەوە کە خوا ئەو شتانە ئەکات و بەدی ئەهێنێ، لەگەڵ ئەوەدا لەم دوایی یەدا دەرکەوت بۆ زانایان ناڕاستی و بێ بنج و بنەوانی ئەو نەزەری یەیە، بەڵکو دەرکەوت هەموو جۆرە گیانلەبەرێك تەنانەت

رووەكی یەكانیش، چەند كەرەسەیەكی تیایە پارێزەری ئەو جۆرە تایبەتییەیە، بە جۆرێك ناگونجێ گۆڕانی هیچ جۆرێك بە جۆرێكی تر، لەبەر ئەوە ئەو نەزەری یەیان بە درۆو هەڵە و پوچ دەركرد. ئەوانەی كە ئەو نەزەرییە و دەنگ و باسەیان خستە ناو مەبەستیان تێكدانی مێشكی نەفامانە و بێ بڕوا كردنیانە بەڵام بە داخی سەختیانەوە ئەگەر نەزەریەكەیان راستیش بوایە نەئەگەیشتن بە ئاوات و ئامانجە بۆگەنەكەیان، تا بێت شتە نهێنییە گرنگەكانی ئەم بوونەوەرە دەرئەكەون و ئاشكرا ئەبن، بە هۆی ئەوەوە تا بێت بڕوا بە خوا بەهێزو پتەو تر ئەبێت، سوپاس بۆ پەروەردگار، ئینجا دێتە سەر باسی چاكە و بەهرەیەكی زۆر گەورە و گرنگ ئەوەش ئەمەیە كە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ واتە ئێوەمان دروستكرد ئیتر لەسەر هەر كام لەو بار و جۆرانەی كە باسكرا، ئینجا پاش دروستكردنی یەكەم كەس و شێوەو نەخشەكێشانی و گیان بە بەرا كردنی و فێركردنی هەموو ناوەكان، وەك لە سورەتی(البقرة) دا بە درێژیی باسكرا، لەپاش ئەوە گوتمان بە فریشتەكان: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، واتە سوژدەی ڕێز پێدان لەلایەن خواوە، نەك سوژدەی پەرستن، چونكە ئەوە تایبەتی یە بە خواوە وەك لەچەند ئایەتدا بە روونی وەرئەگیرێ ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾ ئەوانیش بە بێ تەفرە هەموو سوژدەیان برد بێجگە لە شەیتان كە ناوی ئیبلیسە، ئەم تاوانبارە هەرچەند لە تیرەی فریشتە نەبووبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی تێكەڵ و هاوبەشیان بووە لە زۆر شتدا بە یەكێ لەوان نیشان دراوەو خراوەتە ریزی ئەوان و لەوان دەركرا لە سوژدەبردنەكەدا، یان ئەڵێین: بەڵام ئیبلیس ﴿لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ لە سوژدە بەران نەبوو بۆ ئادەم، سەرپێچی كرد لەو فەرمانە، لەسەر باری یەكەم پێی ئەگوترێ موستەسنای موتەسیل، لەسەر باری دووەم پێی ئەگوترێ مونقەتیع، فریشتە و جنۆكە و شەیاتین دروستكراوێكی نهێنی و نادیارین، ئێمە هیچیان لێ نازانین بێجگە لەوەی كە لە قورئان و حەدیسدا هاتووە، وەك لە چەند شوێنێكدا بە درێژیی باسمان كرد یەكێ لەوانە لە دوا دوایی سورەتی (الأحقاف) دا كە لە پێشەوە تەفسیرم كرد.

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ

---

**﴿قَالَ﴾ خـوا فـەرمـوی پێـی ﴿مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ﴾ ئایـا چـی تـۆی بـەرگری کـرد لـەوەی سوژدە بەری کاتێ کە من فەرمانم پێتدا؟ یان ئایا چی تۆی پاڵ پێوەنا و ناچاری کردی بۆ سـوژدە نـەبردن؟ یـان چـی تـۆی هێنایـە سـەر سـوژدە نـەبردن؟ لەسـەر بـاری یەکـەم وتـەی(لا) زیـادەو وێنـەی ئـەوە هەیـە لـە زمـانی عەرەبـدا، لەسـەر ئـەم دوو بارەکـەی تـر زیـاد نییـە، ئـەو نەفرین لێ کراوە ئەیزانی کە خوا داهێنەر و کاربەدەست و خاوەنە، بەڵام رەخنـەی ئـەگرت لـە کارو فەرمانی خواو بە نادادیی دائەنا وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ شەیتان گوتی: ﴿أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ من چـاکترم لـە ئـەو چـونکە ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾ تـۆ منـت دروسـتکردووە لـە ئـاگرو ئـەوت دروسـتکردووە لـە قـوڕ، کەواتـە سـوژدە بردنـی مـن بـۆ ئـەو ناڕاسـت و بـێ جێیـە، وەڵامـی ئـەو نەفرین لێکراوە نەفامی و نەزانی یەکی ئاشکرای تیایە و حەسادەت و خۆ بە زل زانی سـەری لێ تێك داو دووچاری ئەوەی کرد تا ئـەو رادەیـە رەخنـەی گـرت لـە کـاری پـەروەردگاری و بـە ناڕاست و بە بێ جێی زانـی، بێگومـان هەرکـەس هـەر کـارێکی خـوا بـە ناڕاسـت و بـە بـێ جـێ بزانێ ئەو کەسە بڕوادار نییە و هەر بڕوایەکی ببێ بڕوای راستەقینە نییـە و لێـی وەرنـاگیرێ ﴿قَالَ﴾ خـوا پێـی فـەرمو: ﴿فَٱهْبِطْ مِنْهَا﴾ کەواتـە بچـۆ خـوارەوە لـە بەهەشـت و لێـی دەرچـۆ ﴿فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ چونکە نییە بۆ تۆ و نابێ خۆت بە گەورە بزانی و خۆ بە زل زانی بکـەیت لـە بەهەشـتدا، ﴿فَٱخْرُجْ﴾ کەواتـە دەرچـۆ ﴿إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ چـونکە بەڕاسـتی تـۆ لـە زەلیـل و ریسواو بێ نرخەکانی، ئینجا ئایا مەبەست لەو بەهەشتە بەهەشتی راستەقینەیە کە لە رۆژی دواییـدا ئـەبێ بـە جێـی نیشـتەجێی خواناسـان و چـاکان وەك زۆربـە لەسـەر ئـەوەن؟ یـان مەبەست باغێکی خۆش بووە لـەم جیهـان و زەوییـەدا بـە جێگـا و شـوێنێکی بـەرزەوە، ئیتر لـە عەدەن یـان لـە شـوێنێکی تـر وەك هێنـدێ ئەفـەرمون، و لـە(ئیبن و عـەباس) ەوە – خـوا لێیـان**

رازی بێت – ریوایەتکراوە، هەرچۆن بووبێ شتەکە راستە و پێویست نییە لەسەر رۆیشتنی و دەمەقاڵێ تیایدا، هەرکەس هەر رایەکی بەلاوە چاکە هەڵیبژێرێ بۆ خۆی، ئەو شەیتانە نەفرینی لێکراوە و دەرکرا لە بەهەشت و بڕیاری زەلیلی و ریسوایی درا، بەلاّم سروشتە بەدەکەی ماوەی نادا هەر وا بێ دەنگ ببێ لەبەر ئەوە ﴿قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ گوتی: ئەی پەروەردگارم، کەواتە مۆڵەتم بدە و مەمکوژە تا ئەو رۆژەی کە ئادەم و نەوەکانی زیندوو ئەکرێنەوە، ﴿قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ﴾ خوایش فەرمووی: بێگومان تۆ لە مۆڵەت دراوانی، لێرەدا هەر ئەوەندەی فەرمو، بەلاّم لە سورەتی(حجر) دا ئەمەشی هەیە: ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ﴾ تا رۆژی ئەو کاتەی کە زانراوە، چەند ریوایەتێك هاتووە کە مەبەست لەو رۆژە کاتی یەکەمی فوکردنە بە سووردا کە هەموو کەس بەوە ئەمرێ بێجگە لەو کەسانەی کە خوا ویستبێتی نەیانمرێنێ کە ئەوانەش چوار فریشتە گەورەکانن و هەڵگرانی عەرشن، وەك لە ریوایەتدا هاتووە، بێگومان رۆژی دوایی لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات، ئیتر بە بێ بڕانەوە، لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێیان رازی بێت – ریوایەتکراوە کە ئەو لەعینە ویستوویەتی مردن نەچێژێ، چونکە داوای کردووە تا رۆژی زیندوو کردنەوە نەمرێ، هەرکەس تا ئەو رۆژە نەمرێ ئیتر هەرگیز نامرێ، چونکە ئەو رۆژە بەرپا بوو تازە مردن نامێنێ وەك لە ئایەت و حەدیسەوە دەرئەکەوێ، ئینجا ئەو نەفرین لێکراوە بە بێ شەرمی و کەشخەیەکەوە: ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي﴾ کەواتە سوێند بە گومڕا کردنی تۆ بۆ من، یان بەهۆی گومڕا کردنی تۆ بۆ من بەهۆی ئەوانەوە، ﴿لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ بێگومان دائەنیشم بۆ ئادەم و نەوەکانی لە رێگە راستەکەی تۆدا کە ئەڕوا بۆ بەهەشت ئەو سەرە رێگەیان لێ ئەگرم ﴿ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ﴾ ئینجا بۆیان ئەچم لە پێش دەمیان و لە دویانەوە و لەلای راستیان و لەلای چەپیانەوە، واتە ئەبم بە رێگر لێیان لە هەر چوار لاوە بە وێنەی دوژمن کە لە هەموو لایەکەوە پەلامار ئەدا، ئەوەی کە پێم بکرێ بەکاری ئەهێنم بۆ گومرا کردنیان، لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێیان رازی بێت – ریوایەتکراوە کە مەبەست بە یەکەم رۆژی دوایی یە، دووەم ئەم جیهانەیە، سێ یەم چاکە و کرەوە چاکەکانیانە، چوارەم خراپە و گوناهەکانیانە، واتە لەو هەموو بارەوە هەوڵ ئەدەم بۆ گومڕا کردن و لادانیان لە رێگە راستەکەت،

وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا

---

﴿وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ﴾ دەستت ناکەویٚ زۆربەیان بە گوێرایەڵ و سوپاس گوزار، بۆ چاکە و بەهرەکانی تۆ، مەیل و خواهیشی خوا داخواز بوو بۆ ئەوەی ئەم ئادەمییە بە جۆریٚ دروستبکات کە ئامادەیی تێدا بیٚ بۆ چاکە و خراپە، بۆ وەرگرتنی ڕێنموونی و گومڕایی، هەست و هۆش و ژیریی یەکی پیٚ بەخشی کە باوی چاکە بدات بەسەر خراپەدا، پێغەمبەر(ﷺ) و بەرنامەی بۆ نارد، مەیل و خواهیشی پێدا بۆ هەڵبژاردنی هەر ڕێگە و بارێك، کەواتە بە پێی باوی خوا و بە پێی مەیل و خواهیشی خوا گومڕایی و ڕێنموونی بەدی دێت، جا بەهۆی ئەوەوە شەیتان ڕێی لیٚ نەگیرا و بەرەڵاٚ کرا بۆ کارو کردەوەی بەدی خۆی تا دەرکەویٚ کیٚ شیاوو شایستەی ڕێزو بەهەشتە و کیٚ شایستەی سزاو دۆزەخە، لە بەرامبەر ئەو هەڕەشەی شەیتانە: ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی ﴿ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا﴾ دەرچۆ لە بەهەشت بە لۆمە لێکراوی و لەکەدار کراوی و دەرکراوی و دوور خراوی لە میهرەبانی خوا ﴿لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ سوێند بەخوا هەرکەس لەوان شوێنی تۆ کەوتبیٚ لە جیهاندا بێگومان دۆزەخ پڕ ئەکەم لە ئێوە هەموو پێکەوە، خوای پەروەردگار ماوەی شەیتان و تیرەکەیدا لە گومڕا کردندا، ماوەی ئادەم و ڕۆڵە و نەوەکانیشیدا بۆ هەڵبژاردنی هەر بارو ڕێگەیەك، لەبەر بەدی هاتنی ئەو تاقیکردنەوەی کە خواهیش و کاردروستی خوا داخواز بوو بۆی، داخواز بوو کە ئەم ئادەمی یە بەم جۆرە تایبەتی یە دروست بکات، کە نە فریشتەیی و نە شەیتان، چونکە ئەم ئادەمی یەی دروستکرد بۆ کاروبارێکی تایبەتی، جیاواز لە کاروباری فریشتە و شەیتان لە پاش دەرکردنی شەیتان لە بەهەشت بەو جۆرەی کە باسکرا، ئینجا باسی ئادەم و هاوسەرەکەی دێتە پێشەوە، ڕووی فەرمودەیان تیٚ ئەکات، بۆ ئەوەی کاروباری ژیانیان پیٚ ڕاگەیەنی، بۆ پەروەردەکردنیان و ئامادەکردنیان بۆ کارو فەرمانی سەرەکی یان، کە بریتی یە لە جێنشینی لە زەویدا وەك لە ئایەتی(البقرة) دا باسی فەرمو،

ئینجا ئایا ئەو هاوسەرە چۆن دروستکرا؟ لەبەر ئەوەی هیچ دەقێکی قەتعی نییە بەدەستەوە و شتەکەش غەیبی و نهێنی یە چاك وایە لەسەری نەڕۆین و هەر ئەوەمان بەسە کە خوا هاوسەری بۆ داناوە و باسی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ئەی ئادەم تۆ و هاوسەرەکەت نیشتەجێی بەهەشت بن و بمێننەوە تێیدا ﴿فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا﴾ ئینجا بخۆن تێیدا لە هەر شوێنێ کە ویستتان و حەزتانکرد ﴿وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ نزیکی ئەم درەختە مەکەونەوە، واتە بە هیچ رەنگ لێ ی نەخۆن، ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بگەڕێن لە ستەمکاران لە خۆتان، واتە ئەگەر لێی بخۆن ئەچنە ریزی ئەوانەی کە ستەم لە خۆیان ئەکەن، قورئان بێدەنگە لە دیارییکردنی جۆری ئەو درەختە، چونکە ئەو دیاریی کردنە هیچ مەبەستێکی تایبەتی تێدا نییە بۆ ئەو قەدەغە کردنە، کەواتە ئەوەی مەبەستە هەر قەدەغە کردنەکەیە کە تاقی کردنەوەکەی پێ پێکدێت، بەوە دەرئەکەوێ ئەو کەسەی زاڵ و خۆگرە بەسەر ئارەزووەکانیدا، کێ حاکمە بەسەر ئارەزووەکانیدا و کێ ژێر دەستە و خۆ نەگرە و دەستە پاچەیە بەرامبەر ئەو ئارەزووانە، بەهۆی ئەوەوە جیا ئەبێتەوە لە گیانلەبەرانی تر.

ئینجا دێتە سەر باسی کارو کردەوەی شەیتان کە هەمیشە لێ بڕاوە بۆی، ئەفەرموێ: ﴿فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ ئینجا شەیتان خەیاڵ و خەتەرەی خراپ و بەدی خستە دڵیان و بۆی رازاندنەوە لەبارەی شکاندنی ئەو قەدەغە و خواردنیان لەو درەختەی کە خوا قەدەغەی کرد لەسەریان ﴿لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا﴾ بۆ ئەوەی درەخت بۆیان ئەوەی کە داشاراوە لێ یان لەو عەیب و عەورەتەی کە بوویانە و بە دەرەوە نەبووە و خۆیان نەیان ئەبینی و بە خواردنی ئەو درەختە دەرکەوتن، واتە سەرەنجامی ئەو کردەوەی شەیتانە ئەوە بوو ئەو دەرکەوتنەی لێ پەیدا بوو، لەسەر ئەم بارە شەیتان نیازی ئەو دەرکەوتنەی نەکردووە، بەڵکو هەر مەبەستی قەدەغە شکاندنەکە بوو بێ و سەرپێچی لە فەرمانی خوا، بە پێ ی رووکەش و رواڵەتی ئایەتەکە هەر ئەوە بووە و ئەو نیازە بەدەی بووە، بەم رەنگە بەهۆی شتێکەوە زانیبێتی ئەو خواردنە ئەو دەرکەوتنەی لێ پەیدا ئەبێ، مەبەستی ئەوە بوو ئەو پەندەیان پێبدات و ئازاری دڵیان بدا، وەك نافەرمانی یەکەشیان پێ ئەکات،

وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾

---

لەسەر هەربارو بەهەرحالْ لە ڕێگەیەکەوە بۆیان ڕۆیشت کە پێی بخەڵەتێن و بە گوێی بکەن وەك بۆمان دەرئەخات کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ﴾ شەیتان پێی گوتن: ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ﴾ پەروەردگارتان جڵەوگیریی لێنەکردوون لەو درەختە لەبەر هیچ هۆیەك ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ﴾ مەگەر لەبەر نەویستنی ئەوەی کە ئێوە فریشتە بن و بگەڕێن بە فریشتە، یان ببن لەو کەسانەی کە هەرگیز نامرن یان زۆر زۆر ئەمێننەوە لە بەهەشتدا، واتە خواردن لەو درەختە ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئێوە ببن بە فریشتە و بچنە ڕیزی ئەوان لە هێزو مانەوەی دوور و درێژو نەگۆڕان و هیچ شتێك کارتان لێنەکات، یان بچنە ڕیزی ئەوانەی کە هەمیشەیی ئەبن لە بەهەشتدا، یان هەر نامرن، کەواتە بیخۆن با بەو جۆرەتان لێ بێ کە واشتان لێهات تازە هەروا ئەبن و خوا وازتان لێ نەهێنێ، ئینجا لەبەر ئەوەی جڵەوگیریی یەکەی خوا لە دەروونیاندا هێزو قورسی یەکەی هەبوو شەیتان بەم جۆرە بەتینە دڵنیایی کردن کە ڕاست ئەکات و ڕاستە لەگەڵیان ئەفەرموێ: ﴿وَقَاسَمَهُمَآ﴾ سوێندی بۆ خواردن کە ﴿إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ بەڕاستی و بێگومان من لەگەڵتان ڕاست ئەکەم لەو کەسانەم کە پەندو ئامۆژگاری کەرن و مەبەستیان ڕاستی ڕێنموونییە، ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ﴾ ئینجا بەرە بەرە دایبەزاندن و هێنانییە خوارەوە لە سروشتی پاك و گوێڕایەڵی خوا بۆ ڕادەی پەستی نافەرمانی بەهۆی هەڵخەڵەتاندن بەو سوێند و فڕو فێڵە تا هاتنە سەر خواردنی ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ﴾ ئینجا کاتێ کەمێکیان خوارد لەو درەختە و چەشتیان ﴿بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا﴾ دەرکەوت بۆیان عەیب و عەورەتیان، هەرکام عەیب و عەورەتی خۆی و ئەوی تری بینی، بەهۆی ئەوەوە

شەرم گرتنی، چونکە بە سروشت ئادەمی شەرم ئەکات لە بینینی ئەوە مەگەر سروشتی ئادەمێتی لەکار بکەوێ و زایە ببێ وەك لەم نەفامی تازەدا ئەوە روویدا ﴿وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ﴾ دەستیان کرد بە دانان و بەستنی گەلاّ بەسەریاندا لە گەلاّی درەختانی بەهەشت و بەوە عەیب و عەورەتی خۆیان داپۆشی ﴿وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ﴾ پەروەردگاریان بانگی لێکردن بە شێوەی سەرزەنشت و گلەیی مەندی بەم جۆرە فەرموی: ﴿أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ﴾ ئایا من جڵەوگیریم لێنەکردن لەو درەختەی کە گوتم نزیکی مەکەونەوە ﴿وَأَقُل لَّكُمَآ﴾ ئایا من پێم نەگوتن ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، واتە: کەواتە چۆن گوێرایەڵی بوون و بە قسەی هەڵخەڵەتان؟ لە پێشەوە سەرزەنشتی کردن لەسەر نافەرمانی و جوڵانەوەی پێچەوانە، ئەمە سەرزەنشتە لەسەر هەڵخەڵەتانیان بە قسەی دوژمن، کەواتە دووبارە کردنەوە نەبوو، ئینجا ئایا خوا چۆن بانگی لێکردن و ئەوانیش چۆنیان بیست؟ ئەمانە و وێنەیان شتێکی نهێنی و غەیبین، ئێمە بڕوامان پێیان هەیە و بێ ئاگاین لە چۆنییەتی یەکەیان، خوای پەروەردگار ئەو سەرزەنشتەی کردن و ئەوانیش بێجگە لە دان نان بە گوناهو پەشیمانی و داوای لێبوردن هیچیان بۆ نەمایەوە، لەبەر ئەوە ﴿قَالَا﴾ گوتیان: ﴿رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا﴾ پەروەردگارمان ستەممان کرد لە خۆمان و زیانمان بە خۆمان گەیاند ﴿وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەگەر لێمان نەبووری و تاوانمان دانەشاری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت سوێند بەخوا لە زیانباران ئەبین، زیانباری خۆمان و خۆشبەختی و رزگاریمان، لێرەدا تاقی کردنەوەی یەکەم دواییهات، دەرکەوت کە ئەم ئادەمی یە هەڵە و خراپە ئەکات، هەمیشە لەسەر رێگای راست ناوەستێ، بەڵام ئەزانێ و ئاگادار ئەبێتەوە و پەشیمانی رووی تێ ئەکات، ئەگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری و پەنای پێ ئەهێنێ، لەم تاقیکردنەوەی یەکەمەوە و ئاگادار کردنەوە ئامادەیی پەیدا کرد بۆ ئەوەی بچێ بەدەم کاری خۆیەوە، کاری جێنشینی کە بۆی دانراوە، ئامادەیی پەیدا کرد بۆ ئەوەی بکەوێتە بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنە کۆڵ نەدەرەکەی لەبەر ئەوە،

قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾

---

**﴿قَالَ﴾ خـوا فـەرموی: ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ بـچنە خـوارەوە بـۆ بەهەشـت ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾ لەکاتێکدا هێندێکتان دوژمنە بۆ هێندێکی تر، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم فەرمانە رووی کراوەتە ئادەم و حەواو شەیتان، لەسەر ئەم رایە هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە هێندێکتان کە شەیتانە دوژمنە بۆ هێندێکی تر کە ئادەمی و ئینسانە، چونکە هەر شەیتان کەمەری دوژمنایەتی بەستووە بۆ ئادەمی و سروشتی لەسەر ئەوەیە، ئادەمی هەر ئەوەندە پێویـستە لەسـەری شـەیتان بـە دوژمـن سـەیر بکـات، هێنـدێکی تـر ئەفـەرمون مەبەست دوژمنایەتی یانە بۆ یەکتر، شێوە راستەکەش وا نیشان ئەدات! ﴿بعضكم لبعض عدو﴾ کە ئەو رستەیە بەکار ئەهێنرێ بۆ هاوبەشی یەکتر، ئەو کاتە ئەبێ مەبەست ئەوە بێت: بچنە خوارەوە لە کاتێکدا کە ئێوە دوژمنی یەکترن و دوژمنی یەکتر ئەبن، دوژمنایەتی شەیتان و تیرەکەی ئاشکرایە، بەڵام دوژمنایەتی ئادەمی بە پێی دوژمنایەتی خوا ناسانە کە قین و خەشمیان هەیە بۆی و هەمیشە ئەیانەوێ بە پێچەوانەی شەیتان کارو کردەوە بکەن و هەموو کاروبـارێ بـە دژی شـەیتان بـروا و پێـك بێـت، کەواتـە هاتنـە خوارەوەکـەیان بـۆ ئەوەیـە کـە دژایەتی و بەرەبەرەکانی یەکتر بکەن، تا تاقی کردنەوەی ئادەمی پێك بێت و ئەوەی کە خوا بیـەوێ بـەدی بێـت، بێجگـە لـەم رایـە دوو سـێ رای تـریش هەیـە، بـەڵام بەلامـەوە لاوازن و پێویست نییە خۆ خـەریك کـردن پێیانـەوە ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ﴾ بۆتان هەیە لە زەویدا نیشتەجێیی و هۆی رابواردن و ژیان تا ماوە و کاتێك کە کاتی دیاریی کراوە بۆ مردن چ مردنـی یەکـە یەکـە، چ مردنـی هـەموو تـەواوی تیرەکـەیان ﴿قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ﴾ خـوا فـەرموی لـە زەویـدا ئـەژین و لـە زەوی دا ئـەمرن و لـە زەویـدا دەرئـەهێنرێن و**

**زیندوو ئەکرێنەوە. ئەم وتەیەی جویێ کردەوە و بەسەربەخۆ فەرمویێ، چونکە زۆر گرنگە و شایانە بۆ بیر لێکردنەوە.**

**لە پاش ئەوەی باسی پەیدا بوونی یەکەمجاری ئادەمی کرد، لەوەدا دەرکەوت کە ئەم ئادەمی یە لە یەکەمجارەوە لەناو نازو رێزو نیعمەتدا بووە، شەیتان بوو بەهۆی نەمانی نەوەکانی ئادەم ئەکات، ئەفەرمویێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەی رۆڵە و نەوەکانی ئادەم ﴿قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ﴾ بێگومان هێناومانەتە خوارەوە بۆ سەرتان پۆشاکێ کە عەیب و عەورەتتان ئەشارێتەوە، زینەت و ئارایشتیشە، واتە ئەو پۆشاکە دوو سیفەت و سوودی هەیە: داشاردنی عەورەت، زینەت و ئارایشکران، وتەی(ریش) بە سێ جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: ماڵ و سامان، خۆش گوزەرانی، هەر شتێ کە پێویستی ببێ پێی، مەبەست لە هێنانە خوارەوەی دروست کردنی ئەو شتانەیە کە هۆی فەراهەم هاتنی ئەو پۆشاکەیە کە ئەو هۆیانەش لە ئاسمان و لەلای سەرەوە دێن، وەك(حسن) ئەفەرمویێ. یان مەبەست پێدان و پێ بەخشینە وەك(ئەبو سليم) ئەفەرمویێ، یان مەبەست بڕیار دانە کە بڕیار و قەزا و قەدەری خوا لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە، باس و بیر خستنەوەی ئەم پۆشاکە کە خوا داویەتی بە بەندەکانی، هەرچۆنێ رێك و پێك و پەیوەستە بە باس و بیر خستنەوەی ئەو رووتی و دەرکەوتی عەورەتەی کە شەیتان بەسەری باوك و دایکی هەمووانی هێنا، هەرچۆنێ لەم بارەیەوە رێك و پەیوەستە هەروەها رێك و پەیوەستە لەگەڵ ئەو بارو حاڵەی کە عەرەب لەسەری بوون لە سەردەمی نەفامیدا، وەك(ئیبن و کەسیر) لە تەفسیرەکەیدا باسی ئەکات کە ئەفەرمویێ: عەرەب بێجگە لە قورەیش تەوافیان نەئەکرد لەو پۆشاکانەی کە لەبەریان کردبوو، بەم بۆنەیەوە گوناهیان تێدا کردووە، کەواتە یان ئەبوایە قورەیش پۆشاکیان پێبدانایە و بەوەوە تەوافیان بکردایە، یان بە رووتی تەوافیان ئەکرد، بەرامبەر ئەو دوو شتە خوا باسی چاکەی خۆی ئەکات بەسەر بەندەکانییەوە لە داهێنان و فێر کردن و فەرماندانی بە پۆشینی پۆشاك بۆ نەهێشتنی رووتی کە رووتی و بەرەڵایی شتێکی قیزەون و ناپەسەندە بە سروشت و ناڕێکە لەگەڵ ئادەمێتیدا، مەگەر بەلای ئەوانەی کە لەسەر سروشت و تەوەرەی ئادەمێتی ترازاون، وەك لەم سورەتی نەفامێتی تازەدا، پۆشینی پۆشاك هەرچۆنێ ئادەمی ئەپارێزێ**

لەو رووتی و ناپەسەندییە، هەروەها جوانیی و شیرینش ئەدا بە مەردوم کە ئەمەش شتێکی ئاشکرایە لە پێش چاوی هەرکەسێك کە بەشدار بێت لە سروشتی ئادەمێتیدا، ئینجا پۆشاك دوو جۆرە:

١- پۆشاکی ئاشکرا کە ئەبینریٰ و عورەت و عەیبی ئاشکرا دائەشاریٰ و مایەی جوانیی و ئارایشتی ئاشکرایە.

٢- پۆشاکی نهێنی کە سروشت و ژیریی ئەیبینیٰ و هەستی پێئەکات کە ئەو پۆشاکە نهێنی یە هەموو عەیب و عەورەتی نهێنی بەرگری ئەکات و دایان ئەشارێتەوە وەك رێنموونیمان ئەکات بەم فەرمودەیە کە بە دوای ئەو پۆشاکە ئاشکرادا ئەفەرمویٰ: ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ پۆشاکی لە خوا ترسان و شەرم و بیم لە خوا، ئەو پۆشاکە گرنگە باشترە، لەم پۆشاکەوە رووتی و بەرەڵایی و پێویستی بە نەهێشتنی، هەرکەس لە خوا نەترسیٰ و شەرمی لیٰ نەکات گوێی نییە لە رووتی و بەرەڵایی، بەڵکو هەوڵیشی بۆ ئەدات و خەڵکیشی بۆ بانگ ئەکات، وەك ئەبینریٰ بە چاو، هۆی داپۆشینی لەش و هەوڵدان بۆی شەرم و حەیایە نەك تەنها باو و عورف و عادەتێك بێت، وەك ئەوانە ئەڵێن کە شوێن کەوتووی سەهیۆنی و سەلیبی یەکانن و بە پێی تەمیٰ و بەرنامەی ئەوان رەفتار ئەکەن و بە تایبەتی ئەیانەویٰ پرۆتۆکۆلەکانی حوکەماوی سەهیۆن بەدی بێنن و بیچەسپێنن، بەڵیٰ بەڕاستی تەنها باو و عورف و عادەت نییە، بەڵکو سروشتێکە کە خوا دروستیکردووە لە ئادەمیدا، وەك بەندێکە لە بەندەکانی شەریعەتەکەی خواو پێویستیکردووە لەسەریان، ﴿ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی کە باسکرا لە بارەی پۆشاکی ئاشکرا و نهێنییەوە هێندێکە لە بەڵگە و نیشانە ئاشکراکانی خوا لەسەر چاکە و بەهرەی میهرەبانی خوا بە بەندەکانی ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیر بکەنەوە و ئامۆژگاری وەرگرن و هەڵسن بەوە کە خوا پێویستی کردووە لەسەریان لە سوپاس و گوێرایەڵی فەرمانەکانی، زانایان تەفسیری ئەو وتەی ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ یان کردووەتەوە بە چەند تەفسیرێك هێندێکیان بە دوورو هێندێکیان بە نزیك دائەنرێن، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا گوتمان لە دڵدا بەهێزو جێگیرە.

يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾

---

له بانگ کردنی یەکەمدا دەست نیشانی کرد بە فڕو فێڵ و کردەوەی بەدی شەیتان لەگەڵ یەکەم باوك و دایکمان تا بوو بەهۆی بەسەرهاتنی بەدیان، ئینجا لەم بانگ کردنەی دووەمدا بێدارمان ئەکاتەوە کە وریای خۆمان بین و نەچین بە دەم ئەو دوژمنەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەی رۆڵە و نەوەکانی ئادەم ﴿لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ با شەیتان نەتانخاتە ناو بەڵاو ناڕەحەتی ﴿كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ هەرچۆنێ باوك و دایکتانی لە بەهەشت دەرهێنا، واتە هەرچۆنێ ئەوانی خستە بەڵا و ناڕەحەتی بەم رەنگە لە بەهەشت دەری هێنان و بوو بەهۆی ئەو بەسەرهاتە سەختە ﴿يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا﴾ واتە دەری کردن لە بەهەشت بە جۆرێ پۆشاکەکەیانی لێ داکەندن، واتە بوو بەهۆی ئەوە ﴿لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآ﴾ بۆ ئەوەی عەیب و عەورەتەکەیان دەرخات و نیشانیان بدات، واتە کارێکی وای کرد پۆشاکەکەیانی لەبەر داکەندن و عەیب و عەورەتەکەیانی دەرخست و خستی یە بەرچاویان، بەڵام بۆ ئەوەی ئێمە زیاتر خۆمان بپارێزن و دوور کەوینەوە لە شوێن کەوتنی شەیتان، بە وتەی رابردوو نەیفەرمو، بەڵکو بە وتەی ئێستا فەرموی: ﴿ينزع، ليرهما﴾ کە ئەو جۆرە دەستەواژەیە(تعبیر) باوە لە رەوان بێژیی دا(بلاغة) ئینجا زیاتر وریامان ئەکاتەوە لە خۆپارێزی لە شەیتان بەمەی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡ﴾ واتە با شەیتان نەتانخاتە بەڵاو ناڕەحەتی و بترسن لەوە، چونکە بەڕاستی شەیتان خۆی و سەرباز و نەوەکانی ئێوە ئەبینن لە جێگا و شوێنێکدا کە ئێوە ئەوانی تێدا نابینن، دەی شتێکی روونە هەر کاتێ دوژمن مەردوم ببینێ و مەردوم ئەو نەبینێ بیم و ترسی زیاتر لێ ئەکرێ. هەرچۆنێ پێویستە لەسەرمان خۆپارێزیی لەو میکرۆبە بەدانەی کە هۆی چەندەها نەخۆشی جۆر بەجۆری لەشن و ئێمە نایانبینین مەگەر بە میکرۆسکۆب و ئەو شتانەی کە دەرخەری میکرۆبن، هەرچۆنێ ئەوە

پێویستە، هەروەها پێویستە زۆرتر بە توندی خۆپاراستن لەو شتانەی کە بە پێی حەدیس ئەگەڕێن بە لەشدا لە هەر شوێنێ کە خوێنی پێدا ئەگەڕێ، ئێمە نایانبینین لەسەر بار و شێوەی خۆیان مەگەر لەبەر تیشکی هێزی بینینی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ)، ئەگەر هەر نەشیان بینین ئەبێ هەروەك بینراو وابن لامان کاتێ کە قورئان و پێغەمبەرەکەمان(ﷺ)، هەواڵمان پێ ئەدەن بە بوون و کارکردنیان لە ئێمەدا و زیان گەیاندنیان بە ئێمە، چۆن ئەبێ ئێمە بڕوا بکەین بە پزیشکی لەشمان و بە پێی ڕێنموونی و بەرنامەی ئەو ڕەفتار بکەین لە خۆپارێزیی لە میکرۆبەکانی لەشمان، بەڵام بڕوامان زۆر بەهێزتر ئەبێ بە پزیشکی ڕاستەقینەی گیان و ڕۆحمان کە هەواڵی پێداوین بە بوون و زیانی میکرۆبەکانی گیانمان؟! چۆن دەواو و دەرمانی پزیشکی لەش بەکار بێنین، بەڵام ئەو دەواو دەرمانانە بەکار ئەهێنین بۆ بەرگری و نەهێشتنی میکرۆبەکانی گیان و ڕۆحمان کە زیانی ئەمان لە ڕادەیەك دایە کە زیانی میکرۆبەکانی لەش هیچ نین و هیچ چاو نادەن لە ئاستی ئەماندا؟!

ئینجا فەرمودەیەکی تر ئاراستە ئەکات کە زۆر بەکارە و پاڵدەرە بۆ خۆپارێزیی لە شەیتانەکان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە شەیتانەکانمان گێڕاوە بە دۆست و هاوسەر و خۆشەویست بۆ ئەوانەی کە بڕوایان نییە و بڕوا ناهێنن، ئای هاوار بۆ کەسێك کە دوژمنی دۆست و هاوسەری بێت، بێگومان زاڵ ئەبێ بەسەریدا و جڵەوی ڕائەکێشێ بۆ هەر شوێنێ کە مەیلی ببێ، بە بێ هیچ کۆمەك و یارمەتی دەر و فریاد ڕەسێ! بەڵێ بێگومان ئەمە شتێکی ڕاستە و جێگەی گومان و دوو دڵی نییە کە هەرچۆنێ خوا دۆست و خۆشەویست و کاربەدەستی بڕوادارانە هەروەها ئەبێ شەیتان دۆست و خۆشەویستی بێ بڕوایان بێت، بێگومان ئەو دۆستایەتی و هاوسەریی شەیتانە زۆر سامناکە و بەرهەمی بەدو سامناکی هەیە، یەکێ لە بەرهەم و سەرەنجامەکانی ئەمەیە کە بەسەر بت پەرستەکان هات و کاری لێکردن، تا ئەم ڕادەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً ﴾ کاتێ کە ئەوانە کردەوەیەکی زۆر بەدو ناشیرین بکەن، وەك ئەوەی کە بە ڕووتی پیاو و ئافرەت تەوافیان ئەکرد، کاتێ جڵەوگیریی و سەرزەنشت بکرانایە لەسەر ئەو کردەوە بەدە عوزرو بیانوویان ئەمە بوو ﴿قَالُوا۟﴾ ئەیانگوت ﴿وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا﴾ باوك و باپیرانمان دەستکەوتووە لەسەر ئەو کردەوەیە، ﴿وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ خوا فەرمانیداوە پێمان بەو کردەوەیە، واتە دوو شتیان ئەگرت بە دەستەوە:

١- شوێن کەوتن و لاسایی کوێرانەی باوك و باپیرانیان.

٢- لاڤ ئەوەی کە خوا فەرمانیداوە بەو کردەوەیە.

بەرپەرچی یەکەم پێویست نییە، چونکە شوێنکەوتنی کوێرانە ناڕاست و ناڕەوایە بەلای هەموو ژیرێکەوە، بێجگە لەوەیش لە چەند شوێنێکدا بەرپەرچی داوەتەوە بەم جۆرە: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾ واتە ئایا ئەوانە شوێنی باوك و باپیریان ئەکەون، هەرچەند ئەوان ژیر نەبووبن و هیچیان نەزانیبێ و نەکەوتبنە سەر رێی راست و رێنموونی یان وەرنەگرتبێ؟

کەواتە لێرەدا هەر بەرپەرچ دانەوەی دووەم پێویستە بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە کە ئەو لافە درۆینە لێئەدەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ﴾ بێگومان خوا فەرمان نادات بە کردەوەی بەد و خراپ، ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئایا ئێوە بەدەم خواوە شتێ ئەڵێن کە نایزانن و بێ ئاگان لێی؟ واتە ئەو لافەی کە لێی ئەدەن لە دووبارەوە بەدو ناڕاستە، یەکەم: هەرگیز نەبووەو نابێ و ناگونجێ خوا فەرمان بدات بە کردەوەی بەدو ناشیرین، چونکە خوا پاك و بێگەردە لە هەموو بارو روویەکەوە، فەرمان و شەریعەتی پاك و بێ لەکەیە. دووەم: زانینی فەرمان و شەرعی خوا ئەبێ هەر لە رێگەی نامەو پێغەمبەری خواوە بێت(ﷺ). دەی بڕیاری نامە و پێغەمبەری خوا(ﷺ) دژو پێچەوانەی ئەوەیە کە ئێوە لاف و گەزاف ئەڵێن، کەواتە ئێوە درۆ ئەکەن بەدەم خواوە کە ئەوەش لە تاوانە زۆر گەورەکانە و دژو پێچەوانەی ژیریی یە و بێزراوە لای هەموو ژیرێك، ئەوانەی کە لە سەردەمی نەفامی کۆندا بوون ئەو کارو کردەوەیان ئەکرد بەناوی ئەوەوە کە فەرمان و شەرعی خوایە، کەواتە نەفامانی ئەم سەردەم و چەرخی تازەیە زۆر بەدو بێ شەرم ترن کە هەر باوەڕیان بە ئایینی خوا نییە، یان لایان وایە کە ئایینی خوا پەیوەندی نییە بە ژیان و کاروباری ژیان و جیهانەوە، یان دەمبازی ئەکەن و رەخنە ئەگرن لە هەر بەندو بڕیارێکی ئایین کە نەگونجێ لەگەڵ هەواو ئارەزووی ناڕەوای نەفسی نەفامی خۆیاندا، لە پاش ئەوەی کە بێزاری دەربڕی و ئەو لافەی ئەوانی بە درۆ خستەوە، ئینجا فەرمان ئەدات بە دادو راست و میانەیی لە هەموو کاروبارێکدا، بە دامەزراوی لەسەر بەرنامەی خوا، بە رێنموونی وەرگرتن بەوەی کە لە نامەی خوادا هاتووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ)،

﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٣٠﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ﴾ پەروەردگارم فەرمانیداو فەرمان ئەدات بە دادو میانەیی، بە بێ زیادە رەوی و کەم و کوڕی لە هەر کارو فەرمانێکدا وەك بە روونی و بە درێژیی لە ئایەتی(٣١) ی داهاتوودا باسی ئەو داد و میانەیی یە ئەکەین، ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ رووەکانی خۆتان راست بکەن و بە رێك و راستی راگیری بکەن لە کاتی هەموو نوێژ و سوژدەیەکدا، یان لە شوێنی هەموو نوێژ و سوژدەیەکدا، واتە روو بکەنە پەرستنی خوا بە رێك و راستی و لانەدەن بە هیچ لایەکی تردا، ﴿وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ﴾ خوا بپەرستن بە جۆرێ مل کەچی و گوێرایەڵی بۆ خوا پاك و خاوێن بکەن لە هەر نیاز و لە هەر شتێکی تر، ئینجا لێرەدا ئامۆژگاری و ترساندنێك ئاراستە ئەکات بە دەست نیشان کردن بە زیندوو بوونەوەو گەڕانەوە بۆ لای خوا لە رۆژی دوای دا، کەواتە با وریای خۆمان بین و لەم جیهانەدا خۆمان ئامادە بکەین بۆ ئەو رۆژە، بە فەرمانبەریی ئەو فەرمانانەی کە لە پێشەوە ئاراستەی کردن، هەروەها دەست نیشان ئەکات بە جۆرو شێوەمان لەو گەڕانەوەو زیندوو کردنەوەدا لە کاتێکدا کە ئێمە دوو دەستە و کۆمەڵین: کۆمەڵێك لە جیهاندا شوێنی فەرمانی خوا کەوتووەو کۆمەڵێکی تر کە پەیڕەوی شەیتانیان کردووە، لە هەمان کاتدا دەست نیشان ئەکات بە رێك و گونجاوی ئەو زیندوو بوونەوەو گەڕانەوە، ئەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ﴾ هەرچۆنێ لە یەکەمجارەوە خوا دروستیکردن و دایهێنان، هەروەها بە وێنەی ئەوە ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، کەواتە ئەجرو پاداشتتان ئەداتەوەو تۆڵەتان لێ ئەسێنێ، کەواتە گوێرایەڵی فەرمانەکانی بن و بە پاك و خاوێنی بیپەرستن ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ﴾ واتە هەرچۆنێ لە یەکەم جارەوە دایهێنان و دروستیکردن، هەروەها وێنەی ئەوە ئەگەڕێنەوە لە کاتێکدا کە خوا رێنموونی دەستە و تاقمێکی کردن، دەستە و تاقمێك گومڕایی لەسەریان جێگیر و دامەزراو بوو، واتە هەرچۆنێ لە یەکەمجارەوە دوو دەستە بوون،**

دەستەی خوا پەرست کە ئادەم و حەوایە، دەستەی یاخی کە شەیتان و نەوەو سەربازەکانی یەتی، هەروەها بەو دوو تاقمە ئەگەڕێنەوە، لەسەر ئەم رایە وێنەیی یە کە لەو دوو دەستەیی و دوو تاقمی یەدایە، هێندێ ئەفەرمون: داهێنان و دووبارە کردنەوە وێنەی یەکن لەمەدا کە بە سووك و ئاسان و بێ ئەرك خوا هەردوو فەراهەم ئەهێنێ، هێندێ تر ئەفەرمون: وێنەن لەمەدا کە هەرچۆنێ لە خاك پەیدا بوون، هەروەها ئەبنەوە بە خاك، هێندێ تر ئەفەرمون: هەرچۆنێ لە یەکەمجارەوە خاوەنی هیچ شتێك نین، هەروەها لە دووەم جاریشەوە وان، ئینجا لەسەر رای یەکەم هۆی گومڕایی تاقمی دووەم ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ واتە گومڕایی یان لەسەر دائەمەزرێ و جێگیر ئەبێ، چونکە ئەوانە بە مەیلی خۆیان شەیتانەکانیان گێڕا بە خاوەن و کاربەدەستی خۆیان بە بێ خواو تێپەڕیان کرد لە خاوەنێتی و کاربەدەستی ئەو، بەم رەنگە لایاندا لە شەرعی خواو گوێڕایەڵ بۆ خواو گوێڕایەڵی شەیتانەکان بوون، دەی هەر کەسێك بە مەیل و خواهیشی خۆی دۆستایەتی و خۆشەویستی و جڵەوی کاروباری خۆی بدا بە شەیتان و روو وەرگێڕێ لە خوای خۆی، ئەو کەسە بێجگە لە گومڕایی و ترازان لە رێگەی راست هیچ بەشێکی تری نییە خوا پەنامان بدات. ئەوانە بەو جۆرە گومڕا ئەبن ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ لە کاتێکدا وا گومان ئەبەن کە رێی راستیان داوەتە بەر و لەسەر رێی راستن، لەسەر رای یەکەم ئەم رستەیە هۆی گومڕایی یەکەیانە بەو جۆرەی کە گوتمان، لەسەر رای دووەم و سێ یەم رستەیەکی سەربەخۆیە و ئەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی بارو حاڵی بت پەرستەکان لە پاش ئەوەی ئەو فەرمانانەی ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد. ئینجا بانگێکی تر ئاراستەی ئادەمی ئەکات بۆ زیادە بەهێزکردن و دڵنیایی کردن لەسەر ئەو شتانەی کە سەرەکی و بنەڕەتین لە بارەی بیرو باوەڕو عەقیدەوە، لە بەرامبەر ئەو بیرو باوەڕو کردەوە نەفامی یانەی کە بت پەرستەکان لەسەری بوون، یەکێ لەوانە ئەوە بوو کە لە خۆیانەوە قەدەغەیان ئەکرد تەواف کردن بە پۆشتەیی و پێویستیان کردبوو کە ئەبێ بە رووتی تەواف بکرێ، هەروەها هێندێ لە خۆراکیان قەدەغە ئەکرد کە خوا حەڵاڵی کردبوون، دەست نیشان ئەکات بەوەی کە ئەو قەدەغە کردنە بەشێکە لە هاوبەش دانان بۆ خوا،

ئەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەی رۆڵە و نەوەکانی ئادەم ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ واتە بەرگ و پۆشاکتان کە عەیب و عەورەتتان دائەپۆشێ و هۆی ئارایشت و جوانیتانە، ئەو بەرگ و پۆشاکەتان بپۆشن لە کاتی هەموو نوێژ و تەوافێکدا، کە لای خواروی ئەوەیە عەورەت دائەپۆشێ، عەورەتیش لای کۆمەڵ و جەماوەری زانایان بۆ پیاو نێوان ناوك و ئەژنۆیە، بۆ ئافرەت هەموو لەشە بێجگە لە دەم و چاو و هەردوو لەپی دەست، داپۆشینی ئەو ئەندازەیە پێویستە و مەرجە بۆ تەواف و نوێژ، لای ژووروەکەی پۆشاکێکی پاکی حەڵاڵە و هەرکەس بەپێی باو و عادەت و دەسەڵاتی خۆی کە ئەمەش چاکە و سوننەتە، وەك لە چەند حەدیسێکدا ئاماژەی بۆکراوە، ئینجابانگیان ئەکات بۆئەوەی بەخۆشی رابوێرن وخۆراك و خواردەمەنی یەپاك وحەڵاڵەکان بنۆشن بەبێ زیادە رەوی، ئەفەرموێ: ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ﴾ بخۆن وبخۆنەوە لەوەی کە حەڵاڵە بۆتان ﴿وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ﴾ زیادە رەوی مەکەن بە حەرامکردنی حەڵاڵ یان بە تێپەڕ کردن بۆحەرام، یان بەچڵپ وچڵێسی کردن، زیادەلە ئەندازەی پێویست ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ چونکە بێگومان خوا زیادە رەوی کەرانی خۆش ناوێ، بەڵکو خەشمی هەیە لێیان بە ئەندازەی زیانی زیادە رەوی کردنەکەیان، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەمەیە کە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، باوی عەرەب وابووە بێجگە لە قورەیش تەوافیان ئەکرد بە رووتی. مەگەر قورەیش پۆشاکی پێبدانایە: پیاو بۆ پیاو و ئافرەت بۆ ئافرەت، قورەیش باویان وابوو لە موزدەلیفە دەرئەچوون و ئەیانگوت: ئێمە ئەهلی حەرەمین، کەواتە ئەبێ عەرەب بە پۆشاکی ئێمەوە تەواف بکەن، کاتێ هاتنە خاکی ئێمە ئەبێ هەر خۆراکی ئێمە بخۆن، کەواتە هەرکەس لەو عەرەبانە دۆستێکی نەبوایە لە مەککەدا کە پۆشاکی بداتێ یان خۆی دەسەڵاتی نەبوایە، یان بە رووتی تەواف ئەکرد، یان بە جل و بەرگەکەی خۆیەوە، کاتێ لە تەوافەکەی ئەبووەوە ئەو پۆشاك و بەرگەی توڕ ئەدا و ئیتر هیچ کەس بەکاری نەئەهێنا، هەروەها وێنەی ئەوە لە تەفسیری(قرطبی) دا هاتووە، ئینجا تەنها بەوە کۆتایی ناهێنێ کە بانگ بکات بۆ وەرگرتنی پۆشاك و خواردن و خواردنەوەی خۆراکی پاك و حەڵاڵ، بەڵکو فەرمان ئەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) بێزاری دەربڕێ لە حەرامکردن و قەدەغە کردنیان،

قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ﴾ ئایا کێ قەدەغە ئەکات ئەو شتەی کە خوا دایناوە و کروویەتی بە هۆی جوانی و ئارایشت لە پۆشاك و هەر شتێکی تر کە مەردوم خۆی پێ ئەڕازێنێتەوە و خوا دروستی کردووە بۆ بەندەکانی و دەری هێناوە لە رووەك و حەیوان و ماڵات و کانەکانی زەوی: ﴿وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ﴾ کێ قەدەغەی ئەکات ئەو رۆزی و رزقە پاك و خۆش و بەلەزەتانە کە خوا دروستی کردون بۆ بەندەکانی؟ واتە ئەو قەدەغە کردنانە ناڕاست و ناڕەوایە و پێچەوانەی فەرمان و رەزامەندی خوایە و ئەگەڕێتەوە بۆ دانان و رەوادانی هاوبەش بۆ خوا! ئینجا بەدوای ئەو بێزاری دەربرینەدا ئەمە ئەهێنێ کە ئەو قەدەغە کراوانە ماڤی بڕوادارانە بە هۆی بڕواکەیان بەو پەروەردگارەی کە بۆی دروستکردوون، ئەگەر بێ بڕواکانیش بەشدارییان بکەن ئەوە هەر لەم جیهانەدایە، چونکە لە رۆژی دواییدا بێ بڕوایان بێبەشن لێیان و تایبەتین هەر بە بڕوادارانەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئەو زینەت و رزق و رۆزی یە خۆش و پاکانە لە ئەسڵدا هەر بۆ ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە لەم ژیانی جیهانەدا و هەر ماڤی ئەوانە و بێ بڕوایان بەهۆی ئەوان و لە پەنای ئەواندا بەشداری یان ئەکەن، لە کاتێکدا لە رۆژی دواییدا تایبەتییە بە بڕوادارانەوە بە بێ هاوبەشی بێ بڕوایان، خوای میهرەبان ئەم شتانە بە روونی باس ئەکات بۆ هەموو کەس، بەڵام لەبەر ئەوەی هەر ژیرو زانایان سوودو بەهرەی لێ وەرئەگرن ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بە وێنەی باسکردنی ئەوە کە لەم ئایەتەدا باسمان کرد، باس ئەکەین بە روونی ئایەتەکانمان بۆ گەل و کۆمەڵێك کە ئەزانن و ئامادەن بۆ زانین و واتە ئەوانەی کە زانان بە حەقیقەتی ئەم ئاینە هەر ئەوانە سوود وەرئەگرن و بەهرەمەند ئەبن بەم جۆرە باس و بەیانانە، بەڵێ بەڕاستی زانا ئەزانێ ئەوەی کە خوا حەرامیکردووە لە راستیدا ئەوە زینەتە و پاك و خاوێن و بەلەزەتە، نەك ئەوەی کە نەفامان بە زینەت و پاك وخاوێنی دائەنێن.**

ئیسلام له مەسەلەی خۆراك و پۆشاکدا – وەك هەموو مەسەلەکانی تر – مییانەیە و بە بێ زیادە ڕەوی و کەم و کوڕی، لە هەموو کاروبار و بڕیارێکیدا ناوەڕاستی گرتووە، بە هەر بارێکدا بگۆڕێ ناهەق و ناڕەوا دەرئەچێ، وەك ناوەڕاستی تەرازووە کە بە هەر لایەکدا بگۆڕێ لار و لارە سەنگ دەرئەچێ، جا لەبەر ئەوەیە ئیسلام دەست نادا بۆ دەست تێخستن و بژارە و پاڵفتە کردن، لە مەسەلەی خۆراك و پۆشاکدا مەردوم ئەبن بە سێ دەستە:

١- دەستەی زیادەڕەوی کەران کەئارەزووی خۆیان بەرەڵائەکەن بۆهەرجۆرەخۆراك و پۆشاکێ کەحەزی لێبکەن، بەبێ بەرگریی وسەرلێ کردنەوەوگوێدان بەحەرام وحەڵاڵ.

٢- دەستەی کەم و کوڕی کاران کە خۆیان ئەگرنەوە لە زۆر شت کە خوا حەڵاڵی کردوون، ئەم دەستەیە هەر لەوانەن کە لاف خواپەرستیان لێداوە، ئیتر لە هەر ئایین و میللەتێك، بێگومان دەستەی یەکەم ناڕاست و بەدە و پێچەوانەی هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوایە، دەستەی دووەم ئەگەر لە هێندێ لە شەریعەتەکانی خوادا ڕەوادانی وەك لە شەریعەتی حەزرەتی عیسادا ئوممەت خۆیان لەناو خۆیاندا کەنارگیریی و کونج نشینی و ڕەهبانێتی یان بڕیار دا لەسەر خۆیان و جڵەوگیریی نەکران لەوە، ئەوەش شتێکی کاتی بوو لەبەر هۆیەکی تایبەتی لەو کات و سەردەمەدا، هەرچەند شتی وابووە بەلام ئەوە شتێکی ئەسڵی و سەرەکی نەبووە لە ئایین و شەریعەتی خوادا، بەڵکو لە بنەڕەتدا دژو پێچەوانەی مەبەست و ئامانجی هەموو شەریعەتەکانی خوایە کە هاتوون بۆ دانانی ڕژێمێکی ڕێك و ڕاستی ژیانی ئادەمی یانە هەتا هەتایە، لەم شەریعەتەدا تێمان ئەگەیەنێ کە ئەم زەوی یە و هەرچی وا لەم زەوییەدا هەمووی بۆ سوود و بەرژەوەندی ئێمە خوا دروستیکردووە، ڕەوا دراوە کە بەهرەمەند ببین بە هەموو خێرو بێرێ لەم جیهانە لەو سنوورە ڕاست و ڕەوای کە میانەیە و دووره لە زیادە ڕەوی و کەم ڕەوی و کەم و کوڕی، ئەم ئایەتانەی کە ئێستا ئەژین لە سایەیدا بەسە کە بکرێ بە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕەوان و دەم کوتی ئەو دوو دەستە ناڕاستەی پێ بکرێ، بێجگە لە گوفتار و کرداری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ). کە لە سیرەتە پاك و خاوێنەکەیدا بە ڕوونی دەرخراو ناسراون هەرکەس شارەزا بێت بۆی دەرئەکەوێ کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە(ﷺ) هیچ خۆراك و پۆشاکێ و شتێکی حەڵاڵی بەلەزەتی قەدەغە نەکردووە نە لەسەر خۆی و نە لەسەر هیچ کەسێکی تر، ئینجا ئەوەی کە بینراوە و بیستراوە و لە نامەی هێندێ لەو زانا و خواناساندا هەیە سەبارەت بە کەم و

کوڕی بەکار هێنان و تەنگ هەڵکێشان لەبارەی خۆراك و پۆشاك و خۆشی یەکانی تری جیهانەوە، ئەو جۆرە وتارو کردارانە شتێکی تایبەتییە و شەخسی بوون لەلایەن ئەو خواناسەوە بۆ فێر کردن و رام کردنی هێندێ کەس کە نەفسیان وەك ولاخێکی ساخی تۆڕ وان و پێویستە رام کردن و مۆچاندنیان، وا نیشان نەدراون کە شەریعەت و یاسای خوا هەر ئەوەیە و بەو جۆرە هاتووە، کاشکێ ئەو جۆرە شتانە هەر نەبوایە و نەکرایە، بەڵکو بە رێك و راستی رێگە و رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی بدرایەتە بەر تا هیچ نەشارەزایە دووچاری هەڵە و بۆچوونی ناڕاست نەبووایە، هەموو کەس بیزانی یایە کە هەر ئەم شەریعەتی ئیسلامە شەریعەتی خۆشی و بەختەوەری و کامەرانییە، ژیانی راستەقینەی ئادەمی و ئادەمێتی تەنها لەم شەریعەتی ئیسلامەدا هەیە، لام وایە ئەم ئەندازەیە بەس بێ لەم بارەیەوە، ئینجا قەدەغە و قەدەغە کراوی راست و رەوامان نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ واتە پەروەردگارم هەر ئەو کردەوانەی حەرام کردووە کە باسیان دێت و بەدیی و خراپیان زۆر زیادە، ئیتر ئەوە زینا و داوێن پیسی بێت، یان چرووکی و دەست قوچاوی بەتین، یان بوختان کردن بە داوێن پیسی بۆ کەسێکی پاك، یان دەست بایی و ماڵ بە فیڕۆ و لەناوبردن کە ئەم وتەیە تەفسیر کراوەتەوە بە هەرکام لەمانە کە باسکران، ئینجا ئەو کردەوە بەدانە ئاشکراکانیان یان نهێنی یەکانیان، لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – هاتووە کە مەبەست لە یەکەم زینایە و داوێن پیسی بە ئاشکرا و بێ شاردنەوە، مەبەست لە دووەم داوێن پیستی یە بە نهێنی، باوی زۆر لە بێ بڕوایان وا بوو یەکەمیان بەلاوە ناشیرین بوو , وە دووەمیان ئەکرد.

﴿وَٱلْإِثْمَ﴾ گوناهی حەرامکردووە بە شێوەی گشتی. ﴿وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ لەسەر خراپی و بەدیی ئەو کردەوە ناپەسەندەیە، بەڵام(راغبی ئەسفەهانی) ئەفەرموێ: وتەی(بغی) بریتییە لەداوا کردنی تێپەڕ کردن لە میانە و بارێك کە رێکە و مافی خۆیەتی، ئینجا ئەو تێپەڕ کردنە هێندێ جار چاکە و پەسەندە وەك ئەوەی کە کەسێك مافی شتێکی ببێ بەسەر کەسێکەوە ئینجا خاوەن مافەکە کە دەست هەڵگرێ لە مافەکەی خۆی و هێشتا چاکە و پیاوەتی بکات لەگەڵ تاوانبارەکەدا، هێندێ جار ئەو تێپەڕ کردنە ناهەقە و دەست درێژیی و ستەمە، جا بە گوێرەی ئەم فەرمودەی(ئەسفەهانی) یە وتەی(بغیر

الحق) بۆ جیاکردنەوەی ئەم بارە ناهەقەیە لە بارە راست و رەواکەی، زانینی راستی لای خوایە.

وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ

---

**﴿وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ حەرام و قەدەغەی کردووە کە بگێڕن بە هاوبەشی خوا شتێك کە خوا هیچ بەڵگە و رابەرێکی نەهێناوەتە خوارەوە بەو شتە بە بوون و راستی ئەو شتە، واتە هەر عەقیدە و بیرو باوەڕێك کە لەلایەن خواوە بەڵگە و رابەری لەسەر نەهاتبێ هیچ نرخێکی نییە و ناڕاست و ناڕەوایە، ئەو بڕوای کە ئەوانە لاف لەسەر لێ ئەدەن هیچ جۆرە بەڵگە و رابەرێکیان نییە بەدەستەوە کەواتە بیرو باوەڕەکەیان پڕوپووچە و بێ بنج و بنەوانە، ئەم فەرمودەیە لەلایەکەوە دەست نیشان ئەکات بە بێ نرخی و پووچی بڕوا و ئایینەکەیان لەلایەکی ترەوە لاقرتی یان پێئەکات بۆ ریسوا کردن و سزادانی دەروونیان. ئینجا هاوبەش رەوادان چەند جۆرێکی هەیە، یەکێ لە جۆرەکانی ئەوەیە هاوبەش رەوا بدەی لە دانانی شەرع و یاسا و بەرنامەدا کە ئەم جۆرە لە هەموو چەرخ و سەردەمی نەفامیدا هەر بووەو هەر هەیشە، بێگومان دانانی شەرع و یاسا و بەرنامە تایبەتی یە بە خواوە بە تاك و تەنیا، رەوادانی بۆ هەرکەسێکی تر گێڕانی ئەو کەسەیە. ﴿وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ قەدەغەی کردووە ئەوەی کە بڵێن بەدەم خواوەو رەوا بدەن و بسەپێنن بەسەر خوادا ئەو شتەی کە نایزانن و لە خۆتانەوە بە نەزانین و نەفامی ئەیڵێن بەدەم خواوە وەك ئەو حەرام و حەڵاڵ کردنەی کە لە خۆیانەوە ئەیانکرد بەدەم خواوە، هەروەها هەموو شتە ناشایستەکانی تر کە بۆ خوایان رەوا ئەداو بە راستی زیانی ئەم تاوانە زۆر زۆر بەتینە، هەرچی لا رێی و لادان لە ئایین و شەریعەتی خوا کە رووی دا و هەموو گەل و ئوممەتەکانی پێ دووچار بوون، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم تاوانی پێنجەمە، تەنانەت لەم ئوممەتەیشدا بەهۆی ئەو هەموو بیدعەت و فتوا ناهەقانە کە بەناوی ئایینی خواوە ئەکران لە کۆن و لە تازەوە مەردوم ترازێنرا لە راستە شەقامەکەی ئیسلام و بە هەوا بازی و ئارەزووکاری و شوێنکەوتنی نەفس زۆربەی ئوممەت**

دوور خرایەوە لە پەیڕەوی قورئان و ڕەوشتی پاکی پێغەمبەر(ﷺ)، تا ئەم ئوممەتە ئاوای بەسەرهات کە بەسەری هات، تا گەڕایەوە بۆ کارو کردەوەی سەردەمی نەفامی و شوێن کەوتنی گاورو جوولەکە هەنگاو بە هەنگاو، لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵماناندا چەند دەستەیەك هاتنە کایە کە تاوان بە چاکە سەیر ئەکەن و چاکە بە تاوان، ڕووتی و بەرەڵایی و بێ نامووسی بە پێشکەوتن دائەنێن و کەشخەی پێوە ئەکەن!! لەپاش ئەو باسە گرنگانە ئینجا فەرمودەیەك ئاراستە ئەکات کە هەڕەشە و ترساندنی تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە سەرکێشی بەکار ئەهێنن بە تایبەتی یەکەم چین کە ئەم قورئانەی هاتە سەر و هاندەر و پاڵدەرە بۆ فەرمانبەریی و گوێرایەڵی، ئەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾ بۆ هەر گەل و ئوممەتێك لەوانەی کە سزای خوایان هاتە سەر و لەناو بران ماوەو کاتێکی دیارییکراو بووە، وەك(حسن) ئەفەرموێ و لە(ئیبن و عەباس و مقاتل) یشەوە – خوایان لێ رازی بێت – ریوایەت کراوە، واتە مۆڵەت دراون تا ئەو کاتەی کە دیاریی کراوە، ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ﴾ ئینجا کاتێ ئەو کاتە دیاریی کراوەیان هات، ﴿لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً﴾ ئیتر دواناکەون لەو دیاریی کراوە هیچ کات و ساتێك ﴿وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ ئەوانەی وەك دوا ناکەون پێشیش ناکەون لەو کاتە دیاریی کراوەیان، وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾ هیچ گەل و ئوممەتێك پێش ناکەوێ لە کات و ماوەی دیاریی کراوی خۆی و پاشیش ناکەون. ئینجا بانگێکی تر ئەکات لە ئادەمی و نەوەی ئادەم، بانگیان لێ ئەکات کە لە هەموو بار و ڕوویەکی ژیانیانەوە پەیڕەوی فەرمان و ڕێنموونی خوا بکەن کە ئەوەش لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە وەرئەگیرێ و دەستکەوت ئەبێ، کەواتە تاقانە سەرچاوەیەك بۆ ئادەمی لە پاش خوا پێغەمبەرانە – سەلامی خوایان لێ بێت – حیساب و پرسیاری ڕۆژی دواییش هەر لەسەر گوێرایەڵی و فەرمانبەریی و یاخی بوونە، لەسەر زمانی خواو پێغەمبەرەکانی – سەلامی خوایان لێ بێت –، ئەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ﴾ ئەی ڕۆڵە و نەوەکانی ئادەم ﴿إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ﴾ ئەگەر هات بۆتان ڕەوانە کراوان و فروستادەیان لە خۆتان،

يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ ۖ

﴿يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِي﴾ باس ئەكەن و ئەخوێننەوە بەسەرتان دا ئایەتەكانی من ﴿فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئینجا هەركەس لە ئێوە خۆی پاراست لە نافەرمانی و بڕوای هێنا و كردەوەی خۆی چاك كرد بە پێی فەرمان و شەریعەتی خوا، ئەو كەسانە هیچ مەترسی یەكیان لەسەر نابێ، ئەوانە غەمبار و غەمگین نابن، واتە لە رۆژی دواییدا هیچ ترس و غەمێكیان نابێ و شاد ئەبن بە ناز و رێزی خوا ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەوانەتان كە بڕواتان نەهێنابێ بە ئایەتەكانی ئێمە كە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا ﴿وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ﴾ خۆیان بە زل ئەزانی لە وەرگرتنی ئەو ئایەتانە و روویان لێ وەرگێڕا ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئەوانە هاوەڵ و هاوسەرانی ئاگر ئەبن بە جۆرێ ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە هەمیشەیی ئەبن تیایدا بە بێ بڕانەوە خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات – آمین –، ئەوەبوو عەهد و فەرمانی خوا هەر لە یەكەمجارەوە لەگەڵ ئادەم و نەوەكانی، ئەوە بوو مەرج و بەرنامەی جێنشینی یەكەی لە زەوییەكەی خوادا كە دروستیكرد و ئەوەی پێویست بێ بۆ ژیان دروستیكرد تیایدا، ئەم تیرەی كرد بە كاربەدەست و دەسەڵاتداریكرد تیایدا بۆ ئەوەی هەڵسێ بە كاروباری ژیانی بە پێی ئەو مەرج و فەرمانە، خۆپارێزی لە فەرمانی، كرەوەی چاك، ئەگینا كردەوەكەی وەرنەگیراوە و لە رۆژی دوایی دا نیشتەجێیە لە ئاگردا، ئینجا بە پێی ئەو مەرج و پەیمانە ئەبێ هەموو ئادەمی لە هەموو بیرو باوەڕو بۆچوون و كردەوەكانیاندا بگەڕێنەوە بۆلای ئەوەی كە فروستادەكانیان رایان گەیاندووە پێیان لەلایەن خواوە، هەر لادانێك لەوە بكەن یان درۆ بەدەم خواوە ئەكەن یان بڕوایان نییە بە ئایەتەكانی خوا ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ﴾ دەی ئایا كێ ستەمكار ترە لەو كەسەی كە بە دەستی قەست درۆی كردبێ

بەدەم خواوە، یان بڕوای نەهێنابێ بەئایەتەکانی خوا؟ درۆی کردبێ بەم ڕەنگە بەناوی خواوە بە پێچەوانەی ئایینی خوا حەرام و حەڵاڵی داهێنابێ یان شتێکی بەناوی ئایینی خوا بڵاو کردبێتەوە کە خوا فروستادەکانی پێ ڕەوانە نەکردبێ، یان بڕوای نەهێنابێ بە ئایەتەکانی خوا بەدەم و بە گوتن یان بە کردەوە، بە ڕوو وەرگێڕان و خۆ بە زل زانی و لاقرتی پێکردنیان، یان بە باودانی هەر شتێکی تر بەسەر ئایەتەکانی خوادا، بێگومان لەسەر هەر بار هیچ ستەمێك لەوە گەورەتر نییە، چونکە ئەو ستەمە ڕوو ئەکاتە زاتی پاکی خواو پەیوەستە بە درۆ، کەواتە هیچ ستەمێکی تر ناگات پێی، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ﴾ ئەوانەی کە باسکران بەریان ئەکەوێ و دووچاریان ئەبێ، دەستکەوتیان ئەبێ بەشی خۆیان لە نامەی خوا، واتە ئەوەی بۆیان نووسراوە و بڕیار دراوە لە نامەی خوادا بۆیان، لە ژیان و هۆی ژیانی ئەم جیهانە، هەرچۆنێ دەست کەوتیان ئەبێ بەشی خۆیان لە ئایەتەکانی خوا کە پێغەمبەرەکانی پێ ڕەوانە کراوە و ئەوانیش ڕایان گەیاندووە پێیان لە بەڵێن و هەڕەشە و فەرمان و جڵەوگیریی یەکان، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست خێرو شەڕە، هێندێ تر ئەفەرمون: مەبەست سەعادەت و شەقاوەیە، هێندێ تر ئەفەرمون: مەبەست ڕۆزی و ئەجەل و کردەوەیە، هێندێ تر مەبەست سزاو عەزابە، ئینجا ئایا مەبەست هەر بەشی ئەم جیهانەیان، یان بەشی ڕۆژی دوایی، یان گشتی یە لە هەردوو بەشەکەیان، هەرکام لەمانە ڕای هێندێکە لە زانایان.

بەڵام لە ڕاستی ڕای یەکەم بەهێزەو دڵ زۆرتر پێی بە ئارامە لەبەر دوو شت:

١- ڕێکە لەگەڵ چەند ئایەتێکی تردا وەك ئایەتی ﴿كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَ﴾ واتە هەرکام لە کۆمەڵی بڕواداران و بێ بڕوایان بەشیان ئەدەین لە بەخشینی پەروەردگارت، دیارە مەبەست بەخشینی ئەم جیهانەیە، واتە بەخشینی خوا لەم جیهانەدا تایبەتی نییە بە چاکانەوە، دەی بەم جۆرە هەر ئەو ڕای یەکەمە ئەگرێتەوە لەم ئایەتی ئێرەدا و قورئانیش هێندێکی ئەبێ بە تەفسیر بۆ هێندێکی تری.

حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ

---

٢- **زۆر ڕێك و گونجاوتره لەگەڵ ئەم فەرمودەی کە دێت بە دوایدا: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ﴾ واتە ئەو بەشەیان کە نووسراوە بۆیان لە جیهاندا دەستکەوتیان ئەبێ لەماوەی ژیانیاندا، هەتا کاتێ کە دێت بۆلایان نێرراوەکانمان، واتە فریشتەکانی گیان کێشان کە ئەیانمرێنن، لەو کاتەدا ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەو فریشتانە ئەڵێن بە بێ بڕواکان ﴿أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ﴾ ئایا لە کوێن ئەوەی کە ئێوە هاوارو نزاتان لێ ئەکردن لە ژیانتاندا بێجگە لە خوا و تێپەڕتان ئەکرد لە خوا، ئایا ئەوانە لە کوێن بانگ و هاواریان لێ بکەن با بێن رزگارتان بکەن ﴿قَالُواْ﴾ ئەوانیش لە وەڵامدا ئەڵێن: ﴿ضَلُّواْ عَنَّا﴾ دیار نین و ون بوون لێمان، ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ﴾ شایەتی ئەدەن لەسەر خۆیان کە ئەوان لە جیهاندا بێ بڕوا بوون و هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا داوەو ئەو هاوار لێ کراوانەیان گێڕاوە بە هاوبەشی خوا، ئینجا بێ دەنگ ئەبێ لە بەسەرهاتەکانی پاش مردن و شێوەی خستنە ناو دۆزەخیان ئەخاتە بەرچاو وەك یەکسەر لەماڵی خۆیان لە جیهاندا تور بدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ، ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ خوا ئەفەرموێ پێیان، یان فریشتەی فەرماندار بە فەرمانی خوا ئەفەرموێ پێیان: ﴿ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِ﴾ بچنە ناو چەند گەل و ئوممەتێك کە تێپەڕیان کرد لە پێش ئێوە لە تیرەی(جن) و ئادەمی، بچنە ریزی ئەوانە لە ئاگردا، یان مەبەست ئەوەیە: بچنە ناو ئاگر بە هاوەڵی و لە ریزی چەند گەل و ئوممەتێك لە تیرەی(جن) و ئادەمی کە لە پێش ئێوەدا هاتن و چوونە ناو ئاگر. ئەو گەل و کۆمەڵانە لە جیهاندا دۆستایەتی و پەیوەندی لە ناویاندا بووە، بە جۆرێ هێندێکیان شوێن کەوتووی هێندێ تر بوون،**

كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَىٰهُمْ لِأُخْرَىٰهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾

---

**بەڵام لەو رۆژەدا بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾ هەرجارێ هەر تاقم و دەستەیەك کە ئەچنە ناو دۆزەخ و دووچاری ئەو سزا و ریسوایی یە ئەبێت نەفرین ئەکات لەویتر کە وێنەی بووە لە ئایین و بیرو باوەڕدا، شوێن کەوتووەکان نەفرین ئەکەن لە پێشەواکان کە بوون بەهۆی گومڕایی ئەمان، بەڵکو هەرکام لە پێشەواو شوێن کەوتوو نەفرین ئەکەن لەویتر و تاوانباری ئەکەن، وەك دەرئەکەوێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا﴾ هەتا هەموو ئەگەن بە یەك و دواو بەریان یەك ئەگرن، ئەو کاتە ﴿قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ﴾ دوایی یەکانیان شوێن کەوتوو بوون ئەڵێن دەربارەی پێشووەکانیان کە پێشەوا و چاو لێکراو بوون ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا﴾ ئەی خوای پەروەردگار ئەوانە ئێمەیان گومڕا کرد بەهۆی ئەوەی کە شوێنیان کەوتین و چاومان لێکردن ﴿فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ کەواتە دوو قات و دوو چەندانە سزایان پێبدەن لە ئاگردا، قاتێك لە باتی گومڕایی خۆیان، قاتێك لە باتی گومڕا کردنی ئێمە، لە وەڵامیاندا ﴿قَالَ﴾ پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ﴾ بۆ هەرکام لە ئێوە و لەوان دوو چەندانە هەیە، بۆ ئەوان – وەك باسمان کرد – تۆڵەی گومڕا کردنیان بۆ شوێنکەوتووەکان. بۆ ئەمانەی دوایی قاتێ لەسەر بێ بڕوایی یەکەیان، قاتێ لەسەر شوێن کەوتنی کوێرانەیان و لاسایی یان بۆیان، ئیتر لەبەر بیم و ترس لێیان یان بە ئومێدی دەست کەوتێك یان لەبەر هەر شتێ، کە ئەوە تاوانێکی جیاوازە، چونکە خوا هۆی سەربەستی و سەربەخۆیی پێدا بوون، ئەیانتوانی بە پێی ژیریی و ئەو هەموو رابەر و بەڵگەیە رەفتاریان بکردایە، نەك واز لەوە بێنن و کوێرانە شوێنی ئەوان بکەون کە بەندەیەکن وەك خۆیان، یان قاتی دووەم لەسەر ئەوەیە کە شوێنکەوتنەکەی ئەمان و گێرانی ئەوان بە سەرۆك و**

کاربەدەست دەست ئەوانی زیاتر سووورکرد و بەتین تریکردن لە گومڕایی و گومڕا کردندا، کەواتە با ئەمانیش هەرچۆنیٚ گومڕان، هەروەها ئەبن بە گومڕا کەر بۆ ئەوان، هێندیٚ تر لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە: بۆ هەریەکێك لەوان هەیە دوو چەندانە، قاتێك لەسەر گومڕایی و قاتیٚ تر لەسەر گومڕا کردنەکەیان، یان قاتیٚ ئاشکرا و قاتیٚ نهێنی و دەروونی، لەسەر هەر بار ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾ لەسەر باری یەکەم مەبەست ئەوەیە: بەلاٚم ئێوە نازانن و بیٚ ئاگان لەوەی کە هەیە بۆ هەرکامتان لەبەر ئەوە ئێوە ئەو داوایە ئەکەن و لاتان وایە هەر ئەوان شایستەی دوو قاتن نەك ئێوە. لەسەر بارو رای دووەم: بەلاٚم ئێوە نازانن و بیٚ ئاگان لەوەی کە بۆ خۆتان هەیە لەبەر ئەوە ئەو داوایە ئەکەن، لەسەر هەر بار ئەم فەرمودەیە لەگەلٚ داواکەراندایە لەسەر رای بەهێز و دامەزراو لە دلٚدا.

ئینجا باسی وەلاٚمی چاولێکراوە پێشووەکان ئەکات بەرامبەر بە قسە و داوای شوێن کەوتووەکان، یان بەرامبەر وەلاٚمەکەی خوا. ئەفەرمویٚ: ﴿وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ﴾ سەرۆك و چاولێکراوەکان ئەلێن بە شوێن کەوتووەکانیان: ﴿فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾لەسەر باری یەکەم واتە ماتولٚ ئێوە ئەلێن ئێوەمان گومڕا کردووە و دان ئەنێن بە گومڕایی خۆتاندا، کەواتە نییە بۆ ئێوە هیچ زیادە فەزلێك بەسەر ئێمەدا تا بەهۆی ئەوەوە داوای ئەوە بکەن سزاکەتان کەمتر بیٚ لە سزای ئێمە کاتیٚ کە وەك یەك گومڕاین و گوناهو تاوانەکەمان چوون یەکە، لەسەر باری دووەم، ماتولٚ خوا فەرموی: بۆ هەرکام لە ئێمە و لە ئێوە دوو قات سزا هەیە، ماتولٚ خوا بڕیاری ئەوەیدا، ماتولٚ خوا فەرموی: بۆ هەرکام لە ئێمە و لە ئێوە دوو قات سزا هەیە، ماتولٚ خوا بڕیاری ئەوەیدا، کەواتە بۆ ئێوە نییە هیچ زیادەیەك بەسەر ئێمەدا تا بەهۆی ئەوەوە سزاتان سووك بکریٚ لە سزای ئێمە ﴿فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ کەواتە بچەژن سزا دوو قاتەکەی خۆتان بەهۆی کردەوەی بەدی خۆتان کە کردووتانە، لێرەدا دواییهات وت و وێژو دەمە قالێی ئەو دەستە و بەرە، ئینجا پێش ئەوەی شێوەی شیرینی بڕواداران نیشان بدات لە بەهەشتدا، پێش ئەوە دلٚنیایی ئەکات لەسەر ئەو دوا رۆژ و چارەنووسەی کە باسیکرد و هەرگیز گۆڕانی نابیٚ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوەو نایهێنن بە ئایەتەکانی ئێمە، خۆیان بە گەورە و بە زل دائەنێن لە بڕوا هێنان پێیان و بەهۆی ئـەوەوەروویان وەرگێڕالێیـان وپـەیڕەوی یـان نـەکرد لـە جیهانـدا ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ﴾ قاپییەکانی ئاسمانیان بۆناکرێتەوە، واتە بۆ کردەوەکانیان و کردەوەکانیان بەرز ناکرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە خوا بڕیاری داوە بۆ کرەوەی چاکان، وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ. یان مەبەست ئەوەیە گیان و ڕۆحەکانیان پاش مردن بەرز ناکرێتەوە بۆ ئاسمان وەك گیان و ڕۆحی بڕواداران بەرز ئەکرێتەوە بۆلای وەك(سدی) و تاقمێك ئەفەرمون، یان قاپییەکان ناکرێنەوە نە بۆ کردەوەکانیان نە بۆ گیان و ڕۆحەکانیان ﴿وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ﴾ ئەوانە ناچنە بەهەشت هەتا حوشتر نەچێ بە کونی دەرزی دروماندا، کە دیارە شتی وایش ناگونجێ و نابێ، کەواتە چوونی ئەوانە بۆ بەهەشت بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ و نابێ، خوا پەنامان بدات – آمین –، لەناو عەرەبدا باو بووە وێنەی شتی گەورەیان هێناوەتە بە حوشتری گەورە، وەك وێنەی شتی تەنگ و بچوکیان هێناوەتەوە بە کونی دەرزی، جا بە پێی ئەو باوە ئەم ڕستەیە هاتووە بە چیرۆك و وێنە بۆ نەگونجانی چوونی ئەوانە بۆ بەهەشت، واتە هەرچۆنێ ناگونجێ حوشتر بەو گەورەیی یە و لەسەر ئەو شێوە و قەبارە گەورەیە بچێ بە کونی دەرزیدا لەسەر ئەو بارو شێوەی خۆیە، هەروەها ناگونجێ چوونی ئەوانە بۆ بەهەشت! وێنەی ئەم جۆرە چیرۆکانە بەکار ئەهێنرێن لە زمانی کوردیشدا، بۆ وێنە ئەگوترێ: ئەو کارە ناکەم تا قیر سپی نەبێت. هەروەها چەند وێنەیەکی تر، گەیاندنی مەبەست بەم جۆرە چیرۆك و دەستەواژانە زۆر بەکارە لە دەرووندا و دڵ داگیر ئەکات، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بە ﴿جمل﴾ حەبلێکی ئەستوورە کە بەکار ئەهێنرێ لە بەستنەوەی**

کەشتیدا، بەم جۆرەش مەبەستەکە هەر گەیاندنی نەگونجانەکەیە، بەم جۆرە بە کونی دەرزی یەوە زیاترە لەبەر ئەوە بەم مەبەست و واتایە بە پەسەند ترە دانراوە، بەلاًم هیچ پێویست نییە چاودێریی ئەو پەیوەندییە بەو جۆرەی کە گوتمان زۆر جوان و رێك و پێکە و پێویست نییە لادان لەو مانا و مەبەستەی کە بەناوبانگە بۆ وتەی ﴿جمل﴾، بێجگە لەوەش(ئیبن و مەسعود و حەسەنی بەسری) بەم شێوە بەناوبانگە تەفسیریان کردووە کاتێ کە پرسیاریان لێکرا، ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾ بەو جۆرەی کە باسکرا ئێمە تۆڵە ئەسێنین لە تاوانبارەکان، ئینجا شێوەو چۆنیەتییان لەناو دۆزەخدا نیشان ئەدا و ئەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ واتە بۆ ئەوانە هەیە لەناو ئاگری دۆزەخدا فەرش و ژێرە خەری گرنگ و سامناك و لەلای سەرویشیانەوە بەسەریانەوە هەیە چەند لێفە و پەردەی گرنگ و سامناك لە ئاگر، بەلاًم بۆ سزادانی دەروونیان لاقرتی یان پێ ئەکات کە ژێر راخەرەکانیان ناو ئەبات بە(مهاد) کە بریتی یە لە بێشکە و جێ و بانی خۆش کە هۆی ئارامی و حەوانەوەیە، هەروەها تەبەقەکانی ئاگر بەسەریانەوە ناو ئەبات بە(غواش) کە بریتی یە لە لێفە و پەردە، کەواتە سەر و ژێریان هەر ئاگرە و لە هەموو لایەکەوە دەوری داون و لەناو توێ و تەبەقەکانی ئاگردا ئەسوتێن! خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ – آمین – ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ بەو جۆرە و وێنەی ئەو تۆڵە سەخت و سامناکە تۆڵە ئەسێنین و سزای ستەمکاران ئەدەین ئەم ستەمکار و تاوانبارانە هاوبەش رەوا دەرەکانن کە بڕوایان نەبووە بە ئایەتەکانی خوا و درۆیان بەدەم خواوە ئەکرد، ئینجا بە پێی باوی قورئان کە هەڕەشە و موژدە و بەڵێن بە ئەجرو پاداشت و تۆڵە ئەهێنێ بە دوای یەکدا، بەو پێیە لە پاش باسی بێ بڕوایان و هەڕەشە لێیان بەو جۆرو شێوە سامناکەی کە تێپەڕیکرد، ئەوا باسی بەهەشتی یە خوا پێداوەکان ئەکات و هێندێ لە خۆشی و شادومانی یان ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بەو شتانەی کە پێویستە بڕوا پێهێنانیان، کردەوە چاکەکانیان بەجێهێناوە بەو جۆرو شێوەی داوایان لێکراوە کە ئەوەش ئاسانە و هیچ تەنگەتاو کردنی تێدا نییە،

لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ۖ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾

---

**وەك بە تێهەڵكێش ئەفەرموێ: ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَآ﴾ داوا ناكەین و پێویست ناكەین لەسەر هیچ كەسێك بێجگە لەوەی كە لە تاقەت و توانایەتی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ ئەوانەی كە خاوەنی ئەو بڕوا و كردەوانەن هاوەڵان و دانیشتوانی بەهەشتن، بە جۆرێ ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لەو بەهەشتەدا هەمیشەیین بە بێ بڕانەوە، ئەوەش بە میهرەبانی خوایە وەك پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرموی لە حەدیسێك كە موسلیم هێناویەتی: هیچ كام لە ئێوە كردەوەكەی نایخاتە بەهەشت، هاوەڵەكانیش عەرزیانكرد ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆیش هەر وایت؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ منیش مەگەر خوا داماپۆشێ بە میهرەبانی خۆی، بەڵێ بەڕاستی ئەگەر میهرەبانی خوا نەبێت كردەوەی بەندە ئەبێ چی بێ؟ ئەبێ چ نرخێكی ببێ لە چاو ئەو هەموو چاكە و بەهرەی كە خوا ڕشتوویەتی بەسەر بەندەكانیدا و نایەنە ژمارە، بێجگە لەوەش كە كردەوەكانی بەندەو نە بە هیچ شتێك لەم جیهان و نە لەو جیهان، كۆمەڵی بێ بڕوایان و سەركێشان هەر چۆنێ دژ و جیاوازن لە كۆمەڵی بڕواداران لە بیرو باوەڕ و كردەوەدا، هەروەها دژو جیاوازن لە دوا ڕۆژ و چارەنووسدا: ئەوان لەناو ئاگردا، ئەمان لە بەهەشتدان، ئەوان لەناو ئاگردا نەفرین ئەكەن لە یەكتر و شەڕە جوێن ئەكەن و دڵیان پڕە لە كینە و داخ و قین، ئەمان ئەگەر لە جیهانیشدا رق و قینێكیان بووبێ لە یەكتر لە بەهەشتدا خوا ئەو رق و كینەیان ناهێڵێ وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ﴾ دائەڕنین ئەوەی لە دڵیاندا بووبێ لە هەر كینە و رقێك دەربارەی یەكتر. لە(قتادة) وە ئەگێڕنەوە كە(ئیمامی علی) – ڕەزای خوای لێ بێت – فەرمویەتی: هیوادارم كە من و عوسمان و زوبێر و تەڵحە لەوان بین كە ئەم ئایەتەیان دەربارە هاتووە، ئەوان كە ئاگری دۆزەخ تاو ئەدرێ لە ژێر و**

لەلای سەروویانەوە. ئەمان بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿تَجۡرِی مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَـٰرُ﴾ دێت و ئەچێت لە ژێر کۆشك و باخاتەکانیان رووبارەکان. وا دەرئەکەوێ مەبەست ئەو چوار جۆرە رووبارەیە کە لە سورەتی(محمد) دا ئەفەرموێ: ﴿فِیهَآ أَنۡهَـٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَیۡرِ ءَاسِنٍ وَأَنۡهَـٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمۡ یَتَغَیَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَـٰرٌ مِّنۡ خَمۡرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّـٰرِبِینَ وَأَنۡهَـٰرٌ مِّنۡ عَسَلٍ مُّصَفًّى﴾ رووبارێك لە ئاوی ساف و تام و بۆن خۆش، رووبارێك لە شیری کە تامی نەگۆڕابێ، رووبار لە شەرابی خۆش و خۆش گەوار. رووبار لە هەنگوینی پاڵفتە.

خوا بە میهرەبانی خۆی بیکات بە نسیبمان – آمین –، ئەوانەی کە خەریکن بە ئاژاوە و تانە و تەشەردان لە یەکتر ئەمانە بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِی هَدَىٰنَا لِهَـٰذَا﴾ ئەڵێن: هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوایە کە ناوی (الله) یە و رێنموونی کردین بۆ ئەمە، واتە رێنموونی کردنی بۆ بڕوا و کردەوەیەك کە بوو بەهۆی ئەم نازو نیعمەتەی کە واین تیایدا، یان لە پاش تێپەڕ کردنی پردی(صراط) رێنموونی کردین بۆ ئەمە، ﴿وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِیَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾ ئێمە ئەوە نەبووین کە ڕێ دەرکەین و رێنموونی وەرگرین بۆ ئەمە ئەگەر خوا رێی نیشان نەداینایە و نەیخستینایەتە سەر ئەمە: ﴿لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ﴾ سوێند بە خوا فروستادە و نێرراوەکانی پەروەردگارمان هاتن بە هەق و راستی و هەق و راستی یان هێنا بۆمان تا بوو بەهۆی ئەمەی کە واین تیایدا و سەری لەم خۆشبەختی و کامەرانییەوە دەرکردین، داواکارین کە ئێمە یەکێ بین لەوانە، ئەوان کە بانگیان لێ ئەکرێ بە توانج و تەشەر لێدان و ریسوا و رەزیل کردن، ئەمان بەم جۆرە بانگیان لێ ئەکرێ، کە ئەفەرموێ: ﴿وَنُودُوٓا۟ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ بانگیان لێ ئەکرێ بەمەی ئەو بەهەشتە گرنگەتان پێبەخشرا بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەی کە کردتان لە جیهاندا، واتە ماڤ خۆتانە و پاداشت و بەرهەمی کردەوەی خۆتانە وەك بفەرموێ: هیچ منەت و چاو لەبەریی تیا نییە کە ئەوپەری میهرەبانییە، لە لوتف و میهرەبانییەکەی بەزیاد بێت. لێرەو لە چەند شوێنی تر لە قورئاندا بڕوا و کردەوەی خۆتانە وەك بفەرموێ: هیچ منەت و چاو لەبەریی تیا نییە کە ئەوپەری میهرەبانییە، لە لوتف و میهرەبانییەکەی بەزیاد بێت، لێرەو لە چەند شوێنی تر لە

قورئاندا بڕواو کردەوەی چاك ئەکات بەهۆی چوونە بەهەشت، لە حەدیسەکەی(موسلیم) دا کە تۆزێ لەمەوپێش تێپەڕی کرد فەرموی: هیچ کەس لە ئێوە کردەوەکەی نایخاتە بەهەشت، بەڵکو چوونە بەهەشت بە فەزڵ و میهرەبانی خوایە. ئەم حەدیسە هەرچەند بە رواڵەت ناڕێکە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا. بەلاّم لە رووی راستیدا ناڕێك نییە، چونکە مەبەست لەم حەدیسە ئەوەیە: کردەوەی بەندە هەرچەند گەورە بێ زۆر زۆر کەمتر و بچوکترە لەوەی بەهەشت بکرێ بە بەرهەم و پاداشتی ئەگەر میهرەبانی خوا نەبێ لەکاردا، کەواتە لە راستیدا هیچ ناڕێکی و دژایەتی یەك نییە و حەدیسەکە رێك و دەستە ملە لەگەڵ ئایەتەکان، وتەی ﴿أُورِثۡتُمُوهَا﴾ بە پێی زمانی عەرەب بریتییە لە پێدان بە میراتی و کەلەپوور لە کەسێکەوە بۆ ئەمان، ئەم تەعبیر و دەستەواژەیە زۆر هاتووە لە قورئاندا، هۆو مەبەستەکەشی بە دوو جۆر کراوە لەلایەن زانایانەوە:

١- کەلەپوور و میراتی ماڵ و موڵکێکە کە هیچ ئاژاوەو گیرو گرفتی تێدا نەبێ، کەواتە وا نیشان ئەدات کە ئەو بەهەشتە هینی خۆتانە و هیچ کەس رێی نییە ئاژاوەو بەربەرەکانێتان لەگەڵ بکات و تایبەتییە بە خۆتانەوە.

٢- لە چەند ریوایەتێکدا هاتووە کە هەموو کەس لە بڕوادار و بێ بڕوا جێ و شوێنی خۆی هەیە لە بەهەشتدا و دیاریی کراوە، ئینجا کاتێ بەهەشتی یەکان ئەچنە بەهەشت و دۆزەخی یەکان ئەچنە دۆزەخ، بەهەشت نیشانی دۆزەخی یەکان ئەدرێ و جێ و شوێنەکانی خۆیان ئەبینن. ئینجا ئەگوترێ پێیان: ئەو جێ و شوێنانە بە کەلەپور و میراتی وەرگن لەو بێ بڕوایانە بەهۆی کردەوە چاکەکانتانەوە، ئینجا ئەمانیش ئەو جێ و شوێنانە دابەش ئەکەن لەناو خۆیاندا بە پێی کردەوەکانیان، ئینجا شێوەیەکی بەهەشتی و دۆزەخییەکان نیشان ئەدات، لەپاش جێگیر بوونی هەرکام لە جێ و شوێنی خۆیاندا، شێوەی قسە و گفت و گۆو بانگ کردن لە یەکتر،

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ

---

**له یەکەمجارەوە ئەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ﴾ بەهەشتییەکان بانگ ئەکەن لە دۆزەخی یەکان بەم جۆرە: ﴿أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا﴾ بێگومان ئێمە دەستمان کەوت ئەوەی کە پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابن لە جیهاندا لە نامە لە سەر زمانی پێغەمبەرەکانی، ئەو بەڵێنەمان دەستکەوت بە راست و بەدیهات و خۆمان بە چاوی خۆمان ئەیبینین ﴿فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗا﴾ دەی ئایا ئێوەش دەستتان کەوت ئەوەی کە خوا هەڕەشەی کرد لێتان پێی، دەستتان کەوت و بە راست و بەدیهات؟ بێگومان ئەو بەهەشتی یانە چاك ئەزانن و ئاگادارن کە ئەوەش راست بوو و بەدیهات، کەواتە مەبەست بەم شێوە پرسیارە دەربڕینی کەشخە و شادومانی خۆیانە بە حاڵ و باری خۆیان و لاقرتی و شادەکامی یە بەوان , وتەی(وعد) بەکار هێنراوە لە قورئاندا لە چەند شوێنێك دا بۆ هەڕەشە و ترساندن، ئیتر ئایا لەبەر هاو وێنەیی لەگەڵ بەڵێن بە چاکە و خۆشی، یان لەبەر لاقرتی کردن بە هەڕەشە لێکراوەکان، یان هەر لە راستیدا بۆ هەردوو هاتووە، کەواتە لێرەدا هیچ گرێیەك نییە، لە وەڵامی ئەو شێوە پرسیارەدا یەك وشە ئەڵێن: ﴿قَالُواْ نَعَمۡۚ﴾ ئەڵێن: بەڵێ، واتە دەستمان کەوت و بەدی هات ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ﴾ ئینجا جارچییەك جار ئەدات لە نێوان هەمووان دا ﴿أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەمەی نەفرین و بێ بەشی لە میهرەبانی خوا لەسەر ستەمکاران، ئەو ستەمکارانەی ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا﴾ کە روو وەرئەگێڕن و بەرگری خۆیان ئەکەن لە رێی خوا و لە ئایینی خوا، یان ئەوانەی کە جڵەوگیریی مەردوم ئەکەن لە ئایینی خوا، داوای ئایینی خوا ئەکەن و**

ئەیانەوێ بە خواریی و بە لاریی، بەم رەنگە نەنگ و رەخنەی لێ ئەگرن، یان لاری ئەکەنەوە و بای ئەدەن بەلای لاریی و چەوتیدا بە تەئویل و شتی ناهەق و پڕووپووچ و بەهۆی ئەوەوە خۆیشیان و خەڵکیش لائەدەن لە رێگە راستەکەی خوا و رێگە راستەکەی خوا بەو جۆرە لار و چەوت نیشان ئەدەن، ﴿وَهُم بِالْآخِرَةِ كَافِرُونَ﴾ ئەوانە بێ بڕوان بە هەمیشەیی بە رۆژی دوایی و دان نانێن بەو رۆژەدا و بەسەرهاتەکانیدا ﴿وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ﴾ لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا، یان لە نێوان بەهەشتی و دۆزەخی یەکاندا پەردەو بەربەست هەیە کە جوێی کردوونەتەوە لە یەکتر و بەرگری گوزەر و هاتوچۆ ئەکات، بەڵام بەرگری قسە و گفت و گۆ کردن لەگەڵ یەکتر ناکات، ئیتر بەرگری بینین بکات یان نە ء؟ وا دەرئەکەوێ مەبەست لەم حیجابە ئەو دیوار و شورەیە کە لە سورەتی(حدید) دا ئەفەرموێ: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ﴾ وەك(ئیمامی بەیهەقی) ئەگێڕێتەوە لە(مقاتل) ەوە و چەند کەسێکی تریش لە پێش ئەمەوە ئەگێڕنەوە لە(موجاهید) ەوە، ﴿وَعَلَى الْأَعْرَافِ رِجَالٌ﴾ بەسەر بەرزایی یەکانی ئەو بەست و شورەوە چەند پیاوێك هەیە کە ﴿يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ﴾ هەرکام لە بەهەشتی و دۆزەخی یەکان ئەناسن بەهۆی نیشانە و شێوەی تایبەتی خۆیانەوە کە خوا کردوونی بە نیشانەیان، وەك بریقە و سپێتی رووی بەهەشتییەکان و رەشی و ناشیرینی رووی دۆزەخییەکان ﴿وَنَادَوْا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ﴾ بانگ ئەکەنە بەهەشتی یەکان ﴿أَن سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾بەمەی سەلامتان لێبێ لە کاتێکدا ﴿لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ﴾ ئەو بەهەشتی یانە نەچوونەتە بەهەشت لە کاتێکدا ئومێد و چاوەڕوانی چوونی ئەکەن، یان لە کاتێکدا ئەوان وان بەسەر بەرزایی یەکانەوە نەچوونەتە بەهەشت و چاوەڕوانی چوونی ئەکەن، ئەم دوو رایە هەیە، بەڵام دووەم لە دڵدا بەهێزترە، ئەوانە دیارە چاو ئەبڕنە بەهەشتییەکان و مەگەر بەهۆی شتێکەوە چاویان لێ کلا بکەن، وەك وەریش ئەگیرێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ النَّارِ﴾ کاتێ چاوەکانیان لادرێ و وەرگێڕرێن بۆ تەرەفی دۆزەخی یەکان

قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾

---

**﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن بە پاڕەو لاڵەوە ﴿رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەی پەروەردگارمان مەمانگێڕە لە ریزی ستەم کاران و لەگەڵ ئەوان کۆمان مەکەرەوە لە ئاگردا، ئەمانەی کە وان بەو بەرزایی یانەوە بە تایبەتی بانگێك ئەکەن لە چەند کەسێکی تایبەتی دۆزەخی یەکان کە سەرۆك و بەناوبانگ بوون و ئەیانناسن بە نیشانەی تایبەتی خۆیان لە جیهاندا، یان بە نیشانەی تایبەتی رۆژی دوایی یان وەك لە حەدیسدا هاتووە ئەو نیشانانە بۆ هێندێ لەو بێ بڕوایانە. بۆ نموونە لە حەدیسدا هاتووە کە ئەو بێ بڕواو ستەمکار و خۆ بە زل زانانە لە رۆژی دواییدا لە قەبارەی مێروولە زۆر وردەکاندا زیندوو ئەکرێنەوە کە ئەوە ناشیرین ترین شێوەیە! وێنەی ئادەمی و لەو قەبارە و جەستە زۆر وردەدا!! بانگ ئەکەن لەوانە بە تایبەتی بۆ تەشەر لێدان و ریسوا کردن و سەرزەنشت وەك ئەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ﴾ ئەوانەی کە وان بە بەرزایی یەکانەوە بانگ ئەکەن ﴿رِجَالٗا﴾ لە چەند پیاوێك ﴿يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ﴾ ئەمان ئەیانناسن بە نیشانەی تایبەتی خۆیان، بانگیان لێ ئەکەن بەم جۆرە ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن پێیان ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ﴾ هیچ سوودی پێنەگەیاندن و بێ پێویستی نەکردن کۆ و کۆمەڵەکەتان. یان کۆکردنەوەی ماڵ و سامانەکەتان، خۆ بە زل زانی و یاخی بوونەکەتان کە لە جیهاندا بووتان بەرامبەر بە ئایینی خوا و بەندەیانی خوا، ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ﴾ ئایا ئەوانە، واتە هەژار و بێ دەسەڵاتەکانی بڕواداران کە ئەو سەرکێشانە سزایان ئەدان و بە سووك و ریسوا سەرنجیان ئەدان و لەو رۆژەدا وان لە بەهەشتدا، ئایا ئەوانە ئەو کەسانە بوون کە ئێوە لە جیهاندا سوێندتان ئەخوارد کە خوا میهرەبانی یان لەگەڵ ناکات؟**

مەبەست لەم پرسیارە تەشەر دانە لەو سەرکێشانە و بە درۆ خستنەوەی داخ نانە بە دڵیاندا، لە پاش تەشەردان لەوان، ئینجا لا ئەکەنەوە بۆلای ئەو هەژارە خوا پێداوانە و ئەڵێن پێیان، یان لەلایەن خواوە پێیان ئەگوترێ ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ﴾ بچنە بەهەشت، یان مەبەست ئەوەیە بەردەوام بن لە بەهەشتدا لە کاتێکدا ﴿لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ﴾ هیچ مەترسی یەکتان لەسەر نییە و باکتان نەبێ لە داهاتووتان ﴿وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ﴾ ئێوە غەمبار نابن بەهۆی هیچ رووداو و بەسەرهاتێك کە نازو رێزتان لێ تێك بدات. ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوە، بەڵام ئەمەی کە گوتمان بەهێزو دامەزراو ترە لە دڵدا، خوا خۆی چاك ئەزانێ، ئینجا دەربارەی مەبەست بەم دەستەی کە پێیان ئەگوترێ(أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ ) چەند رایەك هەیە،(قرطبی) دوانزە را باس ئەکات، کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەوانە کەسانێکن چاکە و خراپەیان هاوتایە، نە ئەوەندە چاکن لە رێوە بچنە بەهەشت، نە ئەوەندەش خراپ و بەدن کە لەگەڵ کۆمەڵی دۆزەخی یان بن، ئەوانە ماوەیەك ئەمێننەوە بە بیم و ترس و بە تەمای میهرەبانی خوایشن تا لە پاشدا خوا میهرەبانی یان لەگەڵ ئەکات و ئەیانخاتە بەهەشت،(بیضاوی) ئەفەرموێ: دەستەیەکن لە خواپەرستان و کەم و کورِی یان هەیە لە کردەوەدا، بەند ئەکرێن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا تا بڕیاری خۆی دەرئەکات، ئینجا لەپاش ئەو باسانە بانگ و هاوارێك ئەدا بە گوێچکەماندا لەلایەن دۆزەخی یەکانەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ دۆزەخی یەکان بانگ و هاوار ئەکەن لە بەهەشتییەکان ﴿أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ﴾ بەمەی بڕێژن و بەسەرماندا لە ئاو یان لەوەی کە خوا بەشی داون و کردوویەتی بە رۆزیتان، واتە لە هەر خوراوەیەکی تر وەك هێندێ ئەفەرمون، یان لەهەر خۆراك و خواردەمەنی یەك وەك هێندێ تر ئەفەرمون. بێگومان بەشێك لە سزا سەختەکانی دۆزەخی تینوێتی و برسێتییە، لە پێشەوە تینوێتی لەبەر ئەوە ئەو هاوارە ئەکەن. ئینجا وەڵامێك ئەدرێنەوە کە سەخت ترە لە تینوێتی و برسێتی یەکە، ئەوەتا ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەڵێن پێیان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ خوا هەردووی حەرام و قەدەغە کردووە لەسەر بێ بڕواکان،

ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ

---

**ئینجا بۆ زیادە سزادانی دەروونییان و بێ ئابڕوو کردنیان ئەمەش ئەڵێن: ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ﴾ ئەو بێ بڕوایانەی کە ئایینەکەی خۆیان گێڕا بە ﴿لَهْوًا﴾ کارو کردەوە و خەریك بوون بە شتێ کە نەفس پێی خۆشە و خەریکی ئەکات لە کردەوەی بە سوود و بەنرخ ﴿وَلَعِبًا﴾ رابواردن و خۆشی بەکاری بێ سوود و منداڵانە، واتە ئەو ئایینەی کە خوا فەرمانی پێداوە ئەوانە گاڵتە و لاقرتی پێ ئەکەن، یان ئەو کارو کردەوەی کە بێ سوود و بێ نرخە گێڕاویانە بە ئایینی خۆیان وەك بت پەرستی و هەموو کارو کردەوەکانی تر، یان بە ئارەزووی خۆیان بڕیار ئەدەن لە ئایینی خوادا، بە پێی ئارەزووی خۆیان دەست کاری ئەکەن، یان ئایینی خوا ئەکەن بەهۆی دەستکەوتی دنیا کە دنیای رووت یەکێکە لەو دوو شتە بێ نرخە:(لهو لعب)، ﴿وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ژیانی نزیك و یەکەم کە ژیانی جیهانە هەڵیخەڵەتاندن و خەریکی کردن لە کارو کردەوەی بەنرخ و پڕ سوودی رۆژی دوایی یان و لە بیری خۆیان دەرکرد ﴿فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەمڕۆ ئێمەش ئەوان وەك لەبیرچوو لێ ئەکەین و بە شێوەی لەبیرچووان رەفتاریان لەگەڵ ئەکەین ﴿كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا﴾ هەرچۆنێ بە وێنەی لەبیر چوون و لەبیر دەرکردنی ئەوان بۆ گەیشتن و دووچار بوونی ئەم رۆژەیان، واتە بە وێنەی بیر لێ نەکردنەوەی ئەوان و گوێ نەدانیان، بەم رۆژە و گەیشتنیان بە سەختی و سامناکی بەسەرهاتی ئەم رۆژەیان ﴿وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ هەرچۆنێ و بە وێنەی بڕوا نەهێنان و دان نەنانی ئەوان بە ئایەتەکانی ئێمە لە جیهاندا بە هەمیشەیی و بەردەوام بوون لەسەری تا مردن، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوەی هیچ بڕو بیانوویەك نییە بۆ ئەو بێ بڕوایانە، چونکە ئەم قورئانەی بۆ ناردن کە ئەوەی پێویست بێت روون کراوەتەوە بۆیان لەم نامەدا کە قورئانە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ﴾ سوێند بەخوا ئێمە هاتین بۆلایان بە نامەیەکەوە، واتە نامەیەکمان بۆ ناردن کە ﴿فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ کە ئایەت و مەبەستەکانیمان باسکردووە بە روونی بە بێ تێکەڵ و پێکەڵی، بە پێی زانینی تەواوی خۆمان و لەسەر ئەو زانینە تەواوە،**

هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ

---

﴿هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ لەبەر رێنموونی و ڕێ نیشاندان و میهرەبانی کەسانێ کە بڕوایان هەیە و بڕوا ئەهێنن، هەرچەند ڕێ نیشاندان و رێنموونی یەکەی بۆ هەمووانە، بەلام سوود و بەرهەمەکەی هەر بۆ بڕوادارانە، لەبەر ئەوە تایبەتی کرد پێ یانەوە ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ﴾ ئایا بێ بڕوایان چاوەڕوانی هیچ شتێ ئەکەن بێجگە لە دوا ڕۆژو سەرەنجامە ڕاستەکەی و بەدیهاتنی هەواڵەکانی؟ واتە با چاوەڕوانی هیچ شتێ نەکەن لەبارەی ئەو نامەیە و بڕوا نەهێنانە پێی، بێجگە لە دەرکەوتنی ڕاستی و بەدیهاتنی هەواڵەکانی، چونکە هیچ شتێکی تر نابێ و دەستیان ناکەوێ بێجگە لەوەی کە ئەو نامەیە هەواڵی پێداوە، ﴿يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُۥ﴾ ڕۆژێك کە عاقیبەت و پاشەڕۆژی ئەو نامەیە دێت بە تەواوی کە ئەو ڕۆژەش ڕۆژی دوایی یە کە هەموو هەق و ناهەقێك لەو ڕۆژەدا دەرئەکەوێ بە تەواوی، لەو ڕۆژەدا ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ﴾ ئەوانەی کە ئەو نامەیان لەوە و پێش لەبیر کردبوو و گوێیان نەدابوویە، ئەوانە لەو ڕۆژەدا ئەڵێن: ﴿قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ﴾ بەڕاستی و بێگومان فروستادە و نێرراوەکانی دەرئەکەوێ کە عاقیبەت و دوا ڕۆژی هەواڵەکانی ئەو نامانە ڕاست دەرچوو، بە چاوی خۆیان ئەبینین، جا لەو ڕۆژەدا بە نائومێدیی یەوە ئاوات ئەخوازن و ئەڵێن: ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ﴾ دەی ئایا تکاکاران هەیە بۆ ئێمە تا تکامان بۆ بکەن، واتە ئای داخ بۆ ئێمە کاشکێ تکاکار بوایە بۆمان تکای بکردایە بۆ ڕزگار بوونمان ﴿أَوْ نُرَدُّ﴾ یان ئاخ

بمانگێڕنەوە بۆ جیهان: ﴿فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ تا کردەوەیەك بکەین جیاواز لەو کردەوەی

کە لەوەو پێش کردمان، واتە لەباتی بێ بڕوایی و کردەوە بەدەکانمان، بڕوا و کردەوەی چاك

ئەنجام بدەین، بێگومان کات و هەوڵیان لە دەست چوو، هیچ کام لەو دوو ئاواتە بەدی نایەت

و بەجێناهێنرێ، وەك دەرئەکەوێ لەم هەواڵ و بڕیارەوە کە ئاراستەی ﴿قَدۡ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾

بێگومان ئەوانە زیانباری خۆیان بوون و خۆیان لەدەست چوو بەمەی کات و ژیان و تەمەنی

خۆیان بەختکرد لە بێ بڕوایی و بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان بۆ خوا و کردەوەی بەددا،

﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ بێگومان ون ئەبێ لێیان ئەوەی کە لە جیهاندا دەست

هەڵبەستیان پێکرد و هەمیشەیی بوون لەسەری، واتە ئەو بت و هاوبەشانەی کە بە درۆ و

دەست هەڵبەستیانکرد و ڕەوایاندا بۆ خوا و بە تەمای تکایان بوون، ئەوانە سەرجەم سەریان

لە هیچەوە دەرچوو دەرئەکەوێ کە درۆ و دەست هەڵبەست بوون. لە ئایەتەکانی لەمەو پێش

دەست نیشانی کرد بەوەی هۆی لەناو چوون و تیا چوونی بێ بڕواکان و زیانباری یان

ئەوەیە هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوادا لە پەرستندا، چەند شتێکیان دانا بە تکاکار لای خواو

بەهۆی ئەوەوە ئەو تکاکارانەیان ئەپەرست و کردیانن بە هاوبەشی خوا، پەیڕەوی

پێغەمبەرەکانیان نەکرد کە بانگیان ئەکردن بۆ پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا، ئینجا ئەوا

بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا ئەخاتە بەرچاو، لەسەر تاك و تەنیایی خوا، دەستی ئادەمی

ئەگرێت و چەرخەی پێ ئەکات و ئەیگێڕێ بەناو ئەم بوونەوەرەدا کە خوا دایهێناوە تا

مەردوم شەرم بیگرێ و هیچ هاوبەشێك ڕەوا نەدات بۆ خوا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ﴾

بەڕاستی پەروەردگارتان کاربەدەست وبەڕێوەبەری هەمووکاروبارتان خوایە کە ناوی(الله)یە،

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد لە شەش ڕۆژدا، بە پێی بیرو باوەڕە ڕێك و ڕاستەکەی ئیسلام هەر بۆچوونێ کە لە دەروونی ئادەمی هەڵقوڵێ لە بارەی خواو سیفەتی خوا و چۆنێتی کردەوەی خوا، ئەو بۆچوونە هەڵەیە و ناڕاستە، چونکە ئەو بۆچوونانە لە سنوورێك دایە کە ژێریی ئادەمی وەری ئەگرێ و بنەڕەتی ئەو شتانەیە کە بە دەوری پایەتی و ئەیانناسێ، دەی قورئانیش ئەفەرموێ: ﴿لیس کمثله شیء﴾ هیچ شتێ وێنەی خوا نییە، کەواتە بێگومان بۆچوون و زانینی ئادەمی ئەوەستێ لەو مەیدانەدا، زانای بەناوبانگ سید عبدالرحیمی مەولەوی جوان ئەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| کەنارەی سەحرا نادیاریی یە | بینایی عوقول ئاو مرواری یە |
| چاك واتە خەیاڵ بێ تەقریب نەکەین | مەعلومە تۆ تۆ ئێمەیچ خۆ ئێمەین |

کەواتە ئەوەی بۆ ئێمە مابێتەوە هەر سەرنج دان و بیر کردنەوەیە لە بەرهەمی کردەوەکانی کە بریتی یە لەم بوونەوەرە کەوا لە چوار چێوەی زانین و ژێریی ئێمەدایە، لەبەر ئەوە قورئان لە چەند شوێندا، هەر جارەی بە جۆرێ سەرنجمان ڕائەکێشێ بۆ ئەم بوونەوەرە و ئەو شتانەی کە لەم بوونەوەرەدایە، ئینجا ئایا مەبەست بەم شەش ڕۆژە چییە کە لە قورئاندا هاتووە لە چەند ئایەتێکدا؟ شتێکی ئاشکرایە کە ئەم ڕۆژانی ئێمە نییە کە لە پاش دروستکردنی زەوی و ئاسمان پەیدا بوون، کەواتە ئەڵێین: مەبەست چەند کاتێکە بە وێنەی کات و ماوەی شەش ڕۆژ یان مەبەست شەش ڕۆژە لە ڕۆژەکانی خوا کە لە قورئاندا دەست نیشانیان بۆ ئەکات و خوا خۆی ئەزانێ چۆنن، یان مەبەست شەش قۆناغە کە هاتووە بەسەر ئەم ئاسمان و زەوییەدا، یان مەبەست شەش بارو تەورە کە تێپەڕی کردبێ بەسەریاندا، وەك ئەمانە هەموو گوتران، بەڵام هەرکام لەمانە گۆترەکاری و گومانی ڕووتە و ناگاتە ڕادەی زانینی ڕاستەقینە، کەواتە چاك وایە بێ دەنگ بین لەم جۆرە شتانە و زانینیان حەواڵەی خوا بکەین،

ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ

وەك زانینی مەبەست بە وتەی ﴿ٱسۡتَوَىٰ﴾ کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ لە چەند شوێنێکی تردا باسمان کرد - یەکێ لەو شوێنانە لە سورەتی(طه) لە تەفسیری ئایەتی(٥) کەلە پێش ئێرەدا تەفسیرمان کرد، کە ئایەتەکانی قورئان هێندێکیان پێیان ئەگوترێ(متشابه) واتە واتا و مەبەستەکەی روون نییە، هەر ئایەتێك وتەیەکی تێدا بێت کە رووکەشەکەی وێنەیی خوا نیشان بدات بۆ دروستکراوەکانی ئەو ئایەتە بە(متشابه) دانراوە وەك وتەی: ﴿وجه ، يد، جاء ربك﴾، وەك ﴿استوى﴾ لێرەدا رووکەشەکەی ئەمەیە جێگرو نێشتەجێ بوو، یان رێك و پێك راوەستا بەسەر عەرشەوە، لەبارەی ئەو جۆرە وشە و وتانەوە هەموو ئوممەت لەسەر ئەوەن کە ئەو روالەت و رووکەشانە مەبەست نین، ئینجا لەمەدا جیاواز و دووبەرەکین کە ئایا واتا و مەبەستێکیان بۆ دیاریی ئەکرێ یان حەوالەی زانینی خوا ئەکرێن، تاقم و دەستەی سەرەتای ئوممەت کە پێیان ئەگوترێ:(سلف) لەسەر رای دووەمن، دەستە و تاقمی دوای ئەوان کە پێیان ئەگوترێ:(خلف) لەسەر رای یەکەمن، وەك بە درێژیی لە تەفسیری ئایەتی(٦) ی(آل عمران) دا ئەو باسە تێپەریکرد، جا لێرەدا بە گوێرەی رای(سلف) ئەڵێین: ئینجا لەپاش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی خوا نیشتەجێ بوو رێك و پێك وەستا بەسەر عەرشەوە بە جۆرو شێوەی کە شیاو و شایستەی خوایە و دوور و پاك لەو جۆرەی کە بۆ دروست کراوەکانی خوا هەیە، هەر خوا ئەزانێ چۆنە، هەروەها لە هەموو وتەو وشەکانی تر هەر بەو جۆرە ئەڵێین، لەسەر رای دوایی یەکان(خلف) بە چەند جۆر و شێوەیەك راڤە کراوە، نزیك ترینیان ئەمەیە کە گوتراوە: کاروبار و تەگبیری موڵك و بوونەوەرەکەی دواییهات و تەواو بوو، بە وێنەی ئەوەی کە لە جیهاندا ئەگوترێ پادشا چووە سەر تەخت کاتێ کە کاروباری وڵاتەکەی دامەزرێ و ئەوەی پێویست بێت بۆ وڵاتەکەی بەجێهاتبێ، ئینجا وتەی(عرش) بە پێی ئایەت و حەدیس، خوا دروست کراوێکی هەیە ناوی(عرش) ە و لە پێش ئاسمانەکان و زەوی، ئەو عەرشە بەسەر ئاوەوە بووە و ئەو عەرشە مەرکەزە بۆ هەموو بڕیار و تەگبیری جیهان و جیهانییان، ئیتر ئێمە ئەمە ئەڵێین و چۆنێتی هیچ شتێ لەوانە باس ناکەین، لەمەو پاش لەو ئایەتانەی کە باسی ئەم عەرشەی تێدایە هەر

شتێکی ترمان بۆ دەرکەوت و دڵنیا بووین لێی بە یارمەتی خوا ئەیڵێین. ئینجا هێندێ لەو تەگبیرانە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ﴾ شەو ئەدا بە ملی رۆژدا، یان رۆژ ئەدات بە ملی شەودا، بە هەردووکی تەفسیر کراوەتەوە و بەڵگە لەسەر هەردووکی هێنراوەتەوە، لەسەر هەرکام مەبەست ئەمەیە تاریکی شەو ئەهێنێ بەدوای رۆژدا، یان رووناکی رۆژ ئەهێنێ بە دوای تاریکی شەودا، هەرکام لەو دووانە ئەهێنێ بەسەر جێ و شوێنی ئەوی تردا، لە کاتێکدا ﴿يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا﴾ رۆژ داوای شەو ئەکات بە چەسپانی، یان شەو داوای رۆژ ئەکات بە چەسپانی. واتە ئەو دێت بەدوای ئەمدا و، یان ئەم دێت بەدوای ئەودا وەك داوا کراوە بە بێ تەفرە و دواکەوتن! ئەمەی کە قورئان دەست نیشانی بۆ ئەکات لەم سەردەم و چەرخی تازەدا زۆر ئاشکرایە کە دەرکەوتووە زەوی خڕە و ئەگەڕێ بە دەوری خۆیدا لەبەردەم خۆردا، کە هەر بەش و چمکێکی خۆری لێ ئاوا بوو بە بێ تەفرە و دواکەوتن تاریکی شەو دێتە جێی رووناکی یەکە بە چەسپانی، هەروەها هەر بەشێکی کەوتە بەر تیشکی خۆر دەست بەجێ و بێ تەفرە تاریکی یەکەی ئەڕواو رووناکی دێتە جێگەی بە چەسپانی، وەك هەرکام ئەویتری داوا کردبێ، جا هەرکات هەر ژیرێ بیر بکاتەوە لەو گۆڕاندن و بەدوادا هاتنە هەمیشەیی یە پڕی دڵ و دەروونی ئەبێ لە بڕوای بەهێز بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو کارە گرنگە ئەکات!! ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾ خوا خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی دروستکردووە بە ژێر بار کراوی و بێ سەرپێچی، بە فەرمان و ویست و خواهیشی خۆی، ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾ بێدار بنەوە کە هەر بۆ خوایە دروستکردن و داهێنان، بڕیار دان و دیاریی کردنی هەر شتێ لە سنووری تایبەتی خۆیدا، هەر بۆ ئەوە فەرمان و بەدیهێنان و تەگبیری هەر شتێ، یان مەبەست ئەوەیە هەموو دروستکراوەکان هەر بۆ خوایە و موڵکی خوایە، هەر بۆ خوایە فەرماندان بەهەر شتێ کە خوا خۆی بیەوێ، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بە(خلق) عالەمی خەلقە و مەبەست بە(امر) عالەمی ئەمرە، کە یەکەم دروستکراوێکە بە ئەسباب و کەرەسە، دووەم دروستکراوێکە کە یەکسەر و لە یەکەم جارەوە دروستکرابێ، بۆ وێنە: لەشی ئێمە لە عالەمی(خلق) ەوە گیانەکەمان لە عالەمی(امر) ە، بە هەر بار بگیرێ هەموو هەر بۆ خوایە و موڵکی خوایە و داهێنراوی خوایە،

تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا

---

**﴿تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پاك و بێگەردە لە هەموو كەم و كوڕی و لەكەیەك خوایە كە ناوی(الله) یە و پەروەردگاری هەموو جیهانییانە، پاك و بێگەردە لە هەموو كار و كردەوەكانی یا كە لێرە سەر دەستەی كارو كردەوەكان ئەوەبوو كە لە ئایەتەكەدا فەرموی و ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ بەهەركام لە تەفسیرەكانی، یان ئەڵێین: بەرز و بڵندە و پیت و فەڕی زۆر و فراوانە پەروەردگاری جیهانیان، كەواتە هەموو سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوەو هەر ئەو شیاوی گوێرایەڵی و پەرستنە، چونكە هەر بۆ ئەوە(خلق) و(أمر). ئینجا لەم كاتەدا كە دەری خست مل كەچی و بەندەیی و فەرمانبەریی هەموو شتێ بۆ خوای پەروەردگار. لەم كاتەدا فەرمان ئەدات و تەمێی بەندەكانی ئەكات كە بە ئەوپەڕی مل كەچی و سام و بیمەوە پەروەردگاریان بپەرستن و نزاو هاواری لێبكەن، ئەفەرموێ: ﴿ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ﴾ هاوارو نزا بكەن لە پەروەردگارتان ﴿تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ بە زەلیلی و كڕوزانەوە و پاڕە و لاڵەوە بە نهێنی و نەك بە دەنگی زۆر بەرز كە زیادەڕەوی تێدا بێت، چونكە ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ بێگومان خوا دەست درێژیی كەران و زیادە ڕەوی كەرانی خۆش ناوێ. كەواتە نابێ نزاو هاوار لە غەیری خوا بكرێ بۆ فریاد ڕەسی، نابێ داوای شتێ بكرێ كە لە شانی نزاكەرەكەدا نەبێ، وەك داوای ئێمە بۆ رادە و پلەی پێغەمبەران. وەك لە حەدیسدا هاتووە كە ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود ریوایەتیان كردووە كە ئەفەرموێ: ﴿سیكون قوم یعتدون في الدعاء﴾ لەمەو پاش كەسانێ پەیدا ئەبن كە زیادە ڕەوی ئەكەن لە نزادا، لە وتەیەكی تردا: ﴿تعتدون في الطهور و الدعاء﴾ زیادە ڕەوی ئەكەن لە دەست نوێژو خۆشۆرین و لە نزادا، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێند، جا(ئەبو مجلیز) ئەفەرموێ: با داوای رادە و پلەی پێغەمبەران نەكەن، یەكێتر لە زیادە ڕەوی كردن ئەمەیە دەنگ زۆر بەرز بكرێتەوە و بكرێ بە هۆسە و هەرا وەك باوە لای زۆر لە نەفامان،(ئیمامی موسلیم) حەدیسێك ئەهێنێ لە(ئەبو موسای ئەشعەری) یەوە كە**

ئەفەرمویٚ: لە سەفەرێکدا بووین یان لە غەزایەکدا بووین خەڵکی بە دەنگی بەرز زیکر و نزایان ئەکرد، ئینجا پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: خەڵکینە بە ئارامی و هێواش و خۆتان ناڕەحەت مەکەن، چونکە بێگومان ئێوە هاوار و نزا لە کەسێکی کەڕو غائیب و نائامادە ناکەن، بێگومان ئێوە هاوار و نزا لە بیسەرێکی نزیك ئەکەن، ئەو کەسە لەگەڵتانە، قورئان ئەیەویٚ کە بڕواداران هەمیشە بژین بەو هەستە پاکەوە، هەست بە گەورەیی و ئاگاداریی و نزیکی خوا لە بەندەکانی و لە هەموو شتێکەوە، جا ئەو کاتە بەندە شەرم ئەکات لە هەموو کارێکی ناڕاست و بیٚ جیٚ، تەنانەت لە نزاو هاواریشدا لە رووی نایەت بیکا بە هۆسە و قیڕە و قاڵە! چونکە ئەوە زیادە رەوی و دەست درێژیی یە، جا بەو بۆنەیەوە هەموو زیادە رەوی و دەست درێژیی یەکی ناشیرین و بێزراو کرد و فەرموی: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾، هەروەها جڵەوگیریی کرد لە هەر خراپەکاری یەکی تر، فەرموی: ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا﴾ خراپەکاریی مەکەن لە وڵات و لە زەویدا پاش ئەوەی خوا چاکی کردووە و بە جۆر و شێوەیەك دروستی کردووە کە هەموو جۆرە سوود و بەهرەیەکی تێدایە بۆ بەندەکانی خوا و رێك و پێکە لەگەڵ ژیانی کامەرانیدا، پێغەمبەران و نامە و بەرنامەی خۆی ناردووە و شەریعەتی داد و دادپەروەریی نارد بۆ سەر زەوی. پرسیار کرا لە(ئەبوبەکری کوڕی عیاش) لە مەبەستی ئەم ئایەتە؟ ئەویش فەرموی: دانیشتوانی زەوی و وڵات لە فەساد و خراپەکاریدا بوون، ئینجا خوا محمدی(ص) رەوانە کرد بۆ چاك کردنیان، ئینجا هەرکەس بانگ بکات بۆ پێچەوانەی ئەو ئایین و شەریعەتەی کە ئەو هێنای ئەو کەسە بێگومان لە خراپ کەر و تێکدەرانی وڵاتە، بێگومان خراپەکاری بە هەر جۆر و لەسەر هەر بار بەد و ناشیرینە، بەڵام فەساد و خراپەکاری لە پاش چاك کردن بەد و ناشیرین ترە، جا لەبەر ئەوە بە تایبەتی جڵەوگیریی کرد لەم بەش و جۆرەیە، کەواتە وا نیشان نادات کە جۆرێکی تر بەدو خراپ نییە، لەپاش ئەوەی جڵەوگیریی کرد لە دەست درێژیی و فەساد و تێکدانی وڵات و دانیشتوانی وڵات،

**ئەفەرموێ:** ﴿وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ﴾ **نزاو هاوار بکەن لە خوا بە بیم و ترس و ئومێدەوە، بیم و ترس لە خەشم و تۆڵەی، ئومێدو چاوەڕوانی ڕەزامەندی و پاداشتی، نزاو هاوار کردنە خوا جۆر و شێوەی ئاشکرا و جۆر و شێوەی نهێنی هەیە، جا لە فەرمانی یەکەمدا دەست نیشان هەیە بۆ جۆرو شێوەی یەکەم کە ئەبێ بە سەرکزی و کڕوزانەوە بێت بە سەبر و بە شەرم نەکرێ بە قیڕە و قاڵە کە ئەوەش ئاشکرایە و لە ڕواڵەتدا دەرئەکەوێ، لەم فەرمانی دووەمەدا دەست نیشان هەیە بە جۆرو شێوەی دووەم کە ئەبێ بە ترس و بیم و ئومێدەوە بێ کە نهێنی یەو لە دەرووندایە، کەواتە ئەم فەرمانی دووەمە جیاوازە لە پێشووەکە و دووبارە کردنەوەی ئەو نییە، لەسەر ئەم بارە هەرکام لەم دوو فەرمانە ڕێك و پێك ترە لەگەڵ ئەو ڕستەی کە دێت بە دوای فەرمانەکەدا و هەرکام دەست نیشانە بۆ هۆی فەرمانەکە: لە فەرمانی یەکەمدا داوای شێوە ئاشکراکەی کرد کە بە چاو ئەبینرێ، وەك شێوەی زیادە ڕەوی و دەست درێژیی کە بە چاو ئەبینرێ، واتە بەو جۆر و دیمەن و ڕواڵەتە نزا بکەن و بێجگە لەوە دەست درێژیی یە، خوایش دەست درێژیی کەرانی خۆش ناوێ، لەم فەرمانی دووەمەدا داوای جۆر و شێوە دەروونی یەکەی نزا ئەکات کە بیم و ترس و ئومێدە و زۆر ڕێك و پێکە لەگەڵ ڕستەکەی کە بەدوایدا دێت و هانی بڕوادار ئەدات لەسەر حاڵەت و سیفەتێکی دەروونی، ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ **بەڕاستی میهرەبانی خوانزیکەلەئیحسان کەرانەوە، ئیحسانیش حاڵەتێکی نهێنی دەروونی یەکەبریتییە لە سام و شەرم وشکۆلەخوا وەك لەحەدیسی سەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لە وەڵامی پرسیاردا ڕوونی کردەوەو فەرموی: ئیحسان ئەمەیە کە تۆ خوا بپەرستی بە جۆرێ وەك خوا ببینی، واتە شەرم و شکۆ و سامەکەت بگاتە ڕادەیەك، وەك بە چاوی سەر خوا ببینی، واتە نزا بکەن بەو سام و بیم و ئومێدەوە تا بەهۆی ئەوەوە بچنە ڕیزی ئیحسان کەران کە میهرەبانی خوا نزیکە لێیانەوە، نزا کردن چەند ئادابێکی تری هەیە پێویستە بزانرێن: بە دەست نوێژەوەورووبەقیبلەولەپێشەوەسوپاس وسەنای خواوسەلاوات لەسەرپێغەمبەر(ﷺ)**

وەك لە كۆتاییشدا سەلاوات دان، دەست بەرز كردنەوە بەرەو ئاسمان، بەشداركردنی بڕواداران لە نزاكەدا، هەوڵدان بۆ كاتی تایبەتی كە نزای تیا وەرئەگیرێ، پەلە نەنرێتەوە لە خوا بۆ وەرگرتن، تەگبیر و راوێژی بۆ نەكرێ، بارێكی تایبەتی بۆ دیاریی نەكرێ. پرسیار كراوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە كە بە پێی زمانی عەرەبی ئەبوایە لە باتی(قریب)(قریبة) بوایە؟ بەڕاستی ئەو جۆرە پرسیارانە كە ئەكرێن لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، ئەو جۆرە پرسیارانە لە راستیدا زۆر بێ جێ یە، چونكە ئەم قورئانە لە ئەوپەڕی رادە و پلەی بەرزی رەوان بێژییدایە و لە یەكەم جارەوە خوێنراوەتەوە بەسەر گەل و كۆمەڵێكدا كە مامۆستا و پێشەوا بوون لەم زمانەدا، كەواتە ئەگەر ئەم وتەیە پێچەوانەی یاسا بوایە ئەبوایە هەر لەو یەكەم جارەوە ئەو باسە بكرایە و ئەو پرسیارە بكرایە، بە تایبەتی زۆربەی ئەو یەكەم چینە لە یەكەمجارەوە زۆر دژ و دوژمن بوون، هەمیشە ئەیانویست بە هەر جۆر بووە رەخنەیەك بدۆزنەوە و بیكەن بە هۆسە و هەرا كەچی لە هیچ كام لەو دوژمنانەش نەبیستراوە ئەو جۆرە قسە و باسانە، كەواتە هیچ رەوا نییە لە پاش ئەوان بە چەند چەرخێك هیچ كەس ئەو قسە و باسانە بكات و بیكات بە گرێ لە دڵی خۆی و خەڵكی تریشدا، ئەبێ بزانرێ كە هاتنی ئەو جۆرە وتانە لە قورئاندا جێگەی رەخنە و سەر لێكردنەوە نییە، لەگەڵ ئەوەدا وەڵامی ئەو گرێ و سەر لێكردنەوە دراوەتەوە بە چەند وەڵامێك كە هەمووی راست و بەجێیە، یەكێ لەوانە ئەمەیە: وتەی(رحمت) ماناكەی(إحسان) ە یان بە مانای(رحم) ە و یەكسانە لەگەڵی، یان لەبەر وتەی(الله) یە كە(مضاف إلیه) ە بۆی، یان وتەیە وەك(فعیل) بە مانا(مفعول) ە كە نێر و مێ تێیدا یەكسانە وەك وتەی(قتیل، جریح) هەروەها چەند وەڵامی تریش دراوەتەوە و پێویست نییە باسیان بكەم و ئەوەی گوتم بەسە، ئینجا بە بۆنەی وتەی(رحمت) ەوە نموونەیەك لە بەرهەمی رەحمەتی خوا ئەخاتە بەرچاو لە شێوەی لاپەڕەیەك لە لاپەڕەكانی ئەم بوونەوەرە نایابە كە ورد بوونەوەو خوێندنەوەی هەركام دڵ و دەروون پڕ ئەكات لە بڕوا بە پەروەردگاری ئەو بوونەوەرە، مەگەر دڵ و دەروونێك كە لەكار كەوتبێ و بینایی یان كوێر بووبێ و سەمەسای لێ بڕابێ،

وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ﴾ خوا كەسێكە كە بایەكان ئەنێرێ و رەوانەیان ئەكات بە موژدە دەر لە پێش دەم رەحمەتەكەیدا، واتە باران وەك زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەفەرمون. شوێنی ئایەتەكەش وا نیشان ئەدات. لەناو عەرەبدا چوار جۆر با ناو براوە بە پێی ئەو چوار شوێنەی كە با هەڵئەكات لێیانەوە: ئەوەی لای سەرەوە هەڵئەكات ناو براوە بە(شمال) لەناو كوردیشدا ئەگوترێ شەماڵ، ئەوەی لای خوارەوە هەڵئەكات پێی گوتراوە:(جنوب)، ئەوەی لای رۆژهەڵاتەوە هەڵئەكات ناوبراوە بە(صبا) و ئەوەی لە رۆژئاواوە هەڵئەكات ناوبراوە بە(دبور). بە پێی نیشتمان ولأتی ئەو سەردەمەی عەرەب وا دانراوە كە بای(صبا) هەڵم و هەور ئەخاتە كار، بای شەماڵ كۆی ئەكاتەوە و بای جنوب بارانەكەی لێ ئەبارێنێ، بای دەبور پرژ و بڵاوی ئەكاتەوە، بەڵام لە هەموو ناوچە و ولأتەكاندا بەو جۆرە نییە، بۆ وێنە لە ولأتی میسردا بای(صبا) و(جنوب) باران ناهێنن، چونكە لەوێدا لە دەشت و بیابانەوە هەڵ ئەكەن و دێن كە ئاو و گیا و شینایی تێدا نییە، ئەوەی باران بێنێ بای شەماڵ و دەبورە كە لەلای دەریای سپی یەوە دێن و هەڵم و هەور هەڵئەگرن لەو دەریا و لە زەوی یە كشتوكاڵی یەكان، كەواتە بەهەرحاڵ بایەكان موژدە دەرن بە باران هەركام لە ولأت و ناوچەیەكدا، ئینجا بێگومان با بە شێوەیەكی گشتی چاكە و بەهرەیەكی گەورەیە و ژیان ناڕوا و بەسەر نابرێ بە بێ با، خوا با ئەنێرێ بەو جۆرو شێوەی كە خۆی ئەزانێ و ئەیەوێ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا﴾ هەتا كاتێ كە هەوری قورس هەڵئەگرن كە ئەو هەورانە قورسن بە هۆی ئەو ئاوەی كە تێیدایە، ﴿سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ﴾ ئەنێررێن بۆ**

ولاتێکی مردوو، واته ولاتێك که شینایی و ڕووەکی تێدا نییه ﴿فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ﴾ ئینجا بەو هەورە ئاوو باران ئەبارێنین بەسەر ئەو ولاتەدا ﴿فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە ئەڕوێنین و دەرئەهێنین لەو زەوی یە لە هەموو جۆرە بەر و میوەجات، بێگومان هەڵکردنی باو فەراهەم هێنانی هەور و گەڕان و ڕۆیشتن بۆ ئەو جۆرە شوێنانە و باراندنی باران بەسەریاندا، ئینجا ڕوان و سەوز بوونی ئەو کشت و کاڵ و دار و درەختە زۆر و جۆر بە جۆرانە، بەو بەر و میوەجاتە جوان و ڕەنگا و ڕەنگە شیرین و خۆشانە، هەموو ئەوانە شتێکی ئاشکران و وان بە پێش چاوەوە، لە ڕاستیدا شتێکی زۆر نایاب و سەر سوڕ هێنەرن، بە جۆرێ ئەگەر کەسێك یەکەم جار بێتە ئەم جیهانە و ئەو شتانە

نەبینێ و ئەو باس و هەواڵەی پێ بدرێ سەرسام ئەبێت و هەرگیز بڕوا ناکات کە شتی وا ئەبێ و ئەگونجێ!! ئەو کردەوە و بەرهەمە نایابە هەمیشە ڕوو ئەدەن و ئەبینرێن لەبەر ئەوەی دەقیان پێوە گیراوە بە سادەیی و کەودەنیش سەرنج ئەدرێن و بیریان لێناکرێتەوە لەو دەستە قودرەتەی کە ئەو کار و کردەوانە ئەکات، ئەگەر بە ژیریی و زیرەکی سەرنج بدرێن و بیریان لێبکرێتەوە، بێگومان بینین و بیر لێکردنەوەیان دڵ و دەروون پڕ ئەکەن لە بڕوای بەهێز بەو پەروەردگارە زانا و کاردروستە، جا لەبەر ئەوە قورئان هەموو جارێ سەرنجمان ڕائەکێشێ و وریامان ئەکاتەوە و دەست نیشانمان بۆ ئەکات بۆلای ئەو پەروەردگارە و ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەو کارو کردەوە بێ وێنانە ئەکات، ئینجا هەرچۆنێ ئەو بڕوا بەهێزە ئەچەسپێنێ لە دڵماندا، هەروەها دەست نیشانمان بۆ ئەکات و زیندوو کردنەوەی مردوانیشمان ئەخاتە بەرچاو و بە سوك و ئاسان تێمان ئەگەیەنێ و بڕوای بەهێز فەراهەم ئەهێنێ لە دڵماندا بە زیندوو بوونەوە و هاتنی ڕۆژێی کە بەندێکە لە بەندە گرنگەکانی ئایین و شەریعەتەکانی خوا،

ئەفەرمویٚ: ﴿كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ بە ویٚنەی دەرهیٚنانی ئەو هەموو بەرو میوەجات و رووەکانە لە زەوییە وشك و مردووەکان، بە ویٚنەی ئەوە مردووەکان دەرئەهیٚنین لە زەوی بە زیندوویی و زیندوویان ئەکەینەوە، یان هەرچۆنیٚ ئەو ولاٚت و زەوی یە وشك و مردووانە زیندوو ئەکەینەوە، هەروەها مردوەکانیش زیندوو ئەکەینەوە و لە گۆڕەکانیان دەریان ئەهیٚنین، ئەو کەسەی کە ئەو زیندوو کردنەوەو دەرهیٚنانە ئەکات، ئەم زیندوو کردنەوەو دەرهیٚنانەش ئەکات و یەکسانە بە لایەوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیر بکەنەوە لەوەو هیچ گومان و دوو دڵیتان نەمیٚنیٚ و سەرتان سوڕ نەمیٚنیٚ لە زیندوو کردنەوەی مردوان و هاتنی رۆژی دوایی، ئینجا ئایا ویٚنەیی یە کە تەنها دەرهیٚنانی زیندوو بیٚ لە مردوو، یان دەرهیٚنان بەهۆی ئاو و بارانیٚکەوە کە بباریٚ بەسەر کەرەسەی لەشە رزیوەکانی مردووەکاندا، هەرچۆنیٚ ئاوو باران ئەباریٚ بەسەر تۆمە و دانەویٚڵە وشك و مردووەکاندا؟ هەروەها بارەکە هەڵئەگریٚ و ئایەتەکە دەست ئەدات بۆ هەرکام لەو دووبارە، بەلاٚم چەند حەدیس و ریوایەتیٚك قۆڵگیری باری دووەمە، یەکیٚ لەوانە حەدیسیٚکە کە لە تەفسیری(سەعلەبی و ئیبن و عەتیە) دا هاتووە لە(ئەبو هورەیرە) وە کە ئەفەرمویٚ: مابەینی ئەو دوو فوە کە ئەکریٚ بە سورا چل ساڵە، لەو ماوەدا خوا بارانیٚك ئەباریٚنیٚ بەسەر مردوواندا وەك ئاوی پیاو و لە ژیٚر عەرشەوە دیٚت و ناو ئەبریٚ بە ئاوی زیندوو یان ئاوی زیندوو بوونەوە، بە هۆی ئەو ئاوەوە سەوز ئەبنەوە لە گۆڕەکانیان هەرچۆنیٚ دانەویٚڵە و کشت و کاڵ سەوز ئەبیٚتەوە لە ئاودا، ئینجا لەکاتی فوکردنی دووەمدا خوا گیانەکان ئەکاتەوە بە بەری لەشەکانیاندا، بە هەر بار ئەم ویٚنە و مانەندە بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر ئاشکرا و بەهیٚزە و هیچ ژیریی یەك سەری لیٚناکاتەوەو هەرکەسیش ژیر نەبیٚ با بۆ خۆی هەر وڕیٚنە بکات و شایانی ئەوە نییە گویٚی لیٚ بگیریٚ، ئینجا ئەگەر کەسیٚك ئەڵیٚ: زانیاریی تازە دەریخستووە کە زیندوو ئەبیٚ هەر لە زیندوو دەرچیٚ و هەرگیز لە مردوو دەرناچیٚ، کەواتە چۆن لەم ئایەتە و لە چەند ئایەتیٚکی تردا قورئان ئەفەرمویٚ: زیندوو لە مردوو دەرئەچیٚ؟ لە وەلاٚمدا ئەڵیٚین:

١- مەبەست بەو زیندوویی یە کە ئەو زانایانە گوتویانە شتیٚکی ترە جیاوازە لەم زیندوویی یەی کە باو و ناسراوە لای گشتی و لەناو کۆڕ و کۆمەڵدا، قورئان بە پیٚی ئەو جۆرە کە باوەو ناسراوە قسەی فەرموە و هەواڵی داوە، کەواتە هیچ دژایەتی یەك

نییه، ئەوەی کە قورئان فەرمویەتی لەگەڵ ئەوەی کە ئەو زانایانی تازە ئەیڵێن و مەبەستیانە، ئەمانە ئەڵێن: ئەو تۆمە یان ئەو دانەوێڵە کە بە دیمەن شاراوەی تێدا بێ کە دەرناکەوێ تا ئەو ئاوەی لێ نەکەوێ، ئەی ئەوە لە کوێ و ئەم گیان و زیندوویی یەی کە باو و ناسراوە لە کوێ. بەڵکو ئەڵێین: ئەو جۆرە زیندوویی یەش کە ئەوانە ئەیڵێن لە ئیسلامدا هاتووە و دەست نیشانی بۆ کراوە، دەربارەی ئادەمی هەرچەند بە زیندوویی ناو نەبراوە، ئەوەتا لە حەدیسی(موسلیم و بوخاری) دا هاتووە کە(ئەبو هورەیرە) و کەسانێکی تر ریوایەتی ئەکەن کە هەموو لەشی ئادەمی ئەڕزێ بێجگە لە ئێسکێکی زۆر بچووك لە کۆتایی بربڕەی پشت کە ناوبراوە بە(عجب الذنب) و لەو ئێسکەوە لەشی ئادەمی دروست ئەکرێتەوە بەهۆی ئەو بارانەی کە خوا ئەیبارێنێ، ئینجا بەوە سەوز ئەبن و ئەڕوێنەوە هەرچۆنێ گیاو دانەوێڵە و کشتوکاڵ ئەڕوێنەوەو سەوز ئەبنەوە، وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان بۆ کرد.

٢- ئەڵێین: هەر ئەو زانایانە ئەڵێن: ئەم زەوییە لە یەکەمجارەوە کورەیەکی ئاگرین بوو، زیندەوەرەکانی یەکەمجار و پێشوو لەو کورە ئاگرە یەکسەر دەرهات و پەیدا بوو بە بێ هۆیەکی تر، کەواتە بەم بڕیار و قسەی خۆیانە بڕیارو قسەکەی تریان بە درۆ ئەخەنەوە و ئیتر چۆن پشت ببەسترێ بەو قسە و بڕیارەی کە باسکرا؟

٣- بە چ بەڵگەیەکی بەهێزی قەتعی ئەو بڕیارو قسەی خۆیانە بە راست دەرئەکەن، لە کاتێکدا ئەمانە بێ ئاگان لە بەسەرهات و رووداوی نزیك نزیك چ جای ئەو رووداوو بەسەرهاتی دوورو کۆن کە سەرەتای کەس نازانێ کەی بووە و چۆن بووە؟

٤- کاتێ کە خوای پەروەردگار لە قورئانەکەیدا فەرموی: مردوو لە زیندوو و زیندوو لە مردوو پەیدا ئەبێ، ئەو قورئانەی کە گەورەترین رابەرو موعجیزەی خوایە و هەموو(جن) و ئادەمی لە ئاستی دەستە پاچەن، ئیتر کێ ئەبێ گوێ بگرێ لە قسە و بڕیاری هیچ کەسێکی تر؟! ئینجا لەبەر ئەوەی مەسەلەی زیندوو بوونەوە زۆر گرنگە و هەر لە کۆنەوە هۆی سەرسوڕمان و جێگەی دوو دڵی بووە بەلای زۆر کەسەوە، ئەوانەی کە دوور بوون لە رێنموونی خوا و فەڕ و بەهرەی نامەی خوا، لەبەر ئەوە حەز ئەکەم هێندێ قسە و باس و لێکۆڵینەوە بکەم لەبارەی ئەو زیندوو بوونەوە کە ئەگەر ژیریی لەکار نەکەوێ و لە روانگەی قورئانەوە سەرنجی ئەو مەسەلەیە بدرێ، زۆر بە سووك و ئاسان دڵ وەری ئەگرێ و لە قوڵایی دڵدا ئەچەسپێ، بەڵکو لەو روانگە پاکەوە سەیر

بكرێ ئەزانرێ کە شتێکی پێویستە و ناچاری هەیە پێی، ئەمەی کە ئەڵێن: ژیریی بە سوك و ئاسان وەرئەگرێ و جێگەی سەرسوڕمان و سەر لێکردنەوە نییە لەبەر ئەوەیە، وەك قورئان لە چەند ئایەتدا سەرنجمان بۆ رائەکێشێ، هەرکەس سەرنجێکی خۆی بدا کە چۆن پەیدا بووە و چ دەستێکی قودرەت فەراهەمی هێنا، هەر ئەو دەستە قودرەتە فەراهەمی ئەهێنێتەوە، چ دەستێکی قودرەت ئەم بوونەوەرە گەورەی دروستکرد و راگیری ئەکات بەم رژێم و یاسا تێرو تەواوە کە هەموو ژیرێك لە ئاستی سەرگەردانە، بۆ ئەو دەستە قودرەتە هیچی تێ ناچێ ئەم دروست کراوی خۆیە دووبارە بکاتەوە، بەڕاستی سەر کردنەوە و سەرسوڕمان لەوە، زۆر جێگەی سەرسوڕمانە!! ئەمەی کە ئەڵێن: زیندوو بوونەوە شتێکی پێویستە و ناچاری هەیە پێی لەبەر ئەوەیە ئەگەر ئەو زیندوو بوونەوە نەبێ ئەبێ ئەو هەموو جەورو ستەم و تاوان و دەست درێژیی یە هەر وا بڕوا بە بێ تۆڵە و لێپرسینەوە، ئەو هەموو چاکە و کردارو رەفتارە گەورە و شیرینانە بڕۆن بە بێ سەرو شوێن، کە ئەوە شتێکە دژی دادو دادپەروەریی و ژیریی یە، هەروەها ئەگەر ئەو زیندوو بوونەوە نەبێ و ئەم ژیانی جیهانە قۆناغ و سەرەتا نەبێ بۆ ژیانێکی تری درێژی نەبڕاوە، ئەگەر ئەوە نەبێ ئەبێ ئەم ئادەمی یە نایابە بە تەمەن و ماوەی ژیانی ئەم ئەندازە کەم و کوڕو کورتە بێت، کە ئەوەش دژو پێچەوانەی لێزانی و کاردروستی و بێزراو و وەرنەگیراوە بەلای ژیریی یەوە، کەواتە هەرکەس ژیر بێ سەرناکاتەوە لەو زیندوو بوونەوەو زۆر سووك و ئاسان سەیری ئەکات و وەری ئەگرێ. هەروەها هەرکەسێك ژیر بێ ئەزانێ کە شتێکی پێویستە و نەبوونی بە ناڕاست و ناڕەوا دائەنێ. ئینجا بێگومان مەبەست بە زیندوو بوونەوە لە ئیسلامدا زیندووبوونەوەی لەشە بەوەی ئەو گیانەی کە لە جیهاندا لەبەری لەشدا بوو و دەرچوو، ئەو گیانە دووبارە بکرێتەوە بە بەری لەشی ئەو مردووەدا، ئینجا مەبەست بەو لەشە بەلای کۆمەڵ و جەماوەری موسڵمانانەوە، ئەو لەشەیە کە لە جیهاندا لە ماوەی جیهاندا لەسەری بووە یان لەکاتی مردندا، لەبەر ئەوەی پاداشت و تۆڵە بۆ ئەو لەشە بێ کە خاوەنی کردەوەکانە، ئەوەش بە پێی داخوازی داد و دادپەروەریی، جا لێرەدا رەخنە گیراوە بەوەی کە لەشی مردوو ئەبێ بە خاك و برژ و بڵاو ئەبێتەوە و هەر سێڵێکی ئەچێ بۆ وڵاتێ، ئیتر چۆن کۆ ئەکرێتەوە و یەك ئەگرن دووبارە وەك جاری یەکەم، وەڵامی ئەوە زۆر سووك و ئاسانە بەمەی هەرکەس بڕوای هەبێ بە خوا ئەبێ

بزانیْ ئەوە شتێکی گونجاوە و بۆ خوا هیچی تیْ ناچیْ ئەو سێلانەی کە یەکەمجار هێنای و ئەو لەشەی لیْ پێك هێنا هەر ئەو سێلانە دووبارە بکاتەوە وەك یەکەم جار، ئینجا لێرەدا رەخنەیەکی تر گیراوە بەمەی زۆر کەس لە جیهاندا ئەخورێن و ئەچنە سکی گیانلەبەرێکی تر و ئەبن بە بەش و پارچەیەك لەو گیانلەبەرە، ئیتر چۆن دێنەوە بۆلای ئەم خوراوە و ئەبنەوە بە بەش و پارچەی ئەم، وەلامی ئەوەشە ئەمەیە: ئەو ئادەمی یە خوراوە نابیْ بە بەش و پارچەی ئەسلی بۆ ئەو گیانلەبەرە بخۆرە، بەلکو ئەبیْ لە قەلەوی و بەش و پارچەی زیادە، مەبەست بە زیندوو بوونەوەی ئادەمی دووبارە بوونەوەی ئەو بەش و پارچانەن کە ئەسلین و هەر لە یەکەمجاری پەیدا بوونی یەوە هاتوون و لەشەکەی لیْ پێك هاتووە و هەر ماونەتەوە تا مردن و نەمانی ئەو کەسە، ئینجا لێرەدا رەخنەیەکی تر گیراوە بەمەی ئەگەر ئادەمی یەك ئادەمی یەکی تر بخوات و ئەو خوراوە ببیْ بە ئاو و تۆمەی بخۆرەکە و ئینجا ئەوە بچێتە مندالدانی ئافرەتێك و مندالێکی لیْ پەیدا ببیْ، ئیتر چۆن ئەو سێلْ و بەش و پارچانە دێنەوە بۆلای خوراوەکە، بێگومان شتی وا نابیْ و ناگونجیْ و ژیریی شتی وا رەوا نادات؟ وەلامی ئەوەش ئەمەیە کە هەموو شت بەدەست خوایە، دەی ماتولْ خوا بڕیاری زیندوو بوونەوەی مردووەکانی داوە، ئەبیْ نەهێلیْ لەوە مندالْ پەیدا ببیْ و بەدی بێت، کەواتە هیچ قۆرت و گرێیەك نەما لە مەسەلەکەدا و هیچ کەس رێگەی هیچ دەمبازی یەکی نییە، لێرەدا بەم ئەندازەیە کۆتایی ئەهێنم و بە یارمەتی خوا هەر لەم سورەتەدا ئەگەڕێمەوە بۆ سەر ئەم باسە و ئەندازێکی تر قسە و باس و لێکۆلینەوەی تر ئەکەم لە تەفسیری ئایەتی(١٧٢) دا، ئینجا ئەگەڕێمەوە بۆ سەر ئایەتەکەی ئێرە، لە ئایەتەکانی رابوردوودا گەردش و خولانەوەی کرد بە دلْ و دەروون لە ناوچەکانی ئەم بوونەوەرە پان و فراوانەدا، کۆتایی هێنا بەم ئایەتەی کە خەریکین پێیەوە، کردی بە چیرۆك و بەلگە لەسەر راست و رەوایی زیندوو بوونەوە، ئینجا ئەم ئایەتەی داهاتوو ئەکات بە چیرۆك و بەلگە لەسەر جیاوازی دلەکان لە چاکی و خراپیدا،

وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴿٥٨﴾ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾

**ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ﴾ ئەو زەوی و خاکەی کە پاك و خاوێن بێ، واتە کرو لم نەبێ، رووەك و شینایی و سەوزەکەی دەردێ و بە سووك و ئاسان و بە چەسپانی گەشە ئەکات بە خواهیش و فەرمانی پەروەردگاری ﴿وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا﴾ ئەوەی بێ فەڕ و بێ خێر بێ بەم رەنگە کرو لم بێ، رووەك و شینایی یەکەی دەرنایەت مەگەر بە زەحمەت و سەختی و کەم و کوڕی کە خێر و بێری نییە، واتە باران ئەبارێ بەسەر خاك و ولآت و زەویدا بە تێکڕایی و یەکسان، هەر زەوی یەك رێك و پێك بێت و خۆڵ و خاکەکەی پیت و فەڕدار بێت لە هەمە بابەت و جۆر دارو درەخت و کشتوکاڵی لێ ئەڕوێ بەروبوم و میوەی لێ وەرئەگیرێ، هەر زەوییەك کرو لم و بێ فەڕ بێت مەگەر بە دەگمەن و بە زەحمەت شتی لێ بڕوێ و خێرو وبێری لێ وەرگیرێ، جا هەرچۆنێ حاڵ و باری زەوی و وڵاتەکان بەو جۆرەیە، هەروەها دڵەکانی ئادەمیش بەو جۆرەیە، هەر دڵێك پاك و خاوێن بێت و لەسەر رەوشتی ئادەمێتی نەترازابێت رێنموونی و پەند و ئامۆژگاری شەریعەتی خوا کاری لێ ئەکات و هەموو نیازو هەستێکی پاکی لێ دەرئەچێ و ئەبێتە سەرچاوەی هەموو کارو کردەوەیەکی پڕ سوودو بەهرەدار، هەر دڵێ بەدو سەخت و سەرکێش بێ رێنموونی و پەند و ئامۆژگاری کاری لێناکات و شەڕ و زیان و نیازی بەدی لێ دەرئەچێت و ئەبێتە سەرچاوەی کردار و رەفتاری بەد و خراپ، بە کورتی ئەم ئایەتە وێنەو چیرۆکە بۆ ئەو دوو جۆرە دڵە کە وەك یەك رێنموونی و پەندو ئامۆژگاری یان ئاراستە ئەکرێ، بەڵام ئەوەتا جیاوازن لە بەرو بەرهەمدا،(ئیمامی ئەحمەد و بوخاری و موسلیم و نەسائی) حەدیسێ ئەهێنن لە(ئەبو موسای ئەشعەری) یەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: وێنەی ئەم رێنموونی و عیلم و زانینەی کە خوا منی پێ رەوانە کردووە، وێنەی بارانێکی زۆرە کە ئەبارێ بەسەر زەویدا، ئینجا هێندێ لەو زەوی یانە پاك و خاوێنە و ئاوەکە وەرئەگرێ و گیاو لەوەڕێکی زۆر ئەڕوێنێ و سەوزی ئەکات، هێندێ لەو زەوییە ئاوەکە وەرناگرێت و هەڵی نامژێ و ئاوەکە ئەهێڵێتەوە، بەهۆی ئەوەوە خەڵکی سوودی لێ وەرئەگرن بە خواردنەوەو ئاودانی کشتوکاڵ و دارودرەخت، هێندێ تر لە زەوی لەم و دەشت و سەحرایەکە کە نە ئاو راگیر**

ئەكات و نە گیا و لەوەڕ ئەڕوێنێ و سەوزی ئەكات، ئەوەیە وێنەو چیرۆكی كەسێ كە زانا بێت و تێ بگات لە ئایینی خوا و ئەوەی كە منی پێ ڕەوانە كراوم، ئینجا خۆی فێر ببێ و خەڵكیشی فێر كردبێ، وێنەو چیرۆكی كەسێ كە بەوە سەری خۆی بەرز نەكردبێتەوە ئەو ئایین و ڕێنموونی خوای وەرنەگرتبێ كە منی پێ ڕەوانە كراوم. لەم فەرمودەیەدا بەشی یەكەم و سێ یەمی ڕاڤە كردووە، بەشی یەكەمی گێڕاوە بە وێنەی ئەو كەسەی كە خۆی ئایینی وەرگرتبێ و نە سوودیشی بە كەس گەیاندبێ، بێ دەنگ بوو لەبەشی دووەم و ڕاڤەی نەكردووەتەوە كە ئەوەیە خەڵكی سوودی وەرگرتبێ لە عیلم و زانینەكەی و خۆی بەهرەمەند نەبووبێ پێی وەك ئەو زانایانەی كە خەڵكی فێر ئەكەن، بەڵام ڕەفتار ناكەن بە زانینەكەی خۆیان كە وەك ئەو زەوییە وان كە نە ئاو ڕاگیر ئەكەن و نە هیچیش ئەڕوێنن و سەوزی ئەكەن، حاڵی ئەوانەش ناسراوە، خوای میهرەبان بەو جۆرو شێوە شیرینە ئایەتەكانی خۆی باس ئەفەرموێ بۆ هەمووان بەڵام هەر دڵێ كە پاك و خاوێن بێ بەهرەمەند ئەبێ پێیان و سوپاسی خوا ئەكەن لەسەریان، كەواتە ئەم ئایەتانە لە ڕاستیدا هەر بۆ ئەو دڵە پاك و خاوێنانە هاتووەو باسكراوە لەبەر ئەوە تایبەتی ئەكات بەوانەوەو ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ﴾ ئا بەو جۆرو شێوە نایابە ئێمە ئایەتەكانی خۆمان باس ئەكەین و ئەیان هێڵینەوەو بارو حاڵیان ئەگۆڕین بۆ ئەوانەی كە سوپاسی خوا ئەكەن و چاولەبەری چاكە و بەهرەكانی خوان، لە ئایەتی(٣٥) دا باسی ئەوەی كرد كە هەر لە یەكەمجارەوە ڕووی فەرمودەی كردووەتە تیرەی ئادەمی و هەواڵی پێدان بە هاتنی فروستادەكانی خوا لە خۆیان، بەڵێن و موژدەی پێدان ئەگەر پەیڕەویان بكەن، هەڕەشەی لێكردن ئەگەر سەركێشی یان لێبكەن و لە ئایەتەكانی خوا لابدەن، ئینجا ئەوا لێرەدا كۆمەڵێك لەو فروستادانە كە بەناوبانگن لە جیهاندا، بە تایبەتی شوێن و جێ و وڵاتیشیان ناسراو و نزیك بوو لە وڵاتی یەكەم چین كە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچكەدا، لە ڕێ و بان و سەفەر و كاروانیاندا گوزەریان ئەكرد بەلای شوێنەوارەكانیاندا، ئەو كۆمەڵە فروستادە ئەهێنێ و بە كورتی داستان و بەسەرهاتیان ئەگێڕێتەوە و شێوەو سروشتی خۆیان و بانگەوازەكانیان و بانگ كراوەكانیان ئەخاتە بەرچاو تا ئەم ئوممەتە پەند و ئامۆژگاری یان لێ وەرگرن و خۆیان بپارێزن لە یاخی بوون لە ئایینی خواو فروستادەكەی خوا، تا تێبگەن كە ئایینی خوا لە یەكەمجارەوە تا دواترین جار هەر یەك شتە و هەر بۆ یەك مەبەست هاتووە كە پەرستنی خوایە و گوێرایەڵی فەرمان و ئایین و بەرنامەی خوایە، تا ئەم ئوممەتەش ڕێگە و ڕێبازی

پێغەمبەرەکان و شوێن کەوتووەکانیان بدەنە بەر، هەروەها لە گێرانەوەی ئەو داستان و بەسەرهاتانەوە دەرئەکەوێ کە دوژمنایەتی و بەربەرەکانێ دەستە و شوێن کەوتووەکانی هەق، لەگەڵ شوێن کەوتوو و ناهەق خوازەکان هەر لە کۆنەوە هاتووە، هەق و ئایین و خواپەرستی ئەسڵ و سەرچاوەیە، ناهەق و لادان لە فەرمان و ئایینی خوا لە پاشان پەیدا بووە و ئادەمی ئەو ئەسڵە ترازاوە و لای داوە، هەروەها دەرئەکەوێ کە ناهەق هەرگیز رازی نابێ بە بوونی هەق، تەنانەت ئەگەر هەق کەنارگیریش بێت هەر کۆتایی لێ ناهێنێ و هەر دوژمنایەتی لەگەڵ ئەکات، لەم شوێنەدا بەڕێز ئەم داستانەی هێناوە بە پێی داخوازی شوێنەکە لەبەر ئەوە(نوح) و داستانی(نوح) یەکەم کەس و یەکەم داستانە کە بە یەکەم فروستادە ناوبراوە، ئەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ سوێند بەخوا(نوح) مان رەوانە کرد و ناردمان بۆلای گەل و ئوممەتەکەی: ﴿فَقَالَ﴾ ئینجا(نوح) بانگی کردن، بەم رەنگە گوتی: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەی گەلەکەم خوایەك بپەرستن کە ناوی(الله) یە، واتە بە تاك و تەنیا، چونکە هەر جۆرە هاوبەشێکی بۆ رەوا بدرێ ئیتر بە پەرستنی خوا نامێنێ، وەك دەست نیشانیش ئەکات بۆ ئەوە کە هۆی فەرمانەکە ئەکات بەمە کە ئەفەرموێ: ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ نییە بۆ ئێوە هیچ پەرستراوێکی تر بێجگە لەو، ئەم وتە و فەرمانە پیرۆزەی ئاراستە کردن کە یاسا و بنەڕەتی پەرستنی خوایە و هەموو بەرنامە و شەریعەتەکانی خوایە، هەر ئەمە پایەی ژیانی ئادەمی لارو خوارو بێ نرخە، هەر بەوە ئازادی و سەربەستی دەستکەوت ئەبێ، هەر بەوە مەردوم زاڵ ئەبێ بەسەر ناهەق و ناڕەوایی دا، بێگومان ئایینی خوا بەرنامەی ژیانە، یاسا و بنەڕەتەکەی ئەمەیە کە هەموو کاروباری ژیان پەیوەست بکرێ بە فەرمان و بەرنامەی خواوە بە بێ ئەوە لادان و ترازانە لە پەرستنی خوا، بەو جۆر و شێوە شیرینە بانگی لێکردن، داوای ئەو تەنها شتەی لێکردن، ترساندنی لە دوا رۆژ و سەرەنجامی بڕوا نەهێنانیان، داوای ئەوەی لێکردن بە شێوەی دڵسۆزی و راگەیاندنی برایەکی دڵسۆز لەگەڵ براکانیدا و فەرموی: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ بەراستی من مەترسی ئەکەم لەسەرتان سزای رۆژێکی گەورە کە رۆژی دوایی یە، واتە ئەگەر خوا نەپەرستن بەو جۆرەی کە من پێم گوتن، دوو شتیکرد بەهۆی فەرمانەکەی، یەکەم هۆی پاڵدەرە بۆ پەرستنەکەی خوا، دووەم هۆی لادان و کۆتایی نەهێنانە لەو پەرستنی خوای تاك و تەنیا، بێگومان(نوح)

زانیویەتی کە ئەوانە دووچار ئەبن، بەڵکو فەرموی: مەترسی ئەکەم، لەبەر بەزەیی هاتنەوەی پیایاندا، لەبەر ئەوەی بە نەرم و نیانی و دڵسۆزی یە؟

قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَـٰلَةٌ وَلَـٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾

---

بێگومان مەردومی ناپەسەند ئەبێ لاری و ناپەسەندی خۆی دەربڕێ لەبەر ئەوە بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ﴾ ئینجا دەستەی پیاو ماقوڵ و سەرۆك لە گەلەکەی گوتیان بە(نوح): ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ لە گومڕایی یەکی ئاشکرادا ئەبینین! بەڵێ بت پەرستەکانی قورەیشیش وێنەی ئەو وتە بەدەیان ئەگوت دەربارەی پێغەمبەرمان(ﷺ)، بەڵێ ئەوەی کە گومڕا و سەر لێ شێواو بێت ئەگاتە ئەو رادەیەی کە بانگ کەر بۆ رێگەی راست بە گومڕا دائەنێ! بەو جۆرە سەری لێ تێك ئەچێ و لە سروشتی ئادەمێتی ئەترازێ. نەفامان و سەر لێ تێك چووانی ئەمڕۆیش هەر بەو جۆرەن دەربارەی ئەوانەی کە رێنموونی و رێی راستی خوایان داوەتە بەر، ئەوەتا پێیان ئەڵێن:(رجعی، کۆنەپەرست)! نەفامان و گومڕایانی ئەمڕۆ دەربارەی ئافرەتە پاك و خاوێنەکان ئەڵێن: دواکەوتوو، لادێیی! رووتی و بەرەڵایی و داوێن پیسی دائەنێن بە پێشکەوتن!! نەفامی ئەمڕۆ گۆڵ گۆڵێن و رەقس و سەرکردنە سینەما و تەلەفزیۆن و کاری بێ هودە و نەفامییە پێشکەوتن و شارستانێتی دائەنێن، ئەوانەی کە خۆیان ئەپارێزن لەو جۆرە شتانە بە دواکەوتوو و سەر لێ شێواو دائەنێن! جاهیلی یەت و نەفامی هەر نەفامی یە لە هەموو چەرخ و چینێکدا، دیمەن و شێوەکەی جیایە و ئەگۆڕێ!(نوح) پێغەمبەر لە وەڵامیاندا: ﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿يَـٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿لَيْسَ بِى ضَلَـٰلَةٌ﴾ هیچ جۆرە گومڕایی یەك نییە بە منەوەو من بە هیچ رەنگ گومڕا نیم، واتە چ جای ئەوەی کە ئێوە بە من ئەڵێن:

تۆ وایت لە گومڕایی ئاشکرادا ﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ بەڵکو من نێرراو و فروستادەم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانی یانەوە ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي﴾ رائەگەیەنم پێتان فروستادەیی یەکانی پەروەردگارم، واتە ئەو شتانەی کە پێی سپاردوم لە عەقیدە و بیرو باوەڕ و بڕوا بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتە و بە بەهەشت و دۆزەخ و هەموو بەندەکانی تر کە پێی ڕەوانە کراوە. یان مەبەست فروستادەیی خۆی و پێغەمبەرەکانی پێش خۆی وەك(شیث، إدريس)، ﴿وَأَنصَحُ لَكُمْ﴾ من دڵسۆزی ئەکەم بۆتان و بەدوای شتێکدا ئەگەڕێم بۆتان کە خێرو بەرژەوەندی ئێوەی تێدا بێ. ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ من شتێك ئەزانم لەلایەن خواوە کە ئێوە نایزانن، واتە ئەوانەی کە لە داهاتوودا پەیدا ئەبن، یان ئەو شتانەی کە سروشم بۆ ئەکات، یان من لەبارەی خواو سیفەت و کردەوەکانی خواوە شتێك ئەزانم کە ئێوە نایزانن و ئاشنا نین پێی. وا دەرئەکەوێ ئەوانە سەریان سوڕمابێ لەوەی کە فروستادە بێت و خوا یەکێ هەڵبژێرێ لێیان و بیکات بە فروستادە، لەبەر ئەوە بەرپەرچی دانەوە و پێیانی فەرمو: ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئایا ئێوە سەرتان سوڕما لەوەی کە بێت بۆتان ئامۆژگاری یەك، ﴿عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ﴾ لەسەر دەستی پیاوێك لە خۆتان و هاتنەکەیشی ﴿لِيُنذِرَكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بتانترسێنێ لە سزاو تۆڵەی خوا ﴿وَلِتَتَّقُوا﴾ بۆ ئەوەی بترسن لە خوا و بەو ترساندنە خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی و هۆی خەشم و ناڕەزایی خوا ﴿وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی بەو ترس و خۆپارێزی یە میهرەبانیتان پێ بکرێ، کەواتە هیچ مەبەست و بەرژەوەندی یەکی شەخسی(نوح) نییە لەو کارەدا، بەڵکو ناردن و ڕەوانە کردنەکەی(نوح) سەراسەر مایەی چاکەو بەهرەمەندی ئەوانەیە، بەڵام سروشت کاتێ تێکچوو و شێوا بیر ناکاتەوە و ئامۆژگاری وەرناگرێ.

فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ۞ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾

---

کەواتە ئەوانە بەم جۆرە بوون و بەم جۆرەیان بەسەرهات کە ئەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ ئینجا زۆربەی ئەوانە بڕوایان پێ نەهێنا و سوور و بەردەوام بوون لەسەر بێ بڕوایی یەکەیان ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ﴾ بەهۆی ئەوەوە(نوح) مان ڕزگار کرد ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ﴾ ئەوانەش کە لەگەڵی بوون ﴿فِى ٱلْفُلْكِ﴾ لە کەشتی یەکەدا ﴿وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانمان نوقممان کردن ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوانە گەل و کۆمەڵێکی کوێرو نابینا بوون، واتە چاوی دڵیان نابینا بوو لە بینینی ڕێنموونی و پەند و ئامۆژگاری ترسێنەری دڵسۆزیان بەهۆی ئەوەوە بڕوایان نەهێنا تا بەهۆی ئەوەوە دوچاری ئەوە بوون کە بەسەریان هات، ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا﴾ ڕەوانەمان کرد و ناردمان بۆلای تائیفە(عاد) برای خۆیان کە(هود) پێغەمبەر بوو، واتە یەکێ بوو لەو تیرەو تائیفەیە، ئەمیش هەروەك(نوح): ﴿قَالَ﴾ فەرموی پێیان: ﴿يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن بە تەنیا، چونکە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە بێجگە لەو ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ناترسن لە خوا و خۆتان ناپارێزن لە تۆڵە و سزای خوا؟ واتە بترسن و بڕوا بێنن با دووچار نەبن بە وێنەی گەلەکەی(نوح) ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ﴾ ئەو کۆمەڵە پیاو ماقوڵەی کە بڕوایان نەهێنا لە گەلەکەی گوتیان بە(هود) پێغەمبەر ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ ئەبینین بە کەسێکی دامەزراو لە گێلی و بێ عەقڵیدا، واتە تۆ بە پیاوێکی زۆر بێ عەقڵ و سەلیقە دائەنێین، بەمەی لە ئایینی باوك و باپیرت لاتداوە و خۆت جوێ ئەکەیتەوە لە ئێمە ﴿وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە گومانت لێ ئەکەین کە یەکێ بیت لە درۆزنان و درۆ ئەکەیت لەمەی لاف فروستادەیی خوا لێ ئەدەیت،

قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ

**﴿قَالَ يَٰقَوْمِ﴾ فەرموی پێیان: ﴿لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ﴾ هیچ جۆرە گێلی یەك بەمنەوە نییە، واتە چ جای ئەوە كە ئێوە من دائەنێن بە پیاوێكی زۆر گێل و دامەزراو لە گێلی دا ﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەڵكو من فروستادە و نێرراوێكم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانییان ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ پێتان رائەگەیەنم فروستادەیی یەكانی پەروەردگارم ﴿وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ﴾ من بۆ ئێوە ئامۆژگاری كەرێكی پاك و ئەمینم و جێگەی ئەوە نیم گومانی ناپاكیم پێ ببرێ.**

**بێگومان ئەمانیش وەك گەلەكەی(نوح) سەریان سوڕماوە لە فروستادەیی و لەوەی كە خوا یەكێ هەڵبژێرێ بە فروستادە لەبەر ئەوە ئەمیش بەرپەرچی دانەوە بەم جۆرەی كە ئەفەرموێ: ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ﴾ ئایا ئێوە سەرتان سوڕماوە كە بێت بۆلاتان بەڵگە و ئامۆژگاری لەسەر دەستی پیاوێك لە خۆتان بۆ ئەوەی بتانترسێنێ؟ واتە با سەرتان سوڕ نەمێنێ لەوە ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ﴾ باسی چاكەكانی خوا بكەن بەسەرتانەوە ئەو كاتەی كە ئێوەی گێڕا بە جێنشینان لە وڵات و زەویدا لە پاش گەلەكەی(نوح)، یان باسی ئەو كاتە بكەن كە ئەو هەموو چاكە و بەهرە گەورەی رشت بەسەرتاندا، لە پاش گەلەكەی(نوح) ﴿وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً﴾ ئێوەی لەناو خەڵكیدا زیاد كردووە بە زۆریی و فراوانی لە موڵك و سامان و دەسەڵاتدا، یان ئێوەی گەورەو فراوان كردووە لە شێوەو هێزو لەش و قەبارەدا وەك بەناوبانگن لەناو خەڵكیدا، بەڵام پێویست نییە بەو جۆرە بڵێین كە لە ریوایەتە ئیسرائیلی یەكاندا هاتووە،**

﴿فَاذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ أَتُجَٰدِلُونَنِى فِىٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾

---

**﴿فَاذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ کەواتە باس و بیری چاکە و بەهرە گرنگەکانی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە تا بەهۆی ئەوەوە رزگار ببن و بگەن بە ئامانج، واتە تا بەهۆی ئەو بیر کردنەوەوە سوپاسی خوا بکەن و سەری بەندەیی بۆ داخەن کە ئەوەش مایەی رزگار بوون و گەیشتنتانە بە ئامانج، بەڵێ بێگومان ئەبوایە ئەوانە بیریان بکردایەتەوە لەو هەموو چاە و بەهرەیە کە خوا رشتی بەسەریاندا و بەهۆی ئەوەوە مل کەچ و گوێرایەڵ بوونایە بۆ پەروەردگاریان، بەڵام ئادەمی کە لە سروشتی خۆی لایداو ترازا بیر ناکاتەوە و بەڵگە و ئامۆژگاری کاری لێ ناکات، لەبەر ئەوە ئەو کۆمەڵە بەوە سوور تر بوون لەسەر سەرکێشی و تاوانەکەیان لەبەر ئەوە لە وەڵامدا ﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان بە(هود) پێغەمبەر: ﴿أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ﴾ ئایا تۆ هاتووی بۆلای ئێمە بۆ ئەوەی خوا بپەرستین بە تەنیا ﴿وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾ وازبێنین لەوەی کە باوك و باپیرمان ئەیانپەرستن و بەردەوام بوون لەسەری؟ واتە ئەوە شتێکی بێزراوی دوورە لە ئێمەوەو هەرگیز ئێمە شتی وا ناکەین، ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ دەی ئەو سزایەی کە هەڕەشەی پێ ئەکەیت لێمان بۆمان بێنە و بیهێنە بەسەرمان ئەگەر راست ئەکەیت و لە راستگۆیانی، ئا بەو جۆرە ئەو نەفامانەش پەلەیان ئەنایەوە بۆ هاتنی سزای خوا لە پێغەمبەرەکەیان کە ئامۆژگاری کارێکی دڵسۆز بوو بۆیان، لەبەر ئەوە ئەمیش ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ﴾ بێگومان پێویست بوو لەسەرتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە سزاو خەشمی بەتین و نەفرین و بێ بەشیتان لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، یان بێگومان ئەکەوێ بەسەرتاندا و دێتە خوارەوە سزاو خەشمی بەتین، ئەو سزایەش، وەك لە چەند شوێنێکی تردا باسی فەرمووە ئەو بایە سەخت و سامناکە بوو کە حەوت شەو و هەشت رۆژ دای بەسەریان دا و لە رەگ و ریشەی**

دەرهێنان، خوا پەنامان بدات لە سزاو خەشمی خۆی – آمین –، هەواڵی هاتنی ئەو سزایەی پێدان لەگەڵ خەشمی بەتینی خوا لێیان، ئینجا پڕو پووچی بیروباوەڕ و بۆچوونیان دەرئەخات بەم رەنگە فەرموی پێیان: ﴿أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم﴾ ئایا ئێوە دەمە دەمێ و دەمە قاڵێم لەگەڵ ئەکەن لە چەند ناوێکدا کە ناوتان بردووە خۆتان و باوك و باپیرتان؟! گێڕاوتانە بە ناو بۆ چەند پەرستراوێك کە: ﴿مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖ﴾ خوا هیچ بەڵگە و رابەرێکی نەناردووەتە خوارەوە پێیان لە ئاسمانەوە؟ ئایا ئێوە ئەوەندە نەفام و نەزانن دەمە دەمێم لەگەڵ ئەکەن لە بارەی راستی و رەوایی چەند بتێکەوە کە ناوتان بردوون بە پەرستراو، ئەوەش ناوی رووتە و بە دەمتاندا دێت بە بێ ئەوەی هیچ بنج و بنەوانێکیان ببێ و هیچ نیشانە و دروشمێکی پەرستراویان پێوە بێ، ئەوانە ئەگەر شیاو و شایستەی ئەوە بوونایە خوا بەڵگە و رابەرێکی بناردایەتە خوارەوە لەسەریان لەسەر دەستی پێغەمبەرێکدا، دەی بە شایەتی خوا هیچ رابەر و بەڵگە و دەلیلێك نەهاتووەتە خوارەوە لەسەریان، کەواتە شتێکی پڕو پووچن و دەمە دەمێ تێیاندا ئەوپەڕی نەفامی و نەزانی یە، لە قورئاندا لە چەند شوێنێکدا ئەم فەرمودەیە هاتووە(ما انزل الله)، ئەوە مەبەستێکی گرنگ نیشان ئەدات، ئەوە نیشان ئەدات کە هەر بیرو باوەڕ و یاسا و بۆچوونێك لەلایەن خواوە نەهاتبێ پڕوپووچە و بێ بنەڕەت و بێ بنەوانە و لای خوا هیچ نرخێکی نییە و بە بێ نرخ دەرئەچێ، بەڵام کە لەلایەن خواوە هات نرخدار و قورس و جێگیرە لە دەروونەدا و لە واقیعی ژیانیشدا بە نرخدار دەرئەچێ، ئایا چەند بیرو باوەڕو بۆچوون و نەزەری یات هاتن و بینران، تا چ رادەیەك رازێنرانەوەو تەپڵ و دەهۆڵیان بۆ لێدرا کەچی بێ نرخی و پڕوپووچیان دەرکەوت و دڕان، بەڵام ئەوەی لای خواوە هات لەلایەن پێغەمبەرەکانی یەوە کە کورتەی ئەوەیە: هەر خوا بپەرسترێ و هەر پەیڕەوی بەرنامە و شەریعەتی ئەو بکرێ و بێجگە لەوە ناهەق و ناڕەوا و بێ نرخە و ئەبێ تووڕ درێ، ئەوەی لای خواوە هات هەر ئەوە بە راست و رەوا و نرخدار دەرچوو، ئینجا(هود)(علیە السلام) بە هەموو ئارامی و هێزی دڵەوە فەرموی پێیان: ﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ﴾ کەواتە ئێوە چاوەڕوانی بکەن بۆ هاتنی ئەو سزایە ﴿إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ﴾ بێگومان منیش لەگەڵتان لە چاوەڕوانی کەرانم بۆ هاتنی، ئینجا ئەو سزایە هات وەك خوا هەواڵی پێدا،

فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾

---

**هات لەسەر ئەم شێوەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾ ئینجا ئێمە(هود) و ئەوانەی کە لەگەڵی بوون رزگارمان کردن بە میهرەبانی یەکی گەورە و گرنگ لەلایەن خۆمانەوە ﴿وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ لە ریشەمان هێنان و دواترین کەس ئەوانەمان لەناوبرد کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا و بڕوایان نەهێنا و بەردەوام بوون لەسەر بێ بڕوایی، هەرچەند رستەی یەکەم(ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟) ئەم رستەیەش ئەگرێتەوە کە هات بەدوایدا، بەڵام هێنانی گرنگی و بەنرخی بڕوا نیشان ئەدات و هۆی زیادە سۆز و پەرۆشی بڕوادارانە بۆ بڕواکەیان، لە هێندێ شوێنی تردا بە پێی داخوازی شوێنەکە درێژەی داوە بە باس و چۆنێتی ئەو سزاو داستانە، بەڵام لێرەدا بە کورتی و بە چەسپانی نیشانیدا کە ئێرە هەر ئەو نیشاندان و خستنە بەرچاوەی پێویستە، لەبەر ئەوەی ئێمەیش پێویست نەبوو زیادە لەوە بڵێین کە قورئان ئەفەرموێ. ئینجا دێتە سەر لاپەڕەیەکی تر لە لاپەڕەکانی داستانەکانی ئادەمی کە هەر جارێ ئەکەوتنە ناو چاڵی نەفامی و نەزانی، خوای میهرەبان فروستادەی خۆی رەوانە ئەکرد بۆ دەست گرتن و دەرهێنانیان لە چاڵی گومڕایی، ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا﴾ رەوانەمان کرد و ناردمان بۆلای هۆزو تائیفەی(ثمود) براکەیان کە(صالح) پێغەمبەرەو برایان بوو لە نەژاد و نەسەب و نیشتماندا، ئەویش وەك(نوح) و(هود): ﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن بە تەنیا، چونکە هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نییە بێجگە لەو. یەکێ لە میهرەبانی خوا ئەمە بوو کە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ بە موعجیزەوە ناردوویەتی تا هیچ کەس بڕو بیانوویەکی نەبێ، جا هەر بەو تەرزە(صالح)(علیه السلام) هەرچۆنێ بەرنامەکەی پێ راگەیاندن، هەروەها دەست نیشانی کرد بە موعجیزەکەشی کە فەرموی: ﴿قَدْ جَآءَتْكُم**

﴿ بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ بێگومـان هـاتووە بۆتـان مـوعجیزە و بەڵگەیـەکی روون و ئاشـکرا لەسـەر پێغەمبـەرێتی یەکـەم لەلایـەن پەروەردگارتانـەوە، واتـە بـە دەسـت مـن نییـە و بـە دەسـەڵاتی خوایە. هەروەها هەموو موعجیزەکانی تری پێغەمبەران هیچ دەخل و دەسەڵاتی ئەوانی تێدا نـەبووە، هـەروەها کەرامـەتێك کـە خـوا دابێتی بـە پیاوچاکان هـیچ دەسـەڵاتی ئـەوانی تێدا نەبووە، نـەك وەك هێنـدێ لـە نـەفامان کە گومانیـان وا بـردووە ئـەو کەراماتانـە بە ئارەزوو و دەسـەڵاتی خۆیانـە وەك لـە پێشەوە گوتمـان، بە کورتی و بـە چەسـپانی ئـەم داسـتانانە لـەم سورەتەدا ئەخاتە بەرچاو، ئەگینا لە رێوە باسی موعجیزەی نەکردووە، بەڵکو لـەپاش ئـەوەی ئامۆژگارییـان وەرنـەگرت و بڕوایـان نـەهێنا، ئینجا باسـی ئـەو مـوعجیزەی بـۆ کـردن وەك لـە چەند سـورەتێکی تـردا دەسـت نیشانی بۆ ئـەکات یـەکێ لەوانـە سورەتی(هـود)ە، ئینجا ئـەو موعجیزەیـە دیـاریی ئـەکات بەمـەی کـە ئەفـەرموێ: ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ﴾ ئەمـە حوشترەکەی خوایە دەست نیشان ئەکەم بۆی لـە کاتێکدا کـە موعجیزەیەکی روونـە بۆتـان، ناوبردنی بە حوشتری خوا یان لەبەر ئەوەیە حوشترێکی ئاسایی نـەبروە و جیاواز بـووە لـە حوشتری تر، یان لەبەر ئەوە بووە پەیدا بوونی بە جۆرو شێوەیەکی تایبـەتی بووە، نـەك وەك حوشترانی تر کە بە زاوزێ پەیدا بوون و ئەبن، یان لەبەر رێزو نرخ پێدانە، یـان لەبـەر ئەوەیـە هیچ خاوەنێکی نەبووە بێجگە لە خوا، یان لەبەر ئەوەیە کراوە بە حوججەتی خوا بەسـەر ئـەو گەلـەوە، بە کـورتی بەڵگەیـەکی روون و ئاشـکرا بـووە لەسـەر پێغەمبەرێـتی یەکـەی وەك بـە هەرحاڵ ئەفەرموێ: ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ﴾ کەواتە لێی گەڕێن و وازی لێ بێنن با بخوا و بلەوەڕێ لە خاك و وڵاتی خوادا، واتە حوشتر حوشتری خوایە و وڵات وڵاتی خوایە، کەواتـە وازبێـنن بـا حوشـتری خـوا بلـەوەڕێ لـە خـاکی خـوادا کـە نـە خـاك خـاکی ئێوەیـە و نـە لـەوەڕ لـەوەڕی ئێوەیـە ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ ﴾ لێـی مەکـەون و دەسـتی بـۆ مەبـەن بـە هـیچ جـۆرە زیـان و خراپەیـەك﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ تـا بـەهۆی سـزایەکی سـەختی ئـازار دەر بتـانگرێ و داگیرتـان بکات، لە پاش نیشاندانی ئەو موعجیزەیـە و ترسـاندنیان، ئینجا دەسـت ئـەکات بـە پەنـد و ئامۆژگاری یان بە بیر کردنەوە لە دوا رۆژ و چارەنووسی گەلە رابردووەکان، بە سوپاسی خوا لەسەر بەهرەو چاکەی گێڕانیان بە جێنشین لە پاش گەلە رابوردووەکان،

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ

---

**فەرموی:﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ﴾ بیربکەنەوەلەوکاتەی کە خوا ئێوەی گێرا بەجێنشین لەپاش تائیفەوهۆزی(عاد)﴿وَبَوَّأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾دایمەزراندن ونیشتەجێیکردن لەخاك وولاتدا،خاك وولاتی(حجر)لەنێوان حیجازوشامدا﴿تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا﴾ دروست ئەکەن لە دەشتەکانیدا کۆشك و بینای بەرز بەرز ﴿وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ﴾ دائەتاشن لە شاخەکانی خانو و ماڵ، یان دائەتاشن شاخەکانی بەماڵ و خانوو، وا دەرئەکەوێ لە دەشتەکانیدا کۆشك و خانووی بەرزیان دروستکردبێ بۆ هاوینان و لە شاخەکانیش ماڵ و خانوویان داتاشیبێ بۆ زستان، کەواتە ئاوەدانی و شارستانێتی یەکی گرنگیان بووە و دەسەلات و حوکمڕانی یان تێپەڕی کردووە لە ولاتی(حجر) یش، لەبەر ئەوە فەرموی پێیان: ﴿فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ﴾کەواتەبیربکەنەوە لە چاکە گەورەکانی خوا ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ خراپەکاری مەکەن لە ولاتدا و مەبن بە خراپەکار و گێرە شێوێن، هەروەها دەرئەکەوێ کە ئەو گەلە بووبن بە دوو بەشەوە، بەشی بڕوادار و بەشی بێ بڕوا و سەرکێش، دەستەی سەرکێش هەوڵی ئەوەیان داوە کە بڕواداران هەڵگێڕنەوە لە بڕوا هێنانەکەیان وەك روون ئەبێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ﴾ ئەوانەی کە خۆیان بە زل ئەزانی گوتیان بەوانەی کە بە لاواز و ژێر دەستە دانرا بوون ﴿لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ﴾ ئەیانگوت بە کەسانێ لەوانە کە بڕوایان هێنابوو ﴿أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ﴾ ئایا ئێوە ئەزانن کە(صالح) رەوانە کراوە لەلایەن پەروەردگاری یەوە؟ دیارە ئەم پرسیارە بۆ هەڕەشە و ترساندنە، بۆ بێزاری دەربڕینە لە بڕوا هێنانەکەیان، بۆ لاقرتی کردنە لە بڕواهێنان و بڕواکردنیان بە لاف فروستادەیی لەلایەن پەروەردگارەوە، بەلام ئەو ژێر دەستەو لاوازانە بە لاواز و بێ هێز نەمان، بەڵکو بڕوا هێنانەکەیان هێزو ئارامی و دڵنیایی خستبوە دڵ و دەروونیانەوە، لەبەر ئەوە بە بێ باك و بە بێ شاردنەوە**

قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ

---

**﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان: ﴿إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان ئێمە بڕواداریین بەوەی کە(صالح) ی پێ ڕەوانە کراوە ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی خۆیان بە زل ئەزانی گوتیان ﴿إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین بەوەی کە ئێوە بڕواتان پێهێناوە، بە گوێرەی وتە بەدەکانیان ڕەفتاریانکرد وەك ئەفەرموێ: ﴿فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ﴾ ئینجا حوشترەکەیان سەربڕی ﴿وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ﴾ سەرکێشی یانکرد لە فەرمانی پەروەردگاریان ﴿وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ﴾ گوتیان ئەی(صالح) ﴿ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ ئەوەی کە هەڕەشەمان لێ ئەکەیت پێی و ئەمانترسێنی لێی ئەگەر تۆ لە ڕەوانە کراوان و نێرراوانی لە لایەن خواوە بابۆمان بێت ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ بەهۆی ئەوەوە بومەلەرزەی بەتین گرتنی و لێیدان، ﴿فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾ بەهۆی ئەوە گەڕان بە بێ گیان و مردوو و بێ جووڵە لە وڵات و ماڵ و جێ و شوێنەکەی خۆیاندا، لە ئایەتێکدا ئەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ﴾ دەنگ و پیا هەڵشاخانی بەتین گرتنی، لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿فَأُهْلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ﴾ لەناوبران و بەرباد کران بە شتە سەرکێشە لە سنوور دەرچووەکە، هیچ دژایەتی نییە لە نێوان ئەو فەرمودەیانەدا، وەك هێندێ لە نەفامان گوتویانە، چونکە بێگومان ئەو شتەی کە ئەوانەی پێ لەناوبرا شتێکی گەورەی بەتینی لە سنوور دەرچوو بووە، ئینجا ئەگەر مەبەست بە(رجفة) هەر دەنگ و پیا هەڵشاخان بێت وەك(مجاهد و سدی) ئەفەرمون، ئەوە هیچ گرێ یەك نییە، ئەگەر مەبەست بومەلەرزە بێت وەك(فەررا و زەجاج) و هێندێ تر ئەفەرمون. مەبەست لەرزە و تەپە تەپ و بێ ئارامی دڵ بێت ئەوا ئاشکرایە لە کاتی ئەو دەنگ و پیا هەڵشاخانە**

گەورەیەدا دڵ ئەکەوێتە ئەوپەڕی لەرزە و بێ ئارامی و تەپەتەپ، ئەگەر مەبەست بومەلەرزەی خاك و وڵاتەکە بێت ئەوا هەر ئەگونجێ بەم رەنگە لەلای سەرەوە ئەو دەنگ و پیا هەڵشاخانە گەورەیە بووبێ، لەو کاتەدا لە ژێریشیانەوە بومەلەرزە و تەقینەوەی ناو زەوی بووبێ و بوومەلەرزەی پێ پەیدا بووبێ، قورئان هەر قورئانە و بە دەمی نەفامان لەکەدار نەبووە و هەرگیز نابێ، ئینجا با ئەوانە بەو سزا سەختە لەناوچن و بکەون بە مردوویی، لەم کاتەدا هەڵوێستی(صالح) پێغەمبەرمان نیشان ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ﴾ ئینجا رووی لێ وەرگێڕان و پشتی تێکردن بە داخ و مەراقەوە لەسەر سەرکێشی و بڕوا نەهێنانیان و وەرنەگرتنی پەند و ئامۆژگاری یەکەی ﴿وَقَالَ﴾ فەرموی پێیان ﴿يَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي﴾ بەڕاستی و سوێند بەخوا من پێم راگەیاندن پەیام و فروستادەیی یەکەی پەروەردگارم ﴿وَنَصَحْتُ لَكُمْ﴾ پەندو ئامۆژگاریم کردن و دڵسۆز بووم بۆتان و ئەوەی توانیم بەختم کرد تێتاندا ﴿وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ بەڵام ئێوە لێتان وەرنەگرتم و بەردەوام و هەمیشەیی بوون لەسەر وەرنەگرتن و خۆش نەویستنی دڵسۆزان و ئامۆژگاری کەران. بەو جۆرە قسەی لەگەڵ کردن بە وێنەی قسە کردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) لەگەڵ بێ بڕواکانی بەدر لە پاش کوژرانیان و لەکاتی شاردنەوەو خستنیانە ناو بیر و چاڵ و گۆڕەکانیان، هێندێ ئەفەرمون: ئەو وتەو فەرمودەی(صالح) پێغەمبەر پێش سزاو لەناو چوونەکەیانە، بەڵام دڵ بە رای یەکەم ئارامترە، خوا خۆی چاك ئەزانێ. ئینجا چەرخ و سەردەمی ئیبراهیمی(علیه السلام) دێتە پێشەوە، بەڵام لێرەدا باسی داستان و بەسەرهاتی ئەم ناکات، چونکە باس و داستانەکانی ئێرە باس و داستانی لەناوچوونی بێ بڕواکانە، دەی گەلەکەی ئیبراهیم لەناو نەچوون، چونکە ئیبراهیم داوای ئەوەی نەکرد لە خوا، بەڵکو کەنارگیر لە خۆیان و لە بتەکانیان، ئەوەی کە لێرەدا دێتە باس باسی داستانی(لوط) پێغەمبەرە، کە برازای ئیبراهیم بووەو گەلەکەشی لەناوبران بە وێنەی گەلەکانی تر کە باسکران و ئەو گەلانەی کە باس و داستانیان دێت ئەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا﴾(لوط) مان نارد بە فروستادە: ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ لەو چەرخ و سەردەمەدا کە بە گەلەکەی گوت،

أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾

**یان مەبەست ئەوەیە: باسی(لوط) بکە باسی ئەو کاتەی کە بە گەلەکەی گوت:** ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ﴾ **ئایا ئێوە کاری زۆر بەد و خراپ ئەکەن کە گەیشتووەتە ئەوپەڕی لە بەدیی و خراپیدا، واتە شتی وا ئەکەن زۆر عەیب و عارە بۆتان** ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ **پێشتان نەکەوتووە لەوەدا بە کردنی ئەو کردەوە بەدە هیچ کەسێك لە جیهانییان، بەڵکو ئێوە داتانهێناوە، جا بەسە بۆ بەدیی ئەو کردەوە و دژایەتی لەگەڵ سروشتی ئادەمیدا کە لەوەو پێش هیچ کەسێك نەچووبێ بەلایدا، هەرکەس هەر رەوشت و کردەوەیەکی بەد دابهێنێ بەشدار ئەبێ لە تۆڵە و تاوانی هەرکەسێك کە چاوی لێ بکات و ئەو کردەوە بەدە بکات تا رۆژی دوایی، وەك بەو بارەکەیشەوە هەر کەسێك هەر رەوشت و کردەوەیەکی چاك دابهێنێ بەشدار ئەبێ لە ئەجرو پاداشتی هەر کەسێکی تر کە شوێنی بکەوێ و چاوی لێ بکات تا رۆژی دوایی، وەك لە حەدیسی سەحیحدا هەردووبارەکە هاتووە.**

**لە پێشەوە بێزاری دەربڕی لەو کردەوە بەدە و هەر ناوی برد بە کاری زۆر بەد و خراپ و بە بێ دیاریی کردن، ئینجا بە روونی ناوی ئەبات و بە جۆرێ باسی ئەکات کە بێزراوی ئەکات بەلای هەرکەسێکەوە کە لە سروشتی ئادەمێتی نەترازابێ، ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ﴾ **بێگومان ئێوە ئەچنە لای پیاوان و سواریان ئەبن لەبەر بەجێهێنانی ئارەزووی نێرو مێی ی و لە کاتێکدا تێپەڕ ئەکەن لە ئافرەتان کە جێگەی سروشتی و راستەقینەیە بۆ بەجێ هێنانی ئەو ئارەزووە، بەدیی و خراپی یەکەی ئەخاتە بەرچاو لە چەند بارێکەوە:**

**١- ئەفەرموێ: ئەچنە لای پیاوان، نەك گەنج و منداڵ کە ئەو تەعبیر و دەستەواژەیە قیزەونتری ئەکات.**

٢- ئەفەرموێ: لەبەر بەجێ هێنانی ئارەزوو کە ئەوە پیشەی کەرو گاو ولاخە و ئادەمی ئەبێ نیازی سەرەکی تری ببێ کە پەیدا بوونی بێچووە و بەهۆی ئەوەوە خۆی و تیرەکەی کۆتایی نەهێنێ و درێژە بکێشێ، بێجگە لەوەی ئەو یەك کەوتن و یەك گرتنە هۆی پەیدا بوونی ماڵ و حاڵ و ئاژە و کۆژە و حەوانەوەیە بۆ هەمووان.

٣- تێپەڕ کردن لە ئافرەتەکان کە جێ و شوێنی سروشتی و راستەقینەیە بۆ ئەو کارە و مایەی هەموو خێرو فەڕێکە ئەگەر بە شێوەی شەرعی خۆی بکرێ کە لە هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوادا هاتووە. ئینجا واز ئەهێنێ لەو بێزاری دەربڕینە و ئەگوێزرێتەوە بۆ هەواڵ پێدانیان بەو حاڵ و بارەی کە وان لەسەری و پاڵدەریانە بۆ نەکردنی کارە بەدەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ﴾ واتە واز بێنن لەوەی کە گوترا و هەواڵتان پێ ئەدەین کە ئێوە کۆمەڵ و دەستەیەکن زیادە رەوی کەرن، واتە باوتان وایە زیادە رەوی کەرن لە هەموو شتێکدا و لە سنووردا ناوەستن، هەرکەسێکیش وابێ جێگەی هەموو عەیب و عارو لەکەیەکە، یان مەبەست ئەوەیە کە لەو کردەوە بەدەدا زیاتر لەکەداریان بکات بەوەی کە زیادە رەوی تێدا ئەکەن و گەڕانەوەیان نییە لێی، نەك وەك هێندێ کەس کە کاتێ کردەوەی بەدی کرد پەشیمان بوونەوەو کۆتایی هێنانی ئەبێ یان هیچ نەبێ هەرجارێ بڕیار ئەدا کە کۆتایی بێنێ و پەشیمانی دەرئەبڕێ، ئەم داستانی(لوط) پێغەمبەرە(علیه السلام) جۆرێکی ترمان نیشان ئەدات لە ترازان و لادان لە سروشتی ئادەمێتی، جیاواز لە مەسەلەی بت پەرستی و لادان لە پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا کە ئەم دەردە کوشتندە گشتی بووە لەناو هەموو گەل و ئوممەتەکانی چەرخ و سەردەمە نەفامی یەکاندا، ئەم دەردو لادانە تایبەتی یەی ئەو گەلە بەدە هەر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەردە گشتی یە، چونکە کاتێ بڕوا نەبوو بە تاك و تەنیایی خوا ئەبێ بڕوادار مل کەچ و گوێ رایەڵ بێت بۆ باو و رەوشت و شەریعەتی خواو تەنیا پەیڕەوی ئەوە ئەکات، ئەو کاتە لادان و ترازان لە سروشت روو نادات، کە یەکێ لەو

لادان و ترازانە ئەو کارە بەدەیە کە ئەو گەلە بەدە دایان هێنا، ئەگەر خواپەرست بوونایە هەر شوێنی باو و ڕەوشتی خوا ئەکەوتن و ئەیانزانی کە باوی خوا وا هات کە نێرو مێ دروست بکات، ئەم دووانە بکات بە دوو لەت و بەش بۆ ئەو تاکە نەفسەی کە لە یەکەمجارەوە دروستی کرد، ئەم دووانە یەکتر تەواو بکەن و ئەو تەنیا نەفسە بە هۆی ئەم دوانەوە بگات بە پایانی خۆی، ئەبێ مانەوەو درێژە دان بەم نەفس و تیرەیە لە ڕێگای زاوزێوە بێت و گەیشتنی ئەو نێرو مێیە بە یەکتر، جا لەبەر ئەوە ئەو نێرو مێیەی وا دروستکرد کە شیاوبن بۆ ئەو بە یەک گەیشتنە، شیاوبن بۆ پەرەسەندن و زۆر بوون لەو ڕێگەیەوە، بە جۆرێ ڕێك و پێککراوبن بۆ هەموو پێویست و داخوازی ئەو بەیەك گەیشتن و پەرەسەندنە، ئەو ئارەزوو و لەزەتەی کە دەستکەوتیان ئەبێ لەو بەیەك گەیشتنەدا زۆر بەهێزو بەتین کرا تا ئەو دووانە ئامادە بن بۆ هەڵگرتنی هەر ئەرك و زەحمەتێك کە دووچاریان ئەبێ لەو ڕێگەیەدا: لەبارەی مێیەکەوە ئەرکی ئاوس بوون و منداڵ بوون و شیردان و بەخێوکردن و پەروەردە کردن تا بە تەواوی بێچووەکە پێ ئەگات، لەبارەی نێرەکەوە ئەرك و ڕەنج کێشانی ژیاندن و نان و نەفەقە و چاودێر و سەرپەرشتی کردنی ئەو ماڵ و خێزانە، ئینجا دوای ئەوە ئەو سۆز و بەزەیی و ئارەزوو و لەزەتە ببێتە هۆی مانەوەیان بە دوور و درێژیی لە یەك خێزان و خانەوادەدا، کە هەڵسن بە پێگەیاندن و بەخێوکردن و پەروەردە کردنی منداڵ و ساواکان کە پێویستی هەیە بە ماوەو کاتێکی زۆر درێژ تر لە ماوەو کات بۆ بێچوو و ساوای گیانلەبەرەکانی تر، باو و ڕەوشت و شەریعەتی خوا بەم جۆرو شێوە ڕاست و ڕەوا هاتووە، کەواتە لادان و ترازان لەوە لادان و ترازانە لە بڕوا بە خوا و بڕوا بەو بەرنامەی کە خوا دایناوە بۆ ژیان، جا لەبەر ئەوە قورئان بەو توندی یە بێزاری لە گەلە بەدەکەی(لوط) و کردەوە بەدەکەیان، زامدار و لەکەداری کردن بە لادان و زیادە ڕەوی کردن کە تاوان و لەکەیەکی زۆر بەدو خراپە، ئەوەی کە ئەوانە دایانهێنا زیادە ڕەوی بوو لەم بارەیەوە کە لایاندا

لەو بەرنامەی کە سروشتی یە و خوا دایهێناوە، زیادە رەوی یە لەو هێزو وزەی کە خوا پێی بەخشین، بۆ هەڵسانیان بەو کارەی کە مایەی درێژە دانە بەم تیرەی ئادەمییە و گەشەکردنی ژیان، کەچی ئەوانە بەکاریان ئەهێنا لە شوێنێکدا کە ئەو درێژە دان و گەشەی ژیانیانی پێ پێک نایە و بەڵکو بە بێ بەرو بەرهەم زایە ئەبێ، کەواتە مەبەستەکەیان هەر بەجێهێنانی ئارەزوو لەزەتەکەیە، لەگەڵ ئەوەدا بەکار هێنانی ئەو هێزو وزەیە لە شوێنە راستەقینە سروشتی یەکەی خۆیدا هەمان ئارەزوو و لەزەت پێکدێنێ زۆر بە چاکتر و مەبەستە سەرەکی یەکەش فەراهەم دێت کە درێژە پێدان و گەشە کردنە بە ژیانی ئەم تیرەیە وەك باسکرا، کەواتە ئەو کاری ئەوانە و لادانیان لە شتە سروشتی یە کە تێکدانێکی سروشتی یە، پێش ئەوە کە زایە کردن و تێکدانی ئەخلاقییە، وەك ئەوروپا و ئەمەریکای پێ دەردەدارە لە سەردەمی نەفامی تازەدا، لەلایەن سەهیۆنی یەتی جیهانییەوە، کە هەوڵی روخاندنی ژیانی ئادەمی ئەدا بۆ هەموو کەس بێجگە لە تیرەی خۆیان. لەلایەن ئەو تیرەو گرۆهەیەوە پروپاگەندەی زۆر بلاَو ئەکرێتەوە کەهۆی بلاَوبوونەوەی ئەو کردەوە بەدە حیجاب و داپۆشینی ئافرەتە، ئەگەر ئافرەت بەرەلاَ بکرێ مەردوم لایان نەئەدا لە شوێنە سروشتی یەکە! بەلاَم واقیع شایەتە لەسەر دەلەسەیی و ناراستی قسە و پروپاگەندەکەیان، ئەوەتا لە ئەوروپا و ئەمەریکا کە تێکەڵی و بەرەلاَیی گەیشتووەتە ئەوپەری رادە و پلە، بە بێ هیچ جۆرە بەرگرییەك، بە وێنەی کەر و گاو گیانلەبەرانی تر، لەو ولاَتانەدا ئەو کارو کردەوە بەدەی کە گەلەکەی(لوط) دایانهێنا لە هەموو ولاَتێکی تر زۆرترە و بە تەواوی پەرەی سەندووە نەك تەنها پیاو لەگەڵ پیاو بەڵکو بۆ ئافرەت لەگەڵ ئافرەتیش. وەك بە درێژیی باسکراوە لە نامێلکەی ناوبراو بە(السلوك الجنسی عند الرجال) و(السلوك الجنسی عند النساء).

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ

**ئینجا با کۆتایی بێنین و بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکان و گوێبگرین لە وەڵامەکەی ئەو گەلە بەدە کە بەرپەرچی پەند و ئامۆژگارییەکانی(لوط) پێغەمبەریان ئەدایەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ﴾ وەڵامی گەلەکەی هەر ئەمە بوو کە گوتیان دەریانکەن لە شارو وڵاتەکەتان، واتە(لوط) و ئەوانەی کە وان لەگەڵی ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ چونکە ئەوانە چەند کەسێکن کە خۆیان پاك و تەمیز رائەگرن، واتە دواترین وەڵام و قسەیان ئەو وتە بەدە بوو، نەك مەبەست ئەوە بێ کە ئەو گەلە بەدە تەنیا ئەو قسە بەدەیان کردبێ، چونکە شتێکی ئاشکرایە - وەك قورئانیش چەند قسە و وتەی تریان لێ ئەگێڕێتەوە، وتەو قسەیان هەر ئەوە نەبووە کە تێپەڕیکرد، یان مەبەست ئەوەیە: بەرامبەر ئەو هەموو ئامۆژگاری و بەرگری و بێزاری دەربڕینەی(لوط) هیچ بەڵگە و عوزرو بیانوویەك نەبوو بۆ ئەوانە بێجگە لەو وتە ناپەسەندەیان کە کۆتایی یەکەی کەشخە و شانازی ئەگەیاند بە کردنی کردەوە بەدو پیسەکەیان، لاقرتی کردن بە(لوط) و بڕواداران، بە راستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کە گومڕایی و سەر لێ شێوانیان گەیشتە ئەو رادەیە کە کردەوە پیس و بەدەکەیان بە چاك دابنێن و کەشخەی پێوە بکەن، لاقرتی بکەن بە پاك و خاوێنی یەکەی ئەمان!! بەڵام ئایا بۆچی سەر سوڕبمێنێ لەو نەفامانی کۆنە و بیر نەکرێتەوە لە نەفامەکانی تازەی چەرخی بیستەم کە سەرەتا پێیان نقوم بووە لە هەموو جۆرە کارو کردەوەیەکی پیس و بۆگەندا لەگەڵ ئەوەدا ئەوە بە پێشکەوتن و شارستانێتی دائەنێن و خاوەن خو و رەوشتە**

شیرینەکان ناو ئەبەن بە دواکەوتوو و کۆنەپەرست و بە چاوی سوك و ریسوایی سەرنجیان ئەدەن، بیرو باوەڕ و بۆچوونی نەفامان چوون یەکن لەهەر کات و سەردەم و ولآتێکدا!! ئینجا دوا رۆژ و سەرەنجامی کارو کردەوە پاك و خاوێنەکەی(لوط) و بڕواداران نیشان ئەدات بە کورتی و بێ، درێژە پێدان ئەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ﴾ ئینجا ئێمە(لوط) و کەسە تایبەتییەکانیمان رزگار کرد ﴿إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ ﴾ بێجگە لە ژنەکەی کە بڕوای نەهێنا و ناپاك بوو لەگەڵ(لوط) و یارمەتی دەری ئەو گەلە بێ بڕوایە بووە، ئەگەر پرسیار بکرێ لە بەسەرهاتی وەلآمەکەی ئەمەیە ﴿كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾ گەڕا بە هێندێ لەوانە کە مانەوە لە سزای خوادا و لەناچوون و بێبەش بوون لە میهرەبانی خوا، خوا پەنامان بدات – آمین – ﴿ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ ﴾ باراندمان بەسەریاندا جۆرێك لە باران کە جێگەی سەرسوڕمانە، ئەو جۆرە بارانەش ئەوە بوو کە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴾ باراندمان بەسەریاندا بەردێك کە لە سەنگ گل بوو کە پێی ئەگوترێ:(گلمت)، ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ ئینجا سەرنج بدە ئایا چۆن بوو دوا رۆژی تاوانبارەکان کە بڕوایان نەهێنا و کۆتایی یان نەهێنا لەو کردەوە بەدانە کە مایەی دووچار بوونن بە سزای سەختی خوای گەورە. ئینجا داستان و سەر گوزەشتەی(شعیب) پێغەمبەرو تائیفەکەی نەهێنێ کە لێرەدا کردی بە دواترین داستانی ئەو کۆمەڵ و گەلە بێ بڕوایانە و ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۗ﴾ رەوانەمانکرد و ناردمان بۆلای تائیفە و هۆزی مەدیەن براکەیان کە(شعیب) ە، ئەویش وەك فروستادەکانی تر ﴿قَالَ﴾ فەرموی بەو هۆزە: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ﴾ ئەی گەلەکەم خواپەرستن بە تەنیا، نییە بۆ ئێوە هیچ پەرستراو و خوایەکی تر بێجگە لەو، لە پاش ئەم یاسا سەرەکی و بنەڕەتی یە کە دەست نادا بۆ گۆڕاندن و دەستکاریکردن و یەکەم بەندە لە هەموو شەریعەتەکانی خوادا، لە پاش ئەوە دەست ئەکات بە هێندێ مەسەلە کە لق و پەل و بەرهەمە بۆ ئەو درەختە گەورەی تاك و تەنیایی،

قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا

---

**ئەفـەرموێ: ﴿قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بێگومـان هـاتووە بۆلاتـان لەلایـەن پەروەردگارتانەوە بەڵگە و موعجیزەیەکی روون و ئاشکرا، وەك هەموو فروستادەکانی تر کە خوای میهرەبان موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرای پێ بەخشیون لەسەر راستی و فروستادەیی یەکەیان، بەلاّم نە لێرەو نە لە شوێنی تردا جۆری ئەم موعیجزەی باس نەفەرموە، وەك زۆربەی موعجیزەی فروستادەکانی تریشی باس نەکردووە، بەلاّم بە گوێرەی باوی خۆی لە ناردنی فروستادەکانیدا ئەوا ئەفەرموێ: بۆیان هاتووە جا لەبەر ئەوە فەرموی پێیان ﴿فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ﴾ واتە ماتوڵ بەڵگە و رابەری ئاشکرا هەیە لەسەر فروستادەیی یەکەم کەواتە ئەبێ گوێرایەڵ بن بۆ فەرمانەکانم کە یەکێ لەوانە ئەمەیە پێوان و کێشانتان رێك و راست بکەن، بە بێ کەم و کوڕی و فێڵ و تەڵەکەبازی ﴿وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ﴾ کەم و کـوڕی و زیـان مەگەیـەنن بـە خـەڵکی لـە شـتەکانیاندا، هەڵئـەگرێ مەبەسـت بەمـەش هـەر جڵەوگیریی بێت لە کەم و کوڕی لە کڕین و فرۆشتندا بەم رەنگە مەن گۆڕیی و تەرازوو بازیی نەکەن، ئەگەر ئەمە مەبەست بێت ئەوا هەر پێشووەکە ئەگرێتەوە و دووبارە کردنەوەیە بۆ ئەو لەبەر بە گرنگ گرتن و بەهێز کردنی ئەوە تا باشتر خۆپارێزی لێ بکرێ، هەڵئەگرێ مەبەست بەم دوو رستەیە جیاواز بێ: بەم رەنگە یەکەم فەرماندان بێت بە رێك و پێکی لە فرۆشتندا، مەبەست بە دووەم جڵەوگیریی بێت لە ناهەقی لە کڕیندا وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرمون. بەڵگە لەسەر ئەمە ئەوەیە کە لە(ئیبن و عەباس) ەوە هاتووە کە ئەوانە رێگرو باجگر بوون، ئەگەر کەسێکی غەریبیان دەست کەوتایە پوڵ و پارەی چاکیان لێ ئەسەند و ئەیانگوت: ئەمە قەڵبە و ئەیان شکاند و ئینجا بە هەرزان لێیان ئەکڕی، هەروەها ئەگێڕنەوە کە پارە چاکەکەیان لێ ئەسەند و پارەی قەڵبیان لە باتیدا پێ ئەدان، واتە جڵەوگیریی یان لێکراوە لە خەڵەتاندن و کەم و کوڕی کردن لە هەر بارێکەوە لە پاش جڵەوگیریی لە مەن**

گۆڕی و ترازوو بازی، بێژراوە: هێندێ لەو ناهەقی و کەم و کوڕی کردنە ئەوەیە کردەوەی چاك نەکرێ لەگەڵ چاکاندا و رێزی خاوەن رێزان نەگیرێ و رادەو پلەی شایستەی خۆیان پێ نەدرێ، دان نەنرێ بە هونەر و بەهرەی خاوەن هونەر و خاوەن بەهرەدا، ئەوە باوە لەناو زۆربەدا لەبەر حەسادەت و کینە یان لەبەر خۆپەسەندی و رادە و پلەی خەڵکی کەم ئەکەنەوە، بە هەرحاڵ و لەسەر هەر بار(شعیب) پێغەمبەر(علیە السلام) لە پاش فەرماندان بە پەرستنی خوا ئەم فەرمان و جڵەوگیریی یەی ئاراستە کردن، چونکە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – باویان وابووە دەستیان کردووە بە چاك کردن و گۆڕینی هەر کارو کردەوەیەکی بەد کە باو بووبێ لەناو گەلەکەیاندا، ئەم کردەوەش کە باسکرا لەو دوو رستەیەدا باو بووە لەناو ئەو گەلەدا و سەریان تێکردبوو، کەواتە ئەبێ چارەسەری ئەو دەرد و نەخۆشییە پێش بخات، ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾ خراپەکاری مەکەن لە وڵاتدا لەپاش چاك کردنی لەلایەن پێغەمبەران و جێگرو شوێن کەوتووەکانیانەوە، واتە لە پاش ئەوەی خوا وڵات چاك ئەکات بە ناردنی فروستادە و شەریعەتەکانی، ئێوە وێرانی مەکەن و مەیشێوێنن بە هەوا بازیی خۆتان، لە ئایەتی(٥٦) دا کە وێنەی ئەم ئایەتی ئێرەیە بە درێژتر تەفسیرمان کردووە، کەواتە با سەرنج بدرێ و هەر ئەندازە شیاو بۆ ئێرە با وەرگیرێ ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوەی کە باسمکرد چاك و بەسوودە بۆتان – یان ئەوە زۆر چاکە بۆتان – یان ئەوە چاکترە بۆتان لەبارەی ئادەمیێتی و لەبارەی دەستکەوت و قازانج و مامەڵەتانەوە، چونکە ئەگەر ئێوە ناسران بە ئەمین و کردەوە چاك خەڵکی باشتر رووتان تێ ئەکات لە کڕین و فرۆشتن و بازرگانیدا ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە ئەگەر ئێوە بڕوام پێ ئەکەن و بەڕاستم ئەزانن، ئەوەی کە پێم گوتن چاکە بۆتان لە بارەی کاروباری ژیان و جیهانتانەوە، یان ئەگەر ئێوە بڕوام پێ ئەکەن ئەزانن کە ئەوە چاکە من پێم گوتن ئەوە رێی راستە کە من دەست نیشانم بۆ کردن، یان مەبەست ئەوەیە: ئەگەر ئێوە بڕوام پێ ئەکەن دەی ئەوە بکەن کە من رێنموونیم بۆ کردن، یان مەبەست ئەوەیە: ئەگەر ئێوە بڕوام پێ ئەکەن دەی ئەوە بکەن کە من رێنموونیم بۆ کردن، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە: ئەگەر ئێوە بڕوام پێ بێنن ئەوەی کە من پێم گوتن چاکترە بۆتان لە هەردوو جیهاندا، چونکە بە بێ بڕوا هیچ کردەوەیەکی چاك نرخی نابێ لە رۆژی دواییدا. بە هەرکام لەم تەفسیرانە رێگە نامێنێ بۆ رەخنە گرتن لە روکەش و رواڵەتی ئایەتەکە، بەمەی کە چاکێتی ئەو شتانەی کە(شعیب) پێی فەرمون نەبەستراوە بە بڕوا پێکردن و بڕوا پێهێنان بە(شعیب) چونکە شتێکی ئاشکرایە بڕوا

بكرێ یان نەكرێ و بڕوا بهێنرێ یان نەهێنرێ ئەوەی كە گوتی پێیان و ئامۆژگاری كردن پێی شتێكی چاكە، ئەو گەلە بەدە بە هەموو جۆر و شێوەیەك كە خەریك ئەبوون بۆلادان وەك شەیتان، كەواتە مەبەست دانیشتن و بەرگری كردن لەو ئایینە پیرۆزە، وەك ئەگێڕنەوە لە(حسن و قتادة و مجاهد و ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – ئەو گەلە دائەنیشتن لە سەر رێگەكاندا بۆ بەرگری كردن و ترساندنی هەركەسێك كە بهاتایە بۆ وڵاتەكەیان، بەرگری و ترساندنی لەوەی كە بچێ بۆلای(شعیب) و بڕوای پێ بێنێ. جا لەسەر هەر بار ئەوا جڵەوگیریی كردن لەو كارو كردەوە بەدە بەمەی پێی فەرمون: ﴿وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِهِ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ لەسەر رای یەكەم: دامەنیشن لە هەموو رێگەیەكی هەق و راستدا بۆ گومڕا كردن وەك شەیتان لە كاتێكدا ئەترسێنن و هەڕەشە ئەكەن لە هەركەسێك كە بڕوا بێنێ و ترساندنی هەركەسێك كە بڕوای هێنابێ، بەرگری ئەكەن لە رێگەی خوا هەركەسێك كە بڕوای هێنابێ بە خوا، واتە هەرچۆنێ خۆیان بڕوا ناهێنن، هەروەها رێ ئەگرن لە خەڵكی تر كە بڕوا بهێنێ، ئەوەی كە بڕوای هێناوە هەوڵ ئەدەن بۆلادان و هەڵگەڕانەوەی لە ئایین و رێگە راستەكەی خوا، ئەیانەوێ و داوای لاریی و چەوتی ئەكەن بۆ رێگە راستەكەی خوا بە دوو دڵ كردن و بەد گومان كردن و یان نیشاندانی بەشتێكی لارو چەوت و ناهەق، رێگە و ئایینی خوا هەرچەند یەك شتە، بەڵام چەند بەندێكە و چەند بەش و پەلێكی لێ ئەبێتەوە و هەركام وەك رێگەیەكی تایبەتی وایە، ئەوانەش كاتێ هەركەسێكیان بدیایە خەریكی هەر بەندو بەشێكە بەرگری و جڵەوگیریی یان ئەكرد لێی، جا لەبەر ئەوەیە چەند رێگەیەكی نیشاندا و فەرموی: ﴿بِكُلِّ صِرَاطٍ﴾ لەسەر رای دووەم: دامەنیشن لەسەر رێگە و بانەكان كە خەڵكی گوزەری پیا ئەكەن و دێن بۆ وڵاتەكەتان، لەسەر ئەو رێگایانە دامەنیشن و ئەو رێگایانە مەگرن لە گوزەر كەرانی وڵاتتان بۆ ترساندن و هەڕەشە كردن لەوەی(شعیب) ببینن و بڕوای پێ بهێنن، بە وێنەی بێ بڕواكانی قورەیش كە لەسەر رێگاكانی مەككەدا دائەنیشتن، بەرگری گوزەركەرانیان ئەكرد لە دیتنی پێغەمبەر(ﷺ) و بڕوا پێهێنانی، ئینجا(شعیب)(علیه السلام) هێندێ لە چاكە و بەهرەكانی خوایان بیر ئەخاتەوە لەسەریانەوە، ئەیانترسێنێ لە چارەنووس و دوا رۆژی بەدی خراپەكاریی گەلەكانی رابوردوو تا بەهۆی ئەوەوە بكەونە سۆز و پەرۆش بۆ بڕوا هێنان و بترسن لە نافەرمانی و یاخی بوون لە خوا،

وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ۖ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾

---

فەرموی: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ۖ﴾ بیری ئەو کاتە بکەنەوە کە ئێوە کەم بوون و ئینجا خوا زۆری کردن، وەك ئەگێڕنەوە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێیان رازی بێت – کە ژمارەیان کەم بوو ئینجا خوا پیت و فەڕی خستە ناو رۆڵە و نەوەیان و زۆریکردن و پەرەی پێ سەندن لە ولاتدا، کەواتە سوپاسی چاکەی خوا بکەن بە پەرستن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی ﴿وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ سەرنج بدەن ئایا چۆن بوو دوا رۆژی خراپەکاران وەك گەلەکەی(لوط) و(صالح) و ئەوانی تر کە خوا لەناوی بردن و چاری کردن بەهۆی خراپەکاریی خۆیانەوە کەواتە لەوانەوە تەمێ خوار بن. ئینجا داوایان لێ ئەکات کە کۆتایی بێنن بەو کردەوە بەد و تاوان کارانەیان و بژین لەگەڵ بڕواداران دا بە ئاشتی و بە بێ دەست درێژیی و بوەستن بە بەرکار و بڕیاری خواوە تا بزانن خوا چی ئەکات دەربارەی هەردوو دەستەکە، ئەم ئامۆژگاری یە رێك و پێکەیان ئاراستە ئەکات بە جۆرێ ترساندن و هەڕەشەی لێ وەرئەگیرێ دەربارەی بێ بڕوای و بەڵێن و ئارام دان بە دڵی بڕواداران، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ﴾ ئەگەر دەستەیەك لە ئێوە بڕوای هێنابێ بەو ئایین و شەریعەتەی کە منی پێ رەوانە کراوم، دەستەیەکی تر بڕوای نەهێنابێ ﴿فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ﴾ دەی خۆتان بگرن و بە ئارام بن و چاوەڕوانی بکەن هەتا خوا بڕیار و حوکمی خۆی ئەدات لە نێوانماندا ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ﴾ لە کاتێکدا خوا باشترینی بڕیار دەرانە، چونکە هیچ کەس ناتوانێ بەرگری بڕیاری ئەو بکات

و بڕیـاری ئـەو دادی رووتــە و هـیـچ جـۆرە سـتـەم و نـاڕەوایی تێـدا نییـە، واتـە ئەگـەر بـێ بڕواکانتان تەمێ خوار نابن بە بەسەرهات و رووداوی گەلە پێشووەکان و بڕوا ناهێنن، دەی راوەستن و چاوەڕوانی خـوا بکـەن و کۆتـایی بێـنن بـەو کـردەوە بەدانـەی کـە تـا ئێسـتا پێـی هەڵساون.

سوپاسی بێ پایان بۆ خوای میهرەبان، لێرەدا جزمی هەشت دوایی هات و لەم ئایەتی داهاتووەدا دەست ئەکەین بە جزمی نۆیەم، داواکارین لە خوای میهرەبان لێمان وەرگرێ و ئەوەی کە ماوە پێمان تەواو بکات. لە رۆژی ٢٩ ی شەوالی ١٤٠٩ هیجری قمری بەرامبەر ١٩٨٩/٦/٤ زایینی , هەر لەم رۆژەدا دەستمان کرد بە تەفسیر جزمی نۆ.

وأخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، وصلى الله و سلم على سيدنا محمد و على أله و صحبه أجمعين

قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ

---

ئەم جزمی نۆیە پێکهاتووە لە دوو بەش: بەشی یەکەم لەئایەتی (٨٨)ی ئەم سوورەتی (الاعراف)ەوە دەست پێئەکات تا دوای سوورەتەکە کە سێ لەسەر چواری جومەکەیە، بەشی دووەم نیوەی سوورەتی (الأنفال)ە کە ئەوە یەك لەسەر چواری جوزمەکەی پێ تەواو ئەبێ، جا لێرەدا بەشی یەکەم لە جزمەکە ئەخەینە بەرچاو، بەشی دووەم دوا ئەخەین بۆ سەرەتای سوورەتی ناوبراو.

لەبەشی دووەمی جزمی هەشتدا داستان و سەرگوزەشتەی پەیام و پێغەمبەران و گەلەکانی پاش ئادەمی خستە بەرچاو کە دوایی پێهێنا بە بەشێك لە داستانی شوعەیب، ئینجا ئەوا لەسەرەتای ئەم جزمەشدا دستانەکەی شوعەیب تەواو ئەکات، ئینجا پێش ئەوەی دەست بکات بەداستانی موسا (علیه السلام) لەگەڵ فیرعەون و کۆمەڵەکەی لە یەکەم جارەوە لەپاش ئەوانە لەگەڵ گەلەکەی خۆی کە نەوەی ئیسرائیلە، پێش ئەوە بە تێهەڵکێش چەند مەبەستێکی گرنگ ئەخاتە بەرچاو لەبارەی بڕیارو قەزاو قەدەری خواوە دەربارەی بێبڕواکان وەك بەیارمەتی خوا سەرنجی ئەدەین و تێپەڕئەکەین بەلای ئەم ئایەتانەی کە دێن لەو بارەیەوە، ئینجا با بگەڕێینەوە سەر داستانەکەی شوعەیب و ئەوەی کە ماوە تەواوی بکەین شوعەیب (علیه السلام) بەو جۆرو شێوەی کە باسکرا بانگی ئەو گەلەی کردوو ئامۆژگاریە شیرینەکەی کرد، کەچی لە وەڵامداو بەبامبەر بەوە ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾ ئەو دەستەو پیاوماقوڵانەی کە خۆیان بەزل و گەورە دائەنا لەناو گەلەکەی شوعەیبدا گوتیان ﴿قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ﴾ سوێند بە خوا ئێمە تۆ دەرئەکەین و ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە دەریان ئەکەین لەگەڵ تۆ ﴿مِن قَرْيَتِنَآ﴾ لەشارەکەمان یان وڵاتەکەمان ﴿أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ﴾ یان ئەگەڕێنەوە ناو میللەتەکەمان، واتە: وازتان لێناهێنین تا یەکێ لەم

دووباره بەدی دێت. بێگومان بڕوادارەکان پێش بڕواهێنانیان لەو گەلو میللەتە بەدە بوون، بەڵام شوعەیب ـ وەك هەموو پێغەمبەرانی تر ـ پاكو خاوێن بوو لە بت پەرستیو هەر ئایینێکی تر کە دژی ئایینی خوا بێت، کەواتە مەبەستیان بە گەڕانەوەی بڕوادارەکان پاشگەزبوونەوەیانە لەبڕواکەیانو گەڕانەوەیان بۆ بت پەستیو ئایینە بەدەکەی پێشوویان، بەڵام نابێ ئەوەیان مەبەست بووبێ‌دەربارەی شوعەیب، بەڵکو مەبەستیان کۆتایی هێنانی بێت لەلافی پێغەمبەرێتیو گەڕانەوەی بۆ بارو حاڵێك کەلە پێشەوە لەسەری بووە، یان بەکارهێنانی گەڕانەوە بۆ ئەو شێوەیەکە کە باوە لە گفتوگۆداو پێی ئەگوترێ: (تغليب) واتە زاڵکردنو باودانی هێنێك بەسەر هێندێکی تردا لەناونانو بردندا وەك ئەگوترێ بە مانگو خۆر: (قمرين) دوو مانگ، یان لە بەکارهێنانی کارو کردەوەو بڕیاری هێندێك بۆ هێندێکی تر وەك ئەگوترێ: فلان هۆزو کۆمەڵ چاکن یان خراپن، یان ئەو کارو کردەوەیان کرد لەگەڵ ئەوەدا هێندێکیان بەو جۆرەن، نەك هەموو، هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: وتەی (تعود) هاتووە بەمەعنای (تصير) واتە بەکارئەهێنرێ بۆ گەڕان، هەرچۆنی بەکار ئەهێنرێ بۆ گەڕانەوە، لێرەدا مەبەست گەڕانە نەك گەڕانەوە، واتە یا دەرتان ئەکەین یان ئەبێ بگەڕێن بە وێنەی ئێمە لە بیروباوەڕو ئاییندا، بە هەر حاڵو لەسەر هەر بار ئەوە ناگەیەنێ کە شوعەیب لە پێشەوە لەسەر ئایینی ئەوان بووە، کەواتە هیچ قۆرتو گرییەك لە ئارادا نەما، ئینجا با بزانین شوعەیب چی فەرموو؟﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ﴾ ئایا ئێمە ئەگەڕێننەوە ناو ئەو میللەتە لە کاتێکدا پێمان ناخۆش بێتو بێزار بین لێی؟ یان چۆن ئەگەڕێینەوە ناو ئەو میللەتە لە کاتێکدا ئێمە ناخۆش حاڵو بێزارین لێی؟ واتە شتی وا نابێو ناگونجێ" ﴿ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا﴾ واتە ئەگەر ئێمە بگەڕێننەوە ناویو وەك ئێوە بڵێین: خوا وێنەی هەیە بێگومان ڕۆیەکی زل ئەکەین بەدەم خواوەو ئەیسەپێنین بە دەم خواوە، لەپاش ئەوەی خوا ئێمەی ڕزگار کرد لەو ئایینو میللەتی ئێوە، بەم ڕەنگە ئاگاداری کردین بە بەدیو بێ‌نرخی ئەو ئایینەو ڕێنموونی کردین بۆ پەرستنی خۆی بە تاكو تەنیا، کەواتە هەرگیز ئەوە ناکەین،

وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ

---

﴿وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ﴾ **نابێ و ناگونجێ و ڕاست نیه بۆ ئێمه گەڕانەوەمان بۆی لە هیچ کاتو بە هیچ ڕەنگ مەگەر کاتێ و بەو جۆرەی خوای پەروەردگارمان بیەوێ گەڕانەوەمان** ﴿وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ﴾ **پەروەردگارمان فراوانی هەیە بۆ هەموو شتێ لەبارەی زانینەوەو زانینی هەموو شت ئەگرێتەوەو خۆی ئەزانێ بەرژەوەندی لە چیدایەو خۆی لێزانو کاردروستەو هەرچی ویست ئەیکات** ﴿عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ﴾ **هەر بە خوا پشتمان بەستووەو هەموو کاروبارمان گێڕاوەتەوە بۆلای خواو هەمووی لەسەر خوایە. مەبەست بەم چەند ڕستەیە دەربڕینی ئەوپەڕی دەستە پاچەیی و مل کەچییە بۆ خوا کە پێویستە هەمیشە هەموو بڕوادرێك بەو جۆرە بێت بەرامبەر بە خوا، یان مەبەست نەگونجاوی و دەست نەدانی ئەو گەڕانەوەیە، واتە گەڕانەوەمان بە هیچ کلۆجێك نابێ مەگەر کاتێ کە پەروەردگارمان ئەوەی بوێ، ئەویش شتی وای ناوێ، چونکە پەروەردگارەو ڕزگاریشی کردین لەوە، کەواتە ئەو چاکەو بەهرەمان لێ ناسێنێتەوە. پاڵفتەی وەڵامەکەی شوعەیب (علیه السلام) ئەمەیە: لەیەکەم جارەوە بێزاری دەربڕی و سەر سوڕمانی دەربڕی لە هەڕشەو ترساندنەکەیان، ئینجا بەڵگەی ئایینی و ژیری هێنایەوە لەسەر ئەوە کە گەڕانەوەیان ناگونجێ و هەرگیز نابێ و هیچ کەس ناتوانێ ئەوەیان پێبکات مەگەر خوا بیکات، بەڵگەشی هێنایەوە لەسەر ئەوەی کە خوا ئەوەناکات، ئینجا دەریبڕی کە پشت بەستنی خۆیان هەر بە خوایەو کاروباریان هەر بە خواوە ئەبەستن، ئینجا لە کۆتاییدا وا ئەم نزایەی پێشکەش کرد بۆ بارەگای پەروەردگارو فەرمووی:** ﴿رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ﴾ **ئەی پەروەردگارمان حوکمو بڕیار بدە لەنێوان ئێمەو گەلەکەماندا بە حەقیانەتو بەو جۆرو شێوەی کە باوو ڕەوشتی خۆی پێ هاتووە لە بڕینەوەی ئاژاوەی نێوان پێغەمبەرانو دوژمنانیانو ئەوانەی ڕێگای تریان داوەتە بەرو ئەوانەی کە لاریان داوەتە بەر، بڕیار بدە لە نێوانماندا بەمەی هەرکام شایستەو شیاوی چیە بەسەری بێنە،**

وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾

---

﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ﴾ **تۆ باشترینی هەموو حوکمو بڕیار دەرانی‌و تۆ باشترینی هەموو دەرخەرو جیاکەرەوەی هەق‌و ناهەقانی، ئەوەیە بۆچوون‌و باوی خواناسان کە ئەزانن سەرچاوەی هەموو هێزو دەسەڵاتێك تەنیا خوایە، پەنا هەر پەنای ئەوە لەبەرئەوە ئەگەڕێنەوە هەر بۆلای ئەوو پشت هەر بەو ئەبەستن‌و داوای چارەسەر لەو ئەکەن** ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾ **دەستەو کۆمەڵی پیاوماقوڵ‌و گەورەکانی گەلەکەی کە بڕوایان نەهێنابوو گوتیان، ئیتر ئەم دەستە هەر دەستە پێشووە کەبێت کە باسکراو بە پێشەوە بە خۆ بەزل زانی دانان‌و لێرە بەبێ بڕوا کەبناغەی خۆ بەزل زانین‌و سەرپێچی یەکەیانە، یان مەبەست بەم تاقمە کۆمەڵێکی تریانە کە ڕادەو پلەیان نزم تربوو بێ لە پێشووەکان، ویستویانە هەوڵ بدەن بۆ گومڕا کردنی ئەوانەی کە بەگوێیان بکەن، هەرکام مەبەست بێ ئەمانە گوتیان بەو خەڵکەی خۆیان بۆ دوور خستنەوەیان بەربەست کردنیان لە بڕوا هێنان، لەپاش ئەوەی بینیان ڕەقی‌و دامەزراوی شوعەیب‌و بڕوادارەکان:** ﴿لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا﴾ **سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە پەیڕەوی شوعەیب بکەن‌و شوێنی بکەون‌و دەرچن لەئایین‌و میللەتی باوك‌و باپیرتان** ﴿إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ **بێ‌گومان‌و بەڕاستی ئێوە زیانبارو خەسارەتمەندان ئەبن.**

**باوی سەرکێشەکان بەو جۆرە بووەو بەو جۆرەیە کە لەیەکەمجارەوە ڕوویان کردووەو ڕوو ئەکەنە ئەوەی کەبانگی مەردومان ئەکات، بۆئەوەی دەم کوتی بکەن‌و کۆتایی پێ‌بهێنن، بە هەر جۆرو شێوەیەك کەلە دەستیان بێت، ئینجا کە زانیان لە چاردا نیەو کۆتایی ناهێنێ، ڕوونەکەنە شوێنکەوتووەکان بە ترساندن‌و دەست لێ وەشاندنیان، چونکە بێجگە لەوە هیچی تریان پێ نیە، بەڵام کاتێ کە هەقخوازان‌و سەرکێشان کەوتنە بەربەرەکانێ‌و بەتەواوی جوێ بوونەوە لەیەکترو ڕووبەڕوو وەستان، لەو کاتەدا باوی خوا وایە دەستی قودرەت ئەخاتەکارو هەقخوازن سەر ئەخات‌و سەرکێشان لەناو ئەبات،**

﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٩١ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٩٢ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾

---

وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە بومەلەرزە گرتنیو لێیدان، بومەلەرزەی بەتینو لە ڕیشە هێنەر ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە گەڕان بە مردو لەجێگاو ولاتی خۆیاندا كەوتن بەبێ جوڵە لە شوێنی خۆیاندا، لە سوورەتی (هود)دا ئەفەرموێ: دەنگو پیاهەڵشاخان گرتنیو لێیدان، ڕەنگە لە یەكەم جارەوە دەنگو پیاهەڵشاخانەكەیان بووبێو ئینجا بومەلەرزە لێیدابن، یا وەك هێندێك ئەفەرموون: شوعەیب (علیە السلام) ڕەوانەكراوە دوو گەلو ئوممەت: مەدیەنو ئەهلی ئەیكە، هەركام بەیەكێ لەو دووانە لەناوچووبن، بەلام هەر ڕای یەكەم چاكە، چونكە لێرەو لە سوورەتی (هود)دا هەر باسی داستانی ئەهلی (مەدیەن)ە ئینجا دوو فەرموودەو ڕستە ئەهێنن هەركام بەرامبەر ووتەیەكی بەدی ئەوانە: یەكەم: گوتیان: بێگومان بڕواداران دەرئەكەین لە شارو ولاتەكەمان، خوایش ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان نەهێنا بە شوعەیبو بەدرۆزنیان دانا لەناوبران بە جۆرێ وەك نیشتەجێ نەبووبن لەو ولاتەداو نەژیابن تیایدا، كەواتە دەركراو ئەوان بوون بە دەركردنێك كە ئێجگاری بنو جارێكی تر چوون هاتووچۆیان نەبێ ئەو ولاتەدا، ووتەكەی تریان ئەوەبوو كە گوتیان بە خەڵكی ئەگەر ئێوە شوێنی شوعەیب بكەون بێگومان ئێوە زیان بارو خەسارەتمەند ئەبن، خواش بەرامبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان نەهێنا بە شوعەیبو بە درۆزنیان دانا هەرئەوانە زیانبارو خەسارەتمەندن، نەك بڕواداران‌و شوێن كەوتوانی شوعەیب، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ﴾ ئینجا شوعەیب پشتی تێكردنو ڕووی لێ وەرگێڕانو ﴿وَقَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەكەم ﴿لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ سوێند بە خوا من پێم ڕاگەیاندن پەیامەكانی پەروەردگارم،

وَنَصَحْتُ لَكُمْ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ

﴿وَنَصَحْتُ لَكُمْ﴾ ئامۆژگاریم کردن دڵسۆزبووم بۆتان، ئینجا ئایا ئەو پشت تێکردن و ئاڕاستەی ئەو ووتەیە لە پێش سزاو لەناوچوونەکەیاندا بووبێ وەك هێندێ ئەفەرموون، یان لەپاش سزادان و لەناوچوونەکەیان بووبێ وەك ڕای بەهێز لەسەر ئەوەیە، لەسەر هەربار ئایا مەبەستی دەربڕینی غەم و پەژارەی خۆی بووە لەسەر بەسەرهاتیان و سۆزو بەزەیی دڵی گرتبێ، یان مەبەستی سەرزەنشتیان بووبێ و نەبوونی هیچ عوزرو بیانوویان، هەرکام لەم دوو ڕایە هێندێ لە زانایانی لەسەرە، لەسەر ڕای یەکەم لە یەکەم جارەوە غەم و پەژارەی خۆی دەرەبڕێ و لەپاشان دڵخۆشی و دڵنەوایی خۆی ئەکات بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ﴾ دەی ئایا من چۆن غەم و پەژارەی بەتینم ببێ لەسەر گەل و کۆمەڵێکی بێبڕوا. واتە ڕاست نیە غەم و پەژارەی ببێ چونکە من هەوڵ و تەقەلای خۆم داوەو ئەوان خۆیان خەتابارن کە گوێیان بەمن نەدا خۆیان شایستەی سزای خوا کرد، لەسەر ڕای دووەم مەبەست دڵنیایی کردنی لەسەر شایستەی شیاوی ئەوان بۆ ڕووداوو بەسەرهاتەکەیان، واتە غەم و پەژارەم نابێ لەسەریان، چونکە ئەوانە شایستەی ئەوەن.

لەپاش داستانی شوعەیب (علیە السلام) و پێش دەست کردن بەدواترینی داستانەکانی ئێرە کە داستانی موسایە (علیە السلام)، لەم نێوانەدا چەند شتی گرنگ ئەهێنێ سەرنجی بۆ ڕائەکێشێ، ئەوا بەپێی باوی قورئان کەلەناو بەناودا ئەو سەرنج ڕاکێشانانە ئەکات بۆ زیادە پەندو ئامۆژگاری و بیرخستنەوەو بێدارکردنەوەی دڵە بێ ئاگاکان، لێرەدا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ هەنگاوەکانی قەزاو قەدەری خوا دەربارەی بێبڕواکان

که چۆن دووچاریان ئەکات بەزیان و ناڕەحەتی و تەنگی، بەڵکو هۆشێك بکەنەوەو دڵیان نەرم ببێ بگەڕێنەوەو پەنابێنن بۆلای خوا، ئینجا ئەگەر بەوە هۆشیان نەکردەوەو بێدارنەبوونەوە، تاقیان ئەکاتەوە بە نازو نیعمەت و خۆشی ـ کە ئەمە بەتین ترە لەتاقیکردنەوەدا ـ ئینجا کاتێ بەوە سەرکێش ترو یاخی تر بوون، لەناکاو لێیان ئەدات و بێبەش و بەش بڕاویان ئەکات، هەروەها سەرنج ڕائەکێشێ بۆ پەیوەندی بڕواو لە خواترسان بە بەهرەو نازو نیعمەتەکانی خواوە، کە ئەمەش شتێکە نەزان و بێئاگاکان لێی وێڵن، چونکە نیشانەو دروشمەکانی ئەوە زۆر جار بەزوویی دەرناکەون، بەڵام بێگومان لە پاش ماوەیەکی درێژ ئاشکرا ئەبن، ئینجا لەناو بەناوی ئەو سەرنج ڕاکێشانەدا ترساندنی ئاڕاستە ئەکات لەناوچوونی بێبڕوا سەرنج ڕاکێشەکان ئەخاتە بەرچاو، بەڵکو بەوە ترساندن و تەمێ خواریی پەیدابێ لە دڵی بێباوەڕەکانی ئەم ئوومەتەدا، ئینجا لەکۆتاییدا بە کورتەیەك حاڵ و باری گەل و ئوممەتە ڕابردووەکان ئەخاتە بەرچاوی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دڵنەوایی و ئاڕامی پێدانی دڵی بەفەڕی.

ئینجا با بێینە سەر ئەو ئایەتانە کە ئەوشتە گەورەو گرنگانەمان ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ ﴾ لە هیچ شارو وڵاتێکدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە ﴿ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾ مەگەر دانیشتوانەکانیمان گرتووە بە نەبوونی بێنەوایی بەزیان و نەخۆشی، واتە پاش ڕەوانە کردنی پێغەمبەرەکەیان و بانگ کردنی ئەو دانیشتوانە بۆ فەرمان و ڕێگەی خواو ئینجا سەرکێشی و بڕوا نەهێنانیان، پاش ئەوە ئەوانەمان تاقیکردوەتەوە ئەو سزاو زیانەمان داوە بەسەریاندا، ﴿لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ﴾ بەڵکو بۆ ئەوەی ئەوانە بلاڵێنەوە لە خواو پەشیمان ببنەوە لە بێبڕوایی و سەرکێشیەکەیان و ملکەچ و گوێڕایەڵ ببن بۆ فەرمانی خواو داوای لێبووردن و میهرەبانی خوا بکەن، بەوە بەندەیی خۆیان دەربڕن بۆ پەروەردگاریان. بێگومان خوا هیچ پێویستی نیە نە بەبەنداکانی و نە بە خواپەرستی ئەوان، وەك لە حەدیسی قودسیدا هاتووە، ئەگەر هەموو ئادەمی و جنۆکە کۆببنەوە لەسەر خواپەرستی و هەموو ببن بەیەکەم خواپەست و لەخواترس بەوە دەسەڵات و

گەورەیی و پاداشتی خوا هیچ زیاد ناکات، وەك لەو بارەکەیشیەوە ئەگەر هەموو ببن بە بەدترین و خراپترین و یاخی ترین، بەوە هیچ کەم و کورییەك ڕووناکاتە دەسەڵات و گەورەیی و پادشایەتی خوا، بەڵکو لالانەوەی بەندەکان و بەندەیی و گوێڕایەڵیان مایەی بەهرەمەندی و ڕزگاربوونیانە لە هەموو ناخۆشی ژیانیان، ژیان و گوزەرانیان خۆش ئەبێ، هەرکاتێ بەندەکانی خوا هەڵسان بە بەندەیی خۆیان سەربەستی و ئازادی وەرئەگرن، چونکە ئەو کاتە ئازاد ئەبن لە بەندەیی شەیتان کە ئەیەوێ گومڕایان بکات و لەڕێگای ڕاست بیان ترازێنێ، ئازاد ئەبن لە بەندەیی هەواو ئارەزووەگانی نەفسیان، ئازاد ئەبن لە بەندەیی و بەندەیانێ کە وێنەی خۆیانن و شەرم ئەکەن لەوەی ڕێبازی شەیتان بدەنەبەر، شەرم ئەکەن لەوەی خوا لە خۆیان برەنجێنن بەهیچ نیازو کردەوەیەك لە کاتێکدا کە پەنا ئەبەن بە خوا لەکاتی تەنگی و نارەحەتیدا، بەرێك و پێکی دامەزراو ئەبن لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی خوا، لەبەرئەوە ویست و خواهیشی خوا داخوازبوو بەوەی کە هەر وڵات و شارێك کە پێغەمبەری بۆ ناردبێ ئینجا ئەوانیش سەرکێشیان بەکارهێنابێ لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان، داخوازبوو بەوەی ئەو سەرکێشانە دووچار بکات بەتەنگی و نارەحەتی زیان لەگەڵیان و لە لەش و لەسامان و ماڵیاندا، بۆئەوەی بەوە تەمێ خواربن و خۆیان پاك و خاوێن بکەن گوناهو تاوان و پەنا ببەن بە خوای میهرەبانیان، ﴿بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ﴾ ئینجا لە شوێنی ئەو سەختی و زیان و نارەحەتیە کە دووچاریان بوو، لەباتی ئەو خۆشیی و کامەرانی ئەهێنن و پیان ئەبەخشین ﴿حَتَّىٰ عَفَوا۟﴾ هەتا زۆربوون و گەشەیان کرد لە خۆیان و لە ماڵ و ساماندا وەك (ئیبن عەباس) -خوایان لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: ﴿وَّقَالُوا۟﴾ ووتیان: ﴿قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ﴾ بێگومان زیان و ناخۆشیی و خۆشی و کامەرانی دووچاری باوك و باپیرمان بووە، واتە ئەو دوو جۆرە بەسەرهاتانەیان دانەئەنا بە تاقیکردنەوە لەلای خواوە، بەڵکو ئەیان گووت: ئەوان شتێکن بەپێی باوی چەرخ و ڕۆژگار بەبێ ئەوەی هۆو پاڵدەرێکی تایبەتیان ببێ،

﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٩٥ وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٩٦﴾

---

﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ﴾ ئینجا لەو کاتەدا ئەوانەمان گرتو سزامان دان بە دادو بە شێوەیەك کە شایستە بوون بۆی ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ لە کاتێکدا کە هەستیان نەئەکرد بەوەو هەر بە خەیاڵیشیاندا نە ئەهات کە شتی وا ئەبێ و ڕووئەدات، لەبەر نازو خۆشی ناخۆشیان بەدڵدا نەئەهات، کە ئەو جۆرە سزایانە لەو کاتانەدا بەتین ترو ناخۆشترینی سزایە، ئەوەیان لە تۆڵەی ئەوەی بیریان نەئەکردەوەو دووربوون لە خوا، جڵەوی ئارەزووی نەفسی خۆیان بەرەڵاکردبوو، ترسی خوا لە دڵیاندا نەبوو، بەهیچ ڕەنگ لەبەر ئەوە دوو چاربوون و ئەو نازو ڕێزەیان لێ تێکدرا، ﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ﴾ ئەگەر دانیشتوانی ئەو شارو وڵاتە سزادراوانە بڕوایان بهێنایەو خوایان بپەرستایە لەوەی کە خوا قەدەغەیکرد لەسەریان ﴿عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ قاپی و دەرگای چەند پیت و فەڕمان ئەکردەوەو لە ئاسمان و لەلای سەروویانەوە، لەزەوی لەلای خواریانەوە ﴿وَلَٰكِن كَذَّبُواْ﴾ بەڵام بڕوایان نەهێنا بە پێغەمبەرەکەیان و بەدرۆزنیان دانان لەوەی کە ڕایان ئەگەیاند پێیان، ﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ ئینجا ئێمەش گرتمان و سزاماندا بەهۆی ئەو کردەوە بەندانەی کەئەیانکردن، خوای پەروەردگار ئەو هەواڵ و بەڵێنەیدا دەربارەی ئەو گەل و ئوممەتە ڕابردووە لەناو براوانە، ئەمەش تایبەتی نەبووە بەوانەو، بەڵکو گشتی یە بۆ هەموو چەرخەکانی ئەم ئادەمی یە بەتایبەتی چەرخەکە ئەم دواترین ئەم پەیامە جیهانیەی تێیدا ڕەوانە کرا شتێکی ئاشکرایە کە ئایین و شەریعەتەکانی خوا مایەی کامەڕانی و خۆش بەختی هەردوو جیهانە، چونکە هەر کارو کردەوەیەك کە پاك و خاوێن و سوودبەخشبێ لە هەردوو جیهاندا فەرمانی پێداوە، هەرکارو کردەوەیەك کە بەدو زیان دەر بووبێ لە هەردوو جیهاندا قەدەغەی کردووە، کەواتە بڕواو خۆپارێزی لە قەدەغەکانی خوا مایەی کامەرانی و بەختەوەریە، وەك

بڕوانەهێنان و خۆپاراستن هۆی بەد بەختی زیان و سزایە لەهەردوو جیهاندا، ئەو پیت و فەڕانەی کە خوا بەڵێنی پێداوە چەند جۆرەو دیاری نەکردوون، کەواتە گشتیە بۆ ئەو پیت و فەڕانەی کە زانراوو ناسراوبوو بن، بۆئەوانە کە نەزانراوو نەناسراو بووبن، ئینجا ئەگەر کەسێك ئەڵێ: دەی لەبەرچی ئەبینین زۆر لە گەل و ئوممەتە موسڵمانەکان وان لە ئەوپەڕی نەبوونی و تەنگ گوزەرانیدا، وەك ئەبینین ئەو هەموو ئوممەت و ئەو گەل و بێباوەڕانە وان لەو پەڕی خۆشی و نازو نیعمەتدا؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەوانەی بە موسڵمان سەیرئەکرێن و ئەژین لە تەنگی و تەنگ ژیان و گوزەراندا، ئەوانەی لە ڕاستیدا بڕوادارو لە خواترس و خۆپارێزەر نین، ئەوان ملکەچ و گوێڕایەڵی خوا نین، بەڵکو ملکەچ و گوێڕایەڵی بەندەیانی خوان، ئەوانە بەپێی بەرنامەی خوا ڕەفتار ناکەن، بەڵکو پەیڕەوی بەرنامەیەك ئەکەن لە بەرنامەکانی ئەم زەویە لە دوژمنانی خوا دایان هێناون، ئینجا ئەو ئوممەت و گەلە بێبڕوایانە کە بە کامەران و بەختەوەر سەیرئەکرێن، ئەوانە وان لە تاقیکردنەوەداو بەری ئایەتی پێشوو ئەکەون، کە فەرمووی: ﴿ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ ﴾ لەپاش ماوەیەك بەپێی زانین و کاردروستی خوا سزاو بەد بەختی دائەبارێ بەسەریانداو خوا ئەیانگرێ، بێجگە لەوەش ئەوانە لەئەوپەڕی بێئارامی و دڵتەنگیدا ئەژین و بەسەرگەردانیەوە، وەك بەئاشکرا نوسەرو ڕۆژنامەنوسەکانیان هاواریان لێ هەڵساوەو هەمیشە بێزاری دەرئەبڕن لە ژیان و بەسەرهاتەکانیان، بەهۆی ئەو بێئارامی و دڵتەنگیەی کە تیایدا ئەژین، خۆکوشتن زۆرەو پەرەی سەندووە لەو وڵاتانەدا کە بەڕواڵەت لە هیچ کەمیان نیە!! لەڕاستیدا خۆشی بریتیە لە خۆشی و کامەرانی دڵ، وەك ناخۆشی و بەد بەختی بریتیە لە ناخۆشی و بەد بەختی دڵ، ئەو پیت و فەڕو بەهرەی کەلەگەڵ بڕواو لەخواترسیدایە لە ڕاستیدا پیت و فەڕە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، پیت و فەڕە لە هەموو شت و مەکەکاندا پیت و فەڕە لە دڵ و دەرووندا، پیت و فەڕە لە هەستدا، پیت و فەڕە لە خۆشی ژیاندا، پیت و فەڕێکە کە گەشەئەدا بەژیان و ژیان بەرزئەکاتەوە، تەنیا بریتی نیە لە زۆری شت و مەك لەگەڵ بەد بەختی و دڵتەنگی و بێزاریدا.

لەپاش ئەوەی ئەو باوو ڕەوشتەی کە مێژووی وڵاتە وێرانکراوەکانیش شایەتە لەسەری، لەم کاتەدا کە هەست و ویژدان ئەبێ بکەوێتە لەرزە لەبیرکردنەوە لەو ڕووداوە دڵتەزێنانەی کە هات بەسەر ئەو بێبڕواو لە خوانەترسانە، کە خۆشی و نازو ڕێز هەڵی خەڵەتاندن و بێئاگای کردن لە تاقیکردنەوەکانی خوا، لەم کاتەدا چوارشێوە پرسیار ئەکات و ئەیاندات بەگوێی ئەوانەی کە بێهۆش و بێئاگا و بێباکن لە سزاو تۆڵەی خوا، سەرسوڕئەهێنێ لە حاڵ و باریان: یەکەم: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ﴾ دەی ئایا انیشتووو ئەهلی شارەکان نەترسان و بێباك بوون ﴿أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ﴾ لەوەی سزای ئێمە بێت بۆیان لە شەوداو لەکاتی خەوتندا لەکاتێکدا کەئەوان خەوتووبن؟ ئەگەر مەبەست بەدانیشتوانی شارەکان ئەوانەبێت کەلە داستانەکانی ڕابردوودا باسکران لەم سوورەتەدا ئەگەر ئەوانە مەبەست بن شێوە پرسیارەکان تۆ توانج و تەشەردانە لێیان و سەسوڕهێنانە لە حاڵ و باریان، واتە نەئەبوو بێباك بوونایەو بێباکیەکەیان ناشیرین و ناشایستە بوو، هەروەها ئەگەر مەبەست جێنشینی شارو وڵات بێت کە ئەوانیش و پێش ئەوانیش و پاش ئەوانیش ئەگرێتەوە تا ڕۆژی دوایی، ئەگەر مەبەست بە دانیشتوانی مەککەو دەورووبەری مەککەو شارەکانی تر لەکاتی هاتنی قورئان و داهاتوودا هەتا ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئەمە مەبەست بێت ئەوا ئەم پرسیارانە بۆ ترساندن و هەڕەشەیە، واتە ئایا لەپاش لەناوبردن و تۆڵەسەندن لەو گەل و ئوممەتە ڕابردووانەو زانین و بیستنی ئەو ڕووداوانەو بڵاوبوونەوەی ئەوانە، ئایا لەپاش ئەوانە دانیشتوانی مەککەو شارەکانی تر بێباکن و ناترسن لە دووچار بوونیان لەکاتێکدا کە هاوبەشی ئەوانن لە بڕوا نەهێنان و سەرکێشیان لە فەرمانی خواو ئایینی خوا؟ لەسەر هەربار ئەم پرسیارانە بەستراوو پەیوەستن بەووتەی ﴿فأخذتهم﴾ەوە،

أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ٩٨ أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٩٩ أَوَلَمۡ يَهۡدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ أَن لَّوۡ نَشَآءُ أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ١٠٠ تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَاۚ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبۡلُۚ

---

**ئایەتەکەی ﴿أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾ تێهەڵکێشە، هەروەها لەسەر هەربار ترساندن و هەڕەشەیان تێدایەو دەربارەی سورکێش و بێبڕواکانی ئەم ئوممەتە، ﴿أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ وتەی ﴿أو﴾ بەدوو جۆر خوێنراوەتەوە: ﴿أَوَ،أَوۡ﴾ لەسەر یەکەم ئەڵێن: ئایا ئەوانە بێئاگابوون و باکیان نەبوو لەوەی کە سزای بەتینی ئێمەیان بۆ بێت لە چێشتەنگاوداو لەکاتێکدا کە کاروکردەوەی بێنرخ و بێهودەیان ئەکرد، واتە لەبەر زۆری بێئاگاییان خەریك بوون بەو کارانەوە گەمەو گاڵتەیان ئەکرد، یان خەریك بوون بە کاروباری جیهانەوە، کە کاروباری ئەم جیهانە بەتەنها بێنرخەو وەك گەمەو گاڵتەی منداڵان وایە، لەسەر ئەم بارە مەبەست سەرزەنشت و بێزاری دەربڕینێکی ترە یان هەڕەشەو ترساندنێکی ترە لەپاش ئەوەی پێشوو، لەسەر خوێندنەوەی یەکەم سەربەخۆیەو بەو جۆرە ئەڵێن. لەسەر خوێندنەوەی دووەم سەربەخۆ نیە، واتە ئایا ئەوانە باکیان نەبوو لەهاتنی سزای ئێمە بۆیان لە شەودا یان لە چێشتەنگاودا؟ ئینجا ئەو مەبەستەی پێشوو لەو دوو ڕستەیە دووبارە ئەکاتەوە بە جۆرو شێوەیەکی تر کە ئەوانیش و غەیری ئەوانیش ئەگرێتەوەو سامناکترە لەوان، ئەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ﴾ ئایا ئەوانە نەترسان و بێباکن لە پیلانی خوا، واتە دووچارکردنی خوا بۆیان بەجۆرێ خۆی ئەوێ و ئەوان پێی نازانن وەك ئەو دوو وێنەی کە باسی کردن ﴿فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ واتە کاتێ ئەوانە نەترسان و بێباکبوون زیان باربوون، کەواتە بێباك نابێ لە پیلانی خوا بێجگە لەوانە کە زیانبارن، یان مەبەست ئەوەیە: بێباکیەکەیان زۆر بەدو ناشیرینە، چونکە هەر زیانباران بێباکن لە پیلانی خوا، یان**

ئەڵێین: کاتێ بێباکی ئەوەندە بەدو خراپ بێت، کەواتە هەر زیانباران بێباك ئەبن لەسەر هەربار مەبەست بە زیانباران ئەوانەن کە زیانباری خۆیان بوونو خۆیان لە دەست چوو، بەم ڕەنگە ئەو سروشتە پاکەی کەلەسەری دروستکراونو زایەیان کردو بەپێی ئامادەییەك کە بوویان ڕەفتاریان نەکرد، ئەو دەسەڵاتو توانایان بەختکرد لە هۆی بەد بەختیو زیانو دووچاربوونیاندا! ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ﴾ ئایا دەرنەکەوتو ڕوون نەبووەوە بۆ ئەوانەی کە دێن بە دوای چینو دەستە پێشووەکانی خۆیانداو بوون بە جێنشینیانو خاكو وڵاتەکان بە کەلەپوور وەرئەگرن لە پاش نەمانو لەناوبردنی دانیشتوانەکانیان بەهۆی گوناهو تاوانو بڕوانەهێنانیان، ئیتر ئایا مەبەست بەم جێنشینو کەلەپوور وەرگرانە دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری بێت وەك (سدی) ئەفەرموێ، یان مەبەست هەموو چینو دەستە دواییەکانە کە هاتنو دێن بەدوای پێشووە لەناوبراوەکاندا؟ هەرکام مەبەست بێت هەق وایە دواییەکان تەمێ خوار بن لە پێشووەکانەوەو خۆیان بپارێزن لەوەی ڕێگەی بەدی ئەوان بدەنەبەرو ئەم سەرزەنشتەیان ئاراستە بکرێ، واتە ئایا دەرنەکەوت بۆ تاقمو چینە دواییەکان ﴿أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ کەئەگەر بمانەوێو بمان ویستایە دووچارمان ئەکردنو دووچاریان ئەکەین بە تۆڵەو سزای گوناهەکانیان هەرچۆنێ پێشووەکانمان دووچارکرد؟ واتە ئەبووایە دەربکەوتایە بۆیانو تەمێ خوار ببونایە لێیانەوە ﴿وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ لەبارەی ئەم ڕستەیەوە چەند ڕایەك هەیە لەلایەن زانایانەوە:

١- پەیوەست نیە بە پێشەوە، بەڵكو تێهەڵکێشە، واتە هێندێ لە باوو کاری ئێمە ئەوەیە کە مۆر نەنێن بەسەر دڵی ئەوانەدا هەتا تەمێ خوار نەبن بەبەسەرهاتی ئەو گەلە پێشوانەو بیر نەکەنەوە لە بەڵگەو نیشانەکانی بڕوا هێنان.

٢- پەیوەستە بە پێشەوە، لەسەر ئەم ڕایە هێندێ ئەڵێن: پەیوستە بە ڕستەیەکی بڕیاردراو کە وەرئەگیرێ لە وتەی: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ﴾یەوە، واتە ئەوانە بێئاگان لە ڕێنموونیەوە ئێمەش مۆر ئەنێین بەسەر دڵەکانیاندا، هێندێ تر ئەڵێن: هەر پەیوەستە بە وتەی ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ﴾یەوە، مەبەست بەم ڕستەیە هەواڵدانە بەبێ ئاگایی ئەوانەو ڕێنموونی

وەرنەگرتنیان، هێندێکی تر ئەفەرموون: پەیوەستە بەووتەی ﴿يَرِثُونَ﴾ەوە، هێندێکی تر ئەفەرموون: پەیوەستە بەووتەی ﴿احيينا﴾ کە هەرچەند ئەو ووتەیە بەڕواڵەت بۆ ڕابردووە، بەڵام مەبەست داهاتووە، واتە ﴿نصيب﴾ لەناو ئەم ڕایانەدا ڕای یەکەم باشتر ئەچێتە دڵەوەو ڕێكو گونجاوترە لەگەڵ ئەم ڕستەی کە دێت بەدوایدا، ﴿فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ واتە ئێمە مۆرمان ناوە بەسەر دڵەکانیاندا، کەواتە ئەوانە نابیستن، واتە بەبیستنی وەرنەگرتنو تێنەگەیشتن عیبرەت وەرگرتن، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ئاگاداری ئەکات بەسەر دواڕۆژو چارەنوس کە گشتیە بۆ تاقیکردنەوەی ئەو شارو وڵاتانە، هەروەها ئاگاداری ئەکات بەسەر سروشتی بڕواو بێبڕواییدا، بەسەر زۆربەی سروشتی ئادەمیدا وەك دەرئەکەوێ لەو گەلو دەستەیانەدا کە باسکران، ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الْقُرَىٰ﴾ ئەو شارو وڵاتانەی کە باسکرانو ناوبران﴿نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَائِهَا﴾ ئەگێڕنەوە بۆتو ئەخوێنینەوە بەسەرتدا هێندێ لە هاوەڵەکانیان، ئەو هەواڵانەی کە پەندو تەمێو عیبرەتیان تێدایە﴿وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ سوێند بە خوا هات بۆلایان فروستادەکانیان بە موعجیزەو بەڵگە ڕوونەکانەوە، واتە هەر فروستادەیەك بە موعجیزەی تایبەتی خۆیەوە ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا﴾ ئینجا ئەوانە نەبوون بە بڕوادارو بڕواهێنەر، ﴿بِمَا كَذَّبُوا مِن قَبْلُ﴾ بەوەی کە بڕوایان پێی نەبوو لە پێشەوە، واتە ئەوانە لەیەکەم جارەوەو پێش هاتنی موعجیزە بڕوایان نەهێنا بەوەی کە پێغەمبەرەکانیان بانگی ئەکردن بۆی، ئینجا پاش هاتنی موعجیزەکانیش هەر بڕوایان نەهێناو هەر سوور بوون لەسەر بێبڕوایی و بڕوا نەهێنانیان، کەواتە لەبارەی مەعجیزەوە کەمو کوڕییان نەبوو، موعجیزە بە تەنیا کار ناکات، بەڵکو ئەبێ خاوەنی دڵێکی کراوەو سروشتێکی زیندووو هەستێکی پاكو خاوێن بن،

كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا

---

**ئەوانە بێبەش بوون لەوانە بە هۆی ئەوەوە دڵیان داخرابووو بەربەست کرابوو لە بڕواهێنان وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ مانەندی ئەو مۆر کردنە بەتینە خوا مۆر ئەنێ بەسەر دڵی بێبڕواکاندا لەوانەی کە خوا ئەیانناسێو ئەزانێ کە شایستەی ئەوەن.**

**لەبارەی مەبەست بەو مۆر کردنەوەو هۆکەی لە چەند شوێنێکدا باسکرا، کەواتە لێرەدا پێویست نیە بە چەند بارە کردنەوە، ئەو بڕوا نەهێنانی پێشو پاشە بە چوار جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەم تەفسیرەی کە لێرەدا هەڵمان بژارد لەدڵمدا جێگیر بوو بە لامەوە بەهێز تر بوو، زانینی ڕاست لای خوایە، ﴿وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ﴾ دەستمان نەکەوت بۆ زۆربەی ئەوانە هیچ عەهدو پەیمانێكو هەڵسان بە عەهدو پەیمانێك کەلە گەردنیاندا هەبوو، عەهدو پەیمانی سروشتی کەلە ئایەتی (١٧٢)ی ئەم سوورەتەدا ئاماژەو دەست نیشانی بۆ ئەکات، یان عەهدو پەیمان بەجێهێشتن، یان عەهدو پەیمانێك کەلەکاتی پێگیرانو تەنگانەدا ئەیاندا بە خواو لەپاشان پاشگەزئەبوونەوە لێی، بەهەرکام مەبەست بێت ئەوان ڕوونی نەکاتەوە کە زۆربەی ئەو گەلانەی کە باسکران بەو جۆرەن ﴿وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ﴾ بێگومان بەڕاستی زۆربەی ئەوانەمان دەست کەوت بەدەرچوو لە ئایینی خواو پەیمانی خوا، خوابەمیهرەبانی خۆی ڕاگیرودامەزراومان بکات لەسەرئایین وعەهدوپەیمانەپیرۆزەکەی خۆی.**

**لەپاش ئەو تێهەڵکێشانەی کەلە کۆتایی داستانی شوعەیبەوە دەستی پێکرد تا ئێرە، ئینجا دێتە سەر گێڕانەوەی داستانی موسا (عليه السلام)، کە دواترین داستانی پێغەمبەرو گەلەکەیان لێرەدا، ئەم داستانەی کردووە بە دوو بەش، بەشی یکەم داستانی لەگەڵ**

فیرعەون و کۆمەڵەکەی، بەشی دووەم داستانی لەگەڵ نەتەوەکەی خۆی لەنەوەی ئیسرائیل، داستانی موسا (علیه السلام) لە زۆر لە سوورەتەکانی تردا هاتووە هێندێ بە درێژی، ناوی موسا زیاتر لە (١٣٠)جار هاتووە لە قورئاندا، کەواتە داستانی ئەم گرنگترو بە سوودترە لە هەموو داستانەکانی تر، لە هۆی گرنگیەکەیدا چەن شتێك ووتراوە:

١- موعجیزەکانی زۆر گەورە گەورەبوون.

٢- نەفامی و نەزانی گەلەکەی بەتینتر بووە لەناو گەلەکانی تردا.

٣- بەسەرهات و ڕووداوی سەرسوڕهێنەری داستانی ئەم زۆرتر بووە، کەواتە پەندو عیبرەت زۆرتر وەرئەگیرێ لەداستانەکەی.

٤- داستانی ئەم لە زۆر شتدا وەك داستانی پێغەمبەری ئازیزە (ﷺ) کە خاوەنی شەریعەتێکی ئایینی و جیهانی بووە، بەو شەریعەتە خوا ئوممەت و میللەتێکی گەورەی فەراهەم هێنا کە خاوەنی پادشایەتی و شارستانیەتی بووەو ڕامیاری وڵاتی پێکرا.

ئینجا با بەم ئەندازەیە کۆتایی بێنین و بێینە سەر تەفسیری ئایەتەکان کە دەست پێ ئەکەن بەبەشی یەکەم و ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ﴾ ئینجا لەپاش ئەو فروستادانەی کە باسکران موسامان ناردو ڕەوانە کرد﴿بِـَٔایَـٰتِنَآ﴾ بە موعجیزەکانی خۆمانەوە کە (٩)ن وەك لەمەوپاش باسیان دەکەین ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِیْهِۦ﴾ بۆلای فیرعەون و کۆمەڵی دەست و پیاوماقوڵانی، هەرچەند بۆلای ئەو گەلە ڕەوانەکراوە بەگشتی، بەڵام لەبەرئەوە تەگبیری کاروباری وڵات بەدەست ئەمان بووەو ئەوانی تر شوێنکەوتوو ژێردەست بوون وەك هەر بۆلای فیرعەون و دەستەکەی ڕەوانە کرابێ وایە ﴿فَظَلَمُوا۟ بِهَا﴾ ئینجا ئەوانە ناهەقی و ستەمیان کرد بەو موعجیزانە بەم ڕەنگە بڕوایان پێنەهێنان و دانیان پیانەنان و سەرکێشیان بەکار هێنا، یان مەبەست ئەوەیە ئەوانە ستەمیانکرد لە خۆیان یان لە خەڵکی بەمەی بەرگریانکرد لە بڕواهێنان، وەك (حسن) و کەسانی تر ئەفەرموون،

فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ

---

**﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر یان هەرکەسێك کە بتوانێ سەرنج بدات ئینجا سەرنج بدە بەچاوی دڵ ئایا چۆن بوو داڕۆژی تێکدەران‌و خراپەکاران لە وڵاتدا، چیمان بەسەر هێنان وەك لەمەولا ڕوونیشی ئەکاتەوە، واتە سەرنج بدە کەچیمانکرد بە فیرعەون‌و کۆمەڵەکەی، بەڵام بەم ووتەیە ﴿ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ ناوی بردن‌و لەکەداری کردن، بەوە دەست نیشان ئەکات کەبە بڕوانەهێنانیان وڵات تێك ئەچێ‌و بڕوانەهێنانیان تێکدانی وڵاتە، ئەوەش شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە بەلای هەموو ژیرێکەوە، چونکە ژیان هەرگیز ڕاست نابێتەوە‌و چاك نابێ مەگەر بناغە‌و بنەڕەتەکەی لە بڕوا بە خواو گوێڕایەڵی‌و بەندەیی بۆ خوا، وڵات ئەشێوێ‌و تێك ئەچێ کاتێ کە بەندەیی‌و پەرستن تێیدا تەنها بۆ خوا نەبێ، چونکە پەرستنی خوا بە تاك‌و تەنها ئەمەیە کە خەڵکی یەك گەورە‌و کاربەدەستی هەیە کە بەندەکان ڕووی تێبکەن بەپەرستن‌و گوێڕایەڵی، ملکەچ‌و گوێڕایەڵ بن تەنها بۆ بەرنامە‌و شەریعەتەکەی، ئەو کاتە ڕزگارئەبن لە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی هەواو ئارەزووی بەندەیەکی وەك خۆیان کە ناوەستێ لەسەر بارێك‌و هەردەمە بەلایەکدا ئەڕوا، لەگەڵ ئەوەدا ئارەزووەکانیش بێ‌نرخ‌و بێ‌سوودن، هەرگیز بەندە سەربەستی‌و ئازادی دەست کەوت نابێ مەگەر لەسایەی بەرنامە‌و شەریعەتی خوادا ئینجا بزانین چی ڕوویدا لە نێوان موسا‌و فیرعەون‌و کۆمەڵەکەیدا؟ ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ﴾ موسا فەرمووی: ﴿يَـٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ئەی فیرعەون بەڕاستی من فروستادەیەکم لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ﴿حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾ شیاوم بەوە‌و سوورم لەسەر ئەوەی کە بێجگە لە حەق‌و قسەی ڕاست نەڵێم لەبارەی خواوە‌و هیچ شتێکی درۆ نەڵێم بەدەم خواوە،**

قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ ﴿١٠٧﴾

---

﴿قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ بەڕاستی من هاتووم بۆلای ئێوە بە بەڵگەو موعجیزەیەكی ڕوونەوە لەلایەن خواوە ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ كەواتە نەوەكانی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرە، واتە لێیان گەڕێو دەست مەهێنە ڕێیان با لەگەڵم بن، موسا (علیه السلام) شتێكی ڕاگەیاند كە هەموو پێغەمبەرانی خوا هەر ئەوەیان ڕاگەیاندوە شتێكی فەرموو كەئەوە ڕاستو ڕەوایە: خوا پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ئادەمی بەندەو دروستكراوی خوان، كەواتە ئەبێ هەر بەندەی ئەو بنو هەر ئەو بپەرستن، بێگومان فیرعەونو كۆمەڵەكەی ئەیانزانی كە ئەوەی موسا داوای ئەكاتو ئەیڵێ هۆی ڕووخانو نەمانی پادشایەتیو ڕژێمی فیرعەونە، لەبەرئەوە هیچیان بەدەستەوە نەما ئەمە نەبێ كە موسا بەدرۆزن نیشان بدەن، وەك ئاماژەئەكات بۆئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ فیرعەون ووتی بە موسا: ﴿إِن كُنتَ جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ بەڵگەو نیشانەیەكت هێناوە دەی بیهێنە ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی لەم لافو داوایەدا كە لێی ئەدەیت ﴿فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ﴾ ئینجا موسا داردەستەكەی فڕێدا ئیتر دەست بەجێ داردەستەكە بەمارێكی گەورەی ئاشكرا دەرچوو كە گومان نەبوو تێیدا، كەواتە هەر بەڕاستی بوو بەو مارە نەك بەشێوەی خەیاڵو چاوبەست، هەركەس ژیربێتو خوا بناسێ هەرگیز سەرناكاتەوە لەو جۆرە شتانە كە هەمیشە وێنەشیان ئەبینرێ، بۆ وێنە هەموو كەس ئەزانێ كەئەم ئادەمییە نایابە پێك دێت لەو دڵۆپە ئاوە، ئەو ئاوەش لە خۆراكو خواردەمەنی پەیدائەبێت، خۆراكەكەش لە خاك پەیدائەبێت!! ئیتر چۆن مەردومی ژیر ئەبێ سەربكاتەوە لە گەڕانی داردەست بەمار، لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهَا جَآنّٞ﴾ ئەو داردەستە وەك جانی لێهات، ﴿جَآنّٞ﴾ بەمارێكی بچووك ئەوترێ كە پێی ئەوگوترێ تیرە مار، هیچ دژایەتی نیە لەڕاستیدا لەنێوان ئەم دوو ئایەتەدا، چونكە ئەگونجێ

﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيۡضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ١٠٨ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ عَلِيمٌ ١٠٩ يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡۖ فَمَاذَا تَأۡمُرُونَ ١١٠ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِى ٱلۡمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ١١١ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَـٰحِرٍ عَلِيمٍ ١١٢﴾

ئەو ڕووداوە دووجار ڕووی دابێت، جارێ لە شێوەی ئەژدەهاو ماری گەورەداو جارێکی تر لە شێوەی تیرەمارێکدا، یا ئەو مارە هەرچەند گەورە بووبێ بەڵام لە بزوتنەوەو جوڵاندا وەك تیرە مار بووبێ، یان لەیەکەم جارەوە وەك جان بووبێ لەپاشان گەڕابێ بە مارێکی گەورەو ئەژدەها، یەکەم بەڵگەو موعجیزە ئەوەبوو، دووەم ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ﴾ دەستی دەرهێنا لە ژێر کراسەکەیو یان لە ژێر بن هەنکەکانی ﴿فَإِذَا هِىَ بَيۡضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ﴾ ئیتر ئەو دەستە بوو بە دەستێکی شپی کە بریقەو ڕووناکی ئەدایەوە بۆ سەرنج دەران، ئەو دەستەی کە لە پێشەوە دەستێکی ئاسایی بوو کەچی لەپاش ئەو دەرهێنانە بەو جۆرە گۆڕاو ڕووناکی دایەوە، کە ئەوە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕاستی موسا (علیه السلام).

پێغەمبەران هەرکام بە پێی کاتو چەرخو پێویست موعجیزەیەکی پێدراوە کە دەم کوتی خەڵکی پێبکرێ و ببێ بە نیشانەو بەڵگەیەکی سەرسوڕهێنەری چارنەکراو، لەو چەرخەدا جادووبازی باو بووەو نایابو سەرسوڕهێنەرێکی وا بووە کە لە هەموو شت زیاتر سەرنجی ڕاکێشاوە، لەو کاتو چەرخەدا ئەو موعجیزانەی‌دا بە موسا (علیه السلام) کە هەموو جادوویەکی پەك خستو دەستەپاچەیکردن، بەڵام سەرەڕای ئەوە فیرعەونی سەرکێش کۆتایی نەهێناو سەری شۆڕ نەکرد بۆ ئەوە، چونکە ئەگەر ملکەچ ببوایەو بڕوای بهێنایە ئەبوو دەستبەرداری ئەو پادشایەتیو لافی خوایەتیە ببوایە کە چەند ساڵ بوو کەشخەی پێوە ئەکردو ئاغاییو خوێن مژی پێوە ئەکرد، هەروەها کۆمەڵی پیاو ماقوڵانی کە لە پەنای ئەودا هەر خۆیان شت بوون لە وڵاتدا، لەبەر ئەوە دەستیان کرد بە پڕوپاگەند لە موسا، وەك ئاماژە ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ﴾ کۆمەڵی پیاوماقوڵانو کاربەدەست لە کۆمەڵو دەستەکەی فیرعەون گوتیان: ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی ئەمە ـ واتە موسا ـ

جادووبازێکی زۆر زانایەو لێزانە ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ﴾ ئەیەوێ ئێوە دەرکات لە خاكو وڵاتەکەتان، واتە ئەیەوێ بە جادووبازی خۆی زاڵبکاتو بەوە وڵاتەکە داگیربکات ئێوەی لێدەرکات، لە سوورەتی ﴿الشعراء﴾دا ئەم ووتەیەی بە ووتەی فیرعەون دائەنێ کەواتە چۆن لێرەدا ئەیکات بە قسەی پیاوماقوڵان؟ لەوەڵامدا ئەڵێین: دروستەو هیچ بەرگری کەرێك نیە لەوەی فیرعەونو ئەوانیش ئەوەیان گوتبێ، ئینجا خوایش لێرەدا قسەکەی فیرعەون ئەگێڕێتەوەو لە سوورەتی ﴿الشعراء﴾دا قسەکەی ئەوان یان لەیەکەم جارەوە فیرعەون ئەوەی گوتبێو ئەوان لە فیرعەونیان وەرگرتبێو ئینجا ئەوەیان گوتبێ بۆ خەڵکی تر، قسەکە قسەی فیرعەون بووبێو ئەوان لە فیرعەونەوە ڕایان گەیاندبێ، وەك باوە پادشایان ڕاو قسەی خۆیان باس ئەکەن بۆ پیاوە تایبەتیەکانیانو ئەوانیش باسی ئەکەن بۆ گشتی، ﴿فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ دەی ئایا قسەو فەرمانتان بەچیەو ڕاتان چیە لەم بارەیەوە؟ ئەم ووتەیە هەڵئەگرێ ووتەی فیرعەون بێت،بەڵام باری یەکەم بەهێزترو چەسپاوترە لە دڵدا لەبەرئەوەی بەدوای ئەو ووتەدا ئەم فەرموودەیە دێت کە وەڵامە بۆئەو پرسیارەو ئاشکرایشە کە ووتەی پیاوماقوڵەکانە: ﴿قَالُوا﴾ ئەو پیاوماقوڵانە گوتیان بە فیرعەونو ڕای خۆیان بەمە دەربڕی: ﴿أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ کاری موساو براکەی دوابخە، واتە پەلەمەکە لە بڕیاردان بەسەریاندا تابکرێ بە ڕەخنە بەسەرتەوە، مەبەستیان ئەوەبوو کە بەرگری موعجیزەکەی بکەن بە جادووی جادووبازان وەك دەرنەکەوێ لەوەی کە گوتیان: ﴿وَأَرْسِلْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ﴾ بنێرە بەناو شارەکاندا چەند کەسانێك لە جادووبازان کۆبکەنەوە ﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ﴾ هەموو جادووبازێکی زۆرزانت بۆ ئەهێنین، بەڕاستی هەرچەند فیرعەون یەکێکە لەسەرکێشە بەناوبانگەکانی مێژوو، بەڵام جیاوازبووە لە زۆر لە سەرکێشەکانی چەرخی بیستەم، ئەمان هیچ ماوەی بانگکەرانی ڕێگەی خوا نادەنو بەبێ پرسو ڕاو لێکۆڵینەوە دەست ئەوەشێنن لێیان بە پیسترین دەست وەشاندن! ئینجا قورئان بەپێی باوی کەس نەدیدەی خۆی باسی چۆنیەتی کردەوەی فیرعەون ناکات لەبارەی ئەو تەگبیرو داوای کە لێیکرا، بەڵکو دێتە سەر سەرەنجامو بەرهەمی کردەوەکەی وەك ئێستا پەیدابووبێو بە بەرچاوەوە بێت،

وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُواْ

---

ئەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ ﴾واتە ئەویش ناردنی و ئەوانیش كۆیان كردنەوەو جادووبازەكان هاتن بۆلای فیرعەون، ئینجا با بزانین كە هاتن چییان گوت و چییان كرد: ﴿قَالُوٓاْ ﴾ گوتیان بە فیرعەون: ﴿إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾ بێگومان بۆ ئێمە ئەجرو پاداشتی گەورە هەیە ئەگەر ئێمە زاڵ و سەركەوتوو بین، واتە ئەبێ ئەجرو پاداشتمان ببێ، یان بە شێوەی پرسیار ئەیڵێن وەك (ئیبن و عامر)و چەند كەسی تریش بەو جۆرەی خوێندووەتەوەو لە سوورەتی (الشعراء)دا بەو جۆرە هاتووە بەلای هەموانەوە، ﴿ قَالَ نَعَمْ ﴾ فیرعەونیش گوتی: بەڵێ ئەجرو پاداشتی گەورەتان بۆ هەیە: ﴿وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾ بێگومان ئێوە ئەو كاتە لە نزیك خراوەكان ئەبن لای ئێمە، واتە بێجگە لە ئەجرو پاداشت شتی گەورەتریشتان بۆ هەیە كە بریتیە لە نزیك خستنەوەتان لە ئێمەو پادەو پلە پێدانتان لای ئێمە، لە (كەلبی)یەوە ئەگێڕنەوە كە فیرعەون پێی گوتن: ئێوە یەكەم كەس ئەبن كە دێنە كۆڕو جێی دانیشتنم و دواترین كەس ئەبن كە لێی دەرچن، جادووبازەكان دڵخۆش بوون بەو بەڵێنەو بە شادومانیەوە چوون بۆ بەرامبەركێ و بەر لێ بڕینەوەی موسا (علیه السلام)، ﴿ قَالُواْ ﴾ گوتیان پێی: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴾ ئەی موسا یا تۆ لە پێشەوە فڕێی دەو دەریخە ئەوەی كە پێتە، یا ئێمە كەسانێ بین كە لە پێشەوە فڕێدەرو دەرخەری ئەوە بین كە پێمانەو ئامادەمان كردووە بۆ كاری مەبەستەكەی خۆمان،﴿ قَالَ ﴾ موسا فەرمووی: ﴿أَلْقُواْ﴾ فڕێ دەن و دەری خەن ئەوەی كە پێتانە، واتە ئێوە یەكەم بن لەوەدا، ئەو فەرموودەیە ئەوە ئەگەیەنێ كە موسا باوەڕی بەهێزی بووە بە خوێ و هیچ نرخێكی نەداوە بە كردەوەی ئەوان و باكی نەبووە لێی، واتە ماتوڵ شتەكە ئەكەن دەی ئێوە یەكەم بن و چیتان لە دەست دێت بیكەن، مەبەست ئەوە نیە كە موسا ڕازی بووبێ و فەرمان بدات بەو كارە بەدو بۆگەنەی ئەوان،

فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾

---

**﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ﴾ ئینجا کاتێ ئەوەی کە پێیان بوو دەریان خستو فڕێیاندا، هەرکام لەوان حەبلو داردەستێکیان پێبوو، ﴿سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ﴾ جادوویان کرد لە چاوی ئەو خەڵکەی کە بە دیارەوە بوونو چاوبەستیان لێکردن ﴿وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ﴾ ترساندنیانو ترسێکی بەتینیان خستە دڵیانەوە، ﴿وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾ جادوویەکی گەورەیان پێك هێناو هەڵسان پێی، ئەوەش بەمە بوو کە حەبلو داردەستەکانیان پڕ کرد لە جیوە ئینجا بە گەرمی ئاگر یان خۆر ئەو هەموو جیوە کەوتە بزوتنەوەو جوڵانو لەپێش چاوی خەڵکیش وا دەرئەکەوت کە حەبلو داردەستەکان جوڵانو بزوتنەوە ئەکەن بە هۆی ئەوەوە ترسان، بە کورتی چاوبەست بوو و لە ڕاستیدا حەبلو داردەستەکان هەر لەسەر باری خۆیان بوونو هیچ گۆڕانێکیان بەسەر نەهاتبوو، بەڵام لەڕاستیدا فێڵو فڕێکی زۆر گەورە بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا شتێکی گەورەتر هاتە پێشەوە کە هەموانی سەرسام کردو فڕو فێڵەکەی جادووبازەکانی لە ڕەگو ڕیشەوە دەرهێناو نیشانەو دروشمیشی نەهێشت وەك بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ سروشمانکرد بۆ لای موسا بەمەی کە داردەستەکەت فڕێدە، ئەویش فڕێی داو بوو بە مارێکی ڕاستەقینەو بە ڕاستی نەك بە چاوبەست ﴿فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ ئینجا دەست بەجێ ئەو مارە هەڵی لوشیو قووتیدا هەموو درۆو دەلەسەو فڕو فێڵەکەی ئەوان، بۆ ئەوەی ئەو ڕووداوە بخاتە بەر چاوو ئامادەی بکات بە ووتەی ئێستا**

فەرمووی: ﴿تَلْقَفْ﴾ نەك بە ڕابردوو ﴿لقفت﴾، ﴿ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ﴾ بەهۆی ئەوەوە هەق دەرکەوت و ڕوون بوویەوە، واتە کاری موسا ﴿وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەسەر چووو نەما ئەوەی کە ئەوانە کردیان ﴿ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ﴾ بەهۆی ئەوەوە فیرعەون و دەستەکەی لەوێداو لەو کۆڕو کۆمەڵە گەورەیەدا ژێرخران و داماو کران، ﴿وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴾ گەڕان بە زەلیل و ڕیسوا، هەمیشە ناهەق و شتی بەتاڵ هەروا هاتووە، لە پێشەوە بە گیڤەو گاڵە هاتووەو بافیشی کردووەتە خۆی و ترسی خستوەتە دڵی خەڵکی و بە زاڵ و سەرکەوتوو دەرکەوتووە، ئینجا کە هەق هاتووەتە کایەوە ئیتر ئەو گیڤەو گاڵەی نەماوەو باو فووەکەی نیشتووەتەوە وەك میزەڵدان، گرژ هەڵهاتووە وەك ژوژو،ئینجا شتی گەورەترو ڕیسواکەرو دڵتەزێن بۆ فیرعەون و دەستەکەی ئەمەبوو کە ئەفەرموێ: ﴿ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ﴾ جادووبازەکانی خران بەڕوودا و بە سوژدەبەری و سوژدەبردن بۆ خوای پەروەردگاریان لەکاتێکدا ﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری هەموو جیهانیان ﴿ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ پەروەردگاری موسا و هارون، ئەو جادووبازانە باشتر زانابوون بە جادوو و ئەندازەی ڕادەو پلەی جادوو، باش تێگەیشتن کە ئەوەی موسا هێنای و پێی هەڵسا شتێکی تر بوو جیاوازبوو لە جادووو جادووبازی، زانیان کەئەوە شتێك بوو لە سنوری دەسەلاتی ئادەمی بەدەربوو، لەبەرئەوە هیچ خۆیان پێنەگیراو بڕواکەیان دەربڕی، لە بەربەرەکانیەوە وەرگەڕان بۆ ملکەچی تەواو، بەلام سەرکێش و ملهوڕان نازانن چۆن ئەو ڕووناکیە ڕووی کردە ئەو دلانە، چۆن ئەو گۆڕانە گەورەیە هات بەسەریاندا، ئەوە بێگومان ئەو ڕووداوە گەورەترین زەربەیەك بوو کە دڵی فیرعەون و داروودەستەکەی هێنایە لەرزە، لەبەرئەوە،

قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ

---

**﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ ﴾ فیرعەون گوتی بەوانە: ﴿ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ ئایا ئێوە بڕواتان هێنا پێی پێش ئەوەو بەبێ ئەوەی من ئیزن بدەمو فەرمان بدەم پێتان؟ واتە کارێکی بەدتان کردو ڕاوەستن تابزانن چیتان بەسەر ئەهێنم، دیارە فیرعەون کە بینی ئەوانە بڕوایان هێنا مەترسی داگیریکرد کە ئەو بڕوای ئەوانە ببێتە هۆی بڕواهێنانی هەمووان لەبەرئەوە ویستی بەو جۆرەو لە دوو بارەوە بەربەست فەراهەم بهێنێو بەگری ئەو خەڵکە بکات لە بڕواهێنان، یەکەم: گوتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي ٱلْمَدِينَةِ﴾ بەڕاستی ئەم کردەوەیە کە کردتان فێڵو تەڵەکەیەك بوو ئێوەو موسا کردتان لە شارەکەدا، واتە مصر، واتە بڕواهێنانەکەتان بە موسا لە ڕووی ڕاستیەوە نەبوو، لەبەرئەوە نەبوو کە موسا بەڵگەی بەهێزی بووبێو ئێوەی دەستەپاچە کردبێ بەڵکو هۆی بڕواکەتان ئەمەبوو کە یەك کەوتن لەنێوان خۆتاندا، دووەم: گوتی: ﴿لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا﴾ واتە ئەو پیلانو فێڵەشتان کرد بۆئەوەی دانیشتوانەکەی خۆی دەرکەن لێیو خۆتان وڵاتەکە داگیربکەن، دیارە دەرکردنو ئاوارەکردن هاوتای کوشتنە ئابەو دووجۆرەو بەو پیلانە فیرعەون ویستی چاوڕاو بکات لە خەڵکیو پەردەیەك بهێنێ بەسەر ژێرکەوتنو ئابڕوچوونەکەی خۆیو دەستەو بەستەکەیدا، ئینجا هەڕەشەیەکی سەختو سامناکیان ئاڕاستە ئەکات، لەیەکەم جارەوە بە کورتی بەبێ دیاریکردنی بارو جۆری هەڕەشەکە، بەم ڕەنگە گوتی: ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ کەواتە لەمەوپاش ئەزانن سەرەنجامو دواڕۆژی بەدی ئەوەی کە کردتان، واتە تۆڵەتان لێ ئەسێنم، ئینجا هەڕەشەکەی ڕوون کردەوەو تۆڵەکەی دیاریکردو گوتی: ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ﴾ واتە ئەوە سوێندبێ دەستو قاچتان ئەبڕم بەشێوەی ڕاستو چەپ، واتە دەستی لایەکتانو قاچی ئەولاکەی تر کەئەوە زۆر سەختو بەتینو ئازاردەرە،**

ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾

---

﴿ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە هەڵئەواسم هەموو بەسەر پەلی دارخورمادا وەك لە سوورەتی ﴿طه﴾دا ئەفەرموێ، ئەوەش لەبەر ئابڕووبردنیان و ترساندن و تەمێ دادانی هەرکەسێکی ترو وێنەی ئەوان، ئینجا بەرامبەر ئەو هەڕەشە سەخت و سامناکە ئەو بڕوادارانە ﴿قَالُوٓا۟﴾ گوتیان: ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ بێگومان ئێمەی بڕوادار بۆلای پەروەردگارمان وەرئەگەڕێینەوە، واتە ئەگەر تۆ ئەوەمان بەسەر بێنی قەیناکات و هیچ زیانێکی نیە، چونکە ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆلای میهرەبانی و ئەجرو پاداشتی خوا، کەواتە کردەوەکەی تۆ ئەبێ بەهۆی گەیشتنمان بەو بەهرەو کامەرانیەو ئەبێ بە مایەی خێرو خۆشیمان، یان مەبەست ئەوەیە: ئێمەو ئێوە بەتێکڕایی ئەگەڕێینەوە بۆلای خوا، ئێوەش وەك ئێمە هەر ئەمرن و هەموو ئەچینە دادگای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا ئەوکاتە هەرکاممان ئەگەین بە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەکانمان، بڕوای ڕاستەقینە ئاوایە، نەدائەچڵەکێ و نە ئەکەوێتە لەرزەو ترازان، هەرچۆنێ مل کەچ ناکات بۆ ناهەقی، ئەو بڕوا ڕاستەقینە ڕزایەو دڵئارامە بەدواڕۆژی خۆی و شادمانە بەو بەشەی کە خوا پێی ئەبەخشێ ئیتر بەسەرهات و ڕووداوی ئەم جیهانەی هەرچۆن ببێ و بگوزەرێ، ئەو کەسی کە بەربەرەکانی لەسەر بیرو بڕواکەی بکات هەرگیز شل نابێت و سەر شۆڕناکات بۆ دوژمنە سەرکێشەکەی کە ڕازی نابێ لێی بەواز هێنان نەبێ لە بیرو باوەڕەکەی، هەرگیز داوای چاوپۆشی و لێبوردن ناکات لێی، چونکە ئاژاوەو تێجەنگینەکەی هەر لەبەر بیروباوەڕو عەقیدەکەیەتی، وەك ئەوانە فەرموویان: ﴿وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا﴾ تۆ هیچ ناخۆشی و بێزاریەکت نیە لە ئێمە مەگەر ئەوەی کە ئێمە بڕوامان هێنا بە ئایەتەکانی پەروەردگارمان کاتێ کە هاتن بۆمان، یان تۆ هیچ تۆڵەیەك لە ئێمە ناسێنی لەبەر هیچ هۆیەك مەگەر لەبەرئەوەی بڕوامان هێناوە.... هتد، ئینجا وازیان هێناو ڕووی قسەیان وەرگێڕا لە فیرعەون و ڕوویان کردە پەروەردگاریان و پەنایان بەوە بردو گوتیان: ﴿رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ ئەی پەروەردگارمان بڕێژە بەسەرماندا ئارامی و خۆگری کە بتوانین خۆمان بگرین لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆمان نەترازێین و هەڕەشەو ناپاڵی فیرعەون کارمان تێنەکات ﴿وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾

بمانمرێنـه بـه موسـڵمانێتیو دامـەزراو لەسـەر چاکەو بـەهرەی ئیـسلام، ئینجـا ئایـا ئـەو هەڕەشـەی بـەدی هێنـا، یـان خـوا پاراسـتنی؟ لـه (ئیبنو عـەباسو کەلـەبیو سـدی)یـەوه ئەگێڕنـەوه کـەم بـەدی هێنـاو بەشـەهیدی لـه دنیـا دەرچـوون!! ئابـەو جـۆره سـتەمو سەرکێـشیەکەی کـەوتو دەستەپاچـەبوو بەرامبـەر عەقیـدەو بـڕوا، بەرامبـەر وورِیـاییو تێگەیشتنو ئارامو خۆگری، سەرکێشیو ستەم پەکی کەوت بەرامبەر ئـەو دڵانـەی کـەوای زانـی دەسـەڵاتی هەیـه بەسـەریاندا هەرچۆنێ دەسـەڵاتی هەیـه بەسـەر سـزاو ئەشکەنجەی لەشەکاندا، بۆی دەرکەوت کـه چاری ئـەو دڵانـه ناکاتو کاریـان لێناکات، چونکه ئـەو دڵانـه کاریـان هـەر بەدەست خوایه، ئەبێ ستەمو سەرکێشی چی بکات بەرامبـەر ئـەو دڵانـەی کـه ئارەزووو خۆشیان هەر بۆلای خواو هاوسێتیو پەنای خوایه؟ ستەمو سەرکێشی چی بکـات کە بەو دڵانەی کە پـەنایان هـەر بەخوای خۆیـان بەستووەو چاوەڕوانی هـەر لای ئەونو هـیچ نرخێك نادەن بەهەرشتێك کەلای سەرکێشانه!

بەڕاستی ئـەو هەڵوێستەی کـه ڕوویـدا لـەنێوان فیرعـەونو کۆمەڵەکـەی لەگـەڵ ئـەو تاقمـه کەمو بێدەسـەڵاتەی کـه فیرعـەون کـۆی کردنـەوه لەشـارو وڵاتەکانـداو کەچـی بڕوایـان هێنـاو بوون بەهۆی ڕیسوایی خۆیو کۆمەڵەکەی، بەڕاستی ئەو هەڵوێسته یەکێکه لـه هەڵوێسته زۆر گەورەو گرنگەکانی مێژووی ئادەمی کـه بەپەنجه دەست نیشانی بۆ بکرێ، ئـەو هەڵوێستەی که بڕوا به عەقیدەی تێدا زاڵبوو بەسـەر گیـانو ژیانـدا ئیراده زاڵبوو بەسـەر ئێشو ئازاردا، مرۆڤ بەسـەر شەیتاندا! ئـەو هەڵوێسته ئازادیو سەربەسـتی ڕاستەقینەی تێدا دەرکـەوت کـه بریتیه لەبەرزیو بڵندی بڕواو عەقیده بەسەر ستەمی ستەمکارانو سەرکێشی سەرکێشاندا، نـرخ نـەدان بـەهێزی مـادیو کـه هـەر دەسـەڵاتی بەسـەر ئـازارو ئەشـکەجەی لەشـدا هەیـەو دەستەپاچەیه لە دەستگیرکردنو زاڵبوون بەسەر دڵو گیانـدا، هـەر بـەو دەستەپاچـەبوونەی هێزی مادیه ئازادی ڕاستەقینه پەیدائەبێ له دڵو دەروونا.

بەڕاسـتی هەڵوێستی ئـەو بڕوادارانـه مایـەی سەرسوڕمانه، ئـەوەتا ئـەو تاقمـه کەمـه کـه کـەمێك لـەوەوپێش دوای ئـەجرو پاداشـتیان ئـەکرد لـه فیرعـەون، ئاواتیـان ئـەوه بـوو نزیـك ببنەوه لێی، هەرئەوانه زاڵبوونو بەسەر فیرعەوندا نرخیان دانەئەنا بۆ هەڕەشـەو ناپاڵەکەی، به هەموو ئارامو خۆگریەوه ئامادەبوون بۆ هەڵگرتنی ئەو باره گرانەو خۆگرتن بەرامبـەر ئـەو ئەشکەنجەو سزاو ئازارەی که موچڕکه ئەهێنێ بەلەشداو دڵ ئەهێنێته لەرزه.

وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ

---

ئینجا بگەڕێینەوە بۆ سایەی ئایەتەکان کە چەشمەندازێکی تازەمان بخاتە بەرچاو، شێوەو چەشمەندازی کۆبوونەوەو کۆنگرەی فیرعەون‌و پیاوماقوڵەکانی بۆ تەگبیرو ڕاوێژ لە چارەسەرو بەرگریکردنی موساو شوێن کەوتووەکانی، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ﴾ کۆمەڵی پیاوماقوڵ‌و تایبەتی لە گەلەکەی فیرعەون گوتیان بە فیرعەون ﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ﴾ ئایا وازئەهێنیٚ لە موساو گەلەکەی ﴿لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بۆئەوەی خراپکاری بکەن لە وڵاتدا لە خاکی مصردا، واتە لێیان گەڕێت تابەئارەزووی خۆیان‌و بە سەربەستی خەڵك بانگ بکەن بۆ ئایینەکەی خۆیان، ﴿وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ﴾ واز بێنن لە تۆو پەرستراوەکانت‌و هیچ نرخێکیان بۆ دانەنێن، بە پێی فەرمان و شەریعەتی تۆ ڕەفتار نەکات؟ کەواتە خراپەکاری بەلای ئەوانەوە ئەوە بوو کە بانگ بکەن بۆ پەروەردگارێکی خوا و پەیڕەوی فەرمان و شەریعەتی خوا و لائەدەن لە فەرمان و شەریعەتی فیرعەون، کەواتە ئەو کردەوەی موسا لە ڕاستیدا شۆڕش بوو بەسەر فیرعەون و ڕژێمی فیرعەوندا، پیاوماقوڵەکان فیرعەونیان وریا کردەوەو ئاگاداریان کرد بەو مەترسیە گەورەی کە ڕووی کردە فیرعەون‌و پادشاییەکەی، جا لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ فیرعەون گوتی پێیان: ﴿سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾ لەمەو پاش کوڕەکانیان ئەکوژین بە زۆری‌و بە لێشاو ﴿وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ﴾ ئافرەتەکانیان ئەهێڵینەوە بە زیندوویی وەك لەمەو پێش بەو جۆرەمان کرد، واتە موسا هەر کارو کردەوەیەك بکات بە دژی ئێمە بەهۆی گەل‌و کەس‌و کارەکەیەوە ئەیکات، ئەی ئێمەش هەوڵ ئەدەین بۆ کەم کردنەوەیان بە کوشتنی نێرینەکانیان، زەبوون‌و

ڕیسواشیان ئەکەین بە هێشتنەوەی کە سزای زۆر گەورە ئەمەیە ئافرەتی بێچارە دوژمن دەستگیری بکات، ئەو کردەوە پیسە فیرعەون بەکاری هێنا پێش لەدایک بوونی موسا، ئەو تاوانە زۆر بەدەی کرد، ئینجا ئایا دووبارەی کردەوە لە پاش ئەم هەڕەشە یان نە؟ هێندێ لەسەر ئەوەن کە ئەم جارە بۆی نەکرا، ئینجا گوتی پێیان: ﴿وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَٰهِرُونَ﴾ بێگومان ئێمە بەرزو بڵندین بەسەریانداو زاڵین بەسەریاندا ئەوانەی لە ژێر دەستمانان وەك لەمەو بەرو بارو حاڵمان نەگۆڕاوە، واتە وازهێنان و بێدەنگ بوونمان لەبەر بێدەسەڵاتی بیرکردنمان نیە لێیان، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە نرخیان نیە لامان و بێباکی لێیان، بێگومان ئیسرائیلیەکان ترس و بیمیان لێ نیشت لەو لەو هەڕەشەی فیرعەونە لەبەر ئەوە موسا (علیه السلام) فەرمانیدا بە ئارام و خۆگرییان و دڵنەوایی کردن و ئومێدەواری کردن بە دواڕۆژی کامەرانی و بەختەوەریی کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ﴾ موسا فەرمووی بە گەل و نەتەوەکەی ﴿ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟﴾ کۆمەکی لە خوا داوا بکەن و خۆگرو بەئارام بن لەسەر ئەوەی کە بیستتان لە فیرعەون و مەترسی لێ ئەکەن، فەرمانیدا بەم دوو شتە، چونکە بڕواداران و بانگ کەرانی ڕێگەی خوا ئەبێ یەك پەناو پەناگایان ببێ کە خوایەو پەنای خوایە، ئەبێ هەر یەك دۆست و کاربەدەست و خاوەنیان ببێ کە خوایەو هەموو شت هەر بەدەست ئەوە، کەواتە ئەبێ خۆگرین و بوەستن بە دیاری فەرمان و بڕیاری ئەوەوە، پەلە نەنێنەوەو بوەستن بە دیاری هاتنی کاری خواوە کە کات و باری تایبەتی دیاری کراوی خۆی هەیە بە پێی لێزانی و کاردروستی خۆی، فەرمانیدا بەو دوو شتە، ئینجا بەڵێنی پێدان بە دوو شت: یەکەم: دەست نیشانیکرد بە لەناوبردنی فیرعەون و دەستە وبەستەکەی و گێڕانی ئەمان بە بەهرەمەندو شادو شادومان بە خاك و وڵاتەکەی ئەوان، دووەم: دواڕۆژی کامەرانی و بەختەوەری لەم جیهانەدا یان لە هەردوو جیهاندا،

إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾

---

**فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ﴾ بێگومان خاكو وڵاتی میسر، یان خاكو وڵات بە شێوەی گشتی كە خاكو وڵاتی میسر لێرەدایەكەمو سەردەستەیە ﴿يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ﴾ هینی خوایەو بەدەست خوایەو موڵكی خوایەو ئەیبەخشێو ئەیدا بە كەلەپوور بە هەركەس لە بەندەیانی كە خوا خۆی بیەوێ و مەیلی ببێ ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ دواڕۆژی خێرو خۆشیو سەركەوتنو ڕزگاری بۆ لەخواترسو خۆ پارێزەرانە، واتە كار بەو جۆرە نیە كە فیرعەون گوتی، بەڵكو بەرزیو زاڵبوون بۆ كەسێكە كە خۆگر بێو كۆمەك لە خوا داوا بكات، دەی ئێوە كە خۆگرو لەخواترس بن ئەبێ ئێوە زاڵو سەركەوتوو بن، ئیتر زۆری پێبچێ یان كەم، پێغەمبەرانو شوێن كەوتووە ڕاستەقینەكانی بۆچوونو ئومێدو چاوەڕوانیان بەو جۆرەیەو هەمیشە دڵئارامو دڵنیان، بەڵام زۆربەی ئیسرائیلی لەو ڕادەو پلە بەرزەدا نەبوون، لەبەر ئەوە كەوتنە گلەییو بناشت لە موساو بێزاریان دەربڕی لە بارو بەسەرهاتیان وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەوانە گوتیان ﴿أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ﴾ گەلو نەتەوەكەی موسا وتیان بە موسا: سزاو ئازار دراین لەپێش ئەوەی تۆ بێیت بۆ لامان بە فروستادەییو پێغەمبەرێتی وە لەپاش ئەوەی كە هاتی بۆ لامان بە فروستادەیی، واتە هیچ سوودێكمان وەرنەگرت لەم فروستادەییەی تۆو بارو حاڵمان نەگۆڕا، ئێمە هیوامان وابوو كە لە پاش فروستادەیی تۆ ڕزگار ئەبین، بەڕاستی ئەو وتەو گلەیی ئەوانە ئێشو ئازاری زۆرە لە دڵدا، بەڵام موسا (علیه السلام) خۆی تێك نەداو لەسەر ڕێگەو بەرنامەی خۆی ڕۆیشت، گێڕانیەوە بۆلای خواو هیواو ئومێدی بەستن بە خواوەو بەڵێنی ڕزگاریو سەركەوتنی پێدان**

بەم جۆرە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ﴾ ئومێدو چاوەڕوانیە کە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو بەرێ ﴿وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئێوە بکات بە جادارو جێنشین لە خاك‌و وڵاتەکەدا ﴿فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾ تا سەرنج بدات‌و ببینێ چۆن ئێوە کردەوەو ڕەفتار ئەکەن؟ ئایا چاولەبەری چاکەو بەهرەی خوا ئەبن‌و سوپاس‌و گوێڕایەڵی ئەکەن، یان سپڵە ئەبن‌و بەهۆی ئەوەوە یاخی ئەبن وەك فیرعەون‌و کۆمەڵەکەی؟ واتە تا ئەوەی خوا ئەیزانێ ئێوە بە کردەوە بەدی بێنن‌و بەو جۆرەش خوا بیزانێ‌و ببینێ، تا بە گوێرەی کردەوەکانتان ئەویش ڕەفتارتان لەگەڵ بکات، چونکە باوی خوا وا هات کە تۆڵەو پاداشتی بە دوای کردەوەی بەندەکانیدا بێت‌و ئەوەی کە زانیویەتی بەدی بێت لەلایەن بەندەکانیەوە، موسا (علیه السلام) بە چاوی دڵی پێغەمبەرێتی سەرنجی داو باوی خوای بینی کە بەڵێنی پێداوە بۆ خۆگران‌و یاخیەکان لەبەرئەوە نەمان‌و لەناوچوونی سەرکێشانی بینی، زاڵبوون‌و سەرکەوتنی خۆگران‌و پشت بە خوا بەستانیشی بینی، لەبەر ئەوە تەمێ‌و ئامۆژگاری گەل‌و تاقمەکەی خۆی کردو خستیە سەر ڕێگە ڕاستەکەی خوا تا ئەو باوی خوا بەدی بێت لەوان‌و فیرعەون‌و دەستە یاخی‌و ستەمکارەکەیدا، کە باوەکەی هەر بەو جۆرە هات سەرکێشان‌و ستەمکاران لەناوبەرێ‌و خۆگران‌و پەنا هێنەرەکانی خۆی سەر بخات‌و بیانکات بەجێنشینی ئەوان‌و شادیان بکات بە وڵات‌و جێ‌و شوێنەکانیان، ئیتر زۆری چێچوبێ یان کەم، ئەوەش بەپێی زانین‌و کاردروستی خوایە، ئەو زاڵکردن‌و شادکردنەش تاقی کردنەوەیە تا دەرکەوێ بۆ مەردومان سپڵەیی‌و ناسوپاسی‌و سوپاس‌و گوێڕایەڵی، موسا فەرمووی: ئومێدو چاوەڕوانی‌و هێوایە...هتد، بەڵێنەکەی بەقەتعی نەدا، لەبەرئەوەی ووتەی (عسى، لعل) لەلایەن خواوە بێت بەڵێنی تەواوە، موسایش (علیه السلام) ئەو بەڵێنەی لە خواوە بۆ هات، یان موسا شەرم‌و ئەدەبی بەکار هێنا لەگەڵ خواداو زاتی نەبووە بەشێوەی قەتعی‌و بەڵێنی تەواو ڕایگەیەنی.

وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾

---

**ئینجا لەئایەتەکانی داهاتوودا بەدرێژی باسی چەند ڕووداوو بەسەر هاتێك ئەکات کە خوای میهرەبان کردنی بە پێشەکیو سەرەتا بۆئەو بەڵێنە گەورەی کەدای بە موساو ئیسرائیلەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ﴾ سوێند بە خوا قارمان گرت لە گەلو دەستکەی فیرعەونو سزامان دان ﴿بِٱلسِّنِينَ﴾ بەساڵانی گرانیو قاتو قڕیو تەنگ گوزەرانی ﴿وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ بە کەمو کورپی لەبەرو میوەجاتدا، ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەو بەڵکو بیربکەنەوە لەدەستەپاچەییو بێدەسەڵاتی خۆیانو فیرعەونەکەیانو تەمێ خوار بنو کۆتایی بێنن لەو باوو حاڵە بەدەی وان لەسەریو بەڕاستی زۆر جێی خۆی بوو ئەو بیرەبکەنەوەو بزانن هەموو شت بەدەست خوایە ئەگینا چۆن خاکی پڕ لەپیتو فەڕی وەك مصر ئەوای بەسەر دێتو تەنگیو تەنگ گوزەرانی وای تێدا پەیدا ئەبێ، بەڵام بیریان نەکردووەو تەمێ خوار نەبوونو زیاتر گومڕا بوونو خۆیان بەچاك دانا، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ﴾ ئینجا کاتێ خێرو خۆشیو هەرزانیو فراوانی ڕۆزیو تەندروستیان بۆ بهاتایەو ببوایە ﴿قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦ﴾ ئەیانگوت: ئەمە هەر بۆ ئێمەیەو لەبەر ئێمەیەو ئێمە شایستەی ئەمەین، ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ ئەگەر هەر ناخۆشیو تەنگ گوزەرانیان توشی بهاتایە ﴿يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾ ئەیانخستە مل موساو هەرکەسێك کە لەگەڵیەتیو ئەیانگوت ئەمە بەهۆی شومیو خراپی ئەوانەوە توشمان بووە. لەسەردەمی نەفامی عەرەبدا باو بووە ئەگەر کەسێ کارێکی بکردایە ئەڕۆیش بەلای هێلانەی باڵندەیەکداو هەڵی ئەفڕاند، جا ئەگەر بەلای ڕاستیدا بفڕیایە ئەو کارەی بەچاك دائەنامۆژدە بەخش ئەبوو پێیو ئەچوو بە دەم ئەو کارەوە، ئەگەر بەلای سەرچاوەکەی کە بریتییە لە خواو قەزاو قەدەری خوا، هەروەها لە هەموو چەرخو سەردەمی نەفامییەکاندا کاروباریان**

نەئەگێڕایەوە بۆلای خوا بەڵکو هەر دەمە بۆلای شتێکی تر وەك ئەوی لە سەردەمی نەفامی فیرعەوندا کە خێرو خۆشیان ئەگێڕایەوە بۆلای چاکی خۆیان، ناخۆشیو دەردو بەڵایان ئەگێڕایەوە بۆلای بڕواداران، هەروەها جولەکەکانیش لە مەدینەدا بەو جۆرەیان ئەگوت دەربارەی پێغەمبەرو بڕواداران، بێگومان ئەو قسەوباسانە سەرجەم هەڵەیەو پڕوپوچەو باری ڕاستەقینە ئەمەیە کە خوای پەروەردگار باوو ڕەوشتی داناوە بۆهەرشتێ، بەدیهاتن یا بەدینەهاتنی هەموو کاروبارێك بەستراوە بەو باوو ڕەوشتەو بە قەزاو قەدەری خوا کەئەو باوو ڕەوشتەی داناوە بەدیهاتنو خێرو خۆشیو بەدیو ناخۆشی بەستووە بەو باوو ڕەوشتەوەو لەڕاستیدا هەموو کاروبارەکان ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو قەزاوقەدەری خوا، وەك لێرەدا دەستنیشانی بۆ ئەکات، کە بەرپەرچی ئەو نەفامانە ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بێدارو ئاگاداربن کە شومو بەد بەختیان هەر لای خوایەو لەلایەن حوکمو بڕیاری خوایە وەك (ئیبنو عەباس ) ئەفەرموێ، یان ئەو شومو بەد چارەییەی کە دووچاریان ئەبێ هەر ئەوەیەکە هەڕەشەیان لێکراوە لای خوا نەك ئەوەی کەلە جیهاندا تووشیان ئەبێ، وەك (زەجاج) ئەفەرموێ: یان بەشی ئەوانو ئەوەی کە ئەفڕێو دێت بۆیان لە قەزاو قەدەری خوا هەر بەهۆی بەدییو شومی خۆیانە بەلای خواوە وەك هێندێکی تر ئەفەرموون. یان ئەو شومو بەدیەی کەئەیبڕن بەسەر موساو بڕواداران داو لەوانی ئەناسن، ئەو شومو بەدیە هەر لای خوایەو لەلایەن ئەوەوە هاتووە نەك کە هەموو شت بەدەست خوایەو ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، لەبەرئەوە ئەو وتەو قسەو باسە ناڕاستانە ئەڵێنو دێن بەدەمیاندا، نازانن ئەوەی کە توشیان دێت لە خۆشیو ناخۆشی لەلایەن خواوە دێت بۆیان لەبەر تاقی کردنەوەیان، سزاو ئازاریان توشی ئەبێ بۆ تۆڵەسەندن لێیان، ئەوانە ئەوە نازانن هەرچەند خۆیان بەبڕوادار دائەنێن، ئەوانە نازانن وەك ئەوانەی کەلەم چەرخەدا پەیدا بوونو بڕوایان بە غەیبو قەزاو قەدەر نیەو ئەوەیان ناو ناوە: (العقلية العلمية) هەروەها ئەوانەی بەناوی (الإشتراكيه العلميه) ڕووداوە ناخۆشەکان ئەبڕن بەسەر شتێکدا کەناوی ئەبەن بە: (الطبيعة المعاكسة) ئەوانە ئەمانە هەموو نەفام نەزانن! ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر سەرکێشی دەستەو بەرەکەی فیرعەونو شتی سەیریان لێ ئەگێڕتەوە،

وَقَالُواْ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ

**ئەفەرموێ:** ﴿وَقَالُواْ﴾ **ئەیانگوت بە موسا** ﴿مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا﴾ **هەرچەندو هەرجارێ بەڵگەو نیشانەی ڕوونمان بۆ بێنی بۆئەوەی جادووو چاوبەستمان لێ بکەیت پێی** ﴿فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ **ئێمە نایین و نین بەبڕوادار بەتۆو لەبەر قسەی تۆ، واتە هەرجارێ بەڵگەو نیشانە ببینین بە موعجیزەی ناوببەی ئێمە بە جادووو چاوبەستی ائەنێین، کەواتە بڕوات پێناهێنین هەرگیز، ئەوەیە سەرکێشی تەواو کە نە ئامۆژگاری و بیرخستنەوە چاری ئەکات نە بەڵگەو نیشانەو ڕابەری بەهێز کاری لێ ئەکات، ئەوەش بەسەرهات و نەخۆشیەکی دەروونیە کە دووچاری سەرکێش و ستەمکارەکان دێت کاتێ کە هەق و ڕاستی بەرەنگاریان بوەستێ، موعجیزەو ڕابەرو بەڵگەی ڕوون بەریان لێ ببڕێتەوەو ناچریان بکات، لەوکاتەدا سەرکێشیان دێتە جۆش و ئەو پەڕی لاری و لارەجڵەوی خۆیان دەرئەبڕن و قسەی ئاوا ڕاست و ناڕەوا ئەکەن! جا لەو کاتەدا هێزی هەرە گەورە هاتە مەیدان دەست چار نەکراوی خۆی وەشاند بەم ڕەنگە چەند موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکرای هێنایە کایەو چەند شتی سزاو ئازاردەری نیشان دان کە هەرکام ناچاری ئەکردن بە پەنا هێنان بە موسا (علیه السلام) کە داوا بکات لە پەروەردگاری ڕزگاریان بکات لێی، کەچی کاتێ ڕزگاری ئەکردن ئەچووەنەوە سەر یاخی بوون سەرکێشیەکەیان، وەك بۆمان ڕوون ئەکاتەوە، ئەو موعجیزە ئاشکراو ئازار دەرانەش بریتی بوون لەباران و لافاو و کوللەو ئەسپێی دانەوێڵەو قورباق و خوێن وەك بەدرێژی باسی ئەکەین، لەبارەی چۆنێتی ڕوودان و بەدی هاتنی ئەو موعجیزانەوە چەند ڕیوات هاتووە کە هیچ کام لەوانە نین کە بەرز کرابێتەوە تاگەیشتبێتە پێغەمبەر(ﷺ) لەبەرئەوەی دەلەسەو ئیسرائیلیاتی زۆر بڵاو بوونەتەوەو بەداخەوە تێکەڵی کتێبەکانی تەفسیر بوون، بەجۆرێ هیچ تەفسیرێك ڕزگاری نەبووە لەوە تەنانەت تەفسیری (طبري و ئیبن وکثیر)یش کە چەندە پایەبەرزن، لەبەر ئەوە لە تەفسیری ئایەتەکاندا پشت نابەستن بە هیچ**

کام لەو ڕیوایەتانەو نایانکەن بە تەفسیری ئایەتەکان، بەڵکو شوێنی دەقی ئایەتەکان دەکەوین، بەس لە ناو ئەو ڕیوایەتانەدا ڕیوایەتێك ئەهێنین کە بە لامانەوە زیادەڕەوی تێدا نیەو ڕێك‌و گونجاوە لەگەڵ دەقی ئایەتەکاندا، (طبري) ئەفەرموێ لە (ئیبن‌و حەمید)و ئەویش لە (یەعقوبی قومی)و ئەویش لە (جعفری کوڕی مغیر)ەوە ئەویش لە (سعیدی کوڕی جوبەیر)ەوە کە ئەفەرموێ: کاتێ موسا چوو بۆلای فیرعەون پێی فەرموو: ئیسرائیلیەکان بەرەڵا بکەو لەگەڵم بیان نێرە، ئەویش سەرپێچی کردو بەگوێی نەکرد، ئینجا خوا باران‌و لافاوی دا بەسەریاندا، ترسان لەوەی کە ببێ بە سزا بۆیان، لەبەر ئەوە وتیان بە موسا: داوا بکە لە پەروەردگارت کە ئەمەمان لەسەر لابات تا بڕوات پێ‌بهێنین، ئیسرائیلیەکانت لەگەڵ بنێرین! ئەویش نزای کرد، کەچی بڕوایان نەهێناو ئیسرائیلیەکانیان نەنارد لەگەڵی، ئینجا لەو ساڵەدا کشتوکاڵ‌و بەرمیوەو لەوەڕێکی زۆری بۆ فەراهەم هێنان، کە لەوەو بەر شتی وایان نەبووە، ئینجا ئەوانیش گوتیان: ئەمە بوو کە ئێمە ئاواتمان بوو، ئینجا خوا کوللەی بۆ ناردن‌و زاڵی کرد بەسەر لەوەڕیاندا، ئینجا کاتێ کە بینیان ئەو کوللەیە کاری کرد لە لەوەڕەکەیاندا زانیان کشتوکاڵەکەشیان نایەڵێ لەبەرئەوە داوایان کرد لە موسا هاوارو نزا بکاتە لای پەروەردگاری تا ئەوەیان لەسەر لاببات‌و ئەوانیش باوەڕی پێ‌بێنن‌و ئیسرائیلیەکانیان بخەنە تەك، ئەویش نزای کردو خوایش کوللەکەی نەهێشت، کەچی بڕوایان نەهێناو ئیسرائیلیەکانیشیان بەرەڵا نەکرد! ئینجا کشتوکاڵەکەیان دروێنە کردو کۆیان کردەوە لەماڵەکانیاندا، ئینجا گوتیان: ئەوا کۆمان کردەوەو دەسمان بەسەردا گرت، واتە بیم‌و ترسمان نەما لە نەمان‌و لەناوچوونی! ئینجا خوا کرم‌و ئەسپێی دا بەسەریاندا، ئینجا وایان لێ هات پیاوی وا هەبوو لە چل مەن کە ئەیبرد بۆ ئاش سێ مەنی بۆ دەرنەئەچوو، ئینجا هاواریان لێ هەڵسایەوە بۆ لای موساو ئەویش نزای کردو خوا ڕزگاری کردن‌و کەچی هەر بڕوایان نەهێنا، ئیسرائیلیەکانیان بەرەڵا نەکرد، ئینجا جارێ موسا (علیه السلام) دائەنیشێ لای فیرعەون‌و دەنگی قوڕباقێ ئەبیستێ، ئەفەرموێ بە فیرعەون: ئایا تۆو گەلەکەت دووچاری چی ئەبن لەمەوە، ئەویش ئەڵێ: چاوەڕوانی چی ئەکەیت لەمە؟ ئینجا ئێوارەیان لێ نایە هەتا وایان لێ دێ قوڕباق داگیریان ئەکات تا ڕادەیەك پیاوی وا بوو قوڕباق

دەوری ئەدات تا چەناگەی بە دەرەوە ئەما، ئەیویست قسە بکات دەست بەجێ قورپاقێك ئەچووە دەمی، ئینجا هەمی تر هاواریان لێ هەڵسایەوەو داوایان کرد لە موسا کە بپاڕێتەوە لە خواو هەمان بەڵێنیان دایەوەو لەپاش ڕزگار بوونیان چوونەوە سەر بارەکەی خۆیان، ئینجا خوا خوێنیدا بەسەریاندا تا وایان لێهات لە هەر ڕووبارو کانیو بیرێك ئاویان بهێنایە دەست بەجێ ئەبوو بە خوێنێکی تەڕو تازە، هەروەها هەر ئاوێك لە گۆزەو کوندەو شتەکانیاندا هەبوو هەمووی ئەبو بە خوێن، ئینجا هاواریان بردە لای فیرعەون، ئەویش گوتی جادوو چاوبەستی لێکردوون! ئەوانیش گوتیان لەکوێ جادوو چاوبەستی لێکردووین، ئێمە هەر ئاوێکمان بووبێو هەڵمان گرتبێ تەماشا ئەکەین بووە بە خوێنێکی تەڕو تازە! ئینجا هاتنە لای موساو گوتیان: ئەی موسا داوا بکە پەروەردگارت با ئەم خوێنەمان لەسەر لابات، تا بڕوات پێ بێنینو ئیسرائیلیەکانت لەگەڵ بنێرین! ئەویش نزای کردو خوایش ئەوەی لەسەر لابردن، کەچی بڕوایان نەهێناو بەڵێنەکەیان نەبردە سەر، ئەم ڕیوایەتە بەم جۆرە هاتووەو ڕێكو گونجاویشە، بەڵام لە هەمان کاتدا هیچ پێویست نیە ئێمە زیاد لە شێوەی دەقی ئایەتەکان بگرینبە دەستەوە، بەڵکو هەر ئەوە بڵێین. فەرمووی: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ﴾ ئینجا بەهۆی سەرکێشی ئەوانەو بڕوانەهێنانیان ناردمانە سەریانو ڕشتمان بەسەریاندا ئەم پێنج شتە:

١- ﴿ٱلطُّوفَانَ﴾ بە چەند شتێك تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام بەهێزترینیان ئەمەیە کە مەبەست بارانو لافاوێکە کە جێو شوێنو کشتوکاڵەکانیانی داگیر کرد.

٢- ﴿وَٱلْجَرَادَ﴾ کولە بۆ خواردنی لەوەڕو کشتوکاڵەکانیان.

٣- ﴿وَٱلْقُمَّلَ﴾ ئەمیش بە چەند شتێك تەفسیر کراوەتەوە بەهێزترینیان ئەمەیە کە مەبەست ئەو ئەسپێو کرمەیە کە پەیدا ئەبێ لە دانەوێڵەو ئەیخواتو لەکاری ئەخات.

٤- ﴿وَٱلضَّفَادِعَ﴾ قورپاقەکان.

٥- ﴿وَٱلدَّمَ﴾ خوێن.

ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾

---

**خوا ئەو موعجیزەو بەڵگەیانەی نارد کە زۆر ڕوون‌و ئاشکرا بوون لەسەر پێغەمبەرێتی موسا (علیە السلام) وەك فەرمووی: ﴿ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ﴾ ئەو پێنج شتەی نارد بە بەڵگەو موعجیزەیەکی ڕوون‌و ئاشکرا کە هیچ ژیرێك گومانی نیە لەوەدا کە موعجیزەیەکی خواییں، نەك جادوو چاوبەست بن ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ کەچی خۆیان بە گەورەو بە زل زانی لەوەی لەوەی کە بڕوایان پێ بهێنن، ﴿وَكَانُواْ قَوۡمًا مُّجۡرِمِينَ﴾ ئەوانە گەل‌و کۆمەڵێکی تاوانبار بوون، ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ﴾ کاتێ ئەو سزای کە باسکرا بەسەریان هات ﴿قَالُواْ﴾ ئەیان گوت ﴿يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ئەی موسا نزا بکە بۆمان لە پەروەردگارت ﴿بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ﴾ بەو عەهدو پەیمانەی کە کردی‌و بەستی لای تۆ، واتە پێغەمبەرێتی، ناوی برد بە عەهدو پەیمان، چونکە خوا پەیمانێداوە کە ڕێزی پێغەمبەران بگرێ بە پێغەمبەرێتیەکەیان، ئەوانیش پەیمانیان داوە کە هەڵسن بە ماف‌و ئەرکی پێغەمبەرێتیەکەیان، یان لەبەرئەوەی پێغەمبەرێتی چەند مافێکی هەیە پێویستە پارێزگاری بکرێ، واتە نزا بکە لای پەروەردگارت، پێغەمبەرێتیەکەت بکە بە وەسیلە بۆ وەرگرتنی نزاکەت، ئەو داوایانکرد لە موساو لە پاشان گوتیان: ﴿لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ﴾ پەیمان بێت ئەگەر تۆ ئەو سزامان لەسەر لابەری‌و نەیهێڵی ﴿لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ﴾ کە بڕوات پێ ئەهێنین‌و لەبەر تۆ ﴿وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئیسرائیلیەکانت لەگەڵ ئەنێرین، هێندێ ئەفەرمون: (ب) لە پەیمانەدا پیتی سوێندە، واتە سوێند بەو عەهدو پەیمانەی کە خوا**

کردی‌و بەستی لای تۆ. هتد، ئەمەش هەر ئەگونجێ، بەڵام باری یەکەم کە کردمان بە تەفسیر دڵ باشتر وەری ئەگرێ‌و لە دڵدا جێگیر ترە، ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ ﴾ ئینجا کاتێ کە سزاکەمان لابرد لێیان ﴿إِلَىٰ أَجَلٍ هُم بَالِغُوهُ ﴾ تا ماوەو کاتێك کە پێی ئەگەیشتن ئیتر دوای ئەوە سزای تەواو ئەدرێن‌و لەناو ئەبرێن، کاتێك سزاکەمان لێنەئەهێشتن‌و لائەبرا: ﴿إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾ ئیتر دەست بەجێ پەیمانەکەیان هەڵئەوەشاندەوەو پاشگەز ئەبوونەوە لەوەی بەڵێن‌و پەیمانیان پێدا. پێویستە بیرێك بکەینەوە لەوەی کە نەفامەکانی سەردەمی فیرعەون ئەهوەن تر بوون لە نەفامەکانی تازەو چەرخی بیستەم، ئەوەتا ئەوان لەکاتی تەنگانەدا پەنایان ئەبرد بە موسا کە نزا بکاتە لای خوا بۆ چارەسەرکردنیان، فیرعەون‌و کاربەدەستەکانی جڵەوگیریەکان نەئەکردن لەوە، ئەوپەڕی کاریان ئەوە بوو پاشگەز ئەبوونەوە، بەڵام نەفامەکانی تازە کە تەنگی‌و تەنگانەیان بەسەر بێت نایانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە هیچ ڕەنگ! ئەگەر کەسێکیش ببینن کە لەو جۆرە کاتانەدا بگەڕێتەوەو پەنا بهێنێ بە خوا، ئەوانەی کە خۆیان بە زانا دائەنێن‌و بەوە ناوئەبرێن پێ‌ی ئەڵێن: بیرو باوەڕو بۆچوونەکەتان شتێکی بێ‌جێیەو پڕوپووچە، ئەیانەوێ ئەو کەسە بگێڕنەوە بۆ بێ‌بڕواییەك کە بۆگەن ترو پیس ترە لە بێ‌بڕواییەکەی بت پەرستان! ئینجا دواڕۆژو سەرەنجامی کارو کردەوە بەدەکانیان باس ئەکات، بە پێی باوی خوا لە قارگرتن‌و تۆڵە سەندن لە بێ‌بڕواو سەرکێشەکان لەپاش تاقی کردنەوەیان بە زیان‌و سزا، بە خۆشی‌و کامەرانی، کە ئەو باوەیش بەمە بووە ستەمکارو سەرکێشەکانی لەناو بردووەو چەوساوەو ژێردەستەکانی زاڵ کردووەو شادی کردوون بە جێ‌و شوێنی خۆ بەزل زان‌و سەرکێشەکان،

فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا

**ئەفەرموێ: ﴿فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ﴾ ویستمان تۆڵەیان لێ بسێنینەوە، یان تۆڵەمان لێسەندن ﴿فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ﴾ بەم ڕەنگە نوقمانکردن‌و خنکاندنمان لە دەریادا، بە یەك لێدان‌و دەست وەشاندن ئەوانە لەناو چوون، لە لوت بەرزی‌و خۆ بە گەورەو خۆ بە زل زانیەوە سەرشۆڕو ڕیسوا بوون‌و کەوتنە ناو چاڵی قوڵی دەریا ﴿بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ بەهۆی ئەوەی بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکان‌و موعجیزە ئاشکراکانی ئێمەو بەدرۆیان دانان، ﴿وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ﴾ ئەوانە بێ‌ئاگا بوون لێیان، واتە گوێیان پێ‌نەدان‌و باسیان نەکردن ﴿وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا﴾ ئەو گەل‌و تاقمەی کە لەوەو بەر بە هەمیشەیی ئەچەوسێنرانەوەو زەبوون‌و ژێردەستکرابوون، واتە ئیسرائیلیەکان کە فیرعەونیەکان کردبوونیان بە بەندەی خۆیان‌و کوڕەکانیان سەر ئەبڕین‌و خزمەتکاری‌و کارەکەریان ئەکرد بە ئافرەتەکانیان، بەخشیمان بەو گەلە زەبوونە ڕۆژهەڵاتەکانی زەوی‌و ڕۆژئاواکانی، واتە هەموو بەش‌و ناوچەکانی زەوی‌و ئەو گەلەمان گێڕا بە جێ‌نشین‌و کەلەپوور بەری ئەو خاك‌و وڵاتەو شادومانمان کردن بەو خاك‌و زەویەی ﴿ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا﴾ کە پیت‌و فەڕمان تێ‌خستبوو، واتە خاك‌و وڵاتی شام وەك (حسن‌و قتادەو زەیدی کوڕی ئەسلەم) ئەفەرمون: یان شام‌و میسر وەك هێندێ تر ئەفەرمون، یان میسر کە جێ‌و شوێنی پادشایەتی فیرعەون بووە، مەبەست بە بەخشینی میسر ئەوەیە کە خوا لە پاشان خستیە ژێر دەست‌و تەسەروفی ئیسرائیلیەکان، ئیتر با نەگەڕابنەوە بۆ ئەو وڵاتی میسرەی کە لە پێشەوە تێیدا بوون، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بەخشین‌و پێدانە بەوەی ئەو چەوساوانە کە لە چەرخی (داود)دا کەوتە ژێر دەستیان، وەك لەسەر ئەم بارە هێندێکی تر ئەفەرمون: مەبەست بە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاواکانی هەموو زەویە کە کەوتە ژێر دەستی ئیسرائیلیەکان لە چەرخی (داود و سولەیمان)دا، ئەم ڕایانە هەن بەڵام دڵ بۆ ڕای یەکەم باشتر ئەڕوا وەك چەند ئایەتێکی تریش وا نیشان ئەدەن لە چەند سورەتێکی تردا،**

وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾

---

**﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ وتـەی چـاك‌و شـیرینی پـەروەردگارت تێپـەڕی كردو بەدی هات‌و دامەزرا بە تێرو تەواوی بەسەر نەوەكانی ئیسرائیلەوە، واتە ئەو بەڵێن‌و بڕیارەی كە دای پێیان بە یارمەتیدان‌و سەرخستن‌و زاڵكردنیان لەسەر زمانی موسادا (علیە السلام) وەك لە ئایەتی (١٢٩)دا تێپەڕی كرد ﴿بِمَا صَبَرُوا۟﴾ بەهۆی ئارامی‌و خۆگرییان لەسەر ئەو تەنگی‌و تەنگەتاوی‌و ناڕەحەتییانەی كە چەشتیان لەسەر دەستی فیرعەون‌و دەستەو بەستەكەیدا ﴿وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ﴾ وێرانمان كردو لەناومان برد ئەوەی كە فیرعەون‌و گەلەكەی كردیان‌و بەكاریان هێنا لە خاكی میسردا لەو هەموو كۆشك‌و قەسرو قسورانەی كە بەناوبانگن، هەروەها ئەو هەموو خراپەكاری‌و پیلانەی كە بەكاریان ئەهێنا بۆ موسا و بڕواداران ﴿وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ﴾ ئەو باخات‌و كەپرو هەرزاڵانەی كە دروستیان ئەكردن وەك لە فەرموودەی (حسن)ەوە وەرئەگیرێ، یان ئەو كۆشك‌و منارانەی كە بەرزیان ئەكردەوە وەك (مجاهد) ئەفەرموێ. تا ئێرە باسی داستانی موسا بوو لەگەڵ فیرعەون و كۆمەڵەكەی. ئامۆژگاری بەو جۆرو شێوەیە لەناوچوون‌و وێران كردنی ستەمكارو سەركێشانی خستە بەرچاو لەگەڵ شێوەی زاڵكردن‌و شادومانی چاكان‌و پاكان، بەڕاستی ئەو دوو شێوەیە وەك وێنەو چیرۆكێكی نایاب وان بۆ ئەو تاقمە كەمەی بڕواداران كە لە مەككەدا بوون، دەربەدەرو سزادراو بوون لەلایەن بت پەرستانەوە، هەروەها هەموو تاقم‌و كۆمەڵێكی وێنەی ئەوان كە دووچار بووبن بە دەست كۆمەڵێكە گەورەی بەدەسەڵاتی سەركێش بە وێنەی فیرعەون‌و گەل‌و كۆمەڵەكەی، پێویستە دەستەی چاكان‌و پاكان نەترس‌و ئومێدەوار بن‌و باكیان نەبێ لە هێزی سەركێشان، ئەمەی كە تێپەڕی كرد بەشێك بوو لە داستانی موسا لەگەڵ فیرعەون‌و گەلەكەیدا، ئینجا لەپاش ئەوە دێتە سەر بەشێكی گەورە لە داستانی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە لەگەڵ گەلەكەی خۆی، داستانی پێشووی كۆتایی هێنا بە لەناوچوونی فیرعەون‌و گەلەكەی كە لە ناوچوونەكەیان بە نوقم كردن‌و خنكاندنیان بوو لە دەریادا،**

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾

---

ئینجا لەم استانی دووەمەدا دەست پێ‌ئەكات بە ڕزگار بوون‌و تێپەڕكردنی بڕواداران لەو دەریایە، ئەفەرموێ: ﴿وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ﴾ تێپەڕمانكرد بە ئیسرائیلیەكان‌و پەڕاندنمانەوە لەو دەریایەی كە فیرعەون ئەوانی تێدا خنكان، ﴿فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ﴾ لەپاش پەڕینەوە كە ڕابوردن بەلای گەل‌و كۆمەڵێكدا كە ﴿يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ﴾ كە نیشتەجێ‌و دامەزراو بوون لەسەر چەند بتانێكەوە كە بوویان، واتە لەسەر پەرستنیان، ئینجا كاتێ نەفامەكانیان ئەوەیان بینی: ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَى﴾ گوتیان بە موسا: ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ﴾ بت‌و پەرستراوێكمان بۆ بڕیار بدەو دیاری بكە، هەرچۆنێ هەیە بۆ ئەوانە چەند بت‌و پەرستراوێك، سروشتی ئیسرائیلیەكان هەر ئاوا لاوازو بێ‌بار بووە، ئەگینا چۆن ئەبێ خەتەرەو خەیاڵیان بچێ بۆ شتی ئاوا بەدو ناپەسەند، بەتایبەتی لە پاش ئەوەی ئەوانە لە بنەماڵەیەكی ئایینی‌و خواناس‌و خواپەرست بوون، لە پاش ئەوە موسا (علیە السلام) ماوەیەكی زۆر هەوڵ‌و تەقەلای لەگەڵدان‌و فێری خواپەرستی كردن‌و ئەو هەموو موعجیزە گەورانەی نیشاندان؟! بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمان بوون لەبەر ئەوە بە تەواوی بە نەفامی دەركردن‌و بە سەرسوڕمانەوە ﴿قَالَ﴾ پێی فەرموون: ﴿إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴾ بەڕاستی ئێوە كۆمەڵێكی نەفامن‌و هیچ نازانن!

لەپاش ئەوەی كە بە نەفام‌و نەزان دەریكردن، ئینجا بەجۆرێكی شیرین بۆیان ڕوون ئەكاتەوە كە داواكەیان زۆر ناڕاست‌و بێ‌جێیە بەم بەڵگەیە كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ بێ‌گومان ئائەوانەی كەوان بەدیاری ئەو بتانەوە ﴿مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ﴾ ئەوەی ئەوانی تێدایە شتێكی لەناوبراوی وێرانكراوە، واتە ئەو ئایینەی كەئەوانی لەسەرەو گرتویانەتە ئەستۆی خۆیان خوا لەناوی ئەبات‌و ناهێڵێ لەسەر دەستی مندا بەئایینی ڕاست‌و ئەو بتانی ئەوانە

ناهێڵێ و پارە پارەی ئەکات ﴿وَبَطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ هەر کردەوەیەك کە ئەوانە ئەیکەن نامێنێ و بەبێ سەروشوێن ئەڕوا. بێگومان ئەو ئیسرائیلیانە ئەو بتانەیان بە خوای ڕاستەقینە دائەنا واتە داهێنەرو ڕۆزی دەر بەڵکو ئەوە نەفامی و نەزانیەك بوو کە دەقی پێوەگیرابوو لە چەرخی فیرعەونەوەو ئەمانەش لەوانە فێری بوو بوون، وەك لەچەرخی فیرعەوندا کە فیرعەون لافاوی خوایەتی لێئەداو کەچی خۆشی و ئەو بتانەشی هەبووە وەك قورئان بۆمان باس ئەکات لە زمانی کۆمەڵەکەیەوە کەئەیانگوت: ﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ﴾ جائەو ئیسرائیلیانە خواپەرستی ڕاستەقینەیان لەبیرچوو کە موسا (علیه السلام) فێری کردبوون، تائەو ڕادەی داوایان لە موسا ئەکرد کە بتیان بۆ دابنێ! ئەگەر خۆیان بتیان بۆ خۆیان دابنایە کەمتر جێگەی سەرسوڕمان بوو لەوەی کە داوا لە موسا بکەن!! موسا (علیه السلام) لەو قسەو داوای ئەوانە زۆر زویرو ناڕەحەت بوو لەبەرئەوە زۆر بە سەرسوڕمانەوەئەم پرسیارەی ئاڕاستە کردن و بێزاری دەربڕی لەوەی کە چاکەو بەهرەکانی خوایان لە بیرچوو داوای هاوبەشیان ئەکرد بۆ خوا، بەم ڕەنگە: ﴿قَالَ﴾ پێی ئەفەرموون: ﴿أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَـٰهًا﴾ ئایا بێجگە لە خواو غەیری خوا نیازبکەم و داوای بکەم بەپەرستراو لەکاتێکدا ﴿وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ کەئەو باوی ئێوەی داوە بەسەر جیهانیاندا، واتە جیهانیانی ئەم سەردەمەو چەرخی خۆتانە، یان هەموو جیهانیان سەبارەت بەو موعجیزە گەورانە کە تایبەتی کردن بە ئێوەوە؟ واتە ئایا غەیری خوا کە بەهیچ ڕەنگە شیاو شیاوو شایستەی پەرستن نیەو هیچ مافێکی نیە بەسەرتانەوە دایبنێم و بیگرم بەپەرستراو بۆ ئێوەو وازبێنم لە خوا کە هەر ئەو شیاوو شایستەیە بۆ پەرستن و چاکەو بەهرە رزی هەیە بەسەر ئێوەوە، واتە نەخێر هەرگیز شتی وا ناکەم و ئەو پەڕی بێزاری دەردەبڕم لەو داوای ئێوەیەو سەرم سوڕئەمێنێ لەو داواو قسەی ئێوەیە، ئینجا بەبۆنەی ئەو چاکەو بەهرەیەی کە موسا خستیەوە بیری ئیسرائیلیەکان و سەرزەنشتی پێکردن، بەو بۆنەیەوە پەروەردگار لەلایەن خۆیەوە چاکەو بەهرەی تریان ئەخاتەوە بیرو سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆلای چاکەو بەهرەیەك کە ئامادەو حازرو بزربووە لە هەست و هۆشیاندا،

وَإِذْ أَنجَيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَـٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَـٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَـٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَـٰرُونَ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى

---

**ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَنجَيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ ﴾ باس و یادی ئەوکاتە بکەن کەئێمە ئێوەمان ڕزگارکرد لەدەستەو بەستەکەی فیرعەون لەکاتێکدا ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾ پێیان ئەچەشتن و ئەیاندا بەسەرتاندا بەدی و سزای بەد کەئەوەش ئەمە بوو﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ ﴾ بەزۆری کوڕەکانیان ئەکوشت﴿وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ﴾ ئافرەتەکانیان ئەهێشتەوە، کوڕەکانیان ئەکوشت تا پیاویان کەم بێتەوەو بەرەبەرە بەرەو نەمان بڕۆن، بەئاسانی ژێردەست و زەبون بکرێن، ئافرەتەکانیان ئەهێشتەوە بۆ کارەکەری و ئابڕووبردنیان کە ئەوەش بەدترین سزایە لەم جیهانەدا، ﴿وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ لەو ڕزگارکردنەتاندا چاکەوبەرەیەکی گەورە هەبوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە یان لەو کوشتنی کوڕان و هێشتنەوەی ئافرەتاندا بەڵاوسزایەکی گەورە هەبو لەلایەن پەروەردگارتانەوە، یان لەو هەردوو شتەدا تاقی کردنەوەیەکی گەورە هەبوو، تاقی کردنەوە بە خۆشی و کامەرانی، تاقی کردنەوە بە سزاو ناخۆشی، کە کەم کەس لەو دوو تاقی کردنەوەدا دەرئەچێ، کەواتە ئەو دوو بەسەرهات و ڕووداوە گەورەیە هەروا بە ڕێکەوت و گزاف بەدی نەهاتن، بەڵکو بە تەگبیر بوون و مەبەستی گەورە بوون.**

**قۆناغی یەکەم دوایی هات لەو کارو فەرمانەی کە موسای پێڕەوانە کرا کە بریتی بوو لە ڕزگار کردنی ئیسرائیلیەکان لە سزاو ئەشکەنجەو دەرکردنیان لە وڵات و خاکی ڕیسوایی و ژێردەستەیی و خستنیان بۆ سەر ڕێگەی سەرفرازی و سەربەرزی و بردنیان بەرەو وڵاتی پیرۆزی قودس، بەڵام ئەو گەلە هێشتا ئامادەییان تێدا نەبوو بۆ ئەو کارو فەرمانە بەرزو پیرۆزەی کە مەبەست بوو بۆ هەڵسانیان پێی، کاروفرمانی جێنشینی لەخاك ووڵاتی خوادا،**

لەسەر ئاین وبەرنامەی خوا، قورئان بۆی دەرخستین کە چۆن ئەوانە بەهۆی تێکەڵی و ژێردەستەییان بۆ فیرعەون و کۆمەڵەکەی، دەروونیان تێك چووبوو، بت پەرستی کاری کردبوو لێیان، تا ئەو ڕادەی داوای بتیانکرد لە موسا، لەبەرئەوەی ئەو تاقمە بتپەرستەیان بینی، باوەڕی خواپەرستی ڕاستەقینەیان لێ ون بووبوو لەگەڵ بینینی ئەو هەموو موعجیزە گەورانە، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵو تەقەلاو پێگەیاندن و پەروەردە کردنەی کە ئەو پێغەمبەرە گەورە پێی هەڵسا دەربارەی ئەو گەلە کە لە نەوەی پێغەمبەران و خواپەرستان بوون! کەواتە پێویست بوو بە پەیام و شەریعەتێکی تێرو تەواوو ڕوون و ڕەوان کە ئەو گەلەی پێ پەروەردە بکرێ تا بتوانن هەڵسن بە فەرمانی جێنشینیەکەیان، جا لەبەر بەخشینی ئەو پەیام و شەریعەتەو وەرگرتنی، خوا بەڵێنی دا بە موساو کاتی بۆ دیاری کرد کە لە پاش ئەو ماوەیە بچێتە ئەو شوێنەو پەیام و شەریعەتەکەی وەرگرێ، ئەو ماوەش لە پێشەوە سی شەوو ڕۆژ بوو، لە پاشان دەی تری لێ زیاد کرا تا بوو بە چل، تا لەو ماوەیەدا موسا (علیه السلام) کەنارگیر بێ لە هەر شتێ کە خەریکی بکات لە خواو لە یادی خوا، بە تەواوی لێ ببڕێ و هەر خەریکی خواپەرستی و خۆ ئامادەکردن بێ بۆ وەرگرتنی تەورات و ئەو پەیام و شەریعەتە گەورەیە، وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةً﴾ واتە بەڵێنمان دا بە موساو ماوەی سی شەومان بۆ دیاری کرد بۆ موناجات و خەریك بوون هەر بە خواپەرستی و کەنارگیری و دوور کەوتنەوە لە ئیسرائیلیەکان، ﴿وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ﴾ ئەو سی شەوەمان تەواو کرد بە دە شەوی تر واتە دەی ترمان خستە سەر ﴿فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ﴾ بە هۆی ئەوەوە تەواو کاتی دیاری کراوی پەروەردگاری بە گەیشتنی بە چل شەو، واتە ئەو کات و ماوەیە کە خوا دینابوو بۆ ئەوەی پاش تەواو بوونی گفتوگۆی لەگەڵ بفەرموێ و تەوراتی پێببەخشێ، ئەو کات و ماوەیە تەواو بوون و تێپەڕکردنی چل شەو بوو، ئینجا کاتێ کە گەیشتە شاخی تور مایەوە تا سی ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو، مانگی ذي القعدة، لەپاش دە ڕۆژی مانگی قوربان کە بەوە چل شەوەکە تەواو بوو، ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ﴾ موسا کاتێ ویستی ڕێکەوێ بەرەو شاخی تور فەرمووی: ﴿لِأَخِيهِ هَٰرُونَ﴾ بە براکەی کە هارون بوو: ﴿ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي﴾ ببە بە جێنشینم لەناو گەلەکەمدا لە چاودێری و سەرپەرشتیدا، هەرچەند هارونیش هەر فروستادەو نێرراو بوو، بەڵام موسا سەرۆك بوو،

وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾

---

**لەبەر ئەوە بەو جۆرە فەرمانی بۆ دەرکردو فەرمووی: ﴿وَأَصْلِحْ﴾ چاك بکە ئەوەی کە پێویستیان هەیە بە چاك کردنی لە کارو باری ئایینیان، یان ببە بە چاك کەرو ڕێکخەرێك لە ناویانداو لە نێوانیاندا ﴿وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ شوێنی ڕێگەی تێك دەران و خراپە کەران مەکەوە، واتە بەشداریان مەکە لە کردەوەکانیانداو کۆمەکییان مەکەو لەگەڵیان هەڵسان و دانیشتن مەکە لەکاتی کردن و هەڵسانیان بەو کردەوە بەدانەی کە ئەیکەن.**

**ئینجا بەسەرهات و ڕووداوێکی تاقانەی کەس نەدیو ئەخاتە بەرچاو کە خوا موسای پێوە تایبەتی کرد، ڕووداوی بەسەرهاتی گفتوگۆی خوا لەگەڵ موسادا یەکسەر لە ڕێوەو بەبێ واسیتەو بەبێ هیچ کەسی تر، بەڵام ئێمە نازانین ئەوە چۆن بووەو چۆن ڕووی داوە، نازانین فەرموودەی گفتوگۆی خوا چۆن بووە لەگەڵ ئەو بەندەیەدا، نازانین بە چ هەستیارو ئەندامێك ئەوەی وەرگرتووە، ئەو جۆرە شتانە لە تێگەیشتن و بۆچوونی ئێمە بەدەرە، کەواتە با بیر لە چۆنێتی ئەو شتانە نەکەینەوەو بەس بڕوای پێ ئەهێنین، ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ کاتێ کە موسا هات بە دەم وادەو بەڵێنەکەوە هات بۆ ئەو کاتەی کە دیاریمان کرد بۆ گفتوگۆو بەخشینی تەورات و شەریعەتەکەی، خوا قسەی لەگەڵ کرد بەو جۆرو شێوەی کە شیاو و شایستەیە بە خواوە، کاتێ کە ئەو بەهرە چاکەو نیعمەتە بێهاوتایە بەدی هات موسا ئومێدی پەیدا کرد بۆ بەهرەیەکی تر، بەهرەی بینینی زاتی پاکی بێ وێنەی خوا، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ موسا گوتی: ﴿رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾ ئەی پەروەردگارم خۆتم نیشان بدە تا سەرنجت بدەمو بڕوانم بۆت، واتە دەسەڵاتدارو توانام بکە بەسەر ئەوەدا کە تۆ ببینم، یا خۆتم بۆ دەرخە هەتا سەرنجت بدەمو بڕوانم بۆت، واتە دەسەڵاتدارو توانام بکە بەسەر ئەوەدا کە تۆ ببینم، یا خۆتم بۆ دەرخە هەتا سەرنجت بدەمو بتبینم بەو جۆرو شێوەی کە**

بگونجێ بۆ من، بەو ئەندازەی کە دەست بدات بۆ من، خۆشیو شادمانیو بەختەوەری ئەو بەهرەیە هەستو گیانو دڵو دەروونی موسای داگیر کرد بە جۆرێ لە خۆشیدا بەبێ بیر لێ کردنەوەو بەبێ پرسو ئیزن خواستن ئەو داوایەی کرد بە ئومێدی ئەوە کە ئەم چاکەو بەهرەیەشی پێببەخشرێ، هەتا پەروەردگار ئاگاداری کرد بە نەگونجانو دەست نەدانی ئەو بەهرەیە لە کاتو سەردەمو ئەم جیهانەداو لە وەڵامدا: ﴿قَالَ لَن تَرَىٰنِي﴾ هەرگیز تۆ من نابینی، واتە لەم جیهانەداو لەسەر ئەم بارو حاڵەی ئێستای کە هەتە، ئینجا دەست نیشانی کرد کە هۆی ئەو نەدیتنەش ئەوەیە کە توانای ئەوەی نیەو دەست نادا بۆ ئەوە، فەرمووی: ﴿وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ﴾ بەڵام سەرنج بدەو بڕوانە بۆ لای شاخەکە، ئیتر شاخی تور بووبێیان شاخی ئوردون یان هەر شاخێکی تر کە لەو دەورە بووبێ، بڕوانە بۆ ئەو شاخە کە من خۆمی نیشان ئەدەم ﴿فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ﴾ جا ئەگەر ئەو شاخە خۆی گرتو جێگیر بوو لە شوێنەکەی خۆیدا، ﴿فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ﴾ تۆش لەمەو پاش من ئەبینی کاتی خۆمم بۆ دەرخستی، ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ﴾ ئینجا کاتێ پەروەردگاری دەرکەوت بۆ شاخەوکە ﴿جَعَلَهُۥ دَكّٗا﴾ ئەو خۆ دەرخستنە شاخەکەی ووردو خاش کردو تەختی کرد بە زەویەوە ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ﴾ موسا کەوت بە ڕوودا بەبێهۆشیو لەهۆش خۆی چوو، وەك (ئیبنو عەباسو حسن) ئەفەرموون. یان بەمردوویيو مرد وەك (قەتادە) ئەفەرموێ ﴿فَلَمَّآ أَفَاقَ﴾ ئینجا کاتێ هۆشی هاتەوەو بیریکردەوە لە خۆیو ڕادەو ئەندازەی توانای خۆی ناسیو هەستی کرد بەوەی زیادەڕەوی کردووە لە داواکەی، کاتێ کە ئەوەبوو ﴿قَالَ سُبۡحَٰنَكَ﴾ گوتی: پاکی بۆ تۆو تۆ بە پاكو خاوێن دائەنێمو تۆ پاکیو بەرزیو بڵندی لەوەی بەم چاوی جیهانە ئەبینرێی پاكو خاوێنو خاوێن لەوەی وێنەی هیچ کەسو هیچ شتێك ببێ، بەرزو بڵند لەوەی کە من بەبێ پرسو ئیزن داوای هیچ شتێکت لێ بکەم ﴿تُبۡتُ إِلَيۡكَ﴾ ئەوا گەڕامەوەو تۆبەم کرد بۆلای تۆ لەوەی کەلە خۆمەوە بەبێ پرسو ئیزن ئەو داوایەم کرد، تۆبەم کرد لەوەی زیادەڕەویم کرد لەو داوایە کەکردم ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ من یەکەمی بڕوادارانم، واتە بڕوادارانی گەلو ئوممەتەکەی، چونکە هەموو پێغەمبەرێك هەمیشە یەکەمە لە بڕواهێناندا بەگەورەییو بێهاوتایی پەروەردگاری، بەوەی کە پێی ڕەوانەکراوە، لەلایەن خواوە، یان مەبەست ئەوەیە یەکەمیانە لە بڕواهێنان بەوەی کە هیچ کەس لەم جیهانەدا نایبینێ وەك (ئیبنو عەباس) —

خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ. لەسوورەتی ﴿الانعام﴾دا هێندێ دوام لەبارەی بینینی خواوە، بەجوانی ئەزانم لێرەش دا هێندێکی تر بدوێمو دەست نیشان بکەم بۆ چەنج خاڵێك:

١- بەداخەوە ئەم مەسەلەیە وەك زانراوو بەناوبانگە ماوەیەکی دوورو درێژبوو بەهۆی ئاژاوەو دووبەرەکی لەناو ئەم ئوممەتەدا، زۆر لە پیاوانی هونەرمەندی خریك کرد لە مەبەستی سەرەکی وەم ئوممەتە، یەکێ بوو لەو شتانەی کە بووبەهۆی تێکدانی ڕیزو یەکێتی ئەم ئوممەتە.

٢- پێویستە لەسەر ئێمەی موسڵمانی ئەمڕۆ ئەو جۆرە ئاژاوەو دووبەرەکیە لەبیری خۆمان ببەینەوەو هەموو بگەڕێینەوە بۆسەر ڕەوشتی سەلەفی صالحو لە دیمەنو ڕواڵەتی ئایەتو حەدیس لانەدەین بەپێی ڕای سەلەف ئەو جۆرە لێکۆڵینەوە فەلسەفیانە واز لێبێنینو قورئانو حەدیس نەبەستین بە بۆچوونو تێگەیشتنی لاوازو بێ هێزی خۆمانەوە.

٣- ڕای بەهێزکە زۆر بەشی لەسەر ئەمەیە کەبینینی خوا لەم جیهانەدا بۆ هیچ کەس نەبووەو نابێ، تەنانەت بۆ پێغەمبەری ئازیزیش (ﷺ)، بینینێ کە ڕووی دابێ بەچاوی دڵ بووە نەك بەچاوی سەر.

٤- بینینی خوا لە ڕۆژی دوایی دا شتێکی ڕاستەو لە هەموو نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بەرزترو پیرۆزترە، هەرکەس بڕوای بەوە نەبێ ئەوکەسە لە ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام ترازاوەو ڕاو مەزهەبەکەی دژو پێچەوانەی ڕاو مەزهەبی هاوەڵەکانو شوێنکەوتووەکانیانە، دژو پێچەوانەی کۆمەڵو جەماوەری ئوممەتە، بەڵام پێویستە کە بزانین ئەو دیتنە جیاوازە لە دیتنی بەجۆرێکە کە شیاوو شایستەبێت لەگەڵ زاتی پاکی پەروەردگار کە بێوێنەو بێهاوتایەو زانینو بۆچوونو ژیریی ئێمە کەم کورتو کولە لەئاستی، هەروەها هەموو سیفەتو کاروباری پەروەردگار لە بۆچوونو زانینی ئێمە بەردەر نابێ بەپێی زانینو ژیریی کەمو کورتی ئێمە هەڵیان سەنگێنینو بەراوردیان بکەین.

٥- دیتنی خوا لە خەودا ڕاستەو ڕوی داوە بۆ زۆر کەسو چەند حەدیسێکیشی لەسەرە، بەڵام دیارە ئەو بینراوەش شتێکی خەیاڵیەو دیارە دوورە لە خوای بێوێنەوە.

قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَـٰلَـٰتِى وَبِكَلَـٰمِى فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ

**ئینجا بابێینەوە سەر ئایەتەکان و بێینەسەر بەهرەیەکی تر کە خوا بەخشی بە موسا (علیه السلام)،بێینەسەر باسی میهرەبانیەکی تری خوا بە موژدە پێدانی بە هەڵبژاردنی و بیرخستنەوەی ئەو بەهەرەیەو بەهرەی پەیام و گفتوگۆ لەگەڵ کردنی لەگەڵ پەندو تەمێ بە سوپاس کردنی ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ خوا پێی فەرموو ﴿يَـٰمُوسَىٰٓ﴾ ئەی موسا ﴿إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بێگومان من تۆم هەڵبژاردو باوم دای بەسەر مەردوماندا، واتە مەردومانی چەرخی خۆی ﴿بِرِسَـٰلَـٰتِى﴾ بەتاکیش خوێندراوەتەوە ﴿بِرِسالَتِي﴾ واتە بە فروستادەیی و پەیامەکانم یان بە فروستادەیی و پەیامەکەم، بە کۆ بە گوێرەی پێنج بەشەکەی تەورات کە پێیان گوتراوە: (أسفار) یان بەپێی ئەوە کە پێی ڕەوانە کرا چەند بەش و پارچەیەکە: بەش و پارچەی بیروباوەڕو عەقیدەو عیبادەت و ڕامیاری و جەنگ و شتەکانی تر کەلەو شەریعەتە گەورەیەدا بووە، بەتاکیش بەپێی ئەوەی بە هەموو جۆرو بەشەکانەوە کە یەك پەیام و شەریعەتە ﴿وَبِكَلَـٰمِى﴾ هەڵمبژاردی بە گفتوگۆ کردنم لەگەڵم لەڕێوەو بەبێ هۆی هیچ کەسێکی ترەوە ﴿فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ﴾ کەواتە ئەوەی کە پێم بەخشیت وەری گرە، واتە ئەو بەهرەو چاکەی هەڵبژاردنە ﴿وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾ لە سوپاس کارانبەو بچۆرە ڕیزی ئەوانەی کە سوپاسی خوا ئەکەن بەدەم و بە زوبان و بەکردەوەی ئەندامەکانیان کە سوپاس بریتیە لەوە، ئینجا باسی ئەو پەیامە ئەفەرموێ و چۆن بەخشرا بە موسا چەند لەوحێك، ئەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ﴾ ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە:**

**١- واتە بەخشیمان بە موسا چەند لەوحێك، نووسیمان بۆی لەو لەوحانەدا لە هەر جۆرە شتێك کە پێویستیان هەبیت پێی لە حەڵاڵ و حەرام و چاك و خراپ،**

مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ

---

**﴿مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ واته نوسیمان بۆی پەندو ئامۆژگاریو باس کردن بە ڕوونی بە جیا جیاو بەبێ تێکەڵیو باسی هەموو شتێ کە پێویستیان هەبێ پێی.**

**٢- نووسیمان بۆی لەو لەوحانەدا لە هەموو جۆرە شتێ کە پێویسیان هەبێ پێی لەبەر پەندو ئامۆژگاریان، لەبەر باس کردن بۆیان بەڕوونی بە جیا جیاو تێکەڵ کردن، باس کردنی هەموو شتێ کە پێویستیان هەبێ پێی.**

**٣- نووسیمان بۆی لە هەموو جۆرە شتێ کە پێویستیان هەبێ پێی لەبەر پەندو ئامۆژگاری، نووسیمان بە ڕوونی بۆی هەر شتێك کە پێویستیان هەبێ پێی.**

**بێجگە لەمانە تەفسیریش کراوەتەوەو هەموو دەست ئەدەن بەڵام لە دڵمدا دووەم بەهێزترە، ئینجا بێدەنگ ئەبین لە چۆنێتی ئەو لەوحانەو ژمارەیان، چونکە قورئان بێدەنگە لەوەو حەدیسێکی صەحیحیشمان دەست نەکەوت لەو بارەیەوەو زۆر شتیش گوتراوە کە ئاشکرایە لەو ئیسرائیلیاتانەیە کەبوون بەلەکەو چەپەڵیەك بەڕوونی ئەو کتێبانەی کە تیایاندا نوسراونەتەوە، کەواتە باهەر بێدەنگ بینو هەر شوێنی ڕووکەشو ڕواڵەتی ئایەتەکە بکەوین بەس ئایا ئەو لەوحانە تەوراتیان تێدا نوسرابێتەوە یان لە پێش تەوراتەوە هاتبێ؟ وا دەرئەکەوێ کە ئەکەمو بناغەی سروش بووبن لەبارەی یاساو شەریعەتەوە بە شێوەی کورتیو بنەڕەت بووبن بۆ تەورات بە شێوەی کورتیو لەپاشان هەموو یاساو بڕیارەکان بەرەبەرە هاتبنو خوای گەورە لەکاتی پێویست دا ناردبنی وەك قورئان، لەسەر هەر بار ئەوەی لەو لەوزحانەدا بووبێ زۆر گەورەو گرنگ بوون لەبەرئەوە پێی فەرموو ﴿فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ﴾ بیان گرەو وەریان بگرە بە گرنگیو بە عەزمو ئیرادەیەکی بەهێز ﴿وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ﴾**

فەرمان بدە لە گەلەکەت تا دەست بگرن و ڕەفتار بکەن بەوەی لەو لەوحانەدایە کە هەموویان زۆر چاکن و تێرو تەواون لەچاکی و شیرینیدا با دەست بگرن و ڕەفتارو ڕەوشت بکەن بە چاکترو شیرین ترەکانیان، وەك فەرزەکان کە چاکترن لە تۆڵەسەندن، هەروەها ئەو فەرمانەی داو لەپاشان فەرمووی: ﴿سَأُوْرِيكُمْ دَارَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ لەپاش نیشانتان ئەدەم و زانا و ئاشناتان ئەکەم بەجێ و شوێنی یاخی و سەرپێچی کەرەکان و لە فەرمان دەرچووەکان، ئەم فەرموودەیە هەڵئەگرێ بەڵێن و موژدەبێت بەوانەی کە فەرمان بەرو گوێڕایەڵن، لەسەرباری یەکەم. واتە ئەگەر ئەوەی لەو لەوحانەدایە بە گرنگ نەیان گرن و ڕەفتاریان پێنەکەن ئەوا یاخی سەرپێچی کەران ئەبن لە فەرمانی پەروەردگارتان، ئەو کاتە ئێوەش دووچار ئەبن و وێنەی ئەو سزاو ئازارو لەناوچوونەی کە ڕوویداو هات بەسەر یاخیەکانی فیرعەون و گەلەکەی بەسەر ئێوەش دێت، یان یاخی و سەرپێچی کەرانی لە دانیشتوانی وڵاتە پیرۆزەکەی قودس و فەلەستین، لەسەر باری دووەم: واتە گوێڕایەڵ بن و ڕەفتار بکەن بەوەی کەلەو لەوحانەدایە منیش بەرامبەر ئەوە جێ و شوێنەکانی ئەوانەتان نیشان ئەدەم پێتان ئەبەخشم و ئەتانکەم بە جێنشین و کەلەپوربەری ئەوان، هەردوو شتەکەش بەدی هاتن بۆ ئیسرائیلیەکان، تا لەڕێگەی ڕاستی خوا لایاندا، خوا دوژمنی بەسەردا زاڵکردن، تالەسەر ڕێگا ڕاستەکەی خوابوون، خوا زاڵی کردن بەسەر دوژمنداو ئەمانی شادکرد بەجێ و شوێنەکەی ئەوان، ئیتر با لە چەرخی موسایشدا ئەوە بەدی نەهاتبێ ئەم فەرموودەیە بە دوو جۆری تریش تەفسیرکراوەتەوەو:

١- مەبەست بە جێ و شوێنی یاخیەکان جێ و شوێنی عاو سەمودو ئەو میللەتانی ترەیە کە بەهۆی یاخی بوونیان لە فەرمانی پێغەمبەرەکانیان خوا لەناوی بردن و شوێنەواری وڵاتە وێرانەکانیان مایەوەو بینران، واتە ئەگەر گوێڕایەڵ نەبن وەك ئەوانتان لێئەکەم.

٢- مەبەست دۆزەخە، واتە ئەگەر گوێڕایەڵبن و بەردەوام بن لەسەر سەرکێشی و یاخی بوون تا ئەمرن، ئەو کاتە دۆزەختان نیشان ئەدەم و بەو ئاگرە ئەتان سوتێنم، لەسەر ئەم دووبارەش مەبەست ترساندنیانە.

لەسەر هەر بار ئەوە باوێکە لە باوو ڕەوشتەکانی خوا لەم جیهانەدا کە هەرکات بەندەکانی خوا بەرنامەی خوایان هەڵبژاردبێ و ڕەفتاریان پێکردبێ خوا بەختەوەری کردوون

لە هەردوو جیهاندا، هەرکاتێ بەرنامەکانی تریان هەڵبژاردبێو ڕەفتاریان پێکردبێ خوا دووچاری کردوون هەر لە جیهانیشدا ئیتر زۆری پێچووبێ یان کەم بێجگە لە دووچار کردنی ڕۆژی دواییان، ئەوەتا بینرا کە ئەم ئوممەتە قورئانو شەریعەتەکەی خوایان بە توندیو بە گرنگی گرت خوا کردنی بە سەرۆكو مامۆستای جیهانو ئادەمی، کاتێ کە وازیان هێنا لە ڕەفتار کردن پێی خوا ئەوەی بەسەر هێنان کە بە چاو ئەبینرێ، هەر سەرشۆڕو ڕیسوا ئەبن تا نەگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگە ڕاستەکەی خوا وەك یەکەم جار، بە تەنیا خوێندنو دەنگ لەراندنەوەو لەبەر هەڵسانو ماچ کردنی، خوا وازیان لێناهێنێو بەهرەمەند نابن بە پیتو فەڕی ئەو قورئانو شەریعەتە بێ وێنەی، خوا بە میهرەبانی خۆی ئەم ئوممەتە لە خەوی بێئاگایی خەبەر بکاتەوە.. ئامین، ئینجا باسی دواڕۆژی ئەوانە ئەکات کە بە ناهەق خۆیان بە گەورە دائەنێنو نیشان ئەدەن لە وڵاتدا، ڕوو وەرئەگێڕن لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی خواو پەندو تەمێکانی، لەم باسەدا بە وردی شێوەی سروشتی ئەوانە ئەکێشێو ئەیخاتە بەر چاو، بەو جۆرە نایابە کەس نەدیوەی قورئان، ئینجا ئەم دوو ئایەتە کە ئەم باسە ئەکەن هەڵئەگرێ سەربەخۆ بنو بە تێهەڵکێش هاتبن بەدویا بەشێ لە داستانو بەسەرهاتی موساداو پێش دەستکردن بە بەشێکی تری کەلەپاش ئەم دوو ئایتەوە دەست پێئەکات، هەڵئەگرێ ئاوا تێهەڵکێش بنو لەئایەتی یەکەمدا خوای میهرەبان باوی خۆی ڕوون ئەکاتەوە بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ) لەبارەی گومڕابوونو بڕوانەهێنانی هێندێ لە موردومان کە گشتییە بۆ گەلە گومڕاو سەرکێشەکەی فیرعەونو سەرۆکە سەرکێشەکانی ئەم ئوممتە، لەئایەتی دووەمدا باسی تۆڵەی ئەو بێبڕواو سەرکێشانە ئەکات، هەڵئەگرێ ئەم دوو ئایەتە بەم جۆرە سەربەخۆو تێهەڵکێش بن وەك دەست ئەدەنو هەڵئەگرن بۆئەوەی هەر لەداستانو بەسەرهاتەکەی موسا بنو تەواوکەربن بۆ ئەو بەڵێنەی کە خوا دای بە موسا (علیه السلام)، بەم ڕەنگە لە ئایەتی پێشودا فەرمووی: ﴿سَأُوْرِيكُمْ دَارَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾و لێرەشدا ئەفەرموێ: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ لائەدەمو بەرگری ئەکەم لە ئایەتەکانم ئەو کەسانەی کە خۆیان بە گەورە دائەنێنو بەناهەق خۆیان بەزلو بەرز نیشان ئەدەن لە وڵاتدا، واتە دڵیان مۆرئەکەم لە ئاستی ئایەتەکانم بەجۆرێ بیریان لێناکەنەوەو سوودیان

لێوەرناگرن، ئیتر ئایەتە بوونەوەرییەکان یان ئایەتە نامەییەکان، ئەوەش وەك چەند جارێك ووترا سوچی خۆیانەو بە خواهیش و هەڵبژاردنی خۆیانە بەبێ زۆر پێهێنان و ناچارکردن کەئەوەش شتێکی ڕوون و ئاشکرایەو هەرکەس هۆشی بەلای خۆیەوە بێت ئەزانێ کە خواهیش و مەیل و کردەوەی خوا لەکاردایە، مەبەست بە تەکەبوور ئەوەیە کە خۆی بەچاکترو گەورەتر بزانێ لە خەڵکی و لای وابێ کە مافێکی تایبەتی هەیە کە بۆ هیچ کەسێکی تر نیە، وەك لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە: (غمط الحق واحتقار الناس) دان نەنانە بە حەق و دانانی خەڵکیە بە سوك و بێ‌نرخ لەچاو خۆیدا، ئەگەر بەم جۆرە مەبەست بێت ئەو کاتە هەر تایبەتیە بە خواوەو سیفەتی خوایە کەواتە دان نەنێ بە حەق و ڕاستیدا، هەموو تەکەبوورێك ناحەقەو هێنانی لە ئایەتەکەدا بۆ تەشەر دانەو تاوانبارکرنی ئەو کەسانەیە کە دەردە دارن بەو نەخۆشیە پیسە، ئەگەر مەبەست هەر دانان و سەرنجدانی خەڵکی بێت بە سوك و بێ‌نرخ ئەو کاتە هەموو تەکەبورێك ناحەق نیە، وەك سەرنجدان و دانانی ستەمکارو تاوانبارەکان بە سوك و بێ‌نرخ، ئەگەر بەو جۆرە مەبەست بێت ئەوکاتە هێنانی ووتەی ﴿بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ بۆ جیاکردنەوەی حەق لە ناحەق، لەسەر هەربار ئەوا خوا ویست و مەیلی خۆی دەربڕی دەربارەی ئەوانەی کەبە ناحەق خۆیان بە زل دائەنێن، سیفەت و نیشانەکانی دەرخستن بەمەی کە ئەفەرموێ:

١- ﴿وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا﴾ ئەگەر ئەوانە هەموو ئایەت و موعجیزەیەك ببینن بڕوای پێناهێنن.

٢- ﴿وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا﴾ ئەگەر ڕێگە چاکەو ڕێنموونی و ئایینی ڕاست ببینن نایگێڕن بە ڕێگە بۆ خۆیان و نایدەنە بەر.

٣- ﴿وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا﴾ ئەگەر ڕێگەی گومڕایی و خراپەو ئایینی چەوت و ناحەق ببینن ئەگێڕن بە ڕێگە بۆ خۆیان و ئەیدەنە بەر.

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾

---

**پاکی و بێگەردی لە هەموو لەکەو ڕەخنەیەك بۆ خوای پەروەردگار هەر خۆی بەندەکانی خۆی ئەناسێ، ئەو جۆرە کەسانە کە خۆ بەزل زانن و ئەو نیشانانەیان هەیە بە ئاشکرا ئەبینرێن باش ئەتوانین دەست نیشانیان بۆ بکەین، خوا پەنامان بدات لەو بەد بەختی و سیاچارەییە تا ئەو ڕادەیە کە لە سروشتی ئادەمێتی ئەترازێن، خوا پەروەردگار ستەم ناکات لە بەندەکانی بەڵکو ئەوان بەدەستی خۆیان خۆیان دووچار ئەکەن وەك ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو خۆ بەزل زانی و بڕوا نەهێنانیان بە ئایەتەکانمان و ڕێگەی گومڕایی دانەبەرو لادان لەڕێگەی ڕاست ﴿بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ بەهۆی ئەوەیە کە ئەوانە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە کە بەڵگەن لەسەر ناحەقی باوەڕو کردەوەکەیان ﴿وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ﴾ ئەوانە بێئاگابوون لەو ئایەتانەو هیچ نرخێکیان پێنەئەداو گوێیان نەبوو لێیان، ئەوانە هەرچەند هەر کردەوەیەکی چاکیان کردبێ هیچ سوودی لێ وەرناگرن لە ڕۆژی دواییدا بەڵکو پاداشتەکەی لەم جیهانەدا دەستکەوتیان ئەبێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ئەوانەی کەلە جیهاندا بڕوایان نەهێنابێ بە ئایەتەکانی ئێمەو گەیشتنیان بە ڕۆژی دوایی ئەوەی کە خوا هەواڵ و بەڵێنی پێداوە، ئەوانە ﴿حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ﴾ کردەوە چاکەکانیان کە بەدیمەن و ڕواڵەت بە چاك و گەورە سەیر ئەکران بە هیچ دەرئەچن و هیچ سوودو نرخێکیان نابێ و دەرئەکەوێ کەهەر ڕووکەش و ڕواڵەتی ڕووت بوون و لەڕاستیدا هیچ نەبوون بە وێنەی ماڵاتێك کە گیایەکی ژەهراوی بخواو بئاوسێ تا بەڕواڵەت بە پڕو گەورە دائەنرێ و کەچی لەناکاوێکدا ئەتەقێ و باو فووەکەی دەرئەچێ و گەورەیی و قەڵەویەکەی وون ئەبێ، ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانە کە کردەوەکانیان ئەوەی بەسەر دێت ئایا جەزاو تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ بێجگە لە جەزاو تۆڵەی ئەو بڕواو کردەوە بەدانەی کە**

هەمیشەیی بوون لەسەری لە جیهاندا؟ واتە نەخێر هەر جەزاو تۆڵەی کردەوە بەدەکانی خۆیانەو شتێکی ڕێك و پێکە لەگەڵ بڕواو کردەوە بەدەکانیاندا، چونکە ئەوانە تەنها کەوتوون و بچراون لەم بوونەوەرە بڕوادارو ملکەچە بۆ پەروەردگار، هیچ پەیوەندیو پەیوەستیان نەماوە پێیەوە، کەواتە ئەبێ هەموو کرەوەکانیان زایە ببێ و نەمێنێ هەرچەند بەدیمەن و ڕواڵەت بەگەورەو بە زۆر سەیر بکرێن، بەوێنەی ئەو ماڵاتەی کەئەو خۆراکە ژەهراویە بخوات و بئاوسێ لە پاشان بتەقێ و باو فووەکەی دەرچێ.

لەپاش ئەو دوو ئایەتە تێهەڵکێشە ئینجا دێتە سەر باسی موساو گەلەکەی، ڕووداوو بەسەرهاتێکی زۆر بەدو دڵتەزێنی ئەو گەلە ئەگێڕێتەوە کە بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾گەلەکەی موسا لەپاش ڕۆیشتنی موسا بۆ شاخی تور بەپێی فەرمان و بەڵێنی خوا گێڕایان و دروستیان کرد ﴿مِنۡ حُلِيِّهِمۡ﴾ لە خشڵ و زێڕو زیوەکەیان ﴿عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ﴾ گوێرەکەیەك،، واتە لەش و قەبارەیەك کە هۆڵەو قوڕەی هەبوو، واتە ئەو خشڵ و زێڕو زیوەیان تواندەوەو شێوەی گوێرەکەیەکیان لێ دروستکرد تابیکەن بە بتێك بیپەرستن، یان ئەڵێن: گەلەکەی موسا لە پاش ڕۆیشتن و جیابوونەوەی موسا لێیان لە خشڵ و زێڕو زیوەکەیان گوێرەکەیەکیان دروستکردو گێڕایان بەبت و پەرستراوی خۆیان، ئەوکەسەی کە ئەو کردەوەی کرد یەکێ بوو لەوان لکە ناوی (سامری) بوو وەك لەدەقی ئایەتێکی تردا هەیە، بەڵام بەکردەوەی هەموانی نیشاندا لەبەر ئەوەی ئەوانی تریش پێی ڕازی بوون، بەڵکو لەسەر داوایشیان بوو کەلەپێشەوە داوایانکرد موسا (علیە السلام)، کەواتە وەك هەموو کردبێتیان وایە، بێجگە لەوەش باوە لە ناو هەمواندا کردەوەی یەکێك لەگەل و کۆمەڵێك بەهینی هەموو نیشان ئەدرێ، ئەوەتا ئەگوترێ فلان گەل و تائیفەو ئەو کردەوەیان کرد لە کاتێکدا یەکێکیان کردبێتیان. ئینجا ئایا ئەوەی کە سامری پێکی هێنا لەو خشڵ و زیوە بووبێ لەگیان لەبەرێکی تەواو وەك زۆربەی زانایان ئەفەرموون، بەم ڕەنگە خوا گیانی تێکردبێ بەهۆی ئەو خۆڵەی جێ سمی وولاخەکەی جوبرەئیل کە سامری لەگەڵ خۆی هێنابووی و کردی بەدەمی دروستکراوەکەیدا، بەڵگەی بەهێزیشیان بەدەستەوە هەیە کەلە سوورەتی ﴿طە﴾دا ئەفەرموێ: ﴿بَصُرۡتُ بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذۡتُهَا﴾ وەك لەو

سوورەتەدا تەفسیریم کرد پێش ئەم سوورەتە. یان وەك دەستەیەك لە زانایانی موعتەزیلە ئەڵێن: ئەو دروستکراوە گیانی تیانەبووە بەڵکو سامری وای دروستکردبوو ناو دەمو سکی بۆش بوو، چەند بۆری و لولەیەکی بۆشی تێدا دانابوو، کاتێ با هەڵیئەکردو ئەچوو بەناو ئەو بۆریانەداو ئەم دەنگەی لێپەیدائەبوو وەك دەنگی گوێرەکە. من خۆم باوەڕم بەڕای یەکەمەو هەرگیز لانادەم لە ڕواڵەتی ئایەتی سوورەتی ﴿طه﴾ هیچ سەرم سوڕنامێنێ لەوەی خوا گیانی کردبێ بەبەریدا بەهۆی ئەوەوە یان بەهەر هۆیەکی تر، بۆ خوا چی تێئەچێت شتی وا بکات؟ چ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەم هەموو لەشە گیانلەبەرانەی کە خوا لە خۆڵ دروستیان ئەکات؟ بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار ئەو سامریە ئەوانەی گومڕاکرد، ئەو نەفامانە ئەو هەموو موعجیزە گەورانەیان بەچاوی خۆیان بینی، موسا (علیه السلام) ئەو هەموو وەسیەت و پەندو ئامۆژگاریەی کردن کەچی سوودی نەبوو بۆیان و بەشتە پڕوپووچەکە هەڵخەڵەتان و بیریان نەکردەوە لەوە کە ئەوشتە بێنرخە کە بە پێش چاوی خۆیانەوە سامری دروستیکرد، ئایا ئەوە کەی شایانی پەرستنە؟ وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ﴾ ئایا ئەوانە نەیان ئەزانی نەیان ئەبینی کەئەوە قسەیان لەگەڵ ناکات و ڕێنموونیان ناکات بۆ هیچ ڕێگەیەك؟ واتە ئایا نەیان ئەزانی کە ئەوشتە ناتوانێ و دەسەلاتی نیە بەسەر قسەکردن و ڕێ نیشانداندا کە کەمترین مرۆڤ دەسەلاتی هەیە بەسەریدا؟ کەواتە چۆن ئەیانکرد بە هاوکێش و هاوتای خوا لە پەرستندا؟!! ﴿اتَّخَذُوهُ﴾ ئەوشتە بێنرخەیان گێڕا بەبت و پەرستراو ﴿وَكَانُوا ظَالِمِينَ ﴾ ئەوانە هەر ستەمکار بوون و شتی بێ‌جێیان کرد، واتە پیشەیان هەر بەو جۆرە هاتووە، کەواتە نابێ هیچ سەرسوڕبمێنێ لەوەی کەئەو کردەوە بەدو بۆگەنەیان کرد، ئایا کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی کە دروستکراوو دەستکردی مرۆڤێك بپەرستێ وەك خوا لەکاتێکدا کە خوا ئەوانیش و دەستکردەکانیشی دروستکردو دایهێنان لە نەبوونەوە؟ ئەوانە هارونیشیان لەناودابوو بەلام چاری نەکردن، پیاوە ژیرەکانیشیان هەربوون، بەلام جڵەوی ئەو کۆمەڵە زۆرەیان پێ‌نەگیرا کە بەجارێ کردیان بە هۆسەو ئەو گومڕاییانەیان پەسەندکرد بەتایبەتی ئەو بتە لەئاڵتونە کە بت و پەرستراوی سەرەکی و ڕاستەقینەیانەو لەوە خۆشەویست تر نیە لە دەروونیاندا! لەیەکەم جارەوە بەبێ سەرلێکردنەوە کەوتنە ئەو چاڵی گومڕاییە،

وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْاْ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ

---

**بەڵام لەپاشدا هۆشیانکردەوەو زانیان کە چیان بەسەرهاتووە لەبەرئەوە داهو پەشیمانی دڵی داگیرکردن و کەوتنە تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ ﴾ ئەم ڕستەیە قورئـان دایهێنـا و لـە پـێش قورئـانـدا نەبیـستراوە کـە عـەرەب بـەکاری بهێـنن لەبەرئەوەی ـ وەك لە تەفسیری ڕازی دا هاتووە ـ بەشەش جۆر لێکۆڵینەوەی تێداکراوە، بەڵام پاڵفتەکەی هەموو بریتیە لە پەشیمان بوونەوەیان، بەڵکو پەشیمان بوونەوەی بەتین و داخ و مەراق لەسەر ئەو گومڕایی و گوێرەکە پەرستیەی کە بەسەریان هات، لەبەرئەوەی بە پێویستم نەزانی ئەو درێژە پێدانەو بە کورتی ئەڵێم: کاتێ کە پەشیمانی بەتین ڕووی تێکردن ﴿وَرَأَوْاْ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّواْ ﴾ زانیان و بۆیان دەرکەوت کە بەڕاستی گومڕابوون و لەڕێگەی ڕاست ترازاون ﴿قَالُواْ ﴾ گوتیـان ﴿لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا ﴾ سـوێند بـە خـوا ئەگـەر پـەروەردگارمان میهرەبانیمـان پێنـەکات و نـەمان بـووریێ و گونـاهو تاوانمـان دانەشـارێ ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ بێگومان ئێمە لە زیان باران ئەبین و ئەچینە ڕیزی ئەو زیانبارانەی کە بەشبڕاوی ڕۆژی دوایین و هیچ زیانباریەك لەوە بەتین ترو گەورەتر نیە، خوا پەنامان بدات لێی ئامین. ئەو پەشیمان بوونەوەو بۆ دەرکەوتن و تۆبەو گەڕانەویان لەپاش گەڕانەوەی موسا بوو (علیه السلام) وەك لەسوورەتی ﴿طە﴾دا دەرئەکەوێ، بەڵام لێرەدا لەباسکردندا پێشی خستن تا ووتارو کردەوەکەیان کۆبکاتەوە لە یەك شوێندا وەك زانایان ئەفەرموون، باوی مرۆڤ وایە پەشیمان بوونەوەی لە کارێك لـەپاش زانین و بۆ دەرکـەوتنی بـەدی و خراپـی ئەو کارەیە، کەواتە بۆچی لێرەدا پەشیمان بوونەوەکە پێشخراوە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا چەند شتێك هەیە:**

**١- پەشیمان بوونەوە نەبەستراوە بە ڕوون بوونـەوەی بـەدی و دەرکـەوتنی تـەواو، بەڵکو زۆرجار بـەهۆی گومـانی بـەدی و خراپیـەوە پەشیمانی پەیدا ئـەبێ، ئەوانە لەیەکەم**

جارەوە ئەو کردەوە پیسەیان زۆر بە پیرۆزو پەسەند دائەنا، کەواتە یەکسەر لەوەوە نەگەیشتوونەتە ئەو پلەیە کە بەدیو خراپییەکەی ڕوون بوویێتەوە، بەڵکو یەکەم پلە ئەوەیە کە دوو دڵ بووبن، ئینجا گومانی خراپیان پەیداکردبێ، ئینجا دڵنیاو باوەڕیان بە بەدی پەیداکردبێ، لەپاش ئەو پلەیانە گەیشتوونەتە دواترین پلە کە ڕوون بوونەوەی تەواوە، کەواتە پەشیمان بوونەوەکە چەند پلەیەك پێش ڕوون بوونەوەکەن.

٢- ئەوەی پێویستو گرنگە پەشیمان بوونەوەکەیە، باویش وایە شتی گرنگ لە گوتنو باسکردندا پێش ئەخرێ، هەرچەند لەبوونو پەیدابووندا لەدوا بێت.

مەبەست لە پیتی (و) لێرەدا دەرخستنی هۆی پەشیمان بوونەوەکەیە، واتە کاتێك کە پەشیمان بوونەوە لە کردەوە بەدەکەیان بەهۆی ڕوون بوونەوەی بەدیەکەوە، شتی وایش زۆرەو پێی ئەگوترێ لای زانایان ڕەوانبێژی: عەتفی سەبەب. خوای پەروەردگار ـ وەك لە سوورەتی ﴿طه﴾دا ئەفەرموێ ـ هەواڵی ئەو ڕووداوە سەختەیدا بە موسا (علیه السلام) بەهۆی ئەوەوە زۆر خەشم بارو غەمبار بوو، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا﴾ کاتێ کە موسا لە شاخی تور گەڕایەوە بۆلای گەلەکەی بە ڕق هەڵسانو خەشمناکەیەکی زۆر بەتینەوە، یان خەشمناکی زۆرو غەمباریەکی بەیتنەوە، بەجۆرێ کاری کردبوو لە ووتارو کرداریدا، لە ووتارێکدا کە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: بە گوێرەکە پەرستەکان، یان بە هاروونو شوێن کەوتووەکانی ﴿بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ﴾ زۆر بەد جێنشینی منتان کرد لەپاش من کە ڕۆیشتم بۆ شاخی تور بەدەم فەرمانو بەڵێنی خواوە! بەم ڕەنگە من بەجێمهێشتن لەسەر پەرستنی خوا بە تاكو تەنیا کەچی گوێرەکە پەرستی ڕوویدا! ﴿أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ﴾ ئایا پەلەتان کرد بە فەرمانی پەروەردگارتان پێش کەوتن لێیو تەواوتان نەکرد؟ واتە کارێکی بەدتان کردو ئەبوایە چاوەڕوانی منتان بکردایە بەپێی فەرمانو وەسیەتەکەی من ڕەفتارتان بکردایەو لاتان نەدایە لێی، کەچی پەلەتان کردو لاتان وابوو ئەو ماوەی کە من بەڵێنم پێدان تەواو بووەو ئینجا کەمن دیارنەبووم گومانتان وا برد کەمن مەردوم، ئینجا ئایینەکەتان گۆڕی بە وێنەی گەلو ئوممەتەکانی ڕابردوو کە لە پاش پێغەمبەرەکانیان ئایینەکانیان گۆڕی، ڕقو خەشمەکەی بەو جۆرە کاری کرد لێیو لە وتارەکەیدا دەرکەوت،

﴿وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ﴾

---

**لە کرداریشیدا دەرکەوت کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ﴾ لەوحەکانی تووڕداو لەسەر زەوی دانینان، دیارە ئەو لەوحانە فەرموودەی خوایان تێدا بوو ئەگەر ئەوپەڕی رادە خەشمو قینی نەجوولایە ئەوەی نەئەکرد، هەروەها دەرکەوت لەمەدا کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ﴾ واتە دەستی گرت بە مووی سەری براکەیەوە بەجۆرێ ڕایکێشا بۆلای خۆی لە خەشمو قیندا، هەروەها نەوی لە پێشیشی وەك لە ئایەتێکی ترەوە دەرئەکەوێ، ئەوەش لەبەرئەوە بوو لای وابوو کە هارون دەربەست نەبووەو قوسوری کردووە لە کارەکەدا، ئەم جۆرە کردەوانە ناکرێن بە ڕەخنەو لەکە بەسەر موساوە (علیه السلام) چونکە ڕقو قینەکەی لەبەر خوا بووە، ئەوەندەش بە غیرەت بووە لەسەر ئایینەکەی خوا کاتێ ئەو لادانو هەڵگەڕانەوەی ئەوانەی بینی هیچ خۆی بۆ نەگیراو چاری خۆی پێنەکرا تا ئەوەی کرد کە کردی (علیه السلام) هێندێ لە بەندەکانی خوا بە توندو تیژی دروست کردوونو هێندێکی تر بە نەرمو نیان، ئەوەتا هارون (علیه السلام) کە نەرمو نیانو بە ئارام تر بووە هیچ خۆی تێك نەداو بەڵکو بە وتەی نەرمو شیرین ڕقو خەشمەکەی ئەوی سارد کردەوەو هەڵوێستی پاکی خۆی ڕوونکردەوەو دەرخست کە قوسوری نەکردووە، بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿ٱبْنَ أُمَّ﴾ ئەی کوڕی دایکم، کە ئەم وتەیە سۆزو بەزەییە فراوانەکەی دایك ڕائەکێشێو بیری**

ئەخاتەوە، ﴿إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِي﴾ بە ڕاستی گەلەکە منیان بە بێ‌هێزو لاواز داناو سەیر کرد، لەبەرئەوەی کۆمەك‌و یارمەتی دەرم کەم بوو ﴿وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِي﴾ نزیك بوون بمکوژن کاتێ کە جڵەوگیریم ئەکردن لە کردەوە بەدەکەیان، واتە ئەوەی لە دەستم هات‌و توانیم بەکارم هێنا لە بەرگری‌و جڵەو گیری بەڵام چارم نەکردن‌و بەرگریم پێنەکرا ﴿فَلَا تُشْمِتْ بِيَ ٱلْأَعْدَآءَ﴾ کەواتە دوژمنەکانم پێ دڵخۆش مەکە بەو کردەوانەی کە کردت دەربارەم ﴿وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ مەمگێڕەو دام مەنێ لەگەڵ تاقم‌و دەستەی ستەمکاراندا‌و لە ڕیزی ئەوان دام مەنێ بەم ڕەنگە منیش بە تاوانبار دابنێیت.

ئامۆژگاری بەو جۆرە موسای هێواش کردەوە دەربارەی خۆی‌و پاکی‌و بێ‌تاوانی خۆی بۆ ڕوون کردەوە تا هیچی لە دڵدا نەما، لەبەر ئەوە موسا ڕووی کردە بارەگای خواو کەوتە نزاو پاڕانەوە بۆ خۆیشی‌و بۆ ئەویش وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ موسا گوتی: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِأَخِي﴾ ئەی پەروەردگارم ببورەو خۆش ببە لە خۆم‌و لە براکەم خۆش ببە، لە خۆم لەو ڕق هەستان‌و توندو تیژییەی کە بەکارم هێنا، خۆش ببە لە براکەشم لەبەر هەر کەم‌و کوڕییەك کە پێی هەستابێت لەگەڵ ئەو گوێرەکە پەرستانەدا، ﴿وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ﴾ وە بمانخەرە ناو میهرەبانیەکەت ﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ تۆ میهرەبان ترینی هەموو میهرەبانانی، ئینجا باسی حوکم‌و بڕیاری خوا دێتە پێشەوە لەو مەسەلەیەدا بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسانە کە گوێرەکەکەیان گێڕا بە پەرستراوی خۆیان: ﴿سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لەمەو پاش دووچاریان ئەبێت ڕق‌و خەشمێکی بەتین‌و گەورە لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿وَذِلَّةٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ڕیسوایی‌و زەلیلیەکی گەورە لەم ژیانە نزیکەدا، واتە لەم جیهانەدا،

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ﴾ بەو جۆرو شێوەیە تۆڵە ئەسێنین لە درۆو دەست هەڵبەست کەران بەدەم خواو ئاییني خواوە، ئایا ئەو خەشم و زەلیلیە بۆ نەفسی ئەوانەیە کە گوێرەکەکەیان پەرست؟ یان مەبەست تیرەو نەوەکانیان کە لە چەرخی پێغەمبەرماندا بوون (ﷺ)؟ یان مەبەست گشتییەو هەر لە چەرخ و سەردەمی یەکەم جاریانەوە هەتا پاش ئەوان و هەتاهەتایە؟ هەرکام لەم سێ ڕایە دەستەیەك لە زانایانی لەسەرە، لەسەر ڕای یەکەم ئایا مەبەست ئەوەیە کە خەشم و زەلیلیان دووچار ئەکەم لەم جیهانەدا؟ زۆربە لەسەر ئەم ڕای دووەمەیە، ئینجا ئەگەر مەبەست نەفسی گوێرەکە پەرستەکان بێت بەشێوەی گشتی مەبەست، یان ئەوانە کە هەر سوور بوون لەسەر ئەو کردەوە بەدەو نەگەڕانەوە بۆڕێگەی ڕاست وەك سامری و هێندێ لە شوێن کەوتووانی؟ ئەگەر بە گشتی مەبەست بێت خەشمەکەیان بریتیە لەوەی فەرمان درا کە یەکتر بکوژن، زەلیلیەکەشیان بەوە بوو کە گومڕابوون لەپێش چاو مەردومان و بتەکەیان ووردو خاش کراو تووڕ درایە ناو دەریاو ئەوانیش هیچ دەسەڵاتیان نەبوو، بە تایبەتی سامری وای لێهات تەنیا کەوت و دوور کەوتەوە لە گەل و کۆمەڵ، هەواڵدان بەو بەسەرهاتانە بە شێوەی داهاتوو کە فەرمووی: ﴿سَيَنَالُهُمْ﴾ بە پێی ئەو کاتەیە کە موسا هێشتا نەگەڕابووەوەو نەیزانیبوو بە گومڕایی و لادانەکەیان، خوا ئەو هەواڵەی دا بە موسا لەگەڵ هەواڵی بەسەرهاتیان و دووچار بوونیان کە لە پاش گەڕانەوەی موسا بەدی هات، ئینجا لەسەر ئەم بارە ئەگەر مەبەست خەشم بێت لە ڕۆژی دواییشدا ئەبێ ئەو خەشمە بۆ ئەوانەیان بێت کە تۆبەیان نەکردو هەر لەسەر گوێرەکە پەرستی مانەوە، ئەگەر مەبەست بەو هەڕەشە لێکراوانە ئەوانەی چەرخ و سەردەمی پێغەمبەرمان بن (ﷺ) یان ئەوان و چینەکانی پاش ئەوان هەتاهەتایە، ئەوا مەبەست بە خەشمەکە خەشمی ڕۆژی دواییەو مەبەست بە سەرشۆڕی و زەلیلیەکەی ئەم جیهانەیە، بەڵام بۆ ئەوانەی کە تۆبەیان نەکردبێ و نەگەڕابنەوە لە بارو کردەوە بەدەکەیان، وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات لەم بەشی دووەمی ئایەتەدا کە بە شێوەی یاسایەکی گشتی ئەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ ئەوانەی کەگوناهوخراپەکانیان کردبێ ـ ئیتر هەر گوناهو خراپەیەك ـ

ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ

---

**﴿ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓا۟﴾ لەپاش ئەو گوناهو خراپانە تۆبەیان کردبێ لێیان، بڕوایان هێنابێ، واتە خەریك بووبن بە بڕواو هەرشتێ کە بڕوا داخوازە بۆیو بڕوای پێتەواو ئەبێ لە کردەوە چاکەکان، یان مەبەست ئەوەیە کە تۆبەی کردبێ لە کاتێکدا کە بڕوای هێنابێ، چونکە هیچ کردەوەیەکی چاكو تۆبەو گەڕانەوەیەك بەبێ بڕوا سوودی نابێو وەرناگیرێ، ئەو کەسانەی کەوان ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بێگومان پەروەردگارت لەپاش ئەو تۆبەو بڕوایە زۆر لێبووردەو میهرەبانە، لێبووردەیە لە گوناهو خراپەکارنیان، زۆر میهرەبانە پێیان، داوای لێبووردنو میهرەبانی فراوەنەکەی ئەکەی کە ئەگەر ئەوەمان بۆ ئەخاتە کار ئەوا سەرگەردانو سەرشۆڕو داماوین لە هەردوو جیهاندا لەسەر ئەو ڕاو بارە کە مەبەست لە هەڕەشە لێکراوەکان هەموو چینەکان بێت هەر لەچینی چەرخی سامریەوە هەتا هەتایە، لەسەر ئەم بارو ڕایەش ئەگەر ئەندازێك بیربکرێتەوە دەرئەکەوێ کە ئەو بەڵێنو هەڕەشەیە بەدی هاتووەو هەر بەدیش دێت هەتا هەتایە، ئەوەتا ئەوانە کە بەتەواوی تۆبەیان نەکردبێ هەر دووچاری سزاو سەرشۆڕی بوون بە درێژایی مێژوو هەموو جارێ خوا چەند کەسانێکی کردووە بە ملۆزمیان سزای سەختیان پێبچەژێ، ئەگەر جاربەجارو لە هێندێ کاتدا بە زاڵو سەرکەوتوو سەرنج درابن یان بدرێن وەك لەم چەرخو سەردەمی دوایەدا کە ئەو هەموو خاکی فەلەستینەیان داگیرکردو دانیشتوانیان ئاوارەو ژێردەستکردو بوون بە خاوەن میریو حکومەت ئەوە هەمووی شتێکی کاتێو ماوەی دیاریکراویان هەیە، ئەوانە بەهۆی نیازو نیەتی بۆگەنیانو بەهۆی کاروکردەوە بەدەکانیانەوە هەمیشە خەشمو قینی خوا دەوری داون، زاڵبوونو دەست درێژیان بەسەر فەلەستینیەکاندا یان لەهەر لایەکی ترەوە بەهۆی**

ئەوەیە کە بەڕاستی ئیسلام نیە لەکایەدا، بەناوی ئیسلامەوە لە ژێر ئالاَی ئیسلامدا بەرەنگاری نەکراون، بەڵکو بەناوی نەتەوایەتی و بەرەو لە ژێر ئالاَیەکی تردا دژو جیاواز لە ئالاَی ئیسلام و عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام، بەهۆی ئەو خەبەرپوونەوەو هۆشهاتنە ئیسلامیەوە کەلە هەموو لایەکەوە پەیدابووە لە جیهاندا چاوەڕوانی ئەکرێ کە فەلەستینیەکان هەموو ئالاَیەکی تر توڕبدەن و تەنها ئالاَی ئیسلام بەرزبکەنەوە، ئەو کاتە سەرکەوتن و زاڵبوونیان مسەوگەرە وەك لەیەکەم جاری ئەم ئوممەتەدا کۆمەڵێکی کەم و ڕەش و ڕووت توانیان فەلەستین و قودس ڕزگاربکەن و لە ژێردەستی ڕۆم دەریان بهێنن کەلەو چەرخەدا ڕۆم یەکێبوو لەو دوو هێزە جیهانیەی کە زۆربەی جیهان بەدەست ئەوانەوە بوو! بەڵام ئێستا بەناوێکی ترو لەژێر ئالاَیەکی تردا جەنگ و بەربەرەکانی ئەکەن حاڵ و باریان ئەوەیە کە زانراوەو ناسراوە پێویست ناکات بە باسکردن لەکاتێکدا کە بەناو (٢٢) میری عەرەب وان بەدەوریاندا بەو هەموو دەسەلاَت و سامانەوە کە هەیانەو جیهان بەسامانی ئەوان ئەژی!!

موسا (علیه السلام) لەیەکەم جارەوە بەو جۆرو شێوەی کە باسکرا خەشم و قینی بەتینی هەڵسا، لەپاشدا بەهۆی ئەوەوە بۆی دەرکەوت کە هارون هیچ خەتاو قسورێکی نەبووەو قسەنەرمەکانی هارونی چوو بە گوێچکەدا، بەهۆی ئەوەوە هێواش بوویەوەو ڕق و خەشمەکەی ئەندازێك نیشتەوە وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ﴾ ئەم دەستەواژەیە وا نیشان ئەدات کە خەشم و ڕقەکەی موسا کەسێکی زیندووو زاڵە بەسەر موساداو ئەو کردەوەی پێئەکات و کاتێ لێی بێدەنگ بووو وازی لێ هێنا موسا لە کاروکردەوەکەی وازئەهێنێ، ئەوەتا فەرمووی: کاتێ کە ڕق و خەشم بێدەنگ بوو لە موسا واتە کاتێ ڕق و خەشمی موسا دامردەوەو نیشتەوە وەك لە خوێندنەوەیەك هاتووە ﴿ولما سكن﴾ کە ئەو واتایە ئەگەیەنێ ﴿أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ﴾ ئەو لەوحانەی کە لەپێشەوە فرێیدان لەکاتی ڕقدا، ئەو لەوحانەی وەرگرتنەوەو گرتنیەوە دەست ﴿وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ لە ڕوونوسی ئەو لەوحانەدا بوو کە ڕوونوسکرابوون (لوح المحفوظ) یان لەوەی کە نوسرابوو

ئەو لەوحانەدا هەبوو: ڕێنموونیەکی گەورەو میهرەبانیەکی بەرزو بڵند لەلایەن پەروەردگارەوە ﴿لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ﴾ بۆ ئەوانەی کە ئەترسن لە پەروەردگاریان بە ترسانو بیمێکی بەتین، یان بیمو ترسی بەتینیان هەیە لەبەر خوا، نەك لەبەر ڕیاو خۆ نیشاندانو خۆ نواندن (ئیبنو عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ: کاتێ موسا ئەو لەوحانەی تورِدا شکانو زایەبوون، ئینجا موسا چل ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو تا خوا وەك خۆیو یەکەم جاری لێکردنەوە، لەسەر ئەم بارەش ڕوونوسەکە هەر ڕێكو ڕاستو بەجێیە، وەك لەسەر باری یەکەم مەبەست ڕوونوس بێت لە (لوح المحفوظ)، بێگومان ئەوەی لەو لەوحانەدا بۆ ڕێنموونیو میهرەبانی بوو بۆ هەموو کەس، بەڵام پیتو فەڕو بەرهەمەکەی هەر بۆ ئەوانە بوو کەلەخوا ترس بوون لەبەر ئەوە بەڕواڵەت تایبەتی کرد هەر بەوانەوە.

ئینجا لەسەر گێڕانەوەی داستانو سەرگوزەشتەکە ئەڕواو بەشێکی تر ئەخاتە بەرچاوو ئەفەرموێ: ﴿وَاخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَاتِنَا﴾ موسا لەگەلەکەی حەفتا پیاوی هەڵبژارد بۆچوونو ڕۆیشتن لەکاتی دیاریکراوماندا، کاتی دیاریکراوی یەکەم کە دیاری کرابوو بۆ گفتوگۆ کردنی خوا لەگەڵ موسا (علیە السلام) بەلای (ئەبو عەلیو ئەبو موسلیم)و چەند کەسێکی تر لە زانایانی تەفسیر لە شیعەو سونی، کاتی دیاریکراوی بۆ دەربڕینو جاڕدانی تۆبەو گەڕانەوەبوو لەو گوێرەکە پەرستیەی کە ڕوویدا لەنێوان ئیسرائیلیەکاندا، بۆ داوای لێبووردنو عوزر هێنانەوە لەو کردەوەو تاوانە گەورەیەی کە ڕوویدا وەك کۆمەڵو تاقمێکی زۆر ئەفەرموونو لە (حسن)یشەوە ڕیوایەتکراوە، هەردوو کۆمەڵ چەند بەڵگەو نیشانەیەك ئەهێنن لەسەر ڕای خۆیانو لێکۆڵینەوەی زۆری تێدائەکەن، بەڕاستی ڕای دووەم لە دڵدا جێگیرترەو بەهێزترە، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبە گەورەو درێژەکانی تەفسیر بکات، ئەو حەفتاکەسەی وەك نوێنەربوون بۆ هەموو گەلەکە لەگەڵ ئەوەدا کارێکی وایانکرد کەلەوانە بوو هەموو تێدابچن، بەم ڕەنگە داوای بینینی خوایان کرد بەهۆی ئەوەوە دووچاری هەورەتریشقە بوون یان بوومەلەرزەی ئەو شاخەی کەبەسەریەوەبوون، ئینجا لەوەوە لەهۆش چوون یان مردنو لەپاشان زیندووکرانەوەو وەك لە سوورەتی تردا باسی ئەفەرموێ،

فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ

---

ئەوانە دووچاربوون وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ ئینجا كاتێ كە تریشقە یان بوومەلەرزە گرتنی ئەوان بەهۆی كردەوەی خۆیان ئەوەیان بەسەرهات، بەڵام موسا (علیه السلام) كەئەوەی بینی كەوتە نزاو پاڕانەوەو داوای لێبووردن وەكو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ موسا گوتی: ﴿رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەگەر بتویستایە ئەوانەت لەناو ئەبرد لەمەوپێش و منیشت لەناو ئەبرد، واتە تۆ ئەتوانی ئەمانەو منیشت لەناوببردایە لەمەوبەر هەركاتێ و بەهەر هۆیەك، ماتوڵ لەمەوبەر میهرەبانت بەكارهێناوە تا ئێستا دەی ئێستاش لەم شوێنەدا بەزەیی و میهرەبانیەكەت هەر بەردەوام بێت و خەشم و ڕق بەكارمەهێنە ﴿أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ﴾ ئایا تۆ ئێمە هەموو لەناو ئەبەی بەهۆی ئەوەی كە نەفامەكانی ئێمە كردیان لەكارو كردەوەی خراپ و ناپەسەند، واتە دوورە لە میهرەبانی تۆ شتی وابكەیت و شتی وا ناكەیت، یان مەبەست ئەوەیە شتی وامەكە ئەی خوایە، بەهەرحاڵ موسا (علیه السلام) بەندەیی و ملكەچی تەواو دەرئەبڕێ و داوای لوتف و بەزەیی پەروەردگار ئەكات، ئینجا بۆچوون و ئاگاداری خۆی دەرئەبڕێ سەبارەت بەوەی كە ڕوویداو بوو بەسەرهاتنی ئەوانە، ئەفەرموێ: ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ﴾ ئەو تاقیكردنەوەی كە ئەوانی تێكەوتن هەر تاقیكردنەوەی تۆیە، چونكە تۆ فەرموودەی خۆتت پێبیستن تا كەوتنە داوی شتی گەورەتر كە بینینی زاتی پاكی خۆتە، یان چونكە تۆ ئەو گوێرەكەت گێڕا بە گیاندارو خاوەن هۆڵەو بۆڕە تابەوە گومڕابوون ﴿تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ﴾ بەو تاقیكردنەوە گومڕا ئەكەیت هەركەسێ كە خۆت بتەوێ، ڕێنموونی ئەكەیت هەركەسێك كە خۆت بتەوێ، هەروەها هەموو تاقیكردنەوەكانی خوا هۆی گومڕایی هێندێكەو ڕێنموونی هێندێكی تر، هەركەسێك نەزان و بێئاگا بێ گومڕائەبێ و هەركەسیش زاناو ئاگاداربێ ڕێنموونی وەرئەگرێ و لە تاقیكردنەوەكەدا دەرچەێ،

أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ۞ وَٱكْتُبْ لَنَا فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِىٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ

موسا ئەوەی گوت تابیکات بەسەرەتا بۆ داوای یارمەتی و کۆمەکی لە خوا لەو تاقیکردنەوەدا وەك ئاماژەی کرد بۆئەوە کە گوتی ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان هەرتۆ خاوەنی کاربەدەستمانی لە هەموو کاروباری هەموو جیهانماندا، کەواتە یارمەتی و کۆمەکی خۆتمان پێببەخشە لەو تاقیکردنەوەدا ﴿فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا﴾ کەواتە ببوورە لێمان و گوناهو خراپەمان بسڕەوەو دایشارە، میهرەبانیمان پێبکە ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ﴾ تۆ چاکترینی هەموو لێبووردەو چاوپۆشیکارانی، چونکە هەر لێبووردەیەکی تر بێجگە لەتۆ نیازو مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەیەو پێویستە پێی، بەڵام تۆ تەنها لوتف و میهرەبانی بەکارئەهێنی ﴿وَٱكْتُبْ لَنَا فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ بنووسەو بڕیاربدە بۆمان لەم جیهانەدا ژیانێکی پاك و خاوێن و هۆی گوێڕایەڵی و مەبەستی خێرو گەیشتن بە ئامانجی چاك، ﴿وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ هەروەها لە ڕۆژی دواییشدا ژیانێکی پاك و خاوێن و خۆشمان بۆ بڕیاربدە ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ﴾ بەڕاستی ئەوا ئێمە تۆبەمان کردو گەڕاینەوە بۆلای تۆ، پەنامان پێهێنای واتە لەبەرئەوەی هەر تۆ خاوەن و کاربەدەستی ئێمەی، خاوەن و کاربەدەستیش هەقی وایە زیان دووربخاتەوەو سوودو خۆشی و قازانج بهێنێ، کەواتە لێمان ببوورەو گوناهەکانمان بسڕەوە، لەبەرئەوەی بە ملکەچیەوە تۆبە ئەکەین و ئەگەڕێینەوە بۆلای تۆو داوای خێرو خۆشی هەردوو جیهانت لێئەکەین، بێگومان گەڕانەوە بۆلای خوا بەمە پێکدێت کە پەیڕەوەی ئایین و شەریعەتەکەی بکرێت، پەیڕەوی ئایین و شەریعەتی خوایش مایەی خێرو خۆشی هەردوو جیهانە، بە جۆرو شێوەیە موسا (علیه السلام) تکاو نزای خۆی کرد، ئینجا

لەلایەن پەروەردگارەوە وەڵامی بۆ هاتەوە بەم جۆرە ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ﴾ سزادانی من بەجۆرێکە کە دووچاری ئەکەم پێی هەرکەسێك کە بمەوێت‌و مەیلم لێی بێ ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ﴾ بەزەیی‌و میهرەبانی من بە جۆرێکە فراوانی بووەو هەیە بۆ هەموو شتێ، واتە سزادانی من بۆ هەرکەسێك بەپێی مەیل‌و خواهیشی خۆمە، مەیل‌و خواهیشیشم بەر بەرەڵایەو هیچ شتیك ڕێگەی ناگرێ‌و بەربەستی ناکات، هەرچەند بە مەیل‌و خواهیشی خۆم مەیل‌و خواهیشم بەپێی دادو هەقیانەت‌و ڕاستیەو هەرگیز لەیەك جوێ نابنەوە، چونکە دادو هەق پەروەری سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوا، کەواتە سزادانی خوا دووچاری هەرکەسێك ئەبێ کە شایستەو شیاوی سزابێ لای خوا، بەو جۆرە مەیل‌و خواهیشی خوا هاتووە و کارئەکات، کەواتە سزادانی هەرلەیەکەم جارو هەر لە ڕێوە تایبەتیەو گشتی نیە، چونکە سزادان سیفەتی ئەو نیە بەڵکو ستەم‌و تاوانی بەندە داخوازە بۆی بەڵام بەزەیی‌و میهرەبانی سیفەتی ئەوە کەواتە فراوانی هەیە بۆ هەموو شتێ لە جیهاندا بەتێکڕایی بەبێ جیاوازی لەنێوان چاك‌و خراپ‌و تاوانبارو بێتاواندا، ئەوەش هەر بەمەیل‌و خواهیشی خۆیەتی، مەیل‌و خواهیشی خوا بۆهەر شتێ‌و لەهەر بارێکدا بەڕێکەوت‌و گۆترەکاری نیە، بەڵکو هۆو داخوازی خۆی هەیە بە مەیل‌و خواهیشی خوا، ئەم وەڵامی خوا بەچەند جۆرێك لێکۆڵینەوەی تێداکراوەو هەرکام بە شێوەیەك ڕوونی ئەکاتەوەو ئەی هۆنێتەوەو پەیوەستی بە داواکەی موساوە (علیه السلام) یەکێکە لەو جۆرو شێوانەی کەلە دڵمدا بەهێزترە ئەمەیە کە خاوەنی (کشاف) ئەفەرموێ: کاتێ کە موسا داوای خێرو خۆشی هەردوو جیهانی کرد لە خوا بۆخۆی‌و بۆ گەلەکەی، لە وەڵامی نزاکەیدا خوا فەرمووی: سزادانی من بۆ ئەوانەیە کە تۆبە نەکەن ئەگەر مەیلم ببێ‌و بمەوێ‌و میهرەبانیم لە جیهاندا گشتیە بۆ هەموان میهرەبانیم لە هەردوو جیهاندا بۆ ئەوانەیە کە تۆبە ئەکەن‌و دامەزراوو بەردەوام ئەبن لەسەر ئەوە ئەوانە نزاو داواکەی تۆ سوودیان پێئەگەیەنێ، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەم بارەی کە ئێستا وان لەسەری ئەوا دوورئەبن لەوەی نزاکەت وەرگیرێ بۆیان،

ئینجـا ئەفــەرموێ: مەبەسـت لـەم وەڵامـە هاندانیانـە لەسـەر بـەردەوامیان لـە تۆبـەو گەڕانەوەکەیانـدا، لەسـەر کـردەوەی چـاكو خۆپـارێزی لـەوەی بگەڕێنـەوە بۆسـەر گونـاهو خراپەکەیان، ئینجا بەو بۆنەیەوە باسی پێغەمبەرمان ئەهێنێو فەرمان ئەدا بە شوێنکەوتنی، زانای بەرزی (طیبي) بەجۆرێکی تر ئەی هۆنێتەوە ئەویش هەر زۆر جوانە هەرچەند ڕەخنەو لێکۆڵینـەوەی ئـەوێ لەبەرئـەوەی درێژەنـەدەم زیـاد لەمـە هیـچی تـر بـاس ناکـەمو هەرکـەس ئەیـەوێ باسـەرنجی کتێبـە تایبەتیـەکان بـدا، فـەرمووی: میهرەبـانی مـن فراوانـی هەیـە بـۆ هـەموو شـتێ ئەگـەر مەبەست میهرەبـانی بێـت لـەم جیهانـەدا وەك هێنـدێك ئەفـەرموون، ئـەوا شتێکی ئاشکرایە کـە ئـەم بوونو بوونـەوەرە بەرهـەمی ئـەو میهرەبانیەیـەو هـەموو کەسیش بەشـدارە تێیـدا لـەم جیهانـەدا هـەروەها ئەگـەر مەبەسـت میهرەبـانی ڕووت بێـت بـەبێ بڕینـی بەسەر میهرەبانی ئەم جیهانەدا، چونکە لەسـەر ئـەم بارەش گشتیەتی هەیـە بـۆ هـەموو شتێ بەنەزەر میهرەبانی ئەم جیهانـەوە کـە بەشێکە لـەو میهرەبانیـە ڕووتـە، بـەڵام ئەگـەر مەبەسـت میهرەبـانی هـەردوو جیهـان بێـت وەك موسـا لـە نزاکەیـدا داوایکـرد، ئەوکاتـە ئـەبێ ببەسـترێ بەمەیلو خواهیشەوە، واتە میهرەبانی من لە هەردوو جیهانداو فراوانی هەیە بۆ هەموو شتێ ئەگـەر مـەیلم ببـێ، بـەڵام دیـارە ئـەو مەیلـەی نـەبووە، چـونکە زۆر کـەس بێبەشـە لـە ڕۆژی دواییـدا لـە میهرەبـانی خـوا ـ خـوا پـەنامان بـدات لـەو بـەش بڕاویـە ـ وەك دەسـت نیشانیش ئەکات بۆئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ ئینجا ئەو میهرەبانیە واتە میهرەبانی لە هەردوو جیهاندا، یان میهرەبانیەکەم لە ڕۆژی دواییدا ئەنوسمو بڕیار ئەدەم بۆ ئەوانەی کە خۆیـان ئـەپارێزن لـە بـێبڕوایی و لـە گونـاه، ئیتر هـەر لـە ڕێ وە یـان لـەپاش دووچاربوونیان خۆیـان ئـەپارێزن بەگەڕانـەوە بۆلای خـواو خـۆ پـاك کردنـەوە لـە نیشانەو دروشـمی ئەوکارو کردەوانـەی کـە هـۆی خـەشمی پـەروەردگارن، واتـە ئـەو میهرەبانیـەم لـە داهـاتوودا بـە گشتی نایهێڵمـەوە، بـەڵکو تایبـەتی ئەکـەم بـەو کەسـانەی کـە دارای ئـەم سـیفەتو کردەوانـەن کـە یەکەمیان ئەوەبوو باسکرا.

دووەم ئەمەیە ﴿وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەكات ئەدەن، نوێژی باس نەكرد هەرچەند گەورەتریشە، چونكە سیفەتی یەكەم ئەیگرێتەوەو بەشێكە لەو، زەكاتیش هەرچەندە وایە بەڵام زەكاتدان لەدڵی زۆربەدا قورسترو گرانترە، بەتایبەتی ئیسرائیلیەكان كە زۆر بەتینن لە خۆش ویستنی ماڵدا كە ئەم ئایەتانە لەوان دا هاتووە، كەواتە باسی زەكات پلار دانە لەوان. سیفەتی سێیەم ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی كە هەر ئەوان بڕوایان هەیەو ئەهێنن بە هەموو ئایەتەكانی ئێمە، نەك بەهێندێكیان و بێبڕوان بە هێندێكی تریان وەك ئیسرائیلیەكان، كەواتە ئەمەش هەر پلاری تێدایە لەوانەو لە كەداریان ئەكات بەو بێبڕواییە، ئیتر مەبەست ئایەتەكانی نامە بێت یان موعجیزەكانی موساو عیساو پێغەمبەرمان (ﷺ) بەهەركام مەبەست بێت هێندێ لە ئیسرائیلیەكان ئەو دەردو نەخۆشییە بەدو كوشندەیان تێدابوو هەیە، ئەمڕۆ لە هەموویاندا بێجگە لەوانەیان كە بڕوای هێنابێ یا بهێنێ. وتەی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ەی فەرمووە، نەیفەرمووە: ﴿هُم بِـَٔايَٰتِنَا﴾، لەبەرئەوەی یەكەم گشتییە بۆ هەموو گەلەكەی موسا كە ئەو نزایەی بۆكردن، ئەمەی دووەم تایبەتییە بەوانەی كە لەچەرخی پێغەمبەردا بوون و پەیدابوون، واتە موسا (علیه السلام) لە نزاكەیدا داوای چاكەو میهرەبانی كرد بۆ خۆی و گەلەكەی كە تۆبەیان كرد، خوایش لە وەڵامدا تایبەتی نەكرد هەر بەوانەوە، بەڵكو گشتی كرد بۆ شەوانیش و بۆ هەركەسانی تریش كە خۆپارێزو زەكات دەربن لە هەر چەرخ و سەردەمێكدا، ئینجا بەتایبەتی باسی ئەوانەیانی كرد كەلە چەرخی پێغەمبەرماندا (ﷺ) بوون و پەیدا بوون بڕوایان هێناو شوێنی كەوتن، واتە وتەی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ەی دووەم دەست نیشانەو تایبەتی‌یە بەم چین و تاقمەوە، وەك وەرئەگیرێ و لەم فەرموودەیەوە كە دێن بە دوایدا: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ﴾ واتە ئەوانە كەسانێكن كە پەیڕەوی ئەكەن و شوێنی فروستادەیەك ئەكەون كە سروشی بۆ كراوەو هەواڵ ئەدا لەلایەن خواوەو هەواڵی لە

خوا وەرگرتـووەو نەخوێنـدەوارە. واتـە پێغەمبـەری ئازیزمـان (ﷺ) کەواتـە ئیـسرائیلیەکان لەپێش هاتنی پێغەمبەرمان (ﷺ) بەری میهرەبانی خوا ئەکەون بەو سێ مەرجەی کەباسکرا، بەڵام لە پاش هاتنی ئەم ئەو سێ مەرجە بەس نیەو بەبێ ئەم مەرجی چوارەمە بێبەش ئەبن لەو میهرەبانیەی کە خوا بەڵێنی پێدان، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە لەئایینی ئیسلامدا بە چەند ڕابەرو بەڵگەی تر، خوای میهرەبان لەم ئایەتەدا نۆ سیفەتو نیشانەی باس فەرموو بۆی:

١- نێرراوو فروستاە.

٢- هەواڵ دەر لە خواوە، یان ڕادەو پلە بەرز.

٣- نەخێندەوارە، کە ئەم سیفەتە هەرچەند بۆ کەسانی تر ناتەواوییە بۆ ئەم یەکێکە لە موعجیزە گـەورەکانی، چـونکە کەسـێکی نەخوێنـدەواری نـەنووس چـۆن ئـەتوانێ نامەیەکی وا درێژو گەورە بێنی لەو ماوە دوورو درێژەدا بیخوێنێتەوە بەسەر دۆستو دوژمندا، هیچ کاتێ لێی تێك نەچێو بەبێ گۆڕینو گۆڕاندن، نامەو وتار ڕێك بێت کە هەموو کەس سەرگەردان بێت لە هۆنینـەوەی وشـەو وتـەکانی، بـەر بڕێتـەوە لـە هـەموو کەسو داوای هێنانیو وێنەیان لێبکات تەنانەت بە ئەندازەی کەمترین سورەت، لەگەڵ ئـەوەدا دوژمنـان هـەوڵو تەقـەلای زۆریـشیان داو چـەندەها وتـەو وتاریـان هۆنـدەوەو هێنایـان بـۆ بەرامبـەرکێ و لەسـەرەنجامدا دەرکـەوت کـە نـاتوانن و دەستەپاچـەن، هـەر بەقسەی ئەو دوژمنانە تائەو ڕادەی گوتیـان: ئەمـە جـادووە! ئـەو دەستەپاچەیی یە کە بوویان تەنها بەرامبەر وتنو هۆنینەوەی وتارێ کە وێنەی قورئان بێت لە ڕەوانبێژیدا، ئیتر بێجگە لەوەی کە قورئان ئەو هەموو هەواڵە کەس نەدیوو کە نەزانانەی تێدابوو کە بـەدڵی هـیچ کەسـێکدا گـوزەری نـەکردبوو لـەوەوپێش مەگـەر هێنـدێ لەوانـەی کەلـە نامـەکانی خـوا وەرگیرابێ، سـەیر تـر ئەوەیـە کەبەرەبەرە لەڕێگـەی زانینو زانیارییـەوە

شتی وا وەئەگیرێو دەرئەکەوێ کەنەلەمەوپێشو لەمەو پاش، هەر لە قورئان ئەبێ وەرگیرێ! کەواتە نەخوێدەواریەکەی ئەم گەورەترین موعجیزەیە!

ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِى ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ

---

٤- **ئەمەیە کە ئەفەرموێ:** ﴿ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِى ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ﴾ **کەسێکە کەنامەدارەکان دەستیان ئەکەوێ ناوو نیشانی بەنووسراوی لای خۆیان لە تەوارتو لە ئینجیلدا، واتە ئەو ئیسرائیلیانە لە یەکەمجارەوە پێش هاتنی لەتەوراتدا ئەو ناو نیشانانەیان دەست ئەکەوێ لە ئینجیلیشدا دووبارە پاش هاتنی ئینجیل کە ئەم دووانە دوو نامەی سەرەکین لەنامەکانی خوادا، جێگەی بڕواو بەناو بانگن لەناویاندا، بەڕاستی ئەمە گەورەترین بەڵگەو دەم کوت کەرە بۆ جوولەکەو گاورەکان کەدای بەناوچاوانیان داو بە هیچ ڕەنگ نەیانتوانی بیخەنەوە بە درۆوە، بەڕاستی شایستەی ئەو هەڕەشە سەختو سامناکانەن کە قورئان ئاڕاستەیان ئەکات، بەڕاستی زۆر سەر سوڕئەمێنێ لەلاریو سەرکێشی یان !!**

٥- ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ **فەمانتان پێئەدات بە چاکە کە کارو کردەوەیەکی ناسراون لە ئایینو شەریعەتەکانی خوادا، ناسراوو وەرگیراون لای ژیرییو هەموو سروشتێکی ساغو نەگۆڕاو.**

٦- ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ **جڵەوگیریان لێئەکات لەخراپە کەبێزراوو دان پیان نەنراون لەئایینو شەریعەتەکانی خواداو لای ژیرییو سروشتی پاكو خاوێن.**

٧- ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ **حەڵاڵ ئەکات بۆیان شتە پاكو خاوێنەکان کە خۆشو بە لەزەتن بەسروشتو بەلای هەموو خاوەن سروشتێکی پاكو نەگۆڕاو.**

٨- ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾ **قەدەغەو حەرام ئەکات لەسەریان هەموو شتە پیسەکان کە دژو پێچەوانەی پاکەکانن.**

﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾

---

﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ لائەبات لێیان لە کۆڵیان ئەخات بارە قورس و گرانەکانیان و ئەو کۆت و زنجیرانەی کە بە سەریانەوە بوو، واتە ئەو توندو تیژییەو ئەو داواو تەکلیفانەی کە زۆر قورس و گران بوون لەسەر شانیان، هەموو ئەوانە سووک و ئاسان ئەکات و لەکۆڵیان ئەخات، ئیسرائیلیەکان بەهۆی لاری و نالەباری و سەکێشی خۆیانەوە توندو تیژیی و ئەکری سەخت و گران خرابووە سەرشانیان، بۆ وێنە شوێنێکیان ئەگەر پیس بوایە پێویست بوو برینی و بەشۆرین چارەسەر نەئەبوو، دەست کەوتی جەنگ ئەسوتێنراو قەدەغەبوو خواردن و بەکارهێنانی، تۆڵەی کوشتنی هەڵەو دەست قەست هەر کوشتن بوو، ڕۆژانی شەممە قەدەغە بووو واز ئەهێنرا لە هەموو کارو کردەوەیەکی دنیایی و ئەبوو بە ڕۆژوو بن، ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەهات بەم شەریعەتە سووک و ئاسانەوە کە هیچ جۆرە تەنەگی و تەنگەتاو کردنێکی تێدانییە ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ﴾ ئینجا ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێنابێ ﴿وَعَزَّرُوهُ﴾ بەرێزو گەورە گرتبێتیان وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ –خوا لێیان ڕازی بێ– یان یارمەتیان دابێ بەرێزەوە وەك (راغب) ئەفەرموێ: ﴿وَنَصَرُوهُ﴾ یارمەتی و کۆمەکیان کردبێ لەبەر خواو ڕەزامەندی خوا ﴿وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ پەیڕەوی ئەو نورەیان کردبێ کەهێنراوەتە خوارەوە لەگەڵ ڕەوانەکردنەکەیدا، یان لەگەڵ پێغەمبەردا شوێنی ئەو نورە کەوتوون ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانەی کەباسکران هەر ئەوانە گەیشتوون بەئامانج، نەك کەسانێك کە خاوەنی ئەو سیفەتانەبن، مەبەست بەوانە ئەو ئیسرائیلیانەن کەبڕوایان هێنا بە پێغەمبەرمان (ﷺ) بەلای (ئیبن و عەباس)ەوە –خوا لێیان ڕازی بێ– بە شێوەی گشتی مەبەستە بەلای کۆمەڵێکی ترەوە. لەپاش ئەوەی ڕێزو شەرەفیدا بەوانەی کە شوێنی ئەکەون و کەوتوون، لەپاش ئەوە فەرمانی پێدا کەجاڕی گشتێتی پەیام و پێغەمبەرێتیەکەی بدا بۆ هەموو ئادەمی، فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر ڕایگەیەنێ و بڵێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئـەی ئـادەمی ﴿إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾ بەڕاسـتی مـن فروسـتادەو نێرراوی خوام بۆلای ئێوه هەمووتان‌و بەتێکڕایی. بێگومان ئەم فەرموودەیە وا ناگەیەنێ کە ڕەوانە نەکراوە بۆ لای غەیری ئادەمی، کەواتە هیچ دژایەتییەکی نییە بۆ ئەو هەموو ئایەت‌و حەدیس‌و بڕیارە گشتییەی ئەم ئوممەتەکە هاتوون لەسەر ڕەوانەکردنی بۆ سەر جنۆکەش، بەڵکو بۆ سەر مەلائیکەش، چونکە مەبەست لەم ئایەتە دەم کوت کردنی نامەدارەکانە کە بڕوایان بە پێغەمبەرێتی ئەم نەبوو یان ئەگەر بڕوایان بووبێ بەلایانەوە وابوو تایبەتیيە بە عەرەبەوە، ئینجا ئایا هیچ پێغەمبەرێکی تریش بووبێ کە بۆ سەر گشتی ڕەوانە کرابێ؟ کۆمەڵێك لە زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەو گشتێتیيە تەنها بۆ ئەم بووەو بەڵگەیان ئەو حەدیسەیە کە ئەفەرموێ: پێنج شتم پێبەخشاروە کە بەهیچ پێغەمبەرێکی تر نەدراوە، کە یەکێکیان گشتێتی پێغەمبەرێتی یەکەیەتی، کۆمەڵێکی تر لەسەر ئەوەن کە دوو پێغەمبەری تریش ڕەوانە کردەنەکەیان بۆ گشتی بووە ئەو دووانەش ئادەمە کە بۆ سەر ڕۆڵەو نەوەکانی بووە کەلە چەرخی خۆیدا بوون، لەپاش ئادەم نوح کە ڕەوانە کراوە بۆ سەر ئەو کۆمەڵە کەمەی کە لەو کاتەدا بووە، بەڵام ئەتوانین بڵێین: مەبەست ئەوەیە: لەنێوان ئەو پێغەمبەرانەی کەلە چەرخی ئەواندا چەند تیرەو گەل بووبێ تەنها ئەم ڕەوانەکراوە بۆ سەر هەموو تیرەو گەلەکان، کەواتە ڕەخنە ناگیرێ بە ئادەم‌و نوح ـ سەلامی خوایان لێبێ ـ.

٩- ئەم ئایەتەو هەموو ئایەتەکانی تر بەڵگەن لەسەر گشتێتی پەیام‌و پێغەمبەرێتییەکەی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) ئەو ئایەتانە هەموو مەککەیین، بەڵکو هێندێکیان لەسەرەتای ڕەوانە کردنەکەیدا هاتووە، وەك دواترین ئایەتی سوورەتی (القلم) کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ کەواتە ئەم ئایەتانە قوڕئەدەن بەدەم بێبڕواکانی نامەدارەکان‌و شوێن کەوتووەکانیاندا کە ئەڵێن: محمد لە یەکەم جارەوە بەدڵیدا گوزەری نەکردووە کە پەیامەکەی ڕاگەیەنێ‌و تێپەڕی بکات بۆ زیاد لەدانیشتوانی مەککە، بەڵام کەبینی بەرەبەرە سەرئەکەوێ‌و زاڵ ئەبێ بەپێی ئەوە فراوانی کرد‌و درێژەی پێدا. ئینجا هێندێ لە سیفەتەکانی ئەو خوایە باس ئەکات کە ئەو فروستادەی نارد بۆلای هەموو ئادەمی، ئەو خوایە ئەناسێنێ بە هەمووان، بەچەند سیفەتێك کە بەندەیی‌و پەرستنی هەمووان پێویست ئەکەم بۆ ئەو خوایەو داخوازن بۆ گوێڕایەڵی فروستادەکەی،

ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾

**ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ فروستادەیی ئەو خوایەم کە هەر بۆ ئەوە موڵکو پادشایەتی ئاسمانەکانو زەوی ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ خوایەك نییە بێجگە لەو ﴿يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ گیان ئەداتو گیان ئەکات بەبەری گیاندارانـدا، گیان ئەسێنێتەوەو گیانداران ئەمرێنێ، دەی کەسێك کەخاوەنی بوونو بوونەوەربێت. خوایەتی هەر بۆ ئەو بێت، ژیانو مردن بەدەست ئەو بێتو هەر ئەو کەسە شیاوو شایستەیە کە هەمووان مل کەچ بن بۆ ئایینو بەرنامەیو گەێرایەڵ بن بۆ فروستادەکەی ﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ کەواتە بڕوا بێنن بە خوایە کە ناوی ﴿الله﴾و بڕوابێنن بە نێراوو فروستادەکەی ﴿ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ﴾ کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە ﴿ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾ کەبڕوای هەیە بە خوا بە وتەکانی خوا ﴿وَٱتَّبِعُوهُ﴾ شوێنی بکەونو پەیڕەوی بکەن، بڕوای بێننو پەیڕەوی بکەن ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ لەبەر ئەوەی ڕێنموونی وەرگرنو بکەونە سەر ڕێی ڕاست، یان بە ئومێدو چاوەڕوانی ئەوە. لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەست نیشان هەیە بۆ چەند شتێك کە پێویستە ورد بوونەوە لێیانو دڵ پێدانیان:**

**١- دەست نیشانە بە شایەتومان کەیەکەم بەندە لە ئیسلامدا.**

**٢- بڕوای ڕێكو ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) بەخواو بەوتەکانی خوا، هەرچەند ئەوە شتێکی ڕوونو ئاشکرایە، بەڵام گوتنەکەی ئەوە نیشان ئەدات کە بانگو بانگەواز کار پێویستە خۆی لەپێشەوە بڕوای تەواوی هەبێ بەوەی کە بانگو بانگەوازەکەی بۆ ئەکات.**

٣- بڕوا هێنان بە تەنیا بەس نییە، بەڵکو پێویستە پەیڕەوی و کردەوە بە پێی ئەو بڕوایەو بەدی هێنانی بڕواکە بە کردەوە، کەواتە ئومێدی ڕێنموونی و کەوتنە سەر ڕێگەی ڕاست نابێ و ناگونجێ بەبڕوای تەنیا.

ئەم ئایینە پیرۆزە چەند جارو لە چەند شوێندا سروشت و بارە ڕاستەقینەکەی خۆی ڕوون ئەکاتەوە، ئەم ئایینە تەنیا بڕواو بیرو باوەڕێکی ڕووت نییە کەلەدەروون دایە، هەرچۆنێ تەنیا شیعارو دروشمێکی ڕووت نییە، بەڵکو ئەم ئایینە پەیڕەوی تێرو تەواوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەو شتانەی کە ڕایکەیاندووە لەلایەن خواوە، لەوەی کە کردارو ڕەوشتی بووە، بێجگە لەمە هیچ بارو شێوەیەکی تر نییە بۆ ئەم ئایینە پیرۆزە، ئینجا پێش ئەوەی دەست بکات بە ئەڵقەیەکی تر لە داستانی مەسا (علیە السلام) باسی ئەوە ئەکات کە گەلەکەی موسا بە هەمیشەیی پیاو چاک و خواناسیان بووە هەرچەند گومڕاو سەرکێشیشیان بووە، ئەفەرموێ: ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ﴾ لەگەلەکەی موسادا کۆمەڵ و تاقمێکی گەورە بووە کە ﴿يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ﴾ ڕێنموونی مەردوم ئەکەن بە وتەی هەق و ئایینی ڕاست کە لەلایەن خواوە هات بۆیان، بەوە دادو دادپەروەریی ئەکەن لەحوکم و بڕیارەکانیاندا، بە هەمیشەیی لەو گەلەدا دەستەو تاقمێك بووەکە بەو جۆرە لەسەر ئایینە ڕاستەکەی خوا مابنەوە، چ لەچەرخی خۆیداو چ لەپاش خۆی بە درێژایی مێژوویان، هێندێ لەوانە ئەوانە بوون کە پێشوازیان کرد لەم ئایینی ئیسلامە کاتێ کە پێی گەیشتن، چونکە بەپێی نامەکەی خۆیان بەباشی ئەیانزانی کە دواترین ئایین و شەریعەتی خوایەو ئەبێ پەیڕەوی هەر ئەم بکرێ، یەکێ لەوانە هاوەڵە بەڕێزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) عبداللە کوڕی سەلام -خوا لێی ڕازی بێ- کەبەرەنگاری جوولەکەکان ئەوەستا بە فەرموودەکانی تەوراتەوە کە هاتبوون دەربارەی ئەم پێغەمبەرە نەخوێدەوارە.

وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١٦٠﴾

---

**ئینجا داستانەکە دەست پێئەکات بەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی لەپاش ئەو بومەلەرزە یان ئەو مردنەی کە بەسەریان هات، ئەفەرموێ: ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ﴾ گەلەکەی موسامان بەش بەش کردو گێڕانمان بە دوازدە بەش ﴿أَسۡبَاطًا﴾ واتە دوازدە تیرەو بەرە کە هەرکام کۆمەڵو تاقمێکی گەورە بوونو جیاواز لەوانی ترو هۆیەکی تایبەتی هەبوو بۆ پەیوەستی ئەندامەکانیان لەنێوان خۆیاندا، هەر تیرەو بەرەیەك ئەچوونەوە سەر کوڕێك لە دوازدە کوڕەکەی (یعقوب) (علیە السلام) خوای میهرەبان بەوە چاکەی لەگەڵ کردن تا ناکۆکیو قینو حەسادەت پەیدا نەبێ لەنێوان خۆیاندا، بەڵێ بەڕاستی میهرەبانییەکی گەورە بوو لەگەڵ ئەو گەلە لەپاش ئەوەی زۆریان لێ بێبڕوا بوونو لە ئایینەکەیان پاشگەزبوونەوەو گوێرەکەیان پەرست، ئینجا کەفارەتیاندا بۆ ئەو تاوانەیان، بەهۆی ئەوەوە خوا تۆبەکەی وەرگرتن، پاش ئەوەی داوای دیتنی خوایانکردو ئینجا دووچاری مردن بوونو لەپاشان بەهۆی نزای موساوە خوا زیندووی کردنەوە، لەپاش ئەوە خوا میهرەبانی لەگەڵ کردن لەوەی ڕێكو پێکی کردنو هۆنیندییەوە بەوەی گێڕانی بە دوازدە تیرە کە هەر تیرەیەك لە نەوەی هەر یەکێك بوو لە دوازدە کوڕەکەی باپیرە گەورەیان کە (یعقوب) پێغەمبەرە (ﷺ) یەکێ لەو چاکەو میهرەبانییە ئەوەی کە دوازدە کانیاوی بۆ هەڵقوڵاندنو بۆ هەرکام کانییەکی تایبەتیکرد تا دەست درێژیی نەکەنە سەر یەکترو ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ سروشمان کرد بۆ لای موسا ﴿إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ﴾ کاتێ کە**

گەلەکەی داوای ئاویان لێکرد کە تینوێتییان پێ گەیشت لە خولانەوەیان لە چۆڵ و بیاباندا بەسەرگەردانی کە پێویست کرابوو لەسەریان چل ڕۆژ بەو جۆرە بژین و نەچنەوە شاری قودس، لەو کاتە سەختەدا داوای ئاویان لێکرد خوایش سروشی کرد بۆ لای موسا ﴿أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ﴾ بەمەی بەدارە دەستەکەت بدە لە بەرد ئیتر هەر بەردێك بێباوەڕەکانی یان بەردێکی تایبەتی بووبێ، ئەویش لێیدا ﴿فَانبَجَسَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا﴾ ئیتر دەست بەجێ هەڵقوڵا لێی دوازدە کانی بە پێی دوازدە تیرەکەی خۆیان، ئینجا بۆ ئەوەی ئاژاوەیان نەبێ ئەو کانیاوانە بەجۆرێ بوون هەرکام ناسراو بوو لای ئەو کۆمەڵ و تیرەی کە بۆی دیاریی کرابوو، وەك ئەفەرموێ: ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ بێگومان هەموو کۆمەڵە مرۆڤێك لەو دوازدە تیرە کانیاو و جێگەی ئاو خواردنەوەی خۆی ئەناسی. یەکێ تر لە میهرەبانییەکەی ئەمەیە کە سێبەری بۆ فەراهەم هێنان لەو دەشت و بیابانە گەرمەدا، هەروەها خۆراکی پاك و خۆش وەك ئەفەرموێ: ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ الْغَمَامَ﴾ هەورمان کرد بەسێبەر بەسەریانەوە، ئەگەرا لەگەڵیان لەکاتی گەڕاندا، ئەوەستا بەلای سەریانەوە لەکاتی نیشتەجێیاندا، ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ﴾ باراندمان بەسەریاندا گەزۆ و شەلاقە ﴿كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ لە کاتێکدا پێمان گوتن بخۆن لە پاك و خۆشەکانی ئەوەی کە کردمان بە ڕۆزیتان، واتە بخۆن لەو گەزۆ و گۆشتە پاك و خۆش و بەلەزەتە، ئینجا لەگەڵ ئەو هەموو چاکە و بەهرەدا ئەوانە هەر ستەم و سەرکێشییان بەکار هێنا ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ ئەوانە بەو تاوان و سەرکێشییە هیچ ستەمیان نەکرد لە ئێمە ﴿وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵام ئەوانە هەر لە خۆیان ستەمیانکرد، چونکە هیچ جۆرە ڕەخنە و کەم و کوڕی و زیانێك ڕووناکاتە خوا بەڵکو ئەگەڕێتەوە هەر بۆ سەر خۆیان، کەواتە لەڕاستیدا هەموو گوناهبار و ستەمکارێك ستەم لە خۆی ئەکات.

﴿وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٔـٰتِكُمْ ۚ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ﴾

---

**ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ لاریو ناڵەباری ئەو ئیسرائیلییانە بەرامبەر چاکەو میهرەبانییەکانی خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ﴾ باسی ئەوکاتە بکە ئەی پێغەمبەر کەوترا پێیان: بچنە ناو ئەو شارەو نیشتەجێ بن تیایدا ﴿وَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ﴾ بخۆن لە خۆراكو بەرو میوەکەی لە هەر شوێنێ حەز ئەکەنو ئەتانەوێ لەو شارەدا، ئیتر ئەو شارە قودس بووبێ یان ئەریحا ء ناو بردنەکەی هیچ نرخو بایەخێك نادا بەداستانو مەبەستەکە، لەبەرئەوە لێرەو لەوێنەی ئێرە باسی ئەو شتە بێسوودانە ناکات. ﴿وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ﴾ بڵێن: داوای ئێمە سڕینەوەی گوناهە کانمانە ﴿وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾ بچنە قاپی شارەکە بەسوژدە بردنەوە ﴿سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٔـٰتِكُمْ﴾ لەبەر سوپاس کردن لەسەر چاکەو بەهرەی خوا ئەبووینو ئەسڕینەوە لێتان گوناهو خراپەکانتان ﴿سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ واتە بەرامبەر گوێڕایەڵیەکان گوناهو خراپەکانتان ئەسڕینەوە، بێجگە لەوە چاکەکەرەکانتانو ئەوانەتان کە بە ڕێکی گوێڕایەڵی ئەکەن ئەجرو پاداشتیان زیاد ئەکەین بە میهرەبانی خۆمانو بەخشینێکی زیادە لایەنمانەوە.**

**خوای میهرەبان ئەو هەموو چاکەی لەگەڵ کردنو ئەو بەڵێنە گەورەشی پێدان ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ﴾ کەچی ئەوانەیان کە ستەمکاربوون ستەمیانکرد لە خۆیانو ئەو تۆبەو داوای لێبووردنەیان گۆڕی ﴿قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ﴾ بە وتەیەکی تر جیاواز لەو وتەی کە بێیان گوتراو فەرمانیان پێدرا، واتە سەرپێچی تەواویانکردو پێچەوانەی فەرمانەکەی خوا جووڵانەوە، بەجۆرێ دەستی نەئەدا بۆ تەئویلو پینەکردن، ئینجا هەرچەند شێوەی ئەو گۆڕینە لە حەدیسدا هاتووە، بەڵام لەبەرئەوەی ئیسرائیلییات لەم بارەیەوە زۆر هەیەو بڵاوبووەتەوە،**

**هیچ پێویست نییە باسی جۆرو شێوەی ئەو گۆڕینە بکەین‌و تەنها هەواڵەکەی خوا بەسە کە فەرمووی: ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ﴾، بەو گۆڕینەی شایستەی ئەمەبوون کە ئەو سزا سەختەیان بدات‌و هەواڵەکەش بدات بەم شێوەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَظْلِمُونَ﴾ ئینجا بەدوای ئەوەدا ناردمانە سەریان سزایەك لە ئاسمانەوە بەهۆی ئەوەی کە ستەمیان کردو بەردەوام بوون لەسەری، ئەو سزایە هەر جۆرو هەر شتێك بووبێ لە ئاسمانەوە بڕیار دراوەو فەرمانی پێدراوە، کەواتە هیچ جێگەیەکی قسەو باس نییە، ئەو کردەوە بەدانەی ئەوان هەرچۆنێ ستەم ناهەقی بوو، هەروەها یاخی بوون‌و دەرچوونە لە گوێڕایەڵی‌و فەرمانی خوا، کەواتە ئەم موژدەی ئێرە ڕێکەو هیچ دژایەتی نییە لەگەڵ فەرموودەی سوورەتی ﴿البقرة﴾دا کە ئەفەرموێ: ﴿بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾.**

**ئینجا باسی تاوان‌و خراپەیەکی تریان ئەکات کە بە شێوەکی ڕوون‌و ئاشکرا نەیان ئەکرد، بەڵکو ئەیان ویست بەفێڵ‌و تەڵەکە هەڵسن پێی، ئەم چوار ئایەتەی کە هاتووە لەباس‌و بەسەرهاتی ئەم تاوانەدا مەدینەیین‌و خراونەتە ناو ئەم سوورەتە مەککەییی یەو تێکەڵی ئەم ئایەتانە کراون کە هاتوون لەباسی داستانی ئیسرائیلیەکان لەگەڵ موسادا، ئەم چوار ئایەتی مەدینەییە کاتی خۆی لە مەدینەدا هاتن بۆ ئەوەی ئەو تاوانەی کە پێشووەکان کردیان بیدا بە ناوچاوی نەوەکانیاندا کە لەچەرخی پێغەمبەرماندا بوون (ﷺ) هەروەها هەموو داهاتووەکانیان، ئەم چوار ئایەتە لەم شوێنەدا هاتن بۆ تەواوکردنی داستانی ئیسرائیلیەکان لەگەڵ موسای پێغەمبەریان (علیه السلام)، جا شێوەی گێڕانەوەی ئەم تاوان‌و**

بەسەرهاتەی گۆڕی بەم جۆرەی کە فەرمانیدا بە پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەی پرسیار ئاڕاستەی بکات لە جوولەکەکانی سەردەمی خۆیو فەرمووی: ﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ ﴾ پرسیار بکە لێیان لەبارەی ئەو شارەی کە ئامادەو لە نزیك دەریاکە بوون: ناوی ئەو شارو دەریایەی نەبردو دیاریی نەکردن، چونکە ـ وەك چەند جارێك گوترا ـ ئەو ناوبردنو دیاریی کردنە هیچ نرخو بایەخێك نادا بە باسو مەبەستەکە، بەهەر حاڵ زانینی ئەم جۆرە هەواڵو بەسەرهاتو داستانانە بەشێکن لە موعجیزە گەورەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) کە نەخوێندەواربووو ئاگای لەنامەو نووسراوی کەسیش نەبوو کەچی ئەم هەواڵانەی ئەزانیو کە زۆربەی نامەدارەکانیش ئەیانویست بیشارنەوە تا نەکرێن بە بەڵگە بەسەریانەوە، بێگومان ئەو شارو دەریایە ناسراوو زانراوو بوون لای ئەوانەی کە ئەم پرسیارەیان ئاڕاستەکرا، ئەسڵی ئەم ڕووداوە بەم جۆرە بوو: ئیسرائیلیەکان داوایانکرد کە ڕۆژێکیان بۆ دیاریی بکرێ هەر خەیکی خواپەرستی بن تیایداو وازبێنن لە کاروباری ژیانو جیهان، ئینجا ڕۆژی شەممەیان بۆ دیاریی کرا، ئینجا پێویستە تاقی کردنەوە تا دەرکەوێ ڕاستو ناڕاست، بەتایبەتی ئیسرائیلی کە بەهۆی ڕیسوایيو ژێر دەستەیەکی دوورو درێژەوە سروشتو دەروونیان تێکچوو بوو، خوای گەورە ئەو تاقمە ئیسرائیلیەی کە لەو شارەدا بوون تاقیکردەوە بەوەی ماسی ئەو دەریایە لە ڕۆژی شەممەکاندا ئەهاتنە کەنارو خۆیان دەرئەخست کە بەئاسانی بگیرێن بۆ هەر کەسێك کە مەیلی ببوایە، بەلام بەهۆی ئەو پەیمانەی کە دابوویان دەستیان بۆ نەئەبرد! ئینجا لە ڕۆژەکانی تردا ماسیەکان نەئەهاتنو خۆیان دەرنەئەخست، ئینجا ئەوانیش فرو فێڵێکیان فەراهەم هێنا، بەم ڕەنگە داویان بۆ دائەنانو بەریان لێ ئەبرینەوە لە ڕۆژی شەممەداو لە ڕۆژی دواییدا ئەیانگرتن، ئەیانگوت: لە ڕۆژی شەممەدا نەگیراوان!

إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٣﴾

---

**وەك دەست نیشان ئەكات بۆ ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ﴾ واتە پرسیار بكە لەو كاتەی كە دانیشتوانی ئەو شارە ستەمو دەست درێژییان ئەكرد لە ڕۆژی شەممەدا ﴿إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ﴾ لەو كاتەدا كە ماسیەكان ئەهاتن بۆلایان لە ڕۆژی شەممەكەیاندا ڕێزیان ئەگرتو كارو كردەوەیان واز لێئەهێنا، ئەو ماسیيانە لەو ڕۆژەدا ئەهاتن ﴿شُرَّعٗا﴾ بەدەركەوتوویی بەسەر ئاوەكەو نزیكی لە قەراغییەوە، كەواتە بەئاسانی ڕاو ئەكرانو ئەگیران ﴿وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡ﴾ ڕۆژێ كەلە شەممەدا نەئەبوونو غەمی قەدەغە شكاندنی شەممەیان نەئەبوو ماسیەكانیان نەئەهاتن بۆ لایانو دەرنەئەكەوتن وەك كە ڕۆژەكانی شەممە، ئەوەش بە فەرمانو تەگبیری خوا هەركەس ژێر بێ هەرگیز سەرناكاتەوە لە شتی واو ئەزانێ هەرچی خوا مەیلی ببێ هەر ئەوە ئەبێ، بەوە تاقیكردنەوەكە پێك هاتو وەك ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم﴾ بەو جۆرە تاقیكردنەوە نایابە ئێمە ئەوانەمان تاقیكردەوە، واتە كردەوەمان لەگەڵ كردن بەوێنەی كردەوەی كەسێك كە مەردوم تاقی بكاتەوە، تاقیمان كردنەوە تا ئەوەی كە ئێمە ئەیزانین لە بارەیانەوە ئەوان بەكردەوە بەدی بێننو ئەو كاتە ئێمەش بەپێی كردەوەكەیان پاداشتیان دەربارە بكەین، بەو جۆرە تاقیمانكردنەوە ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ﴾ بەهۆی ئەوە ئەوانە باوو پیشەیان وا بوو دەرئەچوون لە فەرمانی خواو سەرپێچیان ئەكرد لێی، ئەم وتانە لە ﴿يَعۡدُونَ﴾ەوە تائێرە بەڕواڵەت كردەوەی ڕابردوو نین، بەڵام تەفسیرم بە ڕابردوو كردنەوە، چونكە مەبەست گێڕانەوەی بارو حاڵی ڕابردوویانە، بەو وتانە ئەو بارو حاڵانە ئەخاتە بەر چاو كە ئەوەش باوێكە لەباوەكانی ڕەوانبێژی. دانیشتوانی ئەو شارە بوون بەسێ بەش: بەشێكیان ئەو تاوانەی كردو قەدەغەی خۆی شكاند وەك باسكرا، بەشێكی تریان جڵەوگیرییان ئەكردو ئامۆژگاری تاوانبارەكانیانكرد، بەشی سێیەم بێدەنگ بوونو ڕەخنەیان ئەگرت لەجڵەوگیریی كەرەكان،**

﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾

---

**وەك ئەم دووانەش دەرئەكەون لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ﴾ واتە پرسیار بکە لە جوولەکەکان لەبارەی دانیشتوانی ئەو شارە لەکاتێکدا کە دەستەیەکیان دەست درێژییان کردو قەدەغەی خوایان شکاندن، لە کاتێکدا تاقمو دەستەیەك لەوان ئەیانگوت بەوانەیان کە جڵەوگیرییان ئەکرد لەدەست درێژیی کەران: ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ ئایا لەبەرچی ئامۆژگاری کۆمەڵو دەستەیەك ئەکەن کە خوا لەناویان ئەبات، یان سزایان ئەدات بە سزایەکی بەیتن، واتە ئەوانە کۆتایی ناهێننو ناگەڕێنەوە بۆلای خوا، بەهۆی ئەوەوە خوا لە ڕیشەیان ئەهێنێو لەناویان ئەبات، یان سزایەکی بەتینیان ئەدات، کەواتە هیچ سوودێك نییە لە جڵەوگیریی و ئامۆژگاریانو هەرچی بڵێن بێباوەڕەکانی هودەیە؟ ئەمانیش لە وەڵامدا پێیان گوتن: ﴿قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ﴾ ئامۆژگاریو جڵەوگیرییان ئەکەین لەبەر دووشت:**

١- **بۆ عوزرو بەهانەمان لای خوای پەروەردگارتان تا تاوانبار نەبین لەسەر بێدەنگ بوون لە گوناهو تاوان، واتە جڵەو گیریی لە گوناه فەرزو پێویستەو ئێمە هەڵئەسین بە پێویستی سەرشانمان، مەبەست بە وتەی (إلى ربكم) بەرامبەر پەروەردگارتان، پلاردانە لێیان کە چۆن ئێوە هەڵناسن بە پێویستی سەرشانی خۆتان.**

٢- **﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە خۆیان بپارێزنو کۆتایی بێننو بگەڕێنەوە بۆلای خوا، واتە ئێمە نازانینو نائومێد نین لە گەڕانەوەیان، کەواتە ئامۆژگاریان ئەکەین بەئومێدی خۆپارێزیو گەڕانەوەیان.**

﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ﴾ ئینجا کاتێ دەست درێژی کەران لە بیریان چوو ئەوەی کە ئامۆژگاری کران پێی، واتە گوێیان پێنەداو بە خەیاڵیشیاندا نەئەهات وەك هەر لە بیریشیان چووبێ ﴿أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ﴾ ڕزگارمانکرد ئەوانەی کە جڵەو گیریانکرد لە گوناهو خراپەکە ﴿وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ﴾ ئەوانەی کە ستەمو دەست درێژیانکرد گرتنمان بە سزایەکی بەتین ﴿بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ بە هۆی یاخی بوونو دەرچوونیان لە فەرمانی خواو بەردەوامییان لەسەریو کۆتایی نەهێنانیان لە خراپەکاری ﴿فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ﴾ ئینجا کاتێ خۆیان بە زل زانیو سەرپێچیانکرد لە کۆتایی هێنان لەوەی جڵەوگیریی کران لێی ﴿قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾ پێمان گوتن ببن بە مەیمون بە زەلیلیو ڕیسوایی و دوور لە هەموو خێرو خۆشی، واتە گێڕانمانن بە مەیمون بە زەلیلیو ڕیسوایی، ئینجا ئایا مەبەست بە سزا بەتینەکەی پێشوو ئەمە بێباوەڕەکانی یان سزایەکی تری جیاواز بێباوەڕەکانی، بەم ڕەنگە لە پێشەوە دووچار کرابن بە ناڕەحەتیو تەنگ گوزەرانی، ئینجا بەوە تەمێ خوار نەبوون تا خوا ئەمەشی بەسەرهێنان؟ ڕووکەشو ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەم باری دووەمە ئەگەیەنێ، ئینجا ئایا کرابن بە مەیمون لە دیمەنو شێوەدا وەك (مجاهد) ئەفەرموێ؟ لەسەر باری یەکەم (ئیبنو عەباس)-خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ: سی ڕۆژ بەو شێوە مانەوە تا خەڵکی بینینی، لەپاش ئەوە خوا مراندنیو لەناوی بردن، نابێ سەر لەوە بکرێتەوە، چونکە خوای گەورە مەیلی هەرچی بکات ئەبێ، ئینجا ئایا ئەوانەش کە بێدەنگ بوون گێڕران بە مەیمون یان هەر ئەوانەی کە قەدەغەکەیان شکاند؟ هێندێ لەسەر باری یەکەمن، ئەوانەش هەر بەری ستەمکار ئەکەون بەهۆی بێدەنگ بوونەکەیانەوە، بەڵام ڕای بەهێز ئەوەیە کە ئەمانەش هەر ڕزگار بوون، بەڵام قورئان لێیان بێدەنگ بوو لەبەرئەوەی ئەو نرخەیان نەبوو کە ناویان ببات،

﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ﴾

**ئینجا جاڕی نەفرینی هەتاهەتایی ئەدات لە هەموو جوولەکە بێجگە لەوانەیان کە بڕوا ئەهێنن بە پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەوە بکە کە پەروەردگارت ڕای گەیاندو دای بە گوێچکەی هەمواندا کە بێگومان ڕەوانەی ئەکات و زاڵ ئەکات بەسەر جوولەکەکاندا، واتە جولەکەکانی پاش ڕەوانە کردنی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە بڕوای پێنەهێنن وەك زۆربەی زانایان ئەفەرمون، زاڵ ئەکات بە سەریاندا هەتا ڕۆژی دوایی کەسێك کە سزای بەدیان پێ بچەژێ، ئەمە بڕیاری خوایەو هەمیشەییە کە جوولەکە بەهۆی بەدی و کردەوەی بەدیانەوە خوا لەم جیهانەدا تۆڵەی لێ سەندن لەسەر دەستی مەردومانـدا، هەرچەند بەین بەین و بە ڕواڵەت لە خۆشی و سەرکەوتن و دەسەلاّتدا بن وەك ئێستای ئەم چەرخ و سەردەمە کە بەهۆی هەموو دەوڵەتە گەورەکانی جیهانەوەو بەیارمەتی ئەوان میری و دەوڵەتێکیان بۆ فەراهەم هێنان لە فەلەستیندا، بەلاّم لەو کاتەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە ئارامی و خۆشی دانەنیشتوون و هەناسەیەکی ڕەحەتیان نەدا، بڵکو هەمیشە بە ترس و لەرزو بێئارامیەوە ژیان بەسەر ئەبەن، هەمیشە جەنگ و کوشتارو ترس و برسێتی بەشیانە، ئەگەر ئەمەریکاو ئاغاکانی تریان ماوەیان بدەن بلاّوەی لێ ئەکەن و داریان بەسەر بەردیانەوە نامێنێ، دواترین بەسەرهاتی سەختیان کە ئارامی لێ بڕیون ئەم شۆڕشی بەردەیە کە هەموو جیهان سەری سوڕماوە لێی، لە ئایەتی (٥٣)و (١١١)ی سوورەتی (آل عمران)دا ئەندازەیەك بە درێژی باسی جوولەکەمان کردو بە پێویستم نەزانی دووبارە کردنەوەی، با سەرنج بدرێ.**

**خوای پەروەردگار ئەم جاڕەی داو بەدوای ئەوەدا فەرموودەیەکی هێنا، کە دوو جۆر لە سیفەتەکانی خوا نیشان ئەدات: بە جۆرێکیان بیم و ترس ئەخاتە دڵی سەرکێشان و بە جۆرەکەی تریان ئومێدو چاوەڕوانی ئەخاتە بەر چاو بۆ ئەوانەی کە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بەڕاستی خوای پەروەردگارت تۆڵەی چەسپانە بۆ هەرکەسێك کە شایستەیە پێی،**

وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعْنَٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ

---

**﴿وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستیو بێگومان لێبوردەو میهرەبانە بۆ هەرکەسێك کە بڕوای ببێو بگەڕێتەوە بۆلای خوای خۆی، کەواتە پاداشتو تۆڵەو سزادانەکەی بە دادو دادپەروەریە.**

**ئینجا داستانەکە چەند هەنگاوێکی تر ئەنێ لەگەڵ هەنگاوەکانی مێژوودا، لەپاش موسا لەگەڵ چینو تاقمەکانی ئیسرائیلیەکاندا تا ئەگاتە ئەو چینو تاقمەی کە کەوتنە چەرخو سەردەمی هاتنی ئیسلام، ئەفەرموێ: ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا﴾ بەش بەشو پارچە پارچەمانکردن لە زەویدا بە چند کۆمەڵو تاقمێك یان گێڕامانن بە چەند کۆمەڵو تاقمێك لە وڵاتاندا لە پاش ئەوەی یەك گەلو ئوممەت بوون، ئەمەش بەشێکە لە ئایەتە مەدینەییەکان کە لەم شوێنەدا هات بۆ تەواو کردنی داستانی ئیسرائیلیەکان لەپاش موسا (علیه السلام) بەشێکە لە هەواڵە غەیبییەکانی قورئان کە لەو کاتەدا هیچکەس نەیدەزانیو ئێستا دەرئەکەوێ هیچ وڵاتێك نیە مەگەر کۆمەڵ و تاقمێك جوولەکەی تێدایە! دیارە ئەو بەش بەش کردنەش بەشێکە لە تۆڵەیان تا هێزو شەوکەتێکیان نەبێ، بەش بەشمان کردنو گێڕانمان بە چەند کۆمەڵو تاقمێك ﴿مِّنْهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ هێندێ لەوان پیاوچاكو ساڵح بوون کە ئەوانە بوون بڕوایان هەبوو بە خواو پێغەمبەرەکەیو لەسەر ئایینەکەی دامەزراو بوون لەپێش هاتنی عیسادا (علیه السلام) ئەمە ڕای (طبری)یە، لە (ئیبنو عەباسو هندی)یەوە ئەگێڕنەوە**

کە مەبەست ئەوانەیە کە لە چەرخی پێغەمبەردا بوونو بڕوایان هێنا ﴿وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ﴾ هێندێ لەوان کەسانێ بوون کە پەستو جیاواز بوون لەو چاکانە بەم ڕەنگە چاکەیشو خراپەیشیان بوو، یان پەستو جیاواز بوون وەك بێبڕواو تاوانبارو خراپەکارەکان، ﴿وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ﴾ تاقیمانکردنەوە بە چەند چاکەو بەهرەو خۆشیو بە چەند ناخۆشیو بەسەرهاتی بەدو خراپ ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکو بە ئومێدی ئەوەی بگەڕێنەوە بۆلای خواو ڕێگەی لارو چەوت نەدەنە بەر، بێگومان ئەو تاقیکردنەوەش چاکەو میهرەبانیەکی ترە کە خوا لەگەڵی کردن، وەك لە هەمان کاتدا نەهێشتنی هیچ بڕوبیانوویەکە بۆ ئەوانەی کە نەگەڕانەوە ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ﴾ ئینجا هات بە دوای ئەو گەلو کۆمەڵەی کە چاكو خراپو بەدیان هەبوو، دانیشت لە جێی ئەوانەدا، یان هات بەدوای ئەو پیاوچاكو ساڵحانەدا دەستەو تاقمێکی جێنشینی ئەوانە کە ﴿وَرِثُوا الْكِتَابَ﴾ بە کەلەپوور ئەو نامەو کتێبەی کە تەوراتە وەریان گرت لە پێشووەکانیانەوە،

ئینجا بارو حاڵیان بەم جۆرە بوو کە ئەیخاتە بەر چاوو ئەفەرموێ: ﴿يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ﴾ شتو مەكو دەست کەوتی کاتی ئەم جیهانە نزیکە، یان ئەم جیهانە کەم نرخە وەرئەگرنو بەکاری ئەهێنن، وەك بەرتیلو شتە حەرامەکان، ئینجا وەك ئەو گوناهو کارە بەدانە ئەکەنو بێباکن لێیو مەترسییان نیە لە تۆڵەو سزاکەی، چونکە وا ئەزانن و ئەڵێن: ﴿وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا﴾ بێگومان لێبووراوو چاوپۆشی لێکراو ئەبین لەلایەن خواوە، چونکە خۆیان بە خۆشەویستو گەلی هەڵبژێرراوو کەسو کاری خوا دائەنێن، گەڕانەوەو پەشیمانیشیان نیە لەو کردەوە بەدانەو هەر بەردەوامن لەسەری وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ﴾ ئەگەر شتو دەست کەوتی تری وێنەی ئەوەی پێشوویان بۆ بێتو دەستیان کەوێ وەری ئەگرنو بەکاری ئەهێنن، ئینجا دەم کوتیان ئەکاتو بەرپەرچی ئەو گومانو لاف لێدانەیان ئەداتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ﴾ ئایا وەرنەگیراو پێویست نەکراوە لەسەریان پەیمانێ کە باسکراوە لە نامەی

خـوادا، واتـه تـەورات، پەیمانەکـە ئەمەیـە: ﴿أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾ نـەڵێن بـە دەم خـواوە بێجگـە لـەوەی کـە هـەقو ڕاسـتە، واتـە بـەڵێ وەرگـیراوە لێیـان ئـەو پەیمانـە، ﴿وَدَرَسُواْ مَا فِيهِ﴾ ئەوەی لەو نامەدا هاتبوو خوێندیان و تێگەیشتن لێی، واتە وریاو بەهۆشو ئاگاداریش بوون لێی، کەواتە هیچ بڕو بیانوویەکیان نیە لەو گوناهو لادانەیان، ئەوانە بەو کردەوە بەدانەیان دەسـت بـەرداری ڕۆژی دواییـان ئـەبن، ﴿وَٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ ڕۆژی دوایـی و دەستکەوتی ئەو ڕۆژە چاکە بۆ ئەوانەی کە خۆیان ئەپارێزن لە لادان لەڕێگەو بەرنامەی خوا، ئینجا ئـەم سەرزەنشتە سـەختە ئاراستەی ئەوانـە ئـەکات کـە ئـەو پەیمانـەیان لێ وەرگیراوە، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نینو نافامن ئەوەی کە ئامۆژگاری کران پێی تا ئـەو کـارو کـردەوە بەدانـە نەکـەن کـە نـازو ڕێـزی ڕۆژی دواییتـان لـە دەست دەر ئـەکاتو دووچاری سزای سەختی نەبڕاوەی ئەو ڕۆژەتـان ئـەکات؟ واتـە با ژیـر بنو خۆتـان بەدبەخت نەکەن، ئەم ڕۆژی دواییە داهاتوو و نهێنیو غەیبێکە لە نهێنیو غەیبەکانی خوا کە بەندێکە لـە بەنـدەکانی هـەموو ئـاینو شـەریعەتو بەرنامـەکان کـە خـوای میهرەبـان بەخـشی بـە بەندەکانی، هیچ ژیانێك بە ڕێكو ڕاست ناڕوا بەبێ بڕوا بەو بەندە، بوونو هاتنی ئەو ڕۆژە پێویستو داخوازی دادو کاردروستی خوایە، لەبەر ئەوە هەرکەسێك ژیر بێتو چاوی دڵـی بینا بێت بڕوای هەیە بەو ڕۆژە، بەڵام بانگکەرانی ڕێگەی (ئیشتراکیێتی عیلمـی) بە هـەموو هێز ئەیانەوێ بڕوا بە غـەیبو نهێنیەکان لـە دڵو دەروونو ژیریـیو بیروباوەڕەکانی مـەردوم نـەهێڵنو دەری کـەن و لـە جێگـەی ئـەو بۆچـوونێکی بۆگـەنو نـەفامیو نابینـا بـچەسپێنن کەناوی ئەبەن بە (علمی!) کەواتە ئەوانە دوژمنی ڕاستەقینەی ئادەمیو مرۆڤایەتین، نەفرینی خوایان لێبێت. ئینجا بەرامبەر لادانی ئەو جوولەکانە فەرموودەیەك ئەهێنێ کە گوێڕایەڵیو فەرمانبەری بۆی مایەی دەستکەوتی نـازو ڕێـزی ڕۆژی دواییە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئـەو کەسـانەی کـە بەتونـدی دەسـت ئـەگرن بەنامـەی خـواو پـەیڕەوی ئەکەنو بەڕێکی نوێژ بەجێ ئەهێنن،

﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ﴾ بێگومان ئێمه زایەناکەین ئەجرو پاداشتی چاکەکاران، ئەوانەی کەلەجێگای خراپە چاکە ئەکەن‌و خراپە لائەبەن‌و ئەیگۆڕن بە خراپە، واتە ئەوانەی کە بەتوندی‌و هەمیشەیی دەستیان گرتبێ بە نامەکەی‌و ڕێکی نوێژیان بەجێهێنابێ ئێمە ئەجرو پاداشتیان زایەناکەین، چونکە ئەوان چاك کاری خراپەن‌و لە جێگاو لە باتی خراپە ئەهێنن‌و ئەیکەن، یان ئێمە ئەجرو پاداشتی چاك کارانیان زایەناکەین، بە تایبەتی باسی نوێژی کرد لەبەر گرنگی نوێژ تا ئەو ڕادەی دانراوە بەپایەی ئایین، ئینجا نەیفەرموو: ﴿و یقیمون﴾ بەوێنەی ﴿يُمَسِّكُونَ﴾ کە هەمیشەیی‌و بەردەوامی نیشان ئەدەن، چونکە دەستگرتن بەنامەی خواوە بە هەمیشەیی پێویستە، بەڵام بەجێهێنانی نوێژ هەمیشەیی‌و لە هەموو کاتدا نیە، بەڵکو کاتی تایبەتی بۆ دیاری کراوە، پاك‌و بێگەری بۆ خواو بۆ قورئانەکەی خوا، ئینجادەست نیشان هەیەبەدووشتی زۆر گرنگ کەژیان بەبێ ئەو دووانە چاك نابێ‌و تاڵ بوون‌و شێوازی ژیان‌و جیهان لە هەموو چەرخێکدا ئەگەڕێتەوە بۆ واز هێنان لەو دووانە:

١- دەست گرتن‌و ڕەفتارکردنی بەهێزو بەڕاستی بەنامەو بەرنامەی خوا، گێڕانی تەنها ئەوە بە کاربەدەستی ژیان.

٢- عیبادەت‌و پەرستنی خوا کە نوێژ سەردەستەیەتی‌و تەنها بەو پەرستنە ڕاستەقینە دڵ‌و دەروون چاك ئەبێت، تەنها بەهۆی ئەو پەرستنە ڕاستەقینە نامەو بەرنامەی خوا بەجێ ئەهێنرێ‌و بەدی ئەهێنرێ بەبێ فێڵ تەڵەکەو خۆ دزینەوە کە نامەدارەکان لەپێش ئێمەوە کردیان، زۆر کەسیش لە ئێمە کردی کاتێ کە پچڕاو سستی کرد لە عیبادەت‌و خواپەرستی‌و بە هۆی ئەوەوە ترس‌و خۆپارێزی نەما لەەروونداً. فێڵ‌و تەڵەکە بازی لە نامەو بەرنامەی خوا ئێجگار تاوانێکی سەخت‌و سامناکە، لەبەر ئەوە قورئان لەچەند شوێن‌و ئایەتەکانیدا بە توندی گرتوویەتی‌و هەڕەشەی سەختی لەسەر کردووەو گێڕاویەتی بەهۆی سزای هەردوو جیهان، سزای سەختی جیهان تا ئەو ڕادەی هێندێ لەو فێڵ‌و تەڵەکە بازانەی گێڕا بە مەیموون‌و شێوەی ئادەمێتی لێ داڕنێن وەك لەئایەتی (١٦٣و١٦٤)ی ئەم سوورەتەدا تێپەڕیکرد‌و سزای بێباوەڕەکانی وێنەی ڕۆژی دوایی بەئاگری دۆزەخ، خوا پەنامان بدات لەو تەڵەکە بازیەو سزاکەی هەردوو جیهانی ـ ئامین ـ.

۞ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ

**ئینجا کۆتایی داستانەکەی موسا ئەهێنێ بە ئایەتێك کە پەیوەستیەکی بەهێزی هەیە بەسەرەتای داستانەکەوە کەباسی ناردنی نامەی خوای کرد بۆ سەریان، لێرەیشدا باسی ئەوە ئەکات کە بە شێوەیەك پەیمانی لێ وەرگرتن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتەو ڕووداوی ئەو کاتە بکە کە شاخی تورمان بەرز کردەوە بەلای سەرویانەوە بەجۆرێ ﴿كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ﴾ وەك ئەو شاخە پارچە هەورێك بێت یان کەپرو سایاتێك کە سێبەر ئەکات بۆلای ژێری خۆی ﴿وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ﴾ لایان وابوو کە ئەکەوێ بەسەریاندا، ﴿خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ پێمان گوتن ئەوەی کە پێمان بەخشیون وەری گرن بەهێزو بە توندیو بە جددی، ﴿وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ﴾ لەبیرتان بێت ئەوەی کە لەو نامە بەخشراوەدا هەیەو ڕەفتاری پێبکەن، نەك وازی لێبێنن و لەبیری دەرکەن وەك شتێکی لەبیرچوو، ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو بەهۆی ئەوەوە خۆتان بپارێزن لە کردەوەی بەدو خوو ڕەوشتی خراپ، یان ئەوە بکەن بە ئومێدو چاوەڕوانی ئەوەی بچنە ڕیزی خۆپارێزان و لەخواترسان، ئەوانە ملەجەڕێیان ئەکردو ئەیانویست بە هەر جۆر بووە ئەو ئەرکەیان نەخرێتە سەرشان، ئەرکی ڕەفتار کردن بەو فەرمانانەی کە لەو شەریعەتەدا داوایان لێکرا، لە پاشان خوای پەروەردگار بەو شێوەی کرد کە کردی: فەرمانیدا بە جوبرەئیل کە شاخی تور هەڵکەنێ و بەرزی بکاتەوە بەلای سەریانەوەو پێی فەرموون: ئەگەر وەری ئەگرن و پەیمانی لەسەر ئەدەن ئەوا چاکە ئەگینا ئەکەوێ بەسەرتاندا. بەو جۆرو شێوەیەو بەرامبەر ئەو موعجیزە کەس نەدیوە ئەو پەیمانەی**

لێ وەرگرتن کە شتی وا هەرگیز لەبیر نەچێو بە هیچ ڕەنگ پاشگەز بوونەوە ڕووی تێنەکات، بەڵام ئەو ئیسرائیلیانە ئەوانە بوون کە خوایان لەبیر چوو، پاشگەز بوونەوە لە پەیمانەکانیان، سەریانکردە تاوانو ستەمکاری، تا شایستەی قینو نەفرینی خوا بوون!!

ئینجا لەم ئایەتی (١٧٢)ەوە تا ئەگاتە ئایەتی (١٩٨) ئەخولێتەوە بە دەوری مەسەلەی تاکو تەنیایی خواو هاوبەش ڕەوادان بۆی - پاکی بۆ زاتی پاکی بێوێنەی - بە تایبەتی هەرچەند مەبەستی هەموو سوورەتەکە هەر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەسەلەیە، کۆتایی داستانی ئیسرائیلیەکانی هێنا بەباسی پەیمان وەرگرتنی خوا لێیان لە ژێر سێبەری شاخی توورداکە بەرزی کردەوە بەلای سەرووریانەوەو بەو جۆرە ئەو پەیمانەی لێ وەرگرتن، ئینجا ئەوا بەدوای ئەو ئایەتەدا ئایەتێك ئەهێنێ کە باسی پەیمانی هەرە گەورە ئەکات کە خوا پێویستی کرد لەسەر سروشتی ئادەمی، ئەو پەیمانە نیشان ئەدات لە شێوەیەکی زۆر نایابتر لە شێوەی شاخەکەی تور کە لە جێگەی خۆی هەڵکەنراو بەرز کرایەوە بەلای سەرووی ئیسرائیلیەکاندا، کەواتە ئەو ئیسرائیلیانە هەرچۆنێ بەشارن لەو پەیمانەتایبەتیەکەی خۆیانداو سەرزەنشت ئەکرێن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی، هەروەها بەشدارن لەم پەیمانە گشتیەداو پرسیاریان لێ ئەکرێ لەم پەیمانەش، بەم بۆنەیەوە ئەم پەیمانە گشتیە هێنراوە بەدوای پەیمانە تایبەتیەکەیاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە پەروەردگارت وەری گرتو دەری هێنا ڕۆڵەو نەوەکانی ئادەم، وەری گرتو دەری هێنا لە بڕبڕەکانی پشتیان سك لەدوای سكو چین لەدوای چین ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ کردنیو گێڕاندنی بە شایەت لەسەر خۆیان بەم ڕەنگە پێی فەرموون: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش لە وەڵامدا ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان: ﴿بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾ بەڵێ شایەتیماندا، واتە بە گوتنو بە دەمیان، واتە بە جۆرێ دروستی کردوون کە ئەو شایەتیە بدەنو بە زوبانی حاڵ ئەوە بڵێنو شایەتی دان هەرچۆنێ بە گوتن پێکدێت هەروەها بە

کردەوەش پێکدێت، بەو جۆرە لە قورئاندا هاتووە لە چەند شوێنێکدا، یەکێ لەوانە لە سوورەتی (العادیات) ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ بێگومان ئادەمی شایەتە لەسەر ئەوەی کە سپڵەو ناسوپاسە بۆ خوای پەروەردگاری، دیارە بە کردەوە شایەتی ئەدات نەك بە دەمو گوتن، ئەوەتا ڕەفتارو کرداری پێچەوانەی فەرمانی خوایە، بێگومان حاڵو باری سروشتی ئەم ئادەمیە شایەتە لەسەر ئەوەی کە خوای پەروەردگار خاوەن و کاربەدەستیەتی، بە هیچ جۆر ڕێگەی نیە شتێکی تر بڵێ، سروشتی ئادەمی لەسەر ئەوە داڕێژراوەو ئەبێ هەر وابێ مەگەر شتێك وەری گێڕێو بیترازێنێ لەسەر سروشتە پاكو ڕاستەکەی خۆی، هەموو بەش و پارچەو سێڵێکی ئادەمی بە زبانی حاڵو سروشتی ئەم شایەتیە ئەدات، بەڵکو هەموو بوونەوەر بە هەموو بەش و پارچەو سێڵەکانیەوە شایەتی ئەدەن لەسەر تاك و تەنیایی خوای پەروەردگاریان، چونکە هیچ ڕێگەیەکی تریان نیە، ئایا خۆیان خۆیان دروستکرد؟ ئایا بەڕێکەوت بەدی هاتن؟ بێگومان هیچ کام لەو دوو بارە نابێ و ناگونجێ، کەواتە هەر ئەوە مایەوە کە خوا دروستی کردوون، کەواتە هیچ کەسێکی تر هیچ بڕوبیانوویەکی بە دەستەوە نیەلە ڕۆژی دواییدا کە پەڕۆی بەدیو خراپەکەی خۆی پێبکات وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ﴾ واتە خوا بەو جۆرە ئادەمی گێڕا بە شایەت لەسەر خۆیان تا نەڵێن لە ڕۆژی دواییدا: بەڕاستی ئێمە بێئاگا بووین لە تاك و تەنیایی پەروەردگارمان و ئاگادار نەکرابووین لەسەری. ﴿أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ﴾ یان ئەڵێن: هەر باوك و باپیرمان هاوبەشیان ڕەوادا لە پێشەوە، واتە ئەوان دایانهێنا لە پێش چەرخ و زەمانی ئێمەدا، ئێمە بەچەو نەوە بووین، پاش ئەوان بەجێماین و شوێنی ئەوان کەوتین کە بە شوێن و ڕێگەی خواپەرستیمان ئەزانی،

﴿أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ دەی ئایا تۆ ئێمە ئەگریت بە سزادان‌و ئەمڕۆ بە هیلاکمان ئەبەیت بەهۆی ئەوەی کە ناهەق کەران کردیان کە باوك‌و باپیرە گومڕاکانمانە؟ واتە ئەگەر ئادەمی لەسەر ئەو سروشتە دانەڕێژرایەو ئەو ئامادەییەی نەبوایە بۆ خواپەرستی، ئەوانەی کە بێئاگاو شوێن کەوتوون ڕێگەیان بۆ عوزر بهێننەوە بەو جۆرەی کە باسکرا، بەڵام ماتوڵ بەو شێوەیە دروستکراون ئیتر بۆیان نیە عوزر بهێننەوە، ئەم ئایەتە بەم جۆرە تەفسیر کراوەتەوە لای زۆر لە زانایانی ئوممەتلە چین‌و تاقمەکانی پێشووو زۆربەی زانایانی چەرخی دوای ئەوان، بەڵام زۆربەی زانایانی حەدیس لەسەر ئەوەن کە خوا پەیمانی وەرگرت بە گوتن لە هەموو نەوەی ئادەم بە یەك جار بەم ڕەنگە هەرچی نەوەی ئادەمە تا ڕۆژی دوایی دەری هێنان لە پشتی ئادەم لە بچووکترین شێوەیاندا، ئینجا پێی فەرموون: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾ئەمە بۆ ئەم ڕۆژە جێگەی سەر لێکردنەوە نیە، پاش دەرکەوتنی میکرۆب بە ملیارەها ئەبینرێن بە زیندوویی لە دڵۆپێ خوێن یان ئاودا، لەم بارەیەوە چەند ڕیوایەتێك هاتووە، یەکێ لەوانە ئەم ڕیوایەتەیە کە (ئیمامی ئەحمەدو نەسائی) لە (ئیبن‌و جەریرو ئیبن‌و مەردەویەو بەیهەقی‌و حاکم کە بە حەدیسی سەحیحی دائەنێ)، ئەوانە لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوایان لێ ڕازی بێ- ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە ئەفەرموێ: خوا پەیمانی وەرگرت لە پشتی ئادەم، بەم ڕەنگە هەرچی نەوەی ئادەم کە پەیدا ببێ تا ڕۆژی دوایی لە پشتی دەری هێنان‌و بڵاوی کردنەوەو ئینجا قسەی لەگەڵ کردن‌و پێی فەرموون:﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾ بە کورتی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا سێ ڕا هەیە:

١- خوا پەیمانی وەرگرت لە هەموو بەچەو نەوەکانی ئادەم، بەم ڕەنگە دەری هێنان لە پشتی باوکەکانیان چین لە دوای چین‌و ئینجا ئەو پەیمانەی لێ وەرگرتن وەك لە یەکەم جارەوە گوتمان کە کردمان بە تەفسیری ئایەتەکە.

١- خوا پەیمانی لێ وەرگرتن، بەم ڕەنگە هەمووی دەرهێنان لە پشتی ئادەم وەك باسمان کردو ئەو حەدیسەمان لەسەر هێنایەوە.

٢- لەسەر باری یەکەم مەبەستە، بەڵام بە شێوەی چیرۆك نەك لە ڕووی ڕاستیدا، واتە ئادەمی بە جۆرێ ئامادەیی تێدایە بۆ خواپەرستی، لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو بەڵگەو ڕابەرو نیشانە ئاشکرایانەی بەدەوردایە، وەك هەرکامێك گەیشتبنە ئەو ڕادەو پلەیە کە ئەو پەیمانەیان لێ وەرگیرابێ، بێگومان هەرسێ ڕاکە جێگەی قسەو باس‌و

لێکۆڵینەوەیەو قسەو لێکۆڵینەوەی زۆریشیان تیا کراوەو هەرکەس ئەیەوێ با سەرنجی کتێبە گەورەو درێژەکان بدات، وەك ڕازی و مناو ئالوسی، بە لامەوە باشە هێندێ لەو قسەو باسانە بخەمە بەرچاو:

ڕای یەکەم: هەرچەند ڕێك و پێك ترە لەگەڵ ڕووکەش و ڕواڵەتی دەقی ئایەتەکەدا، بەڵام ناگونجێ لەگەڵ ئەو حەدیسەی کە هێنامان، هەروەها چەند حەدیس و ڕیوایەتی ترکە وا نیشان ئەدەن ئەو بەچەو نەوەیانە لە پشتی باوکی هەمووان ئادەم دەرهێنران، زۆر لە زانایانی تەفسیر لە چینی یەکەم و دووەمی ئوممەت تەفسیری ئەم ئایەتەیان بە پێی ئەو حەدیس و ڕیوایەتانە کردووەتەوە.

ڕای دووەم: هەرچەند ڕێکە لەگەڵ ئەو هەموو ڕیوایەتانەدا، بەڵام لەگەڵ ڕووکەشی ئایەتەکەدا یەك ناکەوێ، مەگەر بە تەئویل و پینەو پەڕۆی زۆر، چونکە بە پێی ئەو ڕایە ئەبوایە دەقی ئایەتەکە بەم جۆرە بوایە: (و إذ أخذ ربك من آدم من ظهره ذريته) باسی ئەو کاتە بکە کە خوای تۆ دەری هێنا لە پشتی ئادەم نەوەو بەچەکانی، لەسەر هەردوو ڕاکە ئەم پرسیارە ئەکرێ: بێگومان هیچکەس ئەو پەیمانەی لەیاد نیەو بێ ئاگایە لێی، کەواتە چۆن ئەو پەیمانە ئەکرێ بە بەڵگە بە سەریەوەو ئەبێ بە بەرپرسیار لێی؟! هەرچەند وەڵام دراوەتەوە بەڵام بەڕاستی ئارام نادات بە دڵ.

ڕای سێیەم: هەرچەند ئەو پرسیارو ڕەخنەی نایەتە سەر، هەرچەند لەگەڵ حەدیسێکیشدا ڕێکە، بەڵام لەگەڵ چەند ڕیوایەت و حەدیسی تردا یەك ناکەوێ، بێجگە لەوەش لادانە لە ڕووکەش و لە ڕواڵەت، وازهێنانە لە ماناو واتای حەقیقی و دەستگرتن و ڕۆیشتن بۆ ماناو واتای مەجازی، بە هەرحاڵ و لەسەر هەر بار ئێمە بڕوای بێگومانمان هەیە کە ئەوەی کە خوا بڕیاری داوەو فەرموویەتی هەر ئەوە هەق و ڕاستە ئیتر ئێمە تێ ئەگەین یان نە، لەسەر هەر بار خوای میهرەبان تەنها بە پێی ئەو پەیمانەو بە پێی داخوازی ژیریی ڕەفتاری نەکردو نایکات لەگەڵ بەندەکانی، بەڵکو لەگەڵ ئەمانەدا نامەو فروستادەی نارد بۆ سەر بەندەکانی و لە پاش ڕاگەیاندنی ڕوون و ڕەوان، ئینجا بەندە بەرپرسیارە، ئەگەر تەنها ژیریی و سروش بەس بوونایە بۆ ڕێنموونی و پێویست نەبووایە بە فروستادەو پەیامەکانی خوا، پێویستی نەبوایە بە ئامۆژگاری و ڕوون کردنەوەی بەڵگەو نیشانەکان، ئەگەر بەو جۆرە بوایە خوا بەندەکانی هەر حەواڵەی ژیریی و سروشتیانی ئەکردن، بەڵام میهرەبانی کرد بەبێ پەیام و نێرراوەکان بەندەکانی نەگرت،

وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث

---

**وەك لـەم فەرموودەيـشەوە دەرئەكـەوێ كـە ئەفـەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ ﴾ هـەر بـەو جـۆرە گـرنـگ و نـايابـە ئايەتـەكانمان بـاس ئەكـەين بـە ڕوونـی ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ بۆ ئـەوەی بگەڕێنـەوە لـەو بارو حاڵەتـەی کـە وان لەسـەری، ئەو ئايەتانـە بـە ڕوونـی باس ئەكـەين، يـان مەبەسـت ئەوەيـە ئايەتـەكانمان بـە ڕوونـی بـاس ئەكـەين تـا بـير بكەنـەوەو ژيريـی خۆيـان بەكاربێنن‌و تا بگەڕێنەوە بۆ ڕێگەی ڕاست. ئينجا وێنەيەكمان بۆ باس ئەكات لـە بارەی لادان لە سروشت، پـەيمان شكاندن‌و پاشگەز بوونـەوە بۆ پـشت كردنە ئايەتـەكانی خوا لـە پاش ناسين‌و ئاگـادار بـوون پێيـان، ئەفـەرموێ: ﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ ﴾ ئـەی پێغەمبـەر بخوێنـەرەوە بەسـەرياندا ﴿نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ﴾ هـەواڵی گرنگـی كەسـێ كـە ﴿ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا ﴾ ئايەتـەكانی خۆمانمـان پێ‌بەخشی، واتە زاناو ئاشنامانكردبە ئايينی خواو خواپەرستی، يان ئايەتـەكانی خۆمانمان باسكرد بۆی بە ڕوونی ﴿فَٱنسَلَخَ مِنْهَا﴾ كەچی خۆی داڕنی‌و دەرچوو لەو ئايەتانە بە وێنـەی داڕنينـی گيان لەبەرێك لـە پێستەكەی‌و دەرچوونی لێـی بـە تـەواوی، بەم ڕەنگـە بڕوای نـەما پێيـان‌و پـشت گـوێی خـستن، ﴿فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾ بـەهۆی ئـەوەوە شـەيتان كـردی بـە شـوێن كـەوتووی خـۆی، يـان بـەهۆی ئـەوەوە شـەيتان پێـی گەيـشت لـەپاش ئـەوەی لـە دەسـتی دەرچووبوو، ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴾ بە هۆی ئەوەوە گەڕا بە يەكێ لە گومڕايان‌و چووە ڕيزی ئەوانـەی كـە دامـەزراون لـە گومڕاييـدا ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا ﴾ ئەگـەر ئێمـە بمانويـستايە بـەو ئايەتانە بەرزمان ئەكردەوە، بەم ڕەنگە لەسەر بڕواو زانينەكەی ئەمايەوەو ڕەفتاری ئەكرد بە پێـی ئەو ئايەتانـە كـە ديارە هـەر زانين‌و كردەوەی چاك مايـەی بەرزبوونـەوەی ڕادەو پلـەی**

بەرزن لە هەردوو جیهاندا ﴿وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ بەڵام خۆی مەیلو ئارەزووی بۆلای زەوی کردو پەستیی بۆ خۆی هەڵبژارد، مەیلی بۆلای جیهانو ژیانی جیهان کرد، یان مەیلی بۆلای زەوی کردو خۆی نوساند پێیەوەو لای وابوو هەر ئەمێنێتەوە تێیدا ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت، کەواتە هەمیشەییە لەسەر ئەو باری خۆیەو کۆتایی نامێنێ لێی، ﴿فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ﴾ کەواتە سیفەتو وێنەی وەك سیفەتو وێنەی سەگە کە کاتێك: ﴿إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث﴾ ئەگەر پەلاماری بدەیتیو بیتارێنی زوبان دەرئەهێنێو ئەهانسکێنێو هەناسە بە سەختیو توندی ئەدات ئیتر ماندوو و تینوو بێ یان نە ؟ ئەو بارو شێوەیە زۆر بەدو ناشیرینە، بووە بە باوو عادەت بۆی، ئەو کەسە کە خوا بەهرەو چاکەی پێببەخشێو کەچی ئەو هەوڵی پەستی بداتو شوێنی ئارەزووی خۆی بکەوێ، ئەوکەسەوەك ئەوسەگەوایەکەخووی گرتووە بەو بارو شێوە بەدەوە.

خوای گەورە وێنەی هێنایەوە بۆ ئەو کەسە بە سەگ کە گیان لەبەرێکی پەستەو ئەکرێ بە چێرۆك لە پەستیو بێنرخیدا، لە کاتێکدا کە ئەو شێوە و سیفەتە بەدەی هەیە، جا یان مەبەست ئەوەیە ئەو کەسە لە بەدحاڵیو بێئارامیی دڵیدا بە هەمیشەیی وەك ئەو کەسە وایە کە بە هەمیشەیی بەدحاڵ و بێئارامە یان مەبەست ئەوەیە: ئەو کەسە ئامۆژگاریو پەندو بێدەنگ بوون لێی یەکسانە، لەسەر ئەو گومڕاییە بەردەوام ئەبێو ناگەڕێتەوە بە وێنەی ئەو سەگە کە بەردەوامە لەسەر ئەو حاڵو بارە بەدەی خۆی کە دەقی پێوە گرتووە، یان مەبەست ئەوەیە ئەو کەسەی کە واز ئەهێنێ لە ئایەتەکانی خواو مەبەستی دەستکەوتی ئەم جیهانەیە ئەو کەسە بە هەمیشەیی خەریکەو زوبانی ئەخاتە کار بۆ ئەوەی ڕێزو هونەرو گەورەیی خۆی بچەسپێنێ لەناو خەڵکدا تا بەهۆی ئەوەوە بگاتە ئاواتو ئامانجی خۆی، کەواتە وەك ئەو سەگە وایە کە هەمیشە زوبانی دەرکێشاوە بەهەقو ناهەقو پێویستی ببێ یان نەبێ، یان مەبەست ئەوەیە ئەو کەسە هەمیشە سورئەبێ لەسەر دەستکەوتی ئەم جیهانەوئەوسیفەتەی هەرئەمێنێ هەرچۆنێ ئەوسەگە بەردەوامە لەسەر ئەو باروحاڵی خۆیە،

ذَٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ

---

**بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەوسیفەت و وێنە سەخت و بەدە، سیفەت و وێنەی گەل و کۆمەڵێکە کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە ﴿فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ کەواتە ئەو قسەو چیرۆک و داستانە باس بکەو بیگێڕەرەوە بۆ بێبڕواکان، بەڵکو بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن و بگەڕێنەوە، ئینجا ئەوپەڕی ناشیرینی حاڵ و باری ئەو بێبڕوایانە باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ زۆر بەدو خراپە لەبارەی وێنەو چیرۆکەوە وێنەو چیرۆکی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە ﴿وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ﴾ ئەوانە هەر لە نەفسی خۆیان ستەمیانکردووە، چونکە سەرەنجام و تۆڵەکەی هەر بۆخۆیان ئەگەڕێتەوە، لەبارەی ئەو پیاوەی کە ئەم چیرۆک و ئایەتەی تێدا هاتە خوارەوە چەند ڕیوایەتێك هاتووە هەریەکە بەجۆرێك، لەبەرئەوەی ئیسرائیلییات لەم بابەتانەوە زۆرن، ناسینی خودی ئەو جۆرە کەسانە هیچ بایەخێك نادات بە مەسەلەکە، لەبەرئەوانە بێدەنگ بوون چاکترەو هیچ پێویست نیە خۆ ماندووکردن بەو جۆرە شتانەوە، ئەوەی کە پێویستە ئەمەیە کە پێویستە لەسەر هەموو زانایەك نەخەڵەتێ بە زانینەکەی، بەڵکو ئەم زیاتر بترسێ لە نەزان، دڵی بێتە لەرزەو موچڕکە بێت بە لەشیدا کاتێك ئەبینێ بەم هەموو سەختیی و توندوتیژییە قورئان باسی ئەو زانایە ئەکات کە چۆن لایدا لە ڕێگەی خواو چۆن دووچاری ئەوە بوو کە قورئان جاڕی ئاوای لێبدات تا دنیا دنیایە بخوێندرێتەوە بەسەر هەمووان‌دا، بێگومان ئەو ڕیسوایی و بەد بەختی و سیا چارەییە هەربۆ ئەو کابرانیە بەتایبەتی، بەڵکو گشتیە بۆ هەرکەسێك کە خوا زانای بکات بە ئایین و ئایەتەکانی خۆی کەچی ئەویش خۆی داڕنێ و شوێنی نەفس و شەیتانی بکەوێ، لەم**

بابەتانەوە لە کۆن‌و لە تازە زانای زۆر بووەو هەیەو ئەیشبێ بەڵکو بەڕاستی کەم زانا هەیە کە بەتەواوی پاك‌و بێگەردبێت لەو دەردە کوشندەو پرژێکی بەرنەکەوتبێ نەکەوێ، خوا پەنامان بدات بە میهرەبانی خۆی، چەند زانای بەرز بینراو ئەبینرێ کە بەپێی ئارەزووی کاربەدەستە ستەمکارەکان فتوا دەرئەکات‌و دەری ئەکات، بەتەئویل‌و پینەو پەڕۆی دوورو درێژ حەرام حەڵاڵ ئەکات‌و حەڵاڵ حەرام ئەکات، بەگوێرەی زرووف‌و بەرژەوەندی خۆی ڕەفتار ئەکات‌و لە پێناوی ڕەزامەندی مەردومدا خوا لەخۆی ناڕازی ئەکات!! کەواتە با بەندە پشت هەر بە خوا ببەستێ‌و هەر چاوەڕوانی لای خوا بێ‌و باك‌و بیمی هەر لەو بێ، ڕێنموونی‌و گومڕایی هەر بەدەست ئەوە، بەپێی باوو یاساو ڕژێمێك کە دایهێناوە لەم جیهان‌و بوونەوەرەدا وەك وەرئەگیرێ لەم ئایەتەی کە هێنای بەدوای ئەم هەواڵ‌و چیرۆکەدا، ﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ﴾ هەرکەس خوا ڕێنموونی بکات‌و بیختە سەر ڕێگەی ڕاست هەر ئەو کەسە ڕێنموونی وەرگرەو کەوتووەتە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ هەرکەس گومڕایی بکات هەرئەوانە زیانبارو ڕەنجەڕۆن، خوا بە میهرەبانی خۆی بمانخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکەی بە دامەزراوی‌و پەنامان بدات لە گومڕایی.

ئینجا فەرمووەو ئایەتێکی سەربەخۆ ئەهێنێ کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گومڕاکردن بەدروستکردنی خوایەو بەندەش ناچار نیە، بەڵکو خۆی خەتابارە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ﴾ سوێند بە خوا دروستمان کردووە بۆ دۆزەخ لە جن‌و ئادەمی، ئەم ئایەتە بەڕواڵەت دژی ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ە کە ئەفەرموێ: جن‌و ئادەمیم هەر بۆ ئەمە دروستکردووە کە بم پەرستن، بۆ نەهێشتنی ئەو دژایەتیەو کردنەوەی ئەو گرێیە چەند شتێك گوتراوە:

١- مەبەست بەوانەی کە بۆ ئاگری دۆزەخ دروستکراون کەسانێکن کە خوا زانیویەتی ئەوانە بە مەیلی خۆیان ڕێگەی ئاگر ئەدەنە بەرو هەرگیز پەشیمان نابنەوە تا لەسەر ئەو بارە ئەمرن، مەبەست بەوانەی کە هەر بۆ خواپەرستی دروستکراون ئەوانەن کە

خوا زانیویەتی بە مەیل و خواهیشی خۆیان ڕێگەی خواپەرستی ئەدەنە بەرو بەردەوام ئەبن لەسەری تا مردن، بەکورتی ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ بەگشتی نەگیراوە بەڵکو تایبەتیە.

٢- مەبەست لە دروستکردنی ئەوانە بۆ ئاگر ڕوونکردنەوەی چارەنوس و سەرەنجام و دواڕۆژی ئەوانەیە نەك مەبەست ئەوە بێ کەهەر لەبەر ئەوەو لەبەر خاتری ئەوە دروستکرابن، بە پێچەوانەی خواپەرستیەکە کە هەر بۆئەوەو لەبەر خاتری ئەوە دروستکراون، بەکورتی پیتی (ل) لە زمانی عەرەبدا بە دوو جۆر بەکارئەهێنرێ:

أ- دەرخستنی هۆو مەبەست کە پێی ئەگوترێ: (لامی تعلیل) و زۆرتر بۆ ئەوە هاتووە.

ب- دەرخستنی دوارۆژو سەرەنجام کە پێی ئەگوترێ (لامی عاقیبەت) و هەندێ جار بۆئەوە بەکارئەهێنرێ، جا (ل)ی ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقْتُ﴾ بۆ مەبەستی یەکەم و (ل)ی ئایەتی ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا وَلَهُمْ﴾ بۆ مەبەستی دووەمە، وەك فەرموویێتی: هەموو ئادەمی و جنم هەر لەبەر خواپەرستی دروستکرد، بەڵام هەموو بەوجۆرە دەرنەچوو بەڵکو زۆربە ڕێگای دۆزەخیان دایەبەرو پاشەڕۆژیان ئەوەبوو.

٣- لەبەرئەوەی ئادەمی و جن لەسەر بارو شێوەیەك دروستکراون لە ژیریی و بیرو بیستن و بینین و فام و هۆش، بێگومان ئەو بارو شێوەیە هەر داخوازی خواپەرستیە، لەبەرئەوە وەك هەر لەبەر خواپەرستی دروستکرابن، لەبەرئەوەی بەشێکی زۆر لەو دوو تیرەیە بە خواهیش و مەیل و هەڵبژاردنی خۆیان هەر ڕێگەی ئاگر ئەدەنەبەرو سەرکێش و نالەبارن لەبەرئەوە هەروەك و بۆ دۆزەخ دروستکرابن، بەکورتی گێڕانی خواپەرستی لە ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقْتُ﴾دا بەهۆی دروستکردنی جن و ئادەمی، گێڕانی چوونە دۆزەخ و سوتاندن پێی، بە هۆی دروستکردنی زۆر لە ئادەمی و جن گێڕانی ئەو دووانە بەهۆی دروستکردن بە شێوەی چیرۆکە نەك بە شێوەو بارە ڕاستەقینەکە بێت.

ئەو وەڵامانە گوتراون لەلایەن زانایانەوە، هەر سێ وەڵامەکە چاکەو دەست ئەدا بۆ کردنەوەی ئەو گرێیە، بەڵام بە ڕاستی وەڵامی دووەم بەهێزترەو دڵ پێی بە ئارامترە، زانینی ڕاستەقینە لای خوایە، بەهەرحاڵو لەسەر هەر بار ئەوانە کە دواڕۆژو چارەنوسیان دۆزەخە هەروا لە خۆڕایی نیە، بەڵکو خەتای خۆیانەو هۆکەی لە خۆیانەوە هەڵئەقوڵێ وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا﴾ بۆ ئەوانە دڵێك هەیە کە زانینو وەرگرتنی پێناکەن، واتە بەکاری ناهێنن لە زانینو ناسینو وەرگرتنی هەرشتێ کە ڕاستو پێویستە ﴿وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا﴾ بۆ ئەوانە چاوێك هەیە کە بیناییو بینینی پێناکەن ﴿وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ﴾ بۆ ئەوانە گوێچکەیەك هەیە کە بیستنی پێناکەن، واتە چاوو گوێکانیان بەکار ناهێنن لەبینینو بیستنی ئەو شتانەی کە پێویستەو بۆی دروستکراون، کەواتە خۆیان بەدەست قەست دڵو چاوو گوێچکەکانی خۆیان لەکارخستووە، کەواتە خۆیان خەتابارن تاوان کارنو زۆر ڕاستو بەجێیە کە نیشتەجێی دۆزەخ بن، ئادەمی جیاکراوەتەوە لە گیانلەبەرانی تری ئەم زەویە بەهۆی بیرو ژیریو ئەو بەهرە گرنگو ئاشکرایانەوە کە خوا پێی داوە، دەی کاتێ کە خۆی پەك خستو بێبەش کرد لەبەرهەمی ئەو بەهرەیانە بێگومان ئەوکاتە لەڕادەو پلەی بەرزی ئادەمێتی دێتە خوارەوەو وەك گیان لەبەرانی تری لێدێ،

أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾

---

وەك دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ﴾ ئەوانە وەك وولاخو مەڕو مالات وان ﴿بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ بەڵكو ئەو جنو ئادەمیانە گومڕاترو وون بووترن، چونكە ئەو چوارپێیانە ئەوەی كە پێویستەو لەبارەیاندایە لە زیانو قازانج ئەیناسنو هەوڵ ئەدەن بۆ دووركەوتنەوە لە زیانو دەست خستنی قازانج، بەڵام ئەو جنو ئادەمیانە بەو جۆرە نین، بەڵكو بە پێچەوانەوە قازانجو زیانی ڕاستەقینەی خۆیان نازانن، یان ئەگەر بیزانن گوێیان لێیان نیە، بەڵكو هەوڵو تێكۆشانیان بۆ زیانەكەیە، ئەوەتا سەرئەكەنە كردەوەی بەدو بێبڕوایی كە مایەی زیانی نەبڕاوەیە، لەبارێكی تریشەوە گومڕاترن كەكاتێ ئەخرێنە سەر ڕێگەی ڕاستو ڕێنموونی ئەكرێن ئەو ڕێگەیە نادەنە بەر، بەڵام ئەو چوارپێیانە ئەیدەنە بەرو ملی ڕێ ئەگرن، گومڕاترن لەم بارەیشەوە كەئەگەر گوێڕایەڵی خوا نەبن یاخی نین، بەڵام ئەو جنو ئادەمیانە یاخیو سەركێشن، هەروەها لەچەند باری تریشەوە گومڕاترن، خوا پەنامان بدات ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ﴾ هەر ئەوانەن بێئاگای ڕاستەقینەو ئەوپەڕیان گرتووە لە بێئاگاییدا، ئەوانە بێئاگان لەوەی كە خوا ئامادەی كردووە بۆ دۆستەكانی، لەو سزاو تۆڵەی كە دیاریو ئامادەی كردووە بۆ دوژمنەكانی، ئەوانە لە پاشەڕۆژو بەرو بەرهەمی كردەوە بەدەكانیان.

لەپاش نیشان دانی ئەو پەیمانە بوونەوەریە لەسەر تاكو تەنهایی خوا، نیشان دانی وێنەو چیرۆكی ئەوكەسانەی كە لایانداوە لەو پەیمانەو لە ئایەتەكانی خوا، لەپاش ئەوەو بەدوای ئەوەدا پەندو فەرمانێك ئاڕاستە ئەكات بە گوێ نەدانو نرخ پێنەدان كە لایانداوە لەو ڕێگە ڕاستە، كەلەو كاتەو لەو دەورو بەرەدا بریتی بوون لەو بت پەرستو هاوبەش ڕەوادەرانەی كە بەرەنگاری ئیسلامو بانگەوازەكەی وەستانو لاریو لادانیان ئەكرد لەناوە شیرینەكانی خوادا وەك لەمەو پاش باسی ئەكەینو ڕوونی ئەكەینەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ هەر بۆ خوایە ئەو ناوانەی كە شیرین ترو بەرزو بڵندترو بەڕێزتری هەموو

ناوەکانن، چونکە شیرین ترو بەرزو بەنرخترین واتاو مەبەست نیشان ئەدەن بۆ خوا ﴿فَادْعُوهُ بِهَا﴾ کەواتە بەو ناوانە ناوی ببەن و بانگ و هاواری لێبکەن ئەو فەرموودەیە لە چوار سوورەتی قورئاندا هاتووە: ﴿الأعراف، الإسراء، طه، حشر﴾ ئەو ناوە پیرۆزانە لە حەدیسێکی صەحیحدا (٩٩)یان هاتووە وەك بەیارمەتی خوا لەمەو پاش باسی ئەکەین لە سوورەتێکی تردا، ﴿وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ﴾ وازبێنەو نرخ دامەنێ و گوێ مەدە بەوانەی کەلادان و لاری بەکارئەهێنن بۆ بتە پرپوچەکان، وەك ناوی ﴿اله﴾ کە هاوبەش ڕەوادەرەکان ئەیکەن بە (لات) ئەیکەن بەناوی یەکێ لە بتەکان، یان (عزیز) کە ئەیگۆڕن بە (عزی) ئەیکەن بەناوی بتێکی تر، یان (منان) کە ئەیگۆڕن بە (منات)و ئەیکەن بەناوی بتێکی تر، جۆرێکی تر لەو لادان و لاری بەکارهێنانە ئەمەیە کە ناوێك شایستەو شیاو نیە بەکاری ئەهێنن بۆ خوا وەك گاورەکان کە ناوی ئەبەن بە (اب، ابن، روح القدس) جۆرێکی تر لەو لادانە ئەمەیە کە ناوێکی بۆ بەکاربهێنرێ کە نەناسراوەو نازانرێ واتاو مەبەست پێی، بەڵکو دروست نیە بەکارهێنانی هیچ ناوێك کەلە شەرعدا بەکارنەهێنرابێ بۆی، ئەبێ هەر ئەو ناوەی بۆ بەکاربهێنرێ ئیتر بەهەر زمانێ کە ڕێك و پێك و دەقی ئەوە بێباوەڕەکانی کەلە شەرعدا هاتووە وەك ناوی خودا لە کوردیدا کە دەقی (الموجود بنفسه) یە، واتە خۆی بۆ خۆی پەیدابوو، بەڵام بەکارهێنانی یەزدان ڕاست نیە، چونکە ئەو ناوە داهێنراوی مەجوسەو کردویانە بەناو بۆ داهێنەرو دروستکەری خێرو خۆشی و ڕووناکی کە یەکێکە لەو دوو پەرستراوەی کە ئەوانە بڕیاری ئەدەن، کەئەو ناوە لە ڕێوە ئەوە نیشان ئەدات کە خوا هاوبەشی هەیە، ئەو سێ جۆرەی کە باسکران هینی کۆن و هەموو جۆرەکانی تازەش ئەگرنەوە وەك ناوبردنی بە (مهندس)ی بوونەوەر یان ناوبردنی (شارع یان مشرع) هەموو ئەو لادەرانە بەری ئەم هەڕەشە سەختە ئەکەون کەلێرەدا ئەفەرموێ: ﴿سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان تۆڵەی ئەو کردەوەیان لێ ئەسێنرێ کە کردوویانەو بەردەوام بوون لەسەری لە جیهاندا، دووچار ئەکرێن بە بەرهەمی کردەوەکەیان لە جیهاندا پێش ڕۆژی دوایی و لەوێش ئەگەر نەگەڕێنەوە، لەپێشەوە فەرمووی: زۆر لە جن و ئادەمیمان دروستکردووە بۆ دۆزەخ،

وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾

**ئینجا بەرامبەر ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ﴾ لەناو ئەوانەی کە دروستمان کردوون کۆمەڵو ئوممەتێك هەیە کە ڕێنموونی ئەکەن بە ئایینی ڕاستو ڕێی ڕاست نیشان ئەدەن، هەر بە ئایینی ڕاست دادو دادپەروەری ئەکەن، یان هێندێ لەوانەی کە دروستمانکردن کۆمەڵو ئوممەتێکە کە ڕێنموونی ئەکەن... هتد، مەبەست بە ئوممەت کۆمەڵێکە کە یەك ئایینو بیروباوەڕیان هەبێ، ملکەچ بن بۆ یەك سەرکردایەتی کە ڕاگیرو دامەزراوبێت لەسەر ئەو ئایین بیروباروەڕە، ئەگەر لەبەر ئەو کۆمەڵە نەبێ ئەم ئادەمیە شایستەو شیاوی ئەو ڕێزە نیە کە خوا پێی داوەو باوی داوە بەسەر دروستکراوەکانی تردا، ئینجا با بیرێك بکەینەوە لە سیفەتو نیشانەی ئەو کۆمەڵە تا چاك بیانناسینو هەوڵ بدەین کە بچینە ڕیزیان:**

**یەکەم: ئەوانە بانگو بانگەواز بۆ ڕێو بەرنامەی ڕاست، بێدەنگ نابن لەوەو گۆشە نشینو کەنارگیر نابن بەو ئایینو بەرنامە ڕاستەی کە ئەیناسن، بەڵکو بانگی مەردومی تر ئەکەن بۆلای، بێجگە لەوەی کە خۆیان ڕەفتاری پێئەکەن، کەواتە نەبن بە پێشەواو سەرکردە بۆ ئەوانەی کە گوم بوونو گومڕان لەو ئایینە ڕاستە، تەنها بە ناسینی ئەو هەقو ڕاستە کۆتایی پێناهێنن، بەڵکو تێپەڕئەکەن بۆ ڕێنموونی پێیو بانگ کردن بۆلایو سەرکردایەتی بەناویەوە.**

**دووەم: بەوەیشەوە ناوەستن بەڵکو ئەو ئایینو بەرنامەیە پێك ئەهێننو بەدی ئەهێنن لە ژیانی مەردوماندا، حوکمڕانی پێئەکەن لەناویاندا لەبەر بەدیهێنانی دادو دادپەروەری کە بەدی نایەت بە حوکم کردنو حوکمڕانی نەبێ، کەواتە ئەم ئایینە تەنها بۆ ئەوە نەهاتووە کە بناسرێو بزانرێ، تەنها بەوە پێك نایەت کە هەر پەندو ئامۆژگاری پێبکرێ! بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە کە حوکمڕانی بکات لە هەموو کاروباری مەردوماندا، بۆچوونی عەقیدەو بیروباوەڕیان نیشانەو دروشمی خواپەرستیان، ڕژێمو کاروباری ژیانیان، باوو خوو ڕەوشتیان، بەرنامەی بیرو زانیاریو ڕۆشنبیریان، بەبێ ئەوە ئەم ئایینە بەدی نایەت لە ژیاندا بەبێ ئەوە دادو دادپەروەری بەدی نایەت. ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە ئایەتەکانی ئێمەو بە درۆو ناڕاستیان ئەزانن ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە بەرەبەرەو پلەپلە**

نزیکیان ئەکەینەوە لە نەمان و تیاچوون و سزاوە بەم ڕەنگە نازو نیعمەت و خۆشی و کامەرانی ئەڕژێن بەسەریاندا لەکاتێکا کە سەریان کردۆتە تاوان و ستەم و بێبڕوایی، بە هۆی ئەوەوە تابێت یاخی و سەرکێش تر ئەبن، تا بەتەواوی کاتی لەناوبردن و سزادانیان دێتە پێشەوە، ئەوەشیان لەگەڵ ئەکەین لەلایەکەوە کە نازانن، نازانن بە خۆیان و وا گومان ئەبەن نیازی خێر وخۆشیان پێکراوە،کەچی بەپێچەوانەوەنیازی شەڕیان لێکراوە﴿وَأُمْلِي لَهُمْ﴾ ماوە و مۆڵەتی ئەوانەئەدەم وجڵەویان بۆشل ئەکەم﴿إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾بێگومان پیلانی من بەتین و بەهێزترە.

ئەم هەڕەشە سامناکە هەرچەند لە یەکەم جارەوە ئاراستەی بێبڕواکانی مەککە کرا، بەڵام ئایەتەکانی قورئان گشتین و نابەسترێن بە هۆی هاتنە خوارەوەیانەوە، ئەو هەڕەشە سامناکەی کە ئاراستەی کردن لەسەر ئەو هەڵوێستە بەدەی کە بەکاریان هێنا لەگەڵ ئەو موسڵمانانەدا، ئینجا پاش ئەو هەڕەشەیە بانگیان ئەکات بۆ بەکارهێنانی دڵ و چاو و گوێیان، تا نەچنە ڕیزی ئەوانەی کە دروستکراون بۆ دۆزەخ، بانگیان ئەکرد بۆ بیرکردنەوە لەکاری پێغەمبەرەکەیان کە بانگیان ئەکات بۆ هەق و ڕێی ڕاست و ڕێنموونیان ئەکات بۆی، بانگیان ئەکات بۆ ورد بوونەوە لەم بوونەوەرە پان و پۆڕەو ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە کە پرژ و بڵاو کراونەتەوە لە ئاسمان و زەویدا، لە خەوی بێئاگایی بێداریان ئەکاتەوە بۆ ئەوەی نزیکە تەواو بوونی ژیانیان و کە مردن بدا بە سەریانداو لە کاتێکدا کە ئەوان بێئاگان، ئەو بێبڕوایانە بە هەر جۆر پێیان بکرایە دیعایەو پڕوپاگاندەیان بڵاو ئەکردەوە دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) دەمێ ئەیانگوت: شێتەو جنۆکەو شەیتانی لەگەڵە بەهۆی ئەوەوە ئەتوانێ ئەم وتەو وتارانە بڵێ کە شتێکی نەناسراو و نایابن! بێگومان خۆیان ئەیانزانی کە درۆ ئەکەن و لەسەر ناهەقن، خۆیان پێنەئەگیراو بە نهێنی گوێیان ئەگرت لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر (ﷺ) و بە توندی کاری لێئەکردن، بەڵام هەر سەرکێشیان بەکار ئەهێناو نەیان ئەویست دان بنێن بە ڕاستیەکەیدا، وەك لە چەند شوێنێکدا چەند ڕیوایەتێکمان هێنا لەو بارەیەوە یەکێ لەو شوێنانە سوورەتی (غافر) کە لە پێش ئێرەدا تەفسیرمان کرد، با سەرنج بدرێ، قورئان بانگیان ئەکات بۆ بیرکردنەوە لەو پێغەمبەرە (ﷺ) کەبەباشی ئەیانناسی وباخەبەر بوون لێی وئەیانزانی کە هیچ جۆرە نارێکیەکی تێدا نەبووە، شایەتی یان ئەدالەسەرڕاستی وپاکی وبێلەکەیی،بەسەبۆبەڵگەلەسەرئەوەکەکردیان بەحەکەم لەگرنگ ترین و گەورە ترین ڕووداودا، ڕازی بوون بە بڕیارەکەی و ئەو ئاژاوە گەورەیان پێکوژاندەوە، متمانەیان پێئەکردو ئەیانکرد بە ئەمیندار لەسەر سپاردەو ئەمانەتە کانیان،

أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ وَأَنۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقۡتَرَبَ أَجَلُهُمۡۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٥﴾

---

قورئان هانیان ئەدات كە تێفكرێن و بیربكەنەوە تا ڕوویان نەبێ قسەی ناڕاست و بێ جێ بكەن دەربارەی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ﴾ ئایا ئەوانە بیریان نەكردووەتەوەو تێ نەفكراون ﴿مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ﴾ نیەونەلكاوە بە هاوڕێكەیانەوە، واتە ئەو پێغەمبەرە كە هەڵئەستن و دائەنیشتن لەگەڵی چاك ئەیناسن، هیچ جۆرە شێتی و تێك چوونی هۆش و ژیریی ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ ئەو هاوڕێی ئەوانە هیچ نیە بێجگە لەوەی ترسێنەرێكی ڕوون و ئاشكرایەو ڕوون كەرەوەیە بۆ كارەكەی خۆی، بە هیچ جۆر نە وتارو نە كرداری پەیوەندی نیە بە وتارو كرداری شێتەوە، لە ئایەتی ڕابردوودا سەرزەنشتی ئەو بێبڕوایانەی كردو بێزاری دەربڕی لێیان كە چۆن بڕوایان نەهێناوەو بیریان نەكردووەتەوە لە بارو حاڵی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) ئینجا تەشەرو سەرزەنشتێكی تریان ئەدات لەسەر بیرنەكردنەوەیان لەم بوونەوەرە پان و پۆڕە كە بیركردنەوە لەوەدا مایەی بڕوا هێنانە بە تاك و تەنیایی خواو ڕاستی ئایەتەكانی، هەروەها بیر نەكردنەوەیان لە نزیكی مردنیان كە ئەو بیركردنەوەش پاڵدەرە بۆ ئەوەی زوو فریای خۆیان بكەون و بڕوا بێنن پێش ئەوەی كات و هەلیان لە دەست دەرچێ، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا ئەوانە سەرنجێكیان نەداوەو ئاوڕێكیان نەداوەتەوە لە موڵكە گەورەو پان و فراوانەكەی ئاسمانەكان و زەوی ﴿وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ﴾ لەهەر شتێ كە خوا دایهێناوەو دروستیكردووە؟ واتە سەرنجیان بدایە بە تێفكرانەوە لەوەدا تا بەهۆی ئەوەوە دەسەڵات و گەورەیی و تاك و تەنیایی خوای پەروەردگار، ڕاستی و دروستی ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) بانگیان ئەكات بۆلای، بێگومان سەرنج دانێك بە هۆش و

ئاگاداریەوەو ئاوڕێك بۆ لای تەنها ئەم دیمەن‌و ڕواڵەتە نایاب‌و دڵڕفێنە، دڵ سەرسام‌و سەرگەردان ئەکات، ژیریی ناچار ئەکات بەوەی کە بڕوا بێنێ بە پەروەردگار، سەرنجدان بەو سووك‌و سادەییەش دڵ‌و دەروونێ پڕئەکات لە باوەڕو بڕوای بەهێز، چ جای ئەوەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ خوای میهرەبان بەڵگەو ڕابەرە ئاشکراکانی خۆی دەرئەخات لەم بوونەوەرە گەورەیەدا، لە هەموو دروستکراوەکانیدا، لە دڵ‌و دەروون‌و خودی بەندەکان خۆیاندا!!

خوای میهرەبان بەو جۆرو شێوەیە ئەدوێ‌و ئەکۆڵێتەوەو ئەو هەموو ڕابەرو بەڵگە ڕوونانە ئەخاتە بەر چاو، بێگومان هەرکەسێك ژیریی لەکار نەکەوتبێ‌و چاوی دڵی بە تەواوی کوێر نەبووبێ ئەوەی بەسەو هیچی تری ناوێ، هەرکەس بەم قورئانە چارەسەر نەکرێ چارەسەری بریتیە لەو ئاگرەی کە بۆی ئامادە کراوە، خوا پەنامان بدات، ئینجا لە دواییدا دەستکاریەکی دڵ و دەروون نەکات بە بیرکردنەوە لە مردن کە هەمیشە لەوانەیە لە ناکاودا بێت کە ئەو بیرکردنەوە پاڵدەرو دەست گیرێکی بەهێزە بۆ ڕۆیشتن بە ڕێگەی ڕاستدا، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ﴾ ئایا ئەوانە کە بڕوا ناهێنن بە چاوی دڵ و ئاوڕێکیان نەداوەتەوە بۆ لای ئەوەی کە چاوەڕوانی بکەن نزیك کەوتووەتەوە ئەجەل‌و کۆتایی‌و تەواو بوونی ژیانیان، کە ئیتر دوای ئەوە هیچ چارەسەرێك دەست ناکەوێ‌و هیچ ناکرێ، کەواتە با پەلامار بدەن‌و چەسپانی بکەن بۆ لای شتێ کە بەرگریان بکات لە دووچار بوونی سزای سەخت‌و سامناکی پاش مردن، ئەو کەسەی کە ئەم ئادەمیەی دروستکردووە، هەر ئەو کەسە ئەم قورئانەی نارد بۆ چارەسەرو هەرکەس بەمە چارەسەر نەکرێ‌و بڕوا نەهێنێ ئیتر هیچ چارەسەرێکی نیە، وەکو دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾ دەی ئایا بە چ قسەو باس‌و گوتەیەك لە پاش قورئان ئەوانە بڕوا ئەهێنن؟ بەڵێ بە ڕاستی هەر دڵێ ئەم قورئانە کاری لێ نەکات، بەم قورئانە نەرم نەبێ بە هیچ قسەو باسێکی تر نەرم نابێ‌و هیچ قسەو باسێکی تر کاری لێ ناکات، خوا بە میهرەبانی خۆی ئەم قورئانە بکات بە ڕێنیشاندەرو چارەسەری دڵەکانمان، ئامین.

ئینجا لێرەدا کەمێك ئەوەستێ، باوی خوا باس ئەکات لە بارەی ڕێنموونی و گومڕایی بەندەکانیەوە، ئەفەرموێ: ﴿مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥ﴾ هەرکەسێك خوا گومڕای بکات هیچ ڕێنیشان دەرو ڕێنموونی کەرێکی بۆ نیە، ﴿وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ لێیان ئەگەڕێ لە گومڕایی و سەرکێشیەکەیاندا بە سەرگەردانی، خوا پەنامان بدا، ئامین. ئەو کەسانەی کە گومڕا ئەبن، هۆی گومڕا بوونەکەیان ئەوەیە کە بیر ناکەنەوەو خۆیان کوێرو بێئاگا ئەکەن لەو هەموو بەڵگەو ڕابەرو نیشانە ڕوون و ئاشکرایانەو هەرکەسیش خۆی وا لێبکات خوا گومڕایان ئەکات و ئەو کوێری و گومڕاییانەیان تێدا فەراهەم ئەهێنێ، هەرکەسیش بەو جۆرەی لێهات هیچ کەسێك ناتوانێ بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، هێشتنەوەی ئەوانە لەو بارو حاڵە بەدەیاندا هیچ ستەمو ناڕەواییەکی تێدا نیە، چونکە خۆیان بە هەڵبژاردنی خۆیان ئەو بارو حاڵەیان ئەوێ و هیچی تریان ناوێ، کەواتە خوایش لێیان ئەگەڕێ با لەسەر ئەو بارو حاڵەی خۆیان بن.

ئەو نەفام و بێهۆش و بێئاگایانە پرسیاریان ئەکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی ڕۆژی دواییەوە کە کەی دێت و بەدی دێت، چونکە بێبڕوا بوون پێی و سەریان سوڕئەما لەوەی شتی وا ببێ و لاقرتی و گاڵتەیان لێئەهات کە شتی وا ببێ، لەگەڵ ئەوەدا کە بڕوا بەو ڕۆژە شتێکی سەرەکی و بنەڕەتی بوو لە ئایینی ئیبراهیم و ئیسماعیلدا کە خۆیان بە شوێن کەوتووو نەوەی ئەوان دائەنا، وە بڕوا بەو ڕۆژە یەکێکە لە پێویستیەکانی ئادەمی، هاتنی ئەو ڕۆژە پێویستە داخوازی دادو دادپەروەریە، جا لەبەرئەوە لە چەند ئایەتدا باس ئەکات و دڵنیایی لەسەر ئەکات، بە چەند جۆر بەڵگەو نیشانەی لەسەر ئەهێنێتەوە، یەکێ لەو شوێنانەی کە ئەو مەسەلەی زۆر بە گرنگ گرتووە ئەم شوێنەیە،

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ پرسیار ئەكەن لە تۆ ئەی پێغەمبەر لەبارەی ڕۆژی دواییەوە كە ﴿أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا﴾ ئایا بوون و بەدی هاتنی كەی ئەبێت و كەی كاتەكەی دێت كە تێیدا جێگیرو دامەزراو ئەبێت، بێگومان هاتن و كاتی ئەو ڕۆژە لەو غەیب و نهێنیانەیە كە خوا تایبەتی كردووە بە زانینی خۆیەوە و هیچ كەسی ئاگادار نەكردووە پێی، بەڵام ئەو بێبڕوایانە پرسیاریان ئەكرد لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ تاقیكردنەوەی! یان لەبەر ئەوەی بە شتێكی دووریان ئەزانی و سەریان سووڕئەما لێی، یان مەبەستیان لاقرتی پێكردن بوو! پێغەمبەریش (ﷺ) ئادەمیەو لافی زانینی غەیبی لێ نەئەدا، بەڵكو زانینی ئەو شتانەی حەواڵەی خوا ئەكردو ئەیزانی هەرچی خوا زانای نەكات پێی ئەم نایزانێ وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر لە وەڵامیاندا بڵێ: ﴿إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى﴾ زانینی ئەو ڕۆژە لەبارەی كاتی بەدی هاتنیدا هەر لای پەروەردگارمە ﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾ دەری ناخات و ئاشكرای ناكات لە كاتەكەی خۆیدا بێجگە لە خوا، واتە هەروا بە پۆشیدەیی ئەمێنێتەوەو خوا دەری ناخات لەو كاتەدا ئەبێ كە دێت، ئینجا سەرنجیان ڕائەكێشێ بۆ شتێكی گرنگتر لە پرسیار لە كاتی هاتنی كە بریتیە لە بە گرنگ گرتنی حەقیقەتی ئەو ڕۆژەو هەستكردن بە گەورەیی و سامناكیەكەی، ئەفەرموێ: ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو ڕۆژە گەورەو قورس و گرنە لە ئاسمانەكان و زەویداو لاری دانیشتوانیان، گەورەو قورس و گرانە پۆشیدەیی و نەزانراویەكەی و دەرچوونی لە سنووری ژیریی، یان گەورەو قورس و گرانەو ئەركی گەورەی هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا، ئەوەتا وێرانیان ئەكات و داریان بەسەر بەردەوە ناهێڵێ،

لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾

---

﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾ نایەت بۆتان و بەسەرتان نایەت بە کوت و پڕی و لەناکاودا نەبێت لە کاتێکدا کە بێئاگان لە هاتنی وەك لە حەدیسدا هاتووە کە (بوخاری و موسلیم) هێناویانە لە (ئەبوهورەیرە)وە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕۆژی دوایی بەرپا ئەبێ لەکاتێکدا کە دوو کەس خەریك کڕین و فرۆشتنن و قوماشەکەیان بڵاو کردووەتەوە فریا ناکەون بیپێچنەوە، کاتێ کە یەکێك تیکە ئەبا بۆ دەمی و فریای خواردنی ناکەوێ... هتد، ئینجا سەر سوڕئەهێنێ لە حاڵی ئەو پرسیارکەرانە، ئەوانە نازانن و بێئاگان لە سروشتی پەیام و فروستادەیی، بێئاگان لە حەقیقەتی فروستادە، لە ئەدەب و شەرمی فروستادەیی بەرامبەر خوای گەورەی، ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا﴾ ئەوانە پرسیارت لێ ئەکەن بەجۆرێ وەك تۆ زانا بی پێی وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ -خوا لێیان ڕازی بێ- یان وەك تۆ هەمیشە سوور بێگومان لەسەر پرسیار لەوە! لەسەرت بێت کاتی هاتنی دەرخەیت! پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار ناکات لە شتێ کەواتە زانینی تایبەتی بێت بە خواوە وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ: زانینی ئەو ڕۆژە هەر لای خوایە، تایبەتی کردووە بە خۆیەوە، هیچ کەسی ئاگادار نەکردووە پێی ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، نازانن کە زانینی ئەوە تایبەتیە بە خواوە، بەڵکو هێندێکیان هەر بڕوایان نیە بەو ڕۆژە، هێندێ ئەزانن و بڕوایان پێی هەیە، بەڵام وا گومان ئەبەن کە تۆ کاتی هاتنی ئەزانی، لەبەر ئەوەیە بە نەفامی پرسیارت لێ ئەکەن، هێندێ وا گومان ئەبات کە زانینی ئەوە پێویستە بۆ تۆو فروستادەییەکەت داخوازە بۆ ئەوە لەبەر ئەوە پرسیارت لێ ئەکەن تا بەهۆی ئەوەوە پلارو ڕەخنە بدەن لە فروستادەییەکەت، ئەوانەی کە لەسەر ڕێگەی ڕاستن بڕوادارانەو بۆچوون و بڕوایان بە پێی قورئان و حەدیسە، ئەو جوولەکانەش کە پرسیار ئەکەن بۆ تاقی

کردنەوە، ئەوانەش هەر لە ڕیزی نەفامەکانن، چونکە بە پێی زانینەکەیان ڕەفتار ناکەن‌و پرسیاری نەفامانە ئەکەن، دووجار فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ﴾ ئایا مەبەست بە هەردوو هەر یەکە یان جیاوازن؟ هێندێ بەڵکو زۆربە لەسەر ڕای یەکەمەو مەبەست بەهێزکردن‌و زیادە دڵنیایی کردنە لەسەری، تا وەڵامەکە ببێ بە سەرەتا بۆ پلار لێدان بە ڕستەی ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ هێندێ لەسەر ڕای دووەمەو ئەفەرموون، مەبەست بە یەکەم پرسیارە لە کاتی بەرپا بوونی ئەو ڕۆژە، مەبەست بە دووەم پرسیارە لە قورسی‌و بەتینی و سامناکی ئەو ڕۆژە، کەواتە دووبارە کردنەوە نیە، هەردوو ڕاکە ئەگونجێ‌و زانینی ڕاستی هەر لای خوایە، لە وەڵامی یەکەمدا فەرمووی: ﴿إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ کە دەست نیشانی تێدایە بەوەی زانینی ئەوەو پەیوەندە بە پەروەردگاریی خواوەو لە کاروباری ئەوە، لە وەڵامی دووەمدا فەرمووی: ﴿عِندَ اللَّهِ﴾ کە ئەمیش دەست نیشانی تێدایە بەوەی ئەو زانینە تایبەتیە بە زاتی پاکی خواوە، چونکە ئەوە ناوە بۆ زاتی پاکی، کەواتە بەهەر حاڵ زانینی ئەوە ناگونجێ‌و دەست نادا بۆ خوا نەبێ، تەنانەت بۆ پێغەمبەریشمان (ﷺ) وەك بە دەقی ئەم ئایەتەو بە چەند دەقێکی تریش ئەوە نیشان ئەدات وەك چەند ڕیوایەتێکی ڕاست‌و سەحیحیش، کەواتە با گوێ نەگیرێ لەوانەی کە ئەڵێن: پێغەمبەر زانیویەتی، یان ئەگەر لە جیهاندا نەیزانیبێ لە کاتی دنیا دەرچوونیدا زانا کراوە پێی، با گوێ نەگیرێ لەوەو ئەو جۆرە شتانە لەو زیادەڕەوی کردنانەیە کە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) جڵەو گیریی لێکردن بەوەی کە فەرمووی: (لا تطروني كما أطرت النصارى المسيح إنما أنا عبدالله و رسوله) زیادەڕەوی مەکەن بە من وەك نەسرانیەکان کردیان بە عیسا، من هەر بەندەو فروستادەی خوام. وە نەبێ تەنها زانینی ڕۆژی دوایی شاراوە بووبێ لە پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو زانینی هەموو نهێنی‌و غەیبە تایبەتیەکان ـ چ جای کەسانی تر ـ مەگەر ئەندازێك کە خوا مەیلی بووبێ، لە کاتێکدا کە خوا ویستبێتی،

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾

---

**وەك لەم ئایەتەشدا دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا﴾ من خاوەنی هیچ زیانێك نیم بۆ خۆم، واتە ناتوانم هیچ سوودێك بۆ خۆم ڕاكێشم و هیچ زیانێك بەرگری بكەم لە خۆم لە هیچ كاتێكدا ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ مەگەر كاتێ كە خوا ویستبێتی بەم ڕەنگە ڕێگەم بدات و دەسەڵاتم پێبدا بەسەر ئەوەدا، ئەو كاتە بە مەیل و خواهیشی ئەو ئەتوانم، یان خاوەنی سوودو زیانێك نیم بۆ خۆم، بەڵام ئەوەی خوا ویستبێتی لەو سوودو زیانە هەر ئەوە ئەبێ ﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾ئەگەر من غەیبم بزانیایە ﴿لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾ زۆرم فەراهەم ئەهێنا لە خێرو خۆشی و ئەوەی ئارەزوو ئەكرێ، دووچارم نەئەبوو ناڕەحەتی و ناخۆشی و ئەوەی حەزی لێنەكرێ، واتە ئەگەر غەیبم بزانیایە هەوڵم ئەداو بە پێی توانای خۆم خێرو خۆشیم فەراهەم ئەهێنا بۆ خۆم و شەڕو ناخۆشی و زیانم بەرگری ئەكرد لە خۆم، دەی كاتێ بەو جۆرە نیم، كەواتە غەیب نازانم، واتە لە خۆمەوە غەیب نازانم مەگەر بە ئاشناكردن و ئاگادار كردنی خوا پێم وەك ئەو هەموو هەواڵە غەیبی كە خوا ئاگاداری كرد پێیان كە ئەو زانین و ئاگادار كردنە یەكێ بوو لە موعجیزە گەورەكانی، بەم هەواڵ و جاڕدانە بیروباوەڕی تاك و تەنیایی خوا دەرئەكەوێ بە پاك و خاوێنی لە هەر جۆرە لەكەو تەپ و تۆزو تەم و چڵك و چەپەڵیەك كە لە لایەن نەزان و نەفامانەوە ڕووی كردە ئەو بیرو باوەڕە پیرۆزەوە سنووری بەندەو بەندەیی ڕوون ئەبێتەوەو نزیك نابێتەوە لە سنووری خواو خوایەتیەوە، هەرچەند ئەو بەندە گەورە بە گەورە ترینی هەموو بەندەو دروستكراوەكانی خوا بێت كە پێغەمبەری خۆشەویستمانە (ﷺ) كە سنووری بۆ دیاریكرد بەم فەرموودەیە كە جاڕی پێدا،**

إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ

---

﴿إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ **من نيم بێجگە لە ترسێنەرو موژدەدەری بۆ گەلو كۆمەڵێك كە بڕوایان هەیەو بڕوا ئەهێنن بەوەی منی پێ ڕەوانە كراوم، واتە بەندەیەكم لە بەندەكانی خواو ترسێنەرو موژدەدەرم، بێگومان ترسێنەرو موژدە دەرە بۆ هەموان، بەڵام هەر بڕوادار بەهرەمەند بووە پێی لەبەر ئەوە باسی هەر بڕواداری كرد، ئینجا گەردشێكی تازە ئەكات بە دڵ و دەروون لەبارەی تاكو تەنیایی خواو بڕوا بەو تاكو تەنیاییە كە سەرچاوەی هەموو خێرو فەڕو پیتەو لادان لێی مایەی هەموو بەدیو لاریو سەر لێشێوانە لە هەردوو جیهاندا، ئەم گەردشە ئەهێنێ لە شێوەی داستانو سەرگوزەشتەیەكدا، بۆ نەخشە كێشانو نیشان دانی هەنگاوەكانی لادان لەو تاكو تەنیاییە، ئەفەرموێ:** ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ **خوا كەسێكە كە ئێوەی دروستكرد لە تەنیا كەسێك كە ئادەمە وەك كۆمەڵو جەماوەر ئەفەرمون، یان دروستیكردن لە یەك تیرە، یان لەبەر یەك شت كە كردی بەم دروستكراوە ڕێكو پێكە،** ﴿وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ **گێڕای لە جۆرو تیرەی ئەو تەنیا كەسە ژنو هاوسەرەكەی، یان لە بەشو پارچەیەكی ژنەكەی دروستكردو فەراهەمی هێنا وەك لە ڕیوایەتێكدا هاتووە كە خوا حەوای دروستكرد لە پەراسووی لای چەپی ئادەم ئیتر**

چۆنێتیەکەی نازانین، لە سەرەتای سورەتی (النساء)دا ئەندازەیە درێژەم داوە بەم باسە با سەرنج بدرێ، خوای میهرەبان بەو جۆرەی کرد ﴿لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ﴾ دڵ ئارام بێت و مەیل بکات بۆلای ئەو هاوسەرە کە شتێکی ئاشکرایە ئەو یەکی و یەك تیرەییە پاڵدەرو هۆیەکی بەتینە بۆ ئەو مەیل و دڵ ئارامیە، ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا﴾ ئینجا کاتێ داپۆشی و بەرز بوویەوە بەسەریدا، واتە چووە لای و کاری ژن و مێردی لەگەڵ کرد، ئەو دەستەواژەیە بە پێی باوی قورئانە کە هەر شتێ شەرمی لێبکرێ بە دەقەکەی خۆی باسی ناکات کاتێ کە مێردەکەی ئەوەی کرد ﴿حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفًا﴾ هاوسەرەکەی ئاوس بوو بێچوویەکی سوکی هەڵگرتلە سکیدا، وتەی (حمل) بە بێچوو ئەگوترێ تا لە گۆشت پارەیی تێپەڕ ئەکات، ﴿فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ﴾ ئینجا بەردەوام بوو پێیەوە وەك لەوەو پێش، بەم ڕەنگە هەڵئەساو دائەنیشت و کارو فەرمانی ئەکرد ﴿فَلَمَّآ أَثۡقَلَت﴾ ئینجا کاتێ کە قورسی بۆ پەیدا بوو بە هۆی گەورە بوونی بێچووەکەی لە سکیدا ﴿دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا﴾ نزایان کردە لای پەروەردگاریان، بەم ڕەنگە گوتیان: ﴿لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحًا﴾ سوێند بە خوا ئەگەر منداڵێکی ڕێك و پێك و تێرو تەواومان پێ ببەخشی ﴿لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ بێگومان ئێمە لە سوپاس کارانی تۆ ئەبین و دامەزراو ئەبین لە سوپاس کردندا لەسەر ئەو بەخشینە، یان لەسەر بەهرەو چاکەکانت کە یەکێ لەوانە بەخشینی ئەو منداڵەیە ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا﴾ کەچی کاتێ کە منداڵێکی ڕێك و پێکی پێ بەخشین، وەك خۆیان داوایانکرد﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾ گێڕایان وبڕیاریاندابۆخواچەندهاوبەشێك کە پێی بەخشین،

**﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ ئینجا خوا بەرزو بڵندو پاكو خاوێنە لە گێڕانو ڕەوادانی هاوبەش بۆی، یان لەو شتانەی كە ئەوانە كردیانو گێڕایان بە هاوبەش بۆی، ئەم ئایەتە بە ڕاستی لە دڵدا بووە بە قۆرتو گرێیەكی سەختو بەتین، جێگەی قسەو باسێكی دوورو درێژە لەناو زانایانی كۆنو تازەدا، بە تایبەتی كاتێ كە سەرنجی هێندێ ڕیوایەت ئەدرێ كە هاتووە لە تەفسیریدا، وەك ئەو ڕیوایەتەی كە ئەڵێ: حەوا چەند كوڕێكی بوو ناوی نان عبداللهو عبید اللهو ئەمردن، ئینجا شەیتان هات بۆ لای ئادەمو حەواو پێی گوتن ئەگەر ئێوە ناوی منالّتان بنێن بە ناوێكی تر ئەژیو نامرێ، ئینجا كوڕێكی بوو ناوی نا: عبدالحارث، ئینجا ئەم ئایەتە لەوەدا هاتووەتە خوارەوە، ڕیوایەتێكی تر هەیە زۆر تر جێگەی سەرسوڕمانە، ئەڵێ: كاتێ سكی پڕ بوو شەیتان هات بۆ لایانو پێی گوتن: من هاوڕێكەتانم كە لە بەهەشت دەرم كردن ئەبێ لە گوێم بكەن یان دوو شاخ وەك شاخی گاكێوی ئەنێم لە منالّەكەت كە سكت كون تێبكاتو بێتە دەرەوە، چەند هەڕەشەی تری لێ كرد بۆ ئەوەی ناوی بنێن عبدالحارث، ئەوانیش بە گوێیان نەكردو منالّەكە بە مردوویی بوو، ئینجا جاری دووەم سكی پڕ بوو هەر بە وێنەی یەكەم جار هاتو هەوڵیدا لەگەڵیانو ئەوانیش بە گوێیان نەكردو منالّەكە بە مردوویی بوو، ئینجا لە جاری سێیەمدا خۆش ویستنی منالّ كاری لێكردنو ئەو ناوەیان لێنا، لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە لە جاری سێیەمدا ترساندنی بەمەی ئەگەر لە گوێی نەكەن منالّەكەیان بە چوار پێ دەرئەچێو ئەوانیش ترسانو ناویان نا بەوەی كە شەیتان پێی خۆش بوو، بە ڕاستی ئەم جۆرە ڕیوایەتانە ئەگەر بكرێن بە تەفسیری ئەم ئایەتە ئەو گرێیە سەخت تر ئەكەن، چونكە ئەوەی ئەم ڕیوایەتانە ئەیڵێن شیاوو شایستەی ئەو دووانە نیە بەتایبەتی ئادەم كە خوا ئەو هەموو پایەو پلە بەرزەی پێدا، بێجگە لەوەش ڕووكەشو ڕواڵەتی ئایەتەكەش گونجاوو شیاو نیە، جا بە هۆی ئەوەوە زانایانی تەفسیر ئەو هەموو پینەو پەڕۆو تەئویلەیان كردووە لەم ئایەتەدا بە چەند جۆرێك تەفسیریانكردووەتەوە، وەك باسكراون لە كتێبە گەورەو درێژەكانی تەفسیردا، وەك تەفسیری ڕازیو منارو چەند تەفسیرێكی تر، لەناو ئەو هەموو تەفسیرو تەئویلانەدا ئەمەم بە لاوە بەهێزترو نزیك ترە كە ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە سەبارەت بەناونانی ئادەمو حەوا یان حەوایە بە تەنیاو**

بێ‌دەنگ بوون‌و بێزاری دەرنەبڕینی ئادەم لەو ناونانە، ناونانی کوڕەکەیان بە عبدالحارث، هاوبەش ڕەوادان دوو جۆرە: گەورە کە مەردومی پێ دەرئەچێ لە ئایینی خوا، بچوکەکە مەردمی پێ دەرناچێ لە ئایین، بەڵام شتێکی بەدەو ناشایستەیە. کە ئەوەش شتێکی زۆرەو زۆر بەکار ئەهێنرێ. وەك ئەگوترێ: ئەگەر فڵان نەبوایە پشیلە مریشکەکانی ئەخواردین، ئەگەر تۆ نەبوویتایە منداڵەکەمان لەناو ئاوەکەدا ئەخنکاو هەروەها... ئەم جۆرە گوتراوانە ناشایستەن بۆ بڕوادار هەرچەند بڕوای وایە کە هەمووشت بەدەست خوایەو هەرچی خوا نەیکات نابێ‌و هەرچی خوا بیکات هەر ئەوە ئەبێ، چونکە بە ڕواڵەت‌و بەدیمەن شتێکی تری گێڕاوە بە کاربەدەست‌و هۆی مەبەستەکەی، لێرەدا مەبەست بەو هاوبەش بڕیاردانە ئەم جۆری دووەمەیەو هەواڵ‌و ڕیوایەتە ئەبێ بە تەفسیر بۆ ئایەتەکە، وتە بەگوێ کردنی شەیتان‌و ناونانی ئەو گوڕەیە بە عبدالحارث زۆر بە قورس‌و بە توند گیراو سەرنج درا تا ئەو ڕادەیە دانرا بەهاوبەش ڕەوادان، ئینجا لەسەر ئەم ڕاو تەفسیرە داستانە کە دوایی دێت لەوتەی ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا﴾داو ڕستەی ﴿فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ﴾ سەربەخۆیەو لە داستانەکە نیە، بەڵکو بە بۆنەی باسی هاوبەش ڕەوادانەکەی ئەوان ئەو ڕستەیەی هێنا بۆ گەیاندنی پاکی خوا لە هەر جۆرە هاوبەش ڕەوادانێك لەلایەن هاوبەش ڕەوادەرانەوە، ئینجا هێنانی ﴿شُرَكَآءَ﴾ بە کۆ نەك بە تاك بەم خوێندنەوەیە ئێستا باوە، لەبەر زیادە توندوتیژیی‌و قورسکردنی کارەکە لەسەریان، چونکە هەرکەسێك یەك هاوبەش بڕیاربدات چەند هاوبەشێکیش هەر ڕەوائەدات،بێجگە لەوەش ئەو کردەوەی ئەوانە بووبەهۆی وێنەی کردەوەیە لەپاش خۆیان لەناو بەچەو نەوەکانیاندا، کەواتە وەك چەندەهاو بەشێکیان ڕەوادابێ وایە، بەڕاستی لەناو ئەو هەموو تەفسیرو تەئویلانەدا ئەم تەفسیرو تەئویلە بە بەهێزتر زانی‌و لەدڵمدا جێگیرتر بووەو زۆر لە زانا بەرزەکانیش پەسەندیانکردووە، کەواتە با باش وەرگیرێ، بێ‌گومان زانینی ڕاستەقینە هەر لای خوایەو هەر ئەو سەرچاوەیە بۆی، ئەم تەفسیرو تەئویلە وەك زۆرتر ڕێکە لەگەڵ ڕووکەش‌و ڕوواڵەتی ئایەتەکەدا هەروەها دەستە ملیشە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتانەی کە هێنامان‌و زۆر ڕیوایەتی تریشدا، ئینجا هەروەها ئەڕوات لەسەر هاوبەش ڕەوادان‌و بە بۆش‌و پڕوپوچ دەریئەخات،

أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۗ

---

ئەفەرموێ: ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا﴾ ئایا بت پەرستەکان شتێ ئەکەن بە هاوبەشی خوا کە هیچ شتێك دروست ناکەن و توانای دروستکردنی هیچ شتێکیان نیە، بێگومان پەرستراو پێویستە بتوانێت بپەرستەکەی دروست بکات، ﴿وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ ئەو بتانە دروستکراویشن لەکاتێکدا کە پەرستراو نابێ دروستکراوبێت ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا﴾ ئەو بت و پەرستراوانە ناتوانن و توانای هیچ جۆر یارمەتی و کۆمەکیان نیە بۆ هاوبەش ڕەوادەرەکانیان کە ئەیان پەرستن ﴿وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ﴾ یارمەتی خۆیشیان نادەن و ناتوانن بەرگری لە خۆشیان بکەن کاتێ دووچاربن، ﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ﴾ ئەگەر ئێوە ئەی هاوبەش ڕەوادەران بانگی ئەو بتانە بکەن هاواریان لێبکەن بۆئەوەی ڕێنموونیتان بکەن بۆلای شتێ کە مەبەستتان پێك بێنێت یان ڕزگارتان بکات لەناخۆشیەك ئەو بتانە نایەن بەهاوارتانەوە و بەقسەتان ناکەن و دواتان ناکەون بۆلای ئەو مەبەستەتان، توانای ئەوەشیان نیە تا ئەو ڕادەی ﴿سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ﴾ یەکسانە لەسەرتان لە بێسوودی و بێکەڵکیدا ئایا هاواریان لێبکەن یان بێدەنگ بن، ئابەو جۆرو شێوە ڕوون و ڕەوان و سوك و ئاسانە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای هێنایەوە لەسەر پڕوپوچی و بێکەڵکی ئەو بتانە و سەرزەنشتی کردن لەسەر بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان، پلە پلە هاتە خوارەوە لەگەڵیان تا بیربکەنەوە و هۆشیان بێننەوە:

١- فەرمووی: ئەوانە ناتوانن هیچ شتێ دروستبکەن.

٢- خۆشیان دروستکراون.

٣- ناتوانن هیچ یارمەتی و کۆمەکیەك بکەن بۆ ئەوانەی کە ئەیان پەرستن.

٤- ناتوانن بەرگری لە خۆشیان بکەن.

٥- ناتوانن ڕێنموونیش بکەن بۆ مەبەستو ئامانجێك بەجۆرێ بانگ کردنو هاوار لێکردنو بێدەنگ بوون لێیان وەك یەك وایە لە بێسوودیو بێنرخیدا.

ئەو ئایەتانە هەرچەند هاتوونەتە خوارەوە سەبارەت بەو بتو پەرستراوە سادانەی ئەو سەردەمو چەرخە بەڵام تایبەتی نین هەر بەو بتانەوە، بەڵکو هەموو پەرستراوێکی تر بێجگە لە خوای تاكو تەنیا وەك ئەو بتانە وانو ئەم ئایەتەیان تێدا بەدی دێت، چونکە هەرچی پەرستراو لە جیهاندا بووبێ یان ببێ بێجگە لە خوا ناتوانن و نەیتوانیوە هیچ شتێك دابێنیو دایهێنابێ، هەمووشیان دروستکراون ناتوانن و نەیانتوانیوە بەبێ ئیزن و مەیلی خوا نەبێ یارمەتی هیچ کەسێك بدەن یان بەرگری هیچ شتێ لە خۆیان بکەن، هەروەها بێن بەهاواری هیچ کەسەوەو ڕێنموونی هیچ کەس بکەن، چونکە دەستەپاچەو بێدەسەڵاتن و موڵکی خوان، وەك ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێگومان ئەوانەی کە ئێوە هاواریان لێئەکەن یان ئەیان پەرستن بێجگە لە خوا ﴿عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ ﴾ بەندەیانێکن وێنەی خۆتان، واتەموڵكو دروستکراوی خوان، ژێربارو دەستە پاچەن بەوێنەی خۆتان، دەی چۆن هاواریان لێئەکەن، ئینجا بەریان لێ ئەبڕێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَٱدۡعُوهُمۡ﴾ دەی هاواریان لێبکەن، ﴿فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ ﴾ دەی بابێن بە هاوارتانەوە ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کە ئەوانە بە فریاد ڕەس دائەنێن، ئینجا زیاتر دەمکوتیان ئەکات سەبارەت بەو بتە بێگیانانەی کە ئەوان بەنەزانیو نەفامی هاواریان لێ ئەکردن، ئەفەرموێ: ﴿ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ﴾ ئایا بۆ ئەوانە قاچو پێیەك هەیە کە پێی بگەڕێن و هاتووچۆی پێبکەن؟ ﴿أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ﴾ ئەی ئایا دەستێکیان هەیە کە دەستی پێبوەشێنن و بیخەنەکار بۆ مەبەستێکی خۆیان؟ ﴿أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ﴾ ئەی ئایا چاوێکیان هەیە کە پێی بڕوانن و شتی پێبەدی بکەن؟ ﴿أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ﴾ ئەی ئایا گوێچکەیەکیان هەیە کە پێی ببیستن؟ بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کە ئەو نەفامانە کە خاوەنی ئەو قاچو دەستو چاووگوێ بوون هاواریان ئەکردلەوداروبەردەکەهیچ کام لەوانەیان نەبوو!! خوا پەنامان بدات لە گومڕاییو نەفامی لەپاش دەمکوتکردنی ئەو نەفامانە بەو هەموو نیشانەو بەڵگە ڕوونانە ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بەریان لێببڕێتەوە بە خۆیان و بتەکانیانەوە،

قُلِ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵی بەو بت پەرستانە: هاوار بکەن‌و بانگی ئەوانە بکەن کە کردووتانن بە هاوبەشانی خوا ﴿ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ﴾ ئینجا بە هەمووتانەوە پیلان‌و نیازی خراپم پێبکەن‌و چی لەدەستان دێت بیکەن دەربارەم ئینجا مۆڵەتم مەدەن، واتە هیچ باکم نیە لێتان‌و مەترسی هیچ شتێکتان لێناکەم کە بتانەوێ بیکەن دەربارەم، چونکە ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ بەڕاستی کاربەدەست‌و دۆست‌و یارمەتی دەری من خوایە کە نامە واتە قورئانی هێنایە خوارەوە بۆ سەرم، ئەو نامەیە جیاکەرەوەی هەقە لەناهەق، ڕزگارکەرە لە تاریکی بێبڕوایی، دەمکوت کەری هەموو دەمبازو چەنەبازێکە، موعجیزەیەکی بێوێنەیە بۆ هەموو کات‌و چەرخێك، تاقانە پەیوەندی‌و پەیوەستیەکی بەهێزە بە خواوە، بەم قورئانە خوا هەموو کاروبارێکی ئەو پێغەمبەرەی ڕێکخست (ﷺ) کە ناردی بەم بەرنامەو پەیامە گشتی‌و هەتا هەتاییە، ﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئەو خوایە خاوەنداری‌و یارمەتی‌و کاربەدەستی بەندە چاکەکانی ئەکات، واتە هێندێ لە باوەکانی خوا ئەمەیە کە یارمەتی‌و کۆمەکی بەندە چاکەکانی ئەکات‌و نایاندات بەدەم خراپانەوە، کەواتە هیچ باك‌و مەترسی نیە نەلە خۆتان‌و نەلە بتەکانتان، خوێندنی ئەم ئایەتە بە دڵ‌و بە ئیخلاصەوە زۆر بەکارە بۆ پارێزگاری لە دوژمن، ئەو کەسانە کە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ ڕێگەی خوا پێویستە وەك پێغەمبەر (ﷺ) بەرەنگاری دوژمنان بکەن بەم ئایەتانەو بەم هەست‌و ڕۆحەوە بەرامبەریان بوەستن، لەپێشەوە سەرزەنشتی بت پەرستەکانی کردو تەشەری لێدان بەوەی کە شتێ ئەپەرستن کە بێکەڵکن‌و توانای یارمەتی دانی نە ئەوان‌و نە خۆشیان نیە، نابینا‌و نابیسەرن، ئینجا لێرەدا ئەوانە ئەهێنێتەوە بۆ جیاکردنەوەی ئەوەی کە پەرستنی ڕاست‌و ڕەوایە، لەوەی کە پەرستنی ناڕاست‌و ناڕەوایە،**

وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ

---

**ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ ئەوانەی کە ئێوە هاواریان لێئەکەن بێجگە لە خواو ئەیانپەرستن ﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ﴾ ناتوانن یارمەتیتان بدەن ﴿وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ﴾ یارمەتی خۆشیان نادەن و ناتوانن بیدەن ئەگەر دووچاربوون ﴿وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ﴾ ئەگەر هاوارو نزایان لێبکەن بۆ ڕێنموونیتان بۆ مەبەست و ئامانجتان ﴿لَا يَسۡمَعُواْۖ﴾ نابیستن نزاو هاوارەکەتان چ جای کۆمەکی و یارمەتی ﴿وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ﴾ ئەوانە ئەبینی ئەڕوانن بۆلات لەکاتێکدا نابینن، نەتۆو نە هیچ شتێکی تر، ئەو بتانەیان دائەتاشی و دروستیان ئەکرد لەسەر شێوەی ئادەمی و وێنەی چاو و گوێچکەیان لێ ئەخستن، بەڵام وێنەو شێوەی ڕووت و بەبێ گیان و بەبێ هێز، جا لەسەر ئەوە ئەم ئایەتی پێشووە هاتووە.**

**ئینجا کۆتایی ئەم سوورەتە گەورەیە ئەهێنێ بە چەند پەندو ئامۆژگاری یەک کە ئاڕاستەی پێغەمبەرەکەی ئەکات (ﷺ) لەیەکەم جارەوە، ئینجا دیارە بۆ بڕوادارانیشە، لە کاتێکدا هێشتا لە مەککەدا بوون، لە کاتی بەربەرەکانێی نەفامی نەفامانی عەرەب بە چواردەوریاندا، نەفامی هەموو زەوی، ئەم پەندو ئامۆژگاریە بەرزو شیرینە بەکاربێنێ بەرامبەر نەفامی ئەو نەفامانەو گومڕایی ئەو گومڕایانە، ئەفەرموێ: ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ﴾ لەڕووشت و کردەوەی خەڵکی ئەوەی سووک و ئاسانەو بەبێ زەحمەت و ناڕەحەتی بۆیان ئەکرێ وەری گرە، ڕازی بە لێیان بەوەی بە ئاسانی بۆیان ئەگونجێ و توندو تیژییان لەگەڵ مەکەو داوای شتێ مەکە لێیان کەلەسەر شانیان قورس بێت، با نەتارێن و نەتۆرێن، واتە لە کاروباری شەخسی نەک لە بارەی کاروباری ئایینی و پێویستی ئایینی، یان لێبووردن و چاوپۆشی بگرەو بەکاری بێنە بەرامبەر ئەوانەی خراپەت لەگەڵ ئەکەن، وەک لە حەدیسێکدا تەفسیری کردەوە بەوەی ببورە لە کەسێک کە ستەم و دەست درێژیی لەگەڵ کردی و بەشی کەسێک بدە کە ئەو تۆی بێبەش کردووە، سیلەی ڕەحمی کەسێک بەجێبێنە کە پەیوەندی تۆی پچڕیوە، یان ئەوەی کە دێت بۆت لە ماڵ و سامانی خەڵکی و زیادە لێیان وەری بگرە، بەهەرکام تەفسیر کراوەتەوەو دەست ئەدات، بەڵام یەکەم و دووەم بەهێزترو دامەزراوترن لە دڵدا،**

وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾

---

**﴿وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ﴾ فەرمان بدە بە چاکە، واتە هەر کاروکردەوەیەك کە ناسراوەو بەجوان دائەنرێ، سروشتو دەروونی پاكو ساغ وەری ئەگرێو پێی ڕازییە، دڵو دەروون هەرکاتێ کە دەقی گرت بەو کاروکردەوە چاکەوە زۆر بەئاسانی دێتە ژێر بارو ئامادە ئەبێ بۆ گوێڕایەڵیو سەرپێچیو سەرکێشی ناکات ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ ڕوو وەرگێرە لە نەفامانو پشتیان تێبکەو بەوێنەی ووتارو کرداری بەدیان ڕەفتاریان لەگەڵ مەکە، وازیان لێ بێنەو گوێیان مەدەرێ، بێگومان ئەو بێدەنگ بوونوگوێ پێنەدانە زۆر جار ئەبێ بە هۆی گەڕانەوەو کۆتایی هێنانیان لە نەفامی.**

**بەڕاستی زۆر شیرینو بەجێیە کە هەر بەو جۆرە ڕەفتاری بکردایە لەگەڵ بانگ کراواندا، بەلام پێغەمبەر(ﷺ) ئادەمی بووەو لەوانە بووە کە لە هێندێ جاردا خۆی بۆ نەگیرێو خەشمو قین دڵی بگرتایە، ئەگەر ئەو خۆی بۆ نەگیرایە کەسانی تر پاش خۆی لەبانگ کەران خۆیان بۆ ناگیرێو لەکاتی خەشمو قین دا شەیتان دێتە کایە بۆ ئەوەی کارەکە بترازێنێ لەناوەڕاستی ڕێگە ڕاستەکە، لەبەر ئەوە ئەوا چارەسەری دانا بۆ ئەوەو فەرمووی: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ﴾ واتە ئەگەر خەتەرەو پاڵدەرو هەوڵێك لە لایەن شەیتانەوە ڕووی تێکردی بۆ ئەوەی لات بداو بت ترازێنێ لەو پەندو ئامۆژگاریەی کە ئاڕاستەتکرا، ﴿فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ﴾ ئەو کاتە پەنا ببە بەخوا بۆ بەرگری ئەوەی شەیتان ئەیەوێ، چونکە ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾**

بەڕاستی خوا بیسەری زانایە، بیسەرە بۆ وتارو کرداری نەفامەکان، کە ئازاری دڵی تۆ ئەدەن، ئاگادارو زانایە بەسەختی و قورسی ئەو ئازارە لەدڵتدا، بیسەرە بۆ نزاو پەنا بردنەکەت بە گوتن و ئاگاو زانایە بە پەنا بردنەکەت بە دڵ و بەڕاستی، ئەم فەرموودەیە دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوەیەکی گرنگی تێدایە، چونکە بەڕاستی بەسە کە خوا بیسەرو ئاگایە بەوەی کە دووچاری پێغەمبەر (ﷺ) ئەبێ لە ڕێی خوادا، ئینجا لەڕێگەیەکی ترەوە ئارام و ڕەزامەندی ئەدا بەدڵی، یادو باسی خوای پێ نیشان ئەدات لەکاتی ڕق هەڵسان بۆ بەرگری شەیتان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ترسان و لەخواو خۆیان پاراستووە لە هۆی خەشم و ناڕەزایی خوا ﴿إِذَا مَسَّهُمۡ طَـٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ﴾ کاتێ کە خەیاڵ و خەتەرەیەك لەلایەن شەیتانەوە پەیدا ببێ و بدا لەدڵیان بیرئەکەنەوە و خوای خۆیان بیرئەکەوێتەوە ﴿فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ﴾ ئیتر دەست بەجێ ئەوانە بینائەبن و هەر هەڵەو نارێکی یەك ئەبینن و هەستی پێئەکەن. ئەم فەرموودە کورتە چەند شتێك نیشان ئەدات کە وەرئەگیرێ بە هۆی ئەو ڕستەی کە کۆتایی ئایەتەکەی پێ هێنراوە: ﴿فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ﴾. ئەم ڕستەیە نیشان ئەدات کە خەتەرەی شەیتان کوێرکەرەو قاپی بینایی دڵدا ئەخات، خۆپارێزی لە خەشمی خواو ترسان لە خوا دڵ پەیوەست ئەکات بە خواوەو بێداری ئەکاتەوە لەخەوی بێ ئاگایی، لەخوا ترسەکان وریاو ئاگادار ئەکاتەوە ئەو کاتە چاوو بینایی دڵیان ئەکرێتەوە، هەروەها نیشانە ئەدات کە پەیدا بوونی خەتەرەی شەیتان کوێرییە، بیرکەوتنەوەی خوا بینینە، خەتەرەی شەیتان تاریکییە، ڕوو کردنە خوا ڕووناکییە، زەنگ و تاریکی خەتەرەو دەستکاری شەیتان لە خوا ترسی و خۆپارێزی لائەچێ و نامێنێ، کەواتە شەیتان زۆرو دەسەڵاتی نیە بەسەر لە خواترس و خۆپارێزەراندا.

وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ

له خوا ترسەكان بارو حاڵیان بەو جۆرەیە كە باسكرا كەبە تێهەڵكێش هێنای لەنێوان فەرماندان بە گوێ نەدان و پشت هەڵكردن لە نەفامان و لەنێوان ئەوەی چ شتێ و كەسانێ پاڵئەنێن بە نەفامەكانەوە بۆ هەڵسانیان بەو نەفامی و نەزانی یەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ﴾ براكانیان لە شەیتانەكانی (جن) یان لە شەیتانەكانی ئادەمیش كەلە خوا نەترس و یاخی و سەركێشن، ئەو برایانەیان كۆمەكیان ئەكەن لە گومڕاییداو قۆڵگیریان ئەبن بە هاندانیان لەسەر ئەو تاوان و بێبڕوایی و گومڕاییە، ڕازاندنەوەو شیرین كردنی ئەو بارو ڕێگەیەیە لەپێش چاویان ﴿ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ﴾ ئینجا ناوەستن و وازیان لێناهێنن هەتا بە داوی ئەیانترازێنن و لایان ئەدەن لە ڕێگەی ڕاست، ﴿وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ﴾ كاتێ ئایەتێكیان بۆ ئەهێنێ لەئایەتەكانی قورئان بەم ڕەنگە سروشتی خوا دوا كەوتبێ، وەك (مجاهدو قتادةو زةجاج) ئەفەرموون. یان كاتێ موعجیزەیەكیان بۆ نەهێنێ لەو موعجیزانە كە پەڵپیان پێئەگرن و گەلاڵەی ئەگرن، وەك لە (ئیبن و عەباس)ەوە ڕیوایەت كراوە —خوا لێیان ڕازی بێ—، كاتێ بەو جۆرەبێت ﴿قَالُوا۟﴾ لەو نەفامانە ئەڵێن و ئەیانگوت: ﴿لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ﴾ كاشكێ خۆت لەلایەن خۆتەوە دەست هەڵبەست بكردایە، یان كاشكێ ئەو ئایەتەت لە خواوە وەگرتایە بە داواكردن و واز نەهێنان تا پێكی بهێنایە بۆت، هەركام مەبەست بێت ئەو پەڕی نەفامی بێئاگایی نیشان ئەدات لەلایەن ئەوانەوە، نەفامی و نەزانی و بێئاگایی لەپەیام و فروستادەیی و سروشتی فروستادە، ئەو نەفامانە نەیان ئەزانی كە فروستادە بەندەیەكی گوێڕایەڵەو هەمیشە شوێنی فەرمانی خوا ئەكەوێ و بە مو لانادا لەوەی بۆی دیاری كراوە، هەرگیز پەڵپ و گەلاڵەگرتنی نیە بەرامبەر پەروەردگاری، ناتوانێ لەلایەن خۆیەوە هیچ كارو كردەوەیەك بكات، وەك فەرمانی پێدا بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ﴾ من هەر شوێنی ئەوە ئەكەوم كە (وحی) سروشم بۆ كراوە لەلایەن پەروەردگارمەوە، كەواتە خاوەنی هیچ نیم بێجگە لەوەی كە سروشم بۆ كراوە، هیچ شتێ ناهێنم بێجگە لەوەی كە فەرمانم پێدراوە.

هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾

---

**هەروەها فەرمانی پێدرا کە باس بکات بۆیان‌و پێیان بگەیەنێ لەم قورئان‌و حەقیقەتی ئەم قورئانەیان بۆ ڕوون بکاتەوەو پێیان بفەرموێ: ﴿هَٰذَا﴾ ئەم قورئانە ﴿بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾ چەند بینابییەکە لەلایەن پەروەردگارتانەوە، واتە هەموو ئایەت‌و سوورەتەکانی بینایییە بۆ دڵ‌و دەروونەکان کە هەموو هەق‌و ناهەق‌و ڕاست‌و چەوتەکانی پێ‌بناسرێ‌و جوێ بکرێنەوە لەیەکتر ﴿وَهُدًى﴾ ڕێنموونی‌و ڕێ نیشاندانە ﴿وَرَحْمَةٌ﴾ میهرەبانی‌و بەزەیی خوایە، بەڵام بۆ کێ؟ ﴿لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بۆ کۆمەڵ‌و دەستەیەك کە بڕوایان هەیەو بڕوا ئەهێنن، چونکە ئەمانە بەرهەمەند ئەبن پێی‌و سوودی لێ وەرئەگرن، هێندێ ئەفەرموون: چەند بینابییەکە بۆ هەمووان‌و ڕێنموونی‌و میهرەبانی یە هەر بۆ بڕواداران، بەڵام دڵ بۆ ئەوە زیاتر ئەڕوا کە هەرسێ هەر بۆ بڕوادارانە. ئەم قورئانە لە چەند بارو ڕوویەکەوە گەورەترین موعجیزەی خوایە، وەك لە چەند شوێنێکدا بە درێژیی باسمان کرد، لەگەڵ ئەوەدا نەفامەکانی عەرەب لە کاتی خۆیدا بەم قورئانە کۆتاییان نەئەهێناو پەڵپی چەند موعجیزەیەکی تریان ئەگرت کە ئەم زۆر زۆر گەورەو گرنگ ترە لەوانە، بەڵام بینایی دڵیان کوێربوو هەستیان پێ نەئەکرد وەك شەمشەکوێرە کە هەست ناکات‌و توانای بینینی ڕووناکی خۆری نیە. قورئان کە بەوجۆرە بینایی‌و ڕێنموونی‌و میهرەبانییە، شیاوو شایستەی ئەوەیە کە بەرامبەری بەم جۆرە بن کە فەرمانمان پێ ئەدا لەم ئایەتەدا وەك ڕێگەی بەهرەمەندیش پێی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ﴾ کاتێ کە قورئان خوێنرا ﴿فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ﴾ گوێ بگرن بۆی، گوێ بگرن بە چاکی‌و بەدڵ ﴿وَأَنصِتُوا۟﴾ بێ‌دەنگیش بن ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بەڵکو میهرەبانیتان پێبکرێ، بە ئومێدو چاوەڕوانی ئەو میهرەبانی پێکردنە گوێ بگرن‌و بێدەنگ بن، بێ‌گومان ڕووکەش‌و ڕووالەتی ئەم ئایەتە ئەمەیە، وەك زانایانی زاهیری ئەفەرموون کەلە هەر شوێنێ‌و لە هەر کاتێ لەبەر هەر هۆیە قورئان خوێنرا پێویست‌و فەرزە گوێ گرتن بۆی‌و بێدەنگ بوون، بەڕاستی مافی خۆیەتی‌و دڵیش هەر بۆ ئەوە ئەڕوا، بەڵام چەند ڕایەکی تر هەیە لەناو زانایاندا:**

١- مەبەست بەم ئایەتە قەدەغەکردنی قسەو گفتوگۆیە لە نوێژدا کەلەیەکەم جارەوە باوبووە وەك لە (ئەبوهورەیرەو قەتادە)وە ڕیوایەتکراوە.

٢- ئەم ئایەتە هات بۆ بەرگری لەوەی بەدەنگی بەرز قورئان بخوێنرێ لە پشت ئیمامەوە، (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: هاوەڵەکان لەکاتی خوێندنی پێغەمبەرا (ﷺ) بەدەنگی بەرز ئەیان خوێندو دەنگیان تێکەڵ ئەبوو ئینجا ئەم ئایەتەهات بۆ بەرگری لەوە، (ئیمامی حنەفی) و هاوەڵەکانی لەسەر ئەمەن.

٣- هاتووە بۆ بەرگری لە خوێندن لەکاتی خوتبەدا، ئەمەش فەرموودەی سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عەتایە لە ئیمامی شافیعیەوە ڕیوایەتکراوە، بەڵام بەلای زۆربەوە ڕایەکی دوورە.

٤- هاتووە بۆ بەرگری لە خوێندنی قورئان لەلایەن موسڵمانانەوە لەو نوێژو ئەو ڕکاتانەدا کە ئیمام دەنگ بەرزئەکاتەوە، لەو نوێژو ڕکاتانەدا کە ئیمام دەنگ بەرزناکاتەوە پێویستو فەرزە کە فاتحە بخوێنین ئەمەش بە مەزهەبی ئیمامی مالیكو ڕای پێشووی شافیعی.

٥- ئەم ئایەتە هاتووە دەربارەی بێبڕواکان کە داوای چەند ئایەتێکی تایبەتیان ئەکردو پەلپی چەند موعجیزەیەکیان ئەگرت، ئینجا ئەم ئایەتە هات فەرمانیدا بەگوێ گرتنو بێدەنگ بوونیان لەکاتی ڕاگەیاندنو خوێندنی پێغەمبەرا (ﷺ) تا بۆیان دەرکەوێ کە ئەم قورئانە موعجیزەیەکی تێرو تەواوو هەمیشەییەو ئیتر داوای هیچی تر نەکەن، بەڕاستی ڕای زانایانی زاهیرو ئەم ڕای پێنجەمە ڕێكو پێکە لەگەڵ هۆنینەوەی ئایەتەکانی دەوورو بەری، بەڵام ئەو چوار ڕاکەی تر وەك لە هۆنینەوەکەدا لاوازەو بەهێز نیە هەروەها دوورە بەهەر کام لەو چوار ڕایە تەفسیر بکرێتەوە، چونکە ئایەتە مەککەییە لەو کاتەدا نوێژ بە جەماعەت باونەبووەو ئەو ڕایانەش پەیوەستن بە نوێژی جەماعەتەوە، بێجگە لەوەش ئایەتەکە ڕووتە لە هەر قەیدو شەرتو شروتێك، کەواتە چۆن بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز ببەسترێتەوە بەو قەیدو شەرتانەوە، بەتایبەتی یەکێ لە یاساکانی ئیسلام کە ئایەت بەپێی گشتێتی دەقەکەی ئەگیرێو نابەسرێتەوە بەهۆی هاتنەخوارەوە.

وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾

ئینجا سوورتەکە دوایی ئەهێنێ بە تەمێ و فەرماندان بەیادو باسی خوا بەشێوەی گشتی لەنوێژو لە غەیری نوێژدا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ﴾ باس و یادی پەروەردگارت بکە لە دڵی خۆتدا بەلالانەوەو بە بیم و ترسەوە، واتە بەجۆرێ بلالێرەوە لێی هێندێ ئەفەرموون مەبەست ئەوەیە زانابێت بە واتای ووتەکانی و لە دڵیدا گەورەیی و سام و بیم و شەرم لە خوا ئامادەبێت، ﴿وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾ بەجۆرو ووتەیەك بڵێت کە کەمترو نزمتربێت لە دەنگی بەرزو زوڵاڵ، بەم ڕەنگە خۆی بیبیسێ وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ - خوا لێیان ڕازی بێ- یان میانە لە نێوان بەرزو چپەدا وەك ئیمام (الحرمین) ئەفەرموێ، یادو باسی خوا بەو جۆرە بکە ﴿بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ﴾ لەبەیانیان و ئێوارانـدا، واتە دوای شەبەق و ڕۆژبوونەوە تا خۆرکەوتن، وە دوای عەسر تا ڕۆژ ئاوائەبێت و شەو دێت، ئەم دوو کاتەی بەتایبەتی باس فەرموو چونکە لەم دوو کاتەدا دوو گۆڕانی جیاوازی ئاشکرا دێت بەسەر جیهاندا، دڵی ئاگادار دەستی قودرەتی خوا ئەبینێ لەوەدا، کەواتە باشتر ئەکەوێتە سۆزو پەرۆش بۆ پەروەردگاری خۆی، ملکەچی و سەری بەندەیی باشتر دائەخات بۆ خوای خۆی، هێندێ ئەفەرمون: ئەو کاتە کاتی بیکاریەو دەست خاڵیە، کەواتە دڵ باشتر یادو باسەکەی بۆ پێك دێت، هێندێتر ئەفەرموون: لەو کاتەدا فریشتەکانی شەوو ڕۆژ ئەگۆڕێن و دێن بۆسەر ئادەمی، هێندێ تر ئەفەرموون: مەبەست هەموو کاتە وەك ئەگوترێ: شەوو ڕۆژ خەریکەو ناوەستێ، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار بێگومان پێویستە لەسەر بەندە کە هەمیشە بێدارو وریابێت و خوای خۆی لەبیربێت و هەست بکات بە چاودێری و ئاگاداری خوا لە هەر کارو کردەوەو نیازو مەبەستێکدا، هیچ کاتێك کە هۆشی بەخۆی بێ بێ بێئاگانەبێ وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾ لەبێئاگایان مەبەو نەچیتە ڕیزی ئەوانە کە بێئاگان لە باس و یادی خوای خۆیان، خوا بە میهرەبانی خۆی نەمانخاتە ڕیزی ئەو بێئاگایانە، بەڵکو دڵ وریا و

ئاگادارمان بکات بەچاودێری و ئاگاداریە هەمیشەییەکەی خۆی، ئامین. بێگومان ئێمەی لاواز کە هەمیشە شەیتان ئامادەیەو لە کەمین دایە بۆمان زۆر پێویستین بەیادو باسی خوا هەستکردن بەچاودێری خوا بەسەرمانەوە، کە هیچ پەناو قەڵایەك نیە بۆمان کە بمان پارێزێ لەو دوژمنە کۆڵنەدەرەمان کە هەمیشە وەستاوە بە دیارمانەوە بۆ هەر هەل و هەڵکەوتێك بۆی دەست بدات، بۆئەوەی بمان گێڕێ بە شوێنکەوتووی کۆمەڵەکەی خۆی، ئینجا بۆئەوەی باشتر ئێمە رووبکەینە خواو یادو باسی خواو پەرستنی خوا، بۆئەوە باسی کۆمەڵی هەرەبەرزی مەلائیکەمان بۆ ئەکات کە لەگەڵ ئەوەدا پاکن لە هەرجۆرە گوناهو نا فەرمانیەك، ئەوانە شەوو رۆژو هەمیشە وان لە خواپەرستیدا، چ جای ئێمە کە هەمیشە واین لە هەڵەو تاواندا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەلای پەروەردگارتن، واتە کۆمەڵی هەرەبەرزی مەلائیکە نزیکن لە میهرەبانی و ڕەزامەندی خواوە ﴿لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ﴾ خۆیان بە گەورە نازانن و سەرپێچی ناکەن لە پەرستی پەروەردگارت ﴿وَيُسَبِّحُونَهُۥ﴾ بەپاك و خاوێن ئەیگرن لە هەرشتێ کەشایانی گەورەیی و خوایەتی ئەو نیە، ﴿وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ﴾ بۆ ئەو سوژدە ئەبەن و ئەو تایبەتی ئەکەن بەپەرستن و ئەپەڕی ڕادی بەندەیی و ملکەچی، بێگومان بەندەیی و خواپەرستی یادو باسی خوا بەشێکی بنەڕەتی و سەرەکیە لەبەرنامەی ئەم ئایینەدا، جا لەبەرئەوە ئەم فەرمان و تەمێیە کۆتایی سوورەتەکەی پێهێنرا، کەئەم هەموو باس و مەسەلەو بیروباوەڕە گەورە گەورانەی تێدابوو، پێویست کرابوو گوێڕایەڵی ملکەچی بۆ هەموو فەرمان و بڕیارەکانی، ئەم ئایەتە یەکێکە لەوانەی کە سوننەتە سوژدە بردن لەکاتی خوێندن و گوێ گرتن لێی.

**وصلى وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.**

# سوورەتی ﴿الانفال﴾
## مەدینەییەو (٧٥) ئایەتە

ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە دەربارەی ڕووداوو جەنگی بەدری گەورە کە بەرپا بوو لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی لەپاش تێپەڕبوونی نۆزدە مانگ بەسەر کۆچکردندا، ئەو جەنگ و ڕووداوە ئەوەندە گەورەو گرنگە لە مێژووی ئیسلامدا خوا ڕۆژەکەی ناوبرد بە ﴿يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ﴾ وەك لەمەو پاش بەیارمەتی خوا لەکاتی خۆیدا باسی ئەکەین لە تەفسیری ئەو ئایەتەی کە ئەو ناوەی لێنا، ئەو ڕووداوو جەنگە هەرچەند گەورەو گرنگ بێت، نرخ و گرنگیەکەی بەتەواوی ڕوون نابێتەوە، تا تێنەگەین لە سروشت و حەقیقەتەکەی، تا تێنەگەین لەهۆی بەرپابوونەکەی و مەبەست و ئامانجەکانی، هەروەها تێنەگەین لەسروشت و حەقیقەتی جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا، هۆو مەبەست و ئامانجەکانی، تاتێ نەگەین لە حەقیقەتی ئەم ئایینە پیرۆزە، خاوەنی (زاد المعاد) -خوا لێی ڕازی بێ- پاڵفتەیەکی گرنگی هێناوە لەو بارەیەوە لەکاتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا کاتی لەدنیا دەرچوونی. ئەفەرموێ: لەیەکەمجاری پێغەمبەرێتییەکەیەوە فەرمانی‌دا کە بیخوێنێ بەناوی خواوە بۆ خۆی و لەدەروونی خۆیدا، فەرمانی نەدایە بەڕاگەیاندن، لەپاشان فەرمانیدا بەڕاگەیاندن و فەرمووی: ﴿قُمۡ فَأَنذِرۡ﴾ هەستە و مەردوم بترسێنە، ئینجا فەرمانیدا کە خزمە زۆر نزیکەکانی بترسێنێ، ئینجا گەل و کۆمەڵەکەی ترساند، ئینجا عەرەبی دەوروبەری ئەترافی، ئینجا هەموو عەرەب، ئینجا هەموو جیهان و جیهانیانی ترساند، ئەوە بوو نامەی نووسی بۆ هەموو پادشاو کاربەدەستەکانی جیهان، ئەوەی لەو کاتەدا بۆی کراو دەستی پێی گەیشت. سیازدە ساڵ‌لەپاش گێڕانی بە پێغەمبەر هەستا بەبانگکردن و ترساندنی مەردومان بەبێ جەنگ و کوشتار، فەرمانی پێدرا بە خۆگری و چاوپۆشی، ئینجا ئیزن درا بەکۆچکردن بۆ مەدینەی پیرۆز، لەپاش ئەوە ئینجا ئیزن درا بەجەنگکردن لەگەڵ هەرکەسێك کە جەنگی لەگەڵ بکات و واز بێنێ لەوەی کە کەنار گیرە لێی و جەنگی لەگەڵ ناکات، ئینجا فەرمانی پێدرا بە جەنگ کردن لەگەڵ بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەران. تا هەموو ئایین و ملکەچی هەر بۆ خوا بێت، ئینجا بێبڕوایان لەگەڵی کران بەسێ‌بەش: ئاشتی خوازو جەنگ نەکەرو کەنار گیر، جەنگ کەرو دوژمن، ئەهلی زیمە. ئینجا فەرمانی پێدرا کە ئاشتی و پەیمان بباتە سەر لەگەڵ خاوەن پەیمان و ئاشتی خوازان. تا ئەوان لەسەر پەیمان و ئاشتی و خۆیان بن، ئەگەر مەترسی

ناپاكى و پاشگەزبوونەوەى لێكردن، پەیمانەكەیان بداتەوە جەنگیان لەگەڵ نەكات هەتا پێیان ڕانەگەیەنێ و ئاگاداریان ئەكات بەنەمانى ئاشتى و پەیمان، جەنگ بكات لەگەڵ ئەوەى كە پەیمانى هەڵوەشاندبێتەوەو پاشگەز بووبێتەوە، ئینجا كاتێ سوورەتى (براءة) هاتە خوارەوە حوكم و بڕیارى ئەم سێ بەشەى هێنا: فەرمانیدا بە جەنگ و كوشتار لەگەڵ دوژمنانى نامەدار هەتا سەرانە بدەن یان موسڵمان ببن، فەرمانیدا بە تێكۆشان و بەبەرەكانى بێبڕواكان و ناپاكان و توندوتیژى لەگەڵیان، ئەویش بە بەربەرەكانێ كردن لەگەڵ بێبڕواكان بە شیرو بە چەك، لەگەڵ ناپاكان بە دەم و بە زوبان دەم كوت كردنیان و پەك خستنیان، وەك لە سوورەتى (براءة)دا فەرمانیدا بە هەڵوەشاندنەوەى پەیمانەكانى بێبڕواكان، خاوەن پەیمانەكانى گێڕا بە سێ بەش: بەشێك فەرمانیدا بە جەنگ كردن لەگەڵیان كە ئەوانە بوون پاشگەز بوونەوەو پەیمانیان هەڵوەشاندەوە، جەنگى لەگەڵ كردن و زاڵ بوون بەسەریاندا، بەشێكیان پەیمانى كاتییان لەگەڵ بەسترابوو، پەیمانەكەیان ڕاگیر كردبوو، بە دژى ڕەفتاریان نەكردبوو، بۆ ئەم بەشە فەرمانیدا كە پەیمانیان لەگەڵ ڕابگرێ تا ماوەكەى تەواو ئەبێ، بەشێك ئەوانە بوون كە نە پەیمانیان لەگەڵ بەسترابووو جەنگیشیان نەكردبوو، یان پەیمانێكیان لەگەڵ بەسترابوو بە بێ دیاریكردنى كات بۆیان، دەربارەى ئەمانە فەرمانیدا كە چوار مانگ مۆڵەتیان بدات، لە پاش ئەو چوار مانگە جەنگیان لەگەڵ بكات، بەوپێیە جەنگى كرد لەگەڵ ئەوانەى كە پەیمانیان شكاندو ئەوانەى كە پەیمانیان لەگەڵ نەبەسترابوو، یان پەیمانیان لەگەڵ بەسترا بوو بەڵام بەبێ دیارى كردنى كات و ماوە بۆ پەیمانەكەیان، ئەم دوو دەستەیەى چوار مانگ مۆڵەتدا، فەرمانیدا بەتەواوكردنى ماوەى پەیمان بۆ ئەوانەى كە پەیمانەكەیان ماوەى بۆ دیاریى كرابوو، پەیمانەكەشیان نەشكاندبوو، ئینجا ئەمانە هەموویان موسڵمان بوون پێش تەواو بوونى ماوە پەیمانەكەیان، ئەوانەى كە موسڵمان نەبوون و ڕازى بوون كەلەخاكى ئیسلامدا بن و بەر حوكمى ئیسلام بن كەبەوانە ئەگوترێ (اهل الذمة) دەربارەى ئەمانە لێیان گەڕاو سەرانەى لەسەر دانان لەباتى هەڵسانى ئیسلام بە پارێزگارى مافیان و بەرگریكردن لێیان، تا نیشانەى بەر حوكمیشیان بێت، كەواتە لەپاش هاتنە خوارەوەى سوورەتى (براءة) بێبڕواكان بوون بەسێ بەش: جەنگ كەر، خاوەن پەیمان، ئەهلى زیممە، ئینجا پەیمان دراو ئاشتى خوازەكانى موسڵمان بوون، كەواتە دوو بەش مایەوە: جەنگ كەرو ئەهلى زیممە كەواتە هەموو دانیشتوانى زەوى بوون بەسێ بەش: موسڵمان، ئاشتى خواز كەبەبێ بیم و ترس ئەژیان، جەنگ كەر كەبە مەترسى و بیمەوە ئەژیان، ڕەوشتى لەگەڵ ناپاكەكاندا كەلە

دڵەوە بڕوایان نەبوو، بەڕووکەشی خۆیان بە موسڵمان نیشان ئەدا، ڕەوشت و کردەوەی لەگەڵ ئەمانەدا ئەمە بوو بەڕوواڵەت و ڕووکەشەکەی لێ وەرئەگرتن و نیازو نیەتەکانی حەواڵەی خوا ئەکردن، تێکۆشانی لەگەڵ ئەکردن بە قسەو بەڕابەرو بەڵگە، فەرمانی پێدرا کە چاوپۆشی بکات لێیان و پشتیان تێبکات، بەرگری کرا لەوەی نوێژ بکات لەسەر مردووەکانیان و ڕاوەستێ بەدیاری گۆڕەکانیانەوە، هەواڵی پێدرا ئەگەر داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکات لە خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت، ئەوەبوو ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی دوژمنەکانی لەبێبڕواو لە ناپاکەکان. لەم باسە پاڵفتەی کە ئەو زانا بەرزە خستییە بەرچاو کە قۆناغەکانی جهادی بۆ ڕوون کردنەوەی لە ئیسلامدا، لەو باسە پوختەوە چەند نیشانەو دروشمێکمان بۆ دەرکەوت لەبەرنامەی بزوتنەوەی ئەم ئایینەدا، کە شایانە بۆ ئەوەی کە بەدرێژی بوەستین لەبەردەمیداو بیری لێبکەینەوە، بەڵام لەم شوێنەدا دەست نیشان ئەکەین بۆ چوار نیشانەی گرنگ:

١- ئەم ئایینە شتێکی خەیاڵی نیەو بەگاڵتە کاروباری خۆی نەگرتووە، بەڵکو بزوتنەوەیەکە کە بەرەنگاری هەموو حاڵی ئادەمی وەستاوەو ئەیەوێ لە نەفامی و نەزانیەوە وەری گێڕێ بۆ هەق و ڕاستی و زانین، بەرەنگاری ئەوەستێ بە بانگکردن و باس و ڕێنموونی بۆ ڕاستکردنەوە ڕێک و پێک کردنی بیرو باوەڕو بۆچوونەکانی، بەرەنگاری ئەوەستێ بە هێزو بەچەک و بەتێکۆشان بۆ لابردن و گۆڕینی ئەو ڕژێم و حوکمڕانیانەی کە بەرپا و ڕاگیرن لەسەر ئەو بیروباوەڕو بۆچوونە ناڕاستانەی کە دەستکردی ئادەمین و لەڕێگە ڕاستەکەی خوا لایداون، کەواتە ئەم ئایینە ئەیەوێ مەردوم دەربێنێ لەبەندەیی و پەرستنی بەندە بۆ بەندەیی و پەرستنی خوا بەتەنها.

٢- ئەم ئایینە بزوتنەوەیەکە کە خاوەنی چەند قۆناغێکە بەڕیزو هەر قۆناغێکی کات و ڕادەو پلەی خۆی هەیە لەپاش تەواو بوونی ئەچێت بۆ قۆناغی پاش خۆی، هەر قۆناغێ هۆو ڕێگەو وەسیلەی تایبەتی خۆی هەیەو بەپێی ئەوانە ئایەت و حەدیسەکان هاتوون، کەواتە هێندێ لەو ئایەت و حەدیسانە کاتێ و دەست نادەن بۆ کات و بارێکی تر، کەواتە ئەو کەسانەی کەئایەت و حەدیسەکان ئەهێنن بە بەڵگەو ڕابەر لەسەر بەرنامەی جیهاد، بەبێ تێبینی ئەم نیشانەی دووەمە، ئەو کەسانە سەر ئەشێوێنن و تێکەڵ و پێکەڵیەکی ناڕاست بەکارئەهێنن، بەرنامەی ئەم ئایینە بە شێوەو وێنەیەک نیشان ئەدەن کە مەردوم دوور ئەخاتەوە لەبارە ڕاستەقینەکەی، جا لەبەرئەوە

خۆیشیان دائەمێنن لەئاستی دوژمنانی ئیسلام لەبارەی جیهادەوە، ئەیانەوێ بە هەرجۆر بووە خۆیان ڕزگار بکەن بەمەی کەئەلێن: جیهاد لە ئیسلامدا هەر لەبەر بەرگریە لە ئیسلام‌و موسڵمانان تا دەست درێژییان بۆ نەکرێ! وا ئەزانن کە خزمەتێکی گەورەیان کردووە بۆ ئیسلام، بەڵام لە ڕاستیدا ئیسلامیان لاداوە لەبەرنامەو بارە ڕاستەقینەکەی، کە بریتییە لە نەهێشتن‌و لابردنی هەموو ستەم‌و ستەمکارێك لە هەموو وڵات‌و جیهاندا، گێڕانی هەموو ئادەمی بە بەندەی خواو ڕزگارکردن‌و دەرهێنانی لە بەندەیی بەندە! ئەوەش نەك بەزۆر پێهێنانیان لەسەر بڕواهێنان‌و گرتنە گەردنی بیروباوەڕی ئیسلام، ئیسلام هەرگیز ئەوە ناکات، بەڵکو لەپێشەوە ڕژێمە ڕامیاریەکان کەکاربەدەستن لەوڵاتاندا نایانهێڵێ‌و ڕژێمە ڕامیارییە بەڕاست‌و ڕەواکەی خۆی دائەمەزرێنێ‌و ئەچەسپێنێ ئینجا واز لە خەڵکی ئەهێنێ کە بە خواهیش‌و ئارەزوو کاری خۆیان بڕوا بێنن‌و موسڵمان بن یان ملکەچی خۆیان دەربڕن بەمەی سەرانە بدەن‌و دژایەتی‌و دوژمنایەتی دەرنەبڕن‌و ئاشکرای نەکەن.

٣- نیشانەی سێیەمی ئەم ئایینە ئەوەیە کەلە یەکەم جاریەوەو لە هەموو قۆناغەکانیدا لەسەر بنەڕەتێکی دیارکراو بووەو یەکەم مەبەست‌و ئامانجی بووە کە بریتیە لە بەندەیی خوا بە پاك‌و خاوێنی‌و دەرچوون لەهەر بەندەییەکی تر، ئینجا کارو پیشەی لە هەموو قۆناغەکانیدا هەر پێکهێنان‌و بەدی هێنانی ئەو تاقە مەبەست‌و ئامانجەیە، کەهەر قۆناغێك ڕێگەو ڕێبازو هۆی پێکهێنانی تایبەتی هەیە بۆ پێکهێنانی ئەو مەبەست‌و ئامانجە پیرۆزە.

٤- نیشانەی چوارەم بۆ ئەم ئایینە ئەمەیە یاسای پەیوەندی گەلی موسڵمان لەگەڵ هەموو گەلەکانی تردا لەسەر ئەم بناغەو بنەڕەتەیە: پێویستە لەسەر هەموو ئادەمی ملکەچ‌و گوێڕایەڵ بن بۆ خوا، یان ئاشتی خوازبن‌و بەرامبەر ئایینەکەی خوا نەوەستن‌و ڕێی لێنەگرن‌و وازبێنن لە خەڵکی کەبە سەربەستی خۆی ئەم ئایینە هەڵبژێرێ یان هەڵینەبژێرێ، هەرکەس بەرگری کرد یان جەنگی لەگەڵ کرد ئیسلام جەنگی لەگەڵ ئەکات تالەناوی ئەبات یان ملکەچی ئەکات!

هێندێ لە نووسەران کە بەناوی ئیسلامەوە ئەنووسن‌و لەڕاستیدا دڵسۆزیشن بۆ ئیسلام، بەڵام لەبەر نەشارەزایی لە حەقیقەتی ئیسلام لەبەرئەوەی دڵیان بەهێز نیە بەرگەی پڕوپاگەندەو فاك‌و فیکی دوژمنانی ئیسلام ناگرن، هێندێ لەو نووسەرانە کە لە بارەی

جیهادەوە ئەنووسن ئەڵێن و ئەیانەوێ جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا کورت هەڵبێنن لەیەك مەبەستدا کە ئەمڕۆ ناوئەبرێ بە (الحرب الدفاعیە) جەنگی بەرگری، واتە ئیسلام جەنگ ڕەوا نادات مەگەر کاتێ کە دوژمن پەلاماری خاك و وڵات و دانیشتوانی بدات، بۆی نیە هەرگیز لەخاك و وڵاتی خۆی تێپەڕ بکات و هەوڵ بدات بۆ ئازادکردنی خاك و وڵاتانی تر، بەڵگەشیان ئەمەیە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ زۆر پێهێنان نیە لەئاییندا، بەڵێ بەڕاستی ئەوە فێڵ و تەڵەکەیەکی گەورەبوو کە دوژمنی ئیسلام هێنایی و سەری پێتێکدا لە ناشارەزاکانی ڕۆڵەی ئیسلام و دووری خستەوە لە بەرنامەکەی ئیسلام کە جەنگ و جیهادی پێویست کردو گێڕای بە فەرزو بەشێکی کۆتایی نەهاتوو تاڕۆژی دوایی، ئەو هەموو ئایەت و حەدیسەی نارد بۆ بەهێزکردن و دامەزراندنی لە دڵ و دەروونی موسڵماندا، دوژمن هات بەو هەموو فێڵ و تەڵەکە شەیتانیە موسڵمانانی سارد کردەوەو کۆتایی پێهێنان و کورتی هەڵهێنان لەوڵاتەکانی خۆیاندا، ئینجا ئەوان هاتن پەلاماری ئەمانیانداو هەموو شتی ئەمانیان داگیرکرد تا کار بەو جۆرەی لێهات کە بینراو ئەبیستین، بەڵام نەیان زانی کە زاناو نووسەرە ڕاستەقینەکانی ئیسلام دێنە پێشەوەو هەموو فێڵ و تەڵەکەکانی ئەوان لەکار ئەخەن چ لەم بارەیەوەو چ لە هەموو بارەکانی ترەوە، هەموو تۆزو گەردو پەردەیەك لائەبەن و ڕووی ڕووناکی ئیسلام دەرئەخەن، بەڵێ قورئان ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ بەزۆر بیروباوەڕو عەقیدە ناچەسپێنێ لە دڵ و دەرووندا بیروباوەڕ بەزۆر وەرناگیرێ، بەڵام هۆی جیهادو مەبەست لە جەنگ و جیهاد ئەوە نیە کە بەزۆر خەڵکی موسڵمان بکرێ، بەڵکو هۆو مەبەستی گێڕانی بەرنامەو شەریعەتی خوایە بەحاکم و کاربەدەست لە وڵاتدا ئیتر با دانیشتوان موسڵمان نەبن و بڕوا نەهێنن بە ئیسلام، لە قورئاندا سێ شت کراوە بە هۆو مەبەست لە جەنگ و جیهاد:

١- بەرەنگار وەستان و بەرگری کردنی جەنگاوەرو دەست درێژی کەر.

٢- بەرگری کردنی لە چەوساوەو ستەم لێکراوو پێشێل کراو.

٣- ملکەچ کردنی ستەمکارو ملهوڕان بۆ شەریعەتی خواو گێڕانی خوا بەحاکم ئیتر لەپاش ئەوە خەڵکی سەربەستن لە بڕوا هێناندا.

بە کورتی ئیسلام جاڕدانێکی گشتییە بۆ ئازادکردنی ئادەمی لە هەموو جیهاندا، ئازادکردنی لە بەندەیی بەندەو گێڕانی تەنها بە بەندەی خواو جاڕدانی خوایەتی و پەرستن و پەروەردگارێتی تەنها بۆ خوا بەبێ هیچ هاوبەشێك، کەواتە ئیسلام شۆڕشێکی گشتی و

جیهانیە بەسەر هەموو حاکمێتی بەندەداو گێڕانەوەی هەمووان تەنها بۆ حاکمێتی خوا، پێکهێنان و بەدی هێنانی پادشایەتی خواو لابردن و نەهێشتنی پادشایەتی بەندەیانی خوا، ئەو جاڕدانەش نەك تەنها بەدەم و بیروباوەڕ بەڵکو بە کردەوەش لە شێوەی ڕژێمێکدا کە حوکمڕانی بکات بە شەریعەتی خواو مەردوم دەربێنێ لە بەندەیی بەندە بۆ بەندەیی خوا بەتاك و تەنیا و بێ‌هیچ هاوبەشێك، بێ‌گومان ئەوەش بەبێ شۆڕش و جەنگ و کوشتار نابێ و ناگونجێ، کۆتایی نایەت تا ملکەچ کردنی هەموو ئادەمی بەبڕواهێنان، یان بەئاشتی خوازی و وازهێنان لەسەرکێشی و بەربەرەکانێ. بەڵێ بێ‌گومان جەنگ و جیهاد شتێکی ناچاریە ماتوڵ ئیسلام هاتووە بۆ ئازادکردنی ئادەمی بەتایبەتی ئازادکردنی هەموو ئادەمی لە هەموو وڵات و لە هەموو جیهاندا، هەرچەند ئیسلام هەموو هۆی ئاشتی بەکارئەهێنێ و تا دەست بدات و بگونجێ بەرگری جەنگ و کوشتار ئەکات، بەڵام کاتێ کۆسپ و گرێ و ڕێگری بۆ پەیدابوو ناچارئەبێ بە هێزو بە چەك کۆسپ و ڕێگر لابات و نەیهێڵێ، بۆ وێنە: لەیەکەم جارەوە جەنگ و کوشتار قەدەغە بوو کە لەو کاتەدا بانگ کردن بۆ ئیسلام بە سەربەستی ئەکرا بە هۆی هێزی خزم و کەس و کارەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە بێ‌بڕواکانیشیان بەرگرییان لێئەکرد بە خزمایەتی، لەبەرئەوەو لەبەر چەند هۆیەکی تر جەنگ و کوشتار قەدەغە کرا، لە پاشان ڕەوا درا لە مەدینەدا دەربارەی ستەمکاران لە موسڵمانەکان، ئینجا پێویست و فەرز کرا دەربارەی ئەوانەی جەنگیان ئەکرد لەگەڵیان، ئینجا پێویست کرا دەربارەی هەموو بت پەرست و هاوبەش ڕەوادەران، ئینجا پێویست کرا جەنگ لەگەڵ نامەداران تا موسڵمان بوون یان سەرانە دان، بە کورتی هەرکەس حاڵی بووبێ لە ئیسلام و لە مەبەست و ئامانجەکانی ئیسلام هەرگیز گومانی نابێ لەوەدا کە جیهادو تێکۆشان لە ئیسلامدا شتێکی سەرەکییەو دواهاتنی نیە، بە ناچاری لەو جیهادو تێکۆشانەدا جەنگ و کوشتار بەرپا ئەبێ و فەرزە لەسەر موسڵمانان هەڵسن پێی، مەسەلەکە ئەوەندە ڕوون و ئاشکرا بووە لەم چەرخەدا هیچ پێویست نەماوە بە لێکۆڵینەوەیەکی زیاتر، هەر پیلان و فرو فێڵێك کە دوژمنانی ئیسلام بەکاریان هێنا بۆ بەرگریی پێویستی جیهادو جەنگ لە ئیسلامدا، هەموو ئەوانە لەم چەرخی تازەدا بە هیچ دەرچوون و هیچ نرخێکیان نەما، کەواتە با بێینە سەر باسی چۆنێتی ڕووداوی جەنگی بەدری گەورە کە ئەم سوورەتەی تێدا هاتە خوارەوە، بە کورتەیەك باسی بکەین پێش ئەوەی بچینە سەر ئایەتەکان، تا باشتر تێبگەین لە مەبەست و ئامانجی ئایەتەکان، لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوەدا چەند ڕیوایەتێك ئەهێنین کە

پەسەند کراوە بەلای زانایانەوە شتێکی ئاشکرایە کە موسڵمانانی کۆچ کەر لەپاش ئەو هەموو ئەشکەنجەو سزاو ئازارە دوورو درێژە، ناچار کران کە واز بێنن لە هەموو ماڵو سامانو هەرچی هەیان بوو وڵات بەجێ بهێڵن، بە سەڵتە زەلامیو ڕەشو ڕووتی بەشێکیان لە پێشەوە چوون بۆ حەبەشەو هەر لەوێ مانەوەو ئەوانی تریان چوون بۆ مەدینە بە هەژاریو بێنەوایی، جا لەو کاتەدا هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەبو سوفیان لە شامەوە گەڕاوە بە کاروانێکی گەورەی قوڕەیشەوە کە ماڵو سامانی زۆری پێیەو سی کەس یان چل کەسی لەگەڵە، ئینجا فەرمانیدا کە دەرچن بۆ ئەو کاروانە بەڵکو خوا بیخاتە دەستیان، ئینجا موسڵمانەکان زۆر بە گەرمی تێهەڵنەچوونو لایان وا نەبوو کە دووچاری جەنگ ئەبن، ئەوانەی کە دەرچوون (٣١٧)کەس بوون، (٦١)کەس لە ئەوس، (١٧)کەس لە خەزرەج، (٨٦)کەس لە کۆچکەران، ئەمان لێرەوە بەو جۆرەیانکرد، ئەبو سوفیانیش کە نزیکی خاکی حیجاز بوویەوە کەوتە چمو چارو هەواڵ پرسین، هەتا ئەو هەواڵەی وەرگرت، بە هۆی ئەوەوە مەترسی کردو (ضەمضەی کوڕی عەمری غیفاری) گرت بە کرێ و ناردی بۆ مەککە تا ئەو هەواڵە بدات بە قوڕەیشو فریا کەونو بێن بە دەم ئەو کاروانەوە، ئەویش بە گورجی ڕێکەوتو هاوارێکی وای لێکردن خۆیان پێ نەگیراو لەماوەی سێ ڕۆژ یان دوو ڕۆژدا خۆیان ڕێکخست بە چەكو دەسەڵاتو خۆراكو زەخیرەیەکی چاکەوە بەڕێ کەوتن، لەم لایشەوە ئەبو سوفیان مەترسیکردو کاروانەکەی بەرەو قەراغی دەریای سوور بردو دوور کەوتەوە لە ڕێگەی مەدینەو بە چەسپانی بەرەو مەککە ڕۆیشتو قوتار بووو مەترسی ڕێگرتنی نەما، لەوێدا قەیسی کوڕی ئیمرولقەیسی نارد بۆ ناو لەشکرەکە، ئەو هەواڵەیان پێبدات تا بگەڕێنەوەو غەمیان نەبێ لە کاروانەکە، ئەوانیش بە گوێیان نەکردو نەگەڕانەوەو ئەبو جەهل گوتی: سوێند بە خوا ناگەڕێینەوە هەتا نەچینە بەدر و نەمێنینەوە، ئەبێ لەوێ نانو خۆراكو ئارەق بخۆینو ئافرەتە گۆرانی بێژەکان گۆرانیو مۆسیقامان بۆ لێبدەن، ئینجا هەتا هەتایە با عەرەب لێمان بترسێ، ئینجا کە ئەو هەواڵە گەیشت بە ئەبوسوفیان گوتی: ئای هاوار بۆ گەلەکەمان کە تیا ئەچن! ئەوە کاری عەمری کوڕی هیشامە ـ واتە ئەبو جەهل ـ پێی ناخۆش بوو بگەڕێتەوە، چونکە سەرۆکی گەلەکە بوو خۆی لێگۆڕاو خۆ لێگۆڕانیش شتێکی بەدو خراپە، ئەگەر محمد بگات بەو لەشکرە زەبوونو ژێردەستمان ئەکات، خوا کارەکەی ڕێك خست ئەوانە ئەوانە نەگەڕانەوە بەرەو کانی بەدر ڕۆیشتن، لەم لایشەوە پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو کانی بەدر هاتو نزیك کەوتەوە لەوێدا هەواڵی هاتنی قوڕەیشی پێدرا،

به هۆی ئەوەوە دەستیکرد بە ڕاوێژ تا بزانێ ڕایان چیە؟ لەوێدا حەزرەتی ئەبو بەکر هەستا بەجوانی گوێڕایەڵی و ئامادەیی دەربڕی، ئینجا حەزرەتی عومەر هەستا و ئەویش ڕای دەربڕی بۆ فەرمانبەری و گوێڕایەڵی، ئینجا مقدادی کوڕی عومەر هەستا و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بڕۆ بەدەم فەرمانی خواوە، ئێمە لەگەڵتین، سوێند بەخوا پێت ناڵێین: ـ وەك ئیسرائیلیەکان گوتیان بە موسا ـ بڕۆ خۆت و پەروەردگارت جەنگ بکە ئێمە لێرەدا دائەنیشین، ئێمە ئەڵێین: فەرموو تۆو خوا جەنگ بکەن، بێگومان ئێمە لەگەڵتانین و جەنگ کەرین لەگەڵ دوژمن، سوێند بە کەسێك کە تۆی بەڕاستی ڕەوانەکردووە ئەگەر بمانبەی بۆ (برك الغماد) کە شوێنێکە لەو پەڕی یەمەنەوە، لەگەڵتین. پێغەمبەریش وەڵامی بەشیرینی دایەوەو نزای خێری بۆ کرد، لەپاش ئەو قسانە پێغەمبەر (ﷺ) هەر فەرمووی: پێم بڵێن ڕاتان چیە؟ مەبەستی هاوەڵە مەدینەییەکان بوو، چونکە کاتی خۆی لەپەیمانی (عقبة)دا بەڵێنیان نەدابوو کە بەرگری بکەن و یارمەتی بدەن لەدەرەوەی مەدینە، ئەم جەنگەش لەدەرەوەی مەدینەدایە، ئینجا لەوێدا سەعدی کوڕی مەعاز –خوا لێی ڕازی بێ– هەستا و گوتی: من لەباتی مەدینەییەکان وەڵام ئەدەمەوە، وا دەرئەکەوێ ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت ئێمەیە! ئەویش فەرمووی: بەڵێ، سەعد عەرزی کرد: وا دەرئەکەوێ تۆ لە مەدینە بۆ کارێ دەرچوویت و فەرمانت پێدراوە بەکارێکی تر لەلایەن خواوە، واتە بەنیازی کاروان هاتی و ئێستا جەنگ و لەشکر پەیدابوو، بێگومان بڕوامان پێهێناوی، بەڕاستمان زانیوی، شایەتیمان داوەبە ڕاستی ئەوەی کە پێی هاتووی، عەهدو پەیمانمان پێداوی لەسەر بیستن و گەوێڕایەڵی، کەواتە فەرموو لەسەر نیازی خۆت بڕۆ، سوێند بەکەسێ کە تۆی بەڕاستی ڕەوانەکردووە ئەگەر بچیتە ناو ئەو دەریایە، ـ واتە دەریای سور کە نزیکی بوون ـ ئێمەش لەگەڵت تێی ئەچین تا یەکێ لەئێمە مابێت، کێ ئەگریتە خۆت بیگرە، کێ دەرئەکەیت دەریبکە، لەماڵ و سامانمان چی ئەبەیت بیبە، ئەوەی کەبیبەی خۆشەیست ترە لامان لەوەی بۆمان بەجێئەهێڵی، سوێند بەکەسێ کە گیانی منی بەدەستە هەرگیز بەم ڕێگەدا نەهاتووم و هیچ ئاشنا نیم پێی، پێمان ناخۆش نیە کە سبەینێ تێ جەنگین لەگەڵ دوژمناندا، ئێمە خۆگرین لە جەنگدا، ڕاستین لە کاتی گەیشتن بە دوژمن، ئومێدو وایە کە خوا لەلایەن ئێمەوە شتێکت نیشان بدات کە چاوەکانتی پێ ڕوون و ڕووناك بێت و دڵخۆش بیت پێی، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەمەشی گوت: بێگومان ئێمە چەند کەسێکمان لەگەڵەکەمان بەجێهێشتووە لە مەدینە خۆش ویستنی ئێمە بۆ تۆ بەهێزتر نیە لە خۆش ویستنی ئەوان

بۆت، ئێمە گوێڕایەڵ تر نین لەوان، ئەوان کە نەهاتوون گومانیان وا بردووە کە بۆ سەر کاروان ئەچن و مەترسی یەك نیە، ئێمە شوێن و جێگایەکی مەحکەمت بۆ دروست ئەکەین کە تێیدا بیت و پاسەوان دائەنێین بەدەورتدا، ولاغی سواریت بۆ ئامادە ئەکەین، ئینجا پەلاماری دوژمن ئەدەین و ئەکەوینە جەنگ لەگەڵیان، ئینجا ئەکە خوا زاڵی کردین، ئەوە شتێکە ئەمانەوێ و پێمان خۆشە، ئەگەر ئەو بارەکەی تر بوو ئەوا تۆ بەرسواری ئەگەڕێیتەوە بۆ ناو ئەوانەی کە بەجێماون. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە بەخێرو خۆشی و فەرمووی: یا خوا بڕیاری چاکتر لەوە ئەدا ئەی سەعد. ئینجا کە سەعد لە قسەو ڕاوێژەکە بوویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڕۆن بەیارمەتی خوا لەسەر فەڕو بەرەکەتی خوا، خوا بەڵێنی پێداوم بەیەکێ لەو دوو شتە: کاروانەکە، یان قورەیش و لەشکرەکە، سوێند بە خوا وەك ئێستا بەچاوەبەو سەرنجی تیاچوون و کوژرانی ئەوانە ئەدەم، لەوەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەکەونە جەنگ و کاروانەکە قوتار بووە، ئومێدی زاڵبوون و سەرکەوتنیان پەیداکرد.
لەشکرەکەی دابەشکردو دوو بەیداخی ڕەشی بڕیاردا یەکێکیان لەگەڵ حەزرەتی عەلی و ئەویتر لەگەڵ سەعدی کوڕی مەعاز –خوا لێیان ڕازی بێ– لەشەوی جومعەو حەڤدەی ڕەمەزان پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە نزیکی بەدرو پرس و ڕاوێژیکرد کە لەکوێدا بخەن و نیشتەجێبن، حوبابی کوڕی مونزیر گوتی: بمانبە تا نزیکترین لەوانەوە، من شارەزام پێی و بە بیرە کۆنەکانی بەدر، لەوێدا لە نزیکی بیرێکی کۆن هەیە ئاوەکەی شیرینەو زۆرە، لەوێدا حەزێك دروست ئەکەین لەسەری، بیرە کۆنەکانی تر کوێر ئەکەینەوەو ئێمە ئەو کاتە ئاو ئەخۆینەوەو جەنگ ئەکەین و ئەوان بێئاون، لە ڕیوایەتێکدا ئەفەرموێ: حوباب گوتی کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ـ لەو شوێنەدا خستبووی کە حوباب دەست نیشانی بۆکرد ـ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم شوێنە کە تۆی تیایت ئایا خوا فەرمانی پێداوە، کەواتە ئێمە بۆمان نیە لێی لادەین؟ یان ئەمەڕای خۆتەو ڕێگە هەیە قسەی تێدا بکرێ؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر خوا فەرمانی نەداوە، بەڵکو ڕێگەی قسەو ڕاوێژەیە تێیدا، ئینجا حوبابیش دەست نیشانی کرد بۆ ئەو شوێنەی کە خۆی هەڵیبژاردو باسمانکرد، پێغەمبەر (ﷺ) بەو جۆرەی کرد کە حوباب دەست نیشانی بۆکردو لەشەوی حەڤدەدا باران تییکردو ئەو شەوە زەویەکەی پاك و خاوێن کردو لم و چڵکەکەی نەهێشت و محکەم بوو بۆ گەڕان و ڕۆیشتن تێیداو ڕێك و پێك تر بوو ئەو تەرەفەکەی تر کە قورەیشی تێدا بوو بارانی لێ نەباری بە جۆرێ لای ئەمان باری، بەڵکو جێ و شوێنەکەیان ناڕەحەت تر بوو بۆ گەڕان و هات و چۆ، کەواتە ئەو بارانە بوو

بەخێرو بەرەکەت بۆ موسڵمانەکان و شەڕو نەگبەتی بۆ ئەوان، لەو شەوەدا موسڵمانەکان وەنەزو خەو نوچکەیەك گرتنی و خەوتن، بەجۆرێ هێنی وایان بوو بەخۆی نەئەزانی ئەکەوت بەلادا، بەوە ئارامی کەوتە دڵیان، پێغەمبەر (ﷺ) عماری کوڕی یاسرو ئیبن و مەسعودی نارد گەڕان و چەرخەیەکیان کرد بەدەوری لەشکری قورەیشدا، گەڕانەوەو هەواڵیاندا کە ترس و بیمیان لەدڵ دایە، پاشان شوێن و جێگەی پێغەمبەر (ﷺ) دروستکرا لە لق و پەلی دارخورما و سەعدی کوڕی مەعاز بە شمشێرەکەی لەقاپییەکەدا وەستا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) گەڕاو سەریدا لەو شوێنەی کە جەنگەکەی تێدا ئەبێ و شوێنی کوشتن و کەوتنی سەرۆکەکانی قورەیشی نیشانی هاوەڵەکانیدا یەك بەیەك ئەیفەرموو: ئەوە شوێنی کوشتن و کەوتنی فلانە، هیچ کام لەوانە نەترازا لەوەی کە دیاریکردووو دەست نیشانی بۆ کرد، ئینجا ڕیزی هاوەڵەکانی ڕێك خست و خۆی گەڕایەوە بۆ جێگاکاکەی خۆی. ئینجا قورەیش کاتێ ڕۆژ بوویەوە بەرەو شیوەکە هاتن، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دیتنی نزای کردە لای خواو فەرمووی: ئەی خوایە ئەمە قورەیشە ئەوا هات بە خۆ بەزل زانی و کەشخەو شانازیەوە بەرامبەر تۆ وەستاوەو پێغەمبەرەکەت بەدرۆزن و ناڕاست دائەنێن، ئەی خوایە داوای کۆمەکی و سەرکەوتنت لێئەکەم کە بەڵێنت پێدام، خوایە قڵپیان کەرەوە، لەدوورەوە عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی بینی بە سورای حوشترێکی سوورەوە فەرمووی: ئەگەر لەوانەدا خێربێ لای ئەمەیانە، ئەگەر لە گوێی بکەن ڕێی ڕاست ئەدەنە بەرو دووچار نابن، ئینجا کاتێ کە قورەیش دامەزران چەند کەسێکیان هاتن بەرەو حەوزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکیان حکیمی کوڕی حزام بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لێیان گەڕێن با ئاو بخۆنەوە، ئینجا هەرکام لەوانە کە لەو ئاوەیان خوارد ئەو ڕۆژە کوژران بێجگە لە حکیم لە پاشدا موسڵمان بوو، جا پاش ئەوە هەر کاتێ بیویستایە سوێندی گەورە بخوات ئەیگوت: سوێند بە کەسێك کەمنی ڕزگار کرد لە ڕۆژی بەدردا، ئینجا حەکیم گەڕا بەناو لەشکرەکەی قورەیشدا بۆ پەشیمان کردنەوەیان لە جەنگ کردن، لە پێشەوە چوو بۆ لای عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو پێی گوت: بێگومان تۆ گەورەی قورەیش و ئاغای بە گوێ کراویانیت، ئایا ئەتەوێ تا دنیا دنیایە بەخێرو چاکە ناو ببرێی لەناوخەڵکدا؟ ئەویش گوتی: چۆن ئەی حەکیم؟ ئەمیش گوتی: ئەم خەڵکە بگێڕەوەو مەسەلەی براکەی عەمری حەزرەمی کە موسڵمانەکان کوشتیان بگرە گەردن، بەم ڕەنگە خوێنەکەی بدە، ئەویش گوتی: ئەوا ئەوەم کرد، ئەو سوێند خواری خۆمە خوێنەکەی و هەر زیانێکی ماڵی بووبێ لەسەر من، کەواتە بڕۆ بۆلای ئەبو حەزەلە، واتە ئەبو

جەهل، من هەر مەترسیسم لەو هەیە کەکارەکە تێك بدات، ئینجا عوتبە هەستا و وتاریدا: ئەی کۆمەڵی قورەیش، سوێند بە خوا ئێوە جەنگ بکەن لەگەڵ محمدو هاوەڵەکانی هیچ شتێك بە دەست ناهێنن، سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە ئەوان لەناو بەرن ئەوا کەس و کاری خۆتان ئەکوژن و هەمیشە گرژ ئەبن لە یەکترو ناکۆکیتان ئەبێ، چونکە هەرکام لە ئێوە ئامۆزای یان خاڵۆزایەکی لە خزمی کوژراوە، کەواتە بگەڕێنەوەو لێیان گەڕێن لەگەڵ عەرەبەکانی تر با تێ جەنگن، ئەگەر ئەوان لەناویان بردن ئەوا خۆشی لە خۆتان و ئەوەی پێتان خۆشە ڕوونەدات، ئەگەر بە جۆرێکی تربوو ئەوا ئێوە تووشی هیچ شتێك نابن لێیەوە. حەکیم ئەڵێ: ئینجا چووم بۆلای ئەبو جەهل کە ئەبینم زرێ و تاس کڵاوەکەی دەرهێناوەو خەریکە ئامادەی ئەکات، منیش پێم گوت: عوتبە منی ناردووە بۆلای تۆو سفارشی پێکردووم بەو مەبەستەی کە گوتمان، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا ناگەڕێنەوە هەتا خوا بڕیاری خۆی ئەدا لەنێوان ئێمەو محمددا، عوتبە مەبەستی هەر ئەوەیە ئەزانێ محمدو هاوەڵەکانی تیا ئەچن و کوڕەکەشی لەناو ئەوان دایە، لەبەرئەوە ئەیانترسێنێ! ئینجا سفارشی کردەلای عامری کوڕی حەزرەمی بەمەی کە سوێند خوارەکەت ئەیەوێ خەڵکەکە بگێڕێتەوە، تۆش بەچاوی خۆت هەقی خوێنەکەی خۆتت بینی، کەواتە هەستە هەقەکەی خۆت بسێنە، واتە هەقی براکەی کەلەوەوپێش کوژران بەدەستی موسڵمانەکان! ئینجا ئەویش هەستا خۆی دەرخست ئینجا چووە سەر قولەو هاواریکرد: وا عمراه! بەهۆی ئەوەوە جەنگە داگیرسا و کارەکە بەتین بوو بڕیاری جەنگیاندا، بەو جۆرە ئەو ڕای کە عوتبە هاواریکردو بانگی ئەوانەی بۆ کرد ئەبو جەهل تێکیدا ئینجا کاتێ ئەو قسەو باسی ئەبو جەهلە گەیشتە عوتبەو گوتی عوتبە لە ترسا سی ئاوساوە، گوتی: بێگومان ئەو نێرەمووکە ئەزانێ و ئەبینێ سی ئاوساوە لەترسا. (ئیبن و ئیسحاق) ئەڵێ: ئەسوەدی مەخزومی کە پیاوێکی بێباوەڕەکانی حەیای بەد خو بوو پەلاماریدا: پەیمان ئەدەم بە خوا ئەبێ لەحەوزەکەیان ئاو بخۆنەوە یا ئەیروخێنم، یان ئەبێ بمرم لە پێناویدا، ئینجا کاتێ هات بۆئەوە حەزرەتی حەمزە بۆی دەرچوو –خوا لێی ڕازی بێ– ئینجا کە گەیشتن بەیەك حەمزە شیرێکیدابەقاچیداو لەنیوەی ساقیدا پەڕاندی پێش ئەوەی بگاتە حەوزەکە بەهۆی ئەوەوە کەوت بە پشتداو خوێنی قاچەکەی فوارەی ئەکرد بەرەو هاوەڵەکانی، ئینجا بە گاگۆڵکێ بەرەو حەوزەکە ڕۆیشت و خۆی پێگەیاند ئەیویست سوێندەکەی نەکەوێ، ئینجا حەمزە لێیداو کوشتی لەناو حەوزەکەدا، ئینجا دوای ئەوە عوتبەو شەیبەی برای و وەلیدی کوڕی

عوتبە هاتنە مەیدان و داوایانکرد کە موسڵمانەکان بچنە مەیدان، ئینجا سێ کەس لە موسڵمانانی مەدینەیی چوونە مەیدان، ئەویش گوتی: ئێوە کێن؟ ئەوانیش گوتیان: ئێمە مەدینەیین، ئەمانەیش گوتیان ئێمە هیچ مەبەست و پێویستی یەکمان بە ئێوە نیە، عوتبە گوتی: ئێوە هاوسەرێکی بەڕێزن، ئێمە مەبەستمان گەلەکەی خۆمانە، ئینجا جارچیەکیان جاڕی داو گوتی ئەی محمد لەگەلەکەی خۆمان هاوسەرمان بۆ دەربکە، ئینجا ئەویش فەرمووی: عوبەیدە هەڵسە، حەمزە هەڵسە، عەلی هەڵسە، ئینجا ئەمانیش هەڵسان و کاتێ نزیکی کەوتنەوە، گوتیان ئێوە کێن؟ هەرکام لەو سیانە ناوی خۆیان بردو خۆیان ناساند! ئینجا ئەوانیش گوتیان: بەڵێ ئەمانە هاوسەری بەڕێزن. ئینجا عوبەیدە کە بەتەمەن تر بوو چووە مەیدانی عوتبە، حەمزە چوو بۆ شەیبەو علی چوو بۆ وەلید، حەمزە شەیبەی کوشت و ماوەی نەدا، علی وەلیدی کوشت و ماوەی نەدا، عوبەیدەو عوتبە هەرکام دای لەویترو یەکی خست، ئینجا حەمزەو علی هەڵمەتیان دایە سەر عوتبەو لەگیانیانکردو عوبەیدەیان هەڵگرت و بردیانەوە بۆ ناو موسڵمانەکان، ئینجا بە جارێ هەموو پەلاماریاندا، نزیک کەوتنەوە لە یەکتر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدابوو کە ئەمانە پەلامار نەدەن هەتا ئەمریان پێنەکات، فەرمووی: ئەوانە نزیک کەوتنەوە تیر بارانیان بکەن و دووریان بخەنەوە لە خۆیان بەتیر، ئینجا ڕیزیدان و ڕیزەکانی ڕێك و پێککردن و گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، تەنها ئەبوبەکریش لەگەڵی چوو بۆ ناو شوێن و سەنگەرەکە، پێغەمبەر (ﷺ) دەستیکرد بەنزاو پاڕانەوە لە خوای خۆی و داوای ئەو یارمەتی و سەرکەوتنەی ئەکرد کە بەڵێنی دابو، لەو نزاو پاڕانەوەیەدا گوتی: ئەی خوایە ئەگەر ئەمڕۆ ئەم تاقمە تێدا بچن ئیتر تۆ ناپەرسترێیت، ئەبو بەکر ئەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا هێندێ لە نزاو پاڕانەوەکەت بەسە بێگومان خوا بەڵێنەکەت بۆ بەدی ئەهێنێ، (ئیبن و ئیسحاق) ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) وەنەوزێکی برد لە کاتێکدا کەلەشوێنەکەیدا بوو لەپاشان خەبەری بوویەوەو فەرمووی: ئەبو بەکر موژدەی یارمەتی و زاڵ کرنەکەی خوات بۆهات، ئەمە جوبرەئیلە جڵەوی ئەسپەکەی گرتووە بەدەستەوەو ڕای ئەکێشێ و تۆزو غوباری لێنیشتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) لەو ڕۆژەدا چوو بۆناو موسڵمانەکان و هانیدان لەسەر جەنگ و فیداکاری و فەرمووی: سوێند بە کەسێك کە گیانی منی بەدەستە هەرکەسێك ئەمڕۆ تێ جەنگێ ئینجا بکوژرێ بە جۆرێ خۆگربێ و بەنیازو تەمای پاداشتی خوا بێت و ڕوو بنێ و پشت هەڵنەکات، خوا ئەیخاتە بەهەشت، لەوێدا عومەری کوڕی حەمام گوتی لەکاتێکدا چەند دەنکە خورمایەك لەدەستیدا بوو

ئەیخواردن، گوتی، بەخ، بەخ و ئایا لەنێوان من و چوونە بەهەشتمدا هەر ئەمە هەیە کە ئەوانە من بکوژن؟ ئینجا دەنکە خورماکانی فڕێداو شمشێرەکەی گرت و دەستی کرد بەجەنگ تا شەهیدکرا، ڕەحمەتی خوای لێبێ، (ئیبن و ئیسحاق) ئەڵێ: لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر (ﷺ) چنگێ ڕێـزو خـۆڵی کـرد بـە ڕووی لەشـکرەکەی قوڕەیـشداو فـەرمووی: (شـاهت الوجـوه) دەم و چاوەکان ناشیرین و ڕیسوا بوون، واتـە یاخوا وابن. فەرمانیدا کەبە توندی پەلاماری بدەن بەهۆی ئەوەوە شکان و شکستی قوڕەیش ڕوویدا، بەم ڕەنگە لە سەرۆکەکانی کوژرا ئەوانەی کەکوژران، دەستگیر کرا ئەوەی کە دەستگیرکرا، سەعدی کوڕی مەعاز ئەو دەستگیر کردنەی پێناخۆش بوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووی: ئەی سەعد وەك پێت ناخۆشبێ کە ئەوانە دەستگیر ئەکرێن! ئەویش گوتی: بەڵێ، چونکە ئەمە یەکەمین ڕووداوی سەختە خوا هێنای بەسەر بت پەرستاندا، لەبەرئەوە پێم خۆشە زۆریان لێ بکوژرێ، نەك بهێڵرێنەوە، لەو ڕۆژەدا ئومەیەی کوڕی خەلەف کەکاتی خۆی لە مەککەدا سزای بیلالی ئەدا بەو جۆرە سزایە کە بـەناو بانگـە، ئـەو ئومەیـە دەسـت گـیر کـراو کەوتـە بەرچـاوی بـیلال و جـاڕی دا بـەناو موسڵماناناو گوتی: ئەمە سەری بێبڕوایی یە یا خوا من ڕزگار نەبم ئەگەر ئەو قوتاربێت، هەرچەند عبدالحمنی کوڕی عەوف کە دەستگیری کرد بوو هەوڵیداو بەرگری لێکردو هیچ سوودی نەبوو، موسڵمانان دەوریانداو کوشتیان. هـەروەها لـەو ڕۆژەدا (ئیبن و مسعود) ڕێـی کـەوت لەئەبو جەهل لـەدوا گیانـدا بـوو سـەری بڕی و سـەرەکەی بـردە بـەر دەست پێغەمبـەر (ﷺ) و عـەرزی کرد ئەمـە سـەری دوژمنکـەی خوایە، ئەویش فەرمووی: الحمد لله، سوپاس خوای کرد، لـەو ڕۆژەدا لـەپاش شـکانی قـوڕەیش و تـەواو بـوونی جەنگەکە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمانیـدا کـە ئـەو لاشـانە بخرێنـە ناوچـاڵی ئـەوبیرە کۆنـەی کـە لەوێـدا بـوو ئـەوانیش هەموویانیان خستە ناوی بێجگە لەو ئومەیەی کوڕی خەلەف کە ئاوسابوو لـەناو زرێ و تـاس کڵاوەکەیدا پڕ بە پڕو کاتێ ویستیان بیجوڵێنن و بیبەن لاشەکەی دائەڕزاو ئەوانیش هـەر لە شوێنەکەی خۆیدا بەخۆڵ و بەرد دایان شارد، ئینجا لـەپاش شاردنەوەی ئەو لاشانە لـەو چاڵ و بیرە کۆنەدا پێغەمبەر (ﷺ) بە لاسەریانەوە وەستاو فەرمووی: ئەی ئەوانەی کە خرانە نـاو ئـەو چاڵ و بـیرە ئایـا ئـوە بـەڵێن و هەڕەشـەی کـە خـوا کـردی لێتـان بەڕاسـت دەرچـوو و دەستتان کەوت، من ئەو بەڵێن و مزگێنییەی کە خوا پێیدام دەستم کـەوت بەڕاست و بەدی هـات، ئینجـا هاوەڵـەکان عـەرزیان کـرد: ئایـا تـۆ قسە لەگـەڵ مردووانـدا ئەکـەیت؟ ئـەویش فەرمووی: بێگومان زانییـان ئەوەی کە خوا بـەڵێنی پێدان ڕاست بوو. (عائشە) –خوا لێـی

ڕازی بێ- ئەفەرموێ: خەڵکی ئەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێگومان ئەوەی من پێم گوتن بیستتان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێگومان زانیان. (ئیبن و ئیسحاق) ئەفەرموێ: کاتێ فەرماندرا بە شاردنەوەی لەشی کوژراوەکانی قوڕەیش یەکێ لەوانە عوتبەی کوڕی ڕەبیعەبوو ڕاکێشراو برا بۆناو چاڵەکە، پێغەمبەر (ﷺ) سەرنجی ئەبو حوزەیفەیدا کە کوڕی عوتبەبوو، بەغەمبارو ڕەنگ تێك چووبینی. بەهۆی ئەوەوە پێی فەرمووی: ئەبو حوزەیفە ڕەنگە بەهۆی باوکتەوە دڵگران بووبی، ئەویش گوتی: نە واللە ئەی پێغەمبەری خوا گومانم نیە لەباوکمداو لە ڕۆیشتنی بە خراپی، بەڵام باوکم پیاوێکی ژیریی هونەرمەندبوو، بەهۆی ئەوەوە ئومێدەوار بووم خوا ڕێنموونی بکات و بیخاتە سەر ڕێی ئیسلام، ئینجا کە بینیم وا دەرنەچوو بەبێ بڕوایی مرد بەوە غەمبار بووم، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) نزای خێری بۆ کرد و قسەی خێری ئاڕاستە کرد. لەپاش لێبوونەوە لە جەنگ و کوشتار فەرمانیدا بە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی جەنگ و کۆکرانەوە، ئینجا دووبەرەکی پەیدابوو کە ئایا ئەودەستکەوتانە بەکێ بدرێن؟ ئەوانەی کە کۆیان کردەوە گوتیان: بۆ ئێمەیە و مافی ئێمەیە، ئەوانەی کە جەنگەکەیان کرد بوو گوتیان: مافی ئێمەیە، ئەوانەی کە پاسەوانی پێغەمبەر بوون گوتیان ئێوە لە ئێمە شایستەتر نین، ئێمە ئەو شتانەمان بینی و هیچ کەس بەرگری نەئەکرد و ئەمانتوانی وەری گرین بۆ خۆمان، بەڵام مەترسیمان کرد لەوەی دوژمن پەلاماری پێغەمبەر (ﷺ) بدا لەبەر ئەوە دەستمان لە هیچ نەداو خەریك بووین بە پاسەوانی خۆمان، (ئیبن و ئیسحاق) ئەڵێ: ئەگێڕێتەوە و ڕیوایەتێك ئەهێنێ لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە کە فەرمووی: ئێمە دووبەرەکیمان بوو لە بارەی ئەو دەستکەوتانەوە، بەد خو بووین لەوەدا، بەهۆی ئەوەوە خوا لەدەستی ئێمەی دەرهێناو حەواڵەی پێغەمبەر کرد (ﷺ) ئینجا ئەویش دابەشیکرد، بە یەکسان.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١﴾

---

ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە دەربارەی ئەم جەنگە کە هێندێ لە ڕووداوو بەسەرهاتەکانیمان خستە بەرچاو، ئینجا لەسەر ڕووناکی ئەو باس و هەواڵانە با دەست پێبکەین و ببینە ژێر سایەی ئایەتەکان خوا ئەفەرموێ: بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیار ئەکەن لێت لە بارەی دەستکەوتەکانەوە کەلەم جەنگەدا دەستکەوت بوون، پرسیار ئەکەن کە بۆ کێ ئەبێ و بە کێ ئەدرێن؟ ئەو دەستکەوتانە بە شێوەی مەبەست بن وەك زۆربە ئەفەرموون و چەند ڕیوایەتێکیش بەڵگەن لەسەر ئەوە، یان مەبەست هەر شتێکە کە بەبێ جەنگ لەلایەن بێبڕواکانەوە جوێ بووبێتەوە و دەرچووبێ بۆلای موسڵمانەکان وەك لە (ئیبن و عەباس)ەوە ڕیوایەتکراوە. یان مەبەست ئەو (یەك لەسەر پێنج)ە بێت کە خوا دایناوە و لە ئایەتی داهاتوودا باس ئەکرێ، وەك (مجاهد) ئەفەرموێ:. یان مەبەست زیادە بەش و بەخششێکە کە کاربەدەستی موسڵمانان ئەیدا بەهێندێ لە تێکۆشەران لەبەر هۆیەکی تایبەتی. یان مەبەست چەك و جل و بەرگی کوژراوەکانە وەك هێندێ تر ئەفەرموون کە یەتایبەتی ئەدرێن بە بکوژەکان. بۆ هەر کام لەم ڕایانەش حەدیس و ڕیوایەت هەیە کە بەڵگەو قوڵگیرین، لەسەر هەربارو بە هەر حاڵ خوای پەروەردگار فەرمانیدا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کەوەڵامێکیان بداتەوە و ئاوی دڵیان بدات و ئاژاوە و دووبەرەکی نەهێڵێ لەناویاندا، بەم ڕەنگە کاری ئەو پرسیارلێکراوەی لەدەستی پرسیارکەران دەرهێناوگێڕایەوەبۆلای خۆی و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فەرمووی: ﴿قُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر لەوەڵامیاندا بڵێ: ﴿ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ﴾ ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن و کاروباریان تایبەتییە بەوانەوە، کەواتە

پێغەمبەر (ﷺ) دابەشیان ئەکات بەوڕێ کە خوا فەرمان ئەدات بەبێ ئەوەی هیچ کەسێکی تر ڕاوبڕیاری ببێ ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ کەواتە خۆتان بپارێزن لەهەر کارو کردەوەیەك کە هۆی خەشم و تۆڵەی خوا بێت، بوەستن بەدیار کاروبڕیارو فەرمانی خواوەو وازبێنن لە نارێکی و ئاژاوەو دووبەرەکی ﴿وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ﴾ پەیوەستی و پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەن بەم ڕەنگە بەپێی فەرمانی ئیسلام ڕەفتاربکەن لەناو خۆتاندا، دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی و ئاژاوەو دووبەرەکی و بەپێی فەرمانی خوا ڕەفتاربکەن. ئینجا ئەو مەبەستە بەهێز تر ئەکات و دڵنیایی لەسەر ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ گوێڕایەڵی خواو فروستادەکەی بن، لە هەروەها فەرمان و جڵەوگیرییەك کە یەکێ لەو فەرمانانە لەم شوێنەدا بریتییە لە مەسەلەی ئەم دەستکەوتانەی ئەم جەنگی بەدرە. ئەو دڵانەی داچڵەکان کە ئاژاوەیان بوو لەسەر ئەو دەستکەوتانە بە فەرماندان بەخۆپارێزی لە خوا کە چاکترین جڵەو گیرو بەرگری کەرە بۆ مەردوم، بەهێزترین جڵەوگیرێك کە دڵ و دەروونی پێ ژێربارو گوێڕایەڵ بکرێ ئەو سام و بیم و شەرم و شکۆیە لە خوا کە کەوتە هەر دڵ و دەروونێکەوە زۆر بەسووك و ئاسانی گوێڕایەڵ ئەبێت و ناتوانێ سەکێشی بکات، خۆتان بپارێزن و پەیوەستی نێوان خۆتان چاك بکەن و گوێڕایەڵی خواو فروستادەکەی بن ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن، واتە پێویستە بۆ بڕوای ڕاستەقینە کەلە کردەوەدا دەرکەوێ. نەك بە قسەی ڕووت یان بەئاوات و خۆزگە وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (ليس الإيمان بالتمنيء لابالتحلي، ولكن هو ما وقر في القلب وصدقه العمل) بڕوا نە بەئاوات فەراهەم دێت، نەبەدیمەن و لاف لێدان، بەڵکو بڕوا ئەوەیە کەلە دڵدا دامەزراوبێت و کردەوەس بەڕاستی دەرکات، واتە لە کردەوەدا دەرکەوێ، جا لەبەرئەوە ئەم ڕستەیەی لە زۆر شوێندا دێت بە دوای یاساو بڕیارەکاندا تا ڕوونی بکاتەوە کە بڕوا قسەو وتەی ڕووت نیە، بڕوای ڕاستەقینە ئەبێت بەرو بەرهەمی ببێ و بەدی بێت لە ژیان و جیهاندا،

**وەك دەرئەكەوێ بەجوانی كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ﴾ بڕواداران ی ڕاستەقینە هەر ئەمەن كە ئەم سیفەتو نیشانانەیان تێدا بەدی بێت:**

**١- ﴿إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ كاتێ كەباسی خوا كراو ناوی برا دڵیان ئەترسێو دائەچڵەكێ، ئیتر ناوی ببرێ لەكاتی فەرمانو جڵەوگیرییدا، یان ناوی ببرێو بیر بخرێتەوە بۆ هاندان لەسەر كردنی چاكەیەك یان گەڕانەوە لە خراپەیەك، یان هەر جۆریكی تر كە خوا ناوبرا ئەو بڕوادارە ئەترسێو دڵی دائەچڵەكێ قرچەی دەروونی دێتو لەرزەی تێ ئەكەوێ لەبەر هەست كردنی بە گەورەیی خواو سامو هەیبەتی خوا لە دڵیدا كە باڵا دەستی نیەو هەموو شت هەر بەدەست ئەوەو بێباكە لەهەر كارێ كەبیەوێ بیكات، لە هەمان كات بەندە هیچی بەدەست نیەو لە هەموو بارێكەوە كەمو كوڕی هەیە، ئەو ترسو هەیبەتە شتێكی دەروونییە ڕوو ئەكاتە بەندەی هەر بەبیركردنەوە لە گەورەیی و بێباكی خوا چ جای بیركردنەوەی لەكەم كوڕیی و ناتەواویو گوناهو تاوانی، بەهۆی ئەوەوە گوێڕایەڵبۆ هەموو كارو فەرمانەكانی خوا، بوونی ئەوسام بیمو هەیبەتە لەدەروونی بڕواداردا دژی ئەو ئارامیو دامەزراوییە نیە كە پەیدا ئەبێ بۆ دەروونی بەندە بە هۆی باسو یادی خواوە، بەڵكو هەردوو بە جارێ كۆئەبنەوە لەدڵی بڕواداردا، چونكە سامو بیمو دڵە لەرزەكەی لەبەر هەست كردنییەتی بە گەورەیی و بێباكییەكەی خوا، ئارامیو دامەزراوییەكەی بەهۆی هەست كردنە بە بەزەییو میهرەبانییەكەی، بەڵكو ئەو سامو دڵەلەرزەو قرچەی دڵە لە پێشەوە ئەبێ ئینجا ئەو ئارامیو ئومێدە پەیدائەبێ، وەك لەدەستی قورئاندا ئەفەرموێ: ﴿تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾**

وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾

٢- ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ﴾ کاتێ ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا﴾ ئەو بڕوادارانە زیاد ئەکەن لەبارەی بڕواکەیانەوە، واتە بەهۆی ئەو ئایەتانەوە بڕواکەیان بەهێزترو زیاتر ئەبێت، چونکە هەرکام لەو ئایەتانە بەڵگەو ڕابەرێکی بەهێزن، بێگومان زۆری ڕابەرو بەڵگەش هۆی ئەو زیادە هێزەیە، ئینجا بابزانین بڕوا دەست ئەدات بۆ زیادو کەمو زیادیی وەك زۆر لەزانایان ئەفەرموون؟ یان دەست نادات وەك (ئیمامی حەنەفی)و کۆمەڵێك لەزانایانی کەلامو ئەفەرموون. ئەو مەسەلەیە یەکێ بوو لەوانەی کە دووبەرەیێك تێدا پەیدا بوو لەناو ئەم ئوممەتەدا، بەهۆی زیادە لێکۆڵینەوەو وردەکارییەکی زۆر کە بەکارهێنراو هیچ پێویستیش نەبوو، بەڵکو زیانی زۆریشیان لێپەیدابوو، کەواتە با ئێمە ئەوە نەهێنینەوە کایەو خۆمان بەوەوە خەریك نەکەین بەتایبەتی کەلەم مەسەلەدا بەڵگەی زۆرو زەبەنە هەیە لە ئایەت لەحەدیس و لەبەڵگەی ژیریی لەسەر ڕای یەکەم، دڵی بڕوادار بە ویژدانی خۆی هەست ئەکات بەو زیادیو کەمیە لە دەروونی خۆیدا، هەست ئەکات بەوەی لە هێندێ کاتدا بڕواکەی بەشتێك بەهێزترە تا هێندێ کات بۆ هەمان شت، بەڵێ دڵی بڕوادار دەستی ئەکەوێ لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەوەی کە بڕواکەی پێزیادو بەهێزبێ، تا ئەگاتە ڕادەی ئارامی تەواو، ئەم قورئانە لەڕێوەو یەکسەر ئەدوێ لەگەڵ دڵی ئادەمیدا، هیچ ڕێگرو پەردەیەك نیە لە بەینیدا بێجگە لە تاریکی بێبڕوایی، کاتێ ئەو پەردە ڕەشە لابرا دڵ شیرینی ئەم قورئانە ئەچەژێ هەست ئەکات بەو هێزو زیادبوونە کاتێ کەئەو ئایەتانە دووبارەو چەند بارە کرانەوەو ئاڕاستەی ئەو دڵە کران، جا لەبەر ئەوە لە قورئاندا لە چەند شوێندا چاوی دڵ ئەکاتەوە سەرنجی ڕائەکێشێ بۆ بەڵگەو ڕابەرەکان کە بەدوای ئاڕاستە کردنیاندا ئەفەرموێ: (إن في ذلك لقوم يؤمنون)، (إن في ذلك لأيات للمؤمنين) وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە فەرموودەی یەکێ لە هاوەڵەکان -خوا لێیان ڕازی بێ-: (كنا نؤتي الإيمان قبل أن نؤتي القرآن) ئێمە بڕوامان پێ ئەبەخشرا پێش ئەوەی قورئانمان پێببەخشرێ. بە هۆی ئەوە بڕواوە هاوەڵەکان و شوێن کەوتووە ڕاستەقینەکانی ئەوان، ئەو بۆن و هەناسە خۆشەیان وەرئەگرت لەم قورئانە، ئەو تامو مەزە بێ وێنەیان ئەچەشت لێیەوە تا بوون بەئاوێنەیەکی بالآنما و نوینەرێکی

ڕاستەقینەی ئەم قورئانە، تا ئەو ڕادەی دەربارەی هەرکام ئەگوترا (قرآن يمشي في الأرض). قورئانێکە ئەگەڕێ لەزەویدا!

٣- ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ پشتیان هەر بە پەروەردگاری خۆیان ئەبەستن‌و کاروباری خۆیان هەر حەواڵەی ئەو ئەکەن، هیچ کەسێکی تر بە فریاد ڕەس دانانێن، یان وەك (ئیبن‌و کەسیر) ئەفەرموێ: لە تەفسیرەکەیدا: چاوەڕوانی هەر لەو ئەکەن، نیازی دڵیان هەر بۆ لای ئەوەو پەنا هەر بەئەو ئەبەن، داوای پێویستی هەر لەو ئەکەن، ئومێدو مەیلی دڵیان هەر بۆ لای ئەوە، ئەزانن هەرچی ئەو ویستبێتی هەر ئەوە ئەبێ، هەرچی نەیویستبێ هەرگیز نەبووەو نابێ، هەر ئەو خاوەنی هەموو کاروبارە لەم بوونەوەرەدا، هیچ تێك دەرو گۆڕەرێك نیە بۆ حوکم‌و بڕیاری ئەوو حیساب‌و پرسیاری ئەو چەسپانە، جا لەبەرئەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر فەرموویەتی: ئەم سیفەتە کەپێی ئەگوترێ: (توکل) کۆکەرەوەی ئیمان‌و بڕوایە. ئەم سیفەتی (توکل)ە بریتییە لەبڕوای پاك‌و خاوێن بەتاك‌و تەنیایی خوا. پەرستنی خوا بەپاك‌و خاوێنی‌و بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، کەواتە لە هیچ دڵێك‌و باوەڕ بەتاك‌و تەنیایی خوا کۆنابێتەوە لەگەڵ پشت بەستن بەهیچ کەسێکی تر، ئەو کەسانەی کەلەدەروونی خریاندا هەست ئەکەن بە پشت بەستنیان بە کەسێکی تریان بە هەر هۆیەکی تر ئەبێ لەیەکەمجارەوە بکۆڵنەوە لە بڕواکەیان کە ئایا بڕواکەیان بەخوا ڕاست‌و تێرو تەواوەو پاك‌و خاوێنە؟! یان نە ء با بزانرێ کە ئەو پشت بەستنە بەخوا دژو نە گونجاو نیە لەگەڵ گرتن بە بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە بەپێی باوو بڕیاری خوا لەم جیهانەدا خوا کردوونی بەهۆی فەراهەم هێنانی شتێکی تر، بۆ وێنە: بەپێی باوی خوا کشتوکاڵ پێویستی هەیە بەکێڵانی زەوی‌و چاندنی تۆو ئاودان‌و شتەکانی تر، دەی هەر کاتێ بەندە ئەو هۆیانەی بەکارهێنا بەو نیازەی کە هەموو شت هەر بە دەست خوایەو خوا دەسەڵاتی هەیە بەبێ ئەو هۆیانە شتەکە فەراهەم بێنێ، خوا خاوەنی شتەکەو هۆکانەو ئەو ئەم شتانەی گێڕاوە بە هۆی فەراهەم هاتن، هەرکاتێ بەندە دەست بگرێ بە هەر هۆیەك‌و بەکاری بێنێ بەو جۆرەی کەباسکرا، ئەو دەست پێوەگرتن‌و بەکارهێنانەش پەستن‌و گوێڕایەڵی‌یە بۆ خوا بە مەرجێ ئیزنی خوای لەسەر بێ‌و ئەوبەکار هێنانە قەدەغە نەبێ، بە کورتی بڕوادار ئەزانێ ئەو هۆیانەو بەهەرەو سەرەنجامەکانیان بەتێکڕایی هەر خوا فەراهەمیان ئەهێنێ‌و داهێنەریانە، خوا بە مەیل‌و لێزانی خۆی بەرهەمەکان

فەراهەم ئەهێنێ لەپاش بەکار هێنانی هۆکانیان، هیچ کەس و هیچ شت دەسەڵاتی نیە بەسەر فەراهەم هێنان و پێك هێنانەکەدا بێجگە لەخوا، هەرکات بەندە بەم هەست و بڕواوە پەلاماریداو کارو کردەوەی کرد، ئەو کاتە کارو کردەوە حەڵاڵەکانی سەرجەم ئەبێ بەخواپەرستی، ئەو کاتە ئازاد ئەبێ لە پەرستنی غەیری خواو دڵی پەیوەندی هەر خواوە ئەبێ، پەیوەندی بە هەر شتێکی ترەوە ببێ لەسەر ئەوەیە کە ئەو شتە پەوەندی بە خواوە هەیەو خوا گێڕاویەتی بە پەیوەندیدار. ئەم سیفەتە بەم جۆرەیەو پایەو پلەی ئەوەندە بەرزە، بۆیە خوا ئەوەندە بە گرنگ نیشانیداوە لە قورئانداو پێغەمبەرەکەیشی(ﷺ) بە گرنگ گرتی و خۆی پێ ڕازاندەوەو فەرمانیدا بە ئوممەتەکەی کەبە گرنگ بیگرن و دەستی پێوەبگرن، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات تێیدا. أمین. نەفامی تازە زۆر هەوڵ و تێکۆشانی کرد کە قەزاو خواو زانین و غەیبی خوا دوور بخاتەوە لەخەڵکی و هەموو شتێ پاڵ بدات بە شێکەوە کە ناوی ئەبەن (حتمية القوانين الطبيعية) و هەموو شتێ لەوە بناسێ و ئەوە بکات بە کارکەر! بەڕاستی ئەوەش ئەوپەڕی نەفامییەو هەرکەس بێبەش نەبێ لەژیریی پێکەنینی دێت بەقسەی ئاوا وەك وڕێنەی تاداره بەلایەوە، چونکە ئەو قسە بێ سەرشوێنەش هەر وەك ڕێکەوتەکە وایە کە ماوەیەك وڕێنەیان پێئەکردو پاشان لێی پەشمان بوونەوەو ئینجا ئەمەیان گرت بەدەستەوەو ئەیانەوێ خۆیشیان و خەڵکیش پێبخەڵەتێنن، ئایا نەفام کێ ئەو حەتمیەتەی پێدا؟! ئایا چۆن ئەم بوونەوەرە گرنگەو ڕووداوەکانی ئەکەیت بە بەرهەم و دەستکردی ئەو شتە خەیاڵییەی ئەم نەفامی تازە ماوەیەك لەسەر ئەو شتە پڕوپووچ و خەیاڵییە ڕۆیشتن تا لە دواییدا لە ڕێگای کەرەسەو ئەسباب و بەراوردەکانی خۆیانەوە بۆیان دەرکەوت کە هەڵەن و سەرلێشێواون، بە ناچاری و دەستەپاچەیی لە بەردەم قەزاو قەدەری خوادا کەوتن و بڕیارە حەتمیەکانیان بە ناڕاست دەرچوو، هەرکاتێ دڵ ڕزگاری بوو لە زەحمەت و زۆری ئەسباب و هۆ ئاشکراکان، ئەو کاتە پشت هەر بە خوا ئەبەستێ و سیفەتی (توکل)ی بۆ پەیدا ئەبێ، ئەو کاتە ئەزانێ هەر قەزاو قەدەری خوا لە ئارادا هەیەو هەموو شت و هەموو ڕووداوو بەسەرهاتێك هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێتەوە، ئەوەی کە کار ئەکات لە بوونەوەرەو هەموو یاساو ڕژێمەکانی و هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکانی تەنها دەستی قودرەتی خوایەو قەزاو قەدەری خوایە.

ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾

---

٤- ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ **بڕوادارەکان کە کەسانێکن کە بە ڕێك‌و ڕاستی نوێژ بەجێ ئەهێنن گەورەترین کردەوەیەك کە بڕوا دەروونیەکەی پێ دەرئەکەوێ‌و ببێتە نیشانە لەسەر ڕاستی ئەوەی کە لە دڵ‌و دەروندایە نوێژە تەنها وەستان‌و ڕکوع‌و سوژدەو خوێندن‌و دیمەنە ڕووتەکە نیە بەبێ هۆش‌و ئاگاداریی دڵ، بەڵکو ئەوانەیە لەگەڵ ئاگاداریی دڵ‌و هەستکردن بە ئاگاداریی خوا بەو جۆرەی کە لە حەدیسی سەحیحدا هاتووە: (أن تعبد الله كأنك تراه) خوا بە جۆرێ بپەرستی وەك بە چاو خوا ببینی، خوا بە میهرەبانی خۆی فێری ئەم جۆرە نوێژەمان بکات.**

٥- ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ **لەوەی پێمان داون‌و کردوومانە بەزۆریان بەخت ئەکەن‌و ئەیدەن بەڕێی خوادا، ئیتر بە زەکات یا خێرو بەخشینی تر، کەواتە ئەوەی کە ئەیدەن هێندێکە لەوەی خوا دروستیکردووەو پێی داون، ئەوەی کە ئەیدەن هێندێکە نەك هەمووی. کەواتە ئەبێ بەسۆزو شانازی‌و سوپاسەوە بیدەن!**

**ئەم پێنج سیفەتانە کە باسکران لەم ئایەتەدا خوا کردوونی بە نیشانەی بڕواو سنووری بڕوای پێ‌دیاریی کردوون لەم شوێنەدا کە بەمانە چارەسەری ئەو ئاژاوەو دووبەرەکی‌و بەین تێك چوونەی ئەو بڕوادارانەی پێئەکات، وەك لە چەند ئایەتێکی تردا سیفەتی تر ئەهێنێ کە پەیوەندی بە مەبەستی ترەوە هەیەو چارەسەرە بۆی، جا بەو پێیە لێرەدا ئەفەرموێ:** ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾ **ئەوانە کە خاوەنی ئەم سیفەتانەن کە باسکران، هەر ئەوانە بڕوادارانن بە ڕاستی‌و بڕواداری ڕاستەقینەن، کەواتە هەرکەس خاوەنی ئەو سیفەتانە نەبێ**

بڕواداری ڕاستەقینە نییە، ئینجا ئایا بەبڕوادار دائەنرێ یان نە ؟ بێگومان هەرکەس بێبەش بێت لەو پێنج سیفەتە بە بڕوادار دانانرێو هەر لافێکی بڕوا لێبدات لێی نابیسترێ، هەروەها هەرکەسیش خاوەنی هێندێك بێت لەوانە بەپێی ڕوواڵەتو ڕووکەشی ئایەتەکە، بەڵام لەسەر ڕای زۆربەو جەماوەر کە کردەوە دانانێن بەبەشو پارچەیەك لەبڕوا ئەو کەسە لەڕیزی بڕواداران دەرناچێ ماتوڵ بڕوا دەروونیەکەی بە بێگومان ببێو دامەزراو بێت، ئایەتو حەدیسی زۆریش قۆڵگیری ئەم ڕایەنو فراوانی بەزەیی و میهرەبانی خوایش داخوازە بۆ ئەم ڕایە، خوا خۆی باش ئەزانێ، ئەو بڕواداره ڕاستەقینانە چوار بەهرەیان بۆ باس ئەکات:

١- بەشایەتی خوا هەر ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن.

٢- ﴿لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ بۆ ئەوانە هەیە چەند ڕادەو پلەی بەرز لای پەروەردگاریان، ئەوەش بەپێی جیاوازیو ڕادەو پلەی بڕوا.

٣- ﴿وَمَغۡفِرَةٞ﴾ سڕینەوەو لێبووردنی تاوانو هەڵەکانیان.

٤- ﴿وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ زۆرییەکی پەسەندو بەڕێز تێکەڵ نییەو ئەوەش ڕۆزی بەهەشتە. خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات تیایدا.

ئینجا دێتە سەر باسی ئەو ڕووداوەی کە ئەو دەستکەوتانەی تێدا دەستکەوتو بوو بە هۆی ئەو دووبەرەکیو بەین تێك چوونە تا خوای میهرەبان چارەسەریکرد بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ واتە ئەوانە ڕازی بوون بەو بڕیارەی خوا هەرچەند قورسو گران بوو لەسەر دڵیان، بڕیاری دەستکەوتەکان بۆلای خواو پێغەمبەر(ﷺ) هەرچۆنێ پەروەردگارت تۆی لە ماڵەکەت دەرهێنا بە دەرهێنانێکی ڕاستو ڕەوا بەرەو بەدر بۆ جەنگ لەگەڵ قوڕەیش کە هەر ئەوە خێر بوو ﴿وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ﴾ لە کاتێکدا دەستەیەك لە بڕواداران بێزار بوونو ناخۆشحاڵ بوون لەوەو لە ڕاستیدا بڕیارەکەی خوا ڕاستو پڕ خێر بوو، بەڵام ڕازی بوون بەوەی خوا کردی، یان ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ خوایە کە بڕیاری ڕاستو ڕەوای تێدا ئەدات، بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) دابەشی بکات بە پێی بڕیارو فەرمانی خوا،

ئەگەر چی هێندێ لە بڕواداران ناخۆشحاڵ بوون لەوە لایان وابوو کە خۆیان شایستە ترن‌و مافی خۆیانە، ئەو بڕیاری خواو حاڵ‌و باری ئەو بڕوادارانە وەك بڕیاری خوا وایە کە تۆی لە ماڵەکەت هێنایە دەرەوە بۆ جەنگ لەگەڵ قورەیش لە کاتێکدا کە دەستەیەك ئەوەیان پێ‌ناخۆش بوو لەبەرئەوەی ئامادە نەبوون بۆ جەنگ یان لەبەر هەر هۆیەکی تریش، زانایانی تەفسیر بە سیازدە یان چواردە جۆر ئەو وێنەییەیان تەفسیر کردووەتەوە کە هێندێکیان دوورن‌و هێندێکیان نزیکن، هەرکام لەم دوو جۆرەی کە گوتمان لە دڵدا بەهێزترو دامەزراوترە.

لە پێشەوە باسمانکرد کە کاتی خۆی موسڵمانان بە نیازی کاروانەکەی قورەیش دەرچوون وەك هەنگوینێکی بێ‌باوەڕەکانی مێش بە ئاسانی دەستکەوت ئەبوو بەبێ جەنگ‌و کوشتار، بەڵام ئەوە بوو هەواڵەکە گەیشت بە کاروانەکەو ڕێگەیان گۆڕی‌و خۆیان قوتار کرد، گەیشت بە قورەیش‌و ئەوانیش بەجارێ لەشکریان کۆ کردووەو هاتن بۆ ڕزگار کردن‌و پارێزگاری کاروانەکەیان، ئینجا کەنزیکی بەدر کەوتنەوەو بۆیان دەرکەوت کاروانەکە قوتار بووە زۆریان نیازی گەڕانەوەیانکرد، بەڵام ئەبو جەهل سوێندی خوارد کە ناگەڕێتەوە تا نەچنە بەدرو چەند ڕۆژێك نەمێننەوەو هێندێ ڕانەبوێرن بە خواردن‌و ئارەق خواردنەوە، ئەوە لەو بارەوە، لەم بارەکەیشەوە دەرکەوت پێغەمبەر (ﷺ) دەستیکرد بە ڕاوێژ لەگەڵ هاوەڵەکانی، مەبەستیشی مەدینەییەکان بوو کە کاتی خۆی پەیمانیان نەدابوو بۆ یارمەتیدان لەدەرەوەی مەدینەدا، ئینجا ئەوەبوو سەعدی کوڕی مەعاز ئەو وتە شیرین‌و بەرزانەیدا لەلایەن مەدینەییەکانەوەو ئەو پەیمانە گەورەیەیدا لەپاش پەیمان دانی ئەبوبەکرو عمرو مقداد، بەڵام ئەو فەرموودەو پەیمانی ئەوانە بڕیارو قسەی هەموو ئەوانە نەبوو کەلە مەدینەوە دەرچوو بوون، بەڵکو دەستەیەك لەوان بێزارو ناخۆش حاڵ بوو لە جەنگ کردن لەگەڵ لەشکری قورەیش وەك ئایەتەکە گەیاندی،

﴿يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ﴾

---

**بێزاریو ناخۆش حاڵیەکان گەیشتە ئەو ڕادەی کە خوا فەرمووی بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ﴾ موجادەلەو دەمەقاڵی ئەکەن لەگەڵت لەو شتە هەقو ڕاستەدا کە ئایینی پێسەرئەکەوێ، کەئەوەش بریتییە لە جەنگو تێجەنگین لەگەڵ لەشکرەکەی قوڕەیشدا، موجادەلەو دەمەقاڵێ ئەکەن لەپاش ئەوەی ئەو شتە هەقو ڕاستەش دەرکەوت بۆیان، ئەوەش بەهەواڵدانو ڕاگەیاندنی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان کە سەرکەوتوو ئەبن، موجادەلەو دەمەقاڵێیان ئەکرد بەمەی کە ئێمە هەر بۆ کاروانەکە هاتووین، کاشکێ باسی جەنگو کوشتارت بکردایە تا خۆمان بۆ ئامادەبکردایە ﴿كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ﴾ واتە ئەو دەستەیە بێزارو ناخۆش حاڵبوون یان دەمەقاڵی یان ئەکرد بە بێزارییەوە وەك ئەوەی ئەوانە بە زۆرو بەتوندی ڕاکێشرێن بۆلای مردن لە کاتێکدا کە سەرنجی نیشانەو هۆی مردنەکەیان بدەن، ئەوانە ژمارەیان کەم بووو تەنها دوو وڵاخی سوارییان هەبوو چەکیشیان کەم بوو، لەناکاودا ئەو شتە ڕووی تێکردن، ئادەمی جێگەی هەڵەو لاوازییە لەو جۆرە کاتو هەڵوێستانەدا، ئەو هەڵەو لاوازییە بەدژی بڕواو عەقیدەی بەهێزییە، کەواتە نابێ بڵێین: چۆن ئەو هاوەڵانە وتارو بەسەرهاتیان بەو جۆرەبووە؟ ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ چاکیو شیرینی کردەوەکەی خوا لەگەڵ دەست نیشان بۆ هەڵەو ناڕەوایی ئەوەی ئەو دەستە موسڵمانە ئەیانەوێو ئارەزووی ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ﴾ باسی ئەو کاتە بەکەن کە خوا بەڵێنی دا بەئێوە بەدەست کەوتو زاڵبوونتان بەسەر یەکێ لەو دوو دەستەو کۆمەڵە: کاروان یان لەشکرو کۆمەڵی قوڕەیش.**

وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ

---

**﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ﴾ ئێوه پێتان خۆشەو ئەتانەوێ ئەو دەستە كە خاوەنی هێزو تیژیی نییە یان خاوەنی چەك نییە، واتە كاروانە كە بۆ ئێوەبێت ﴿وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ خوا ویشتیو ئەیەوێ كە هەق بەهەق دەربخات بە وشەو وتەكانی كەناردیـیە خـوارەوەو یـەڵێنی پێدا تیایانـدا، یـان فـەرمانو بڕیارەكـانی بەیارمـەتی دانـی مەلائیكـەكان، بەكوشـتنو دەسـتگیر كردنـی بێبڕواكـان ﴿وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ ویـستی دوا قەتەی بێ بڕواكان ببڕێو لەناویان بەرێ، واتە ئێوە نەتان ئەزانیو بەدوای شتی بێنرخو بێ كەڵكدا ئەگەڕان كە دەستكەوتو شتومەكی ئەم جیهانەیە. خوا میهرەبان شتی بەرزو بڵندو دوا نـەهاتووی هـەردوو جیهـانی ئەویـست بـۆ ئێـوە، هـەموو سـتایشو سوپاسێك بـۆ خـوای میهرەبان. ﴿لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ﴾ واتە خوا ئەوەیكرد كە كردی هـەر لەبەرئـەوە هـەق بەهـەق دەربخاتو جێگیرو دامەزراوی بكات، ناهـەقو بـەتاڵ بەناهـەقو بەتاڵدەربخاتو لایبـەرێو لـەناوی ببـات، ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ هەرچـەندە تاوانبارەكـان ـ واتـە بـت پەرسـتو هاوبەش بڕیـار دەرەكـان ـ بێـزار بـوون لـەوەو پێیـان نـاخۆش بـوو. بـەم ڕستەیە لەلایەكەوە لاقرتییان پێئـەكاتو سـووكیو ڕیـسواییان نیشان ئـەدات، لەلایـەكی تـرەوە داخـی سـەخت ئـەنێ بەجگەریاندا، وەك بفەرمووێ: خوا ئەوەی كرد بە كوێرایی چاوی ئەوانو بەداخی سەختی سـەر دڵـی ئەوانـەوە. وشـەی (حـق) دووبـارە كردنـەوە نییـە بـۆ (حـق) لەپێشوودا، چونكە مەبەست بە (حق) لەئایەتی پێشوودا جەنگ بوو لەگەڵ لەشكری قوڕەیشداو سەركەوتنو زاڵ بوونی موسڵمانان بەسەریاندا، مەبەست بە (حق) لەم ئایەتەدا ئیسلامە، كەواتە (حق) لێرەدا**

مەبەستەکەیەو پێشووەکە هۆو ڕێکاکەیەتی. بێجگە لەمەدوو سێ جۆری تریش گوتراوە لەبارەی ئەوەوە کە دووبارە کردنەوە نییە، بەڵام ئەوەی کە گوتمان ڕوون ترو بەهێزترە، کەواتە با هەر ئەم جۆرە بگیرێ.

ئینجا زیاتر حاڵو باری ئەو ڕووداوە ڕوون ئەکاتەوە، ڕوونی ئەکاتەوە، چۆن خوا تەگبیری کارەکەی کردنو سەری خستن، ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ﴾ واتە باسی ئەو کاتە بکە داوای بەهاوارەوە چوونو کۆمەکیو فریاد ڕەسیتانکرد لە پەروەردگارتان. (ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە عومەری فاروقەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: لە ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر (ﷺ) سەرنجی هاوەڵەکانیدا کە سێسەدو ئەوەندە کەس بوون، سەرنجی بت پەرستەکانیدا کە هەزارو زیاتر بوون، لە چەند ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە بەینی هەزارو نۆسەدو پەنجا بوون. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی کردە ڕووگەو فەرمووی: ئەی خوایە ئەو بەڵێنەی کەدات پێم بۆم بەدی بێنە، ئەی خوایە ئەگەر ئەم دەستەیە لە موسڵمانان لەناو بچن ئیتر تۆناپەرستری لەزەویدا، عمر ئەفەرموێ: کۆتایی نەهێنا لەنزاو پاڕانەوە، دەستی بەرزکردەوە هەتا ڕیداکەی داکەوت لەهەر دوو تەنیشتی، ئینجا ئەبوبەکر هاتە خزمەتیو ڕیداکەی هەڵگرتو دایەوە بەسەرشانیدا، ئینجا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەستە نزاو پاڕانەوەکەت لەخوای خۆت، بێگومان ئەو بەڵێنەی کەپێی دای بەدی ئەهێنێ بۆت، ئینجا بەهۆی ئەوەوە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ﴾ هەرچەند نزاو لالانەوەکە پێغەمبەر (ﷺ) کردی بەپێی هێندێ ڕیوایەت، بەڵام ئەو نزایەی لەبەر موسڵمانان ئەکرد، کەواتە وەك نزای ئەوانیش بێت وایە، بەڵکو بەپێی هێندێ ڕیوایەتی تر لە نزاکانی ئەوانەوە ئەم نزای کرد. یان ئەڵێین: وەك لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە ئەو نزاکەی ئەکردو ئەوانیش ئامینیان لەسەر ئەکرد یان لەبەر ڕێزو بە گەورە گرتن بەکۆ نیشانیدا، کەواتە بەهەر حاڵ هیچ گرێیەك نییە لەمەدا کە بەنزای کۆمەڵ نیشانی ئەدات، نەك تەنها بەنزای پێغەمبەر (ﷺ)،

**﴿فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ﴾ ئینجا بە دوای نزاو هاوارەکەتاندا، خوا نزاو هاوارەکەی وەرگرتن ﴿أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ﴾ بەمەی کە من کۆمەك و یارمەتی دەرتانم بە هەزار لە فریشتە بەجۆرێ هەرکام یەکێ تر بەدوای خۆیدا بێت، ئیتر لەپاشکۆیدا بێت وەك ڕووکەشەکە وانیشان ئەدات، یان هەر بە دوایدا بێت بە سواری ولاغێکی تر، بەپێی ئەم دووبارە فریشتەکان ئەبن بە دووهەزار، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە ئەو هەزارە دێن یەك لەدوای یەك نەك بە کۆمەڵ و تێکەڵی بەپێی ئەم ڕایە کۆمەڵەکان هەر هەزار بوون و هەر ئەمەش بەهێزترە لە دڵدا، هەروەها لەسەر ڕایەکی تریش کە ئەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە: موسڵمانەکانیان هێناوە بەدوای خۆیاندا ئەمان پێشیان کەوتوون، یان بە پێچەوانەی ئەمە، بەم جۆرانە تەفسیر کراوەتەوەو هەموویش ئەگونجێ و زانینی ڕاستی هەر لای خوایە. لە (قەتادە)وە ڕیوایەتکراوە کەلە یەکەمجارەوە بەهەزار، ئینجا بەسێ هەزار، ئینجا بە دوو هەزاری تر کەواتە ڕێك و پێك و دەستە ملە لەگەڵ ئایەتەکانی سوورەتی ﴿آل عمران﴾دا، لەو سوورەتەدا ئەندازەیە درێژەماندا بەم باسە، با سەرنج بدرێ، ئینجا ئایا ئەو مەلائیکەتانە جەنگیانکرد، وەك زۆربەی ئەفەرموون یان هەر بۆ زۆر کردنی کۆمەڵ هاتن و دڵ بەهێزکردنی موسڵمانان، وەك کۆمەڵێك لە زانایانی لەسەرە؟ ئەو دوو ڕایە هەیە، بەڵام بەڕاستی ڕای دووەم لە دڵدا بەهێزترە، چونکە ئەگەر بۆ جەنگ بهاتنایە پێویست نەئەبوو بەو هەمووە، بەڵکو تەنیا فریشتەیەك بەس بوو بۆ تێك دان و لەناوبردنی ولاتێك، بەڵکو هەموو جیهان، بێجگە لەوە ڕووکەش و ڕواڵەتی ئایەتەکانیش لەگەڵ ئەم ڕایەدا گونجاو ترە، ڕیوایەتی زۆر هاتووە سەبارەت بەم مەلائیکەتانە لەو ڕۆژەدا، ژمارەیان، چۆنێتی بەشدارییان لەو جەنگەدا، چیان گوتووە بە موسڵمانان بۆ بەهێزکردنی دڵیان و چیان گووتوە بە بێبڕواکان بۆ ترساندن و سستکردنی دڵیان،بەڵام چاك ئەوەیەتێپەڕنەکرێ لەدەقی ئایەتەکان وحەدیسێکی صەحیح، چونکەئەوانەشتێکی نهێنی وغەیبین بەبێ ڕابەروبەڵگەی بەهێز نابێ قسەیان لێبکرێ.**

وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾

---

**خوای پەروەردگاری میهرەبان نزاکەیانی وەرگرت و چوو بە هاواریانەوەو یارمەتیدان بەو فریشتانە، بەڵام بۆئەوەی بەندە پشت بە هیچ شتێك نەبەستێ بێجگە لە خوا، چاوی لە هیچ شتێك نەبێ بێجگە لە خوا، هیچ کەس و هیچ شتێك هیچی بە دەست نییەو کارناکات بێجگە لەدەستی قودرەتی خوا بۆ گەیاندن و چەسپاندنی ئەو بۆچوون و بیروباوەڕە، فەرمووی: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ ﴾ خوا ئەو یارمەتی دانەی بەو فریشتانەی لەبەر هیچ هۆیەك نەگێڕاو بڕیار نەدا مەگەر لەبەر موژدە دان پێتان بەسەرکەوتن و زاڵبوون ﴿وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ ﴾ بۆ ئەوەی دڵەکانتان ئارام بگرێ بەهۆی ئەو یارمەتی دانەو بیم و بێئارامی نەمێنێ ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ ﴾ سەرخستن و زاڵکردن لای هیچ کەس نییە بێجگە لای خوا، هیچ کەس ناتوانێ فەراهەمی بێنێ بێجگە لە خوا، بەدەستی هیچکەس نییە بێجگە لە خوا، واتە ئەو شتانەی کە ئەکرێن بەهۆو کارکەر شتێکی ڕووالەتییەو هەموو کارەکان خوا ئەیانکات و فەراهەمیان ئەهێنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە چونکە خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێك ناتوانێت سەرپێچی لێبکات. لێزان و کاردروستەو هەرچی ئەکات ڕاست و بەجێیەو لەجێی خۆیدایە. شتێکی ئاشکرایە کەئەو ڕووداوی بەدرە زۆر سەخت و سامناك بوو: موسڵمانان بەو کزی و کەم دەسەڵاتییەو بێبڕواکان بەو زۆری و دەسەڵاتە زۆرەوە هاتن بەو هەموو کەشخەو خۆ بەزل زانییەوە، موسڵمانەکان بەنیازی کاروانێکەوە بوون کە بەئاسانی بیگرن و ئەو سامانە فراوانەیان دەستکەوت ببێ لەبەرئەوە هیچ چاوەڕوان نەبوو کە شتی وا بێتە ڕێگایان، ئینجا کاتێ لەناکاودا دووچاری ئەوەبوون ئەبێ داچڵەکێن و بیم و**

ترس دڵیان داگیربکات، لەبەرئەوەی خوای میهرەبان دەستی قودرەتی خستە کار بۆیان بەمەی وەنەوزو خەوە نوچکە دای بەسەریاندا، تا بەوە بیمو ترسەکەی نەهێشتن، نەمانو لابردنی بیمو ترس بەوتۆزە وەنەوزو خەوەنوچکەیە شتێکی ڕاستەو چەند جار بەراورد کراوەو خوا خۆیشی ئەزانێ هۆکەی چیەو چۆن ئەو بیمو ترسە نامێنێ، جا ئەوان ئەو چاکەو بەهرەی بیرخستنەوە، وەك چاکەو بەهرەی باراندنی باران بەسەریاندا کە چەند سوودیان لێ وەرگرت وەك باسیان ئەکەین، ئەفەرموێ: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ ﴾ باسی ئەوکاتە بکەن کە خوا وەنەوزیدا بەسەرتاندا بەجۆرێ داگیریکردن لەبەر ئارام پێدان لەلایەن خواوە، (ئیمامی عەلی) ئەفەرموێ: خۆمانم بینی هیچ لە ئێمە کە خەوتوو نەبێ بێجگە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە نوێژ کردن لە ژێر دارێکدا تا ڕۆژ بوویەوە، ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً ﴾ هێنایە خوارەوە بەسەرتاندا لە ئاسمانو لەلای سەرووتانەوە ئاوێك واتە بارانێکی گرنگ پڕ سوود وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ:

١- ﴿لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ ﴾ بۆئەوەی پاکتان بکاتەوە لێی لە بێدەست نوێژی گەورەو بچووك، لەچڵكو چەپەڵی.

٢- ﴿وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ ﴾ لابەرێ لێتان خەتەرەو خەیاڵی بەد کە شەیتان ئاڕاستەی ئەکردن.

٣- ﴿وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ ﴾ واتە بۆ ئەوەی دڵیان بەهێزو دامەزراو بکاتو بێئارامی نەمێنێ بەهۆی ئەو ئاوەوە کە لوتفو میهرەبانی خوای لێ هەست ئەکرا.

٤- ﴿وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴾ بۆ ئەوەی بەو بارانە پێکانتان دامەزرێنێو نەچێ بە قور لمە بۆشەکەدا کەوان لەناویدا، (ئیبنو جەریر) ئەگێڕێتەوە لە (ئیبنو عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: لەیەکەمجارەوە بت پەرستەکان زاڵبوون بەسەر ئاوەکەدا بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکان تینووبوون شەو ئیحتلامیان بووەو لەبەر

بێئاوی بەبێ دەست نوێژو بە لەش پیسییەوە نوێژیانکرد، لەبەینی ئەوان و ئاوەکەدا لمێکی وابوو کە پێی پێدائەچووە خوارەوەو ڕۆیشتن تیایا زۆر سەختو گران بوو، بەهۆی ئەوە شەیتان غەمو پەژارەو خەتەرەی بەدی خستەدڵیان، بەمەی کە ئێوە ئەڵێن: پێغەمبەرمان لەگەڵەو ئێمە دۆستی خواین، ئەگەر وایە بۆچی واتان بەسەرهاتو لەناچاریدا بەبێ دەست نوێژو بەلەشی گرانەوە نوێژئەکەن؟ ئینجا خوا ئەو بارانەی باراندو ئاوو لافاویان بۆ هاتو ئاویان خواردەوەو خۆیان شۆشتو دەست نوێژیان گرت، زەوییەکەی کوتایەوەو بۆشی لمەکە نەماو جێ‌پێیان محکەم بوو، ختەرەو خەیاڵە بەدەکانی شەیتان نەما. (ئیبن و قەیم) ئەفەرموێ: لەو شەوەدا خوا بارانێکی باراند کە سەختو بەتین بوو لەسەر بێبڕواکان و نەرمو ناسك بو لەسەر موسڵمانەکان، بەهۆی ئەوەوە بێبڕواکان نەیان ئەتوانی بێنە پێشەوەو لە جێگای خۆیاندا مانەوە، بەڵام موسڵمانەکان خۆیان پێ‌شۆشتو ئاویان خواردەوەو لمو زەوییەکەی پێ محکەم بوو بەهۆی ئەوەوە دڵی موسڵمانەکان بەهێزو دامەزراوبوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانی پێش کەوتن بۆ سەر ئاوەکەو لەوێدا خستیان، حەوزیان دروستکردو بیرەکانی تریان کوێرکردەوە، شوێن و سەنگەو دروستکرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر تەپۆلکەیەك کە ئەیڕوانییەوە بەسەر جێگەی جەنگەکەدا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) گەڕا بەو شوێنەداو دەست نیشانیکرد بەدەست بۆ جێگە کەوتن و کوژرانەکەی ئەوانەی کەلەپاشدا کوژران، ئەیفەرموو ئمە جێگەی فلانە، ئەوە جێگەی فلانە، هیچ کام لەوانە تیپەڕیان نەکرد لەوەی کە بۆی دیاریکردن. ئیجاچاکەوبەهرەیەکی ترئەخاتەبەرچاو،لەیەکەم جارەوەتەنها پێغەمبەر(ﷺ)بە چاکەو بەهرەیە ئەزانێ، جا بەپێی ئەوە ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەوو تایبەتی ئەکات بەوەوە،

﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەوکاتە بکە کە پەروەردگارت سروشی کردە لای فریشتەکان بەمەی من لەگەڵتام، واتە کۆمەکتان لە بەهێزکردنو دامەزراندنی بڕوا دارەکاندا، یان خوا بارانی باراند بۆئەوەی بەو بارانە پێی بڕواداران بە هێزو دامەزراو بکات لەو کاتەدا کە خوای تۆ سروشی کردە لای فریشتەکان بەمەی من لەگەڵتانام... هتد ﴿فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ کەواتە بڕوادارەکان دامەزراوبکەنو دڵیان بەهێزو دامەزراو بکەن، ئەوەش بەم ڕەنگە ئەوان پێغەمبەر (ﷺ) ئاشنابکەن بەوەی خوا یارمەتی دەروو کۆمەکی بڕوادارانە، ئەویش بڕوادارەکان ئاشناو ئاگاداربکات بەوە، یا بەمەی موژدەو خۆشیو خەتەرەی بەد کە شەیتان ئەیخاتە دڵیان، یان بەمەی خۆیان ببەنە شێوەو شکڵی پیاوانی ناسراوو بەڵێنیان پێبدەن بە یارمەتیدانو کۆمەکیان، یان بەهەر جۆرو شێوەیەکی تر کە خوا خۆی ئەزانێو ئەو فریشتانەی ئاگادار کرد پێی، بەهەر حاڵو لەسەر هەربار کارەکە زۆر گەورەو گرنگە کەبە فەرمانی خوا فریشتە بەشداری بکات لەو جەنگەداو بەو جۆرە تێکۆشێن بۆئەو بڕوادارانە!! ئینجا باسی چاکەو بەهرەیەکی تر ئەکات دەربارەی موسڵمانەکان، ئەفەرموێ: ﴿سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ بێگومان ترسو بیم ئەخەمە دڵی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، بیمو ترسێك کە دڵیان پڕبکات ﴿فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ﴾ ئینجا ئەی بڕوادارەکان، یان ئەی فریشتەکان بدەن لەسەریانو

بێ‌سەریان بکەن، یان بدەن لە گەردنیان ﴿وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ﴾ بدەن لە هەموو شوێنێکیان، یان بدەن لە هەموو پەنجەکانیان، یان لە هەموو سەرەپەنجەو ئەم لاوئەولای پەنجەکانیان، کەواتە بە پەنجەکانیان جەنگ ئەکەن‌و تیرو شیر بەکارئەهێنن، بەهەرکام لەوانە تەفسیرکراوەتەوە ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ ئەوەی کە باسکرا دەربارەی ئەو بێبڕوایانە، بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە دوژمنایەتیانکرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی، دژو پێچەوانەیان ڕەفتاریانکردو بەرامبەریان وەستان ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ هەرکەس دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات‌و دژو پێچەوانەیان بوەستێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بێگومان خوا تۆڵەی بەتینە بۆی یان بێگومان خوا تۆڵەی سەختی لێ ئەسێنێ، چونکە بەڕاستی خوا تۆڵەی بەتینە، واتە ئەوەی بەسەر ئەوانەدا هات شتێکی ڕێکەوت یان تایبەتی نییە بەوانەوە، بەڵکو باوو یاسای خوایەو بۆ هەر کەسێکی تریشە کە وەك ئەوان وابێ، باوو یاسای خوایە کە هەرکاتێ موسڵمانان هەڵسان بە پێویستی سەرشانی خۆیان‌و هەوڵ‌و تێکۆشانیانکرد بۆ بەرزکردنەوەی ئالآی خواو چەسپاندنی بەرنامەکەی، ئینجا ئینجا دوژمنانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بەرەنگاریان وەستان، سەکەوتن‌و زاڵبوون بۆ کۆمەکی موسڵمانان ئەبێ، بەشی دوژمنەکان ترس‌و تێك شکان ئەبێ تا موسڵمانەکان لانەدەن لەڕێگەو بەرنامەکەی خوا. ئینجا لە کۆتاییدا بەخەشمەوە ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەو دوژمنانە بەمەی کە هەرچیان بەسەر هات لەو جەنگەدا، ئەوەی دووچاریان بوو هەر بەوە کۆتایی نایەت‌و بەسزای ئەم جیهانە وازیان لێناهێنرێ، بەڵکوتۆڵەو سزای سەختی ئەوان پاش ئەم ژیان‌و جیهانەیە، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمۡ﴾ حوکم‌و بڕیاری خوا ئەوەبوو کە باسکراو بەسەرتان هات لەم جیهانەدا ﴿فَذُوقُوهُ﴾ کەواتە بچەژن ﴿وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ بۆ بێبڕواکان هەیە سزای ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی دواییدا.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ﴾

لەپاش ئەوەی ئەو هەموو یارمەتی و چاکەو بەهرە گەورە گەورەی نیشان دان و خستیە بەرچاویان و تێی گەیاندن کە کارەکە خوا کردی و خوا ئەو هەموو هۆی زاڵبوون و سەرکەوتنەی بۆ سازاندن، ئینجا فەرمانیان پێئەدات بەدامەزراوی و خۆگریی بەرامبەر بێبروایان، نەشکێن و پشتیان تێنەکەن، زۆر لەو بەهرەو میهرەبانی و یارمەتیەی کە بۆی فەراهەم هێنان لەو جەنگەدا ئەخاتەوە بەچاویان، تا باشتر چاو لەبەری خوابن و باشتر گوێڕایەڵ بن، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا﴾ کاتێ لەجەنگدا گەیشتن بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، لەکاتێکدا کە ئەهاتن بۆتان بەزۆری ﴿فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ﴾ دوایان تێمەکەن و پشت هەڵمەکەن لێیان بەشکستەیی، بەڵکو پەلاماریان بدەنێ و ڕوو بەڕوویان بوەستن، بەگوێرەی ڕووداوەکەو کات و شوێنەکەی کە ئەڵێن: ئەی بڕواداران کاتێ کە گەیشتن بەدوژمنە بێبڕواکانتان لە جەنگدا لە کاتێکدا ئەوان کۆمەڵێکی زۆر بوون تاڕادەیەك لەبەر زۆری بەزەحمەت ئەهاتن و ئێوە ژمارەیەکی کەم، ئێوە لەو کاتەیشدا پشتیان تێمەکەن چ جای ڕاکردن لێیان، بەڵکو هەڵمەتیان بدەنێ و ڕووبەڕوویان جەنگیان لەگەڵ بکەن، ﴿وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ﴾ هەرکەس لەو ڕۆژەدا پشت و دوایان تێبکات ﴿إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ﴾ هەرکەسێك لادەرو وازهێنەربێت لە شوێنەکەی خۆی لەبەر جەنگ کردن، بەم ڕەنگە ئەو شوێنەی کە بۆی ئەڕوا باشترو شیاوتربێت بۆ جەنگ کردن، یان لابدا بۆ جەنگی دەستەیەکی تر کە جەنگ کردن لەگەڵ ئەوان گرنگ ترو پێویست ترە، یان بیەوێ خۆی بکات بە شکستەو لەناکاودا پەلاماری دوژمن بداتەوە کە ئەوەش فێڵێکە لە فێڵەکانی جەنگ وەك بەناوبانگەو ئەگوترێ: (الحرب خدعة) جەنگ بە فڕو فێڵ ئەکرێ،

﴿أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ یان کەسێك لە شوێنەکەی خۆی لابدا بۆلای دەستەیەکی تر تێکەڵیان ببێ بۆ یارمەتیدانیان، یان مەترسی خۆی هەیەو ئەیەوێ بەو دەستەیە خۆی بەهێزو ڕزگاربکات، هەرکەسێ لەکاتی جەنگدا پشت بکاتە دوژمن بێجگە لەو دوو جۆر کەسەی کە باسکران، ﴿فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بێگومان ئەو کەسە ئەگەڕێتەوە بە خەشمێکی گەورەو بەتینەوە لە لایەن خواوە ﴿وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ﴾ جێو شوێنی پەناگای دۆزەخە، واتە ئەو کەسەی کە ڕا ئەکات لە جەنگەکە ئەیەوێ پەنا ببا بەشوێنێ کە ڕزگاری بکات لە کوشتن، دەی خوا تۆڵەی لێ ئەسێنێ بەوەی کە پەناگاکەی لە ڕۆژی دواییدا ئەکات بەدۆزەخ، خوا پەنامان بدات لێی ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ دۆزەخ دواڕۆژێکی بەدەو جێو شوێنێکی بەدە بۆ ئەوانە، ناو بردنی بە پەناگاو لاقرتیو ڕیسواکردنی لێ وەرئەگیرێ کە ئەوەش سزای دەروونی تێدایە، ئینجا ئایا ئەم هەڕەشەو بڕیارە تایبەتی بووە بە جەنگی بەدرەوە، یان بەهەر جەنگێکی تریش کە پێغەمبەر (ﷺ) بەشدار بووبێ تیایدا، یان گشتێ بۆ هەموو کاتو چەرخێك، کۆمەڵو جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە گشتییە، ڕاکردن لە جەنگدا بەبێ ئەو دوو جۆرەی کە باسکرا یەکێکە لە گوناهە زۆر گەورەکانو یەکێکە لەو حەوتە کە ناوبراون بە (موبقات) واتە ڕاگیرکەرانو بەند کەران لە دۆزەخدا، (ئیمامی موسلیمو بوخاری) لە صەحیحەکەیاندا حەدیسێك ئەهێنن لە (ئەبو هورەیرە)وە –خوا لێی ڕازی بێ– کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دوورکەونەوە لەو حەوتە. عەرزیان کرد: کامانەن ئەوانە، ئەویش فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان، سیحرو جادو کوشتنی ناهەق، سو خواردن، خواردنی ماڵی هەتیو، ڕاکردن لە ڕۆژی پەلاماردانو تێك ڕژانی دوژمن، بوختان کردن بۆ ئافرەتە پاكو بێئاگاو بڕوادارەکان، هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە لە پاش تەواو بوونی

جەنگی بەدرو ئەم حەدیسە بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر بەهێزی ڕای کۆمەڵو جەماوەر، بەڵێ بەڕاستی دڵی بڕوادار ئەبێ بەهێزو دامەزراوبێت هیچ هێزێك لەزەویدا لەخشەی پێنەکات، لەکاتێکدا ئەو پەیوەستە بەهێزی خواوە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەگەر ترس و لەرزگرتی لەکاتی سەخت و سامناکدا نابێ بگاتە ڕادەی شکان و ڕاکردن، ماتوڵ بڕوای وایە کە مردن و ژیان و ئەجەل هەر بەدەست خوایە، نابێ بڕوادار لە ترسی گیان و ژیان پشت بکاتە دوژمن و ئەو ڕیسواییە بەسەر خۆیدا بێنێ، ئەوە ئەرکێك نییە کەلە تواناداا نەبێ، چونکە ئەو بڕوادارە ئادەمییە و تێهەڵئەچێ لەگەڵ ئادەمی یەکدا، ئینجا بڕوادارەکە جوێبووەتەوە لەو بێبڕواییە بەمەی دڵی پەیوەستە بەهێزی هەرەگەورەوە کە سەرچاوەی هەموو هێزەکە، کەواتە بەهەر حاڵو لەسەر هەربار ئەم هێزترە لە دوژمنەکەی کە بەربەرەکانێ ئەکات لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) جالەبەرئەوە ئەو بڕیارە گەورەی بەسەردا دراوە کەلەو ئایەتەدا کرا، ئەو بڕیارە کە هۆنینەوەو دەستەواژەکەی ئێجگار هاندەرە بۆ خۆگرتن دامەزراوی و ڕیسواکەرە بۆ خۆنەگرو ڕاکەرو ترسنۆکەکان، ئەوەبوو فەرمووی: ﴿فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ﴾ ﴿ٱلۡأَدۡبَارَ﴾ کۆیەو تاکەکەی (دبر)ەو ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ﴾ (دبر) پاشی مەردومە، کەواتە ئەو ڕاکەرە وەك پاشی خۆی خستبێتە بەر دەستی دوژمن، بێجگە لەوەی کە بەخەشمی خواوە ئەگەڕێتەوە بەرەو پەناگاکەی کە دۆزەخە! ئینجا لەپاش ئەو ترساندن و هەڕەشەیە هەر لەسەر باسەکە ئەڕواو دەستی قودرەتی خوایان ئەخاتە بەرچاو، کە کوشتن و برینی دوژمن ئەو دەستە قودرەتە کردی، نەك ئەوان، ئەفەرموێ: ﴿فَلَمۡ تَقۡتُلُوهُمۡ﴾ لەبارەی پەیوەستی ئەم ئایەتەوە چەند ڕایەك هەیەو هەموویش دەست ئەدەن و مەبەستەکە پێك دێت: (ئەبو حیان) ئەفەرموێ: پەیوەستە بە ڕستەکانی پێشەوە: ﴿فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ﴾، ﴿وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ﴾،واتەهەرچەندئێوەگوێڕایەڵیتانکردودەستتان کردبەجەنگ وکوشتنی ئەوانە،

بەڵام بۆئەوەی خۆیان بەسەر بەخۆ دانەنێن فەرمووی: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ﴾ ئینجا ئێوە نەتان کوشتن بەم ڕەنگە سەربەخۆین لەوەدا ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ﴾ بەڵکو خوا ئەوانەی کوشت، چونکە دەسەڵاتدان بەسەر ئەو کوشتنەو دروستکردنی کوشتنەکە هەر بەدەست خوایە، خاوەنی (کشاف) ئەفەرموێ: ئەم ڕستەیە وەڵامی شەرتێکی نەگوتراوە، واتە ئەگەر ئێوە کەشخە ئەکەن ــ ئەی بڕواداران ــ بەو کوشتن و زاڵبوونە بەسەر بێبڕواکاندا، ئێوە نەتانکوشتن، بەڵکو خوا کوشتنی، هێندێکی تر ئەفەرموون: پەیوەستە بەو مۆژدەو هەواڵانەی پێشەوە، واتە ماتوڵ خوا یارمەتیدان فریشتەو ترسی خستەدڵی بێبڕواکان و دڵی ئێوەی بەهێزو دامەزراو کرد، کەواتە ئێوە نەتان کوشتن، بەڵکو خوا کوشتنی، هێ،دێکی تر ئەفەرموون: پەیوەستە بە ئایەتەکەی پێشی کە جڵەوگیری کرد لە خۆنەگرتن و ڕتکردن، واتە بڕوادارەکان لە جەنگدا مەشکێنن و پشت مەکەنە دوژمن و خۆتان بگرن، چونکە خوا یارمەتی دەرتانە، ئەوەتا ئێوە بەو کەمی و کەم دەسەڵاتییەوە خوا زاڵی کردن، یارمەتیدانی خۆی کە بەهێزو دامەزراوی کردن لەسەر دەستتاندا ئەوەی بەسەر هێنان، کەواتە ئێوە نەتانکوشتن.... هتدن بە هەرکام ئەگونجێ و چاکە. ڕیوایەتکراوە کەلەو ڕۆژەدا جوبرەئیل هات و فەرمووی بە پێغەمبەر (ﷺ): چنگێ خۆڵ و ڕیزە وردەبگرەو بیگرە ئەو بێبڕوایانە، ئینجا کاتێ کە هەردوو کۆمەڵ تێك ڕژان، فەرمووی بەعەلی ئەبو تالیب: مشتێ ڕیزەو وزدەی ئەو شیوەم پێبدە، ئەویش پێیدا، ئینجا ئەویش گرتییە بێبڕواکان و لەدوورەوە کردنی بە حەوادا بەڕوویاندا، ئەو ڕیزو خۆڵە دای لەهەرکام لەوانە کە خوا ئیرادەی کوشتنی کردبوو. جا بۆ دەست نیشان بەوە ڕووی فەرموودەی کردە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ﴾ واتە لە ڕاستیدا تۆ نەتدا لەو بێبڕوایانە کاتێ کە بەڕووکەش و ڕواڵەت لێتدان و ئەو مشتە خۆڵ و ڕیزەت تێگرتن ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾، بەڵکو خوا لێیدان، چونکە ئەگەر لەڕاستیدا کردەوەی تۆ بوایە لەو دوورەوە بڕی نەکردە ئەوانە، کەواتە خوا ئەو مشتە خۆڵەو ڕیزەی گەیاندە ئەوانەو هەرکام شتێکی بەرکەوت و دای لەدەم و چاوی، خوایش ئەوەی کرد تا بێبڕواکان بەش بڕاوو بێ فەڕ بکات،

وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُۖ وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ

---

**﴿وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ﴾ بۆئەوەی ببەخشێ بە بڕوادارەکان لەلایەن خۆیەوە بەخششێکی جوان و شیرین بەسەر خستن و زاڵ کردن و ئەو هەموو دەستکەوتەی ئەبن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ واتە خوا ئەو چاکەو بەخششەی پێدان، چونکە بەڕاستی خوا بیسەری زانایە، بیسەری نزاو هاوارەکەی ئەوانەو بۆ هەموو شتێ و بە هەموو شتێ کەنزاو نیەتەکەی ئەوان هێندێکە لەو شتانە ﴿ذَٰلِكُمْ﴾ مەبەست ئەو بەهرەو بەخشینەبە بڕواداران ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ ئەمەیش بوو کە خوا لاوازکەرو لەکار خەری پیلانی بێبڕواکانە، واتە خوا ئەوەی کرد کە کردی لەو جەنگەدا لەبەر دوو هۆ:**

**یەکەم: بەخشینی ئەو چاکەو بەهرەیە کەباسکرا بەبڕواداران.**

**دووەم: لاواز کردن و لەکارخستنی پیلانی بێبڕواکان دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ)، هەوڵدانیان بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی ئایین و بانگەوازەکەی، کەواتە هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ ترسان و تێکشکان، هیچ شایستە نییە بۆ بڕواداران کە لەکاتی جەنگدا خۆ نەگرو بێهێزو لاوازبن.**

**بڕواداران کاتێ بیربکەنەوە لەو هەموو بەهرەو چاکەو گەورە گەورانەی کە خوا لەو جەنگەدا ڕشتی بەسەریاندا، کاتێ بیربکەنەوە لەوەی کە خوا هەموو کارەکانی کردو خۆی ئەو شتانەی فەراهەم هێنا، بەشی بڕواداران لەو جەنگەدا هەر ئەوەبوو کە خوا بە میهرەبانی خۆی لەسەر دەستی ئەوان ئەو کارە گەورەی کردو ئەوانی گێڕا بەهۆی کارەکە، کاتێ کەبیر بکەنەوە لەوانە ئیتر ئەبێ چۆن خۆیان بەخاوەنی ئەو دەستکەوتانە سەیربکەن، تا دووبەرەکی و ئاژاوەی تێدا بکەن، بێگومان کە بیربکەنەوە هەرگیز لە ڕوویان نایەت هیچ جۆرە ئاژاوەو دووبەرەکی، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە بێبڕواکان کەلەپێش دەستکردن**

بەجەنگەکە داوای سەرکەوتنیان ئەکرد لەخوا، وەك ڕیوایەت کراوە کە ئەبو جەهل لە ڕۆژی بەدردا ئەیگوت: ئەی خوایە ئەم دوو ئایینە ئایینی ئایینی محمد کامیان باشترەو شایستەترە بەیارمەتیدان یارمەتی بدەو سەری بخە، لە ڕیوایەتێکی تردا گوتی: ئەی خوایە کام ئێمەو ئەوان زیاتر قەتعی ڕەحمی کردووەو تاوانبارترە، ئەم ڕۆ لەناوی بەرە، (سدی) ئەفەرموێ: ئەوانە کاتێ ویستیان بچن بۆ بەدر دەستیانگرت بە پەردەکانی کەعبەوەو گوتیان: ئەم دوو لەشکرە کامیان بەرزترە، ئەم دوو دەستەیە کامیان باشتر ڕێی ڕاستی داوەتەبەر، ئەم دوو کۆمەڵە کامیان بەڕێزترە، ئەم دوو ئایینە کامیان چاکترە ئەوەیان یارمەتی بدەو سەری بخە، لەبەر ئەوە ڕووی فەرموودەی کردە ئەو بێبڕوایانەو بە لاقرتیەوە ئەفەرموێ: ﴿ إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ﴾ ئەگەر ئێوە داوای یارمەتی و سەرکەوتن ئەکەن، یان ئەگەر ئێوە داوای حوکم و بڕیار ئەکەن لە جیاکردنەوەی هەق و ناهەق، چاك و خراپ، ﴿فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُۖ﴾ ئەوا یارمەتی و سەرکەوتن و زاڵ کردن هات بۆتان، ئەوەتا باشترین ئایینی سەرخست و چاکترین دەستەی زاڵ کرد و چاکی لەخراپ و هەقی لەناهەق جیاکردەوە، بەڵام بەداخیانەوە بە پێچەوانەی ئەوەی ئەوان نیازیان ئەکرد و بەتەمای بوون، بەو جۆرە لاقرتی پێکردن، بۆ سزادانی دەروونیان، دەست نیشان ئەکات بەمەی کە ئەوەی بەسەریان هات و ڕوویدا لە بەدردا نموونەیەکە لەباوەکانی خوا، کۆمەڵ و زۆرییەکەی ئەوان هیچ گۆڕانکاری یەك ناکات لەکارەکەدا، پەند و ئامۆژگارییان ئەکات بە کۆتایی پێهێنان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ ئەگەر کۆتایی ئەهێنن لە دوژمنایەتی پێغەمبەر و ئایینەکەی خوا ئەوا ئەوە چاکترە بۆتان، ئەمەش هەر لاقرتی تێدایە، ئەگینا هیچ جۆرە چاکییەك نییە لە کۆتایی نەهێناندا، ئینجا هەڕەشەیان لێئەکات، ئەگەر پەند و ئامۆژگاریەکە وەرنەگرن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعُودُواْ﴾ ئەگەر دووبارە ببنەوەو تەمێ خوار نەبن بەوەی بەسەرتان هات﴿نَعُدۡ﴾ ئەوا ئێمەش دووبارە ئەکەینەوە بۆ سزادان و وێنەی ئەوەی بەسەرتان هات ﴿وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَوۡ كَثُرَتۡ ﴾ هەرگیز دەستەو کۆمەڵەکەتان سوودی هیچ شتێکتان پێناگەیەنێ و بەرگریی هیچ سزاوزیانێکتان لێناکات، هەرچەند کۆمەڵ و دەستەکەتان زۆر بێباوەڕەکانی،

وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْاْ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ

---

﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واته لەبەرئەوەی خوا لەگەڵ بڕوادارەکاندایە، کارەکەتان بەو جۆرەیە یان ئەمەیە خوا لەگەڵ بڕوادارانە، زۆربەی زانایان (ان) بەپێژە ئەخوێننەوە، لەسەر ئەو خوێندنەوە ڕستەکە ئەبێتە هۆی ڕستەی پێشوو، واتە دەستەو کۆمەڵتان با زۆریش بن هیچ جۆرە سوودێکتان پێناگەیەنێ، چونکە بەڕاستی خوا لەگەڵ بڕواداراندایە، لەسەر هەر بار دەست نیشان ئەکات بەوەی کە جەنگ و بەربەرەکانێکە لەنێوان دوو کۆمەڵدایە کە هاوتای یەك نین: بڕواداران خوایان لەگەڵەو وان لە ڕیزێکدا، بێبڕواکان وان لە ڕیزێکی بەرامبەردا ئەوپەڕی یارمەتی دەریان کەسانێکی ترن وێنەی خۆیان... نەفامان و نەفامی تازە زۆر بەدترو ناپەسەندترن لە نەفامان و نەفامی کۆن، ئەوانەی کۆن بڕوایان هەبوو بە خواو نەفامییەکەیان لەوەدا بوو کە بەرنامەی ژیان و یاساو شەریعەتیان لە خواوە وەرنەگرت، بەڵام نەفامی تازە بێبڕواییە بەخوا چ جای بەبەرنامەو یاساو شەریعەتی خوا، زۆر پێویستە بیرکردنەوە لەمە تا نەزانانی ئەمڕۆ بزانن کە کاریان بەمە تەواو نابێ لافی بڕوا لێبدەن و خۆیان بە موسڵمان بزانن و لەگەڵ ئەوەدا هەڵگری بەرنامەو بیرو باوەڕێکی ترن، یا بزانن کە بەتەنها بەو بڕوا بە خوا جوێ نابنەوە لەبت پەرستەکانی کۆن و نایەتە ڕیزی موسڵمان هەرچەند نوێژو فەرزەکانیش بەجێبێنن!!

لەپاش باسی ئەوەی کە خوا لەگەڵیانە، ئینجا چەند بانگێکی گرنگ ئاڕاستەیان ئەکات و ئەیانهێنێ بەدوای یەکدا: یەکەم بانگ ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ گوێڕایەڵی خواو فروستادەکەی بن ﴿وَلَا تَوَلَّوْاْ عَنْهُ﴾ پشت مەکەنە فروستادەکەی و فەرمانبەری بن ﴿وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ﴾ لەکاتێکدا ئێوە ئەبیستن، واتە تەنها بیستنی ئایەت و فەرموودەکانی خوا لەم قورئانەدا کە موعجیزەیەکی

ئاشکرایەو فەرمانتان پێئەدات بە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵی بیستنی ئەو ئایەتانە داخوازە بۆ گوێڕایەڵی و دوورکەوتنەوە لە هەر سەرپێچی و نا فەرمانییەك ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوانە نابیستن بە بیستنی وەرگرتن و تێگەیشتن و گوێڕایەڵی، ئەم بانگ کردنە هات بەدوای باس و خستنە بەرچاوی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو جەگەدا کە دەستی قودرەتی خواو تەگبیرو بڕیارو کۆمەك و یارمەتی خوای تێدا بینرا، هات بەدوای بەڵێنی خوادا کە بڕوادارانی دڵنیا کرد بەوەی لەگەڵیانەو پیلان و فڕو بێبڕواکان لاوازو بێ نرخ ئەکات، کەواتە لەپاش ئەو باس و بەیانە ئیتر هیچ هۆو بڕوبیانوویەك نییە بۆ هەرکەسێك کە ژیریی و بیستنی لەکار نەکەوتبێ، هیچ هۆو بڕوبیانووی نییەو ئەبێ هەر گوێڕایەڵ و فەرمانبەربێت، ئەگینا لەڕادەو پلەی بەرزی ئادەمێتی دەرئەچێ، بەڵکو ئەبێ بەدتر بێت لە هەمووگیان لەبەرێك وەك دەست نیشان بۆئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ بەڕاستی بەدترینی هەموو گیان لەبەران کەبە زەویدا ئەگەڕێن یان هەموو چوار پێکان هەر ئەو کەڕو لاڵانەن کە ژیر نین و نافامن. ئەوانە وەك چوار پێکان گوێچکەو زمانیان هەیە بەڵام تێناگەن لە بیستراوەکان و شتێ ناڵێن کە سوودی بێ و سوودی لێ وەرگیرێ، بەڵام بەدترن لەو گیان لەبەرو چوار پێیانە، چونکە ئەوان ڕێئەبەن بەو شتانەی کە بۆی دروستکراون و پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، بەڵام ئەمان ڕێ نابەن، کەواتە بەدترن لەو گیان لەبەرانە بەڕاستی و بە بێ گومان! ﴿ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ﴾ ئەگەر خوا بیزانیایە هیچ جۆرە چاکەیەك لەو کەڕو لاڵانەدا هەیە، فەرمان و فەرموودەی خوای پێ ئەبیستاندن بەبیستنی تێگەیشتن و وەرگرتن، هەق و ڕاستیان بۆ دەر ئەکەوت و بڕوایان ئەهێنا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەڵام خوا زانی کە خێرو چاکەیان تێدا نییەو ئامادەییان نییە بۆ وەرگرتن و گوێڕایەڵی، خۆیان بە مەیل و خواهیشی خۆیان لایانداوە لە سروشتەکەی خۆیان، بە هۆی ئەوەوە خوایش قاپی دڵی نەکردنەوەو سروشتە تێك چووەکەی چاك نەکردنەوە، ئەوانە بە جۆرێکن ئەگەر خوا پێی بگەیاندنایە تا بە ژیریی خۆیان هەستیان بەڕاستورەوایی ئەوەی کەبانگ ئەکرێن

بۆی‌وداوای گوێڕایەڵیان لێئەکرێ بۆی، ئەگەرخوائەوەشی لەگەڵ بکردانایەئەوانە هەر دڵیان نەئەدایەو گوێڕاڵیان هەرنەئەبوو،

وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّواْ﴾ ئەگەر خوا فەرموودەو فەرمانی خۆی پێبیستایە تا تێئەگەیشتن و بەباشی لێی حاڵی ئەبوون، ئەوانە هەر پشتیان تێئەکردو گوێڕایەڵیان بۆ نەئەکردو سەکێشیان بەکار ئەهێنا دەربارەی یان پاشگەز ئەبوونەوەو هەڵئەگەڕانەوە. ﴿وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە هەر لەپێشەوە بەدڵ پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕن لەوەرگرتن و ڕەفتار پێکردنی فەرمان و فەرموودەی خوا لەبەر عینادو سەرکێشی خۆیان، واتە ئەوانە هەر باویان پشت تێکردن و ڕوو وەرگێڕانە، ئەم ئایەتە کە بەو جۆرە تەفسیرمان کردەوە هیچ جۆرە گرێ و گەردو غوبارێکی تێدانییەو کورتەکەی ئەوەیە: ئەوانە ئەگەر ئامادەبوونایە بۆ ئەوەی ڕێی ڕاست بدەنەبەرو بەدوای ئەوەدا بگەڕانایە خوا بۆی ئەکردن، بەڵام بەو جۆرە نەبوو لەبەر ئەوە خوا بۆی نەکردن، ئەوانە ئەگەر خوا بیخستنایەتە سەر ڕێگەی ڕاست خۆیان بەمەیل و خواهیشی خۆیان لایان ئەداو گوێڕایەڵیان نەئەکرد. ئینجا بانگێکی تری بڕواداران ئەکات بۆئەوە بە سۆزو پەرۆشەوە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکەن (ﷺ)، گوێڕایەڵیەکەیان لەبەرچاو شیرین ئەکات و ئەیان ترسێنێ لە سەرکێشی و ڕوو وەرگێڕان، چاکەو بەهرەی خوایان بیرئەخاتەوە کە دەست کەوتیان بوو بەهۆی گوێڕایەڵییەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ بەخۆشی و پەرۆش و توندییەوە گوێڕایەڵی بکەن بۆ خواو فروستادەکەی خوا،

**﴿إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ کاتێ کە ئەو فروستادە بانگتان ئەکات بۆ شتێ کە زیندووتان ئەکاتەوە. واتە بڕواو مل کەچی بۆ خوا وەك (سدی) ئەفەرموێ. قورئان وەك (قتادە) ئەفەرموێ. جیهادو جەنگو تێکۆشان وەك زۆربە ئەفەرموون. هەموو شتێکی هەقو ڕاست وەك هێندێ تر ئەفەرموون. بەهەرکام مەبەست بێت ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگی بۆ کرد مایەی خۆشبەختیو کامەرانی جیهانەو ژیانی خۆشی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایییە، کەواتە هەموو بڕوادارێکی ژیر ئەبێ بەئەوپەڕی سۆزو پەرۆشو خۆشییەوە بێت بەدەم ئەم بانگکردنەوە.**

**خوای میهرەبان پێی خۆشە بەندەکانی بەخواهیشو پێخۆش بوونی خۆیان بڕوا بێننو گوێڕایەڵیان بکەن، ئەگینا خوا دەسەڵاتدارە بەسەر ئەوەی بڕوایان پێبێنێو گوێڕایەڵیان بکات، کەواتە ڕێزی بەندەکانی ئەگرێ کە داوایان لێئەکات بەخۆشیو ئارەزووی خۆیان هەڵسن بە پێویستی سەرشانی خۆیان، تا شایستەی ئەجرو پاداشت بن، تا ئادەمێتیو مرۆڤایەتییان بەرزو بڵند ببنەوە بۆ ڕادە، پلەی ئەو ئەمینداریەی کە خوا پێیداون، ئەو سپاردەی کە پێیان دراوە بیگەیەنن بە جێگەی خۆی، سپاردەی ڕێنموونیو ڕێی ڕاست دانەبەر بە مەیلو خواهیش، سپاردەی جێنشینی لەزەویدا بە ئارەزووو زانینو تێگەیشتنەوە، سپاردەی ئەو ئیرادەو مەیلو خواهیشەی کە بەنیازو زانینەوە هەڵسێ بەکارو فرمان، خوای میهرەبان دەسەڵاتدارە بەسەر دڵی بەندەکانیدا کە بڕوایان پێبهێنێو گوێڕایەڵییان پێبکاتو وەریان گێڕێ بەهەربارێکدا کە خوا خۆی مەیلی هەبێ، وەك وەرئەگیرێ لەمەی کەئەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ بەپێی زمانی عەرەب ئەبێ بڵێین: بزانن کە خوا ئەکەوێتە بەینی مرۆڤو دڵەکەیەوە، بەڵام بەم ڕووکەشو ڕواڵەتە نابێ بگیرێ، بەڵکو ئەبێ مەبەست یەکێ لەم سێبارە بێباوەڕەکانی کە زانایان فەرموویانە:**

١- خوا ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەیە بەسەر دڵی بەندەکانیدا، بەجۆرێ ئەیگۆڕێ بەهەر بارێکدا کەخۆی مەیلی بێ‌و خاوەنەکەی ناتوانێ سەرپێچی بکات‌و دەسەڵاتی نییە بەسەریدا، ئەوە بڕیارو ئارەزووی ئەگۆڕێ، نیازو مەبەستی تێك ئەدات، ڕێنموونی ئەکات‌و ئەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، گومڕایی ئەکات‌و ئەیترازێنێ، ترس‌و ئارامی ئەهێنێ بەسەریدا، بیرو هۆش‌و لە یاد چوون بەسەری دێنێ، هەروەها.

٢- خوا ئەوپەڕی ڕادە نزیکە لە مرۆڤ‌و دڵەکەیەوە واتە نزیك ترە لە هەرکام لە مرۆڤ‌و دڵەکەی بۆئەوی تریان بەوێنەی ئەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾ ئێمە نزیك ترین لەبەندەو مرۆڤەوە تا ڕەگی بناگوێی، بەڵێ ئەوە شتێکی زۆر ڕاست‌و ڕەوایە، چونکە هەر شتێ کە هەبێ بەبوونەکەی شتەو بوونەکەی لە پێشە، بوونەکەشی لەخواوەیە، کەواتە خواناسان‌و زانایان چاکیان فەرمووە: (وهو اقرب من كل شيء من عينه) خوا لە هەموو شتێك نزیك ترە لە خۆی بۆ خۆی.

٣- مرۆڤ و دڵەکەی جوێ ئەکاتەوە لەیەکتر، دڵەکەی کە هۆی زانین‌و ژیرییە، لێی ئەستێنێ بەم ڕەنگە لێی ئەگەڕێ هەتا ئەکەوێتە شوێنی هەوای نەفسیان ئەیمرێنێ‌و هەل‌و هەڵکەوتی ژیانی لەدەست دەرئەکات، کەواتە با مرۆڤ فریای خۆی کەوێ لەم ماوەی ژیانەدا ڕێگەی ژیانی ڕاستەقینەی نەبڕاوە بداتە بەر بەڕواهێنان‌و گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ).

لەسەر هەربارو هەرکام لەم سێ تەفسیرە بەڕاستی ئایەتێکی ئێجگار سامناکەو دڵی وریا ئەهێنێتە لەرزە، بەڕاستی پاڵدەرێکی زۆر بەهێزە بۆ بێداری‌و وریاییەکەی هەمیشەیی‌و پەیوەندیەکی هەمیشەیی بە خواوە، نەوەك خوانەخواستە دڵەکەی بگۆڕێ‌و لادا لەڕێگە ڕاستەکەی خوا، هۆیەکی بەتینە بۆ پاك‌و خاوێن کردنی نیازو مەبەستی دڵ، بۆ هەوڵدان بۆ مەترسی‌و چارەسەر کردنی ئەو هەموو نەخۆشییە بەدانەی کە ڕوو ئەکەنە دڵ، خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتی دەرمان بێ بۆ کردەوە بە پێی ئەم ئایەتە، امین.

وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ

**یارمەتی دەرمان بێ کە ئەم ڕستەیەمان لەبیر بێ کە ئایەتەکەی پێدوایی هێناو فەرمووی: ﴿وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ بزانن کە هەر بۆلای ئەو کۆئەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، واتە دڵەکانتان بەدەست خوایە، هەر بۆلای خوایش، زیندوو ئەکرێنەوە، کەواتە لە هیچ لایەك پەنایەکتان نییە بێجگە لە پەنای خوا، پەناو قەڵای خوایش بۆ ئێوە بریتییە لە بڕوا هێنانو گوێڕایەڵی کە بانگتان ئەکات بۆی، کەواتە بچنە ناو پەناو قەڵاکەی خوا با دووچاری هەردوو جیهان نەبن، ئینجا ئەیانترسێنێ لەدانیشتنو کۆتایی هێنان لەجیهادو تێکۆشان، لەبە پیرەوە نەچوونی بانگ کردن بۆ هۆی ژیان، لەسستی کردنو دواخستنی گۆڕاندنو بەرگری هەر خراپەو بێشەرعیەك، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾ خۆتان بپارێزن لە گوناهێك کە تۆڵەکەی بەتایبەتی دووچاری ئەوانەتان نابێ کە ستەمو تاوانەکەی کردووە، بەڵکو گشتی ئەبێ بۆ ئەوانو غەیری ئەوانو چاكو خراپ داگیرئەکات، ئەوەش وەك کۆتایی هێنان لە تێکۆشانو فیداکاریی لەڕێی خوادا، بێدەنگ بوونو واز هێنان لە فەرمان بەچاکەو جڵەوگیریی لە خراپە، یان خۆتان بپارێزن لە ڕوودانلە بەڵاو سەر لێ شێوانو تاقی کردنەوەیەك کە بەتایبەتی دووچاری...هتد، وەك ئەو ئاژاوەو دووبەرەکیو بەش بوونەوەی کە ڕوو ئەکاتە گەلو میللەتانو داگیریان ئەکات بەگشتی نەك بەتەنیا ئەوانەی...هتد. بەهەردوو تەفسیر کراوەتەوەو نزکیشن لە یەکەوە، لەسەر هەردوو بارەکە زۆر بەجێیە کە گشتی دووچاری ببێ، چونکە ئیسلام بەرنامەیەکی وایە پێویستی کردووە کە دەستەبەرەیی بەکاربهێنرێ لەنێوان موسڵمانەکاندا، کەواتە ئەو کەسانەی کەبێدەنگ بۆ خۆیان دائەنیشن کەنار گیری ئەکەن لە خراپەکەران، ئەو کەسانە شایستەن دووچار بێن**

لەگەڵ ئەوانەی کە ستەمو خراپەکە ئەکەن بە ئاشکرا لەناو گەل و کۆمەڵدا، ئەگەر هەر لەیەکەمجارەوە ئەو بێباوەڕەکانی دەنگییە نەبوایەو چاکان بەرگری نەفامانیان بکردایە یەکەم بەڵاو سەر لێ شێوان و دووبەرەکی ڕووی نەئەدا، تا ئەو تاوانە گەورەیە کراو بەناهەق و ستەم جێنشینی سێیەم شەهید کرا، لەوەوە کار وای لێهات جەنگ و کوشتار فەراهەم هات لەنێوان هاوەڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) و هاوەڵانی وەك (زبیر و طلحة و عمار) شەهید بوون، ئینجا لەوەوە وای لێهات کە پیسان و ناپاکان دەستیان چووە نازدارێکی وەك حەزرەتی حسین و لەوەوە ئەم نیعمەتە پیرۆزە دووبەرەکی تێکەوت و وای لێهات کەوای لێهات، بەو جۆرەی کە ئەبینرێ و هەرچی نارێکی و نالەباری و دووبەرەکی و لاوازییەك کە ڕوویدا لەناو ئەم ئوممەتەدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو یەکەمجارە، خوا بە میهرەبانی خۆی ئەو دووبەرەکی و ئاژاوە نەهێڵێ لەناو ئوممەتداو بیانکاتەوە بەیەك وەك پێش ڕوودوای یەکەم تاوان و دووبەرەکی و ئاژاوە، بۆ خوا ئەوە هیچی تێ ناچێ بەڵکو چاوەڕوانی ئەو میهرەبانییە ئەکرێ و ئەبێ هەر بەدی بێن بەئیزن و یارمەتی خوا. لە پاش ئەو فەرمان و ترساندنە ئینجا ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بزان کە بێگومان خوا تۆڵەی بەتینە، واتە خۆتان مەخەنە بەر تۆڵەو سزا بەتینەکەی کەبە هۆی نا فەرمانییەوە ڕووی ئەدا، لەئایەتی پێشوودا فەرمانیدا بە بەرگری ستەم و ستەمکاران، ئەوەش بەختکردنی گیان و ماڵی تێدائەبێ، لەبەر ئەوە ئەوا چاکەو بەهرەیەکیان ئەخاتەوە کە بەهۆی ئەم ئایینەوە دەستکەوتیان ئەبێ، کۆتایی نەهێنن و هەڵسن بە ئەرکی ئەو ژیان و زیندووییە کە بانگیان ئەکات بۆی، ئەفەرموێ بەو یەکەم چین و دوو دەستەیە کە یەکەم جار ئەم قورئانەی بە گوێچکەدا: ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ﴾ بیربکەنەوە ﴿إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ﴾ لە حاڵ و باری خۆتان و بیر بکەنەوە لەو کاتەی کە ئێوە ژمارەیەکی کەم بوون ﴿مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لاوازو ژێردەستە کرابوون لەخاك و وڵاتی مەککەدا،

تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾

---

**﴿تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ﴾ مەترسیتان ئەکرد کە خەڵکی بتانفڕێنن بە چەسپانی، واتە بێبڕواکانی قوڕەیش، یان بێبڕواکانی عەرەب، یان فارس‌و ڕۆم، ئەوە حاڵ‌و باری موسڵمانەکان بوو تا کاتی کۆچکردن بۆ مەدینە ﴿فَـَٔاوَىٰكُمْ﴾ ئینجا خوا پەنایدان‌و گرتنییە خۆی بۆ لای ئیسلام یان مەدینە، یان جێ‌و شوێنی پێدان ئەی کۆچکەران ﴿وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ﴾ بەهێزی کردن بە کۆمەك‌و یارمەتیدانی مەلائیکە لەبەدردا، یان بەهۆی چەند کەسێکەوە کە دوژمن ئەترسان‌و دڵە لەرزەیان بوو لێیان ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ﴾ ڕۆزیدان لە پاك‌و حەڵاڵ‌و بەلەزەتەکان، ئیتر مەبەست دەستکەوتەکانی جەنگ بێت کە هەر بۆ ئەم ئوممەتە حەڵاڵ کرا، ئەگەر مەبەست موسڵمانەکانی بەدربێت، ئەگەر مەبەستی عەرەب بێت بەگشتی، ئەو کاتە مەبەست ئەو نازو ڕێزەبوو کە خوا ڕشتی بەسەریاندا لەپاش ئەو تەنگی‌و تەنگ گوزەرانییەی کە تێیدا ئەژیان، خوا ئەوانەی بۆ کردن ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بەڵکو سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو چاکەو بەهرەیانە، ئایا هەرکەسێك بیربکاتەوە لەو هەموو چاکەو بەهرەیە، چۆن بەسۆزو پەرۆشەوە ناچێت بەدەم ئەو بانگ‌و بانگەوازەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە بانگی بڕواداران ئەکات بۆ کارو کردەوەیەك کە زیندوویان ئەکاتەوە، ئینجا ئایا کێ سوپاسی خوا ناکات ئەو چاکەو بەهرەیانەی کە خوای میهرەبان بیری بڕوادارانی خستەوە لە ئایەتەکەدا؟ ئەو موسڵمانانەی کە ئەمڕۆ جیهادو تێکۆشان‌و فیداکاری ئەکەن بۆ هێنانەوەو بەدی هێنانی ئەم ئایینە لە ژیان‌و جیهاندا، لەوانەیە هێندێکیان ئەو کەم‌و کوڕی‌و ژێر دەستەیی یەیان بەسەر نەهاتبێ‌و ئەو تاڵ‌و سوێرییەیان نەچەشتبێ، بەڵام قورئان بەو جۆرە بانگیان لێئەکات‌و ئەیانخاتە سۆز بۆ تێکۆشان‌و فیداکرای، ئەوانەی کە ئەو بەسەرهاتانەیان بە خۆیانەوە دیبێ، ئەوا چاکتر ئەبێ گوێڕایەڵ بن بۆ ئەو بانگ کردنی زیندوو کردنەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاراستەی یەکەم چین‌و دەستەیکرد، ئەبێ بە باوەڕێکی بەهێزەوە چاوەڕوانی ئەو چاکەو بەهرەیە بکەن کە بەخشی بەو یەکەم چینە موسڵمانە.**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا﴾

**ئینجا بانگێکی تر ئاڕاستەی بڕواداران ئەکات بۆ ئەوەی بەتێرو تەواوی هەڵسن بە پێویستیو ئەرکی سەرشانیان بەرامبەر خواو پێغەمبەر (ﷺ)و هەڵسن بەگەیاندنی سپاردە بە جێی خۆیان، بۆئەوەی نەماڵو نەئەولاد سستیان نەکاتو پەکیان نەخات لە تێکۆشانو ناپاکی بەکار نەهێنن لەگەڵ خواو پێغەمبەردا (ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ ناپاکی مەکەن لەگەڵ خواو فرۆستادەکەدا، کەمو کوڕی مەکەن لەبەجێهێنانی فەرمانەکانیان، یان ناپاکی مەکەن لە بەجێهێنانی فەرزو سوننەتەکان، یان بەوەی کردەوەتان پێچەوانەی نیازو نیەتتان بێت. یان بەدزینو داشاردنی دەستەکەوتەکانی جەنگ کە خوا بۆ ئێوەی حەڵاڵ کرد لەناو ئوممەتەکاندا، ﴿وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ﴾ ناپاکی مەکەن لە سپاردەکانی ناو خۆتان، یان لەو سپاردانەی کە خراوەتە سەرشانتان، سپاردەی پەیمانی سروشتو ژیریی، سپاردەی پەیماندان بەخواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پەیمان بە تێکۆشان بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵاو وتەی خوا لە زەویداو چەسپاندنی خوایەتی خوالەجیهانوژیانداوچەسپاندنی فرۆستادەیی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئەو ناپاکیانە مەکەن ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا کە ئێوە ئەزانن ناپاکیە، واتە بەدەستی ئەنقەستو بە زانینەوە ئەیکەن نەك بەهەڵەو نەزانین کە گوناهێك بەو جۆرە بێت زۆر بەدەو تاوانێکی گەورەیە، یان ئێوە ئەزانن‌و زانانو چاكو خراپ لەیەك ئەکەنەوە، لەسەر هەربار مەبەست بەم ڕستەیە سەرزەنشتو تانەو تەشەرە لەوانەی کە ئەو ناپاکیانە ئەکەن، ئینجا بێگومان ماڵو ئەولادو خۆش ویستنی ئەو دوو شتە پاڵدەرێکی بەهێزە بۆ دووچار بوونی ئەو ناپاکی کردنە، بەو دووانە بەندە تاقی ئەکرێتەوەو هەرکەس لەو تاقیکردنەوە دەرچێت بەمەی هەڵسێ بەمافی خوا لەو دووانەدا، ئەو کەسە بەندەی ڕاستەقینەیەو تەمای ئەجرو پاداشت بێت، هەرکەس بەهۆی ئەو دووانەوە لابدا لەڕێگە ڕاستەکەی خوا، ئەو کەسە ستەمکارو سەرکێشە لە پەروەردگاری، بێبەشە لەئەجرو پاداشتو خۆی ئەخاتە بەر سزاو تۆڵەی خوا، جا لەبەرئەوە ئەم ئامۆژگاری‌یە گرنگە ئاڕاستە**

ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ بڕوادارەكان بزانن ﴿أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ﴾ كە بێگومان ماڵ و ئەولادتان مایەی سزاو ئازارە یان بزانن كە ماڵ و ئەولادتان هۆی تاقیكردنەوەتانە، لەسەر هەربار كەواتە ئاگاتان لە خۆتان بێت بە هۆی ماڵ و ئەولادەوە خۆتان مەخەنە بەر تۆڵەی خوا، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ﴾ بزانن كە خوا هەر بەلای ئەوەوە هەیە ئەجرو پاداشتی گەورە، كەواتە ئاگاتان لە خۆتان بێت ئەو ماڵ و ئەولادەوە ئەو ئەجرو پاداشتە لەكیسی خۆتان مەدەن، بەڵكو بەكاریان بێنن لە ڕێی ڕەزامەندی خواو دەستكەوتی ئەجرو پاداشتی لای خوا، واتە ماڵ و ئەولاد هینی خوایەو خوا پێتان ئەدات، هەركەس زاڵببێ بەسەر ئەو دووانەدا، بەم ڕەنگە ئەو دووانە دووچاری گوناهو نافرمانی نەكەن بۆئەو كەسە هەیە لای خوا ئەجرو پاداشتی گەورە، ئا بەو جۆرە قورئان چارەسەری دەروون ئەكات و ئەیپارێزی لە لاوزایەكانی دەروون، ئینجا لەم دواترین بانگەدا بانگی بڕواداران ئەكات بۆ توێشویی ئەم ڕێگە ڕاستەی كە ئەیداتە بەر، قەڵغانێكی بۆ دیاریی ئەكات كە بەرگری بكات لە هەموو شتێ كە مەترسی لێبكرێ لە بڕینی ئەم ڕێگەیەدا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە، ﴿إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەگەر ئێوە خۆتان بپارێزن لە خواو هۆی خەشم و ناڕەزایی خوا لە هەر كارێكدا كەئەیكەن و هەكارێك كە نایكەن و وازی لێئەهێنن، ئەگەر ئێوە بەو جۆرە بن لەگەڵ خوادا، خوا ئەم شتانەتان بۆ ئەكات:

١- ﴿يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا﴾ خوا ئەگێڕێ و فەراهەم ئەهێنێ بۆتان جیاكەرەوەیەكی گەورەو گرنگ، واتە ڕێنموونی و ڕووناكی و زانینێك فەراهەم ئەهێنێ لەدڵ و دەروونتاندا كە هەموو هەق و ناهەقێكی پێ جوێ بكەنەوە لەیەكتر، یان سەركەوتن و زاڵبوونێك كە ڕاست و پاكانی پێ جوێ ببێتەوە لە ناڕاست و ناپاكان، یان ڕزگاربوون لە هەردوو جیهاندا، یان ڕێ بردن و ڕزگاربوون لە هەموو گوناهو دوو دڵیەك یان دەركەوتن و ئاشكرابوون و زاڵبوونێك كە ناوبانگ و شوورەتی پێبڵاوببێتەوە، بەم جۆرانە تەفسیر كراوەتەوە لە ناو زانایاندا، هەموو ئەگێڕنەوە بۆ جیاكردنەوە لە نێوان دوو شتدا، لەبەر ئەوە هێندێ لەزانایان بە جارێ ئەیبڕن بەسەر ئەو مەبەستانەی كە گوتراون لەسەر هەربار ئەو خۆپارێزی و لە خوا ترسییە لە هەر دڵێك دابوو هەموو ڕاست و لاریەك ڕوون ئەكاتەوە بۆ ئەو دڵەو ئەیپارێزێ لەهەر لادان و هەڵكەوتنێك كە بێتە ڕێگەی ئەو بڕوادارە، ئەوە شتێكی ئاشكرایە لای ئەو كەسانەی كە ئەو تامە خۆشەیان چەشتبێ و خوا ئەوەی بەنسیب كردین.

﴿وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُۖ﴾

---

٢- ﴿وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ دائەشارێ لێتان گوناهو خراپەكانتانو دایان ئەپۆشێ لە جیهان دا، كەواتە بێئابڕوویان ناكات بەدەرخستنی ئەو كارە بەدانە كە ئەو چاكەو منەتێكی زۆر گەورەیە.

٣- ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْۗ﴾ ئەبورێ لێتانو چاوپۆشی ئەكات لە ڕۆژی دواییدا، كەواتە تۆڵەو سزایان نابێ.هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بەیەكەم گوناهە بچووكەكانەو دووەم گەورەكان، هێندێكی تر ئەفەرموون: مەبەست بەیەكەم گوناهی لەوەو پێشەو دووەم گوناهی لەمەوپاش، لەسەر هەربار خوا بەرامبەر ئەو خۆپارێزیو لە خوا ترسییە ئەو سێ شتە گەورەو گرنگە ئەكات، چونكە ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ خوا خاوەنی بەخشینی گەورەیە كە بەچاكەو میهرەبانی خۆی ئەیبەخشێ، بەبێ ئەوەی هیچ پێویستیو داخوازێك ڕووی تێبكاتو هیچ كەس هیچ مافێكی ببێ بەسەر خوای میهرەبانیەوە، لە میهرەبانیەكەی بەزیاد بێتو داوای بەشداری ئەكەین لەو بەخشینو پیتو فەڕە.

لەمەوپێش خوای پەروەردگار ڕابردووی موسڵمانەكانی خستە بەرچاویان كە لەچ بارو حاڵێكی بەدو ناخۆشەوە گواستنییەوە بۆ ئەو خۆشیو بەرزیو سەركەوتنەی كە ئەنجامیدا بۆیان لەم ڕووداوی بەدرەدا، ئینجا بەو بۆنەیەوە شێوەی هەڵوێستی بەدی بێبڕواكان ئەخاتە بەرچاوو بیری ئەخاتەوە كاتێ كە پێش كۆچكردنی پێغەمبەر (ﷺ) ویستیانو نیازبوو كاری بێنن، ئینجا بە پێچەوانەی نیازی بەدی ئەوان، خوا پیلانەكانی ئەوانی لەكارخستو پێغەمبەرەكەی پاراست لەوە (ﷺ)، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو كاتە بكە كە ئەوانەی بڕوایان نەهێنابوو پیلانو نیازو تەگبیرو ڕێنموونی ڕاوێژی

بەدیان کرد دەربارەی تۆ ﴿لِيُثْبِتُوكَ﴾ بۆئەوەی تۆ بەندو کۆت بکەن ﴿أَوْ يَقْتُلُوكَ﴾ یان بتکوژن ﴿أَوْ يُخْرِجُوكَ﴾ یا دەرت بکەن لە مەککە، (ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لەو بارەیەوە لە (ئیبن و عەباس)ەوە -خوایان لێ ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: شەوێك قورەیش لە مەککەدا کۆبوونەوەو ڕاوێـژیانکرد لەبارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هێندێکیان گوتیان کە ڕۆژبوویەوە بەندو کۆتو زنجیری بکەن، هێندێکی تر گوتی: نەخێر بیکوژن، هێندێکی تر گوتی: نەخێر دەری بکەن، ئینجا علی لەسەر جێگاکەی خەوتو پێغەمبەر (ﷺ) هەتا گەیشتە ئەشکەوتەکەی (سەور)، بێبڕواکانیش ئەو شەوە مانەوە بە دیاری عەلی یەوەو گومانیان وابوو ئەو خەوتووە پێغەمبەرە (ﷺ) ئینجا کاتێ کە ڕۆژ بوویەوە هەڵمەتیاندا بۆلای، ئینجا بۆیان دەرکەوت عەلییەو خوا تەگبیرو پیلانەکەی پەك خستن، ئینجا پرسیاریانکرد لە عەلی هاوەڵەکەت لەکوێیە؟ ئەویش فەرمووی: نازانم، ئینجا کەوتنە شوێنیو گەڕان بەدوایدا، ئینجا کە گەیشتنە شاخەکەو جێپێی نەما لێیان شێوا، ئینجا سەرکەوتن بەشاخەکەداو ڕابووردن بەلای ئەشکەوتەکەداو سەرنجیاندا جاڵجاڵۆکە قاپییەکەی تەندووە، بەهۆی ئەوەوە گومانیان وابرد کە نەچوونەتە ئەو ئەشکەوتە بە نیشانەو بەڵگەی ماڵی ئەو جاڵجاڵۆکەیە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سێ شەو لەوێدا مایەوە، ئەوان بەو جۆرە تەگبیرو پیلانی خۆیانکردو خوایش بەو شێوەیە تەگبیرو پیلانەکەی ئەوانی پەك خستو دەری کرد وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَيَمْكُرُونَ﴾ ئەوانە تەگبیرو پیلانیانکرد ﴿وَيَمْكُرُ اللَّهُ﴾ خوایش پیلان ئەکاتو پیلانیکرد، واتە پیلانەکەی ئەوانی پەك خست بە جۆرێ بە خۆیانیان نەزانی وەك دەست نیشانی بۆکرا لە حەدسیەکەدا، یان خوا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ، یان خوا وەك پیلان کە ڕەفتاری لەگەڵ کردن، بەم ڕەنگە هێنانی بۆ بەدر، تا ئەوەی بەسەر هێنان کە باسکرا،

وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾

﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ خوا باشترینی هەموو تەگبیر کەرو پیلان گێڕانە، چونکە هیچ تەگبیرێکی تر هیچ نرخێکی نییەو کارناکات لەکاتی تەگبیری خوادا، تەگبیری خوا هەمووی خێرو چاکەیە، بەڵام تەگبیری خەڵکییان هەر بەدو خراپە یان ئەگەر چاکیشی تێدابێ خراپەشی هەیە، بەڵکو زۆرترە، بەکورتی بەکارهێنانی وشەی (مکر) بۆ خوا ئەبێ بەجۆرێ بێ‌باوەڕەکانی کە بگونجێ‌و شایانی خوا بێت، وەك دەست نیشانمانکرد بۆی بە چەند جۆرێك، ئەم شێوەی کە نیشانیدا بەرامبەر پیلان‌و کردەوە بەدەکەی ئەوانە لە بارێکەوە لاقرتیان پێئەکات، لەبارێکی ترەوە دڵ دائەچڵەکێنێ، چونکە ئایا ئەبێ ئەو ئادەمییە لەڕو لاوازو بێ‌دەسەڵاتانە چی بن بەرامبەر ئەو زۆرو دەسەڵاتە بێ‌باوەڕەکانی سنووررە کە هەموو بوونەوەر دڵە تەپەو دڵە لەرزەیەتی لەئاستی؟!! ئینجا هەروەها ئەڕوا لەسەر بێ‌بڕواکان، بارو کردەوەی بەدیان دەرئەخات، لاف‌و گزافیان باس ئەکات تا گەیشتنە ئەو ڕادەیە لافی ئەوە لێئەدەن کە ئەتوانن وێنەی ئەم قورئانە بێنن، وەك لە هەمان کاتدا بە قسەو نوسراوی پڕوپووچی کۆنی دائەنێن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا﴾ کاتێ کە ئایەتەکانی ئێمە ئەخوێنرێتەوە بەسەریاندا، ﴿قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا﴾ ئەڵێن بیستمان‌و ﴿لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ﴾ ئەگەر ئێمە بمانەوێ وێنەی ئەم خوێنراوەو ئەم قورئانە ئەڵێین: ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئەمە هیچ نییە بێجگە لە قسەی پڕوپووچە نوسراوەکانی گەلە کۆن‌و ڕابردووەکان! (ئیبن‌و کەسیر) لە تەفسیرەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە (سەعیدی کوڕی جوبەیرو سدی ئیبن‌و جورەیج)و کەسانێکی ترەوە کە خاوەنی ئەم وتە بەدە (نضری کوڕی حارث)ە کە گوێیان بۆ ئەگرت، کەواتە وەك وتەی ئەوانیش بێت وایە لەبەر ئەوە بە کۆ فەرمووی. جا ئەو نەفرین لێکراوە چوو بۆ وڵاتی فارس‌و فێری بەسەرهات‌و هەواڵی پاشاکانیان بوو بوو، وەك ڕۆستەم‌و ئەسفەندیار، کاتێ گەڕابووەوە لەوێ ئەبینێ پێغەمبەرمان (ﷺ) ڕەوانە کراوەو ئەم قورئانە ئەخوێنێتەوە بەسەر خەڵکیدا، جا کاتێ کە هەڵئەسا لە کۆڕو کۆمەڵ ئەو نەفرین لێکراوە ئەچووە ناو ئەو کۆڕەو هەواڵ‌و داستانی ئەو پادشایانەی ئەگێڕایەوە بۆیان‌و ئەیگوت: سوێندتان ئەدەم بە خواو محمد کاممان هەواڵ‌و قسەکانمان خۆشترو شیرین ترە؟ لەبەر ئەوە کاتێ کە بەدیل گیرا لە ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدا بەکوشتنی و کوژرا لەبەردەمیدا

سوپاس بۆ خوا، ئەوەی کە بەدیلی گرتبووی مقدادی کوڕی ئەسوەد بوو -خوا لێی ڕازی بێ- وەك (ئیبن و جەریر) حەدیسێ ئەهێنێ لە (سعیدی کوڕی جوبەیر)ەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدابە کوشتنی سێ کەس: عوقبەی کوڕی ئەبو معیط، نعمەی کوڕی عدیء و نضری کوڕی حارث کە مقداد بەدیلی گرتبووی، ئینجا کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدا بە کوشتنی: مقداد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دیلی منە. ئەویش فەرمووی: ئەمە دەربارەی نامەکەی خوا ئەوەی ئەگوت کە گوتی. ئینجا فەرمانیدا بەکوشتنی، مقدادیش دوبارە گوتی دیلی منە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی خوایە لە فەزڵ و میهرەبانی خۆت مقداد دەوڵەمەندو بێباوەڕەکانی پێویست بکە، ئینجا مقداد گوتی: من ئەمەم ئەویست! سەعید فەرمووی: ئەم ئایەتە لەم (نضر)ەدا هاتە خوارەوە، لە چەند شوێنێکی تردا ئەگێڕێتەوە لەو بت پەرست و بێبڕوایانە ئەم وتە بەدە، ئەو وتەیە ئەڵقەیەك بوو لەو زنجیرەیە کە بەربەرست و بەرهەڵستی قورئانیان پێئەکردو ئەیانویست بەهەر جۆر بووە خەڵکی لێدوور بخەنەوە بەتایبەتی ئەوانەی کە سەرۆك و بەرزو سەرمایەدارن، لەبەر ئەوەی زۆر ئەترسان لەم قورئانەو باش حاڵی بوو بوون لەم بانگ و بانگەوازەو ئەیانزانی ئەدا لە زۆرو تاوان و مل هوڕییەکەیان، ئەوانە چاك حاڵی بوو بوون لەشایەتومانەکەی موسڵمانان، ئەیانزانی کەئەوە جاڕدانە بە شۆڕشێکی تێرو تەواو بەسەر هەموو زۆرو دەسەڵات و ستەمی ئادەمیدا، مەبەست بە (لا إله إلا الله) ئەمەیە هیچ حاکم و کاربەدەست و فەرمانڕەوایەك نییە لە ڕاستیدا بێجگە لە خوا، خوا تاکە خوایەو بێجگە لەو هەموو بەندەی ئەوە، ئەبێ هەموو کارو فەرمانەکانی خوا هەر لە پێغەمبەرەوە وەرگیرێ، کەواتە هیچ سایا و دەستوورو ڕژێم و شەریعەتێك نییە بێجگە لەوەی کە وەرئەگیرێ لە خوا لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە! ئەوانە باش ئەیانزانی مەبەست بەو شایەتومانە چییە، لەبەر ئەوە بەو جۆرە بێزاربوون و ڕاپەڕین بۆ بەربەست و بەرگری ئەم ئایینەو ئەم قورئانە، ئەگەر بیانزانی بایە مەبەست بەم ئایینە تەنیا بیرو باوەڕو خواپەرستییەکەو ئیتر کەنار گیرەو هەقی نییە بەسەر هیچکەس و هیچ شتێکی ترەوە ـ وەك بەداخەوە ئەو جۆرە بۆچوون و بیرو باوەڕە باوە لەناو زۆربەی موسڵماناندا ـ ئەگەر بەو جۆرە حاڵی بوونایە لەو ئایینە تازەیە هەرگیز بەو جۆرە بێزار نەئەبوون و دوژمنایەتیان نەئەکرد، بەڵگەی ئاشکرا لەسەر ئەوە ئەمەیە: پێش هاتنی ئیسلام لە ناویاندا دەستەو کۆمەڵێك هەبوو پێیان ئەگوتن: (حنفاء) کەنار گیربوون لە بیروباوەڕو عیبادەتی ئەو بت پەرستانە، باوەڕیان بە خوایەتی و تاك و تەنیایی خوابوو، هەر ئەویان ئەپەرست و دوور

بوون لە پەرستنی هیچکام لەو بتانەی کە ئەپەستران، ئەو دەستەو کۆمەڵە هەبوون و دوژمنایەتی نەئەکران و کەس هەقی نەبوو بەسەریانەوە، بەڵکو ڕێزیش ئەگیران، چونکە مەترسیان لێنەئەکرو هیچ شۆڕشێکیان بەدەستەوە نەبوو، بەڵکو کارەکەیان تایبەتی بوو بەخۆیان و دڵ و دەروونی خۆیانەوە، بێگومان ئیسلامیش بریتییە لەو بزوتنەوەیە کە هات و دای لە هەموو ناهەقییەك و شۆڕشی کرد بەسەر هەموو بیروباوەڕو بۆچوون و ڕژێم و یاسایەکدا، ئەو جۆرە هەوڵ و تێکۆشانەی کە (نضری کوڕی حارث) کردی بۆ بەرگری ئەم ئایین و قورئانە، دواترین هەوڵ و تێکۆشان نەبوو، هەر نایش وەستێ و هەردەمە بە جۆرێ کراوەو ئەکرێ، دواترین هەوڵ و تێکۆشان ئەوە بوو کە قورئانکرا هەر بەشێکی بەڕێزو پیرۆز کە بخوێنرێ بە ئاوازێکی خۆش و دەنگ لەراندنەوە لەناو کۆڕو کۆمەڵ و لەسەر ئێزگەکان بە ئێوارەو بەیانیدا، کرا بە نوشتەو بۆ پیت و فەڕو پارێزگاری کرا بەسەرو ماڵ و شاندا، هەرکاتێ قورئان هێنرا دەست بەجێ خەڵکی هەستن لەبەری و ماچی بکەن!! زۆر بە داخەوە ئەم قورئانە بەو جۆرەی لێکراو مافەکەی هەر بەو جۆرە نیشاندرا، هەرکەس بەو جۆرە ڕێزی قورئان بگرێ و بەپیرۆزی سەیر بکات ئەو کەسە موسڵمانە، ئیتر با بۆچوون و تێگەیشتن و ڕژێم و یاسا و شەریعەتی لەلایەکی ترەوە هێنانی کە دژو دوژمنی قورئان بێت!! دوژمنانی ئیسلام ئەو هەوڵ و تێکۆشانەیان کرد تا گەیشتن بەو مەبەست و ئامانجە پەست و بۆ گەنەیان، بەهۆی ئەوەوە هاتنە وڵاتی ئیسلام و دەستیانگرت بەسەر خێرو بێری وڵاتدا، بەڵام لە میهرەبانی خوا بە زیاد بێت موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە خەبەریان بوویەوەو هۆشیان کردەوە کە قورئان بۆچی هاتووە، لەبەرئەوە ئەبینین لە هەموو لایەکەوە ـ تەنانەت لە وڵاتە بێگانەکانیشەوەـ بە جارێ داوای گەڕانەوە ئەکرێ بۆلای قورئان و یاسا و شەریعەتی قورئان، ئەم قورئانە بەبێ لەشکرو پشتێوانێکی ئاشکرا زاڵبووو سەرکەوت لەدڵ و دەرووندا بەسەر هەموو یاسا و بیرو باوەڕەکانی تردا کە بە هەموو هێزو چەك و لەشکرێکەوە چەندەها ساڵە بەهێز ئەکرێن و یارمەتی ئەدرێن، بەرەبەرە گەورەیی قورئان و ئیسلام دەرئەکەوێ و بێباوەڕەکانی کەڵکی و بێباوەڕەکانی نرخی بیروباوەڕو یاساکانی تر ئاشکرا ئەبێ، بۆ نموونە ماركسیێتی کە چەند ساڵە یارمەتی ئەدرێ وەدەهۆڵی بۆلێ ئەدرێ وهەمووچەك وئاگروئاسنێك بەکارئەهێنرێ بۆچەسپاندنی،کەچی لەپرێکدائەبینین ڕووخاوبەجارێ خەڵکی بەدژی هەڵساون وداوای نەهێشتن ودوورخستنەوەی ئەکرێ لەکاربەدەستی و حوکمڕانی، کە هێشتا ئەوە لە کوێیەتی و تابێت سەیر تر ئەبینرێ!!

وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾

---

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆلای ئایەتەکانی قورئان شێوەیەکی زۆر سەیرمان نیشان ئەدات لە بارەی سەرکێشی بێبڕواکانی یەکەم چین کە بەدژی ئەم قورئانە هەستان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالُوا۟﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە ئەو بێبڕوایانە ئەیانگوت: ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ﴾ ئەی خوایە ئەگەر ئەم قورئانە هەر ئەو هەق و ڕاستەکە لەلایەن تۆوە هاتووە، وەك محمد ئەڵێ: ﴿فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەی بباریێنە بەسەرماندا بەردێك کەلە ئاسمان و لای سەرومانەوە هاتبێ، واتە ئەو سەنگ و گڵەی کە دیاریی کراوە بۆ سزادان وەك هات بۆ سەر گەلەکەی (لوط)، لەسەر هەر بار مەبەست بەم نزایە گاڵتە و لاقرتی کردنەو دەربڕینی بێبڕواییيە، یان مەبەست دەربڕینی قین و سەرپێچی و بڕوا نەهێنانە بەم قورئانە تەنانەت با هەق و ڕاستیش بێت، کەواتە بڕوا نەهێنانەکەیان هەر لە ڕووی سەرکێشییەوە بووە نەك نەزانین و دەرنەکەوتن، ﴿أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ یان سزایەکی تری سەختی ئێش و ئازار دەرمان بۆ بێنە، بەڕاستی نزاکەیان زۆر جێگەی سەرسوڕمانە و نیشانەیە لەسەر ئەوە کە سروشتیان بە تواوی تێك چووە و ترازاوە لەسەر بارە ڕاستەکەی خۆی، ئەگینا، هیچ نەبێ ئەبوایە داوای ڕێنموونییان بکردایە بۆ ڕێگەی ڕاست، بەڵام کە بەهۆی سەرکێشی و خۆ بەزل زانییەوە تێك چووە ئەوەتا سزاو تیاچوون و لەناو چوون هەڵئەبژێرن بەسەر بڕواهێنان و مل کەچی بۆ هەق و ڕاستی!! ئەوانە بەو لاری و سەرکێشییە چوون بە پێشەوازی بانگ کردنەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەرەنگاری وەستان، بەڵام هەر بانگ و بانگەوازە کە زاڵ بوو و سەرکەوت، سوپاس بۆ خوا، قورئان بەرامبەر ئەو نزا ناڕاست و ناڕەوای ئەوانەوە وەڵامیان ئەداتەوە بەمەی هەرچەند ئەوانە شایستەی سزادانن، بەڵام خوا ئەو سزایەی نەدان و هێشتنییەوە، چونکە پێغەمبەریان لەناودایەو هەر بانگیان ئەکات بۆ بڕواهێنان و ڕێنموونی، خوایش ئەو جۆرە سزایان ئەدات و لەڕیشەیان ناهێنێ تا پێغەمبەر (ﷺ) لەناویاندا بێت، هەرچۆنێ ئەوجۆرەسزایان نادات لەسەرتاوان وگوناه تا ئەوان داوای لێبوردن بکەن لە خوا،

وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ﴾ باوی خوا وا نەهاتووەو شیاوو شایستە نەبووە بۆ خوا کە ئەوانە سزا بداتو نیازی ئەوانە بەکات لە کاتێکدا تۆ ـ ئەی پێغەمبەرـ لەناویاندا بێت ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ نەبووە بۆ خواو شایستە نەبووە بۆی سزا دەری ئەوانە بێت بەو سزای لەناوبردنو لەڕیشەهێنانە لە کاتێکدا ئەوانە داوای لێبورن بکەن لە گوناهەکانیانو داوای لێبوردن تازەو دووبارە بکەنەوە جار لە جوای جار، ئایا مەبەست داوای لێبووردنی ئەو بڕوادارانەیە کە مانەوە بەژێر دەستەیی لەناو قوڕەیشدا وەك (ضحاك)و هێندێ تر لە زانایان ئەفەرموون، یا مەبەست داوای لێبووردنو نزای بێبڕواکانیشەو ئەبێتە بەرگری کەری ئەو سزایە کە باسکرا وەك (یەزیدی کوڕی رومانو محمد کوڕی قەیس) ئەفەرموون کە ئەم دووانە ئەفەرموون: لەپاش ئەو نزا شەڕەی کە کردیان لە خۆیان پەشیمان بوونەوەو گوتیان: ئەی خوایە داوای لێبووردنت لێئەکەین؟ ئایا مەبەست تۆبەو گەڕانەوەیە لە بێبڕواییو تاوانەکانی تۆیان کە ئەگەر ئەوەیان بکردایە سزا نەئەدران وەك (سدیو قتادەو ئیبنو زەید) ئەفەرموون. هەرسێ بارەکە هاتووە لە (ئیبنو عەباس)ەوە —خوا لێی ڕازی بێ— وەك ئەمەش هاتووە لێیەوە کە مەبەست داوای لێبووردنی ئەوانەیان کەلەداهاتوودا بڕوا ئەهێننو داوای لێبووردن ئەکەن، واتە خوا سزادەری ئەوانە نییە لە کاتێکدا لەناویاندا بێ ئەوانەی کە لەپاشدا موسڵمان ئەبن وەك (عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلو سەفوانی کوڕی ئوممەییەو سوهەیلی کوڕی عەمر)و وێنەیان، لە (مجاهد)ەوە هاتووە کە مەبەست داوای لێبووردنی ئەوانەیە کە لەپشتی باوکەکانیان دەرئەچن لە داهاتوودا، خوا سزا دەری ئەوانە نیە بەسزای لەناو بردنو لەڕیشەهێنان لەکاتێکدا کەلەپشتی ئەوانە دەرچێ، کەسانێك کە داوای لێبوردن ئەکەن، بەڵام ئەم ڕایە ناچێتە دڵەوەو دوورە ئەو مەبەست بێت، بەهەر جۆرو لەسەر هەر بار ئەو مۆڵەتدانو بەرگری سزایە بە میهرەبانییە کەلەلایەنە خواوە کە بەکاری هێنا بۆیان،

وَمَا لَهُمۡ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمۡ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَمَا كَانُوٓاْ أَوۡلِيَآءَهُۥٓۚ إِنۡ أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمۡ عِندَ ٱلۡبَيۡتِ إِلَّا مُكَآءٗ وَتَصۡدِيَةٗۚ

---

**ئەگەر بەپێی کردەوەی خۆیان ڕەفتاری بکردایە لەگەڵیان ئەبو بەبێ مۆڵەتدان لەڕیشەی بهێنایە وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُمۡ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئایا چی هەیە بۆ ئەوانە کە خوا سزایان نەدا ﴿وَهُمۡ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوانە بەرگری موسڵمانان ئەکەن و ڕێیان لێئەگرن لە چوون بۆ مزگەوتی بەڕێزو پیرۆز، واتە ئەو ماڵی خوا لە مەککە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی، ئینجا کە ئەو بەرگریی و ڕێگرتنەش ئەکەن، ﴿وَمَا كَانُوٓاْ أَوۡلِيَآءَهُۥٓۚ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوانە کاربەدەست و ماف دارو خاوەنی ئەو مزگەوتە نین، چونکە ﴿إِنۡ أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُتَّقُونَ﴾ کاربەدەست و ماف داری ئەو مزگەوتە هەر لە خوا ترس و خۆ پارێزەرەکانە لە بێبڕوایی و بت پەرستی ئەوانەش بێبڕواو بت پەرستن، پاڵفتەی باسەکە ئەمەیە: خوا بە میهرەبانی خۆی مۆڵەتی ئەوانەی داو دوو شتی گێڕا بە بەربەست و بەرگری کەری سزای لەناوچوون و لەناوبردنیان:**

**١- بوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەناویاندا.**

**٢- داوای لێبووردن لە خوا.**

**ئەوانە لەلایەن خۆیانەوەو بەپێی کردەوەی خۆیان شایستەی سزابوون، بەتایبەتی بەهۆی ڕێگرتنیان لەو ماڵی خوا بەبێ ئەوەی هیچ مافێکی ئەوەشیان ببێ، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئەوانە نازانن کە ماف و خاوەنداریان نییە بۆ ئەو ماڵە پیرۆزە، ئەفەرموێ زۆربە چونکە هێنی وایان بووە زانیویانە بەڵام بەسەرکێشی دانیان پیادا ئەنا، یان ئەڵێین: مەبەست بە زۆربە هەموویانە وەك زۆر جار زۆربە بەکارئەهێنرێ لە جێگەی هەموودا، هێندێ ئەفەرموون: ڕاناو لە ﴿أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ﴾ دا ئەگەڕێتەوە بۆ خوا، واتە ئەوانەی ڕێ ئەگرن لەو مزگەوتە لە کاتێکدا ئەوانە دۆست و خۆشەویستی خوا نین...هتد، بەم جۆرەش ئەگونجێ بەڵام باری یەکەم لە دڵدا جێگیرە، ئینجا ئایا مەبەست بە ﴿ٱلۡمُتَّقُونَ﴾ خۆپارێزەرانە لە**

بێبڕوایی و پەرستنی هیچ شتێك بێجگە لە خوا وەك لە تەفسیری ئایەتەکەدا گوتمان کە ئەوە لای خوارو یەکەم پلەی خۆپارێزیە، ئەو کاتە ڕاناوەکە هەر مزگەوتەکە ئەگەڕێتەوە؟ یان مەبەست خۆپارێزەرانە لە هەر بێشەرعیەکە کە پلەی دووەمی خۆپارێزیە، ئەو کاتە ڕاناوەکە بۆ خوا ڕێکترە؟ هەرکام لەم دووبارە ئەگونجێ و هەڵئەگرێ، بەڵام لەسەر ڕای یەکەم ئەبێ بڵێین: ئەوانە شیاو و شایستەی ئەوەی نین خاوەن و مافداری ئەو مزگەوتە پیرۆزە بن، چونکە بە ڕووالەت ئەو بێبڕوایانە کاربەدەست و خاوەن و دۆستی ئەو مزگەوتە بوون و بەو جۆرە ناسراو و بەناوبانگ بوون، ئەو بێبڕوایانە لافی خاوەنی مافداریان لێئەدا بەبۆنەی ئەوە کە خۆیان بە نەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل دائەنا، بەڵام بێبڕوایەکەیان ئەو پەیوەندیەی بچڕین، ئەوانە بەدەم و بە ڕوو کەش نوێژو خواپەرستیان ئەکرد لەو مزگەوتە پیرۆزەدا، بەڵام نوێژو خواپەرستی ئەبێ بە جۆرێك بێت کە خوا دایناب و فەرمانی پێدابێ، نەك بە هەوەس و ئارەزووکاری خۆیان، هەر نوێژو خواپەرستیەك بەم شێوە بێت لای خوا نوێژو خوا پەرستی نییە و هیچ نرخێکی نییە، بەرگری سزا ناکات لە هیچکەس وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ نوێژەکەی ئەوانە لای ماڵی خوادا هەر بریتی بوو لە فیقە و فیکە و چەپڵە لێدان، واتە بەپێی بیروباوەڕی پڕوپووچی خۆیان ئەوە نوێژبوو، لە (ئیبن و عومەر)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەگێڕنەوە کە ئەفەرموێ: کوڵم و ڕوومەتیان ئەخستە سەر زەوی و چەپڵەیان لێئەداو بەدەم ئەیان فیقان بەم ڕەنگە پەنجەیان ئەخستە ناو دەمیان فوویان پێدائەکرد تا ئەو دەنگەی لێپەیدائەبوو، لە (ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- هاتووە کە قوڕەیش بە ڕووتی تەوافیان ئەکرد بەدەوری ماڵی خوادا بە فیقەکردن و چەپڵە لێدانەوە، (مجاهد) ئەفەرموێ: پێچەوانە و بەرگری پێغەمبەریان (ﷺ) ئەکرد لە تەواف کردنداو لاقرتیان پێئەکرد و فیکە و فیقەیان ئەکرد و نوێژو تەوافەکەیان ئەشێواند و سەریان لێ تێك ئەدا، هەروەها وێنەی ئەمە لە (مقاتل)ەوە هاتووە، جا لەسەر ڕای (ئیبن و عومەر و ئیبن و عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەو فیقە و چەپڵەیە جۆرێك بوو لە خواپەرستیان! لەسەر ڕای (مجاهد و مقاتل) مەبەست ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، هەڵئەگرن ئەوەیان دانابێ بە نوێژو خواپەرستی و لە هەمان کاتدا تا بەوە ئازاری ئەویان دابێ و سەریان تێکدابێ لە نوێژو تەوافەکەی،

فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ

---

**﴿فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ کەواتە بچەژن سزای کوشتن و بەدیل گرتنی ڕۆژی بەدر، یان ئەو سزای کە داواتانکرد لە نزا شەڕەکەی کە کردتان لە خۆتان، بچەژن بەهۆی بڕوانەهێنانتان، واتە ماتوڵ خۆتان داوای سزاتانکرد لە نزاکەتاندا، کەواتە بچەژن...هتد، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست سزای ڕۆژی دواییەو لە ڕۆژی دواییدا ئەوەیان پێئەگوترێ، جا لەسەر ئەم بارە ئەڵێین: بەهۆی کردەوەی بەدو بەرگریان بۆ موسڵمانان لە مزگەوت و ماڵی خوا بچەژن سزای ئەم ڕۆژە بەهۆی بێبڕواییەك کە بووتان لەجیهاندا بەڕاستی باری یەکەم بەهێزترە لە دڵدا. (محمدی کوڕی ئیسحاق) ئەگێڕێتەوە لە چەند کەسێکەوە کە ئەڵێن: کاتێ قوڕەیش لە بەدردا ئەوەیان بەسەرهات و لەشکرەکەیان گەڕایەوە بۆ مەککە، (ئەبو سوفیان) بە کاروانەکەوە گەیشتە بەرەوە، (عبدالله ی کوڕی ڕەبیعەو عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل و سەفوانی کوڕی ئومەییە) لەگەڵ چەند پیاوێکدا کە باوك و کوڕو کەس و کاریان کوژرا بوون، چوون بۆلای ئەبو سوفیان و هەرکەس بەشداربوو لەو کاروانەدا، گوتیان: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش، بێگومان محمد بێکەسی کردن و پیاوە هەڵبژێراوەکانی کوشتن! کەواتە کۆمەکیان بکەن بەم ماڵە لەسەرجەنگ لەگەڵ محمد، بەڵکو هەقی خۆمان بسێنین، ئەوانیش گوتیان چاکەو بەڵێنیاندا، جا ئەفەرموێ: دەربارەی ئەوانە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە ماڵ و سامانیان بەخت ئەکەن بۆ ئەوەی بەرگری بکەن لە ڕێگەی خواو بەربەستی خەڵکی بکەن لە ئایینی خوا، وەك (کەلەبی و ضحاك و مقاتل) ئەفەرموون هاتووەتە خوارەوە لەو دوازدە کەسەی کە نان و خۆراکیان ئەدا بە خەڵکی و ئەو لەشکرە لە ڕۆژی بەدردا. لە (سعیدی کوڕی جوبەیرو مجاهد)ەوە هاتووە کەلە ئەبو سوفیاندا هاتووەتە خوارەوە کە دوو هەزار کەسی گرت بە کرێ**

له ئەحابیشەكانی مەككە بۆئەوەی جەنگی پێبكات لە ڕۆژی ئوحوددا بێجگە لەو عەرەبانەی تر كە هەڵینابوون بۆ ئەوە، چل هۆقە ئاڵتونی تێدا بەختكردن كە هەر هۆقەیەكی چل مسقاڵ بوو، لەسەر هەر بار بەختكردنی ماڵ بۆ ئەو مەبەستە بۆگەنە تایبەتی نییە هەر بەوانەوە، بەڵكو ئەوە باوی دوژمنانی ئیسلامە لە كۆنو تازەوە كەلە هەموو بارو ڕوویەكەوە ماڵو سامان بەخت ئەكەنو بەختیانكردووە، بەتایبەتی لەم سەردەمی نەفامی تازەدا كە هەموو كەرەسەیەكیان خستە كار بەتایبەتی كەرەسەی ڕاگەیاندن بۆ بەرگری كردنو لادانی خەڵكیو دوورخستنەوەیان لە ئایینی خوا لە هەموو خاكو وڵاتێكدا، ئەو جەنگو بەربەرەكانێ هەرگیز ناوەستێ، دوژمنانی ئیسلام هەرگیز واز ناهێنن لەم ئایینە كە بەئارامیو ئاشتی بڕواو بچەسپێ، هەرگیز واز ناهێنن لە بڕواداران كە بە ئارامیو ئاشتی بژین، ڕێگەی ئەم ئایینە هەر ئەوەیە كە نەوەستێو هەمیشە لە بزوتنەوەدا بێت بۆ لابردنو نەهێشتنی نەفامی، ڕێگەی بڕوادارانی ڕاستەقینەش هەر ئەمەیە كە نەوەستنو هەوڵبدەن بۆیەك خستنو نەهێشتنی دەسەڵاتی نەفامی بەسەر دوژمنایەتیو دەست درێژییدا، ئینجا بۆ بەرزكردنەوەی نەهێشتنی دەسەڵاتی نەفامی بەسەر دوژمنایەتیو دەست درێژییدا، ئینجا بۆ بەرز كردنەوەی ئاڵای خوا تا قوەت نەتوانێ لە ڕێگەیدا بوەستێ، دوژمنی ئیسلام بەو جۆرە نەوەستاوەو هەرگیز ناوەستێ، خوایش ئەم هەڕەشەی ئاڕاستەی ئەوانەكرد كە ماڵو سامان بەخت ئەكەن بەمەی فەرمووی: ﴿فَسَيُنفِقُونَهَا﴾ ئەوانەی كە بڕوایان نەهێناوەو ماڵو سامان بەخت ئەكەن بۆ بەرگری كردنی ئایینو ڕێگەی خوا، ﴿ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةً﴾ ئینجا لەپاشدا ئەو ماڵو سامانە ئەبێ بەداخو حەسرەت بەسەریانەوەو داڕۆژەكەی هەر ئەوەیە، چونكە مەبەستەكەیان پێك نایەتو ناگەن بەو ئامانجە بەدەیان، ﴿ثُمَّ يُغۡلَبُونَ﴾ ئینجا ژێر ئەخرێنو ژێردەست ئەكرێن، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان نەهێناوەو ناگەڕێنەوەو موسڵمان نابن ـ نەك ئەوانەیان كە لەپاشدا موسڵمان ئەبن ـ هەر بۆ لای دۆزەخ كۆئەكرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، ﴿لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ﴾ بۆ ئەوەی خوا دەستەی پیس جیابكاتەوە لە دەستەی پاك، واتە بێبڕوا لە بڕوادار، یان خراپە لە چاكە ﴿وَيَجۡعَلَ ٱلۡخَبِيثَ بَعۡضَهُۥ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ پیسە كە هێندێكی بخات بەسەر هێندێكی تری دا،

فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ

---

﴿فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا﴾ ئینجا هەمووی کۆبکاتەوە پێکەوە ﴿فَيَجْعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ﴾ ئینجا هەمووی بخاتە ناو دۆزەخ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە هەر ئەوانەن زیانباری ڕاستەقینەو خەسارەت مەندی تەواو. ئەگەر مەبەست بە پیس دەستەی بێبڕواکان بێت ئەوا ئاشکرایە کە جێ و شوێنیان لە ڕۆژی دواییدا هەر ئاگرە، ئەگەر مەبەست ماڵ و سامانە پیسەکە بێت ئەوا مەبەست ئەوەیە ئەو ماڵ و سامانە هەموو کۆئەکرێتەوە و سزای ئەو بێبڕوایانەی پێ ئەدرێ و داخ ئەکرێن پێی: وەك لە ئایەتی بەرائەتدا ئەفەرموێ: ﴿فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْۖ﴾ لە ڕۆژی دواییدا ئەو ئاڵتون و زیوە بە ئاگری دۆزەخ سوور ئەکرێنەوە و ئینجا تەوێڵ و دەم و چاو و تەنیشتیانیان چێ داخ ئەکرێ.

ئینجا لە کۆتایی باسەکەدا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە دواترین ترساندن ئاراستەی بێبڕواکان بکات، ڕووی فەرموودە ئەکاتە دەستەی موسڵمانان، فەرمانیان پێئەدات بە جەنگکردن هەتا ئازار دانی موسڵمانان نەمێنێ و کەس نەتوانێ سزا و ئازاریان بدات لەسەر ئایینەکەیان، هەتا مل کەچی هەر بۆ خوا بێ، ئەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ بڵێ دەربارەی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە: یان پێیان بڵێ و پێیان ڕاگەیەنە: ﴿إِن يَنتَهُواْ﴾ ئەگەر ئەوانە کۆتایی ئەهێنن بە بێبڕوایی و موسڵمان ئەبن، ﴿يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾ ئەبورێ لێیان هەرچی لەمەوپێش کردوویانە و تێپەڕی کردووە کە هێندێ لەو تاوانانە ئەو دوژمنایەتی و ماڵ بەخت کردنەبوو لەڕێی بێبڕوایی و گومڕاییەدا، ئەمەش یەکێکە لە بەهرە و میهرەبانیەکانی ئیسلام کە بەکاری ئەهێنن دەربارەی بەندەکانی خوا، لەلوتف و میهرەبانیەکەی بەزیاد بێت،

﴿وَإِن يَعُودُواْ﴾ واته ئەگەر كۆتايی ناهێنن‌و بەردەوام ئەبن لەسەر ئەو بارەی كەوان لەسەری ﴿فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەوا بێگومان تێپەڕیكردووە باوو عادەتی پێشووەكان، واتە باوو عادەتی خواو دەربارەی كۆمەڵی بێبڕواكانی گەلەكانی ڕابردوو كە دژی پێغەمبەرەكانیان هەستان‌و لەپاشان خوا لەناوی بردن‌و لە ڕیشەی هێنان‌و ئایینی خواو بڕوادارانی سەرخست‌و زاڵ كرد بەری ئەو ڕابردووانە ئەكەون‌و كۆمەكی قوڕەیش كەلەم ڕووداوی بەدرەدا دووچار بوون. واتە ئەگەر ئەمانیش وەك ئەوان نەگەڕێنەوە بێگومان وێنەی ڕووداوو بەسەرهاتی ئەوان ئەچەژن‌و بەسەریان دێت، خوای پەروەردگار ئەو هەل‌و هەڵكەوتەی بۆ دانان‌و ڕێگەی گەڕانەوەو تۆبەی بۆ ئاسانكردن‌و هیچ بڕوبیانوویەكی بۆ نەهێشتنەوەو كارەكەی خۆیانی خستنە مەیل‌و خواهیشی خۆیان، كەواتە هەرباری هەڵئەبژێرن هەڵی بژێرن بەمەیل‌و ئارەزووی خۆیان، بەپێی ئەم ئایەتە كافرو بێبڕوای ئەسڵی كاتێ موسڵمان بوو هیچی بەسەرەوە نامێنێ‌و وەك ئەو ڕۆژە لە دایك بووبێ، هیچ قسەو باس‌و دووبەرەكی یەك نییە لەمەدا، ئینجا ماوەتەوە ئەوانەی كەلە پاش ئیسلام بوون پاشگەزبنەوەو لەپاشان موسڵمان ببنەوە، بەلای ئیمامی شافیعی‌و زۆربەی زانایان ئەوانە بەو موسڵمان بوونی دووەمە ڕزگار نابن لە گوناهو تاوانەكانی ڕابردوویان‌و هەموو مافێكیان بەسەرەوە ئەمێنێ چ مافی خواو چ مافی ئادەمی كە ڕووی تێكردبن لەماوەی هەڵگەڕانەوەو پاشگەز بوونەوەكەیاندا، بەكورتی ئەم ئایەتە گشتی نییەو تایبەتییە بەبێبڕوای ئەسڵیەوە، هێندێ لە پێشەواو زانایان لەسەر ئەوەن كە ئەم ئایەتانە گشتی‌یە وەك بە درێژی باسكراوە لە كتێبی مەزهەبەكانداو هەركەس ئەیەوێ با تەماشایان بكات، هەركەس لەم بارانەوە هەر شتێك ئەڵێ بەناوی شەرع‌و ئیسلامەوە نەیڵێ، بەڵكو بەناوی ڕاو مەزهەبی فیقهێ دووبەرەكی زانایان هەیە تێیاندا لەگەڵ ئەوەدا بە ئەسڵی‌و بەشەرع دائەنرێن‌و نیشان ئەدرێن، ئەوەش

زۆر کارێکی خراپە، چونکە هەر بڕیارو مەسەلەیەك کە ئەسڵیو شەرعی بێتو دەقی قورئانو حەیسی لەسەربێ پێویستە بڕوا پێهێنانیو مل کەچکردن بۆیو دژو پێچەوانەی دروست نییەو خەڵکی پێ کافرو بێبڕوائەبێ، بەڵام هەر بڕیارو مەسەلەیەك کە فەرعیو فیقهی بێت پێویست نییە بڕوا پێهێنانیو بەبڕوا پێکردنی کابرا بێبڕواو گوناهبار نابێ، بۆ نموونەو بۆ وێنە: ئافرەت دروستە خۆی خۆی بدات بەشوو ئەگەر باڵغو ژیربێت بەلای حەنەفیەکانەوە، بەلای شافیعیەکانەوە دروست نییەو بەتاڵە، هیچ دەقێکی قەتعی شەرعی نیە لەسەر هیچ بارێکیان بەڵکو بۆ هەرکامیان زاناکان نیشانەو بەڵگەیان هێناوەو هەرکام دەست ئەداتو هەڵ ئەگرێ، کەواتە هەرکەس زانایە زانینی خۆی بخاتە کارو هەوڵو تێکۆشان بکات کام باری بەلاوە بەهێز بوو بەوە ڕەفتار بکاتو لانەدا لەوە وەك لە حەیسی صەحیحدا هاتووە: (دع ما يريبك إلى مالا يريبك) واز بێنە لەوەی کە ئەتخاتە گومانو دوو دڵیو بڕۆ بۆلای ئەوەی کە دڵت بەهێزە پێیو ناتخاتە گومانو دوو دڵی، هەرکەس زانا نییە دروستە بەپێی ڕاو فتوای هەرکام لەو زانایانە بکات کە ڕووی مەسەلەکەیان لە ئیسلامو شەرعەوە وەر گرتووە، نموونەو وێنە زۆر زۆرەو بە ئاسانی نایەتە ژمارەو حەز ئەکەم کە نموونەیەك بهێنمەوە: دەست نوێژ شکان بەڵێ کەوتنی پێستی پیاو لە پێستی ئافرەت کە نامحرەمو بێگانەبن، ئەمەش مەسەلەیەکی فیقهیو فەرعییەو هەرکام لە زانایان کە دووبەرەکین تێیدا، بەڵگەو ڕابەری خۆیان هەیە لەسەر ڕای خۆیان، کەواتە نابێ ئەو جۆرە مەسەلانە بکرێن بەمایەی ئاژاوەو دووبەرەکی، هەرچەند ئەم باسە وەك بێگانە وایە لەگەڵ شوێنەکەدا، بەڵام حەزم کرد دەست نیشانی بۆ بکەم بەڵکو نەشارەزا فێرببێ بەو جۆرو شێوەیە سەرنجی ئەو مەسەلە فەرعیو فیقهیانە بداتو نەیانکات بە هەراو هۆسەو مایەی ئاژاوە، لەخوا داواکارم کەبماناخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکەی، امین. ئینجا بابگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە، لەم ئایەتەدا تەفسیرمانکرد بڕیارەکەی دەربارەی بێبڕوکان بوو،

وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

---

**ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە بڕواداران و ئەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ﴾ جەنگ بکەن لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەدا ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ هەتا سزاو ئازار دان لەسەر ئایین و بڕوا هێنان نەمێنێ، واتە هەتا هێزی بێبڕواکان بشکێرێ و نەتوانن ئازارو سزای بڕواداران بدەن و بەرگریان بکەن لە ئایینەکەی خۆیان، (عوروەی کوڕی زوبەیر) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ: بڕواداران لەیەکەمجاری هاتنی ئیسلامەوە سزاو ئازار ئەدران لەسەر ئایینەکەیان، بەهۆی ئەوەوە هێندێ لە موسڵمانان بە ناچاری هەڵگەڕانەوە لە ئایینەکەیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدا بەکۆچکردن بۆ وڵاتی حەبەشە، جاری دووەم سزا درانەوە کاتێ مەدینەیەکان پەیمانی عەقەبەیان بەست لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) قوڕەیش دەستیانکرد بە سزادان، بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکان کەوتنە نارەحەتیەکی بەتین، مەبەست بەم ئایەتە ئەمەیە، خوا فەرمانیدا بەجەنگ و کوشتار لەگەڵیان تا ئەو ئازارو سزا دانە نەمێنێ ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ هەتا ئایین هەمووی بۆ خوا بێت و ئایینێکی ناهەق و بەلام بەتاڵ نەمێنێ، ئەوەش بەنەمانی هەموو بێبڕواکان یان بەگەڕانەوەیان لێیان لەترسی کوشتن، لە (ئیبن و عەباس و حەسەن)ەوە هاتووە کە مەبەست بە وتەی (فتنة) هاوبەش ڕەوادانە، ئەو کاتە هەڵئەگرێ مەبەست ئەوەبێ: جەنگیان لەگەڵ بکەن لەبەر پێك هاتنی نەمانی بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان و نەمانی هیچ ئایینێك بێجگە لە ئایینی خوا، واتە ئەو جەنگە بکەن با ئەوە پێك بێت لە وڵاتی مەککە و دەوروبەری، چونکە ئەو مەبەستە هەر هەمووی پێکهات وەك لە حەدیسیشدا هات: (لا يجتمع دينان في جزيرة العرب)، دوو ئایین کۆ نابێتەوە لە نیوە ورگەی عەرەبدا، واتە نابێ ببێ، یەکێ لەوانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پێکرد پاك کردنەوی نیوە دوورگەبوو لە بت پەرستی و هاوبەش ڕەوا دان، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست پێك هاتنە لە هەموو جیهاندا، ئەوەش پێك دێت لە کاتی هاتنی مەهدی دا، کەلەو کاتەدا لەسەر زەویدا بت پەرستی نامێنێ وەك (ئەبو عبدالله) ڕیوایەتی کردووە، ئەگەر مەبەستەکە**

ئەوەبێت: جەنگیان لەگەڵ بکەن لەبەر پێکهاتنی ئەو مەبەستە پێك دێتو بەدی دێت، ئەوا ئەو پێکهاتنە ئەبڕین بەسەر یەکێ لەو دووبارەدا کە باسمانکرد، ئەگەر مەبەست ئەوەبێت: جەنگیان لەگەڵ بکە بە نیازی پێکهاتنی ئەوە، ئەوا نایبڕین بەسەر هیچکامدا، بەڵکو ئەڵێین: جەنگ بکەن بەو نیازەوە ئیتر با پێك نەیەتو بەدی نەیەت، بێگومان وتەی (دین) بۆ دوو مەبەست بەکار ئەهێنرێ:

١- عەقیدەو بیروباوەڕ.

٢- بەرنامەو ڕژێمێك کە مل کەچیو گوێڕایەڵی بۆ بکرێ، ئیتر با عەقیدەو باوەڕ نەمێنێ، جا لە ئیسلامدا پێویست نەکراوە جەنگو کوشتار بۆ پێك هێنانی مەبەستی یەکەم بە زۆرو ناچارکردن، بەڵکو خەڵکی ئازادو سەربەستکراوە لەهەڵگرتنو گرتنە گەردنی عەقیدەو بیروباوەڕ لەپاش ڕێنموونیو ئاشنا کردنو ڕاگەیاندنی ڕوونو ڕەوان، وەك ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ هیچ جۆرە زۆر پێهێنانێك نییە لە ئاییندا، واتە لە هەڵگرتنی عەقیدەو بیروباوەڕدا، بەڵکو جەنگو کوشتار پێویستکراوە بۆ پێکهێنانو بەدی هێنانی مەبەستی دووەم، واتە پێویستە بەرنامەو ڕژێمێك کە حوکمڕانو کاربەدەست بێت لە ژیان، هەر بەرنامەو ڕژێمی خوا بێت، ئەبێ کۆتایی نەهێنرێ هەتا بەرنامەو ڕژێمی خوا ئەکرێ بەحاکمو کار بەدەست، ئینجا لە پاش ئەوە خەڵکی ئازادو سەربەستەو زۆری پێناهێنرێو بیروباوەڕی بەسەردا ناسەپێنرێ، بەڵام بەرگری ئەکرێن لەمەی دووبەرەکی فەراهەم بێنن بەدژی بەرنامەو ڕژێمی ئیسلام، بەڵێ زۆر پێهێنان بەکارئەهێنرێ بۆ دوو جۆر بێبڕوا:

ا- ئەوەی پاشگەز بووبێتەوە لە ئایینەکەی، ئەوەش لەبەر پارێزگاری ئایین لەوەی بێباوەڕەکانی نرخ بکرێو هەردوژمنێ هەڵسێ بیکات، بە گاڵتەو دەمێ هەڵیگرێو دەمێ تووڕی بدات.

ب- لەخاکی پاکی حەرەمدا کە پایتەختی ئیسلامە نابێ بێبڕوای تێابێتو ئەبێ هەر موسڵمانی تێدا بێت.

جا لەم ئایەتە بەم جۆرەو لەسەر ئەم بارە تەفسیرکراوەتەوە ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ﴾ جەنگیان لەگەڵ بکەن هەتا هیچ سزاو ئازاردان نەبێ لەلایەن دوژمنو بێبڕوایانەوە دەربارەی بڕواداران، ئایینو بەرنامەی هەمووی هینی خوا بێتو مل کەچیو گوێڕایەڵی هەر بۆ ئەو بێت، بەم جۆرە هیچ ناکۆکیو ناڕێکییەك ڕووناکاتە نێوان ئەم

ئایەتە لەگەڵ ئایەتی: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾داو پێویست نابێ بە هەوڵدان بۆ یەك خستنیان ـ وەك دراوەـ بەهەر حاڵو لەسەر هەربار ئەم ئایەتە سنووری دیاریکرد بۆ تێکۆشانو جەنگو کوشتار لەرێی خوادا کە فەرمووی: ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ﴾، هەرکەس ئەم سنووره نەشکێنێ گیانو ماڵی پارێزراوەو هەموو مافێکی شەرعی خۆی پێئەدرێ با هیچ بڕوای نەبێ بە ئیسلامو هەموو رِقو خەشمێکی ببێ لەدەروونی خۆیەوە دەربارەی ئیسلامو موسڵمانان، وەك لەم فەرموودەیشەوە وەرئەگیرێ: ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ﴾ ئەگەر ئەوانە وازیان هێناو کۆتاییان هێنا لە بێبڕوایی و جەنگو دوژمنایەتی لەگەڵتان ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ ئەوا بێگومان خوا بینایە بەهەر کردەوەیەك کە ئەوانە ئەیکەن، کەواتە بەپێی ئەوە پاداشتو تۆڵەیان لێئەسێنێو رەفتاریان لەگەڵ ئەکات ﴿وَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەگەر روویان وەرگێڕاو سەرپێچیانکردو کۆتاییان نەهێنا ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَىٰكُمۡۚ﴾ ئەوا بزانن کە خوا کۆمەكو یارمەتی دەرتانە، واتە تێجەنگن لەگەڵیانو باکتان نەبێ لێیان ﴿نِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ خوا خاوەنو کاربەدەستی چاکە، هەرکەس ئەو خاوەنو کاربەدەستی بێت زایە نابێت، خوا یارمەتی دەرو پشتگیری چاکە، هەرکەس ئەو پشتیوانی بێت هەرگیز ژێر ناکەوێو داماو نابێ، داواکارین ئەی پەروەردگار کە تەنها خۆت کاربەدەستیو پشتیوانیمان بکەیتو نەماندەیتە دەستی هیچکەس بە میهرەبانی خۆت یاالله.

**وصلى وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.**

جزمی نۆ لە ٢٠ رجب ١٤١٠ کۆچی هەتایوی تەواو بوو، خوایە یارمەتیمان بدەیت بۆ تەواو کردنی ئەوەی کە ماوە لەو تەفسیرە، وەریشی بگرە لێمان یاالله.